# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

## بەرگی بیست و دووەم

سوورەتەکانی

(الأحزاب) و (سبأ)

[redacted]

عەلی باپیر

# تەفسیری سوورەتەکانی

# الأحزاب و سبإ


نووسینی : عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤٣ك - ٢٠٢١ز

٦٩٣ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

تەفسیری سوورەتەكانی

# الأحزاب

# و

# سَبَإٍ

نووسینی: عەلی باپیر

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للّـهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللّـهُ فَلاَ مُضِلَّ لَـهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَـهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إلَـهَ إلاَّ اللّـهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَـهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

أمَّا بَعْدُ: فإِنَّ أَصْدَقَ الحَديث كَلَامُ اللّـه، وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[1].

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین و ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ و، خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا لێی بەهرەمەندە.

(١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد، پێش هەر قسەیەکی گرنگ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و... هتدو، ئەم وتارە، هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، النسائي: (١١٠٤)، ابن ماجه: (١٨٩٢) أحمد: (٣٧٢٠)، الطَّبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدّث بنعمة اللّه) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردوومو، بەر لە تەمەنی بیست ساڵیی یەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و تێوەرامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر رۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کە ئەویش هەر روونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە رەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەرەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (متفرّغ) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەرامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی روون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضَاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش روونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: هەروەها زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیر بکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە موسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەکانی و کتێبەکانی سوننەتدا خەریکم و، دەیان کتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تعالى**)دا زۆر چاك دەرەوشاوەتەوە[1]. بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنوورداربوونی تواناو بڕستم، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسووعەیە کە ئێستا چاپ کراوەو، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەم و، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاکرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

شــارەزا نیم، یـان خوێنــەر پێویســتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیــەوێ لـە قورئان تێبگات و، بزانێ خـوا (تبارك وتعـالـی) ڕاستەوخۆ چـی پـێ فــەرمووە؟!

ئنجا هــەر لێرەشـەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح ســووك و گـورج و گـۆڵ و دڵســۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیـریی، سـەرجـەم ئـەم زنجیـرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هــەروەها هـەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەوە کێشـــاوە، خـــوا بـە باشـتـرین شـــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صـالح و سـاغ و سـەلامەت و سـەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشــە کـە ئێمـە لـەم تەفسیــرەماندا، بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قوڕئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکــە هـــەر ســوورەتێك بۆخـــۆی شــتێکی ســەربەخۆیـــەو، ســەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســـت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرەشـــدا، دیسـان حیســـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســوورەتەکان، بەرگــەکانی دیـاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بـــرا دڵســۆزە ئێســـتاش پـاش تەواوکردنـی زۆربـەی قورئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشـی جـەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنـــان بەردەوام بێ، هەتـــا کۆتـــایی ئەم تەفسیــرە ســەرکەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکارییم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکەییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هەولێر

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ
# لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی

دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەکی ئەم بەرگە

**الحمدلله كما ينبغي لجلال وجهه وعظيم سلطانه والصلاة والسلام والبركات على النبي الأمي محمد سيد رسله وخاتم أنبيائه وأعظم برهانه، وآله المهتدين بهديه المبين من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين بإحسان إلى يوم الدين.**

**خوێنەری بەڕێز و خۆشەویستم!**

ستایش بۆ خوای بەخشەر ئەمە بەرگی بیست و دووەمی تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێزە، کەهەردووك سوورەتی (الأحزاب) و (سبأ)ی تێدان، کە وەك سەرجەم بەرگەکانی دیکە بە حەوت هەنگاو ئایەتەکانیان تەفسیرکراون : پێناسە، خوێندنەوەی ئایەتەکان، مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان، شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان، هۆی هاتنەخوار، مانای گشتی، مەسەلە گرنگەکان، ئنجا وێرای ئەوەش چەندان کورتە باسیشیان تێدا خراونە ڕوو، کە ئەمانەن:

**یەکەم: لە سوورەتی [الأحزاب] دا:**

**١- ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە و ڕواندنەوەی تەم و مژێك.**

**٢- بەسەرهاتی جەنگی ئەحزاب و جەنگی تیرەی بەنی قوڕەیزە.**

**٣- جەنگی ئەحزاب و دوازدە هەڵوەستە.**

**٤- جەنگی بەنی قوڕەیزە و حەوت هەڵوەستە.**

**٥- کورتە باسێك لەبارەی چەمک و واتای (فاحشة مبينة) دوە.**

**٦- لافلێدەرانی پێغەمبەرایەتی و بابییەکان و بەهائییەکان.**

**٧- کورتە باسێك لەبارەی بەسەرهاتی : زەید و زەینەبەوە**

٨- كورتە باسێک لەبارەی یادی خوا كردنەوە.

٩- چوار سەرنجی گرنگ.

١٠- كورتە باسێك لەبارەی صەڵات و سەلام دان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ.

١١- كورتە باسێك لە بارەی خێزان (أسرة)ی پێغەمبەرەوە.

١٢- مانای وشەی (أمانة) لە ئایەتی (٧٢) دا.

## دووەم : لە سووڕەتی (سبأ)دا:

١- كورتە باسێك دە (١٠) كورتە سەرنج لەبارەی چاكەكانی خواوە لەسەر داوود و سولەیمان .

٢- حەوت هەڵوەستە لە بەرانبەر بەسەرهاتی گەلی سەبەئدا.

٣- كورتە باسێك لەبارەی شێوازی بانگەوازەوە لە دە (١٠) خاڵان دا.

هیواداریشم ئەم بەرگەش وەك سەرجەم بەرگەكانی دیكەی ئەم تەفسیرە كە ئەركی زۆریان لەگەڵ كێشراوە، هەم لەلایەن بەندە و هەم لەلایەن دڵسۆزانێك مشوورخۆر و ماندوو نەناسە، وەك شایستەیە گرنگیی و بایەخی پێبدرێ و بەقووڵیی و تێفكرین و ڕامانەوە موتاڵا بكەیّ و فام بكریّ و دواتریش كاری پێبكریّ.

**سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك**

**١٩ رمضان ١٤٤٢ ك**

**١ / ٥ / ٢٠٢١ ز**

# دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١٥/ ١١/ ١٤٤٠) کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠١٩/٧/١٨) زایینیـی، لـە شـاری هەولێـر دەسـت دەکەیـن بـە شـیکردنەوەو ڕوونکردنـەوەی واتـاو مەبەسـتەکانی ئایەتـە موبارەکەکانـی سـوورەتی (الأحْـزَاب).

## نێوەڕۆکی سوورەتی (الأحزاب) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە نـاوی (**سُورَةُ الأَحْـزَاب**)ە، بـە جگە لـەو نـاوە نەنـاسراوەو، نەزاندراوە ناوێکـی دیکـەی هەبـێ، هـۆی ناونرانـی بـە (**سُـورَةُ الأَحْـزَاب**)، ئەوەیـە کـە باسـی (**الأَحْـزَاب**)ی تێـدا کـراوە، کـە بریتـی بـوون لـە کافرەکانـی قورەیـش و، هاوکارانیـان لـە (**غطفـان**) و (**الأحابیـش**)ی قورەیـش، (**بنُـو المصطلـق**)، و (**بَـنُ هـون**) کـە لـە لای چیـای (**حُبْشـي**)، کاتـی خـۆی کۆبوونـەوەو پەیمانیـان لەگـەڵ قورەیشـدا بەسـتوە، چیـای (**حُبْشـي**)یش لـە نیزیـك شـاری مەککەیـە، هەروەهـا وێـڕای ئەوانـەی باسـکران هـۆزی (**بَنُـو قريظـة**)ش لـە جوولەکـەکان، ئەوانـە هەموویـان ئـەو کۆمەڵـە کافرانـە بـوون کـە بـە (**الأَحْـزَاب**) ناویـان هاتـوەو، لـە سـاڵی پێنجەمـی کۆچییـدا گەمـارۆی شـاری مەدینەیـان داوەو، شـەڕێکی زۆر دڕندانەیـان بەرانبـەر مسـوڵمانان کـردوە، بـە نیەتێکـی زۆر خراپـەوە، بـە تەمابـوون بنەبـڕو قـڕە بڕیـان بکـەن.

## دووەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنە خواردا:

لە ڕیزبەندیی دابەزیندا، ژمارەی ئەم سوورەتە، بە پێی کتێبی: (**الإتقان في علوم القرآن**)ی (**السیوطي**)، هەشتاو نۆ (٨٩)یە، بەڵام هەندێکیان دەڵێن: ژمارە نەوەد (٩٠)ە، ڕەنگە هەشبێ بڵێ: نەخێر نەوەدو یەك (٩١)ە، هەمیشە لەو بارەوە ڕاجیایی لە نێوان زانایاندا هەیە، یەکێك گوتوویەتی: ئەم سوورەتە پێش ئەوە دابەزیوە، یەکێك گوتوویەتی: ئەوە دوای ئەوە دابەزیوە، ئەوانە هەر بوون.

لە ڕیزبەندیی موصحەفیش دا ژمارە سی و سێ (٣٣)یە، واتە: لە سوورەتی (**الفاتحة**)ەوە کە دێی لە ژمارە سی و سێ (٣٣) دەگەین بە سوورەتی (**الأحْزَاب**).

## سێیەم: شوێنی دابەزینی:

ئەم سوورەتە بە ڕای تێکرای زانایان و لێکۆڵەرەوان، سوورەتێکی مەدینەییە، نەمبینیوە کەسێك لەسەر ئایەتێك ڕاجیاییەکی بووبێ و، هیچ کام لە ئایەتەکانی بە مەککەیی دابنێ.

کاتی دابەزینیشی، بە پێی قسەی (**ابنُ إسحاق**)، لە کۆتایی ساڵی پێنجەمی کۆچییدا بووە، چونکە (**ابنُ إسحاق**)، کە (**ابن هشام**)، لە سیرەکەی خۆی دا[1]، لێی نەقڵ کردوە دەڵێ: (**ثُمَّ كَانَ غَزْوَةُ الخَنْدَقِ فِي شَوَّالٍ سَنَةَ خَمْسٍ**)، واتە: ئنجا سوورەتی خەندەق (**أحزاب**) لە مانگی شەووالی ساڵی پێنجەم دا بوو، مانای وایە دابەزینی ئەم سوورەتە دەکەوێتە کۆتایی ساڵی پێنجەم.

هەروەها (**ابنُ إسحاق**)، دەڵێ: (**وَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى فِي أَمْرِ الخَنْدَقِ، وَأَمْرِ بَنِي قُرَيْظَةَ مِنَ القُرْآنِ سُورَةَ الأَحْزَابِ**)[2]، واتە: خوای بەرز لە بارەی خەندەقەوە، [جەنگی خەندەق] و لە بارەی (**بَنِي قُرَيْظَةَ**)ەوە، سوورەتی (**الأحزاب**)ی لە قورئان دابەزاند.

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام: ج٣، ص١٢٣.

(٢) السيرة النبوية لابن هشام: ج٣، ص١٢٣.

کـە نـۆزدە ئایـەت لـەو بـارەوە هاتنـە خـوار، حەڤدەیـان دەربـارەی جەنگـی (الْخَنْـدَقِ)، یـان (الْأَحْـزَابِ) و دووشـیان دەربـارەی (بَنِـي قُرَيْظَـةَ).

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بـە بەیـەك دەنگیـی ژمێرەرانـی ئایەتەکانـی قورئـان، سـوورەتی (الأحـزاب) حەفتـاو سـێ (٧٣) ئایەتـە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێـوەڕۆکی ئـەم سـوورەتە بـە گشـتیی هەمـان نێوەڕۆکـی سـوورەتە مەدینەییەکانـە، لـە خستنەڕووی حوکمەکانـی ئیسـلام بـۆ ڕێکخسـتنی کۆمەڵگای مسـوڵمان، لـە ڕووی ژیانـی کۆمەڵایەتیـی و، سیاسـیی و، خێزانییـەوەو، لـە ڕووی چۆنیەتـی مامەڵەکـردن لەگـەڵ دەغـەڵ و دڵ نەخۆشـەکانی نێوخـۆداو، لەگـەڵ دوژمـن و ناحـەزە شـەڕ فرۆشـە دەرەکییـەکان دا، لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا هەمـوو ئەوانـە هاتـوون.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئـەم سـوورەتە ژمارەیـەکی زۆر تایبەتەندیـی هـەن، ئێمـە سـێزدە تایبەتمەندیـی ئـەم سـوورەتە موبارەکەمـان دیاریـی کردون:

١- لەم سوورەتە موبارەکەدا، پێنج (٥) جاران وشەی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾، ئەی پێغەمبەر! هاتوەو، شەش جاران وشەی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هاتوە، ئنجا ئەو پێنج جارە کە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾، دووبارە بۆتەوە، یان ئەو شەش جارە کە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾هاتوە، هەر جارە بابەتێکی تایبەت و گەورەو گرنگ خراوەتەڕوو، چ کە خوا عزوجل بانگی پێغەمبەری ﷺ کردوە، چ کە بانگی بڕواداران کردوە، کە دوایی لە کاتی درێژەی پێشکەشکردنی دەرسەکاندا، هەڵوەستە دەکەین، لە بەرانبەر ئەو پێنج جار: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾و، ئەو شەش جار: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾دا.

٢- لە قەدەغەکردنی عادەتی نەفامییانەی بە کوڕ گرتن، یان بە کوڕکردن (تَبَنّي)، کە ئەمە لە ئایەتی ژمارە (٤ و ٥)دا لەم سوورەتی (الْأَحْزَابِ)دا هاتوە، کە ئەوە کاتی خۆی عادەتێك بووەو ئێستاش هەر هەیە، کەسێك کوڕی کەسێکی دیکەی کردوە بە کوڕی خۆی، دوایی هەر وەك کوڕی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا کردوەو بە مەحرەم لە قەڵەم دراوە، بەڵام خوا ﷻ ئەوەی هەڵوەشاندۆتەوە، چونکە بە قسەی ڕووت کوڕی کەسێکی دیکە، نابێتە هی یەکێکی دی، وەك خوا فەرموویەتی: ئەوە هەر قسەیەکە هەر بە زاری خۆیان دەیڵێن.

٣- خوا ﷻ لەم سوورەتەدا، پێغەمبەری ﷺ بە لە پێشتر داناوە، بۆ بڕواداران لە خودی خۆیان: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴿٦﴾ ﴾، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە پێشترە بۆ بڕواداران لە خودی خۆیان، پاشان هاوسەرانی پێغەمبەریش ﷺ بە دایکی بڕواداران لە قەڵەم دراون: ﴿ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ﴿٦﴾ ﴾، ئەم دوو بابەتە تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا، بەو شێوەیە هاتوون.

٤- لەم سوورەتەدا باسی جەنگی ئەحزاب کراوە، لە ئایەتەکانی: (٩ - ٢٧) واتە: نۆزدە ئایەت، هەم جەنگی ئەحزاب، هەم جەنگی (بَنو قُرَيْظَةَ)، تەنیا لەم سوورەتەدا باسی ئەم دوو جەنگە کراوە.

٥- هەروەها بەس لەم سوورەتەدا باسی سەرپشککردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوسەرانی کراوە، لە دوو ئایەتی: (٢٨ و ٢٩)دا، دوای ئەوەی هەندێك لە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خوایان ﷺ هەڵپێچاوەو ئیلحاحیان لێکردوە کە لە ڕووی ژیانی دنیاییەوە، لە ڕووی عەیش و نۆش و گوزەرانەوە، ئاسانکارییان بۆ بکات، دوای ئەوەی تەماشایان کردوە، دەوڵەتی ئیسلامیی فراوان بووەو، بەرهەم و دەستکەوت هەیەو، خەزێنەی دەوڵەت وەك جاران ڕووت و ڕەجاڵ نیە، ئەوانیش وە تەماع کەوتوون، وەك ماڵەکانی دیکە، نەك لە خەڵکی دیکە زیاتر، بەڵکو وەك ماڵەکانی دیکە جۆرێك لە خۆشگوزەرانییان هەبێ، بەڵام خوا فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کردوە: بە هاوسەرەکانت بفەرموو: وەرن ئەگەر ژیانی دنیاو جوانیی دنیاتان دەوێ، سەرو دیارییتان پێ دەدەم و، بە شێوەیەکی جوان دەستتان لێ بەردەدەم، ئەگەر خواو پێغەمبەری خوا ﷺو ڕۆژی دواییشتان دەوێ،

ئەوە خوا دوو قات پاداشتتان دەداتەوە، پاداشتێکی مەزنتان بۆ هەڵگیراوە، بەڵام ، دوای سەرپشککرانەکە - کە پێغەمبەر ﷺ سەرەتا دایکمان عائیشە سەرپشك دەکات - هاوسەرەکانی هەموویان دەڵێن: بەڵکو ئێمە خواو پێغەمبەری خوا ﷺو ڕۆژی دوایی هەڵدەبژێرین بەسەر دنیادا.

٦- چەند ڕێنماییەکی تایبەت بە هاوسەرانی پێغەمبەرەوە ﷺ لە ئایەتەکانی: (٣٠ - ٣٤)، لە پێنج ئایەت دا، کۆمەڵێك ئامۆژگاریی خوا ﷻو، کۆمەڵێك ڕێنمایی گەورەو گرنگ کە تایبەتن بە هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ دایکانی بڕواداران.

٧- پێکەوە بەراورد کردنی پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار لە دە (١٠) لە سیفەتەکانیاندا، کە لە ئایەتی ژمارە (٣٥)دا هاتوە، کە لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا ئەو دە (١٠) سیفەتە بۆ بڕواداران بە پیاوو ئافرەتەوە هاتوون، کە هەردووك ڕەگەزەکە پێکەوە بەراورد کراون: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾﴾.

٨- بەسەرهاتی زەیدو زەینەب و، بە کردەوە هەڵوەشاندنەوەی نەریتی بە کوڕگرتن، لە ئایەتەکانی: (٣٦ - ٤٠)دا، پێنج ئایەتی بۆ تەرخانکراون، پێشتر ئاماژەمان پێدا.

٩- باسی چەند تایبەتمەندییەکی خێزانیی پێغەمبەر ﷺ کە لە ئایەتەکانی: (٥٠ - ٥٢)، لەو سێ ئایەتە دا هاتوون.

١٠- چۆنیەتیی مامەڵەکردنی مسوڵمانان لەگەڵ ماڵ و خێزان و هاوسەرانی پێغەمبەردا ﷺ کە لە ئایەتەکانی: (٥٣ - ٥٥)دا هاتوە، دەبێ مسوڵمانان چۆن بچنە ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر دەعوەت کران، چۆن خواردن بخۆن؟ چەند دابنیشن؟ ئەگەر کارێکیان پێویست بوو، پێویستییەکیان لە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ ویست، چۆنیان لێ داوا بکەن؟ کە دەبێ لە پشت پەردەوە بێ، بۆ یەکەمجار لەم سوورەتە موبارەکەدا هاوسەرانی بەڕێزی

پێغەمبەر ﷺ (خوا لێیان ڕازی بێ)، پابەند کران بە پەردەگرتنەوەوە، (حجاب) واتە: پەردە، نەك وەك زۆر كەس وا دەزانێ حیجاب پۆشاكی ئافرەتە! حیجاب واتە: پەردە، ﴿ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ﴿٥٣﴾ ﴾، واتە: ئەگەر پێویستییەكتان لە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ داوا كرد، ماڵی بابی خۆتان و ماڵی دایكی خۆتان، لە پشت پەردەوە داوایان لێ بكەن، نەك ڕووبەڕوو، بەو جۆرە بە ویقارو حورمەت و ڕێزەوە، لەگەڵ ماڵی پێغەمبەردا ﷺ مامەڵە بكەن.

١١- فەرمانكردن بە پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرمان بە هاوسەرانی و كچانی و ئافرەتانی ئوممەتی بكات، خۆیان داپۆشن، كە ئەمە لە ئایەتی (٥٩)دا هاتوە، سەرپۆشەكانیان، یاخود كۆڵوانەكانیان، ئەو پۆشاكەی كە لەسەر پۆشاكی ئاساییەوە بە خۆیانی دادەن، كە بە پێی عادەت و نەریتی گەلان، ناوەكانی جیاجیان، دەگونجێ بگوترێ: چوارشێو، دەگونجێ بگوترێ: كۆڵوانە، دەگونجێ بگوترێ: عەبا، گرنگ ئەوەیە ئافرەتان مولزەم كراون كە سەرتاپای جەستەی خۆیان داپۆشن، بە بەرگێك كە تەنك و تەسك نەبێ و، سەرنجڕاكێش نەبێ، وەك دوایی باسی دەكەین.

١٢- هەڕەشەكردن لە مونافیق و دڵنەخۆش و پڕوپاگەندە چییەكان، كە ئەگەر دەست هەڵنەگرن لەو ڕەفتارە خراپانەی كە دەیانكەن، پێغەمبەریان ﷺ لێ هان دەدات، پێغەمبەری خوا ﷺ دەگونجێ ئاشكرایان بكات، دواییش هیچ ڕێی دەربازبوونیان نابێ لە سزای خوا، چ لە دنیا، چ لە دواڕۆژدا، ئەمیش لە ئایەتەكانی: (٦٠ - ٦٢)دا هاتوە.

١٣- باسی سپاردنی خوا، سپاردەی خۆی بە مرۆڤ و، هەڵنەگیرانی ئەو سپاردەیە بە هیچ كام لە چیایەكان و زەوی و ئاسمانەكان، كە لە ئایەتی (٧٢)ی ئەم سوورەتە موبارەكەدا هاتوە.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئەم سوورەتە بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە حەفتاو سێ (٧٣) ئایەتەكەی ئەم سوورەتە، بۆ نۆ (٩) دەرس دابەش دەكەین، كە ئەو نەریتەی ئێمەش لاسایی هیچ كام لە تەفسیرەكانم تێدا نەكردۆتەوە، بەڵكو داهێنانێكی خۆمە، چونكە تەماشا دەكەم، هەر كۆمەڵە

ئایەتێک کە باسی بابەتێک دەکەن، دەیکەم بە دەرسێك، جاری واش هەیە چەند بابەتێک دەکەم بە دەرسێك کە ئایەتەکان پێکەوە پەیوەستن، ئەم حەفتاو سێ (٧٣) ئایەتەمان دابەشکردوە بۆ نۆ دەرس، کە نیو جوزئن، بە پێی دابەشکردنی زانایان بۆ قورئان، کە کردوویانە بە سی (٣٠) بەش، ئنجا نیو بەشی بەشێك، ئەم سووڕەتە دەیگرێتە خۆی:

دەرسی یەکەم: ئایەتەکانی: (١ - ٨)، واتە: هەشت ئایەت کە وەك پێشەکیی وان لەم سووڕەتە موبارەکەدا بۆ کۆی بابەتەکان، ئەم دەرسەش کۆمەڵێك بابەتی تێدا خراونە ڕوو:

١- فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەر ﷺ کە پارێز لە خوا بکات و، فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی کافرو مونافیقەکان نەکات و، شوێن ئەوە بکەوێ کە خوا بۆی دابەزاندوە.

٢- دوایی باسی هەڵوەشانەوەی عادەتی بە کوڕ کردن (تَبَنّي)، دەکات.

٣- پاشان قەدەغەبوونی زیهارکردنی پیاو لە خێزانی.

٤- دوایی باسی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ کە دایکانی بڕوادارانن و، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بڕواداران لە خۆیان لە پێشترە.

٥- دوایی باسی پەیمان لێوەرگیرانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ و نووح و ئیبراهیم و مووساو عیسای کوڕی مەریەم (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

دەرسی دووەم: ئایەتەکانی: (٩ - ٢٧)، واتە: نۆزدە ئایەت دەگرێتە خۆی، هەمووی تەرخانکراوە بۆ باسی جەنگی ئەحزاب، کە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، حەڤدە ئایەتیان بۆ جەنگی ئەحزابن و، دوو ئایەتی کۆتاییش بۆ جەنگی (بَنِي قُرَيْظَةَ)ن.

دەرسی سێیەم: ئایەتەکانی: (٢٨ - ٣٥)، واتە: هەشت ئایەتە، باسی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرە ﷺ دایکانی بڕواداران، سەرەتا خوا فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کردوە کە ئەگەر هاوسەرانت ژیانی دنیاو جوانیی دنیایان دەوێ، سەرپشکیان

بکە لە نێوان مانەوە لەگەڵ تۆو ڕازیبوون بە ژیانێکی دنیا بە کەمگرانەدا، یاخود ئازادبوونیان و، دەست لێ بەردرانیان لە لایەن تۆوە، دوای ئەوەی تۆ سەرو دیارییان پێ دەدەی، دوایی کۆمەڵێك ڕێنمایی لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، ئاڕاستەی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ کراون.

دەرسی چوارەم: ئایەتەکانی: (٣٦ - ٤٠)، واتە: پێنج ئایەت، باسی بەسەرهاتی زەیدو زەینەبە (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە چۆن سەرەتا زەینەب ڕازی نەبووە شوو بە زەید بکات، کە زەید کۆیلەیەك بووە لە لای موحەممەد ﷺ، لە سەردەمی پێش ئیسلامدا، دوایی کردوویەتی بە کوڕی خۆی، ئنجا خوا ویستوویەتی ئەو عادەتە هەڵبوەشێنێتەوە، عادەتی بە کوڕکردن (تَبَنِّي)، بۆ ئەوەش پێغەمبەری خوای ﷺ هەڵبژاردوە، زەیدیش لەگەڵ زەینەب هەر ناکۆك بووە، جارێك پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: **{أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ} (أخرجه أحمد: ١٢٥٣٣، والبخاري: ٦٩٨٤، والترمذي: ٣٢١٢، وقال: صحيح، وابن حبان: ٧٠٤٥، والحاكم: ٣٥٦٣)**، هاوسەرەکەت بهێڵەوە لە لای خۆت و پارێز لە خوا بکە، ئیدی ئەویش گوتوویەتی: لێی بێزارم و، دەبێ زەینەب خۆی بەسەردا هەڵکێشابێ، کە ڕەچەڵەکی لەو بەرزترە، زەینەب کچە پووری پێغەمبەر ﷺ بووە، یانی: کچی خوشکی بابی بووە، سەرەنجام زەیدو زەینەب لێك جیا دەبنەوە، دوایی خوا فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، کە ئەوە زەینەبمان لێ مارە کردی و، بوو بە هاوسەری تۆ.

ئەو پێنج ئایەتە لەو بارەوەن، کە وەك دواتر پێی دەگەین، مشتومڕێکی زۆر لە ڕابردوودا و ئێستاش، لەو بارەوە بووەو هەیە، بەڵام هەر کەسێك سەرنجی ئایەتەکان بدات، جێی ئەو مشتومڕە هیچی نابێت، چونکە ئەوە هاوسەرگیرییەکی ئیجباریی بووە، خوا ﷻ بۆ پێغەمبەری خۆی ﷺ هێناوەتە پێش، تاکو ئەو نەریتە نەفامییەی کە پێشتر بووە، پێی هەڵبوەشێنێتەوە.

دەرسی پێنجەم: ئایەتەکانی: (٤١ - ٤٩)، واتە: نۆ ئایەت، ئەویش چەند ڕێنماییەك بۆ پێغەمبەر ﷺو بۆ بڕواداران، دیسان لە بواری مامەڵەکردن لەگەڵ هاوسەرو خێزان و ژیانی خێزانییدا.

دەرسی شەشەم: ئایەتەکانی: (٥٠ - ٥٢)، واتە: سێ ئایەت، چەند ڕێنماییەك بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە بواری مامەڵەکردنی لەگەڵ هاوسەرانیدا، چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکات؟ کێ لە لای خۆی بهێڵێتەوەو کێ واز لێ بێنێ؟ ئایا بۆی هەیە ئافرەتانی دیکە هاوسەرگیریان لەگەڵیاندا بکات؟

دەرسی حەوتەم: ئایەتەکانی: (٥٣ - ٥٨)، واتە: شەش ئایەت، ئەویش دیسان چەند ڕێنماییەك بۆ بڕوادارانە، لە بواری مامەڵەیان لەگەڵ ماڵ و خێزانی پێغەمبەر ﷺو هاوسەرانیدا، چۆن هاموشۆی ماڵی پێغەمبەر ﷺ بکەن؟ چۆن لەگەڵ هاوسەرەکانیدا قسە بکەن؟ چۆن دابنیشن؟ چۆن مامەڵە بکەن بە شێوەیەك نەبێتە هۆی بێزاریی پێغەمبەر ﷺ؟ پێچەوانەی ئەو ئەدەب و ڕەوشتە بەرزانە نەبێت، کە دەبێ مسوڵمانان مامەڵەیان پێ بکەن لە نێوان خۆیاندا.

دەرسی هەشتەم: ئایەتەکانی: (٥٩ - ٦٢)، واتە: چوار ئایەت، چەند ڕێنماییەك بۆ پێغەمبەر ﷺ لە بواری ئامۆژگاریی بۆ ئافرەتان، چ هاوسەرانی خۆی، چ کچەکانی، چ ئافرەتانی بڕوادار، هەروەها مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دەغەڵاندا، دەغەڵ و دڵ نەخۆش و پڕو پاگەندەکەرەکانی نێو شاری مەدینەدا، پاشان باسی سەرەنجامی شوومی کافران کە لە دنیاو دواڕۆژدا، لە سزای خوا دەرباز نابن.

دەرسی نۆیەم و کۆتایی: ئایەتەکانی: (٦٣ - ٧٣)، واتە: یازدە ئایەت، باسی قیامەت و، سەرەنجامی شوومی مونافیقان و کافران و، ئامۆژگاریی کردنی بڕواداران کە لەوانە نەبن کاتی خۆی پێغەمبەرەکانیان ئەزیەتدا، وەك بەنی ئیسرائیل کە مووسایان ئەزیەتدا، ئەوانیش پێغەمبەری خۆیان ﷺ ئەزیەت نەدەن و، باسی ئەوە کە خوا سپاردە (أمانة)ی بە ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان سپاردوە، بەڵام نەیانتوانیوە هەڵیبگرن و مرۆڤ هەڵیگرتوەو، دوایی سەرەنجامی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو ئەمانەتەی خوادا، خوای پەروەردگار ڕوونی کردۆتەوە.

**ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سـوورەتەو ڕەواندنەوەی تەم و مژێك:**

سەرەتـــا دەڵـێم:

بۆیـە ئـەم باسـە دەورووژێنـم، چونکـە چەنـد دەقێـك لـەو بـارەوە هـەن، کـە ئیشـکال و دوو دڵیـی و گومـان دروسـت دەکـەن، لەسـەر ئـەم سـوورەتی ئەحـزاب، هەروەهـا لەسـەر کـۆی قورئـان، هەندێك لەوانـەی کـە ناحـەزی ئیسـلام و قورئانـن، هەندێـك لـەو جـۆرە دەقانـە دێنـن و، دەیانـەوێ بیانکەنـە هۆکارێـك و بیانـوو پاسـاوێك، بـۆ خسـتنە ژێر پرسـیاری کـۆی قورئـان و سـوورەتەکان و ئایەتەکانـی قورئان.

ئنجـا ئێمـە سـەرەتا ئـەو دەقانـەی کـە ئـەو ئیشـکالە دروسـت دەکـەن دێنیـن، دوایـی ڕای زانایـان دێنیـن، ڕای خۆشـمان لـەو بـارەوە دەڵێیـن و، ئێواخنـی ڕای ئـەو زانایانـە دەکەیـن، کـە بەرپەرچـی ئـەو جـۆرە قسـانە دەدەنـەوە:

**١- (عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ، قَالَ: قَالَ لِي أُبَيُّ بْنُ كعب ﷺ كأين تَقْرَأُ سُورَةَ الْأَحْزَابِ؟ أَوْ كَأَيِّنْ تَعُدُّهَا؟ قُلْتُ: ثَلَاثًا وَسَبْعِينَ آيَةً، فَقَالَ: أَقَطُّ؟ لَقَدْ رَأَيْتُهَا وَإِنَّهَا لَتُعَادِلُ سُورَةَ الْبَقَرَةِ، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، وَلَقَدْ قَرَأْنَا فِيهَا «الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا فَارْجُمُوهُمَا أَلْبَتَّةَ نَكَالًا مِنَ اللهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ» فَرُفِعَ فِيمَا رُفِعَ) (أخرجه عبد الرزاق: ١٣٣٦٣، والطيالسي: ٥٤٠، وأحمد: ٢١٢٤٥، والنسائي في الكبرى: ٧١٥٠، وابن حبان: ٤٤٢٩، والحاكم: ٨٠٦٨، وَالضِّيَاءُ فِي الْمُخْتَارَةِ: ١١٦٦، قَالَ ابْنُ كَثِيرٍ: وَإِسْنَادُهُ حَسَنٌ).**

واتـە: زیـڕڕی کـوڕی حوبەیـش، دەڵـێ: ئوبـەی کـوڕی کەعـب ﷺ (کـە یەکێکـە لـە هـاوەڵان، زۆر شـارەزا بـووە لـە قورئـان) پێیگوتـم: تـۆ سـوورەتی ئەحـزاب چەنـد دەخوێنـی؟ یـان بـە چەنـد ئایەتـی دەژمێـری؟ گوتـم: حەفتـاو سـێ ئایـەت، گوتـی: هـەر ئەوەنـدە؟ مـن سـوورەتی ئەحزابـم بینـی کـە هێنـدەی سـوورەتی بەقـەرە دەبـوو، یاخـود زیاتـر لـە سـوورەتی بەقـەرەش دەبـوو، خوێندمانـەوە لـە سـوورەتی ئەحزابـدا: (**الشَّـيْخُ وَالشَّـيْخَةُ إِذَا زَنَيَا فَارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ نَكَالًا مِـنَ اللَّـهِ وَاللَّـهُ عَزِيـزٌ حَكِيمٌ**)، واتـە: (پیـاوی بـە تەمـەن و ئافرەتـی بـە تەمـەن، ئەگـەر زینایـان کـرد، بـەرد

بارانیان بکەن بە یەکجارەکیی، ئەوە تەمبێکردنە لە لایەن خواوە، خواش زاڵی کارزانە)، ئەم ئایەتەش بەرز کرایەوەو نەسخ کرایەوە، لە میانی ئەوەدا کە نەسخ کراوەتەوە.

ئنجا ئەمە هەرچەندە (ابْنُ كَثِير) دەڵێ: سەنەدەکەی باش (حَسَن)ە، بەڵام دوایی قسەی دیکە لەو بارەوە دەکەین.

٢- [عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَتْ سُورَةُ الأَحْزَابِ تُقْرَأُ فِي زَمَانِ النَّبِيِّ ﷺ مِائَتَيْ آيَةٍ، فَلَمَّا كَتَبَ عُثْمَانُ الْمَصَاحِفَ لَمْ يُقَرِّرْ مِنْهَا إِلَّا عَلَى مَا هُوَ الآنَ] (أخرجه أَبُو عُبَيْدٍ فِي الْفَضَائِلِ وَابْنُ الأَنْبَارِيِّ، وَابْنُ مَرْدَوَيْهِ)[1].

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: سووڕەتی ئەحزاب لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ بە دووسەد ئایەت دەخوێندرایەوە، کە ئێستا حەفتاو سێیە، {واتە: (١٢٧) ئایەتی لێ دیار نەماوە}، کاتێك عوسمان موصحەفەکانی نووسینەوە، {ئەو چەند موصحەفە کە هەر یەکەی بۆ شارێك نارد}، تەنیا ئەوەی کە ئێستا هەیە لەم سووڕەتە، تەنیا ئەوەندەی تێدا تۆمار کرد.

(ئەمەش گوایە دایکمان عائیشە گوتوویەتی)!!

٣- [عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ لِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: كَمْ تَعُدُّونَ سُورَةَ الأَحْزَابِ؟ قُلْتُ: ثِنْتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا وَسَبْعِينَ قَالَ: إِنْ كَانَتْ لَتُعَادِلُ سُورَةَ الْبَقَرَةِ، وَإِنْ كَانَ فِيهَا لَآيَةُ الرَّجْمِ] (أخرجه وَابْنُ مَرْدَوَيْهِ)[2].

واتە: حوزەیفە ﷺ، دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، پێی گوتم: سووڕەتی ئەحزاب لە لای ئێوە بە چەند ئایەتی دەژمێرن؟ گوتم: حەفتاو دوو یان حەفتاو سێ، گوتی: سووڕەتی ئەحزاب بە ئەندازەی سووڕەتی بەقەڕە بوو، ئایەتی ڕەجمیشی تێدا بوو.

---

(١) فتح القدير الشوكاني ج:٤، ص: ٣١٣، ٣١٤.

(٢) فتح القدير الشوكاني ج:٤، ص: ٣١٣.

(هەڵبەتە دەقی دیکەش هەن، بەڵام ئەو سێیەم لێ بە نموونە هێنانەوە).

(ابْنُ كَثِيرٍ)، لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (وَهُوَ يَقْتَضِي أَنَّهُ قَدْ كَانَ فِيهَا قُرْآنٌ ثُمَّ نُسِخَ لَفْظُهُ وَحُكْمُهُ أَيْضًا، وَاللَّهُ أَعْلَمُ)، دەڵێ: ئەم دەقانە ئەوە دەگەیەنن کە لە سوورەتی ئەحزاب دا، قورئانی دیکەش هەبووە، غەیری ئەو حەفتاو سێ ئایەتە، بەڵام دوایی بێژەکەشی و حوکمەکەشی نەسخ کراوەتەوەو خواش زاناترە.

## قسەی زانایان:

من قسەی دوو لە زانایانم بە نموونە هێناونەوە:

ڕای یەکەم:

(جمال الدین قاسمي) لە تەفسیری خۆی دا[1] دەڵێ: (قُلْتُ: كَانَ يَصِحُّ هَذَا الإِقْتِضَاء، لَوْ كَانَ هَذَا الأَثَرُ صَحِيْحَاً، أَمَا وَلَمْ يُخْرِجْهُ أَرْبَاب الصِّحَاح، فَهُوَ مِنَ الضُّعْفِ بِمَكَان)، دوای ئەوەی قسەکەی (ابْنُ كَثِيرٍ)، دێنێ کە دەڵێ: ئەم دەقانە ئەوە دەگەیەنن و خوازیاری ئەوەن، کە قورئانی دیکە لە سوورەتی ئەحزابدا هەبووە، بەڵام دوایی بێژەکەشی و حوکمەکەشی هەڵوەشێنراوەتەوە، دەڵێ: ئەو خواستنە کاتێك ڕاست دەبوو کە ئەو شوێنەوارانە(ی سێیانمان لێ بە نموونە هێنایەوە)، لە ڕووی سەنەدەوە ڕاست بوونایە، بەڵام مادام خاوەنانی فەرمووده ڕاستەکان نەیانهێناون، کەواتە: ئەو شوێنەوارە یەکجار بێهێزە، واتە: هی ئەوە نیە کە بڵێین: ئەو شوێنەوارە خوازیاری ئەوەیەو، بە پشت بەستن بە هێنانی ئەو دەقانە، ئێمە هەڵوەستەیەك وەربگرین بەرانبەر بە سوورەتی (الأَحْزَابِ)، یان بەرانبەر بە حوکمێکی شەرعیی، کە بەرد بارانکردنی پیاوو ئافرەتی زیناکەرە، کە حوکمێکی بەردەوام بێ، ئەگەرنا وەك پێشتر لە سوورەتی تەفسیری (النور)دا باسمان کرد، ئەو حوکمە بووەو پێغەمبەر ﷺ کاری پێکردوە، بەڵام ئێستا هەبێ و بەردەوام بێ، بە بیانووی ئەوەی کە وەختی خۆی لە قورئاندا بووە، ئەوە

---

(١) محاسن تأويل: ج٨، ص ٢٢١.

کاتێـك دەبـێ کـە ئـەم شـوێنەوارە، ئـەم دەقانـە لـە ڕووی سـەنەدەوە ڕاسـت بـن، بـەڵام هیـچ کام لەوانـەی لـە فەرمـوودەو دەقـە ڕاسـتییەکانیان هێنـاون، نەیانهێنـاوە.

ڕای دووەم:

(محمـد الطاهـر بـن عاشـور) لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا[1]، دەڵـێ: (إنْ صَحَّ عَـنْ أُبَيٍّ مـا نُسِـبَ إلَيْـهِ، فَـما هـو إلّا أنَّ شَـيْئًا كَثِيرًا مِـنَ القُـرْآنِ كانَ أُبَيٌّ يُلْحِقُـهُ بِسُـورَةِ الأحْـزابِ، وَهُـوَ مِـنْ سُـوَرٍ أُخْـرى مِـنَ القُـرْآنِ، مِثْـلَ كَثِـيرٍ مِـن سُـورَةِ النِّسَـاءِ الشَّـبِيهِ بِبَعْـضِ مـا في سُـورَةِ الأحْـزابِ أغْراضًـا ولَهْجَـةً، مِـمّا فِيـهِ ذِكْـرُ المُنافِقِـينَ واليَهُـودِ، فَـإنَّ أصْحَـابَ رَسُـولِ اللَّـهِ لَـمْ يَكُونُـوا عَـلى طَرِيقَـةٍ واحِـدَةٍ في تَرْتِيـبِ آيِ القُـرْآنِ، ولا في عِـدَّةِ سُـوَرِهِ وتَقْسِـيمِ سُـوَرِهِ كَـما تَقَـدَّمَ في المُقَدِّمَـةِ الثّامِنَـةِ، ولا في ضَبْـطِ المَنْسُـوخِ لَفْظُـهُ، كَيْـفَ وقَـدْ أجْمَـعَ حُفّـاظُ القُـرْآنِ والخُلَفـاءُ الأرْبَعَـةُ، وكافَّـةُ أصْحـابِ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ إلّا الَّذِيـنَ شَـذُّوا، عَـلى أنَّ القُـرْآنَ هـو الَّـذِي في المُصْحَـفِ، وأجْمَعُـوا في عَـدَدِ آيـاتِ القُـرْآنِ عَـلى عَـدَدٍ قَرِيـبٍ بَعْضُـهُ مِـن بَعْـضٍ، ولَيْـسَ بَعْـدَ إجْـماعِ أصْحـابِ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ عَـلى مُصْحَـفِ عُثْـمانَ، مَطْلَـبٌ لِطالِـبٍ، وأمّـا الخَـبَرُ عَـنْ عائِشَـةَ، فَهـو أضْعَـفُ سَـنَدًا وأقْـرَبُ تَأْوِيـلًا، فَـإنْ صَـحَّ عَنْهـا، ولا إخالُـهُ، فَقَـدْ تَحَدَّثَـتْ عَـنْ شَيْءٍ نُسِـخَ مِـنَ القُـرْآنِ كانَ في سُـورَةِ الأحْـزابِ. وفي الكَشّـافِ: وأمّـا مـا يُحْـكى أنَّ تِلْـكَ الزِّيـادَةَ الَّتِـي رُوِيَـتْ عَـنْ عائِشَـةَ كانَـتْ مَكْتُوبَـةً في صَحِيفَـةٍ في بَيْـتِ عائِشَـةَ فَأكَلَتْهـا الدّاجِـنُ، أي الشّـاةُ، فَمِـن تَألِيفـاتِ المَلاحِـدَةِ والرَّوافِـضِ. ووَضْـعُ هَـذا الخَـبَرِ ظاهِـرٌ مَكْشُـوفٌ، فَإنَّـهُ لَـوْ صَـدَقَ هَـذا، لَكانَـتْ هَـذِهِ الصَّحِيفَـةُ قَـدْ هَلَكَـتْ في زَمَـنِ النَّبِـيِّ ﷺ أوْ بَعْـدَهُ، والصَّحابَـةُ مُتَوافِـرُونَ، وحُفّـاظُ القُـرْآنِ كَثِـيرُونَ، فَلَـوْ تَلِفَـتْ هَـذِهِ الصَّحِيفَـةُ، لَـمْ يُتْلَـفْ مـا فِيهـا مِـن صُـدُورِ الحُفّـاظِ، وكَـوْنُ القُـرْآنِ قَـدْ تَـلاشى مِنـهُ كَثِـيرٌ، هـو أصْـلٌ مِـن أُصُـولِ الرَّوافِـضِ، لِيَطْعَنُـوا بِـهِ في الخُلَفـاءِ الثَّلاثَـةِ، والرّافِضَـةُ يَزْعُمُـونَ أنَّ القُـرْآنَ مُسْـتَوْدَعٌ عِنْـدَ الإمـامِ المُنْتَظَـرِ، فَهـو الَّـذِي يَـأْتِي بِالقُـرْآنِ وِقْـرَ بَعِـيرٍ).

واتـە: ئەگـەر ئـەوەی پـاڵ دەدرێتـە لای ئوبـەی سـەنەدەکەی ڕاسـت بـێ، (یانـی: کـە ڕاسـت نیـە)، تەنیـا ئەوەیـە کـە دەبـێ بەشـێکی زۆر لـە قورئـان، ئوبـەی کاتـی

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢١، ص ٢٤٦، ٢٤٧.

خـۆی لکاندوویەتـی بـە سـوورەتی ئەحزابـەوە، کـە ئـەو بەشـە زۆرەی قورئـان هـی سـوورەتەکانی دیکـە بـووە، بـۆ وێنـە: وەك زۆرێـك لـە سـوورەتی (النسـاء)، کـە دەشـوبهێتە هەندێـك لـەوەی لـە سـوورەتی ئەحزابـدا هاتـوە، هـەم لـە ڕووی نێوەڕۆکـەوە، هـەم لـە ڕووی شـێوەی دەربڕینـەوە، کـە باسـی موونافیقـەکان و باسـی جوولەکانـی تێدایـە، هاوەڵانـی پێغەمبـەری خـواش ﷺ هەموویـان بـە یـەك شـێواز ئایەتەکانـی قورئانیـان ڕیزبەنـد نەدەکـردن، هەروەهـا لـە ژمـارەی سـوورەتەکانیش دا، وەك یـەك مامەڵەیـان نەدەکـرد، هەروەهـا دابەشـکردنی ئایەتـەکان بـۆ سـوورەتەکان وەك یـەك نەبـوون، هـەر کامێکیـان ئەوەنـدە قورئانـەی کـە خـۆی لەبـەری بـووە، بـە کۆشـش و ئیجتیهـادی خـۆی، ئایەتەکانـی پێکـەوە نووسـیون.

لێرەدا منیش قسەیەك دەکەم:

عوسـمان (خـوا لێـی ڕازی بـێ)و، پێـش عوسـمان لـە سـەردەمی ئەبووبەکـردا (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، وەك لـە کتێبـی: (بـا لـە خزمـەت قورئانـدا بیـن!)، هەروەهـا دواتـر لـە بابـەتی: (قورئـانی مـەزن لـە نـۆزدە تـەوەردا)، بـە درێژیـی و بـە ڕوونیـی دەربـارەی چۆنیەتیـی لەبەرکـردن و نووسـینەوەی قورئـان و، کۆکردنـەوەی لـە نێـو دوو بەرگـی موصحەفـدا، باسـم کـردوە، کـە کاتـی خـۆی عومـەر ﷺ، پێشـنیار دەکات بـۆ ئەبـوو بەکـر: بـا قورئـان بخەینـە دوو توێـی کتێبێکـەوە (مصحـف)! ئەبـوو بەکریـش ﷺ، دەڵـێ: چـۆن شـتێك بکـەم کـە پێغەمبـەر ﷺ نەیکردبـێ؟ ئەویـش دەڵـێ: وەڵڵاهـی خێـرە، ئیـدی عومـەر چەنـد جارێـك داوای لـێ دەکات، تاکـو ئەبـوو بەکریـش ﷺ، سـینەی بـۆ ئـەو پێشـنیارە گوشـاد دەبـێ و، قورئـان دەخەنـە نێـوان، واتـە: سـوورەتەکانی قورئـان بـە هەمـوو ئایەتەکانیانـەوە، کـە لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەردا وەك قۆناغـی یەکەمـی کۆکردنـەوەی قورئـان، کۆکراونـەوە، دەخەنـە نێـوان دوو بەرگـەوە، کـە ئـەوە قۆناغـی دووەمـی کۆکردنـەوەی قورئـان بـوو لەسـەردەمی ئەبـوو بەکرداو بـە پێشـنیاری عومـەر (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، هەمـوو سـوورەتەکان خرانـە نێـوان دوو بەرگـەوە، قۆناغـی سـێیەمی کۆکردنـەوەی قورئـان ئەوەبـوو کـە لـە ڕۆژگاری عوسـمان دابـوو ﷺ، چونکـە هـاوەڵان - وەك ئـەم قسـەیەی (محمـد

الطاهر بن عاشور) ئاماژەی پێ دەکات - هەندێکیان ڕەنگە هەندێك پەروەردەی پێغەمبەریان ﷺ وەك شەرح و تەفسیر لەگەڵ ئایەتەکان نووسیبێ، هەندێکیان هەندێك ئایەتی سووڕەتی دیکەیان لەگەڵ تێکەڵ کردوە، بۆیە لە سەردەمی عوسماندا ﷺ، لیژنەیەکی شەش کەسیی لە شارەزایان لە قورئان و ئەوانەی قورئانیان لەبەرەو، زۆر جێی متمانە بوون پێك دێنن، کە یەکێك لەوانە زەیدی کوڕی سابیت بوو، ئەو بەرپرسی لیژنەکە بوو، زۆریش شارەزا بووە لە قورئان و پێغەمبەر ﷺ شایەدیی بۆ داوە، ئنجا ئەو لیژنە شەش کەسییە بە هەموو سووڕەتەکاندا دەچنەوەو، جۆرێك لە تێکەڵیی کە لە هەندێك لەو نووسراوانەی لە لای هەندێك لە هاوەڵانە لایدەبەن و، ئەو سەدو چواردە سووڕەتە، بەو شەش هەزارو دوو سەدو سی و شەش ئایەتەوە، کە ئێستا لەبەر دەستی ئێمەدا هەیە، دەیخەنە نێوان دوو توێی موصحەفێکەوە.

ئنجا بۆ ڕیزبەندیی سووڕەتەکانیش، هەندێ لە سووڕەتەکان لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ ڕیزبەند کراون، بۆ وێنە: هاوەڵێك دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد، دوای فاتیحە سووڕەتی (الْبَقَرَةِ)ی خوێند، دوایی (آل عمران)، دوایی (النساء)، ئەمە جۆرێك لە ڕیزبەندیی لە سووڕەتەکاندا هەبووە، بەڵام لەسەر ڕیزبەندیی هەندێ لە سووڕەتەکان، جۆرێك لە مشتومڕ بووە، بۆیە من لەو کتێبەدا کە ئاماژەم پێدا: (با لە خزمەت قورئاندا بین!)، هەروەها لە بابەتی: (قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەردا)، وەك تێکڕای زانایان ئەو ڕایەم تەبەننیی کردوە، کە ڕیزبەندیی ئایەتەکان هەمووی تەوقیفییە، یانی: خوا چۆنی فەرمووەو پێغەمبەر ﷺ چۆنی بۆ داناون، ئاوا بەو شێوەیە بووەو، بواری ئیجتیهادو بۆچوون و ڕای کەسی تێدا نەبووە، بەڵام ڕیزبەند کردنی سووڕەتەکان، کام لە پێش کامەوە بێ؟ بەشێکی تەوقیفیی بووە واتە: بە وەحیی خواو بە فەرمانی ڕاستەوخۆی پێغەمبەر ﷺ بووە، بەڵام بەشێکیشی دەتوانین بڵێین: تەوفیقیی بووە، واتە: بە ئیجتیهادو ڕای هاوەڵان، کە بە تەئکید ئەوانیش هەوڵیانداوە بزانن و ئەوە ڕەچاو بکەن: ئەگەر شتێك لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەو بارەوە بیسترابێ، کام سووڕەت بخەنە

پێش کام سوورەت؟ یاخود هەندێ ئیعتیباری دیکەی وەك قەبارەی سوورەتەکان، یاخود نێوەڕۆك و پێکەوە گونجانیان، بۆ وێنە: (الأنفال) و (التوبة)، کە (التوبة) لە (الأنفال) زیاترە، بەڵام ئەویان خستۆتە پێش، چونکە ڕایەك هەبووە کە هەردووکیان یەك سوورەتن، هەر بۆیە لە سەرەتای سوورەتی (التوبة)دا، (بسم الله الرحمن الرحيم) نەهاتوە، (کەواتە: ئەوەی لە سەردەمی عوسماندا (خوا لێی ڕازی بێ) کراوە، ئەوە بووە کە ئەم موصحەفەی ئێستا لەبەر دەستی ئێمە دایە، بەو شێوەیە بێ، کە هەر هەمان قورئانی ڕۆژگاری پێغەمبەرو ئەبووبەکرو عومەرە، بەڵام هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەندێکیان ئیجتیهادیان کردوە کە هەندێك لە ئایەتی سوورەتێکیان لەگەڵ سوورەتێکی دیکەدا تێکەڵ کردوون و، هەندێك سوورەتیان پێش هەندێك سوورەتان خستوون، هەروەها هەندێك ڕای خۆیان، شەرح و تەفسیری هەندێك لە ئایەتەکانیان، خستوونە نێو ئایەتەکانەوە، وەك لە تەفسیرەکاندا ئەوە هەیە، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: ئەو ئایەتە ئاوا دەخوێنرێتەوە، بۆ خۆی دوو سێ وشەی لێ زیاد کردوون، کە مەبەست پێی چەمك و ڕوونکردنەوەی مانای ئایەتەکان بووە].

(إبن عاشور) دەڵێ: چۆن دەگونجێ سوورەتی ئەحزاب زیادەی بووبێت و، ئێستا دیار نەمابێ، یان عوسمان (خوا لێی ڕازی بێ) تۆماری نەکردبێ؟، لە حاڵێکدا کە هەموو لەبەرکەرەکانی قورئان (حُفَّاظ القرآن) و، هەر چوار خەلیفە ڕاشیدەکان و، تێکڕای هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ مەگەر ئەوەی ڕیزپەڕ بووبێ، هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوون، کە قورئان ئەوەیە لە موصحەفدایە، [کە بە سوورەتی (الفاتحة) دەست پێدەکات و، بە سوورەتی (الناس) کۆتایی پێدێت، سەدو چواردە (١١٤) سوورەتەو، شەش هەزارو دوو سەدو سی و شەش (٦٢٣٦) ئایەتەو، حەفتاو حەوت هەزارو سەدو نەوەد (٧٧١٩٠) وشەیەو، سێ سەدو بیست و یەك هەزارو چوار سەدو سی و نۆ (٣٢١٤٣٩) پیتە، یانی: وشەو پیتەکانی قورئانیشیان سەرژمێر کردوە][1]، هەروەها یەکدەنگ بوون لەسەر

---

(١ ) ئەوەی نێوان ئەو دوو کەوانەیە،ڕای خۆمە بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست.

ژمـارەی ئایەتـەکان، ژمارەکانـی هەندێکیـان لـە هەندێکیـان نیزیکـن، [یەکێکیـان گوتوویەتـی: ئـەو سـوورەتە حەفتـاو دوو ئایەتـە، یەکێکـی دیکـە گوتوویەتـی: حەفتـاو سێیە، وەك گوتـم: درێژیـی و کورتیـی ڕستەکان بـووە بۆتـە هـۆی جیاوازیـی ژمـارەی ئایەتەکانـی سـووڕەتێك، (دوایـی (**محمـد الطاهـر بـن عاشـور**) دەڵـێ:] لـە دوای یەکدەنگیـی هاوەڵانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەسـەر موصحەفـی عوسـمان، هیـچ داواکارییـەك بـۆ هیـچ داواکارێـك نامێنێتـەوە، (واتـە: هیـچ قسـەیەك نامێنێتـەوە بـۆ هیـچ کەسـێك)، ئنجـا ئـەو هەواڵـەش کـە لە عائیشـەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، هێنراوە، سـەنەدەکەی زۆر بێهێـزە، ئەگـەر گریـمان سـەنەدەکەیش بەهێـز بـێ، کـە (**ابْنُ كَثِيرٍ**) سـەنەدەکەش بـە بـاش دانـاوە، ئـەوە تەئویـل کردنەکـەی ئاسـانەو نیزیکـە، ئـەوە دیـارە دایکـمان عائیشـە قسـەی کـردوە لـە بـارەی هەندێـك لـە قوڕئانـەوە، کـە نەسـخ بۆتـەوە لـە سـووڕەتی (**الأحـزاب**)دا، [واتـە: کاتـی خـۆی بـووە، بـەڵام نەسـخ بۆتـەوە، کـە مـن پێـم وانیـە کاتـی خۆشـی هیـچ قوڕئـان نەسـخ بوبێتـەوە، بـەڵام ئەگـەر ئـەو ڕایـە ڕاسـتیش بـێ، گرنـگ ئەوەیـە ئێسـتا هیـچ ئایەتێـك لـە قوڕئانـدا نیـە کاری پـێ نەکـرێ و لابرابـێ و نەسـخ کرابێتـەوە].

لـە تەفسـیری (**الكَشّافِ**)یشـدا هاتـوە، دەڵـێ: ئـەو زیادەیـەش - لـە سـووڕەتی تەحـزاب - کـە گێڕدراوەتـەوە لـە عائیشـەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، گوایـە لـە لاپەڕەیەکـدا نـووسراوەو لـە ماڵـی عائیشـەدا بـووە، دوایـی ئاژەڵێکـی دابەسـتە، لـە ماڵـی ئەوانـدا ئـەو پەڕەیـەی خـواردوە کـە ئـەو قوڕئانـەی تێـدا نووسراوەتـەوە، [ئـەو زیادەیـەی گوایـە لـە سـووڕەتی (**الأحـزاب**)دا بـووەو ئێسـتا تێیـدا نەمـاوە]، ئـەوە هەڵبەسـتراوی ڕافیـزەکان (**روافِـضِ**)ە، (شـیعەی ڕافیـزە) کـە تانـە لـە قوڕئـان دەدەن.

هەڵبەسـترانی ئـەو هەواڵـەش زۆر ئاشـکراو دیـارە، چونکـە ئەگـەر ئـەو هەواڵـە ڕاسـت بووایـە، دەبووایـە ئـەو لاپەڕەیـە کـە ئـەو ئاژەڵـە خواردوویەتـی لـە ماڵەکـەی عائیشـەدا (خـوا لێـی ڕازی بێ)، لە سـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ، یاخود دوای سـەردەمی پێغەمبـەر ﷺ بووبـێ، ئـەو کاتـەش هـاوەڵان زۆر بـوون و، لەبەرکەران(**حفـاظ**)ی قوڕئانیـش زۆر بـوون، ئنجـا ئەگـەر لاپەڕەکـە فەوتـاوە، بـەڵام ئـەوەی لـە سـینەو دڵـی

هاوەڵاندا بووە هەر ماوە، (دووبارە دەیاننووسیەوە)، بەڵام کە هیچ کەس باسی ئەوەی نەکردوە، دیارە ئەوە هەواڵێکی هەڵبەستراوە بۆ تانەدان لە قورئان.

ئەو قسەیەش کە گوایە قورئان زۆرێکی لێ فەوتاوە، ئەمە یەکێکە لە بنەمایەکانی شیعەی ڕافیزە، بۆ ئەوەی تانە بدەن لە سێ خەلیفە ڕاشیدەکان، [کە گوایە ئەوان وایانکردوە، بەشێك لە قورئان، یان زۆرێك لە قورئان بفەوتێ، لەبەر ئەوەی مەدحی عەلی تێدا بووەو، زەم و سەرزەنشتی ئەو سێ خەلیفەیەی تێدا بووە (خوا لێیان ڕازی بێ)][1]، شیعەی ڕافیزە گومانیان وایە، دەڵێن: قورئان لە لای پێشەوای چاوەڕوانکراو (المَهْدِي المُنْتَظَر)ە، ئەوە کە دوایی قورئان دێنێ باری یەك حوشترە.

دەڵێن: ئەو قورئانەی ئێستا لەبەر دەستی مسوڵماناندا هەیە، کە شەش هەزارو دوو سەدو سی و شەش ئایەتە، ئەوە کەمێکی قورئانەو (المَهْدِي المُنْتَظَر)، لە ئاخیر زەماندا کە دێت، قورئان دێنێ، قورئانە ئەصڵییەکە، باری یەك حوشترە!.

ئنجا خۆشم دەڵێم:

یەك: لە ڕاستییدا هاوەڵانێك (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو هەموو مەدح و ستایشەی کردوون و، خواش پێش پێغەمبەر ﷺ ئەو هەموو مەدح و ستایشەیان دەکات: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ ...﴿١٨﴾﴾الفتح، واتە: بە دڵنیایی خوا ڕازی بوو لەو بڕوادارانەی کە لە ژێر درەختەکەدا پەیمانیان لەگەڵ تۆدا بەست، خوا زانی چی لە دڵیاندا هەیە، بۆیە ئۆخژن و ئارامیی دابەزاندە سەریان...

هاوەڵانێکی بەڕێز کە ژمارەیان (١٤٠٠) کەس بوو لە ژێر درەختی (رضوان) دا، کە چوار خەلیفە ڕاشیدەکان هەر چواریان لە نێویان دا بوون، کە خوا ئەو هەموو مەدح و ستایشەیان دەکات، پاشان هاوەڵانی بەرزی پێغەمبەر ﷺ چ

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

بەرژەوەندییەکان لەوەدا بووەو چۆن ئیمان و دینیان ڕێ دەدات، ئایەتێکی خوا نادیدە بگرن، ئەوە بە ڕاستیی گومانێکی زۆر خراپەو، لە دڵێکی زۆر پیس و ڕەشەوە دێ و، لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشاکردنی ئەو هاوەڵە بەڕێزانەیە (خوا لێیان ڕازی بێ).

دوو: ئەو گێڕدراوانە، سەنەدو نێوەڕۆکیشیان زۆر لەوە بێهێزترەو کەمترە، کە پشتیان پێ ببەسترێ و، ڕایەکیان لێ وەربگیرێ، کە پێچەوانەی ڕای هەزاران لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بێ، بە پیاوو ئافرەتەوە، کە هەموو قورئانیان لەبەر بووە، تەنانەت ئەو پێشنیارەی عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، کاتی خۆی بۆ ئەبوو بەکری کرد، کە سوورەتەکانی قورئان بخەنە نێوان دوو بەرگەوە، کە هەر هەبوون، بەڵام لە لەوحی نووسراوو چەرمی نوسراوو...هتددا بوون، بەڵام نەخرابوونە نێوان دوو بەرگ و نەکرابوون بە موصحەف، پێشنیارەکەی لەوەوە هات، کە لە جەنگەکانی هەڵگەڕاوان (حُرُوب الرِدَّة)دا، ئەوانەی کە قورئانیان لەبەر بوو، ئەهلی قورئان، شارەزایانی قورئان ئەوانە سەرەڕمی سوپای ئیسلام بوون، زۆریان لێ کوژران، گوتراوە: (فَلَمَّا اسْتَحَرَّ القَتْلُ بِالقُرَّاءِ)، کاتێك قورئان خوێنەکان، قورئان لەبەرەکان، شارەزایانی قورئان کە سەرە ڕمی سوپای ئیسلام بوون، نەدەگەڕانەوە، فیداکاربوون، ئەوانە زۆریان لێ کوژرا، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: ئاوا بچێتە دوێ و، ئەو جەنگانە بەردەوام بن، سەرەنجام هەموو ئەوانەی کە شارەزای قورئانن، ڕەنگە زۆریان شەهید ببن، بەڵێ قورئان نووسراوەتەوە، بەڵام ئەوە دوایی مەترسیی هەیە بۆ سەر ئایندەی پارێزرانی قورئان، کەواتە: ئەو هەموو هاوەڵانەی (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە هەموو قورئانیان لەبەر بووە، ئێستا ڕیوایەتێك و شوێنەوارێکی کێویلکە، کە سەنەدێکی وای نیە پشتی پێ ببەسترێ، چۆن دژایەتیی هەڵوێستی ئەو هەموو هاوەڵانەی (خوا لێیان ڕازی بێ) پێ دەکرێ؟! بە تایبەت چوار خەلیفە ڕاشیدەکان، کە لە سەرووی ئەو شوبهەو دوو دڵیی و گومانانەوەن.

سێ: پاشان هەندێك لە شیعەی ڕافیزە کە وا دەڵێن[1]، بێگومان عەلی کوڕی ئەبی تاڵیبیش (خوا لێی ڕازی بێ)، هەر لەسەردەمی ئەو سێ خەلیفە ڕاشیدانەدا بووە، ئنجا ئەگەر

---

(١) کە ئێستا ئەو ڕایە لە نێو شیعەدا شتێکی ڕیزپەڕو دەگمەنە.

سوورەتێکیان لاداوە، ئایەتێکیان لاداوە، ئەدی بۆچی عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕەخنەکی نەگرتوە؟ بەڵکو لە هەندێك لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتوە، کە عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، کە ماوەیەك دواکەوتوە لە بەیعەت پێدانی ئەبوو بەکر، شەش مانگێك دوا کەوتوە، گوتوویەتی: من خەریکی قورئان بووم کۆمدەکردەوەو، سوورەتەکانم ڕیز بەند دەکرد، ئنجا ئەگەر قورئان کەم و زیادی تێدا هەبووایە، ئەو کاتە هەڵوێستی دەبوو.

بەڵام وەك ئەمانەتێکی عیلمیی دەڵێم: من سەرنجی سێ لە تەفسیری شیعەکانم دا کە هەر ئەو سێ تەفسیرەشم لەبەر دەستدان، لەم شوێنەدا لە بارەی سوورەتی (الأحزاب)ەوە، ئەوەم تێدا نەدیتن کە بڵێن: سوورەتی (الأحزاب) زیاتر بووەو، کەمتر نووسراوە، یاخود لێی نایدەگیراوە، هەروەها بە نسبەت کۆی قورئانیشەوە تێمدا نەبینین، هەر کام لە:

١- تەفسیری (المیزان)ی (الطبا طبائي).

٢- تەفسیری (الكاشف)ی (جواد محمد مغنية).

٣- تەفسیری (نمونه)، لە ژێر سەرپەرشتی ناصری مەکاریمی شیرازیی، کە بە فارسیی نووسراوەو بیست و حەوت بەرگە.

لە هیچ کام لەو تەفسیرانەدا دوورو نیزیك ئەوەم نەبینی، ئاماژە بەوە کرابێ کە سوورەتی (الأحزاب)، لەوەی کە ئێستا هەیە، لەو حەفتاو سێ ئایەتە زیاتر بووەو، هەندێکی لێ فەرامۆش کراوە، یاخود لێ نەسخ کراوەتەوە، یاخود لێی نادیدە گیراوە، شتی وام نەبینی.

بەڵێ دەزانم کە هەندێك لە شیعەی دوازدە ئیمامیی ئەو ڕایەیان هەیەو، لە کتێبەکانیاندا ئەوە باسکراوە، بەڵام لە نێو خۆشیاندا لەو بارەوە مشتومڕ هەیە، چونکە بە تەئکید هەر کەسێك باسی کەم و زیادیی لە قورئاندا بکات، بۆی بە کوفر لە قەڵەم دەدرێ، دوای ئەوەی خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾الحجر، واتە: ئێمە خۆمان زیکرمان دابەزاندووەو

خۆشـمان پارێزەرینـی، هـەر کەسـێك بڵـێ: قورئـان نەپارێـزراوە، مانـای وایـە ئـەو فەرمایشـتەی خـوا بـە درۆ دادەنـێ و بـەس بـەوە کافـر دەبـێ، جگـە لـەوەی کـە تانەدانـە لـە پێغەمبـەر ﷺو هەمـوو هاوەڵانـی پێغەمبـەر (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، بـە چـوار خەلیفەکانـەوە بـە عەلـی کـوڕی ئەبـی تاڵیبـەوە لـە نێویانـدا، ئنجا ئەگـەر ئـەوە کوفـر نەبـێ، بێگومـان کوفـرو کافـر بـوون هـەر نیـە، چونکـە تانـەدان لـە یـەك حوکمـی شـەریعەت و لـە یـەك ئایـەت، بە کوفـر لە قەڵـەم دەدرێ، چ جای قسـەیەکی هێنـدە زل بکـرێ! بـە هـەر حـاڵ ئێسـتا شـیعەی دوازدە ئیمامیـی کەمتر وایـە خۆیـان لـەو قسـەیە بکەنـە خـاوەن، دەڵێـن: ئـەوە قسـەی هەنـدێ لـە خەڵکـی پێشـوو بـووە، هەندێـك لـە (غُـلاة) ئەوانـەی زۆر تێپەڕێنـەڕ بـوون و، لـە بازنـەی ئیسـلام چوونـە دەرێ، قسـەی ئـەوان بـووە، بـەڵام ئەوانـەی ئێسـتا بـە تایبـەت شـیعەی ڕۆژگاری ئێمـە، مەگـەر چـۆن دەنـا لێیـان نەبیسـتراوە، تانـە لـە قورئـان بـدەن.

ئنجـا ئـەو (المَهْـدِي المُنْتَظَـر)ەش کـە چاوەڕێـی دەکـەن، سـەرچاوە مێژووییـەکان دەریانخسـتوەو، هەندێـك لـە لێکۆڵـەرەوانی شـیعە خۆشـیان دەڵێـن: حەسـەنی عەسـکەریی کـە ئیمامـی یازدەیەمـە - ئـەو ئیمامـی یازدەیـەم و، ڕیزبەندیـی ئیمامەکانیـش لـە ڕاسـتیی دا ئەفسـانەیەکە، ئەوانـە هەموویـان زانایانـی ئیسـلام بـوون، وەك ئەبـوو حەنیفـەو شـافیعیی و مالیـك و ئەحمـەد - سـەرچاوە مێژووییـەکان دەڵێـن: حەسـەنی عەسـکەریی هیـچ وەچـەی نەبـووە، نـە کـوڕ نـە کـچ، چـوار سـاڵ دوای کۆچـی دوایـی خـۆی گوتیـان: کوڕێکـی هەیـەو پەنهانمـان کـردوە! بـەڵام لـە ڕاسـتییدا (المَهْـدِي المُنْتَظَـر)، مەهـدی چاوەڕوانکـراو، بوونی نیەو، شـتێکی ئەفسـانەیەو هەڵبەسـتراوەو، دەڵێـن: پێـش قیامـەت دێ، بـەڵام لـە دایـك نەبـووە تاکـو دوایـی بـێ، بەداخـەوەش خەڵکێکـی زۆر چاوەڕێـی شـتێك بکـەن، کـە بـوونی نیـە!

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە هەشت (٨) ئایەت دەگرێتە خۆی لە: (١ - ٨) کە تێیاندا، چوار (٤) بابەتی گەورەو گرنگ خراونەڕوو:

١- خوای کاربەجێ بۆ جاری یەکەم لەم سوورەتەدا بە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾، پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺی دواندوە، کە سەرجەم لەم سوورەتەدا، پێنج جاران خوا ﷻ بە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾، پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ دەدوێنێ، لەم یەکەم جارە دا، خوا فەرمانی پێکردوە بە پارێزکاریی و، بە قسەنەکردنی کافرو دەغەڵەکان و، شوێنکەوتنی پەیامی خوای پەروەردگاری و، پشت بە خوا بەستن، لە ئایەتەکانی: (١ - ٣)دا ئەمە هاتوە.

٢- خوا ڕایگەیاندوە کە هیچ پیاوێك، دوو دڵی نین و، ئافرەتانی ظیهار لێکراو دایکی مێردەکانیان نین و، کوڕانی تەبەننیی کراویش، کوڕی کوڕگرەکانیان نین و، فەرمانیشی پێکردوون کە دادگەریی ئەوەیە، بە ناوی بابیانەوە بانگیان بکەن و، ئەگەر باببیشیان زانراو نەبوو، برای ئایینی و دۆست و نیزیکیانن و، قسەی زاریش کە بە هەڵە دەکرێ، زیانی نیە، ئەگەر مەبەستی نێو دڵی لەگەڵدا نەبێ، ئەمەش لە ئایەتەکانی: (٤ - ٥)دا هاتوە.

٣- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە پێغەمبەر ﷺ بۆ بڕواداران، لە خۆیان لێیان لە پێشترەو هاوسەرانیشی دایکیانن، خزمانیش بۆ میراتگرتن لە یەکدی، لە پێشترن لە بڕواداران و کۆچکەران...، ئەمیش لە ئایەتی شەش (٦)دا هاتوە.

٤- باسکردنی بەڵێن و پەیمانی پتەو وەرگرتنی خوا، لە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ و نووح و ئیبراهیم و مووساو عیسا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، تاکو سەرەنجام ڕاستان لێیان بپرسرێتەوەو، بێبڕوایانیش ئازاری بە ئێشی بۆ ئامادەکراویان بچێژن، ئەمەش لە ئایەتەکانی (٧-٨)دا هاتوە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا
(١) وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا (٢) وَتَوَكَّلۡ عَلَى
ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا (٣) مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٖ مِّن قَلۡبَيۡنِ فِي جَوۡفِهِۦۚ وَمَا جَعَلَ أَزۡوَٰجَكُمُ
ٱلَّٰٓـِٔي تُظَٰهِرُونَ مِنۡهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمۡۚ وَمَا جَعَلَ أَدۡعِيَآءَكُمۡ أَبۡنَآءَكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ قَوۡلُكُم بِأَفۡوَٰهِكُمۡۖ وَٱللَّهُ
يَقُولُ ٱلۡحَقَّ وَهُوَ يَهۡدِي ٱلسَّبِيلَ (٤) ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ فَإِن لَّمۡ
تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡۚ وَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٞ فِيمَآ أَخۡطَأۡتُم
بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتۡ قُلُوبُكُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمًا (٥) ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ
مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡۗ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ
مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفۡعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِكُم مَّعۡرُوفٗاۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي
ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا (٦) وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمۡ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٖ وَإِبۡرَٰهِيمَ
وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا (٧) لِّيَسۡـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدۡقِهِمۡۚ
وَأَعَدَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمٗا (٨)﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

[بـه نـاوی خـوای بـه بەزەیـی بەخشـندە، ئـەی پێغەمبـەر! پارێـز لـه خـوا بکـەو، بـه قسـەی بێبـڕوا و موونافیقـەکان مەکـە، بێگومـان خـوا زانـای کارزانـه ﴿١﴾ هەروەهـا شـوێن ئـەو (پەیـام)ە بکـەوە کـه لـه پەروەردگارتـەوە بـۆت سروش دەکـرێ، بەڕاسـتیی خـوا بـەوەی دەیکـەن شـارەزایە ﴿٢﴾ تەنیـا پشـتیش بـه خـوا ببەسـتەو، خـوا بەسـه پارێـزەرو کار پـێ سـپێردراوبێ ﴿٣﴾ خـوا دوو دڵـی بـۆ هیـچ پیاوێـك لـه هەناویـدا دانەنـاون و، ئـەو هاوسەرانەشـتانی نەکردوونـه دایکتـان کـه ظیهاریـان لێدەکـەن و، بـه کـوڕ گیراوەکانیشـتانی نەکردوونـه کوڕانتـان، ئـەو (قسـەی)ەتان، تەنیـا قسـەی خۆتانـه بـه زارتـان دەیڵێـن و، خـواش تەنیـا هـەق و ڕاسـتیی دەفەرمـوێ و، تەنیـا ئەویـش ڕاسـته ڕێ پێشـان دەدات ﴿٤﴾ (ئەوانـەی بـه کوڕتـان گرتـوون) بـه نـاوی بابەکانیانـەوە بانگیـان بکـەن (پاڵیانبدەنـه لای ئـەوان) ئـەوە لـەلای خـوا دادگەرانەتـرو ڕاسـترە، ئنجـا ئەگـەر بابەکانیشـیانتان نـەزانی، ئـەوە براتانـن لـه ئاییـن داو دۆسـت و نیزیکتانـن و، بـه هـۆی ئەوەشـەوە کـه (لـه کاتی دوانـدا) هەڵـەی تێـدا دەکـەن، گوناهتـان ناگات، بـەڵام (کاتێـك گوناهتـان دەگات) کـه بـه ئەنقەسـت لـه دڵەکانتانـەوە بـێ و، خـواش لێبـوردەی بـه بەزەیـه ﴿٥﴾ پێغەمبـەر (ﷺ) بۆ بـڕواداران لـه خۆیـان لێیـان لە پێشـترە، (بـه خۆشویسـتران و ڕێزلێگیـران و فەرمانبەریی، شایسـته تـرە)و هاوسـەرەکانیشی دایکانیانـن و، خـاوەن خزمایەتییەکانیـش لـه (حوکمـی) کتێبـی خـوادا، لـه بـڕواداران و کۆچکـەران لـه یەکـدی لـه پێشـترن (بـۆ میراتگرتـن)، مەگـەر چاکەیـەك لەگـەڵ دۆسـت و نیزیکانتـان دا بکـەن (وەك هاوکاریـی ماددیـی و پشـتیوانیی مەعنەویـی)، ئـا ئـەوە لـه کتێـب (لـه زانیاریـی خـوا)دا نووسراوە ﴿٦﴾ یادیـش بکـەوە کاتێـك پەیـمانی پتەومـان لـه پێغەمبـەران وەرگـرت، هەروەهـا لـه تـۆو لـه نـووح و ئیبراهیـم و مووسـاو عیسـای کـوڕی مەریـەم، بەڵێـن و پەیمانێـکی پتەومـان لێوەرگرتـن (لەسـەر گەیانـدنی پەیامـی خـوا) ﴿٧﴾ تاکـو (سـەرەنجام) خـوا

لـە ڕاسـتان لـە بـارەی ڕاسـتییانەوە بپرسـێ و، بـۆ بێبڕوایانیـش ئازارێـكی بـە ئێـشی ئامادەكـردوە ﴿٨﴾].

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(جَوْفِهِۦ): (الجَـوْفُ: بَاطِـنُ الإِنْسَـانِ، صَـدْرُهُ وَبَطْنُـهُ وَهُـوَ مقَـرُّ الأَعْضَـاء الرَّئِيسِـيَّةِ عَـدَا الدِّمَـاغ)، (جَـوْف) واتـە: نێـوەوەی مـرۆڤ، سینەو سـكی، كـە نشـینگەی ئەندامـە سـەرەكییەكانی جەسـتەیە، جگـە لـە مێشـك، بـە كوردیـی هەنـاوی پـێ دەڵێـن.

(تُظَـٰهِرُونَ مِنْهُنَّ): (الظِّهَـارُ: أَنْ يَقُـولَ الرَّجُـلُ لامْرأَتِـهِ: أَنْـتِ عَـلَيَّ كَظَهْـرِ أُمِّـي)، واتـە: (ظِهَـار) ئەوەیـە كـە پیاوێـك مێردێـك بـە ژنەكـەی خـۆی بڵـێ: تـۆ وەك پشـتی دایكـم وای، ئنجـا چ بـە پشـتی دایـكی بچوێنـێ، چ بـە هـەر ئەندامێـكی دایـكی بچوێنـێ، لەبـەر ئـەوەی دایـكی لێـی قەدەغەیـە، واتـە: تـۆش لـە مـن قەدەغـەی، كـە ئـەوە سـەرەنجامەكەی بریتـی بـوو: لـە لێـك جیابوونـەوە، ئەگـەر ئـەو كەسـە پەشـێمان نەبێتـەوەو كەفـارەت نـەدات، وەك لـە سـەرەتای سـوورەتی (المجادلـة)دا خـوا باسـیكردوە.

(أَدْعِيَآءَكُمْ): (جَمْـعُ دَعـيّ، وَهُـوَ الَّـذِي يُدْعَـى لِغَـيْرِ أَبِيـهِ)، (أَدْعِيَـاء) كـۆی (دعـيّ)ە، (دعي)یـش بریتیـە لـەو كەسـەی كـە پـاڵ دەدرێتـە لای جگـە لـە بـابی خـۆی.

(وَمَوَٰلِيكُمْ): (الـوَلِي وَالمـوْلَى: يُسْـتَعْمَلاَنِ فِي مَعْنَـى الفَاعِـلِ، المُـوالِي، والمفعولِ: والمُـوَالَى، وَيُسْـتَعَارُ الـوَلِيُّ لِلقُـرْبِ مَكَانَـاً وَنسـبَةً وَدِيْنَـاً)، وشـەی (وَلِي ومـوْلى) بەكاردەهێنرێـن هـەم بـۆ مانـای بكـەر، هـەم بـۆ مانـای بـەركار، ئەگـەر بـۆ بكـەر بـێ، ئـەو كاتـە (وَلِي، ومَـوْلى) دەبـن بـە (مُوالِي) یـانی: كەسـێك كـە نیزیكـە لـە كەسـێك، كەسـێك كەسـێك بـە دۆسـت دەگـرێ، یـان سـەری دەخـات، پشـتی دەگـرێ، ئەگـەر بـە مانـای (مفعـول بە)یـش بـێ، ئـەو كاتـە، واتـە: (مُوالى) یـانی: كەسـێك كـە نیزیكایەتیـی لـێ دەكـرێ و، دۆسـتایەتیی دەكـرێ و، پشـتیوانیی لـێ دەكـرێ، وشـەی (ولي)یـش بـۆ نیزیكیـی

دەخوازرێتەوە لە ڕووی شوێنەوە نیزیک بێ، یاخود لە ڕووی کاتەوە، یان لە ڕووی دینەوە، یان لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە.

(**تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ**): واتە: دڵتان بە ئەنقەست بیڵێ، (**العَمْدُ: قَصْدُ الشَّيءِ وَالإِسْتِنَادُ إِلَيْهِ**)، (**عَمْد**) بریتیە لەوەی ئینسان شتێك بە ئامانج بگرێ و، پشتی پێ ببەستێ.

(**مَسْطُورًا**): (**أَي: مُثْبَتاً مَحْفُوظاً، وَجَمْعُ السَّطْر: أَسْطُر وَسُطُور وَأَسَاطِير وَأَسطار، مَسْطوراً: أَي مَكْتُوبَاً**)، واتە: چەسپاوە و، پارێزراوە لە کتێبی خوادا واتە: مەبەست پێی زانیاریی خوای پەروەردگارە، (**سطر**) یانی: دێڕ، بە (**أَسْطُر وَسُطُور وَأَسَاطِير وأسطار**)یش کۆدەکرێتەوە، (**أُسْطورة**)ش هەر لەوەوە هاتووە (**أسطورة**)، واتە: شتێك کە نووسرابێتەوەو ئەفسانە بێ، بە (**أساطير**) کۆ دەکرێتەوە.

(**مِيثَاقًا**): (**أَوْثَقْتُهُ: شَدَدْتُهُ، الوَثَاقُ وَالوِثَاق: إِسْمَانِ لِمَا يُوثَقُ بِهِ الشَّيءِ، وَالمِيثَاقُ: عَقْدٌ مُؤَكَّدٌ بيَمِينٍ وَعَهْدٍ**)، دەگوترێ: (**أَوْثَقْتُهُ**) واتە: توندم کرد، قاییمم کرد، (**وَثاق و وِثَاق**) هەردووکیان ناون بۆ شتێك کە شتێکی پێ ببەسترێتەوە، بەڵام (**مِيثاق**) بریتیە لە گرێبەستێکی جەخت لەسەر کراو، بە هۆی سوێند و پەیمان بە یەکدی دانەوە.

(**غَلِيظًا**): (**الغِلْظَةُ ضِدُّ الرِّقَّةِ، وَأَصْلُهُ أَنْ يُسْتَعْمَلَ فِي الأَجْسَامِ، لَكِن قَدْ يُسْتَعَارُ لِلْمَعَانِي كَالكَبِيرِ والكَثِيرِ**)، (**غِلْظَة**) پێچەوانەی (**رِقَّة**)یە، (**رِقَّة**) واتە: نەرمیی و ناسکیی، بەڵام (**غِلْظَة**) واتە: زبریی و قەبەیی و، لە ئەسڵدا لە شتی بەرهەست و جەستەییدا بەکاردێ، بەڵام جاری واشە دەخوازرێتەوە بۆ مانایەك وەك گەورەو زۆر، وشەی (**غَلِيظ**) لە جیاتی ئەو دوو واتایەش جاری وا هەیە بەکاردێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١)- هۆی هاتنە خواری ئەم ڕستە موبارەکەی دەفەرموێ: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ فَإِن لَّمۡ تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡۚ وَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٞ فِيمَآ أَخۡطَأۡتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتۡ قُلُوبُكُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمًا ٥ ﴾.

لەوبارەوە لەم دوو ڕیوایەتە دێنین:

**یەکەم: [عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ، مَوْلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، مَا كُنَّا نَدْعُوهُ إِلاَّ زَيْدَ بْنَ مُحَمَّدٍ، حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾] (أخرجه أحمد: ٥٤٧٩، والبخاري: ٤٧٨٢، ومسلم: ٢٤٢٥، والترمذي: ٣٢٩٠).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: زەیدی کوڕی حاریسە، [کۆیلەی ئازادکراوی پێغەمبەری خوا ﷺ ] ئێمە هەر بە زەیدی کوڕی موحەممەد بانگمان دەکرد[1]، هەتا قورئان دابەزی ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: بە ناوی باوبیانەوە بانگیان بکەن. (دوای دابەزینی ئەم ئایەتە هەر دەیانگوت: زەیدی کوڕی حاریسە).

**دووەم: [عَن ابْن عَبَّاس رَضِي الله عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ من أَمر زيد بن حَارِثَة ﷺ أَنَّهُ كَانَ فِي أَخْوَاله بني معن من بني ثعلب من طَيء، فَأُصِيب فِي غلمة من طَيء، فَقدم بِهِ سوق عكاظ، وَانْطَلق حَكِيم بن حزَام بن خويلد إِلَى عكاظ يتسوق بهَا، فأوصته عمته خَدِيجَة رَضِي الله عَنْهَا أَي يبْتَاع لَهَا غُلَاماً ظريفاً عَرَبياً إِنْ قَدر عَلَيْهِ ... ثمَّ إِنَّه خرج فِي إبل (عبدالمطّلب) إِلَى الشَّام فَمر بِأَرْض قومه، فَعرفهُ عَمّه فَقَامَ إِلَيْهِ... الخ][2].**

---

(١) کاتی خۆی پێش پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەر ﷺ، وەك کۆیلە کەوتبووە ژێر دەستی، دوایی ئازادی کردبوو و کردبووی بە کوڕی خۆی، کە ئەوە پلەو پێگەیەك بووە بە هەموو کەس نەدراوە.

(٢) الدر المنثور: ج٦، ص٥٦٣ و ٥٦٤، ونسبه لابن مردويه.

واتــە: عەبدوڵــڵای کــوڕی عەببــاس (خــوا لێیــان ڕازی بــێ) دەڵــێ: بەســەرهاتی زەیــدی کــوڕی حاریســە بــەو شــێوەیە بــوو: لــە لای خاڵــەکانی بــوو لــە بــەنی مەعنــی بــەنی ســەعلەبە لــە (طيء)، (هــۆزی طــيء کــە (حاتــم الطــائي) لــەوان بــووە)، لەگــەڵ کۆمەڵێــك گەنجــدا دەگیــرێ[1]، دەکرێتــە کۆیلــەو دەهێــنرێ بــۆ بــازاڕی عــوکاظ، حەکیمــی کــوڕی حیزامــی کــوڕی خوەیلیدیــش دەچــێ بــۆ بــازاڕی عــوکاظ بــۆ شــت کڕیــن، پــووری (خەدیجــەی کچــی خوەیلیــد) ڕای دەســپێرێ کوڕێــکی عاقــڵ و نەجیبــی عەڕەبــی لــە بــە کۆیلەکــراوان بــۆ بکــڕێ، ئەگــەر دەســتی بکــەوێ، (ئەویــش زەیــد دەکــڕێ، خەدیجــەش خــوا لێــی ڕازی بێ، دەیبەخشــێ بــە هاوســەرەکەی موحەممەدی کــوڕی عەبدوڵــڵای کــوڕی عەبدولموتتەڵیــب)...

جارێــك زەیــد لەگــەڵ حوشــترەکانی عەبدولموتتەڵیــب دا (کــە مەبەســت پێــی کاروانــە) دەچــێ بــۆ شــام، بــە لای ســەر زەمینــی خەڵکەکــەی خۆیــدا ڕەت دەبــێ، مامــی دەیناســێتەوە.

ئنجــا هەڵدەســتێتەوە بــۆ لای [لێــی دەپرســێ: تــۆ کێــی؟ کۆیلــەی فلانکەســم، لــە کــوێ؟ لــە فــڵان شــوێن، بەســەرهاتی خــۆی بــۆ دەگێڕێتــەوە، ئەویــش ماچــی دەکات و دەڵــێ: تــۆ بــرازای منــی، بابــی بانــگ دەکات، بابــی نــاوی (حارثــة بــن شراحبيــل) بــووە، دایکیــشی نــاوی (سُعْدَى) بــووە، لێــی دەپرســێ تــۆ کێــی؟ نــاوی خــۆی دەڵــێ، دایکــت نــاوی چییــە؟ دەڵــێ: نــاوی (سُعْدَى)یە، ئنجــا بــابی و برایــەکی لەگەڵــی دەچــن بــۆ مەککــە، دوای ئــەوەی کــە لەوســەر دەگەڕێتــەوە، داوا لــە موحەممــەد دەکــەن کــە بیانداتــەوە، دەڵێــن: ئــەوە کــوڕی ئێمەیــە، کاتێ خــۆی بــە ســتەم گیــراوەو بــە کۆیلــە کــراوە، ئێمــە هۆزێــکی ئازادیــن، موحەممەدیــش دەڵــێ: چــی دەڵێــن: ئەگــەر سەرپشــکی بکــەم؟ دەڵێــن: شــتێکی زۆر باشــە، کــە سەرپشــکی دەکات، زەیــد دەڵــێ: مــن لــە لای موحەممــەد دەمێنمــەوە، بابــی و مامــی و بــرای سەرزەنشــتی دەکــەن، دەڵێــن: چــۆن کۆیلایەتیــی هەڵدەبژێــری بەســەر ئازادییــداو، بێگانــە بەســەر بــاب و مــام و خزمــدا؟ ئەویــش دەڵــێ: ئــەو ڕەوشــت و نــاکارە جوانانــەی لــەو پیاوەم

---

(١) لە لایەن کۆمەڵێک خەڵکەوە کە ڕێکرو دز بوون، ئەو کاتە عادەت وا بووە.

بینیـون، لـە کەسـم نەبینیـون، بۆیـە حـەز دەکـەم لـە خزمـەت ئـەودا بـم و لێـی نیزیـك بـم، موحەممەدیـش لـە بەرانبـەر ئـەوەدا ئـازادی دەکات، بـاب و مامـی و خەڵـك کۆدەکاتـەوە، دەڵـێ: ئێـوە شـایەدبن، ئـازادی دەکـەم و دەشـیکەم بـە کـوڕی خـۆم، ئیـدی بـاب و مـام و برایەکـەی دەڵیـن: ئێسـتا دڵـمان ئاسـوودەیە، ئیـدی زەیـد ئـازادەو کـوڕی موحەممـەدە].

٢)- دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە: ﴿ ٱلنَّبِىُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَـٰتُهُمْ ۗ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَسْطُورًا ﴿٦﴾ ﴾.

ئەو گێڕدراوەیە هەیە:

[عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: لَبِثَ الْمُسْلِمُونَ زَمَانًا يَتَوَارَثُونَ بِالهِجْرَةِ، وَالأَعْرَابِيُّ الْمُسْلِمُ لَا يَرِثُ مِنَ الْمُهَاجِرِ شَيْئًا، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ ٱلنَّبِىُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَـٰتُهُمْ ۗ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَسْطُورًا ﴿٦﴾ ﴾، فَخَلَطَ الْمُؤْمِنِينَ بَعْضُهُمْ بَعْضِهِ فَصَارَتِ الْمَوَارِيثُ بِالْمِلَلِ][1].

واتـە: قەتـادە دەڵـێ: مسـوڵمانان ماوەیـەك مانـەوە بـە کۆچکـردن میراتیـان لـە یەکـدی دەگـرت، (کـە پێغەمبـەر ﷺ کۆچکـەران و پشـتیوانانی کردبوونـە بـرای یەکـدی)، بـەڵام ئەعرابیـی مسـوڵمان کـە کۆچـی نەکردبـوو، میـراتی لـە بـرا، یـان لـە خزمـە کۆچکەرەکـەی نەدەگـرت، دوایـی خـوا ﷻ ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوار، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلنَّبِىُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَـٰتُهُمْ ۗ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟

---

(١) أخرجـه الطـبري: ج٢١، ص١٥٧، رقـم: ٢٨٣٦٦، الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب: ج٣، ص٨٣، قلنـا: وهـذا مرسـلٌ صحيـح الإسـناد.

إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِكُم مَّعۡرُوفٗاۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا ﴿٦﴾ ﴾، ئیدی لەو کاتەوە بڕواداران بە هۆی دینەوە میراتیان لە یەکدی دەگرت، نەك ئەو برایەتییە کاتییەی کە پێشتر پێغەمبەر ﷺ لە نێوانیاندا دروستی کردبوو، بە هۆی بارودۆخێکی تایبەتەوە، چونکە کۆچکەران، لە شوێنی خۆیان و لە نێو خزم و کەسیان هەڵقەنابوون و، پێغەمبەر ﷺ وەك قەرەبوو کردنەوە، ئەوەی بۆ کردن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ ئەم سوورەتی (الأحزاب) - کە وەك پێشتر باسمان کرد، لە کۆتایی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا دایبەزاندوە - جگە لە باسی جەنگی خەندق، کە جەنگی ئەحزابیشی پێ دەگوترێ و، جەنگی بەنوو قورەیزە، کۆمەڵێك باسای دیکەشی تێدا خستوونە ڕوو، کە زیاتر پەیوەستن بە بواری کۆمەڵایەتیی و خێزانیی، بە تایبەت پێغەمبەر ﷺو، هاوسەرە بە ڕێزەکانی و ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺو، چۆنیەتیی مامەڵە کردن لەگەڵ هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ و ماڵی پێغەمبەر ﷺ، هاموشۆ و نان و خواردن و دانیشتن، هەروەها باسی بەرگ و پۆشاکی ئافرەتان و، هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ دەبێ چ جۆرە ئاکارو ڕەوشت و هەڵسوکەوتێکیان هەبێ کە شایستەی ئەو پێگەو پایە بەرزە بێ، هەیانە، کە بریتیە لە هاوسەریی پێغەمبەر ﷺ، سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (بسم الله الرحمن الرحيم) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

١)- ئەم کارە بە ناوی خوا دەستپێدەکەم.

٢)- ئەم کارە بۆ خوا دەکەم.

٣)- بە پێی شەرعی خوا ئەنجامی دەدەم.

٤)- ئەم کارەم بە یارمەتییدان و ئاسانکاریی خوا دەکەم، نەك بە شان و شەوکەتی خۆم.

ئنجا خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ ﴾، ئەی پێغەمبەر ﷺ! پارێز لە خوا بکە، پارێزکارانە مامەڵە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بکە و، بە قسەی کافرەکان و مونافیقەکان مەکە، بۆیان ملکەچ مەبەو فەرمانبەرییان مەکە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾، بە دڵنیایی خوا لە ئەزەلەوە زاناو کارزان بووە، زانا بووە لە فەرمایشتەکانی دا و، کارزان بووە لە کارەکانیدا.

﴿ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ﴾، شوێن ئەوەش بکەوە کە لە پەروەردگارتەوە بۆت سروش دەکرێ، بۆت دەنێردرێ، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴾، بە دڵنیایی خوا شارەزای کردەوەکانتانە، بەوەی کە دەیکەن شارەزایەو ئاگادارە.

﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾، پشتیش هەر بە خوا ببەستە و، خوا بەسە کە پشت پێ بەستراوو کار پێ سپێردراو بێ، (وكيل) لەسەر کێشی (فعيل) ە، بەڵام بە مانای (مفعول)ە، (وكيل) واتە: (موكول إليه)، کەسێك کە کاری پێ دەسپێردرێ و بە سەرپەرشتیار دادەنرێ، واتە: خوا بەسە کار پێ سپێردراوی تۆ و سەرپەرشتییکاری تۆ بێ.

ئنجا دوای ئەو ئاماژە ڕاستەوخۆیە بۆ پێغەمبەر ﷺ، خوای پەروەردگار دێتە سەر خستنە ڕووی هەندێك شتی دیکە، کە پێویست بە ڕاستکردنەوە بوون و، پێویست بە هەڵوەشاندنەوە بوون و، هەندێ عادەت و نەرێتی نەفامیی، دەفەرموێ:

﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ﴾، خوا بۆ هیچ پیاوێك دوو دڵی لە نێو هەناویدا دانەناون، لەو بارەوە کە ئەم ڕستە قورئانییە بۆچی هاتۆتە خوار؟ باسکراوە، گوایە: کەسێك هەبووە، یان دوو کەس هەبوون لە نێو شاری مەککە، لافی ئەوەیان لێداوە کە دوو دڵیان هەن و، زۆر زیرەك و هۆشیارن و بە هەردوو دڵەکانیشیان دەفامن.

لە هەندێ ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە گوتوویانە: موحەممەد ﷺ ڕەنگە دوو دڵی هەبن، بەڵام خوا دەفەرموێ: خوا بۆ هیچ پیاوێك دوو دڵی لە نێو هەناویدا

دانەناون، هەندێکیش دەڵێن مەبەست پێی ئەوە بووە، کە وەك چۆن مرۆڤ دوو دڵی نین، بە هەمان شێوەش نابێ کوڕی دوو بابان بێ، دەبێ کوڕی بابێك بێ، واتە: ئەمە دەفەرموێ: خوا بۆ هیچ پیاوێك دوو دڵی دانەناون، بۆیەش باسی پیاو دەکات، چونکە دەیەوێ نەریتی: بە کوڕ گرتن (تبنّي) هەڵبوەشێنێتەوە، واتە: وەك چۆن هیچ پیاوێك دوو دڵی نین، بە هەمان شێوەش هیچ کوڕێکی دوو بابی نین، کەواتە: هەر کەسە با پاڵ بدرێتە لای بابی خۆی و، ئەو عادەت و نەریتەی کە لەسەردەمی نەفامیی دا بووە، دەبێ هەڵبوەشێتەوە.

﴿ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔى تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ ﴾، ئەو هاوسەرانەشتان کە ظیهاریان لێ دەکەن، خوا ئەوانەی نەکردۆتە دایکانی ئێوە، واتە: مێردێك کە ظیهار لە ژنەکەی دەکات و دەڵێت: تۆ وەك پشتی دایکم وای، بەو قسەیە ژنەکەی نابێتە دایکی و لێی قەدەغە نابێ، بەڵکو دایکیان هەر ئەوانەن کە ئەوانیان بووە، وەك لە سوورەتی (المجادلة)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔى وَلَدْنَهُمْ ﴿٢﴾ ﴾، دایکیان هەر ئەوانەن کە ئەوانیان بووە، ﴿ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ﴾، هەروەها ئەو کوڕانەی کردووتانن بە کوڕانی خۆتان، خوا نەیکردوون بە کوڕانی ئێوە، (أدعياء) کۆی (دَعِيّ)ە، (دعي) یانی: (الإبن المتبنّى) کوڕێك کە بە کوڕی کەسێکی دیکە کراوە، ﴿ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ﴾، ئەوەتان هەر قسەیەکە بە زاری خۆتان دەیڵێن، ﴿ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴾، خواش تەنیا هەق دەفەرموێ، هەق واتە: شتی چەسپاو و ڕاست، هەر ئەویش خەڵك بەرەو ڕێی ڕاست، ڕێنمایی دەکات، (سبيل) یانی: ڕێی ڕاست، ڕاستە ڕێ، ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، ئەو کوڕانە کە بە کوڕتان کردوون، بە کوڕی خۆتانتان کردوون، کوڕی ئێوە نین، بانگیان بکەن بۆ لای بابیان، واتە: پاڵیان بدەنە لای بابیان، ئەوە لە لای خوا دادگەرانەترە، ﴿ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ﴾، ئنجا ئەگەر بابەکانتانیان نەزانی و نەناسی، ئەوە براتانن لە دین دا و، دۆست و نیزیکانتانن، ﴿ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ ﴾، لەوەشدا کە بەهەڵە دەیڵێن بەسەر زمانتان دێ، گوناهتان ناگاتێ،

﴿ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ﴾، بەڵام ئەوەی کە دڵتان بە ئەنقەست ڕووی تێ دەکات و، دەیکاتە ئامانج، لەسەر ئەوە گوناهبار دەبن، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، خواش هەمیشە لێبووردەی میهرەبان و بە بەزەیی بووە.

ئنجا کە لە هەڵوەشاندنەوەی دوو نەریتی نەفامیی بۆوە، یەکەم: عادەتی تەبەنیی، دووەم: ظیهار کردنی مێرد لە ژنی، دێتە سەر بابەتی سێیەم:

دەفەرموێ: ﴿ ٱلنَّبِىُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾، پێغەمبەر ﷺ بۆ بڕواداران لە خۆیان لێیان لە پێشترە، واتە: لە ڕووی خۆشویستنەوە، لە ڕووی ڕێزگرتنەوە، لە ڕووی بە قسەکردنەوە، لە ڕووی فیداکاریی لە پێناودا کردنەوە، لە هەموو ڕوویەکەوە، دەبێ لە خۆیان نیزیکتری بزانن، بە شایستەتری بزانن، کە خۆشیانی بوێ، ﴿ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ﴾، هاوسەرەکانیشی دایکیانن، هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ لە حوکمی دایکانی بڕوادارانن، ئنجا ئایا تەنیا دایکانی پیاوانی بڕوادارن، یاخود هی ئافرەتانی بڕواداریشن؟ لەو بارەوە ڕاجیاییەك هەیە، ﴿ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ ﴾، خاوەن خزمایەتییەکانیش لە کتێبی خوادا لە حوکمی کتێبی خوادا، هەندێکیان لە پێشترن لە هەندێکیان، واتە: ئەوان لە نێو خۆیاندا لە یەکدی لە پێشترن، بۆ میرات لە یەکدی گرتن، لە کێ؟ ﴿ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ ﴾، لە بڕواداران و لە کۆچکەران، ﴿ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا ﴾، مەگەر بتانەوێ چاکەیەك لەگەڵ دۆستەکانی خۆتان دا بکەن، پێش ئەوەی کابرا بمرێ، بۆی هەیە وەسیەت بکات: ئەوەندە ماڵەی من بدەن بە فڵانکەس، کە دۆستیەتی و هاوەڵ و ناسیاویەتی و خۆشی دەوێ، ﴿ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا ﴾، ئەوەش لە کتێبدا نووسراوە، تۆمارکراوە، چەسپێنراوە، لە کتێبدا ئایا مەبەست پێی قورئانە؟! یاخود مەبەست پێی زانیاریی خوای پەروەردگارە، کە لە قورئاندا بە (لوح محفوظ، کتاب مبین، إمام مبین)، تەعبیرکراوە؟ وا پێدەچێ مانای دووەم ڕاستتربێ کە مەبەست پێی زانیاریی خوایە، چونکە ئەوەی پێشێ باسی: (کتابُ الله)ی کرد: ﴿ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ ﴾، کە بە تەئکید ئەوەیان مەبەست پێی کتێبی خوایە، واتە: ئەو

کتێبەی کە قورئانەو دەخوێنرێتەوەو نووسراوەتەوە، بەڵام ئەوی دیکە دەفەرموێ: ﴿كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا﴾، ئەمە دەیگێڕێتەوە بۆ ڕابردوو، ئەوە لە ئەزەلەوە لە کتێبی خوادا، لە زانیاریی خوادا، تۆمار کراوە، بەڵام کە بۆ ماوەیەکی کاتیی پێغەمبەر ﷺ وایکرد کە کۆچکەران میرات لە پشتیوانان بگرن، کە برایەتییان لە نێواندا هەبووە و، میراتیان لە یەکدی دەگرت، ئەوە شتێکی کاتیی بوو، لەبەر حاڵەتێکی ناچاریی بوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیەی کرد، بەڵام دوای تێپەڕینی ئەو حاڵەتە ناچارییە، وەزعەکە گێڕدرایەوە بۆ حاڵەتە ئاسایی و سروشتییەکەی خۆی، کە لە زانیاریی خوادا بەو شێوەیە بووە، واتە: ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ کردبووی ئەم ئایەتە موبارەکە، ئەوەی نەسخ کرد، کە لە ئایەتی کۆتایی سوورەتی (الأنفال)یشدا، هەمان مەبەست هەر هاتووە: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ مَعَكُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنكُمْ ۚ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٧٥﴾﴾، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە و، دواتر کۆچیان کردووە، لەگەڵ ئێوەدا تێکۆشاون، ئەوانەش لە ئێوەن، بەڵام خاوەن خزمایەتییەکان لە کتێبی خوادا لە یەکدی لە پێشترن، (واتە: بۆ میراتگرتن)، بێگومان خوا بۆ هەموو شتێك زانایە.

وا پێدەچێ سوورەتی (الأنفال) کە لە کاتی جەنگی بەدردا دابەزیوە، پێشتربووبێ، دوایی لێرە لە سوورەتی (الأحزاب)دا کە لە کاتی جەنگی ئەحزاب دا دابەزیوە لە کۆتایی ساڵی پێنجەمی (٥) کۆچییدا، ڕوونتر خوای بەرزو پاك ئەو حوکمەی ڕاگەیاندوە.

ئنجا لە بابەتی کۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمْ﴾، یاد بکەوە! کە پەیمانی پتەومان لە پێغەمبەران وەرگرت، پەیمانی چی لێوەرگرتن؟ پەیمانی ئەوە کە پەیامی خوا بگەیەنن، پەیمانی ئەوە کە خەڵك بۆ تەنیا خوا پەرستیی بانگ بکەن و، پەیمانی ئەوە کە بۆ پابەندیی بەرنامەو شەریعەتی خواوە بانگیان بکەن و، ئەو شەریعەتە لە ژیانی تایبەتیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی خۆیاندا بەرجەستە بکەن، بۆ ئەوەی ببنە سەر مەشق بۆ خەڵك، ئەو پەیمانەی

لێوەرگرتــن، ﴿ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴾، دوای ئــەوەی کــە خـوا بـە گشـتیی بـاسی پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەکات، ئنجا بـە تایبەتیی بـاسی ئـەو پێنـج (٥)یـان دەکات، بـەڵام موحەممـەد ﷺ پێـش هەموویـان دەخـات، لەبـەر ئـەوەی سـەروەری پێغەمبەرانـە، واتـە: یـاد بکـەوە کاتێـك پەیـمانی پتەومـان لـە پێغەمبـەران وەرگـرت و، بـە تایبـەت لـە تـۆ و لـە نـووح و، هەروەهـا ئیبراهیـم و مووســاو عیســای کــوڕی مەریــەم، ﴿ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴾، پەیمانێــکی پتـەوو قاییـم و قەبـەو مەحکەمـمان لـێ وەرگرتـن، (غلیـظ) واتـە: زۆر پتـەو قاییـم و قەبـە، کـە (غلیـظ) لـە ئەسـڵدا بـۆ شـتی مادديـی و بەرهەسـت بـەکاردێ، بـەڵام لێـرەدا خوازراوەتـەوە بـۆ شـتێکی مەعنەویـی، کـە بریتیـە لـە پەیـمان، واتـە: پەیمانێـکی زۆر قاییـم و تونـدو پتـەو، ﴿ لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّـٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ ﴾، خـوا ئـەو پەیمانـەی وەرگـرت لـە پێغەمبـەران، بـە تایبەتیـی لـەو پێنجـەی کۆتاییـان لـە: موحەممـەدو نـووح و ئیبراهیـم و مووسـاو عیسـای کـوڕی مەریـەم، تاکـو لـە بـارەی ڕاسـتییانەوە لـە ڕاسـتان بپرسـێ، ﴿ وَأَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾، بـۆ بێبڕوایانیـش ئازارێـکی بـە ئێشی ئامـادە کـردوە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کە پارێزی لێ بکات و، بە قسەی کافرو دەغەڵەکان نەکات و، شوێن ئەو پەیامە بکەوێ کە بۆی دابەزێنراوەو، پشتیش بە خوا ببەستێ و، بێباک بێ لە پیلان و فێڵی ناحەزانی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٢﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٣﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- خوا ﷻ بانگی پێغەمبەر ﷺ دەکات، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ﴾، ئەی پێغەمبەر! ﷺ پارێز لە خوا بکە، ئایا پێغەمبەر ﷺ پارێزی لە خوا نەکردووەو پارێزکار نەبووە؟ بە تەئکید با، لێرەدا یانی: لەسەر ئەو پارێزکردن و وریا بوون و هۆشیار بوونەت لە مامەڵە لەگەڵ خوادا بەردەوامبە، (دُم عَلَى التَّقْوَى فِي التَّعَامُلِ مَعَ الله).

لەم سوورەتەدا پێنج (٥) جاران خوا بە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾، پێغەمبەری کۆتایی ﷺ دەدوێنێ:

جاری یەکەم: لە ئایەتی ژمارە (١)دا کە ئێرەیە:

جاری دووەم: لە ئایەتی (٢٨)دا کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾﴾.

جاری سێیەم: لە ئایەتی ژمارە (٤٥)دا کە خوا جارێکی دیکە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾ ﴾.

جاری چوارەم: لە ئایەتی ژمارە (٥٠)دا کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ أَزۡوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيۡتَ أُجُورَهُنَّ ﴿٥٠﴾ ﴾.

جاری پێنجەمیش: لە ئایەتی ژمارە (٥٩)دا کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ﴿٥٩﴾ ﴾.

ئەو پێنج (٥) جارە کە خوا بانگی پێغەمبەر ﷺ دەکات بە نازناوی پێغەمبەرایەتیی ﷺ، هەرجارە ئەرکێکی گەورەو گرنگی پێ دەسپێرێ، کە لە هەموویان گرنگتر ئەم ئەرکی یەکەمە کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴾، ئەی پێغەمبەر! ﷺ پارێز لە خوا بکەو، بە قسەی کافرەکان و مونافیقەکان مەکە.

٢)- ﴿ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴾، فەرمانبەریی بێبڕوایان و دەغەڵان مەکە، (**الطَّاعَةُ: العَمَلُ عَلَى مَا يَأْمُرُ بِهِ الغَيْرُ أَو يُشِيرُ بِهِ**)، (طاعة) بریتیە لەوە کە مرۆڤ کار بەوە بکات کە ئەوی دیکە، کەسێك فەرمانی پێدەکات، یاخود ئاماژەی بۆ دەکات، واتە: بۆیان ملکەچ مەبە، بۆیان فەرمانبەر مەبە، گوێڕایەڵیان مەبە، کە بە تەئکید هەر گوێڕایەڵیان نەبووە، بەڵام ئەوە هۆشداریی پێدانە بە پێغەمبەر ﷺ، کە لەسەر حاڵەتی پێشتری کە بریتی بووە لە گوێ نەدان بە کافرەکان و بە قسە نەکردنیان، لەوەدا کە لەگەڵ ئایین و بەرنامەی خوادا تێك دەگیرێ، بەردەوام بێ.

٣)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴾، بە دڵنیایی خوا زانایەو کارزانە، زانایە لە فەرمایشتکردنیدا و، کاربەجێیە لە کارەکانیدا.

لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە، ئایەتی ژمارە یەك (١)، بەسەرهاتێك گێڕدراوەتەوە لە هۆی هاتنە خواردا، گوایە: (أَبو سفيان)و (عِكْرمە بن أبي

جهل)و (أبو الأعور) لە مەککەوە هاتوون و، لە مەدینە میوانی هەندێك لەوانە بوون کە ئەهلی نیفاق و دوو دڵیی و دەغەڵیی بوون، دوایی داوایان لە خانە خوێیەکەیان کردوە، دیدارێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بۆ بڕەخسێنێ، ئەویش دیداری بۆ ڕەخساندوون و، ئەوانیش داوایان لە پێغەمبەر کردوە ﷺ کە واز لە پەرستراوەکانیان بێنێ و، قسەیان پێ نەڵێ، بەڵام لە ڕووی سەنەدەوە مەحکەم نیە و، جێی پشت بەستن نیە.

لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ پارێز لە خوا بکەو گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی کافران و مونافیقان مەکە، بێگومان خوا زانای کارزانە، واتە: ئەو خوایەی کە تۆ دەیپەرستی، ئەوپەڕی زانیاریی هەیە، ئەوپەڕی کارزانیی هەیە، ئنجا تۆ متمانەی ڕەهات هەبێ بە فەرمایشتەکانی و فەرمانەکانی و قەدەغەکانی.

٤)- ﴿ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ﴾، بشکەوە شوێن ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت سروش دەکرێ.

ئەمە زەمینە خۆشکەرە بۆ ئەوەی کە لە دوایی دێ، لە هەڵوەشانەوەی نەریتی بە کوڕ گرتن، هەروەها ظیهار کردنی مێرد لە ژنی، ئەمە زەمینە خۆشکردنە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو دوو نەریتە نەفامییەو، حوکمەکانی دیکەش، کە هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر دڵی قورس بووە، لەبەر لۆمەو سەرکۆنەی خەڵك، بەڵام خوا زەینەبی - دوای ئەوەی لە زەید جیابۆوە - لێ مارەکرد، هەروەها هەر ئەرکێکی دیکەش کە خوا بە پێغەمبەری خاتەمی ﷺ سپاردوە، ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: شوێن ئەوە بکەوە کە لە پەروەردگارتەوە بۆت سروش دەکرێ، ئەمە زەمینە خۆشکەرە بۆ وەرگرتنی هەموو ئەو ئەرك و فەرمانانەی کە دوایی دێن.

٥)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴾، بە دڵنیایی خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە، ئەوەی دەیکەن لە داهاتوودا و ئێستاش دەیکەن شارەزایە، دەزانێ چی دەکەن و چۆنی دەکەن!

٦)- ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾، پشتیش بە خوا ببەستە.

ئەمەش دیسان هەر زەمینە خۆشکردنە بۆ ئەو فەرمان و ئەرکانەی کە لە داهاتوودا دێن، واتە: پشت بە خوا ببەستە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا و، گوێ نەدان بە ئازاری دەغەڵ و مونافیقەکان و دژایەتیی کافرەکان.

٧)- ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾، خواش بەسە کارپێسپێردراو بێ، (**الوَكيلُ: الَّذِي يُسْنِدُ إلَيْهِ غَيْرُهُ أمْرَهُ**)، (**وكيل**) کەسێکە کە جگە لە خۆی، کاری خۆی پێ دەسپێرێ، واتە: وەکالەتی خواو پاراستنی خوا بۆ تۆ بەسە.

(**الطبري**): ئەم ڕستەیەی ئاوا لێك داوەتەوە، دەڵێ: (**وَفَوِّضْ إلى اللهِ أمْرَكَ يَا مُحَمَّد وَثِقْ بِهِ**)، ئەی موحەممەد! ﷺ کاری خۆت بە خوا بسپێرەو متمانەو باوەڕی پێ بکەو، پشتی پێ ببەستە.

**مەسەلەی دووەم:**

**بەرپەرچدانــەوەی قســەی: بــوونی مرۆڤــی دوو دڵ و، بــە هــۆی ظیهــارەوە ژن بوونــە دایــکی پیــاو و، بــە ئیددیعــا بــە کوڕکــران، کــوڕی خەڵــك بوونــە کــوڕی کەســێك و، فەرمانکــردنی خــوا ﷻ بــە بانگکــردنی ئــەو کوڕانــە بــە نــاوی بابیــان و، ڕوونکردنــەوەی ئــەوە کــە بــە قســەی زاری هەڵــە، مــرۆڤ گوناهبــار نابــێ، بــەڵام بــە نیــازی دڵ گوناهبــار دەبــێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔى تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ ۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ﴾، خوا بۆ هیچ پیاوێك دوو دڵی دانەناون، لە نێو هەناویدا.

ئەمــە زەمینــە خۆشــکردنە بــۆ قەدەغەکــردنی ئــەوەی کــە لــە دوایــی دێ، کــە بریتیە لــە نەرێتــی بــە کوڕگرتنــی کــوڕی خەڵــك و، نەرێتــی ظیهارکــردنی مێــرد لــە ژنی، کــە لــە ســەردەمی نەفامییــدا دەبــوو بــە هــۆی لێــك جیابوونــەوەی ژن و مێــردو تــەڵاق، بــەڵام خــوا ﷻ حوکمەکــەی گــۆڕی، بــەوە کــە ئــەو مرۆڤــە گوناهبــار دەبــێ، بــەڵام کــە کەفــارەتی دا:

أ- کە یان کۆیلەیەك ئازاد بکات.

ب- یان دوو مانگ بە ڕۆژوو بێ.

ج- یاخود خۆراکی ڕۆژێکی شەست (٦٠) کەس دابین بکات و، بەو کەفارەتدانەش ئەو گوناهەی لە کۆڵ دەکەوێ و، دەبنەوە بە ژن و مێردی جاران، دوای ئەوەی کە ئەو پیاوە پەشێمان دەبێتەوەو داوای لێبووردن لە خوا دەکات، وەك لە سوورەتی (المجادلة)دا باسکراوە، ئنجا ئەمە کە خوا دەفەرمویّ: خوا بۆ هیچ پیاوێك دوو دڵی دانەناون لە هەناوییدا، - ﴿ فِي جَوْفِهِۦ ﴾، (الجوف: باطِن الإنسان)، کە بە کوردیی هەناوی پێ دەڵێین - ئەمە زەمینە خۆشکردنە، وەك چۆن سێ (٣) ئایەتی پێشووش هەر جۆرێك لە زەمینە خۆشکردن بوون، ئایەتەکانی: (١ و ٢و ٣)، بەڵام ئەو لەلایەنی پێغەمبەرەوەو ﷺ ئەمیشیان زەمینە خۆشکردن بووە بۆ خەڵك، کە بزانن وەك چۆن خوا دوو دڵی نەداون بە هیچ کەس، کەواتە: ناشگونجێ هیچ کوڕێك هی دوو بابان بێ و، ناشگونجێ بە قسەی زار، ژنێك بۆ مێردەکەی وەك دایکی مێردەکەی لێبێ.

٢)- ﴿ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔى تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ ﴾، ئەو ژنانەشتان کە ظیهاریان لێ دەکەن، خوا نەیکردوون بە دایکتان، وشەی (اللاء) بە دوو جۆر خوێندراوەتەوە: (اللاء) بە ژێر (کسرة)، هەروەها (اللائي) بە یاء (ي)، بێگومان وشەی (اللاء واللائي: اسم موصول لجماعة النساء، فهو اسم جمع التي)، (اللاء واللائي) ناوی مەوسووڵە بۆ کۆمەڵێك لە ئافرەتان و، ناوی کۆیە بۆ (التي)، (التي) یانی: ئافرەتێك، (اللائي) یانی: کۆمەڵە ئافرەتێك، هەروەك (اللاتي)یش هاتوە و، (اللائي)یش هاتوە.

﴿ تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ ﴾، واتە: ظیهاریان لێ دەکەن، (تظاهرون)ش بە چەند جۆرێك خوێنراوەتەوە:

أ- بە (تُظاهِرون).

ب- بە (تَظَّهَّرون).

ج- بە (تَظاهرون).

هەر سێکیان بە یەك واتان، واتە: ظیهاریان لێ دەکەن، ظیهاریش ئەوە بووە کە پیاوەکە بە ژنەکەی بڵێ: (أنتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمّي)، تۆ بۆ من وەك پشتی

دایکم وای، وەك چۆن دایکم لێم قەدەغەیە، تۆشم لێ قەدەغەی، کە ئەوە لە سەردەمی نەفامییدا، بە تەڵاق و جیابوونەوەی ژن و مێرد، دادەنرا.

٣)- ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ﴾، بە کوڕ کردووەکانیشتانی نەگێڕاون بە کوڕانتان.

(أَدعِیاء) کۆی (دعي)ە، (دعي) واتە: کوڕێك کە پاڵدەدرێتە لای جگە لە بابی، واتە: دەبێتە کوڕی یەکێکی دیکە، کەسێکی دیکە دەیکات بە کوڕی خۆی، کە پێی گوتراوە عادەتی (تبنّي) واتە: بە کوڕکردن، واتە: ئەو کوڕانەی کە بە کوڕی خۆتانتان کردوون، خوا نەیکردوون بە کوڕی خۆتان.

(الأدعیاء: جمع دعي بوزن فعیل بمعنی مفعول من مادة الإدّعاء)، (دعي) (فعیل)ە، بە مانای (مفعول)، واتە: بە کوڕ کراو، لە ماددەی (إدعاء)ەوە هاتووە، ئەویش بریتیە لەوە کە کەسێك شتێك بکات بە مافی خۆی لە ماڵ و ڕەچەڵەك، بێ ئەوەی بەڵگەیەك لەسەر ئەوە بێنێ، بەڵکو بە لاف لێدان و بە ئیددیعا.

٤)- ﴿ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ﴾، ئا ئەم قسەیەتان بەس قسەیە بە زارتان، واتە: تەنیا قسەیەکی ڕووتە و، هیچ حەقیقەتێکی نیە لەسەر زەوی واقیع.

٥)- ﴿وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ﴾، هەر خوا ڕاستیی و هەق دەبێژێ، وشەی (الحَقَّ: صِفَةٌ لمصدرٍ محذوف مفعول به ل (یقول) تقدیره: الکلام الحق)، واتە: (والله یقول الکلام الحق)، (القول الحق)، واتە: هەق سیفەتە بۆ چاوگێك کە قرتێنراوە و دەبێتە بەرکار (مفعول به) بۆ (یقول).

٦)- ﴿وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ﴾، هەر خوا بەرەو ڕاستە شەقام خەڵك ڕێنمایی دەکات، دەڵێ: (السَّبیلُ: الطَّرِیقُ السابلة الواضحة)، (السبیل) ڕێیەکە خەڵك پێیدا دەڕواو ڕۆشنە، هەر خوا خەڵك دەخاتە سەر ئەو ڕاستە ڕێیەو، خەڵك بەو ڕاستە ڕێیەدا ڕێنمایی دەکات.

٧)- ﴿ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ﴾، ئەوەش ڕاستە ڕێیەکەیە: کە بانگیان بکەن بۆ لای بابیان.

٨)- ﴿ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، ئەوە لەلای خوا دادگەرانەترە، ﴿ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، دەگەڕێتەوە بۆ چاوگێك كە دەفامرێتەوە لە كرداری: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ ﴾، واتە: بانگكردنیان بۆ لای بابیان، دادگەرانەترە لەلای خوا، (**هُوَ أَقْسَطُ: عَائِدٌ إلى المصْدَرِ المفهوم مِن فعل ادعوهم لآبائهم، أي الدُّعاء للآباء أقسط، أي هو قسط كامل، وغيره جور**)، (**أقسط**) لێرەدا مانای ئەوە نیە كە بەراورد كرابێ لەگەڵ شتێكی دیكەدا، كە كەمتر دادگەرانەیەو ئەویان دادگەرانەتر بێ، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە دادگەریی تەواو هەر ئەوەیە كە پاڵیان بدەنە لای بابیان و بانگیان بكەن بۆ لای بابیان.

٩)- ﴿ فَإِن لَّمۡ تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ ﴾، ئنجا ئەگەر بابەكانتانیان نەزانین و نەناسین، تەماشا بكەن! ئەو وردەكارییە هەر شایستەی خوایە ﷻ، شایستەی فەرمایشتی خوایە، باشە ئەوە كەسێك بابی دیار نەبوو وەك ئێستا لە ڕۆژئاوا، لە ئەورووپاو ئەمریكا، لە وڵاتانی ڕۆژئاوا، بە گشتیی زۆر كەس هەیە بابی خۆی ناناسێ، كاتێ خۆی من لە زیندانی (كرووپەڕ) كە لەلایەن ئەمریكاوە گیرابووم، پاسەوانەكان هەر لە بەینی خۆیاندا كە قسەیان دەكرد لەگەڵ گیراوەكان دەیانگوت: فڵانكەس نازانێ كوڕی كێیە، فڵانكەس بابی خۆی ناناسێ، ئەوە شتێكی ئاساییە لەوێ، كە لە كوردەوارییدا ئێمە بەو كەسانە دەڵێین: زۆڵ، بیژوو، كە نازانێ بابی كێیە، ئنجا ئەوەش لە سەردەمی نەفامییدا وابووە، كە جاری وابووە چەند پیاوێك چوونە لای ئافرەتێك، یان ئافرەتێك لەگەڵ چەند پیاواندا جووت بووە، دوایی منداڵی بووە، نەیزانیوە هی كامیانە، مەگەر هەروا لە خۆڕا پاڵیدابێتە لای یەكێكیان، جاری واش هەبووە كە كەسەكان دیارییكراو نەبوون، پاڵیبداتە لای كەسێك نەیانزانیوە بابی كێیە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن لَّمۡ تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ ﴾، ئەگەر بابیانتان نەزانین، بابەكانیانتان نەزانین و نەناسین.

١٠)- ﴿ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡ ﴾، ئەوانە برای ئایینیتانن و، دۆست و نیزیكتانن، (**ومواليكم**) لێرەدا (و) بە مانای (یان) (أو)ە: ﴿ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡ ﴾، واتە: برای دینیتانن، یاخود دۆست و نیزیك و هاوكارتانن، (**الواو: بِمَعْنَى (أو) و«الموالي»: يقصد بهم المتحالفون**)، (**موالي**) كۆی (**مولى**)یە، هەم بە خاوەن و ئازادكەر (**مُعْتِقْ**) گوتراوە،

کەسێك کە کەسێك یان کۆیلەیەکی ئازادکردوە، هەم بە (مُعْتَقْ) کەسێك کە ئازاد کراوە، هەروەها (مولى) بە (دۆست و نیزیك)یش لێکدراوەتەوەو (موالیکم) باشترە وا لێکبدرێتەوە هەر کۆی (مولى)یە، واتە: نیزیك دۆست، یانی: برای دینییتانن، یان دۆست و نیزیکتانن، ئەگەر برای دینیشتان نەبن، چونکە هەبووە مسوڵمان نەبووە، ئنجا چی پێ دەگوترێ؟ پێی دەگوترێ دۆست و نیزیك.

دەشـگونجێ (مـوالي) مەبەسـت پێـی هاوپەیمانـان بووبـن، ئەوانـەی پەیمانیـان لەگـەڵ یەکدیـدا هەبـووە، کەسـێك لـە عەشـیرەتێکی دیکـە بووە، بـەڵام پەیـمانی لەگەڵ ئـەو عەشـیرەتەدا هەبـووە، پێیـان گوتـوە ئـەو کەسـە (مَـولى)ی ئـەو عەشـیرەتەیە، یـان ئەوانـە (مـوالي) ئـەو عەشـیرەتەن، واتـە: هاوپەیمانـن لەگەڵیانـدا، لێـرە بـە تەئکید خـوا ﷻ ئـەوەی هەڵوەشـاندۆتەوە، ئەمـە پێـی دەگوتـرێ: نەسـخ کرانـەوەی سـوننەتی کردەیـی بـە قورئـان، یـانی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێـش ئـەوەی خـوا ئـەو حوکمـە هەڵبوەشـێنێتەوە، کاری پێکـردوەو زەیـدی کـردوە بـە کـوڕی خـۆی، بـەڵام دوایـی خـوا ﷻهەڵیوەشـاندۆتەوە.

١١)- ﴿ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ ﴾، گوناهتان ناگاتێ لەوەدا کە بە هەڵە بیڵێن، واتە: بە هەڵە، بە قسەی زار کەسێك بڵێ: فڵانکەسی کوڕی فڵانکەس، بێ ئەوەی کوڕی بێ، لەبەر ئەوەی لە سەردەمی نەفامییدا کردوویەتی بە کوڕی خۆی، ئنجا مادام بە هەڵە بێ، گوناهتان ناگاتێ.

١٢)- ﴿ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ﴾، بەڵام ئەوەی کە دڵتان بە ئەنقەست دەیکات و، دڵتان بە ئەنقەست بە ئامانجی دەگرێ: (قصدتموه بقلوبکم، قصدته قلوبکم عَامِدَةً)، بە دڵ بە ئامانجتان گرتوە، یاخود دڵەکانتان بە ئەنقەست کردوویەتی و بە مەبەست، لەسەر ئەوە گوناهبار دەبن.

١٣)- ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

لەو بارەوە چەند دەقێك دێنین:

**یەکەم: {عَنْ سَعْدٍ وَأَبِي بَكْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، كِلاَهُمَا يَقُولُ: سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ، وَوَعَاهُ قَلْبِي أَنَّ مُحَمَّدًا ﷺ يَقُولُ: «مَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ، وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ، فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ»} (أخرجه البخاري: ٦٧٦٦، ومسلم: ١١٥).**

واتە: سەعدو ئەبوو بەکرە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕنەوە، دەڵێن: هەردوو گوێیەکانم بیستیان و دڵم وەریگرت، کە موحەممەد ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك یەکێك پاڵبداتە لای جگە لە بابی، بشزانێ کە ئەوە بابی نیە، ئەوە بەهەشتی لێ حەرامە.

**دووەم: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لاَ تَرْغَبُوا عَنْ آبَائِكُمْ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ أَبِيهِ، فَهُوَ كُفْرٌ»} (أخرجه البخاري: ٦٧٦٨، ومسلم: ١١٣).**

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ پیاوێك نیە کە لاف ئەوە لێ بدات و خۆی بداتە لای جگە لە بابی و، بشزانێ کە ئەوە بابی نیە، مەگەر ئەوە کوفری گوتوە (یان سپڵەیی نواندوە).

**سێیەم: {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ، مَوْلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، مَا كُنَّا نَدْعُوهُ إِلاَّ زَيْدَ بْنَ مُحَمَّدٍ، حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ: ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾}، (أخرجه أحمد: ٥٤٧٩، والبخاري: ٤٧٨٢، ومسلم: ٢٤٢٥، والترمذي: ٣٢٩٠).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: زەیدی کوڕی حاریسە، کۆیلەی ئازادکراوی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە هەر بە زەیدی کوڕی موحەممەد بانگمان دەکرد[1]، هەتا قورئان دابەزی: ﴿ ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: بە ناوی بابیانەوە بانگیان بکەن. (دوای دابەزینی ئەم ئایەتە هەر دەیانگوت: زەیدی کوڕی حاریسە).

---

(١) کاتی خۆی پێش پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەر ﷺ وەك کۆیلە کەوتبووە ژێر دەستی، دوایی ئازادی کردبوو و، کردبووی بە کوڕی خۆی، کە ئەوەش پلەو پێگەیەك بووە بە هەموو کەس نەدراوە.

ئـەوە کـە دەفەرمـوێ: گوناهاتـان ناگاتـێ لـەوەدا کـە بـە زار بیڵێـن: زانایـان گوتوویانـە: یەکێـك لەوانـە کـە پاڵدراوەتـە لای جگـە لـە بابـی و، پێشـیەوە نـاسراو بـووە، میقـدادی کـوڕی ئەسـوەد بـووە، کـە کاتێ خـۆی (الأسـود) یەکێـك بـووە لـە زلەزلـەکانی قوڕەیـش، لەسـەردەمی نەفامیـی دا، میقـدادی تەبەننیـی کـردوەو کردوویـەتی بـە کـوڕی خـۆی، ئەگەرنـا بابـی نـاوی عەمـر بـووە، بـەڵام دواییـش هـەر بـە میقـدادی کـوڕی ئەسـوەد نـاسراوە، بـەڵام مـادام بـۆ ناسـینەوە بـووە، ئـەوە گوناهباریـی تێـدا نیـە، چونکـە شـتێك بـە زار دەگوترێ، نـەك خەڵکەکـە دڵـی خۆیـان لەسـەر چەسـپاندبێ، چونکـە وا نیـە.

(القرطبي) دەڵـێ: (وَلَـمْ يُسْـمَع فِيمَـن مَـضَى مَـنْ عَـصَى مُطْلِـق ذَلِـكَ عَلَيْـهِ، وَإِنْ كَانَ مُتَعَمِّـدًا وَكَذَلِـكَ سَـالِمُ مَـوْلَى أَبِي حُذَيْفَـة، كَانَ يُدْعَـى لأَبِي حُذَيْفَـة)[1].

واتـە: لـەوەدا کـە ڕابـردوە، نەبیسـتراوە هیـچ کـەس نـەو نـاوەی کـە لـێ هەڵـدەدا (بـۆ وێنـە: کـە دەڵێـن: میقـدادی کـوڕی ئەسـوەد) بـە گوناهبـار دابـنرێ، هەروەهـا سـالیمی مـەولای حوزەیفـە، دیسـان هـەر پاڵدراوەتـە لای ئەبـوو حوزەیفـە، کەچـی کـوڕی ئـەو نەبـووە، بەڵکـو کاتێ خـۆی ئـەو تەبەننیـی کـردوە.

جـاری واش هەبـووە، ئەوانـەی تەبەننیـی کـراون، بابیـان نـاسراو نەبـووە، هەتـا لـە شـوێنەوارێکدا هاتـوە: فڵانکەسـە بابـی خـۆی نەدەنـاسی، ئەگـەر زانیبـای بـابی گـوێ درێژێکیشـە، نـاوی دەهێنـاو خـۆی پاڵدەدایـە لا، بۆیـە هـەر بـە نـاوی کەسێکی دیکـە بانـگ کـراون، بـۆ وێنـە: گوتوویانـە: (زیـاد بـن أبیـه)، بـەڵام دوایـی ئەبـوو سـوفیان گـوێ: کاتێ خـۆی مـن لەگـەڵ دایکیـدا جووتبـووم لەسـەردەمی نەفامیـی دا، ئنجـا ناویـان لێنـا (زیـاد بـن أبي سـفیان).

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ١١٩.

**مەسەلەی سێیەم:**

**پێغەمبەر ﷺ بۆ بڕواداران لە خۆیان لە پێشترەو، هاوسەرەکانیشی دایکانیانن و، خزمانیش لە حوکمی کتێبی خوادا، بە میرات لە یەکدی گرتن لە خەڵکی دیکە شایستەترن و، ڕێش لە چاکە لەگەڵ یەکدی کردن نەگیراوە، وەك دۆستایەتیی و برادەرایەتیی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ۗ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا ﴿٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾، پێغەمبەر ﷺ بۆ بڕواداران لە خۆیان لێیان لە پێشترە، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەمە دەبێ شتێك تەقدیر بکرێ، بۆ وێنە: پاڵدراو (مضاف)ێك تەقدیر بکرێ، وەك: **(النّبي أَوْلَى بِمَصَالِح المؤمنين)**، **(بالمؤمنين)** واتە: **(بمصالح المؤمنين)**، پێغەمبەر ﷺ بە بەرژەوەندییەکانی بڕواداران نیزیکترە لە خۆیان، واتە: ئەگەر بەرژەوەندییەکی پێغەمبەر ﷺ یان شتێك هەبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێویستیی پێبێ و، ئەو مرۆڤەش بۆ خۆی پێویستیی بە شتێك بێ، دەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ پێش خۆی بخات، وەك لە سوورەتی **(التوبة)**دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ﴿١٢٠﴾ ﴾، واتە: نابێ خۆیان هەڵبژێرن بەسەر نەفسی پێغەمبەردا ﷺ.

کەواتە: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾، **(أي: أَشَدُّ قُرْبَاً وَيَتَضَمَّنُ (أَوْلَى) الأَحَقِيَّة بالشيءِ)**، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بڕواداران لە خۆیان لێیان نیزیکترە، ئنجا وشەی **(أَوْلَى)** شایستە بوون بە شتێك دەگرێتە خۆی، وەك پاڵدراو **(مُضاف)**ێك لەوێدا مەزەننە (تقدیر) بکرێ، یانی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەرژەوەندیی بڕواداران نیزیکترەو لە پێشترە لە خودی خۆیان.

٢)- ﴿ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ﴾، هاوسەرەکانیشی دایکانیانن، لەو بارەوە کە ئایا هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ بە دایکانی پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار لە قەڵەم دەدرێن؟ یان تەنیا بە دایکانی پیاوان لە قەڵەم دەدرێن؟ لەو بارەوە ڕاجیایی هەیە: لە دایکمان عائیشەوە گێڕدراوەتەوە کە ئافرەتێك جارێك پێی دەڵێ: (یا أمّاه!) ئەی دایکە! ئەویش دەڵێ: من دایکی پیاوەکانتانم، دایکی ئافرەتان نیم، بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: کە خوا دەفەرموێ: هاوسەرەکانی دایکانی بڕوادارانن، ئەم تەعبیری (مؤمنين) یان (مؤمنون) کە لە قورئاندا هاتوە، مەگەر بەڵگەو نیشانەیەك هەبێ، ئەگەرنا نێر و مێ دەگرێتەوە، هەموویان دەگرێتەوە واتە: بڕواداران چ نێر بن چ مێ، لەبەر ئەوە ئەو مانایە بەهێزترە و، ڕەنگە ئەوەی کە لە دایکمان عائیشەوە گێڕدراوەتەوە خوا لێی ڕازی بێ، ڕاست نەبێ، یان ئەوەتا دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازیبێ، لەوەدا نەیپێکابێ، ئەگەرنا لە ڕاستییدا بۆ پیاوان و ئافرەتانیان، وەك دایکیان بوون، هەڵبەتە وەك دایکیان بوون، یانی: لە ڕووی ڕێزلێگرتن و حورمەت و، بۆ پیاوانیان لە ڕووی ئەوەوە کە پێیان ناشێن، بۆ ئافرەتان و پیاوان، پێغەمبەری خوا ﷺ وەك بابیان بووەو، هاوسەرەکانیشی وەك دایکیان بوون.

٣)- ﴿ وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ ﴾، خاوەن نیزیکایەتییەکان لە کتێبی خوادا، لە یەکدی لە پێشترن لە بڕواداران و کۆچکەران، یانی: خزمایەتیی ڕاستەقینە زاڵترە لە برایەتییەك کە دانراوە بۆ قۆناغێکی کاتیی.

(فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ) یانی: لەوەدا کە خوا نوسیوویەتی و، لەو کتێبەی خوادا کە قورئانە، خوا لەوێدا تۆماری کردوە، خزمان لە کێ لە یەکدی نیزیکترن؟ بڕواداران بە گشتیی و، لە کۆچکەرانی بڕواداران بە تایبەتیی، لە ڕووی میرات لە یەکدی گرتنەوە، ئەم ڕستەیە زانایان ئاوایان لێکداوەتەوە: (أي: أولُوا الأرْحَامِ أولى بـإرثِ ذَوِي أرْحَامِهِـم مِـنْ إرْثِ أصْحَـاب ولايـة الإيْمَـان وَالهِجْـرَة)، واتە: خزمان بۆ میراتگرتنی خزمانیان لە ئەوانە کە بە هۆی ئیمانەوە کرابوون، بە برا بە شێوەیەکی کاتیی و میراتیان لە یەکدی دەبرد، لە پێشترن و لە یەکدی نیزیکترن.

٤)- ﴿إِلَّآ أَن تَفۡعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِكُم مَّعۡرُوفٗاۚ﴾، مەگەر چاكەیەك لەگەڵ دۆستەكانتاندا بكەن، [(إلاّ) لێرەدا (إستثناء منقطع) بمعنى (لكن)]، هەڵاواردنێكی دابڕاوە بە مانای (بەڵام)ە، یانی: بەڵام ئەگەر بتانەوێ چاكەیان لەگەڵدا بكەن، ئەوە ڕێی لێنەگیراوە، بۆچی؟ چونكە هەڵاواردن پەیوەست (إستثناء متصل) ئەوەیە كە (مستثنى ومستثنى منه) یەك جۆر بن، وەك (جاء القومُ إلاّ محمّدٌ)، بەڵام (إستثناء منقطع) هەڵاواردنی دابڕاو ئەوەیە كە (مستثنى ومستثنى منه) واتە: هەڵاوێردراو و لێ هەڵاوێردراو، یەك جینس نەبن، وەك لە زمانی عەرەبییدا ڕێزمان زانان وێنەیان بە: (جاء القوم إلاّ حمار) واتە: خەڵكەكە هات جگە لە كەرێك، كەرەكە، یەكێك نیە لە قەومەكە.

لێرەش: (لِأنّ مَا بَعْد «إلاّ» لَيْسَ مِنْ جِنْس مَا قَبْلَهَا، إذ الأوْلَوِيّة الّتِي أُثْبِتَت لأُولِي الأَرْحَام، أَوْلَوِيَّةٌ خَاصّة وَهِيَ أولويّة المِيراثِ بدلالَةِ السّيَاق)، واتە: چونكە ئەوەی لە دوای (إلاّ)وە هاتوە: ﴿إِلَّآ أَن تَفۡعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِكُم مَّعۡرُوفٗاۚ﴾، لە جینسی ئەوەی پێشێ نیە كە: (أولوا الأرحام)ە، چونكە ئەو لە پێشتریەی كە چەسپاوە بۆ خزمان، لە پێشترییەكی تایبەتە كە بریتیە لە پێشتربوون بۆ میراتگرتن، بە دەلالەتی ئەو سیاقە كە ئەوەی تێدا هاتوە.

٥)- ﴿كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا﴾، ئەوە لە كتێب دا تۆمار كراو بووە. (الكتاب) كە (أل)ی ناساندنی لەسەرە بۆ (عهد)ە، واتە: ئەوە لە كتێبەكە لە كتێبی خوادا، لەوەدا كە خوا لەسەر خەڵكی نووسیوەو پێویستی كردوە، تۆماركراوە، دەشكونجێ (الكتاب) (أل)ی (تعریف) بێ و بۆ (عهد) بێ، بەڵام مەبەست لە (كتاب)، (لوح محفوظ) بێ، یانی: زانیاریی خوا ﷻ واتە: دەگونجێ كە دەفەرموێ: (في كتاب الله) ئەم (كتابُ الله)یە، لەگەڵ ئەو (الكتاب)ە، لە یەك جیا بن، (كتاب الله) قورئانە، بەڵام (الكتاب) لێرەدا واتە: زانیاریی خوا، ئەم ڕایەش بەهێزترە، دەشكونجێ هەر یەك بن و، ئەو كاتە (ال) بە هی (عهد) دادەنرێ، واتە: لە كتێبەكەدا كە (كتاب الله)ەو پێشتر ناوی هاتوە.

پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە كە دەبێ وا مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ، كە بۆ بڕواداران لە خۆیان لێیان لە پێشترەو نیزیكترە و شایستەترە، فەرمایشتی زۆرن، دوو فەرموودەیان لێ بە نموونە دێنینەوە:

**یەکەم: {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَن النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ مُؤْمِنٍ إلاَّ وَأَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ تَرَكَ مَالًا فَلْيَرِثْهُ عَصَبَتُهُ مَنْ كَانُوا، فَإِنْ تَرَكَ دَيْنًا، أَوْ ضَيَاعًا، فَلْيَأْتِنِي فَأَنَا مَوْلاَهُ} (أخرجه البخاري: ٢٣٩٩، ومسلم: ١٦١٩)**، واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هیچ بڕوادارێك نیە، مەگەر من نیزیکترین کەسم لێی لە دنیاو لە دواڕۆژدا، ئەگەر دەتانەوێ بەڵگەی ئەوە بزانن، بخوێننەوە، **(النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ)**، ئنجا هەر بڕوادارێك ماڵ و سامانێکی بەجێهێشت با خزمەکانی پشتێی، خزمە میراتگرەکانی لێی بەمیرات بگرن، (هەر کەسێك بن)، بەڵام ئەگەر قەرزێکی بەجێهێشت (قەرزی لەسەر بوو)، یاخود ماڵ و منداڵێك کە دەبوو سەرپەرشتیی بکرێ، ئەگەرنا زایەدەبوون، با بێت بۆ لای من، من دۆست و سەرپەرشتیارو نیزیکم بۆی.

**دووەم: {عَن أَنَس ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ، حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ} (أخرجه البخاري: ١٤، ومسلم: ٦٧)**، واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هیچ کامێکتان بە بڕوادار لە قەڵەم نادرێن، تاکو منی لە لا خۆشەویستتر نەبێ لە باب و دایکی و منداڵ و، وەچەکەی و، تێکڕای خەڵکی.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**پەیمانی پتەو وەرگرتنی خوا لە پێغەمبەران بە گشتیی و، بە تایبەت موحەممەدو نووح و ئیبراهیم و مووساو عیسای کوڕی مەریەم (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) تاکو خوا لە ڕاستیی ڕاستان بپرسێ و، بێبڕوایانیش سزایەکی بە ئێش بدات:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۖ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٧﴾ لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّـٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ ۚ وَأَعَدَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)- ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ﴾، یادیش بکەوە کاتێك پەیمانێکی پتەومان لە پێغەمبەران وەرگرت.**

(وَإِذ) (و) بۆ یادانەوەیەو ئەمە دەباتەوە سەر ئەوەی پێشێ، واتە: هەروەها (إذ)یش، یانی: یاد بکەوە (اذکر)، کاتێك پەیمانیانمان لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) وەرگرت بە گشتیی، (المِيثَاقُ: إسمٌ للعَهْدِ وَتَحْقِيقُ الوَعْد)، ناوە بۆ پەیمان و جێبەجێکردنی بەڵێن، ئایا ئەو بەڵێن و پەیمانەی کە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) وەرگیراوە، چی بووە؟ خوا ﷻ بە گشتیی باسی کردوە، بەڵام بە ڕەوت (سیاق)و بە عەقڵ و سەلیقە دەزانرێ، کە ئەو پەیمانەی لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) وەرگیراوە، دەبێ شتێك بێ تایبەت بێ بەوانەوە، ئەویش ئەوەیە: مادام خوا کردوونی بە نوێنەری خۆی و، ڕەوانەکراوی خۆی، دەبێ پەیامی خوا بگەیەنن بە بەندەکان و، دەبێ بەندەکان دڵخۆش بکەن و، موژدەیان پێ بدەن، ئەگەر ڕێی خوا بگرن و، بیانترسێنن و هۆشیاریان بکەنەوەو هۆشدارییان پێ بدەن، ئەگەر لار بڕۆن و لە ڕێ لابدەن و، دەبێ

ئـەو ئاییـن و بەرنامەیـەی خـوا پێیـدا نـاردوون، هەوڵبـدەن لـە خۆیانـدا، لـە مـاڵ و خێزانیانـدا، لـە دەوروبەریـان، لـە کۆمەڵگایانـدا، لـە هەمـوو ڕووەکانەوە بەرجەسـتەی بکـەن و جێبەجێـی بکـەن، خـوا ئـەو بەڵێنەی لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّلاَةُ وَالسَّـلاَم) وەرگرتـوە، دەزانـرێ کـە ئـەو بەڵێـن و پەیمانـە، نێوەڕۆکەکـەی ئەوەیـە.

٢)- ﴿ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴾، هەروەها لە تۆو لە نووح و ئیبراهیم و مووساو عیسای کوڕی مەریەم، دوای ئەوەی کە بە گشتیی باسی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەکات، ئنجا دەفەرموێ: هەروەها بە تایبەت: پەیمان و بەڵێنی پتەومان لە تۆ و، لە نووح و ئیبراهیم و مووساو عیسای کوڕی مەریەمیش وەرگرت، ئەمە لە زمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: (ذِكْرُ الخَاصِّ بَعْدَ العَام)، باسکردنی شتی تایبەتە لە دوای شتی گشتیی، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە گشتیی پەیمانیان لێوەرگیراوە، بەڵام بە تایبەت لە تۆ ئەی موحەممەد! ﷺ و لە نووح و، لە ئیبراهیم و، مووساو، عیسای کوڕی مەریەم، ئەم پێنج (٥) پێغەمبەرە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لە سوورەتی (الشورى)ش دا خوای پەروەردگار پێکەوەی هێناون، کە دەفەرموێ: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: خوا لە ئایینی گشتیی خۆی بەرنامەی بۆ داناون، ئەوەی کە نووحی پێ ڕاسپارد بوو و، ئەوەی بۆ تۆمان سروشکردوە و، ئەوەی کە ئیبراهیم و مووساو عیساشمان پێ ڕاسپارد بوون، (ئەویش بریتیە لەوەی:) ئایین بەرپا بکەن و تێیدا پەرتەوازە مەبن.

کەواتـە: ئـەو پەیمانـەی کـە لێـرە وەرگیـراوە، هـەر ئەوەیـە کـە ئاییـن بەرنامـەی خـوا، دەبـێ ڕابگەیەنـرێ و بەرپـا بکـرێ و، بەرجەسـتە بکـرێ لەسـەر زەوی و، تێیـدا پەرتـەوازە نەبـن، ئنجـا هەندێـك لـە زانایـان - وەك لـە (موسـوعة) عەرەبییەکـەی خۆم: (الإسـلام كـما يتجـلى في كتـاب اللـه) لـە بەرگـی پێنجـەم (٥)دا، کـە تەرخانـم کـردوە بـۆ بـاسی پێغەمبـەران، ئـەو پێنـج (٥) پێغەمبـەرە کـە لێـرەدا پێکـەوە هاتـوون واتـە: نـووح و ئیبراهیـم و مووسـاو عیسـا و موحەممـەد (عَلَيْهِـمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، هەروەهـا لـە سـوورەتی (الشـورى)ش دا پێکـەوە هاتـوون، هەندێـك لـە زانایـان کردوویانـە بـە

بەڵكـە لەسـەر ئـەوەی كـە خـوا بـە پێغەمبـەری خاتـەم دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ﴿٣٥﴾ ﴾الأحقاف، واتـە: خـۆت ڕابگـرە وەك چـۆن خـاوەن عـەزم و ئیـرادە پتـەوەكان لـە پێغەمبـەران خۆیـان ڕاگـرت، گوتوویانـە: (أولـوا العـزم) ئـەو پێنجـەن.

بـەڵام مـن لـەوێ دا باسـم كـردوە، كـە لـە ڕاسـتییدا ئـەو بۆچوونـە ڕاسـت نیـە، پێغەمبـەران تەنیـا ئـەو پێنجەیـان خـاوەن عـەزم نەبـوون، بەڵكـو پێغەمبـەران هەموویـان خـاوەن عـەزم و ئیـرادەی پتـەو بـوون، بەڵـێ دەگونجـێ بگوتـرێ: ئـەو پێنجەیـان ناسراوتـرن، یاخـود ئیـرادەو عەزمەكەیـان بەهێزتـر بـووە، بـەڵام مانـای وا نیـە پێغەمبـەرانی دیكـە خـاوەن عـەزم نەبـوو بـن، لـە سـوورەتی (طـه)دا خـوا لـە بـارەی ئادەمـەوە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ ﴾طـه، عەزمـمان پێـوە نەبینـی واتـە: لـەو هەڵوێسـتەدا عەزمـمان پێـوە نەبینـی، نـەك ئـادەم خـاوەن عـەزم نەبـوو بـێ، واتـە: لـەو هەڵوێسـتەدا كـە خـۆی مـەرزەم بـكات و، لـە درەختـە قەدەغەكراوەكـە نەخـواو، بـە فێڵـی شـەیتان هەڵنەخەڵەتـێ، لـەوەدا عەزیمـەت و عـەزم و ئیرادەیـەكی پتەومـان پێـوە نەبینـی، نـەك بـە گشـتیی ئـادەم خـاوەن عـەزم نەبووبـێ، یاخـود تەنیـا ئـەو پێنـج پێغەمبـەرە خـاوەن عـەزم بووبـن!!

كـە ئـەوە هەڵەیەكـە، مـن كاتی خـۆی لـەو مەوسـووعەیەدا ڕاسـتم كردۆتـەوە، چونكـە بێگومـان تەنیـا بـە خـاوەن عـەزم لـە قەڵەمـدانی ئـەو پێنـج پێغەمبـەرە، نوقسـانیی و پاڵدانـە لای پێغەمبـەرانی دیكەیـە، ئنجـا ئێمـە هـەر لەبـەر ئـەوەی مەدحـی پێنـج لـە پێغەمبـەرانی خـوا دەكەیـن، بـا لـەوانی دیكـەش ناسراوتـر و پلـە بەرزتـر بـن، بێنیـن ئـەوانی دیكـە بشـكێنین، شـتێكی خراپـمان كـردوە، چونكـە لـە ڕاسـتییدا پێغەمبـەران، هـەر كامێكیـان لـە ڕۆژگاری خۆیـدا لـە نێـو خەڵـكی خۆیـدا، باشـترین بـووە و، پێغەمبـەران بـە گشـتیی باشـترینی مرۆڤەكانـن، وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (النمـل)دا دەفەرمـوێ: ﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾النمـل، واتـە: بڵـێ سـتایش بـۆ خـواو سـەلامی خـوا لەسـەر ئـەو بەندانـەی كـە هەڵیبـژاردوون، یـان دەفەرمـوێ: ﴿ ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ

ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٧٥﴾ ﴾الحج، واتە: خوا لە فریشتەکان و لە خەڵکی نوێنەران هەڵدەبژێرێ، بە دڵنیایی خوا بیسەری بینەرە.

پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەڵبژێردراوانی خوای پەروەردگارن و، لە سووڕەتی (ص)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: ئەوانە بەندە بژاردەو گوڵبژێرکراوەکانی ئێمەن.

٣)- ﴿ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴾، هەروەها پەیمانێکی زۆر پتەو و مەحکەممان لێوەرگرتن، (الغليظ: القوي المتين الخلق)، (الغليظ) شتێکە کە قایم و قوڵ دروست کرابێ، بەڵام (اسْتُعِيرَ هُنَا للعظِيم الرَّفِيعِ فِي جِنْسِهِ)، لێرە خوازراوەتەوە، بۆ شتێکی مەزن و بەرز لە جینسی خۆی.

٤)- ﴿ لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّـٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ ﴾، تاکو لە بارەی ڕاستییانەوە لە ڕاستان بپرسێ.

خوا ﷻ بۆیە پەیمانی لە پێغەمبەران وەرگرتوە، پێغەمبەرانی ناردن و پەیمانی لێوەرگرتن، تاکو لە ڕاستان بپرسێتەوە دەربارەی ڕاستییەکەیان.

٥)- ﴿ وَأَعَدَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾، بۆ بێبڕوایانیش سزایەکی بە ئێشی داناوە، ئەم (ل)ە، هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەمە (ل)ی (عاقبة)یە، تاکو سەرەنجام ئاوای لێبێ، وەك لە سووڕەتی (القصص) دەفەرموێ: ﴿ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ ﴾، چونکە ئالی فیرعەون، بنەماڵەی فیرعەون و شوێن کەوتووانی فیرعەون، بۆیە مووسای مەلۆتکەیان هەڵنەگرتەوە، کە بۆیان ببێ بە دوژمن و مایەی دڵتەنگیی، کەواتە: لێردا (ل)کە، (ل)ی سەرەنجامە کە سەرەنجام وایلێبێ، تاکو سەرەنجام خوا ﷻ لە ڕاستان بپرسێتەوە، دەربارەی ڕاستییەکەیان، ئنجا ڕاستان دەگونجێ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) مەبەست بن، کە لە لووتکەی ڕاستییدا بوون، دەشگونجێ مەبەست هەموو ئەو بڕوادارانە بن، کە بە دوای پێغەمبەران کەوتوون، بەڕاستیی، بۆ ئەوەی خوا لێیان بپرسێتەوە، چونکە ئەگەر پێغەمبەریان بۆ نەنێررابان و، پەیامی خوایان بۆ ڕەوانە نەکرابایەو، دوایی خوا لێی

پرسیبانەوە، بیانوویان دەبوو، پاساویان دەبوو، دەیانگوت: خوایە! نەمانزانی تۆ چیت پێ چاکەو، چیت پێ خراپە، تاکو چاکەکە بکەین و خۆمان لە خراپەکە بپارێزین، هەروەها بۆ ئەوەی بێبڕوایانیش خوا ﷻ ئازارێکی بە ئێشیان بۆ دابنێ، ئەو کاتە ئەوانیش هیچ بیانوو پاساویان نابێ.

سُبْحَانَك اللّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان ئایەتەكانـی: (٩ - ٢٧) واتـە: نـۆزدە (١٩) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، تێیانـدا بـاسی جەنگـی ئەحـزاب (خندق) كـراوە، كـە لـە سـاڵی پێنجەمـی (٥) كۆچیـی دا ڕوویـداوە، بەڵكـو دەتوانیـن بڵێیـن: حەڤـدە (١٧) ئایـەتی بـاسی جەنگـی خەندەقـن و، دوو (٢) ئایەتیشـیان بـاسی جەنگـی بـەنی قوڕەیـزەن، كـە هـەردوو جەنگەكـە بـە دوای یەكـدا بـوون و لـە كۆتایـی سـاڵی پێنجەمـی كۆچییـدا ڕوویانـداوە، لـە مانگـی شـەووالدا كـە دەكاتـە مانگـی دە (١٠)یـەم لـە سـاڵی كۆچیـی دا، كـە (بنـو قریظـة) ی جوولەكـە هـەر لەمیـانی جەنگـی ئەحزابـدا پەیمانیـان لەگـەڵ پێغەمبـەر و ﷺ مسـوڵمانانـدا شـكاند و، ویسـتیان خەنجـەری غـەدر لـە پشـتەوەڕا لـە مسـوڵمانان بـدەن، بـەڵام خـوای دادگـەر و باڵادەسـت پیلانەكەیـانی هەڵوەشـاندەوەو، كـردی بـە نەخـشی سـەر ئـاو.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا
وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ
أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠
﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى
قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا
مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن
يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ لَءَاتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا۟
بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَٰرَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ

مَسْـُٔولًا ﴿١٥﴾ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا
قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ
لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ ۞ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ
إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ
تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ
أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾
يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ
يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى
رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَمَّا
رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ
إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ
نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ
ٱلْمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾ وَأَنزَلَ
ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا
تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢٧﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

[ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! یـادی چاکـەی خـوا بکەنـەوە بەسـەرتانەوە، کاتێك سـەربازانێك (سـوپایەك) بۆتـان هاتـن، ئێمـەش بایـەك(ی بەهێز)مـان نـاردە سـەریان، وێـڕای سـەربازانێك (لـە فریشـتان) کـە نەتاندەدیـتن و، خـواش بینـەری ئەوەبـوو کـە دەتانکـرد ﴿٩﴾ کاتێـك لـە سـەرووتانەوە و، لـە لای خوارووتانـەوە بۆتـان هاتـن (ئابڵووقەیـان دان) و، ئـەو حاڵـە یـاد بکەنـەوە کـە چاوەکان (لـە تـرس و حەژمەتـان) لایانــدا، (ئەبڵــەق بــوون) و دڵــەکان گەیشــتنە گــەرووان و، گومــانی جۆراوجۆرتــان بـە خـوا دەبـردن ﴿١٠﴾ لـەو کات و شـوێنەدا بـڕواداران تاقیکرانـەوەو بـە سـەختیی ڕاتەکێـنران ﴿١١﴾ هەروەهـا یـاد بکەنـەوە کاتێـك مونافیقـەکان و ئەوانـەی دڵەکانیـان نەخۆشـیی تێدایـە، دەیانگـوت: خـواو پێغەمبەرەکـەی تەنیـا گفتـی فریودەریـان پێداویـن ﴿١٢﴾ دیسـان یـاد بکەنـەوە کاتێـك کۆمەڵێکیـان گوتیـان: ئـەی خەڵـکی یەثریـب! هیـچ شـوێنی مانەوەتـان نیـە (سـوود لـە مانەوەتـان لێرەدا نیـە لـە مەیدانی جەنگـدا) و، بگەڕێنــەوە (ماڵــەکانی خۆتــان)، هەروەهــا کۆمەڵێکیــان مۆڵەتیــان لــە پێغەمبـەر وەردەگـرت دەیانگـوت: بێگومـان ماڵەکانمان بـە دەرەوەن (هیـچ پارێزەریان نیـە)، لـە حاڵێـك دا کـە (ماڵەکانیـان) بـە دەرەوەش نەبـوون (بـێ پارێـزەر نەبـوون) تەنیـا مەبەسـتیان ڕاکـردن بـوو ﴿١٣﴾ ئەگـەر هاتبـاو لـە لایـەکانی شـارەوە بەسـەریاندا درابایـە (و دوژمـن لێیـان وە ژوورکەوتبایـە)، ئنجـا داوای هەڵگەڕانەوەیـان لێکرابایـە، دەیانکـردو کەمێـك نەبـێ جێبەجێکـردنی ئـەو (داواکاری)ەیـان نەدەوەخرانـد ﴿١٤﴾ هەرچەنـدە بـە دڵنیاییشـەوە پێشـتر پەیمانیـان بـە خـوادا بـوو کـە پشـت ناکەنـە دوژمـن و، بێگومـان پەیـمانی خـواش لێـی دەپرسرێتـەوە ﴿١٥﴾ پێیـان بڵـێ: ئەگـەر لـە مـردن و کوشـتن ڕابکـەن، ڕاکـردن سـوودتان پـێ ناگەیەنـێ و، لـە حاڵـی قوتاربوونیـش دا کەمێـك نەبـێ (لـە ژیـانی دنیـا) بەهرەمەنـد ناکرێـن ﴿١٦﴾ بڵـێ: ئایـا ئەگـەر خـوا خراپـە و زیانێـکی بۆتـان بـوێ، یـان بەزەییـەکی بۆتـان بـوێ، ئـەو کەسـە کێیـە کـە لـە

بەرانبەریدا دەتانپارێزێ و چەپاڵەتان دەدات! (بێگومان) جگە لە خوا هیچ دۆست و پشتیوانێك شك نابەن ﴿١٧﴾ مسۆگەر خوا ئەوانەتان باش دەناسێ کە پەکخەرو کۆسپن (لە بەشداریی کردنی جەنگ دا)، هەروەها بێژەران بە برایەکانیان: وەرنە لامان (و مەچن بۆ جەنگ) دەناسێ، لە حاڵێك دا کە خۆشیان کەمێك نەبێ ناچن بۆ جەنگ ﴿١٨﴾ ئەوانە (لە هەموو ڕوویێکەوە) لەگەڵتان چرووکن، (بێ خێرن بۆتان، کاتێکیش ترس دێ، دەیانبینی تەماشات دەکەن، چاویان دەسووڕێن وەك کەسێك کە لە کاتی مردن دا بێهۆشیی بەسەردا دێ، کەچی هەر کات ترس نەما، دەتانخەنە بەر زمانە تیژو بڕندەکانیان، لە (ئەنجامدانی) هەر چاکەیەك دا چرووك ڕژدن، ئا ئەوانە (کاتی خۆیشی) بڕوایان نەهێنا، ئنجا سەرەنجام خوا کردەوە (بە ڕواڵەت باشە)کانی هەڵوەشاندوونەوەو، ئەوەش بۆ خوا ئاسانە ﴿١٩﴾ (ئەوانە دوای شکانی ئابڵووقەی شارو ڕۆیشتنی سوپای دوژمن) هێندە ترساون، پێیان وایە (سوپایەکانی) حیزبەکان نەڕۆیشتوون و، ئەگەر (گریمان) حیزبەکانیش بگەڕێنەوە (بۆ سەر مەدینە) حەز دەکەن، لە نێو عەرەبە بیابانشینەکاندا بن (لە دوورەوە) لە هەواڵەکانتان بپرسن و، ئەگەر لە نێویشتاندا بان تەنیا کەمێك دەجەنگان ﴿٢٠﴾ بە دڵنیایی لە پێغەمبەری خوادا ﷺ سەرمەشقێکی باش هەیە، بۆ هەر کەس بە ئومێدی (بەزەیی) خواو (پاداشتی) ڕۆژی دوایی بێ و، زۆر یادی خوا بکات ﴿٢١﴾ کاتێکیش بڕواداران حیزبەکانیان دیتن، گوتیان: ئەمە بوو کە خواو پێغەمبەرەکەی بەڵێنیان پێدابووین (کە لە تەنگانانەدا سەردەکەوین) و، خواو پێغەمبەرکەیشی ڕاستیان فەرموو و، ئەو (حاڵەت)ەش، تەنیا بڕوا و ملکەچیی تێدا زێدەکردن ﴿٢٢﴾ لە نێو بڕواداران دا پیاوانێك (ی دانسقە) هەن، کە لەو پەیمانەی لەگەڵ خوادا بەستوویانە، ڕاستیان کردوە، ئنجا هەیانە بەڵێنەکەیان جێ بەجێکردوەو، هەشیانە چاوەڕێ دەکات و، هیچ گۆڕانێکیان تێدانەکردوە ﴿٢٣﴾ (ئامانجیش لەوە ئەوە بوو) کە خوا پاداشتی ڕاستان بە هۆی ڕاستییانەوە بداتەوەو، ئەگەر ویستیشی سزای مونافیقەکان بدات، یان گەڕانەوەیان لێ وەربگرێ، بێگومان خوا لێبووردەی میهرەبانە ﴿٢٤﴾ سەرەنجامیش خوا ئەوانەی بێبڕوان بە (دڵی پڕ لە) پەستیی و تووڕەییەوە بەرپەرچ دانەوە و، هیچ سوودێکیان وەرنەگرت و، خواش جەنگی لە

كۆڵ بڕواداران كردەوە و، خواش بە هێزی زاڵە ﴿٢٥﴾ ئەوانەش لە خاوەن كتێبەكان كە پشتگیرییان كردن (هی بتپەرستەكانی مەككە) لە قەڵایەكانیان دایبەزاندن و، ترس و بیمی هاویشتە دڵەكانیانەوە (كە سەرەنجام) كۆمەڵێكتان (لێیان) كوشت و، كۆمەڵێكیشیانتان بە دیل گرتن ﴿٢٦﴾ هەروەها زەوییەكەیان و خانووەكانیان و سامانەكانیان و، سەرزەمینێكیش كە نەچوو بوونە سەری (نەكەوتبووە ژێر ڕكێفتان، ئەوانەی هەمووی) كردە میراتتان (بە میراتتان گرت)و، خواش لەسەر هەموو شتێك توانایە ﴿٢٧﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ): واتە: چاویان نەبڵەق بوون، یان: چاویان لایدا، (**الزَّيْغُ: المَيْلُ عَنِ الإِسْتِقَامَةِ**)، (زیغ) بریتیە لەوە كە شتێك لە ڕێی ڕاست لا بدات، مرۆڤ كاتێك دەكەوێتە حاڵەتێكی ترس و لەرزێكی زۆر، سەراسیمە دەبێ و چاوی ئەبڵەق دەبن و، چاوی بە هەموو لایاندا دەسووڕێن، چونكە نازانێ ئەوەی جێگای مەترسییە بۆی، لە كوێوە دێ؟ لەبەر ئەوە چاوی دەسووڕێن.

(ٱلۡحَنَاجِرَ): (**جَمْعُ حَنْجَرَة، وَهِيَ رَأْسُ الغَلْصَمَةِ مِنْ خَارِجٍ**)، (حَنجرة) قوڕگ، كە بە (حَنَاجِر) كۆ دەكرێتەوە، (**وَبَلَغَتِ القُلُوبُ الحَنَاجِرَ**)، دڵەكان گەیشتنە قوڕقوڕاگەكان، كە مەبەست ئەوەیە دڵەكان زۆر بە خێرایی لێ دەدەن و، مرۆڤ وا هەست دەكات خەریكە دڵی بێتەدەر.

(زِلۡزَالٗا): واتە: ڕاشەقێنران، ڕاتەكێنران، (**التَّزَلْزُلُ: الإِضْطِرَابُ وَتَكْرِيرُ حُرُوفِ لَفْظِهِ تنبيهٌ عَلَى تَكْرِيرِ مَعْنَى الزَّلَلِ فِيهِ**)، (زلل) بە مانای لادانە، ئنجا (تَزَلْزُل) بریتیە لە هاتن و چوون و جووڵان، پیتەكان كە دووبارە دەبنەوە (زَلزلة)، یان (زِلْزَال) دەلالەت لەسەر ئەوە دەكات، كە مانای (زلل)ی تێدا دووبارە بۆتەوە، لادان و جووڵە جووڵە.

(لَا مُقَامَ لَكُمْ): شوێنی وەستان بۆ ئێوە نیە، یاخود: کاتی وەستانی نیە، یاخود: وەستان بۆ ئێوە نیە، (مُقَام) هەم بە چاوگ دەگوترێ، هەم بە ناوی شوێن، هەم بە ناوی کات.

(عَوْرَةٌ): (العَوْرَةُ: شِقٌّ فِي الشَّيءِ كَالثَّوْبِ وَالبَيْتِ وَنَحْوِه...)، (عَوْرَة) بریتیە لە درزو کەلێنێك لە شتێکدا، وەك لە بەرگ و پۆشاك، لە دیوار، وێنەی ئەوانە، (عورة) لێردا بە مانای بۆشاییە، یان بە مانای شتێکە کە پارێزراو نەبێ و بە دەرەوە بێ، واتە: ماڵەکانمان بە دەرەوەن، شوورەیان نیە، یاخود پارێزەرێکیان نیە.

(أَقْطَارِهَا): (جَمْعُ قُطْر: وَهُوَ الجَانِب)، (قُطْر) بە مانای لا، یان تەنیشت دێ، (أَقْطَار) لایەکان، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴿٣٣﴾﴾ الرحمن، واتە: ئەگەر دەتوانن لەلایەکانی ئاسمان و زەوی دەربچن.

(ٱلْفِتْنَةَ): وشەی (فِتْنَة) لە ئەسڵدا بە مانای تاقیکردنەوە دێ، بەڵام دوایی دەخوازرێتەوە بۆ: بەڵاو، پێشهات و، سزا، بەڵکو جاری وا هەیە بۆ: کوفر و شیرك و هەڵگەڕانەوە، کە بە پێی سیاقەکان مانای دەگۆڕێ، لێردا (إِذَا سُئِلُوا الفِتْنَة) واتە: داوایان لێ بکرێ هەڵبگەڕێنەوە، بۆیە وامان لێکداوەتەوە: (الفتنة: البَلَاءُ المُصِيبَةُ، العَذَابُ، الوُقُوعُ فِي الكُفْر وَالشِّرْك، وَهُوَ المَقْصُود هُنَا).

(وَمَا تَلَبَّثُوا۟): واتە: کەمێك نەبێ نەدەمانەوە، دەگوترێ: (لَبِثَ بِالمَكَانِ: أَقَامَ بِهِ مُلَازِمَاً لَهُ)، لە شوێنەکە مایەوەو پێیەوەی پەیوەست بوو، کەواتە: (وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا)، کەمێك نەبێ نەدەوەخران، کە داوایان لێ دەکرا بچنە نێو کوفرو شیرکەوەو، هەڵبگەڕێنەوە لە ئیسلام، ئەگەر داوایان لێکرابایە کەمێك نەبێ پێی نەدەچوو، کە ئەوەیان دەکرد.

(ٱلْمُعَوِّقِينَ): پەکخەران، ئەوانەی کۆسپ و پەرچ دەخەنە ڕێی خەڵك، (العَائِقُ: الصَّارِفُ عَمَّا يُرَادُ بِهِ مِنْ خَيْرٍ، عَاقَهُ وَعَوَّقَهُ وَاعْتَاقَهُ)، (عَائِق) بریتیە لەوەی خێرێك ڕوو لە کەسێك بکات، بەڵام شتێك ببێتە پەرچ، یان کەسێك ببێتە کۆسپ لە بەردەمیدا، دەگوترێ: (عَاقَهُ وَعَوَّقَهُ وَاعْتَاقَهُ) هەرسێکیان بە یەك واتان.

ئنجا (عائـق) واتـە: كۆسـپ و پـەرچ، بـەڵام (معوِّق) واتـە: پەكخـەر، (عَائِـق) بوونە كۆسـپ و پەرچـی شـتێكە بـێ ئـەوەی ویسـتێكی هەبـێ، بـۆ نموونـە: دیوارێـك بەردێك دەبێتـە كۆسـپ (عائـق)، بـەڵام (مُعَوِّق) حەتمـەن ئیـرادەو ویسـتێكی لـە پشـتەوەیە، (المعوِّقین) واتـە: ئەوانـەی خەڵـك دەگێڕنـەوەو خەڵـك لادەدەن.

(هَلُمَّ إِلَيْنَا): (هَلُـمَ: دُعَـاءٌ إلى الـشَيءِ)، (هَلُمَّ) بانگكردنـە، نـاوی كار (إسـم فعـل)ە، كـە بـۆ تـاك و دووان و كـۆو نێرینـەو مێینـە، هەموویـان وەك یەكـە، بـەڵام هەندێـك گوتوویانـە: ئەگـەر دووان بـن: (هَلُـمَّ)، ئەگـەر كـۆ بـن: (هلمّـوا)، مێیینـە بـێ: (هَلُمِّي)، بـەڵام ڕای یەكـەم ڕاسـترە كـە (هَلُـمَّ) بـۆ هەموویـان بـەكاردێ، واتـە: وەرن بـۆ لامـان.

(أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ): (أَشِـحَّة) كـۆی (شـحیح)ە، واتـە: چـرووك و ڕژد، (الشُـحُ: بُخْـلٌ مَـعَ حِـرْصٍ)، (شـحّ) بریتیـە لـە چرووكیـی، لەگـەڵ سـوور بـوون لەسـەر چرووكیـی، واتـە: (شـحیح) لـە (بخیـل) ماناكـەی بەهێزتـرە، واتـە: چرووكـن لەسـەر ئێـوەو هیـچ خێرێكیـان لـە ئێـوە بـۆ هەڵنـاوەرێ، نـە شـتی مادديـی و نـە مەعنەویـی.

(سَلَقُوكُم): (السَـلْقُ: بَسْـطٌ بِقَهْرٍ باليَـدِ أَوِ اللِّسَـان)، (سَـلْق) بریتیـە لـەوە كـە لـە ڕووی باڵادەسـتییەوە دەسـت بـۆ شـتێك، یـان زمـان بـۆ شـتێك درێـژ بكـرێ، كەواتـە: (سَـلَقُوكُم): زمانیانتـان لـێ دەدەن.

(حِدَادٍ): بـە زمانانێـكی تیـژ، چونكـە (حـداد) كـۆی (حدیـد)ە، دەگوتـرێ: (لِسَـانٌ حَدِيـد: صَـارِمٌ وَمَـاضٍ، إِذَا كَانَ يُؤْثِـر تَأْثِيرَ الحَدِيـد)، (لسـان حدیـد) واتـە: زمانێـكی تیـژ، زمانێـكی بڕندە، مـەرج نیـە بـە بڕیـن بـێ، یـانی: كاریگەریـی تێیـدا هەیـە، وەك چـۆن ئاسـنێك لـە شـتێك دەدەی، یـان بـە مشـارێكی ئاسـن شـتێك دەبـڕی، ئـەو زمانـەش كـە بەرانبـەر بـە كـەسی بەرانبـەر تیـژ بـێ، پێـی دەگوتـرێ: (لسـان حدیـد)، واتـە: زمانێكـە وەك چەقـۆو تیـغ دەبـڕێ.

(قَضَىٰ نَحْبَهُ): واتـە: نەزرەكـەی خـۆی، یـان بەڵێنەكـەی خـۆی جـێ بەجێكـردوە، دەڵـێ: (النَّحْـبُ: النَـذْرُ المحكـومُ بوجوبـه)، لـە خـۆ گرتنێكـە كـە پێویسـتەو حوكـم دراوە، بـەوەی جـێ بەجـێ بكـرێ، (قـضی نحبـه) یـانی: (وَفَّى بعَهْـدِهِ)، یـان (وَفَّى بنَـذْرِهِ)، بەڵێنـی خـۆی، یـان نـەزری خـۆی جـێ بەجێكـردوە.

(بِغَيْظِهِمْ): واتە: بە پەستییانەوە، (الغَيْظُ: أَشَدُّ الغَضَبِ، وَهُوَ الحَرَارَةُ الَّتِي يَجِدُهَا الإِنْسَانُ مِنْ فَوَرَانِ دَمِ قَلْبِهِ)، (غيظ) بریتیە لە تووڕە بوونێكی زۆر، بریتیە لەو گەرمییەی مرۆڤ لە دەروونی خۆیدا هەستی پێدەكات، كاتێك كە هەست دەكات خوێنی زیاتر دەجۆشێ.

(صَيَاصِيهِمْ): (جَمْعُ صِيصَة: وَهِيَ الحِصْنُ، وَيُقَالُ: لِقَرْنِ البَقَرِ، وَيُقَالُ: الشَّوْكَةِ الَّتِي يُقَاتِلُ بِهَا الدِّيك)، (صِيصَة) یان (صِيصِيَة) هەم بە قەڵا دەگوترێ، هەم بە قۆچی ڕەشەوڵاخ دەگوترێ، هەم بەو دڕكەی كەڵەشێر شەڕی پێدەكات لە پێیەكانی دا، نینۆكەكانی.

(لَّمْ تَطَئُوهَا): واتە: نەیچوونە نێو، دەگوترێ: (وَطِئْتُهُ بِرِجْلِي، أَطَئُوهُ وَطْأَةً وَوَطَاءَةً)، واتە: پێم لەسەر دانا، كەواتە: (لَمْ تَطَئُوهَا) یانی: (لم تدخلوها) ئینسان كاتێ دەچێ بۆ شوێنێك پێیەكانی لێ دادەنێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێ: ﴿وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾﴾.

لەو بارەوە ئەو گێڕدراوەیە هاتوە:

(عَنْ أَبِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: حُبِسْنَا يَوْمَ الْخَنْدَقِ عَنِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، حَتَّى كُفِينَا ذَلِكَ، وَذَلِكَ قوله تعالى: ﴿وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾﴾ فَقَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَمَرَ بِلاَلاً، فَأَقَامَ الصَّلاَةَ، ثُمَّ صَلَّى الظُّهْرَ كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ أَقَامَ الْعَصْرَ، فَصَلَّى الْعَصْرَ كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ أَقَامَ الْمَغْرِبَ، فَصَلَّى الْمَغْرِبَ كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ أَقَامَ الْعِشَاءَ فَصَلاَّهَا كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ، قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ: {فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً ، أَوْ رُكْبَانًا} (أخرجه ابن

**أبي شيبة في المصنف: ٨٣٥١، والنسائي في الكبرى: ١٦٢٥، والبيهقي في الدلائل ج٣، ص٤٤٥، وأبو يعلى: ١٢٩٦، قال حسين سليم أسد: إسناده صحيح)**[1].

ئەبوو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی خەندەکدا (واتە: ڕۆژی جەنگی ئەحزاب) ئێمە دەرفەتمان ئەبوو نوێژەکانی نیوەڕۆو عەصر و شێوان و خەوتنان بکەین، (ئەو چوار نوێژەیان بۆ نەکراون، دیارە گەمارۆدان و ئابڵووقەدانەکە لەو کاتەدا زۆر توونـد بووە، هەر هەموویان سەرقاڵی بەرپەرچدانەوە بوون، شەڕە تیر بوون و دوژمنان هێرشیان هێناوە)، هەتا دوایی خوا ﷻ ئەوەی لە کۆڵ کردینەوە، (ئەویش ئەوە بوو کە بایەکی توندی ناردو، کافرەکان بە دەردی خۆیانەوە گرفتار بوون)، خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾ ﴾، (دوای ئەوە کە ئەو چوار نوێژەیان چوون، لە وەختی خۆیدا بۆیان نەکران)، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە بیلال کرد، قامەتی خوێند، دوایی نوێژی نیوەڕۆی کرد، وەك چۆن پێشتر دەیکرد، (واتە: بە چوار ڕکات)، دوایی دووبارە بیلال قامەتی خوێندەوەو نوێژی عەسریشی کرد، هەروەك چۆن پێشتر دەیکرد، دوایی دووبارە قامەتی خوێندەوەو نوێژی شێوانیشی کرد (بە سێ ڕکات)، وەك چۆن پێشتر دەیکرد، دوایی دووبارە قامەتی خوێندەوەو نوێژی خەوتنانیشی کرد، وەك چۆن پێشتر دەیکرد، (ئەوەش پێش ئەوە بووە، کە چۆنیەتیی نوێژی ترس بێتە خوار)، پێش ئەوەی ئەو ئایەتە دابەزێ: ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ۖ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾ ﴾البقرة، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەگەر ترستان لەسەر بوو نوێژەکەتان بکەن بە پێوە، یاخود بە سواریی، ئەگەر دڵنیابوونەوەو ترستان نەما، یادی خوا بکەن، هەروەك چۆن ئەوەی فێر کردوون، کە نەتاندەزانی.

---

(١) قال مؤلفا الإستيعاب في بيان الأسباب، قلنا: وهذا سندهُ صحيح، ج٣، ص٩٤.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

پێشتر باسمان کرد کە هەر کام لە جەنگی ئەحزاب و، جەنگی بەنی قورەیزە، کە تیرەیەك بوون لە جوولەکەکان، لە کۆتایی ساڵی پێنجەمی کۆچیی، لە مانگی شەووالدا روویداوە، کە مانگی شەووال مانگی دەیەمینە لە ساڵی کۆچییدا، بۆیە ئێمە بەسەرهاتی جەنگی ئەحزاب و جەنگی هۆزی بەنو قورەیزە لە باسێکی سەربەخۆدا دەکەین، وردەکارییەکان لەوێدا باس دەکەین، بەڵام لێرەدا بە کورتیی بەسەر مانای گشتیی ئەم نۆزدە ئایەتەدا دەڕۆین.

خوا ﷻ بانگی بڕواداران دەکات، بانگی بڕوادارانێك کە یەکەمین کۆمەڵی بڕواداران بوون، یەکەمین پشت (جیل)ی بڕواداران بوون، کە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەرن ﷺ، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! چاکەی خوا یاد بکەنەوە لەسەر خۆتان.

بێگومان ئەم دواندن (خطاب)ە، ئێمەش دەگرێتەوە، پێش ئێمەش و دوای ئێمەش دەگرێتەوە، چونکە ئەو چاکەیەی کە خوا لەگەڵ پێغەمبەری خواو ﷺ هاوەڵانی بەڕێزیدا خوا لێیان ڕازیبێ، کردوویەتی، ئێمەش دەگرێتەوە، ئەگەر خوا ئەوانی نە پاراستباو، سەری نەخستبان، ئەو ئایین و بەرنامەو پەیامی خوایە، نەدەگەیشتە دەستی ئێمە، هەر بۆیەش خوا ئەو دواندنانەی کە ڕاستەوخۆ ئاراستەی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ کردوون، لە یەك شوێنیشدا لە قورئاندا نەیفەرمووە: (يا أصحاب النّبي، يا صحابة النّبي)، ئەگەر وای فەرمووبایە، بەس ئەوانی دەگرتەوە، بەڵام هەمیشە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! کە ئەوانیش دەگرێتەوە بە پلەی یەکەم و، مسوڵمانانیش لە هەموو جیل و پشت و سەدەکاندا دەگرێتەوە، ﴿ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ ﴾، یاد بکەنەوە کاتێك سەربازانێك بۆتان هاتن، پەلاماریان دان و هێرشیان بۆ هێنان،

گەمارۆیـان دان، ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ﴾، ئێمـەش بایـەکی تایبەتمـان نـاردە سـەریان، بایـەکی بەهێـز کـە پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی بـای (صبا) بـووە، (ريح الصَّبا)، وێـڕای سـەربازانێك کـە نەتاندەبینیـن، کـە مەبەسـت پێـی فریشـتەکانە، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾، بـە دڵنیایـی خـواش بینـەری ئـەوە بـوو کـە دەتانکـردو دەیکـەن.

ئنجا خـوا بۆمـان وێنـا دەکات، ئەو سـوپایە چـۆن هاتـوە؟ ﴿ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ ﴾، کاتێـك کـە لـە لای سـەرووتانەوە (لـە لای باکوورەوە) هاتـن و، لـەلای خوارێشـەوە بۆتـان هاتـن، کـە دەگونجـێ تەنیـا لـەو دوو لایەنـەوە هاتـبن، دەشـگونجێ مەبەسـت ئـەوە بـێ: لـە هەمـوو لاوەو لـە هـەر چـوارلاوە بۆتـان هاتـن، کـە هاتـن شـاری مەدینەیـان گەمـارۆدا، ﴿ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾، یاد بکەنـەوە کاتێك کـە چـاوەکان لایانـدەدا، چـاو ئەبلـەق دەبـوون لـە ترسـان، چـاو بەمـلاولا دەسـووڕان، ﴿ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ ﴾، دڵەکانیـش گەیشـتنە گـەروان، واتـە: دڵەکانتـان بەخێرایـی لێیـان دەدا، خـوا مرۆڤـی وا خوڵقانـدوە، کاتێـك تـووشی مەترسـییەك دێ، لـە مێشـکەوە فەرمـان دەچـێ بـۆ دڵ کـە خێراتـر لێبـدات و، خوێـن باشـتر دابـەش بـکات، بەسـەر جەسـتەدا، بـۆ ئـەوەی ئەندامـەکان ئامادەبـن، بۆیـە کەسـێك کـە تـووڕە دەبـێ سـوور دەبێتـەوە، چونکـە خوێنـی زیاتـر بـۆ دەم و چـاو و هەمـوو ئەندامـەکانی دەچـێ و، پەیـت و گـورج دەبێتـەوە، ﴿ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴾، گومـانی جـۆرا وجۆریشـتان بـە خـوا دەبـردن، هەبـوو گومـانی وابـوو کـە: ئـەوە بەڵێنـی خوایەو خـواو پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕاسـتیان فەرمـووەو ئێمـە سـەردەکەوین، هەشـبوو بـە جۆرێـکی دیکـە بیـری دەکـردەوەو گومـانی خراپـی دەبـرد!

هەشـبووە کـە هـەر بـە تەمـای سـەر ومالّـی خـۆی نەمـاوە! هەشـبووە کـە لـەو نێوانـەدا بـووە، ﴿ هُنَالِكَ ٱبْتُلِيَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾، لـەو کاتـەدا و، لـەو شـوێنەدا بـڕواداران تاقیکرانـەوە، جەڕبێـنران، ﴿ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴾، زۆر بـە خەسـتیی و بـە سـەختیی تێکـەوە ڕاشـەقێنران، ڕاتەکێـنران.

﴿ وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾، یاد بکەوە! کاتێك کە مونافیقەکان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، دەیانگوت، مونافیقەکان ئەوانە بوون کە لە دەرووندا کافربوون بە ڕواڵەت خۆیان بە مسوڵمان پیشانداوە، بەڵام ئەوانەی نەخۆشییان لە دڵدا هەیە، ئەوانە بوون کە مسوڵمان بوون، بەڵام گومان و دوو دڵیی هەبووە لە دڵ و دەروونیاندا، دەیانگوت چی؟ ﴿ مَّا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا ﴾، خواو ڕەوانەکراوەکەی، تەنیا بەڵێنی فریودەریان پێداوین، یانی: هیچ بەڵێنێکیان پێ نەداوین مەگەر بەڵێنێکی فریودەر، واتە: کڵاویان لەسەر ناوین، هەڵیانخەڵەتاندووین، کە گوتوویانە: بە دوای ئیسلام بکەون و خوا دەتانپارێزێ و سەرتان دەخات، ﴿ وَإِذْ قَالَت طَّائِفَةٌ مِّنْهُمْ يَا أَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا ﴾، یاد بکەوە! کاتێك کۆمەڵێکیان دەیانگوت: ئەی خەڵکی یەثریب (خەڵکی (مەدینە)) مانەوە بۆ ئێوە لێرە نیە، یان: شوێنی مانەوە، یان: کاتی مانەوە نیە، بگەڕێنەوە، واتە: بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانی خۆتان، ﴿ وَيَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ النَّبِيَّ ﴾، کۆمەڵێکیشیان مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەردەگرت، بۆچی مۆڵەتیان وەردەگرت؟ بۆ ئەوەی بچنەوە ماڵێ، ﴿ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ ﴾، دەیانگوت: ماڵەکانمان چۆڵایین، ماڵەکانمان بۆشن، پارێزراو نین و بە دەرەوەن، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ ﴾، لە حاڵێك دا ماڵەکانیان و خانووەکانیان بە دەرەوە نەبوون، بێ پارێزەر نەبوون، چونکە یان قەڵاو بورج هەبوون، یان خەندەق لێدرابوو، لە شوێنەکانی دیکەش مسوڵمانان شوێنی پاراستنیان دروست کردبوو، ﴿ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴾، تەنیا هەڵاتنیان دەویست، ڕاکردنیان دەویست، بیانوویان بەوەدەگرت کە ماڵەکانمان بۆشن و دەوری ماڵەکانمان چۆڵن، یاخود ماڵەکانمان هیچ پارێزەریان نیە.

﴿ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ﴾، ئەگەر لە لایەکانی شاری مەدینەوەش دوژمن لێیان وەژوور کەوتبایەو، پەلامار درابان، ﴿ ثُمَّ سُئِلُوا الْفِتْنَةَ ﴾، دوایی داوای فیتنەیان لێکرابایە، واتە: داوای هەڵگەڕانەوە، یان داوای کافربوونەوەو موشریك بوونەوەیان لێکرابایە، ﴿ لَآتَوْهَا ﴾، دەیاندا، واتە: ئەوەی کە داوایان لێ دەکرا،

دەیانبەخشی، ﴿ وَمَا تَلَبَّثُوا بِهَا إِلَّا يَسِيرًا ﴾، کەمێکیش نەبێ نەیاندەوەخراند، واتە: دوانەدەکەوتن، بەخێرایی ئەوەی لێیان داوا دەکرا، جێبەجێیان دەکرد، ئەگەر کافربوون و هەڵگەڕانەوەش بووایە!.

﴿ وَلَقَدْ كَانُوا عَاهَدُوا اللَّهَ مِن قَبْلُ ﴾، پێشتریش بەڵێنیان بە خوادا بوو، ﴿ لَا يُوَلُّونَ الْأَدْبَارَ ﴾، پشت لە دوژمن ناکەن، لە کاتی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا، ﴿ وَكَانَ عَهْدُ اللَّهِ مَسْئُولًا ﴾، بە دڵنیایی بەڵێنی خواش لێی دەپرسرێتەوە، بەڵێنێك کە بە خوا دەدرێ خوا لێی دەپرسێتەوە، کە ئایا خاوەنەکەی وەفادار بوو بەو بەڵێنە، یان بێ وەفا؟ پابەندبوو یان نا؟!.

﴿ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ الْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ الْمَوْتِ أَوِ الْقَتْلِ ﴾، بڵێ: هەڵاتن سوودتان پێناگەیەنێ، ئەگەر لە ترسی مردن ڕابکەن، یان لە ترسی کوشتن، ﴿ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، ئەگەر ڕاشبکەن، لە ترسی مردن و کوشتن، کەمێك نەبێ بەهرەمەند ناکرێن، واتە: لە ژیانی دنیا بەهرەمەند ناکرێن، واتە: تۆ ئێستا بە حیساب لە هۆکارێك ڕادەکەی کە مردنی خۆتی تێدا دەبینی، یان کوژرانی خۆتی تێدا دەبینی، بەڵام هەر دەمری، ئەگەر بەو شتەش کە تۆ جێی مەترسییتە، کە بە هۆیەوە بکوژرێی یان بمری، ئەگەر بەوەش نەمری، بە شتێکی دیکە دەمری و هەر نامێنیەوە لە دنیادا، ﴿ قُلْ مَن ذَا الَّذِي يَعْصِمُكُم مِّنَ اللَّهِ ﴾، بڵێ: کێیە ئەو کەسەی کە لە خوا دەتانپارێزێ، کێ چەپاڵەتان دەدات، ﴿ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ﴾، ئەگەر خوا بیەوێ زیانێکتان تووش بکات، یاخود ئەگەر بیەوێ بەزەییتان بۆ فەڕاهەم بێنێ، کێ دەتوانێ ببێتە بەربەرچەدەر، ئەگەر خراپەیەکتان تووش بکات و، کێ دەتوانێ بتانپارێزێ، هەروەها ئەگەر خوا چاکەو بەزەییەکتان بە قسمەت بکات، کێ دەتوانێ بیگێڕێتەوە، بەربەرچی بداتەوە؟ ﴿ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾، جگە لە خواش هیچ سەرپەرشتیارو هیچ پشتیوانیان نیە.

ئنجا دێتە سەر باسی کۆمەڵێکی دیکەیان، کە هەر بەوەندەیان وازنەهێناوە کە خۆیان بڕۆن، بەڵکو هەوڵیانداوە سوپایەکەی پێغەمبەری خواش ﷺ لێك بڵاو بکەن و، هەر کەسە بە ماڵ و منداڵی خۆیەوە سەرقاڵ بکەن و مەیدانیان پێ

چۆڵبکەن، ﴿ قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ ﴾، بە دڵنیایی خوا ئەوانەتان دەناسێ کە پەرچ و کۆسپ دروستکەرن، یاخود خەڵك ساردکەرەوەن و، خەڵك گێڕەرەوەن لە مەیدانی جەنگ و جیهاد، ﴿ وَالْقَائِلِينَ لِإِخْوَانِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ﴾، بێژەران بە برایەکانیان: وەرن بۆ لای ئێمە، ﴿ وَلَا يَأْتُونَ الْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، ناشچن بۆ جەنگ و بۆ کوشتار، مەگەر کەمێك نەبێ، بایی شەرمێ ڕووان و، بایی ئەوە کە بە ترسنۆك لە قەڵەم نەدرێن، یان بایی ئەوە کە نەکەونە سەر زارو زمانی خەڵکی، ﴿ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ﴾، زۆر چرووکن لەسەر ئێوە، واتە: هیچ خێرێکیان نیە بۆ ئێوە، نەخێری ماددیی و نەخێری مەعنەویی، ﴿ فَإِذَا جَاءَ الْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَالَّذِي يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ ﴾، کاتێك ترس دێ، دەیانبینی تەماشات دەکەن چاویان دەسووڕێن، وەك کەسێك کە لە حاڵەتی مردندایەو بێهۆشیی مردنی بەسەر دادێ، ﴿ فَإِذَا ذَهَبَ الْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ ﴾، بەڵام هەر کە ترس لاچوو، بە زمانە تیژو بڕندەکانیان لێتان دەدەن، واتە: زمانی تیژیان بۆ ئێوە بەکاردەخەن، بە تیغی زمانیان دژی ئێوە قسە دەکەن، ﴿ أَشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ ﴾، زۆر چرووك و دەستنووقاون لە بەرانبەر هەر چاکەیەکدا، واتە: هیچ خێرو چاکەیەکیان لێ هەڵناوەرێ، ﴿ أُولَٰئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا فَأَحْبَطَ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ ﴾، ئا ئەوانە بڕوایان نەهێناوە، ئەو بڕوایەی کە خوا دەیەوێ، هەر بە ڕواڵەت گوتوویانە مسوڵمانین، بۆیە خوا کردەوەکانی هەڵوەشاندوونەوە، ﴿ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا ﴾، ئەوەش بۆ خوا ئاسانە، خوا ستەم لە بەندەکان ناکات، بەڵام خۆیان ستەم لە خۆیان دەکەن، ﴿ يَحْسَبُونَ الْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا ﴾، ئەوەندە ترساون لە گەمارۆدان و ئابڵووقەدانی شارەکەیان لەلایەنی دوژمنەوە، وا ترسیان چۆتە دڵ، دوای ئەوەی کە گەمارۆی دوژمنیش شکاوەو حیزبەکانی کە گەلەکۆمەکێیان لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان کرد، بڵاویش بوون، پێیان وایە نەڕۆیشتوون، پێیان وایە حیزبەکان نەڕۆیشتوون و کۆمەڵ و سوپایەکەی ئەهلی کوفر بڵاونەبوون، ﴿ وَإِن يَأْتِ الْأَحْزَابُ يَوَدُّوا لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِي الْأَعْرَابِ يَسْأَلُونَ عَنْ أَنبَائِكُمْ ﴾، ئەگەر جارێکی دیکەش ئەو کۆمەڵانە بێنەوە، ئەو سوپایانەی ئەهلی کوفر بێنەوە، خۆزگە دەخوازن کە بیابانشین بان و، لە نێو عەرەبە خێڵەکییەکان، بوونایە، لەوێوە لە هەواڵ

و دەنگوبـاسی ئێوەیـان پرسـیبایە، ﴿ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَـٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، ئنجـا ئەگـەر لـە ئێویشـتاندابوونەیە، کەمێـك نەبـێ جەنگیـان نەدەکـرد، بایـی ئەوەنـدە کـە نەکەونـە سـەرزارو زمـانی خەڵـکی و لەبـەر شـەرمێ ڕووان، نـەك وەك هانـدەری ئیمانیـی و هانـدەری پاراسـتنی شـارو وڵاتــی خۆیـان.

ئنجـا خـوا ﷻ ڕووو لـە ئیمانـداران دەکات و پێیـان دەفەرمـوێ کـە دەبـێ چۆن بن؟ ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾، بـە دڵنیایـی لـە پێغەمبـەری خـوادا ﷺ بـۆ ئێــوە سەرمەشــقییەکی بــاش هەیــە، ﴿ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾، بـۆ هـەر کەسـێك کـە بـە ئومێـدی خوابـێ و، بـە ئومێـدی ڕۆژی دوایـی بێ و، زۆریـش یـادی خـوا بـکات، واتـە: بـە ئومێـدی بەزەیـی خوابـێ، بـە ئومێـدی پاداشـتی ڕۆژی دوایـی بـێ و، هەمیشـەش خـوای لـە یـاد بـێ، بـۆ کەسـێك وابـێ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ سەرمەشــقیەتی، وەك چــۆن بــۆ نوێــژو عیبــادەتی شەخسـیی و، بــۆ کارو هەڵوێسـتی کۆمەڵایەتیـی و سیاسـیی و، بـۆ ڕووبەڕووبوونــەوە لەگـەڵ مەترسـیی و لـە کاتی جەنـگ و ناشـتیی دا، لـە هەمـوو شـتێکدا، پێغەمبـەر ﷺ دەبـێ بکرێتـە سـەر مەشـق و چاوسـاغ، ﴿ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ ﴾، کاتێـك بـڕواداران حیزبەکانیـان بینـی ئـەو کۆمەڵانـەی ئەهـلی کوفـر کـە گەمـارۆی مەدینەیـان دابـوو، ﴿ قَالُوا۟ هَـٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ﴾، گوتیـان: ئەمـە ئەوەبـوو کـە خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ بەڵێنیـان پێدایـن، ﴿ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ﴾، خـواو پێغەمبەرەکـەشی ﷺ ڕاسـتیان کـرد، دیـارە پێغەمبـەر ﷺ پێشـتر پێـی فەرمـوون، وەك لـە هەنـدێ شـوێندا هاتـوە کـە لـە ئەوەندە ڕۆژەی دیکـەدا، ئەهـلی کوفـر دێـن و گەمـارۆی ئـەم شارەی ئێمـە دەدەن، ئنجـا یـان خـوا بـە وەحیـی پێیڕاگەیانـدوە، یـان پێغەمبـەر ﷺ لـە ڕێـی هەواڵگرییـەوە و بـە عەقـڵ و سـەلیقەی خـۆی زانیویـەتی، هەواڵـی پێـداون و پێشـبینیی ئـەوەی کـردوە، بـۆ ئـەوەی خۆیـانی بـۆ ئامـادە بکـەن، ئنجـا کـە خەندەقەکەیـان لێـداوە، زانیویانـە دوژمــن دێ و گەمارۆیـان دەدات، ئنجـا بـڕواداران گوتیـان: ئەمــە ئــەوە بــوو کــە خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ بەڵێنیـان پێدایـن و، خـواو پێغەمبـەری خـواش ڕاسـتیان کرد، لـەوەدا کـە دوژمـن هاتـن و، ڕاستیشـیان کـرد لـەوەدا کـە زەفەرمـان پێنابـەن و زیانمان

لێنادەن و، ئێمە سەرکەوتوو دەبین، ﴿ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴾، هاتنی حیزبەکان بۆ دەوروبەری مەدینەو گەمارۆدانیان بۆ شاری مەدینە، تەنیا بڕوا هێنان و ملکەچیی تێدا زیادکردن، تیغی چاك هەتا شتی پێ ببڕی، زیاتر ساف و لووس دەبێ، بەڵام تیغی نارەسەن ئەگەر شتێکت پێ بڕی، دەم و تیژایی و نووکەکەی دەپاچێتەوە.

ئنجا خوا باسی بڕوادارانێك دەکات کە لەو تەنگانەو نارەحەتییەدا، هەڵوێستی زۆر جوان و جوامێرانەیان بووە، دەفەرموێ: ﴿ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ﴾، لە نێو بڕوادارانـدا پیاوانێك هەن ئەو بەڵێنەی لەگەڵ خوادا داویانە، بەڵێنەکەیان ڕاست بردۆتە سەر، یانی: ڕاستیان کرد لەو بەڵێنەدا کە بە خوایان دابوو، کە گوتیان: ئێمە خۆڕاگر دەبین، ڕاستیان کرد، ﴿ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ﴾، ئنجا هەیانە نەزرەکەی خۆی، ئەو شتەی لە خۆی گرتبوو، تەواوی کردوە، ئنجا چ شەهیدبوون بێ، چ ئەرکی خۆی جێبەجێ کرد بێ لە تەنگانەدا، هەشیانە چاوەڕێ دەکات، بێتە پێش، تاکو وەك پێویستە ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ بکات، ﴿ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴾، هیچ گۆڕانێکیان نەکردوە لەو بەڵێن و پەیمانەدا کە بە خوا داویانە، ﴿ لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ ﴾، بۆیەش خوا ئەوەی هێنایە پێش، تاکو پاداشتی ڕاستان بە هۆی ڕاستییەکەیانەوە بداتەوە، ﴿ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ﴾، مونافیقەکانیش ئەگەر خوا بیەوێ سزایان بدات، یاخود دوای ئەوەی کە دەگەڕێنەوە، خوا بگەڕێتەوە سەریان واتە: تۆبەیان لێ وەربگرێت، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبووردەی بە بەزەییە.

﴿ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ﴾، خوا ئەوانەی بێبڕوابوون بە تووڕەیی پەستیی خۆیانەوە، بەرپەرچی دانەوەو هیچ دەستکەوتیان نەبوو، دەسخەڕۆ بوون و، بێ ئامانج بوون، ئامانجێك کە بۆی هاتبوون: بنبڕکردنی مسوڵمانان، وە دەستیان نەهێناو بۆیان دەستەبەر نەکرا، ﴿ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ﴾، خواش جەنگی لە کۆڵ بڕواداران کردەوە، بە هۆی ئەوەوە کە

بای ناردو، فریشتەکانی ناردن و ترسی خستە دڵیانەوە، خوا کارێکی وایکرد، کە هەرچەندە ڕووبەڕوو بوونەوە هەبوو، بەڵام ئەو ڕووبەڕوو بوونەوە گەورەیە نەبێ، کە بڕواداران ترسیان لێی هەبوو، سەرەنجام سوپایەکانی ئەهلی کوفر، پرژان و لێك بڵاوبوون و بڵاوەیان لێکرد، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴾، بە دڵنیایی خواش بەهێزی زاڵە.

لە کۆتاییدا خوا لە دوو ئایەتدا باسی جەنگی بەنی قورەیزە دەکات، ئەو هۆزە جوولەکەیەی کە ویستیان لە پشتەوە خەنجەری غەدر لە مسوڵمانان بدەن و، پەیمانیان شکاندو هەڵوەشاندەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ ﴾، ئەوانەش لە خاوەن کتێبان کە پشتگیرییان کرد لەوان، لە قەڵایەکانیان دابەزاندن، واتە: لە کافرەکانی شاری مەککەو هۆزی غەتەفان و ئەو هۆزانە کە لە گەڵیاندا هاوپەیمان بوون و هاتبوون، ئەوانەی پشتگیریی وانیان کرد لە خاوەن کتێبەکان، دابەزاندن هێنانیە خوار لە قەڵایەکانیان، ﴿ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ﴾، ترس و سامی خستە نێو دڵیانەوە، ﴿ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴾، کە سەرەنجام کۆمەڵێکتان کوشت و، کۆمەڵێکیشتان بە دیلگرتن، ﴿ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ﴾، هەروەها سەر زەمینەکەی ئەوان و خانووبەرەکانیان و، ماڵ و سامانەکانیان و، سەر زەمینێکیش کە ئێوە پێشتر پێتان تێنەنابوو، ئەوەی هەمووی کردە میراتی ئێوە، هەمووی بە ئێوەدا، وەك میراتێك چۆن بۆ مرۆڤ دێ، ئاوا هەمووی هاتە دەستی ئێوە، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا ﴾، خواش لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

## بەسەرهاتی جەنگی ئەحزاب و جەنگی تیرەی بەنی قورەیزە

**شایانی باسیشە: ئێمە ئەم بەسەرهاتە لەبەر رۆشنایی (السيرة النبوية لابن هشام)دا دێنین و، ئەوەی لەوێدا هاتوە، لە سی و پێنج (٣٥) برگەدا، کورت و پوختی دەکەینەوە، جەنگی خەندەك لە بیست (٢٠) برگەداو، هی بەنو قورەیزەش لە یازدە برگەدا:**

(إبن هِشَام) لە ژێر ناوی: (غَزْوَةُ الْخَنْدَقِ فِي شَوَّالٍ سَنَةَ خَمْسٍ)[1]، جەنگی خەندەق لە مانگی شەووالی ساڵی پێنجەمی کۆچییدا، لە کۆتایی ساڵی پێنجەمی کۆچییدا، بەم شێوەیە دەیهێنێ:

### جەنگی خەندەك (الأحزاب) لە بیست (٢٠) برگەدا:

١)- دەڵێ چەند پیاوێك لە جوولەکەکان کە ئەوانەیان لە ئێودابوون: (سَلَامُ بْنُ أَبِي الْحُقَيْقِ النَّضَرِيّ ، وَحُيَيّ بْنُ أَخْطَبَ النَّضَرِيّ، وَكِنَانَةُ بْنُ أَبِي الْحُقَيْقِ النَّضَرِيّ، وَهَوْذَةُ بْنُ قَيْسٍ الْوَائِلِيّ، وَأَبُو عَمَّارٍ الْوَائِلِيّ) ئەمە پێنج، لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکە کە لەگەڵیان بوون، ناویان نەهێناون، لە (بني النَّضير) و کۆمەڵێکی دیکە لە (بَني وائل) (وَهُمْ الَّذِينَ حَزَّبُوا الْأَحْزَابَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ) ئەوانە بوون کە حیزبەکانیان کۆکردنەوە لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: ئەم جەنگی خەندەقە لە ئەسڵدا جوولەکەکان پێی هەڵساون و، ئەوان ئاگری بن کایە بوون)، بەو تەعبیرە گوتیان: (إِنَّا سَنَكُونُ مَعَكُمْ عَلَيْهِ حَتَّى نَسْتَأْصِلَهُ)، بە قورەیش و بە تیرەکانی دیکە کە لەگەڵ قورەیشدا هاوپەیمان بوون، گوتیان: ئێمە لەگەڵ ئێوە دەبین لە دژی موحەممەد ﷺ تاکو ڕیشەکێشی دەکەین، (واتە: قڕە بڕیان دەکەین، کەسیان لێ ناهێڵین، بە خەیاڵی خۆیان)، قورەیشییەکان لێیان پرسین، گوتیان: کۆمەڵی جوولەکە! ئێوە خاوەنی کتێبی یەکەمن، (واتە: بە نسبەت نەصرانییەکانەوە، تەورات کتێبی یەکەم

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، التحقيق: جودة محمد جودة، دار آبن الهيثم، سنة: ٢٠٠٦ ز، الطبعة الأولى، ج٣، ص ١٠٣ - ١٢٩.

بووە، لە هی خاوەن کتێبان و، جوولەکە تەوراتیان پێدراوە، بەلای کەمەوە (١٥٠٠) ساڵ پێش ئەوەی ئینجیل بە عیسا (عليه السلام) بدرێ، گوتیان: ئێوە خاوەنی کتێبی یەکەمن و، خاوەنی زانیاریین و، شارەزان لەوەدا کە ئێمە لەگەڵ موحەممەددا ﷺ تێیدا کەوتووینە ڕاجیایی، ئنجا ئایا بەرنامەی ئێمە چاکترە یان هی وی؟ گوتیان: بەڵکو بەرنامەی ئێوە باشترە لە بەرنامەی وی و، ئێوە لە هەقەوە نیزیکترن! ئنجا ئەم ئایەتانەی سووڕەتی (النساء) (٥١ - ٥٥) لەو بارەوە دابەزین:

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَٰؤُلَاءِ أَهْدَىٰ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا ﴿٥١﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾ أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّنَ الْمُلْكِ فَإِذًا لَّا يُؤْتُونَ النَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾ أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَىٰ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۖ فَقَدْ آتَيْنَا آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا ﴿٥٤﴾ فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ بِهِ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ ۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا ﴿٥٥﴾ ﴾.

کاتێک کە جوولەکەکان ئەوەیان بە هۆزی قوڕەیش گوت، (بە هاوبەش بۆ خوادانەرانی هۆزی قوڕەیش)، ئەوە دڵخۆشیکردن و، هانیدان بۆ ئەوەی ئەوانیان بۆ بانگهێشت کرد بوو، کە بریتی بوو: لە جەنگکردن لە دژی پێغەمبەر ﷺ ئیدی کۆبوونەوەو بەڵێنیان دانا، دوایی ئەو کۆمەڵە لە جوولەکەکان ڕۆیشتن هەتا چوونە لای هۆزی (غطفان)یش، کە دەچنەوە سەر (قَيْسِ عَيْلاَنَ)، ئەوانیشیان بانگکرد بۆ جەنگ لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێشیان ڕاگەیاندن کە قوڕەیشییەکان پشتگیرییان کردوون و، لە گەڵیاندان و، هەواڵیشیان پێدان کە لەگەڵیان دەبن لە دژی پێغەمبەر ﷺ، ئیدی ئەوانیش بەڵێنیان پێدان لەگەڵیان بن، بناغەی جەنگی ئەحزاب ئاوا دەستی پێکرد.

٢)- قوڕەیشییەکان چوونەدەر، (واتە: لەو کاتەدا کە دیاریی کرابوو) و، فەرماندەکەیان (أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ) بوو، (غطفان)یش چوونەدەر و، فەرماندەکانیان ئەم سێیە بوون: (أ- عُيَيْنَةُ

بْنُ حِصْنِ بْنِ حُذَيْفَةَ بْنِ بَدْرٍ ، فِي بَنِي فَزَارَةَ، ب- وَالْحَارِثُ بْنُ عَوْفِ بْنِ أَبِي حَارِثَةَ الْمُرِّيِّ، ج-فِي بَنِي مُرَّةَ ؛ وَمِسْعَرُ بْنُ رُخَيْلَةَ بْنِ نُوَيْرَةَ بْنِ طَرِيفِ بْنِ سُحْمَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ هِلَالِ بْنِ خُلَاوَةَ بْنِ أَشْجَعَ بْنِ رَيْثِ بْنِ غَطَفَانَ ، فِيمَنْ تَابَعَهُ مِنْ قَوْمِهِ مِنْ أَشْجَعَ)، کەواتە: هۆزی قورەیشییەکان و هۆزی (غطفان) هێزی سەرەکیی ئەحزاب بوون کە بەرەو مەدینە هاتن.

٣)- کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی ئەوەی بیست، ئەوەی نیەتیان لێی هێناوە بۆی کۆبوونەوە، هەڵسا بە هەڵقەندنی چاڵێك بە دەوری مەدینەدا، کە لەسەرچاوە مێژووییەکاندا دەڵێن: ئەو چاڵە بە مەزەندە، دەوری شەش (٦) کیلۆمەتر درێژ بووە، واتە: شەش (٦٠٠٠) هەزار مەتر و، بێگومان چەند مەترێکیش قووڵ بووە، کە بە ئاسانیی پڕنەکرێتەوە و، چەند مەترێکیش فراوان و بەرین بووە، بۆ ئەوەی نە مرۆڤ و نە ئەسپ سوار، بتوانێ لێی باز بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆشی کاری تێدا دەکرد، بۆ ئەوەی مسوڵمانان هان بدات، لەسەر ئەوە کە پاداشتیان دەبێ، مسوڵمانانیش کاریان تێدا کرد و، زۆر بە جیددیی خۆیان تێدا ماندوو کرد، کە بەر لەوەی ئەو سوپای ئەهلی کوفر بێ و گەمارۆی شاری مەدینە بدات، ئەوان ئەو خەندەق و چاڵەیان تەواوکرد بێ، (ئەو چاڵەش لەو شوێنە بووە کە دەشتایی بووەو پێ دەشت بووە و، سوپای ئەهلی کوفر توانیویانە کە بە پێرۆ و بە سواریی پێیدابێن، ئەوان چاڵیان لێداوە، ئەگەرنا شوێنەکانی دیکە کە بەرزایی بوون، بە تیرو کەوان و بەو ئامرازانەی کە جەنگی ئەو کاتی پێکراوە، ئێشکەیان گرتوە)، کەسانێك هەبوون کە دڵنەخۆش بوون و، لەرزۆك بوون، خۆیان پەنادەدا و، خۆیان دەدزییەوە، لەوە کە بەشداریی ئەو چاڵ هەڵکەندنە بکەن، ئنجا ئەم ئایەتە موبارەکە لە بارەی ئەوانەوە دابەزیوە، کە زۆرینەی هاوەڵان بوون و بە قسەی پێغەمبەریان ﷺ کردوە، بەبێ فەرمانی وی بەملاو لادا نەچوون:

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾﴾ النــور.

واتــە: بــڕواداران تەنیـا ئەوانــەن کــە بڕوایـان بــە خــواو بــە پێغەمبەرەکـەی ﷺ هێنـاوە و، کاتێـك لـە خزمـەتی پێغەمبـەردا دەبـن ﷺ بـۆ کارێـکی کۆکـەرەوە، کارێـکی هەرەوەزیـی، نـاڕۆن تاکـو مۆڵـەتی لێوەرنەگـرن، ئەوانـەی کـە مۆڵەتـت لێوەردەگـرن، ئنجـا بـۆ ئیـش و کارێکیـان دەچـن، ئەوانـە بڕوایـان بـە خـواو بـە پێغەمبەرەکـەی هەیـە، ئەگـەر بـۆ کارێکیـان داوای مۆڵـەتی لێکـردی مۆڵەتیـان بـدە، هـەر کەسـێکت ویسـت لێیـان مۆڵەتیـان بـدە و، داوای لێبوردنیـان بـۆ لـە خـوا بکـە، بێگومـان خـوا لێبـوردەی بـە بەزەییـە، (ئـەوە لـە بـارەی بڕوادارانێکـەوە کـە پابەنـد بـوون بـە فەرمـانی پێغەمبـەرەوە ﷺ کاری چاکیـان دەکـرد و، خۆیـان نەدەدزییـەوە)، لـە بـارەی ئەوانەشـەوە کـە دڵنەخـۆش بـوون و خـۆ دزەرەوە بـوون، خـوا ئـەم ئایەتـەی ژمـارە (٦٣) سـوورەتی (النـور)ی دابەزانـد، دەفەرمـوێ:

﴿ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾النـور.

واتـە: بانگکـردنی پێغەمبـەر ﷺ لـە نێـو خۆتانـدا، وەك بانگکـردنی هەندێکتـان بـۆ هەندێکتـان تەماشـا مەکـەن، بـە دڵنیایـی خـوا ئەوانەتـان دەزانـێ کـە خـۆ دەدزنـەوە، خۆیـان لـە شـتێك دەگـرن و خۆیـان پەنـا دەدەن، بـا ئەوانـە بترسـێن و وریـا بـن، کـە سـەرپێچیی لـە فەرمـانی پێغەمبـەر دەکـەن ﷺ بەڵایەکیـان تـووش بـێ، یاخـود ئـازارو سـزایەکی بـە ئێشـیان لـە ڕۆژی دواییـدا تـووش بـێ، دوایـی خـوا لـە کۆتاییـدا دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٦٤﴾ ﴾النـور، واتـە: ئـاگادار بـن! هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و لـە زەویدایـە هـی خوایـە، دەزانـێ ئێـوە لەسـەر چ حاڵێکن و، ئـەو ڕۆژەش کـە بـۆ لای دەگێڕدرێنـەوە، هەواڵیـان پێـدەدا بـەوەی دەیانکـرد و، خـوا بـە هەمـوو شـتێك زانایـە.

٤)- ئیدی مسوڵمانان کاریان کرد لە هەڵقاندنی ئەو خەندەکەدا، وەك (القرطبي)یش[1] هەمان شت دێنێ، مسوڵمانان چاڵەکەیان هەڵقەندو، بە دەم چاڵ هەڵکەندن و ئیشکردنەوەش هەندێ شیعریشیان دەگوتن، کە پێغەمبەریش ﷺ جاری وا هەبووە لەگەڵی دەگوتنەوە، بۆ وێنە: پیاوێك لە مسوڵمانان کە ناوی (جُعَیل) بوو، پێغەمبەر ﷺ ناوی لێنا بوو (عَمْرو)، ئنجا مسوڵمانان بە شیعر دەیانگوت: بە دەم ئیشکردنەوە:

(سَمَّاهُ مِنْ بَعْدِ جُعَيْلٍ عَمْرًا ... وَكَانَ لِلْبَائِسِ يَوْمًا ظَهْرًا).

واتە: دوای جوعەیل ناوی نا عەمر که ڕۆژانێك بۆ بابای داماو، پشت بوو.

ئنجا کاتێك بە لای وشەی (عَمْرو)دا تێدەپەڕین پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: (عَمْرا)، کاتێ بەلای وشەی (ظهر) تێدەپەڕین، پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵیان دەیفەرموو: (ظَهْرا).

٥)- (ابْنُ إِسْحَاق) باسی چەند شتێك دەکات کە وەك موعجیزە لە کاتی هەڵکەندنی ئەو خەندەکەدا ڕوویانداوە، دەڵێ: لە کاتی هەڵکەندنی ئەو خەندەکەدا، هەندێ قسە هەن پێم گەیشتوون، کە لە خوای بەرزەوە پەندیان تێدایە بۆ ڕاست دانانی پێغەمبەری خوا ﷺو، دڵنیاکردنەوە لە پێغەمبەرایەتیی موحەممەد و، مسوڵمانان ئەوانەیان بینیون:

چوار نموونە دێنێتەوە، کە بە کورتیی باسیان دەکەین:

أ- لە هەڵکەندنی ئەو خەندەکەدا شوێنێکیان لێ عاصێ دەبێ، شاخی ڕەق دەبێ، سکاڵا دەبەنە لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش داوا دەکات کە هەندێ ئاوی بۆ بێنن و، فوو لە ئاوەکە دەکات و تفی تێ دەکات، دوایی دوعا دەکات، بەوەی کە لەو کاتەدا خوای پەروەردگار ویستی لەسەر دەبێ، لێی بپاڕێتەوە، دوایی ئەو ئاوە بەو شوێنەدا دەکات، ئەو شاخە ڕەقە کە لێیان عاصێ بووە، ئەوەی کە لەوێ ئامادەبوون دەڵێن: سوێند بەو کەسەی کە موحەممەدی ﷺ بە هەق ناردوە، دوای ئەوەی ئاوەکەی لێ پڕژاند و، دوعاکانی لێ خوێندن، وەك چۆن زبڵێك، یان لمێك کە پێکەوە لکاوە بەو شێوەیە بوو، نە پاچی لێ هەڵدەبەزیەوە، نە بێڵیش و بەسەریەکدا ڕما.

---

(١) الجامع الأحكام القرآن، ج١٤، ص١٠٧.

ب- کچێکی (بَشِيرِ بْنِ سَعْد) خوشکی (نُعْمَانُ بْنُ بَشِير)، دەڵێ: دایکم (عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَة) بانگی کردم و چەنگە خورمایەکی وێدام، لە کۆشی خۆمم کرد، یان لە پۆشاکەکەم کرد، گوتی: ڕۆڵە گیان! ئەمە بۆ بابت و خاڵت (عبدالله بن رَوَاحَة) بەرە، کە وەك خواردنی نیوەڕۆ بیخۆن، دەڵێ: منیش ئەو چەنگی خورمایەم برد، بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕیم، لە بابم و لە خاڵم دەگەڕام، پێغەمبەر فەرمووی ﷺ: کچی خۆم وەرە ئەوە چییە پێتە؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەوە خورمایە، دایکم پێیدا ناردووم بۆ بابم (بَشِيرُ بْنُ سَعْد) و، خاڵم (عَبْدُاللهِ بْن رَوَاحَة)، کە وەك خواردنی نیوەڕۆ بیخۆن، فەرمووی: بۆم بێنە، دەڵێ: منیش خورمایەکەم کردە هەردوو دەستی پێغەمبەرەوە ﷺ، کە خورمایەکە هێندە نەبوو، هەردوو لەپە دەستی پڕ بکات، دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد پەڕۆیەکیان هێنا، ڕایخست و، خورمایەکانیشی لەسەر ئەو پەڕۆیە دانان، دوایی بە کەسێك کە لە لای بوو پێی فەرموو: بانگی ئەهلی خەندەك بکە، کە بێن بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ، دەڵێ: خەڵکی خەندەك هەموو ئەوانەی کە چاڵی خەندەکیان هەڵدەکەند، هاتن، لێیان دەخوارد، کەچی ئەو چەنگە خورمایە لە هەمووشیان زیاد بوو، هەتا خەڵکی خەندەك هەموویان ڕۆیشتن، (واتە: خواردیان و ڕۆیشتن)، ئەو خورمایە هێندە زۆر بوو لە قەراغی پەڕۆیەکە دەکەوتە خوارێ.

ج- جابیری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە هەڵکەندنی خەندەکدا کارمان دەکرد، منیش بەرخۆڵەیەکم لەلا بوو قەڵەویش نەبوو، گوتم: با بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ سەری ببڕین و، بۆی ساز بکەین، بە خێزانەکەم گوت: با بۆی ئامادە بکەین، ئیدی خێزانم هەندێ جۆی کوتا و، نانی لێ دروستکرد و، ئەو بەرخۆڵەیەشمان سەربڕی و، برژاندمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتێك ئێوارە داهات، پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی لەلای خەندەکەوە بچێتەوە بەرەو ماڵ، کە ئێمە ئیشمان تێدا دەکرد، لە بەیانیی ڕا تاکو ئێوارە، ئنجا دوایی دەچووینەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ من بەرخۆڵەیەکم بۆ سازکردووی لەگەڵ هەندێك لە نانی جۆ، پێم خۆشە تەشریفت بێ و، بچینەوە ماڵێ، بۆ ئەوەی پێکەوە بیخۆین، (دیارە ئەویش ماڵ و منداڵی هەبووەو مەبەستی ئەوە بووە پێغەمبەر ﷺ تەنیا بۆ خۆی بێت)، دەڵێ: کاتێ ئەوەم گوت: پێغەمبەر فەرمووی ﷺ بەڵێ، دوایی بانگی کرد، کە یەکێك بانگ بکات

و هاوار بکات کە خەڵکینە! لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ وەرن بۆ ماڵی جابیری کوڕی عەبدوڵڵا، منیش گوتم: (إنا لله وإنا إليه راجعون)، (ئەوە لە کاتی موصیبەتدا دەگوترێ، واتە: من خواردنی دوو سێ نەفەرم سازکردوە، ئێستا ئەهلی خەندەك خوا دەزانێ چەند سەد کەس بوون، بە لای کەمەوە)، ئنجا پێغەمبەر ﷺ هات خەڵکەکەشی هەموو لە خزمەت دابوو، ئێمەش ئەو بەرخۆلەیە گۆشتەکەیمان برژاندبوومان، نانەکەش پێغەمبەر ﷺ دوعای لێکرد ناوی خوای هێنا، دوایی دەستیان کرد بە خواردن و هەموو خەڵکیش هاتن، هەتا هەر کۆمەڵێك تەواو دەبوون، (دیارە ماڵەکەیان جێی هەموویانی تێدا نەبۆتەوە)، کۆمەڵێك نانیان دەخوارد و، کۆمەڵێکی دیکە دەهاتن، تاکو خەڵکی خەندەك هەموویان خواردیان و بەشی هەمووانی کرد[1].

د- (إبن إسحاق) دەڵێ: لە سەلمانی فارسییەوە پێم گەیشتوە، دەڵێ: لەلایەکی خەندەکەوە خەندەکم هەڵدەکەند، گاشە بەردێکی ڕەق هاتە پێشم، پێغەمبەری خواش ﷺ لێم نیزیك بوو، کاتێ بینیمی (ئایا بە کوین بووە، بە پاچ بووە، ئەوەی کە بەردیان پێی شکاندوە)، لێی دەدەم و تەماشای کرد شوێنەکە زۆر ڕەقەو هەر پاچ لێی هەڵدەبەزێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دابەزی و، پاچەکەی لێوەرگرتم و پاچێکی لێدا، لە ژێر نووکی پاچەکەدا بلێسەیەك بەرز بۆوە، دوایی یەکێکی دیکەی لێدا، جارێکی دیکە بلێسە بەرز بۆوە، دوایی سێیەم جاری لێدا، جاری سێیەمیش بلێسە لە شوێنی نووکی پاچەکە بەرز بۆوە، منیش گوتم: باب و دایکم بە قوربانت بن، ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەوە چی بوو، لە ژێر نووکی پاچەکەدا دەمبینی بلێسە دەدا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

(أَوَقَدْ رَأَيْتَ ذَلِكَ يَا سَلْمَانُ ؟ قَالَ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: أَمَّا الْأُولَى، فَإِنَّ اللَّهَ فَتَحَ عَلَيَّ بِهَا الْيَمَنَ؛ وَأَمَّا الثَّانِيَةُ، فَإِنَّ اللَّهَ فَتَحَ عَلَيَّ بِهَا الشَّامَ وَالْمَغْرِبَ، وَأَمَّا الثَّالِثَةُ فَإِنَّ اللَّهَ فَتَحَ عَلَيَّ بِهَا الْمَشْرِقَ)، واتە: سەلمان! ئایا تۆش ئەوەت بینی؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: دوای لێدانی یەکەمیان: برووسکەی یەکەمیان خوا یەمەنی پێشاندام، کە ئۆممەتی من یەمەن ئازاد دەکەن، هی دووەمیان: خوای پەروەردگار شام و لای ڕۆژئاوای پێشاندام، ئەوێش ئازاد دەکەن، (واتە: وڵاتی ڕۆم)، هی سێیەمیان: لای

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ص١٠٨، ١٠٩.

ڕۆژهەڵاتی پێشاندام، واتە: وڵاتی فارس و ئێرانیش دەگرن، (ئێرانی ئێستاو فارسی کاتی خۆی).

٦)- کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە هەڵکەندنی خەندەك بۆوە، ئنجا سوپایەکانی کافران هاتن، هەم هۆزی قوڕەیش و، هەم هۆزی (غَطَفَان) و هاوپەیمانەکانی قوڕەیش، هاتن، هەتا گەیشتنە شوێنێك کە پێی دەگوترێ: (مُجْتَمَعِ الأَسْيَالِ مِنْ رُومَةَ، بَيْنَ الجُرُفِ وَزغَابَةَ)، ژمارەیان دە هەزار (١٠،٠٠٠) کەس بوو، هەم قوڕەیش، هەم ئەحابیش، ئەوانەی کە شوێنیان کەوتبوون لە (بَنِي كِنَانَة)، هەروەها لە خەڵکی (تِهَامة)، هەروەها (غطفان) یش و، خەڵکی (نجد) کە شوێنیان کەوتبوون، ئەوانە هەموویان هاتن، ئەوانیش لە (ذَنَبُ نَقْمَى) بارەگایان خست و، پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمانانیش دەرچوون، پشتی خۆیان کردە چیای (سلع)، ژمارەی پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمانانیش سێ هەزار (٣٠٠٠) کەس بوو، لەوێ سەربازگەی خۆیان دانا و، خەندەکەکە کەوتبۆ نێوان ئەو سێ هەزار کەسە، بە سەرکردایەتیی پێغەمبەرو ﷺ، ئەو دە هەزار (١٠) کەسە بە سەرکردایەتیی (أبو سُفیان) لە قوڕەیشییەکان و، هەروەها (غطفان)یش کە چەند سەرکردەیەکیان هەبوون و، هۆزو تیرەکانی دیکەش.

٧)- پێغەمبەر ﷺ کاتێك دەرچوو بۆ ئەو جەنگە، (عبدالله ابْنُ أُمِّ مَكْتُوم)ی لە شوێنی خۆی دانا، لە شاری مەدینە، کە پێشنوێژیی بۆ خەڵك بکات و سەرپەرشتییان بکات.

٨)- پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد: منداڵ و ئافرەتان لە قەڵاکان دابن، لە شوێنی مەحکەم و قایم، کە دوژمن دەستی نەیانگاتێ.

٩)- هەڵوێستی جوولەکەکانی پەیمان شکێن، ئەمە درێژەیەکی هەیەو تەنیا پوختەیەکی لێ دێنین، (إبن إسحاق) دەڵێ:

دوژمنی خوا (حُيَيّ بْنُ أَخْطَب النَّضرِيّ) دەرچوو، هەتا هاتە لای (كَعْبُ بْنُ أَسَد القُرَظِيّ)، کە خاوەنی بەڵێن و پەیمانی بەنی قوڕەیزە بوو، پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەستبوو، کە شەڕ دژی یەکدیی نەکەن، ئنجا کە (كَعْب بْن

أَسَد الْقُرَظِيّ) دەبیستێ (حُيَيّ بْنُ أَخْطَب) هاتوە، دەرگایەکە بە ڕوویدا دادەخات، ئەویش مۆڵەت وەردەگرێ، بەڵام (کعب) ئامادە نابێ دەرگای بۆ بکاتەوە، (حُيَيّ بْن أَخْطَب)یش بانگی دەکات دەڵێ: ئەی (کعب)! بێ قەزابێ دەرگام لێ بکەوە، ئەویش دەڵێ: بێ قەزابی (حُيَيّ) تۆ پیاوێکی بێ خێرو نەگبەتی، من بەڵێنم بە موحەممەد ﷺ داوە و، بەڵێنەکە هەڵناوەشێنمەوە لە نێوان خۆم و ئەودا، من جگە لە وەفاو ڕاستگۆیی هیچی دیکەم لە موحەممەد ﷺ نەبینیوە، دووبارە (حُيَيّ بْن أَخْطَب) بانگی دەکاتەوە دەڵێ: دەرگام لێ بکەوە، قسەت لەگەڵدا دەکەم، دەڵێ: نەخێر دەرگات لێناکەمەوە، دوایی (حُيَيّ) دەڵێ: بۆیە دەرگای قەڵام لێ دادەخەی، لە ترسی ئەوەی لە خواردنەکەت بخۆم، تۆ پیاوێکی چرووکی! تووڕەی دەکات، ئەویش دەرگایەکەی بۆ دەکاتەوەو، (حُيَيّ) پێی دەڵێ: ئەی (کعب)! سوپایەك و هێزێکم بۆ هێناوی وەك دەریا وایەو، دەسەڵاتدارانی ئەم ڕۆژگارەو قوڕەیشم هێناوە بە هەموو سەرکردەکان و گەورەکانیانەوەو، لە (مجتمع الأسيال) کە لە دوامەوەیە، لەوێ مەنزڵگایان گرتوە، (غطفان)یش بە هەموو سەرکردەو گەورەکانیانەوە، هێناومە، ئەوانیش لە (ذنبُ نقمى) لە لای چیای ئوحود، بارەگایان گرتوەو، بەڵێنیشان بە من داوە کە نەڕۆن هەتا موحەممەدو ﷺ ئەوەی لەگەڵیدایە، بنبڕیان دەکەن.

(كَعْب بْن أَسَد الْقُرَظِي)یش، پێیگوت: سوێند بە خوا، بێ دەستەڵاتدارانی ئەم ڕۆژگارەت بۆ هێناوم و، هەورێکت بۆ هێناوم، ئاوی تێدا نەماوە، (واتە: هیچیان لە باران دا نیە، هەر هەورە گرمەیەتی و برووسکەیەتی، بەڵام هیچ ئاوی تێدانیە). ئەی (حُيَيّ)! لێم گەڕێ لەو حاڵەی من لەسەریمی، چونکە من لە موحەممەد ﷺ جگە لە ڕاستگۆیی و وەفا، هیچی دیکەم لێ نەبینیوە! (حُيَيّ)یش هەر لەگەڵی دا خەریك دەبێ و هانی دەدات، هەتا ڕێگای دەدا و، بەڵێنی پێدەداو پەیمانی لەگەڵدا دەبەستێ، (حُيي)ش بەڵێن و پەیمانی پێدا، کە ئەگەر قوڕەیش و (غطفان)یش گەڕانەوەو نەیانتوانی موحەممەدو ﷺ هاوەڵانی لە بەین بەرن، من لەگەڵتدا دێمە نێو قەڵایەکە، تاکو چی بەسەر تۆ بێ، بەسەر منیش بێ، ئیدی

**(كعب)** پەیمانەكەی هەڵدەوەشێنێتەوە لەسەر قسەی **(حُيَيّ)**و، بەڕانەت دەكات لەو پەیمانەی كە لە نێوان ئەوو پێغەمبەری خوادا ﷺ بووە.

**١٠)- كاتێك ئەو هەواڵە بە پێغەمبەری خوا ﷺو، بە مسوڵمانان دەگات، پێغەمبەری خوا ﷺ (سعد بن معاذ) كە ئەو كاتە گەورەی هۆزی ئەوس بوو، لەگەڵ (سعد بن عبادة بن دليم) كە یەكێك بووە لە (بني ساعدة بن خزرج) كە ئەویش لەو كاتەدا گەورەی هۆزی خەزرەج بوو، هەروەها لەگەڵیشیاندا (عبدالله بن رواحة) و (خوات بن جبير) ئەو چوار كەسە دەنێرێ، دەفەرموێ: بچن سەرنج بدەن، ئایا ئەوەی پێمان گەیشتوە لە بارەی ئەو خەڵكەوە، ڕاستە؟! ئەگەر ڕاستبوو، بە شێوەیەك پێم بڵێن بە ئاماژە، كە من تێبگەم، بەڵام وامەكەن عەزیمەتی خەڵك بڕووخێ و، ئەگەر لەسەر وەفادارییش مابوونەوە، لەسەر ئەو بەڵێنەی كە لە نێوان ئێمەو ئەواندا هەیە، ئەوە بە ئاشكرا بیڵێن.**

ئەوانیش دەرچوون تاكو چوونە لایان، تەماشایان كرد لەسەر حاڵێكی زۆر خراپن و، قسەشیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوت، گوتیان: **(رسول الله)** كێیە؟ هیچ پەیمان لە نێوان ئێمەو موحەممەد دا نیە، هیچ گرێبەستمان لە نێواندا نیە، سەعدی كوڕی موعازیش قسەی پێگوتن و جنێوی پێدان، **(سعد)** پیاوێك بوو تۆزێك توندیی تێدابوو، [جێی سەرنج ئەوەیە لێرەدا **(إبن إسحاق)** دەڵێ: **(سعد)** قسەی پێگوتن، بەڵام **(القرطبي)** لە **(الجامع لأحكام القرآن)**دا دەڵێ: سەعدی كوڕی عوبادە ﷺ قسەی پێگوتن، واتە: سەرۆكی هۆزی خەزرەج، نەك سەرۆكی هۆزی ئەوس]، ئنجا كە سەعدی كوڕی موعاز قسەی پێگوتن، سەعدی كوڕی عوبادە پێیگوت: لێیان گەڕێ و، قسەیان پێ مەڵێ، ئەوەی لە نێوان ئێمەو ئەواندا هەیە، گەورەترە لە قسە بە یەكدی گوتن.

{بەڵام لە تەفسیری **(القرطبي)**دا دەڵێ: سەعدی كوڕی موعاز ئامۆژگاریی سەعدی كوڕی عوبادەی كردو، گوتی: شەڕە جنێویان لەگەڵدا مەكە، ئەوەی لە نێوان ئێمەو ئەواندا هەیە، گەورەترە لە شەڕە قسە، ئنجا من ئەوەی دووەمیانم پێ ڕاستە، چونكە سەعدی كوڕی عوبادە، زیاتر بەلای توندیی و هەڵچووندابوو،

وەك لـە هەڵوێستەكانیدا دیارەو، سـەعدی كـوڕی موعـاز پیاوێـكی هێدیـی مەندتـر و بـار قووڵتربـووە}

دوایـی هـەردووك سـەعد و ئەوانـەی لەگەڵیـان بوون، هاتنـەوە بـۆ لای پێغەمبەری خـوا ﷺ سـڵاویان لێكـرد، دوایـی گوتیـان: (العَضَـل وَالْقَـارَةُ) پێغەمبـەری خـواش ﷺ تێگەیشـت، [واتـە: ئەوانـە پەیمانیـان شـكاندوە، وەك پەیـمان شـكاندنی هـەردووك هـۆزی (العَضَـل وَالْقَـارَةُ) كـە هـاوەڵانی پێغەمبەریـان ﷺ كوشـت لـە (الرجیـع)، كـە (خُبیـب)و هاوەڵـەكانی بـوون]، پێغەمبـەری خـواش فەرمـووی: خـوا گەورەتـرە، موژدەتـان لێبـێ، ئـەی كۆمەڵـی مسـوڵمانان!

١١)- ئنجا ئەو بەڵایە لەسەر مسوڵمانان زۆر توند بوو، ترسیان ورده ورده لەسەر توند بوو، دوژمن لەسەرروویانەوە هات و، لە لای خوارەوەش بۆیان هات، هەتا بڕواداران هەموو جۆرە گومانێكیان بردو، نیفاق و دەغەڵیی سەری هەڵێنا، هەتا یەكێك لە مونافیقەكان كە ناوی (مُعَتِّبُ بْنُ قُشَيْرٍ) بوو لە (بني عمرو بن عوف) گوتی: موحەممەد بەڵێنی پێدەداین كە خەزێنەكانی كیسراو قەیسەر (واتە: پادشای فارس و ڕۆم) بگرین، كەچی یەكێك لە ئێمە لە خۆی دڵنیا نیە بچێ تارەت بگرێ، هەتا یەكێكی دیكە لە (بنو حارثة) بە ناوی (أوس بن قَيظي) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ماڵەكانمان چۆڵن و بە دەرەوەن لە دوژمن، ئەویش لەلای كۆمەڵێك لە خەڵكی خۆی وایگوت، مۆڵەتمان بدە بچینەوە بۆ لای ماڵەكانمان، چونكە لە مەدینە دوورە! پێغەمبەری خوا ﷺ مایەوە لەسەر ئەو حاڵە و، ئەوانەش كە لە خزمەتیدا بوون مانەوە، بیست و ئەوەندە شەوە، نیزیكەی مانگێك، بەڵام جەنگێكی جیددییان لە بەیندا نەبوو، تەنیا بریتی بوو لە گەمارۆدان و، لە دوورەوە شەڕە تیـر.

١٢)- كاتێك ئەو حاڵەتە لەسەر خەڵك توند بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی نارد بۆ هەر كام لە: (عُيَيْنَةَ بْنِ حِصْنِ بْنِ حُذَيْفَةَ بْنِ بَدْرٍ) و (الْحَارِثِ بْنِ عَوْفِ بْنِ أَبِي حَارِثَةَ الْمُرِّيِّ) كە دوو سەركردەی هۆزی (غطفان) بوون و، لەگەڵیان ڕێككەوت كە سێیەكی بەروبوومی مەدینەیان بداتێ، بەڵام بە مەرجێك ئەوان وازبێنن و، پشتگیریی هۆزی قورەیش و ئەهلی كوفر نەكەن و، خۆیان و خەڵكەكە بڕۆن، صوڵح و دانووستان لە نێوانیاندا بوو، تەنانەت نووسیشیان،

بەڵام شایەدییان لەسەر نەدا و، نەبوو بە عەزیمەت، هەروا خەریکی دانووستان بوون، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی ئەوە بکات، پێش ئەوەی ئیمزای لەسەربکرێ و بە یەکجاریی ئەو پێکهاتنە ببڕێتەوە، نوێنەری نارد بۆ لای سەعدی کوڕی موعازو سەعدی کوڕی عوبادە، (هەردووك سەرۆك هۆزی ئەوس و خەزرەج)، ئەوەی بۆ باسکردن و ڕاوێژی پێکردن، ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئایا ئەمە شتێکە حەزت لێیەو دەیکەی، یان شتێکە خوا فەرمانی پێکردووەو هەر دەبێ بیکەین؟ یان شتێکە بەرژەوەندیی ئێمەی تێدا دەبینی؟ فەرمووی: بەڵکو شتێکە لەبەر ئێوە دەیکەم، (واتە: نەخۆم حەزم لێیە و، نە خواش فەرمانی پێکردووم)، چونکە تەماشا دەکەم عەرەب هەمووی لە یەك کەوانەوە تیرتان تێ دەگرێ، (هەموویان گەلە کۆمەکێ لە دژتان دەکەن و، لە هەموو لایەکەوە لە دژتان کۆبوونەوە)، ویستم تۆزێك لە دڕك و سەختییەکێ کە ئەوان هەیانە، بیشکێنم، سەعدی کوڕی موعاز گوتی:

(يَا رَسُولَ اللهِ! قَدْ كُنَّا نَحْنُ وَهَؤُلَاءِ الْقَوْمُ عَلَى الشِّرْكِ بِاللهِ وَعِبَادَةِ الأَوْثَانِ لَا نَعْبُدُ اللهَ وَلَا نَعْرِفُهُ، وَهُمْ لَا يَطْمَعُونَ أَنْ يَأْكُلُوا مِنْهَا تَمْرَةً إِلَّا قِرَى أَوْ بَيْعًا، أَفَحِينَ أَكْرَمَنَا اللهُ بِالْإِسْلَامِ وَهَدَانَا لَهُ وَأَعَزَّنَا بِكَ وَبِهِ، نُعْطِيهِمْ أَمْوَالَنَا؟ «وَاللهِ» مَا لَنَا بِهَذَا مِنْ حَاجَةٍ وَاللهِ لَا نُعْطِيهِمْ إِلَّا السَّيْفَ، حَتَّى يَحْكُمَ اللهُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَأَنْتَ وَذَاكَ، فَتَنَاوَلَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ الصَّحِيفَةَ، فَمَحَا مَا فِيهَا مِنْ الْكِتَابِ ثُمَّ قَالَ: لِيَجْهَدُوا عَلَيْنَا).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئێمەو ئەو خەڵکە (واتە: (غطفان))، لەسەر هاوبەش بۆ خوا دانان و بتپەرستیی بووین، (خوامان نەدەناسی و نەدەپەرست)، بەڵام ئەوان تەماعیان لە ماڵی ئێمەدا نەبوو کە دەنکە خورمایەك بخۆن، مەگەر بە میوانداریی بێن بۆ لامان، وەك میوان پێیان بدەین، یاخود بە فرۆشتن، ئنجا ئایا دوای ئەوەی خوا ئێمەی بەڕێز کردوە بە هۆی ئیسلامەوە و، ئێمەی ڕێنمایی کردوە بۆ ئیسلام، بە هۆی تۆوەو بە هۆی ئیسلامەوە ئێمەی عیززەت مەندو باڵا دەست کردوە، ماڵ و سامانی خۆمانی دەدەینێ؟ بە خوا پێویستییمان بەوە نیە، بە خوا جگە لە شمشێر هیچی دیکەیان نادەینێ، تاکو خوا دادوەرییمان

لـە نێـوان دا نـەكات، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: دەجـا ئێـوەو ئـەو كارەتـان چۆن پـێ چاكـە، ئـاوا بكـەن، سـەعدی كـوڕی موعازیـش پەڕەكـە كـە دانوسـتانەكەی تێـدا نـووسرا بـوو، وەری گـرت و ئـەوەی تێـدا نـووسرا بـوو كوژاندیـەوە (ئـاوی پێداكـرد، یـان بـە جۆرێـك سـڕییەوە)و گـوتی: چـی لـە توانایاندایـە بـا بیكـەن.

١٣)- پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان مانەوە بەو شێوەیەو، دوژمن گەمارۆو تابڵووقەی دابوون، هیچ جەنگی تێدا ڕوونەدا، جگە لە چەند ئەسپ سوارێكی قوڕەیش كە (عَمْرُو بْنُ ودّ بْنِ أَبِي قَيْسٍ، وَعِكْرِمَةُ بْنُ أَبِي جَهْلٍ، وَهُبَيْرَةُ بْنُ أَبِي وَهْبٍ الْمَخْزُومِيَّانِ، وَضِرَارُ بْنُ الْخَطَّابِ الشَّاعِرُ ابْنُ مِرْدَاسٍ أَخُو بَنِي مُحَارِبِ بْنِ فِهْر)، ئەم چوار نەفەرە هاتن خۆیان بۆ جەنگ پۆشیی و، دوایی بە سواری وڵاخەكانیانەوە هاتن، هەتا گەیشتنە لای مەنزڵگەكانی (بني كنانة)و گوتیان: ئەی (بني كنانة)! بۆ جەنگ ئامادەبن، ئەمڕۆ بۆتان دەردەكەوێ سوارچاك كێن؟ دوایی ڕۆیشتن بە ڕاكردن بە ئەسپەكانیان تاكو هاتنە لای خەندەك، كە بینییان گوتیان: (والله إن هذه لمكيدة، ما كانت العرب تكيدُها)، بە خوا ئەمە تاكتیكێكەو فێڵێكە عەرەب فێڵی وای نەزانیوە!.

بـەڵام ئـەوە داهێنـانی پێغەمبـەری خوایـەﷺ، بـە ڕاوێـژ سـەلمانی فارسـیی، دەگوترێ: سـەلمانی فارسـیی ئامـاژەی بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ كـردو گوتی: ئـەی پێغەمبـەری خوا! ﷺ ئێمـە لـە وڵاتی فـارس كـە جەنگـمان دەبـوو لەگـەڵ دوژمنـدا لـەو شـوێنەوە كـە دەشـت بـوو، خەندەكـمان لێـدەدا، پێغەمبـەری خـواش ﷺ ئـەو پێشـنیارەی وەرگـرت و، تەبەننیـی كـردو جێبەجێـی كـرد.

هەروەهـا (إبـن هِشـام) دەڵـێ: هەندێـك لـە ئەوانـەی خـاوەن زانیاریـین، بۆیـان باسـكردووم كـە كۆچكـەران لـە ڕۆژی خەندەكـدا گوتیـان: سـەلمان لـە ئێمەیـە و، پشـتیوانەكانیش گوتیـان: سـەلمان لـە ئێمەیـە، پێغەمبەریـش ﷺ فەرمـووی: (سلمانُ منّـا أهـل البيـت) واتـە: سـەلمان لـە ئێمەیـە لـە بنەماڵـەی ئێمەیـە، (بـۆ ئـەوەی جۆرێكیـش لـە صوڵـح بـێ لـە نێـوان كۆچكـەران و پشـتیوانانندا، كەواتـە: سـەلمان بـە تایبـەت عایـدی منـەو لـە بنەماڵـەی ئێمەیـە، ئنجـا كـە لـە بنەماڵـەی پێغەمبەریـش

ﷺ بـوو، لـه خێـزانی ئـەو بـوو، مانـای وایـە هـی هـەردووك لایـە، هـی كۆچكـەران و پشــتیوانان).

ئنجـا ئـەو چـوار ئەسـپ سـوارە ڕۆیشــتن، كـوێ لـە خەندەكەكـە بـە تەسـك و تەنگەبەریـان زانی بـە سـواری وڵاخەكانیـان و بـە ڕاكـردن خۆیـان پێـداداو پەڕینـەوە، هەتـا گەیشـتنە شـوێنێك لـە نێـوانی خەنـدەك و سـەلعدا، ئیـدی لـە وێ عـەلی كـوڕی ئەبـو تاڵیـب ﷺ لەگـەڵ كۆمەڵێـك لـە مسـوڵمانان، بۆیـان چوونـە مەیـدان و، ئـەو شـوێنەی كـە ئـەوان لێـی پەڕیبوونـەوە، ئـەو شـوێنەیان لـێ گرتـن، ئنجـا چـوار ئەسـپ سـوارەكان بۆیـان گەڕانـەوەو ڕووبـەڕووی یەكـدی بوونـەوە.

١٤)- (عمرو بن ود) لە جەنگی بەدردا جەنگی كرد بوو هەتا بە برینداریی پەكی كەوتبوو، (واتە: هێندەی برین تێ بوو بوون پەكی كەوتبوو)، بۆیە لە جەنگی ئوحوددا نەیتوانی بوو بەشداریی بكات، برینەكانی زۆر بوون و چاك نەبوو بۆوە، بۆیە لە ڕۆژی خەندەكدا دەرچوو، خۆی نیشانەداركرد تاكو بزانرێ و بناسرێ، كاتێك بە خۆی و ئەسپەكەی ڕاوەستا (علي بن أبي طالب) بۆی چۆوە پێشێ، دیارە عەلیی و هاوەڵەكانی بە پێیان بوون، (علي) بە (عمرو بن ود)ی گوت: بیستوومە پەیمانت لەگەڵ خوادا بەستوە، كە هەر كەسێك لە قوڕەیش تۆ بانگ بكات بۆ یەكێك لە دوو شتان لێی وەردەگری، گوتی: بەڵێ، گوتی: ئنجا من بانگت دەكەم بۆ لای خواو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و، بانگت دەكەم بۆ ئیسلام، ئەویش گوتی: پێویستم بەوە نیە، گوتی: كەواتە: بانگت دەكەم بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەو بۆ جەنگ! گوتی: ئاخر بۆچی ئەی برازام؟ بە خوا حەز ناكەم بتكوژم، عەلی گوتی: بە خوا من حەز دەكەم بتكوژم، (عَمْرو) تووڕە بوو لە ئەسپەكەی هاتە خوار و، ئەسپەكەی پەیكرد (چوار پەلەكانی بڕین)و، لە دەم و چاوی ئەسپەكەی دا، (كوشتی)، دوایی ڕوویكردە عەلیی و، بۆ یەكدی دابەزین و لێك سووڕان، سەرەنجام عەلی ﷺ كوشتی و ئەو سێ ئەسپ سوارەی مابوونەوە ڕایانكرد و، خۆیان بە خەندەكەكەدا داو پەڕینەوەو هەڵاتن.

١٥)- دروشمی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە كاتی جەنگی خەندەكدا و، لە كاتی جەنگی بەنی قوڕەیزەدا بریتی بوو لە: (حـم، لا ینصرون) حا میم سەرناكەون، یاخود سەرناخرێن، (ئەو كاتە عادەت وابووە دەبووایە هەر سوپایەك دروشمێكی هەبێ).

**١٦)- (إبن إسحاق) دەڵێ: بۆم گێردراوەتەوە کە عائیشە دایکی بڕواداران لە قەڵایەك دابوو لە قەڵایەکانی (بني حارثة) لە ڕۆژی خەندەکدا، کە لە هەموو قەڵایەکان مەحکەمتر بوو، دایکی سەعدی کوڕی موعازیش لەگەڵی بوو لەو قەڵایەدا، عائیشە دەڵێ: سەعدی کوڕی موعاز تێپەڕی زرێیەکی لەبەر دابوو، زرێیەکەی کورت بوو، واتە: هەموو جەستەی نەگرتبۆوە و، قۆڵی لە زرێیەکە هاتبووە دەرێ، نێزەیەکی بەدەستەوە بوو، نێزەکەی ڕادەوەشاندو دەیگوت:**

(لبّث قليلاً يشهد الهيجا حمل ... لا بأس بالموت إذا حان الأجل).

**واتە: ئارام بگرە لە مەودوا جەنگ دەبینین و، قەیدی ناکات مردن بێ هەر کاتێ کە کاتی خۆی هات**

**دایکی پێیگوت: ڕۆڵە گیان! بڕۆ بە خوا دواکەوتووی، خۆت بگەیەنێ، عائیشەش خوا لێی ڕازیبێ دەڵێ: پێمگوت: ئەی دایکی سەعد! بە خوا حەزم دەکرد زرێیەکەی سەعد لەوەی کە ئێستا لەبەریەتی، درێژتر بووایە، عائیشە دەڵێ: ترسام تیرێك بە قۆڵی بکەوێ، چونکە قۆڵی لە زرێیەکە هاتبووە دەرێ و، (دواییش ئەگەر دانانەکەی دایکمان عائیشە هاتۆتە دی و، تیرێك بە قۆڵی سەعد کەوتوە کە دەمارەکەی بڕیوەو واپێدەچێت دەماری خوێنبەری بڕیبێ)، ئنجا ئەوەی کە لێیداوە (إبن عرقة) بووە، کە دەڵێ: لێم وەربگرە من (إبن عرقة)م، سەعد دەڵێ: (عرّق الله وجهك في النار) خوا دەم و چاوت گەرم دابێنێ و، ئارەقەی پێ بکات لە ئاگردا، دیارە دوایی سەعد دەڵێ: خوایە! ئەگەر لە نێوان ئێمەو قوڕەیشدا جەنگ ماوە، بۆ ئەو جەنگە بمهێڵەوە، چونکە هیچ کۆمەڵە خەڵکێك لە لام خۆشەویستتر نیە لە دژیان بجەنگم لە خەڵکێك کە پێغەمبەرەکەی ﷺ تۆیان ئەزیەتداوەو، بە درۆیان داناوەو دەریانکردوە، ئەگەر لە نێوان ئێمەو قوڕەیشیش دا جارێکی دیکە جەنگ نابێتەوە، ئەو برینەم بۆ بکە بە مایەی شەهید بوون، بەڵام مەشمرێنە تاکو دڵخۆش و شادمانم دەکەی، بەوە کە تۆڵە لە بەنی قوڕەیزە بسەنرێتەوە، (کە خواش ئەو دوعایانەی سەعدی هەموویان قبووڵ کردوون).**

١٧)- (إبن إسحاق) دەڵێ: بۆم گێڕدراوەتەوە کە (صفیة بنت عبدالمطلب)، (کە پووری پێغەمبەرە ﷺ خوشکی بابی)، لە قەڵایەکدا دەبێ و، (حسّان بن ثابت)یش هەر لەوێ دەبێ، کە وەك پارێزەرێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر ئافرەتان و منداڵانەوە دایناوە، صەفییە دەڵێ: پیاوێك لە جوولەکەکان بە لاماندا ڕەتبوو، دەوری قەڵاکەی دەدا، کەسیشی لێ نەبوو بەرگرییمان لێ بکات، بە حەسسانم گوت: ئەو جوولەکەیە بە دەوری قەڵایەکە دێت و دەچێ، منیش دڵنیا نیم کە بزانێ و پەی بەرێ کە ئێمە کەسمان لە لا نیە و، دوایی جوولەکەکانی دیکە تێبگەیەنێ و بەسەرماندا بدەن، لە قەڵاکە دابەزەو بچۆ بیکوژە! ئەویش گوتی: خوا لێت ببووریێ کچی (عبدالمطلب) بۆ خۆت دەزانی کە من هاوەڵی ئەوە نیم، صەفییە دەڵێ: کاتێك کە ئەوەی پێگوتم و تەماشام کرد هیچی لە باراندا نیە لەو بارەوە، خۆم بەست و کۆڵەکەیەکم بەدەستەوە گرت، یان مەترەقێکی گەورە، (کۆڵەگەی کە چادریان پێ هەڵداوە)، لە قەڵایەکە دابەزیم و بەو کۆڵەگەیە لە جوولەکەکەم دا تاکو کوشتم، کاتێك لێی بوومەوە گەڕامەوە بۆ قەڵایەکە، گوتم: حەسسان دابەزە سەلەبەکەی بێنە، (واتە: کەل و پەلەکانی بێنە)، چونکە تەنیا ئەوە ڕێگرم بوو لەبەر ئەوەی پیاوە، ئەوەك عەوڕەتی دەربکەوێ، حەسسان گوتی: ئەی کچی (عبدالمطلب) بە خوا پێویستیم بە کەل و پەل و شمەکی ئەو نیە.

بەڵام (القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا[1]، دەڵێ: (أبو عمرو بن عبدالبرّ) گوتوویەتی: ئەو گێردراوەیە وا پێناچێ ڕاست بێ، چونکە (حسان بن ثابت) پیاوێکی ئازا بووە و، ئەوەندە بەسە کە ڕووبەڕووی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بۆتەوە و، شیعری زۆر بوێرانەی گوتوون و بەرگریی چاکی لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (روح القدس)، جیبریلیش لەگەڵتەو هانت دەداو فێرت دەکات.

١٨)- (إبن إسحاق) دەڵێ: ئیدی بەو شێوەیە پێغەمبەری خواو ﷺ هاوەڵانی کە خوای پەنهانزان بەو شێوەیە وەسفی کردوە، لە ترس و سەختیی و، لە ئابڵووقەدانی دوژمنەکان بۆیان و، لەسەرەوەو لە خوارەوە پەلاماردانیان دا بۆیان، مانەوە و، لەو نێوانەدا (نُعَیْمَ

---

(١) الجامع لأحکام القرآن، ج١٤، ص ١١٢.

بْنَ مَسْعُودِ بْنِ عَامِرِ بْنِ أُنَيْفِ بْنِ ثَعْلَبَةَ بْنِ قُنْفُدِ بْنِ هِلَالِ بْنِ خَلَاوَةَ بْنِ أَشْجَعَ بْنِ رَيْثِ بْنِ غَطَفَانَ) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ من مسوڵمان بووم و خەڵکەکەشم بە مسوڵمانێتیی من نازانێ، ئنجا فەرمانم پێبکە چیت دەوێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی پێ فەرموو: (إِنَّمَا أَنْتَ فِينَا رَجُلٌ وَاحِدٌ، فَخَذِّلْ عَنَّا إِنْ اسْتَطَعْتَ، فَإِنَّ الْحَرْبَ خَدْعَةٌ)، گوتی: تۆ لە نێومان دا پیاوێکی بەتەنێی، بەڵام هەوڵبدە دوژمنانمان لە کۆڵ بکەوە، ئەوەندەی کە دەتوانی، چونکە جەنگ بریتیە لە فێڵ[1].

دوایی (نعيم بن مسعود الثقفي) هەر بەو ئاماژەی پێغەمبەر ﷺ تێدەگات چی بکات! (ئەوانە هێندە عاقڵ بوون بە ئاماژە لە شت حاڵیی بوون)، (نعيم) دەچێ بۆ لای بەنی قورەیزە کە لەسەردەمی نەفامییدا هاودەم و هاوڕازیان بووە، دەڵێ: ئەی بەنی قورەیزە! دەزانن من چەندە ئێوەم خۆش دەوێ و، دەزانن پەیوەندیی تایبەتیی من و ئێوە چۆنە؟ دەڵێن: ڕاستە تۆ لە لای ئێمە تۆمەتبار نی، دەڵێ: ئنجا بۆ زانیارییتان قورەیش و (غطفان) وەك ئێوە نین، وڵات وڵاتی خۆتانە، ماڵ و سامانی ئێوەو کوڕەکانتان و ئافرەتەکانتان و منداڵەکانتان لێرەن، ئێوە ناتوانن ئێرە بەجێ بهێڵن و بچن بۆ شوێنێکی دیکە، بەڵام قورەیش و (غطفان) هاتوون بۆ جەنگ کردن لە دژی موحەممەدو ﷺ هاوەڵانی، ئێوەش پشتگیریی ئەوانتان کردوە، بەڵام ئەوان وڵاتیان و ماڵ و سامانیان و ئافرەتەکانیان لە شوێنێکی دیکەن، وەك ئێوە نین، هاتوون ئەگەر کەلێنێکیان دەستکەوت و دەستکەوتێکیان دەستکەوت باشە، ئەگەرنا دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و، لە ئێوەو لە موحەممەد ﷺ دەگەڕێن لە وڵاتی خۆتاندا و، ئنجا ئەگەر ئێوەو موحەممەدو ﷺ هاوەڵانی بمێننەوە، تواناتان بەسەریاندا ناشکێ، بۆیە لەگەڵ قورەیشدا جەنگ لە دژی موحەممەدو ﷺ هاوەڵانی مەکەن، تاکو بارمتە (رهن) ێکیان لێ وەرنەگرن، چەند بارمتەیەك لە پیاوە ناودارەکانیان، با لە لای ئێوەبن وەك متمانەی ئێوە بەوان، تاکو لەگەڵ موحەممەددا ﷺ دەجەنگن، نەك لە

(١) ئەم دەقە: ئەلبانیی بە بێهێزی داناوە لە (ضعيف الجامع) ژمارە (١٨٢٨) و هەروەها لە (السلسلة الضعيفة) (٣٧- ٧٧)، بەڵام (ابن كثير وابن سيد الناس وابن خلدون و الطبري وابن حبان) هێناویانە.

تەنگانـەدا بڕۆنـەوەو بـە گـورگان خواردووتـان بـدەن!.

بـەنی قورەیـزە دەڵێـن: بەڕاسـتیی ڕایـەکی چاکـت پێشـنیاز کـردوە، دوایـی (نعیـم) لـەلای ئـەوان دەڕواو دەچـێ بـۆ لای قورەیـش و، بـە ئەبـوو سـوفیانی کـوڕی حـەڕب و بـە پیاوەکانی قورەیـش کـە لەگەڵیـدان دەڵـێ: خۆتـان دەزانـن ئێـوەم خـۆش دەوێ و، دەزانـن کـە مـن لەگـەڵ موحەممـەددا نیـم ﷺ و، هەواڵێکیشـم پێگەیشـتوە، کـە ئـەوە حەقـی ئێوەیـە لەسـەر مـن، پێتـان بگەیەنـم وەك دڵسـۆزیی بـۆ ئێـوە، بـەڵام لێـم ئاشـکرا مەکـەن، دەڵێـن: باشـە وا دەکەیـن، دەڵـێ:

خۆتـان دەزانـن کـە کۆمەڵـی جوولەکـەکان، لەسـەر ئـەوەی کـە کردوویانـە بـۆ پشـتگیریی پەشـێمان بوونـەوە، لـە نێـوان خۆیـان و موحەممـەدا ﷺو، نوێنەریـان بـۆ لا نـاردوە، وەڵامیـان بـۆ نـاردوە کـە ئێمـە پەشـێمانین لـەوەی کردوومانـە، ئایـا ڕازی دەبـێ کـە ئێمـە لـە قورەیـش و لـە (غطفـان) چەنـد پیاوێـك لـە ناودارەکانیـان وەربگریـن و بیاندەیـن بـە تـۆ، تـۆش لـە گەردنیـان بـدەی؟ دوایـی ئێمـە لەگـەڵ تـۆ بیـن تاکـو ئەوانـەی مـاون بنبڕیـان بکەیـن؟ ئەویـش دەڵـێ: بەڵـێ، ئنجـا هـەر کاتـێ جوولەکـەکان داوای بارمتەیـان کـرد لـە پیاوەکانتـان، یـەك پیاویـان تەسـلیم مەکـەن، چونکـە بـە تەمـان تەسـلیمی موحەممەدیـان بکـەن و ﷺ بیانکـوژێ، دوایـی لـەلای قورەیـش لادەچـێ، دەچـێ بـۆ لای (غطفـان) دەڵـێ: ئـەی کۆمەڵـی (غطفـان)! ئێـوە ئەسـڵی منـن، هـۆزی منـن، خۆشەویسـترین کەسـن لـە لای مـن، پێموانیـە مـن تۆمەتبـار بکـەن، دەڵێـن: نەخێـر ڕاسـت دەکـەی تـۆ لـە لای ئێمـە تۆمەتبـار نـی، دەڵـێ: ئنجـا شـتێکتان پێدەڵێـم، پەنهـانی بکـەن و لێـم ئاشـکرا مەکـەن، دەڵێـن: باشـە، شـتەکە چییـە؟! ئەویـش چـی بـە قورەیـشی گوتـوە، بەوانیـشی دەڵـێ، چـۆن ئـەوانی ترسـاندوە، ئەوانیـش دەترسـێنێ.

ئنجـا کاتێـك کە شـەوی شـەممە بەسـەردا دێ، مانگی شـەووالی سـاڵی پێنجـەم، (أبو سُـفیان بـن حـرب) و سـەرانی (غطفـان) ئـاگاداری بـەنی قورەیـزە دەکەنـەوە: (عکرمـة بـن أبـو جهـل)و کۆمەڵێـك لـە قورەیـش و (غطفـان) دەنێـرن پێیـان دەڵێـن: ئێمـە لـە شـوێنێك نیـن کـە بتوانیـن هـەر ئـاوا بمێنینیـەوە، ئێمـە حوشـترمان نەمـاوە و، یـەك

سـممان نەمـا (واتـە: وڵاخـە بـەرزە)، مانـدوو بـوون، یـان سـەرمان بڕیـون بـۆ خـواردن، بۆیـە ئامادەبـن کـە جەنـگ لـە دژی موحەممـەدا بکەیـن، ئـەوەی لـە نێـوان ئێمـەو ئەوانـدا هەیـە کۆتایـی پێبێنـن، جوولەکـەکان وەڵامیـان بـۆ دەنێرنـەوە دەڵێـن: ئەمڕۆ ڕۆژی شـەممەیە، ئێمـە لـەو ڕۆژەدا هیـچ ناکەیـن و، کاتێ خـۆی لـە ڕۆژی شـەممەدا، جوولەکـە شـتێکیان کـردوە و بەڵایەکیـان بەسـەر هاتـوە، کـە لـە ئێـوە شـێردراوە نیـە کـە خـوا کـردوونی بـە مەیمـوون و بـەراز، ئنجـا ئێمـە لـە دژی موحەممـەد، لەگـەڵ ئێـوەدا جەنـگ ناکەیـن، تاکـو چەنـد بارمتەیـەك لـە پیاوەکانتانمـان نەدەنـێ و لـە لای ئێمـە بـن و، وەك متمانـەی ئێمـە بـە ئێـوە، تاکـو شـەڕ لـە دژی موحەممـەد ﷺ دەکەیـن، چونکـە ئێمـە دەترسـین ئەگـەر لـە جەنگـدا تینتـان بـۆ هـات و وەزعەکـە لێتـان سـەخت بـوو، بڕۆنـەوە بـۆ وڵاتی خۆتـان و، ئێمـە بەجێهێڵـن و ئـەو پیـاوەش لـە وڵاتی ئێمەدایـەو، بـە تەنیـاش ناتوانیـن بەرەنـگاری ببینـەوە.

کاتێـك نوێنـەرەکان دەچنـەوە بـۆ لای قوڕەیـش و (غطفـان)، دەڵێـن: ئـەوەی کـە (نعیـم) پێیگوتـن حـەق بـوو، ئیـدی ئـاگاداری بـەنی قوڕەیـزە دەکەنـەوە دەڵێـن: ئێمـە یـەك پیاویشـتان تەسـلیم ناکەیـن لـە پیاوەکانمـان، ئەگـەر دەتانـەوێ جەنـگ بکەیـن وەرنـە دەرێ، بـا بجەنگیـن، بـەنی قوڕەیـزە دەڵێـن: کەواتـە: ئـەوەی (نُعیـم) گوتی حەق بـوو، ئەوانـە نایانـەوێ جەنـگ بکـەن و، دەیانـەوێ ئەگـەر هەلێکیـان دەسـتکەوت بەهرەیـەك وەربگـرن، ئەگـەر نـا لـە ئێمـە بگەڕێـن لەگـەڵ موحەممـەدا ﷺ چییـمان لێـدەکات، بـکات، بۆیـە سـوێند بـە خـوا ئێمـە لەگـەڵ ئێـوەدا لـە دژی موحەممـەد ﷺ ناجەنگیـن، تاکـو چەنـد بارمتەیەکـمان نەدەنـێ، ئەوانیـش ئامـادە نابـن، ئیـدی بـەو شـێوەیە خـوا بەینیـان تێکـدەدا بـە هـۆی (نعیـم بـن مسـعود الثقفي)یـەوە.

هەروەهـا خـوا ﷻ بایـەکی سـاردیشی لـە شـەوانێکی زۆر سـارددا دەنێـرێ، هێنـدە سـارد دەبـێ و، هێنـدە بەهێـز دەبـێ، مەنجەڵیـان لەسـەر ئاگـرو سـێکوچکە بـۆ ڕاناوەسـتێ و، ڕەشـماڵ و چادرەکانیـان فـڕێ دەدات.

١٩)- کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەگاتەوە کە چۆن لە بەینی خۆیاندا تێکچوون و،

چۆن خوا ﷻ بڵاوی کردوون و، متمانەیان بە یەکدی نەماوە، (واتە: قورەیش و (غطفان) لەلایەك و بەنی قورەیزە لەلایەك)، حوزەیفەی کوڕی یەمان بانگ دەکات و دەینێرێ بۆ لایان، تاکو بزانێ ئەو خەڵکە چی کردوەو، چۆنەو بە تەمای چین؟، واتە: ئەحزاب، بە تایبەت قورەیش و (غطفان).

ئنجا ئەوە (القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا[1] هێناویەتی و (إبن هشام)یش بە هەمان شێوە دەڵێ: پیاوێك لە خەڵکی کووفە بە حوزەیفەی کوڕی یەمانی ﷺ گوت: ئەی (أبو عبدالله)! ئایا پێغەمبەری خواتان ﷺ بینیوەو هاوەڵاتییتان کرد؟ گوتی: بەڵێ ئەی برازا، گوتی: چیتان دەکرد؟ گوتی: بە خوا هەوڵمان دەدا بەپێی توانا، گوتی: بە خوا ئەگەر ئێمە ئەو کاتە بووباین لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ رازی نەدەبووین بە پێیان لەسەر زەوی بڕوا و، لەسەر ملمان هەڵمان دەگرت، حوزەیفەی کوڕی یەمان گوتی: بە خوا برازام ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە جەنگی خەندەکدا، پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێکیان ئەندازەیەك لە شەوەکە شەو نوێژی کرد دوایی ئاوڕی لێداینەوەو فەرمووی:

چ پیاوێك دەچێ تەماشا بکات بزانێ ئەو خەڵکەی (ئەحزاب) بە تەمای چین؟ دوایی بگەڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بۆشی بە مەرج گرت، کە بە سەلامەتیی بگەڕێتەوەو، داوا لە خوای بەرز دەکەم کە لە بەهەشتدا هاوەڵی من بێ؟ بەڵام یەك پیاو لە ئێمە ئامادە نەبوو لەبەر ترسی زۆرو برسێتیی زۆرو سەرمای زۆر، یەکێك لە ئێمە هەڵنەستا، دوایی پێغەمبەر ﷺ بانگی کردم بە تایبەت، کاتێك بانگی کردم بە ناچاریی دەبوو هەر هەڵسم، فەرمووی: ئەی حوزەیفە! بچۆ نێو ئەو خەڵکە [کە شەو بووە] و، تەماشا بکە بزانە بە تەمای چین و چی دەکەن؟ بەڵام هیچ مەکە تاکو دەگەڕێیەوە بۆ لامان، دەڵێ: چوومە نێو خەڵکەکە، باو سەربازانی خواش ئەوەی پێدەکردن کە دەیانکرد، نە مەنجەڵێکیان بۆ ڕادەوەستا، نە ئاگرێکیان بۆ دەکرایەوە، نە چادرێکیان بۆ ڕادەگیرا، ئەبوو سوفیان گوتی: ئەی هۆزی قورەیش! هەر کام لە ئێوە با تەماشا بکات هاونشینەکەی کێیەو

(١) ج١٤، ص١١٣.

کێ لەگەڵیدا دانیشتوە؟ شەوە تاریکە، حوزەیفە دەڵێ: من یەکسەر دەستی ئەوەی تەنیشتی خۆمم گرت و گوتم: جەنابت کێی؟ گوتی: فلانی کوڕی فلانم، (چەند عاقڵ و بلیمەت بوونە ئەو هاوەڵانە، ئەگەر ئەو دەستی حوزەیفەی گرتبایە دەبووایە چی گوتبایە؟ یەکسەر ئەو دەستی وی گرتوە تۆ کێی؟) ئەبوو سوفیان گوتی: ئەی قورەیشییەکان! سوێند بە خوا، ئێوە لە شوێنێکن کە جێی دیکە لێمانەوە دیار نیە، ئێمە ولاخمان فەوتان، حوشترەکانمان فەوتان، ئاژەڵەکان هەموویان تەواو بوون، (هەموویان سەربڕیون و خواردوویانن)، بەنی قورەیزەش پەیمانی لەگەڵ هەڵوەشاندووینەوە و، هەواڵێکمان پێگەیشتوە لەوانەوە کە پێمان ناخۆشەو، ئەو بایەش وەك دەیبینن زۆر بەهێزە، نە مەنجەڵمان بۆ ڕادەوەستێ، نە ئاگرمان بۆ دەکرێتەوە، نە بیناو چادرێکمان بۆ ڕادەوەستێ، بۆیە خۆتان ئامادە بکەن من دەڕۆم، ئیدی هەڵسا بۆ حوشترەکەی کە بۆی بەسترا بۆوە، لەسەر حوشترەکەی دانیشتوو دوایی سێ جاران لێیدا بڕوا، ئنجا حوشترەکە هەڵسا، بەر لەوەی پەتەکەی کە حوشترەکەی پێی بەسترا بۆوە بکاتەوە، حوشترەکەی ڕاستکردەوە، لە پەلە پەلیان، ئەگەر ئەوە نەبوایە پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاریی کردم و فەرمووی: هیچ مەکە تاکو دێیەوە، دەمتوانی بە تیرێك بیکوژم.

ئنجا گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺو لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد لە پۆشاکێکدا، پۆشاکی یەکێك لە هاوسەرانی، (واتە: لە خۆی پێچابوو سەرمای بوو)، کاتێك منی دی لە نوێژدا بوو، خستمیە نێوان پێیەکانی خۆی بۆ ئەوەی گەرمم بێتەوە، بەشێك لەو پۆشاکەی کە بەخۆی دادابوو لەسەرمان هەندێکیشی بە مندادا، دوایی چووە ڕکووع و چووە سەجدە، من هەر لەنێو ئەو پۆشاکەدا بووم، کاتێك سەلامی دایەوە، هەواڵەکەم پێیدا و، دواییش (غطفان) یش ئەوەی قورەیش بڕیاری دابوو بیستبوویان، ئیدی هەم قورەیش گەڕانەوە، هەم (غطفان)یش گەڕانەوە.

(إبن إسحاق) دەڵێ: پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانیشی و مسوڵمانانیش، کاتێك زانییان ئەو گەمارۆیە نەماوە لە دەوری مەدینەو ڕۆیشتوونە، ئەوانیش چوونەوە ماڵەکانی

خۆیـان و چەکیـان دانـا.

٢٠)- (إبن هِشَام) دەڵێ: دوای ئەوەی سوپا گەمارۆدەرەکانی شاری مەدینە، [دەوڵەتی ئیسلامیی کە پایتەختەکەی شاری مەدینە بوو]، دوای ئەوەی ئاڵقەی گەمارۆ شکا، خوا ﷻ ترسی خستە نێو دڵیان و، بایەکی بەهێزی بۆ ناردن و، فریشتەکان ڕیزەکانیان لێك هەڵوەشاندن، هەروەها کۆمەڵێك هۆکاری دیکەش هەبوون، یەکێك لەوانە هەڵوێستەکەی (نعیم بن مسعود).

ئنجـا دەمــی نیــوەڕۆ بــوو جیبریــل هاتــە لای پێغەمبــەری خــوا ﷺ مێزەرێـکی ئاوریشـمی بەسـتبوو، [واهاتـە بەرچـاوی] بـە سـواریی ئێسـترێك کـە کورتـانی لەسـەر بــوو، کورتانەکــەش قەطیفەیــەکی لەســەر بــوو (کــە جــۆرە قوماشــێکە لــە دیبــاج، دیباجیــش جــۆرە ئاوریشــمێکە)، جیبریــل بــە پێغەمبــەری خــوای ﷺ فەرمــوو: (ئــەی پێغەمبــەری خــوا! ﷺ ئایــا چەکتــان دانــاوە؟ (واتــە: کۆتاییتــان بــە جەنــگ هێنـاوە؟))، فەرمـووی: بەڵـێ، جیبریـل گـوتی: بـەڵام تاکـو ئێسـتا فریشـتەکان چەکیـان دانەنـاوە و، مـن ئێسـتا گەڕامـەوە لـە شـوێنکەوتنی ئـەو خەڵکـە کـە هاتبـوون بـۆ گەمـارۆدانی شـاری مەدینـەو بـە ناچاریـی ڕۆیشـتن، خـوا ﷻ فەرمانتـان پـێ دەکات، کـە بـەڕێ بکـەوی بـەرەو هـۆزی بـەنی قوڕەیـزە، مـن ئـەوە بـەرەو ڕوویـان دەچـم و، ڕایاندەتەکێنـم، (واتـە: ترسـیان دەخەمـە دڵ)، ئیـدی پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـانی بـە بانگەرێـك کـرد، بـە جاڕ چییـەك کـە لـە نێـو خەڵکیـدا جـاڕ بـدات: (مـن کان سامعاً مطیعاً فلا یصَلّینَّ العصر إلاّ ببني قریظة)، واتـە: هـەر کەسـێك بیسـەرەو گوێڕایەڵـەو فەرمانبـەرە، بـا نوێـژی عـەسر نـەکات، مەگـەر لـە لای هـۆزی بـەنی قوڕەیـزە!.

ئنجــا پێغەمبــەری خــوا ﷺ (عبداللــە بــن أم مکتــوم) لــە شــوێنی خــۆی دانــا بەسەرپەرشــتیاری مەدینــە.

## جەنگی بەنو قوڕەیزە لە پازدە (١٥) بڕگەدا:

٢١)- پێغەمبەری خوا ﷺ (علي بن أبو طالب)ی پێش خست و ئاڵایەکەی دایە دەستی بەرەو هۆزی بەنی قورەیزە، خەڵکیش پەلەیانکرد لە کۆبوونەوەداو بەرێکەوتن، عەلی ﷺ ڕۆیشت تاکو لە قەڵایەکانیان نیزیك کەوتنەوە، (بەنی قورەیزە لە چەند قەڵایەکی مەحکەمدابوون)، گوێی لێ بوون قسەی ناشیرینیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگوت، گەڕایەوە لە ڕێ گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ لەسەرەخۆ بە لەو خەڵکە پیسە نیزیك مەبەوە، فەرمووی: بۆچی؟ پێموایە لە بارەی منەوە ئازارت لێ بیستوون (قسەی ناشیرین؟)، گوتی: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر من ببینن، ئەو قسانە ناکەن، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە قەڵایەکانیان نیزیك بۆوە، فەرمووی: (يَا إِخْوَانَ الْقِرَدَةِ! هَلْ أَخْزَاكُمْ اللَّهُ وَأَنْزَلَ بِكُمْ نِقْمَتَهُ؟ قَالُوا: يَا أَبَا الْقَاسِمِ مَا كُنْت جَهُولاً)، ئەی برایەکانی مەیموونان! ئایا خوا سەرشۆڕی کردوون و بەڵاو تۆڵەی خۆی بۆ ناردوون؟ گوتیان: ئەی (أبو القاسم) تۆ هەرگیز نەفام نەبووی، (واتە: قسەی ناشیرین گوتن لە تۆ ناوەشێتەوە)[1].

٢٢)- پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای کۆمەڵێك لە هاوەڵانی دا تێپەڕی، لە (الصَّورين) (شوێنێك بووە) پێش ئەوەی بگاتە هۆزی بەنی قورەیزە، پێغەمبەر فەرمووی ﷺ: کەس بەلاتاندا ڕەت بووە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ (دِحْيَةُ بْنُ خَلِيفَةَ الْكَلْبِيّ)، بە لاماندا ڕەت بوو بە سواری ئێسترێکی سپیی، کورتانی بەسەرەوە بوو، کورتانەکە قوماشێکی لە ئاوریشمی تێوە پێچرا بوو، پێغەمبەری خوا فەرمووی ﷺ: (ذَلِكَ جِبْرِيلُ بُعِثَ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ يُزَلْزِلُ بِهِمْ حُصُونَهُمْ وَيَقْذِفُ الرُّعْبَ فِي قُلُوبِهِم) واتە: ئەوە جیبریل بووە نێردراوە بۆ لای هۆزی بەنی قورەیزە، کە قەڵایەکانیان بلەرزێنێ و، ترس بخاتە نێو دڵ و دەروونیانەوە.

٢٣)- کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای هۆزی بەنی قورەیزە، لە لای بیرێك لە بیرەکانیان کە لە لای ماڵ و سامانەکانیان بوو، بارگەو بنەی خست، بیرەکە پێیدەگوترا: (بِئْرُ أَنَا)، بەڵام (إبن هشام) دەڵێ: پێیدەگوترا: (بِئْرُ أُنِي)، ئنجا خەڵك وردە وردە پێوەی

---

(١) تأريخ الطبري: ج٢، ص٩٩، عيون الآثر: ج٢، ص١٠٣.

پەیوەست بوون، هاوەڵان هاتن خوا لێیان ڕازیبێ، هەندێکیان لە دوای نوێژی خەوتنان گەیشتن و، نوێژی عەسریان نەکرد، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووبووی: (**لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدُكُمْ الْعَصْرَ إِلاَّ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ**).

[ئیدی ئەوان تەماشای ڕواڵەتی فەرمانەکەیان کردو، وەك خۆی جێ بەجێیان کردو، هەتا گەیشتبوونە لای هۆزی بەنی قورەیزەش، نەك نوێژی عەسر، نوێژی شێوانیشیان چوو بوو، ڕۆیشتن سەرقاڵی کردبوون و نەیانتوانی فریای نوێژەکەیان بکەون، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموو بووی: (**من كان سامعاً مطيعاً فلا يصَلِّينَّ العصر إلاَّ في بني قريظة**)، ((هەر کەسێك بیسەرەو گوێڕایەڵە، با نوێژی عەسر نەکات مەگەر لە لای بەنی قورەیزە))]، ئنجا هەندێکیان نوێژەکەیان بۆ ئەوێ دواخستبوو، هەتا گەیشتنە لای بەنی قورەیزە لەوێ نوێژی عەسریان کرد، لە دوای نوێژی خەوتنان، بەڵام نە خوا ﷻ لە کتێبەکەیدا لەو بارەوە ڕەخنەی لێگرتن، نە پێغەمبەری خواش ﷺ لەو بارەوە لێیان تووڕە بووە، [بەڵام هەندێکیان تەماشای نێوەڕۆکی فەرمانەکەی پێغەمبەری خوایان ﷺ کردوەو گوتوویانە: مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەنە بووە، نوێژی عەسر بەرینە ئەوێ، مەبەستی ئەوە بووە بە پەلە بڕۆین، کەواتە: با زوو نوێژەکەمان بکەین و بڕۆین، کە بە تەئکید هی دووەمیان پێکاویانە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئامانجی ئەوە نەبووە هەموو خەڵك نوێژی عەسر بەرێتە بەنی قورەیزە و، زانیوشیەتی نایگەنێ، مەبەستی ئەوە بووە کە زوو بەڕێ بکەون، ئنجا ئەوانەی تەماشای نێوەڕۆکی فەرمانەکەیان کردوە، نوێژەکەیان زوو کردوەو بەڕێکەوتوون، ئەوانی دیکەش تەماشای ڕواڵەتی فەرمانەکەیان کردوەو، نوێژەکەیان نەکردوەو چوون]، تاکو گەیشتنە لای هۆزی بەنی قورەیزە، کە گەیشتنە ئەوێ نوێژی خەوتنانیش بووە، نوێژی عەسر و نوێژی شێوان و خەوتنانیان لەوێ کردوون.

٢٤)- پێغەمبەری خوا ﷺ بیست و پێنج (٢٥) شەو ئابڵووقەی دان، هەتا ئابڵووقەو گەمارۆیەکە ماندووی کردن و، خواش ﷻ ترسی خستە نێو دڵیان و، (**حُيَيّ بْن أَخْطَب النَّضري**) سەرۆکی هۆزی بەنوو نەزیر کە پێشتر لەسەر خیانەت لە شاری مەدینە

دەرکرابوو، وەك بەڵێنیدا بوو بە (كعب بن أسد القرظي) بەڵێنەکەی خۆی بردە سەرو، لەگەڵیدا چووە نێو قەڵایەکە، کاتێك کە قورەیش و (غطفان) گەڕانەوە، وەك وەفادارییەك بۆ ئەو بەڵێن و پەیمانەی خۆی، کە پێشتر پەیمانی پێی دابوو، لەگەڵیدا چووە نێو قەڵایەکە، [هەڵبەتە جوامێریی و وەفاداریی بە پەیمان، لە هەر کەسێکەوە بێ جوانەو، ئەو هەڵوێستەی (حُيَيّ بْن أَخْطَب) هەرچەندە زۆر کینە لە دڵ بووە بەرانبەر بە ئیسلام و مسوڵمانان، بەڵام ئەو هەڵوێستەی جوامێرانە بووە].

٢٥)- کاتێك بەنی قورەیزە دڵنیابوون کە پێغەمبەری خوا ﷺ وازیان لێ ناهێنێ، تاکو لە دژیان نەجەنگێ، (كعب بن أسد) کە سەرۆکی بەنی قورەیزە بوو، گوتی: ئەی کۆمەڵی جوولەکە! ئەوەتان بە ملدا هاتوە کە خۆتان دەیبینن و، من سێ پێشنیارتان دەخەمە بەردەم، هەر کامێکیانتان پێ چاکە هەڵیبژێرن، گوتیان: ئەو سێ پێشنیارە چیین؟ گوتی:

یەکەم: ئەوەیە کە ئێمە بە دوای ئەو پیاوە بکەوین و بەڕاستیی دابنێین، سوێند بە خوا بۆتان دەرکەوتوە کە پێغەمبەرو ڕەوانەکراوە ﷺ و، ئەو کەسەیە کە سیفەتەکانی لە کتێبی خۆتاندا دەبینن، بەو شێوەیە هەم خوێنتان دەپارێزرێ و ماڵ و سامانتان و کوڕەکانتان و ئافرەتەکانتان، جگە لە سەرفرازیی دواڕۆژ، جوولەکەکان گوتیان: هەرگیز ئێمە سەرپێچیی حوکمی تەورات ناکەین و، هەرگیز تەورات بە هیچ کتێبێك ناگۆڕینەوە.

گوتی: ئنجا ئەگەر ڕازی نین بەو پێشنیارە، دووەم: فەرموون با کوڕەکانمان و ئافرەتەکانمان بکوژین و، بچینەدەر بەرەو موحەممەدو هاوەڵانی، پیاوانێك بە شمشێری ڕووتەوە و، هیچ شتێکی قورس بەدوای خۆمانەوە بە جێی ناهێڵین کە پەرۆشمان بێ، نە ماڵ و سامان، نە ماڵ و منداڵ، هەتا خوا حوکم لە نێوان ئێمەو موحەممەددا دەکات، ئەگەر فەوتاین ئەوە دەفەتێین و، هیچ منداڵ و ژن و وەچەمان لە دوای خۆمان بەجێ نەهێشتوون، کە مەترسییمان لێیان هەبێ و، ئەگەر سەریش کەوتین ئەوە بێگومان دەتوانین ژن و منداڵان پەیدابکەینەوە، جوولەکەکان گوتیان: ئەو پاك و بێگوناهانە بکوژین! ئنجا ژیان چ خۆشییەکی

تێدایـە لـە دوای وان، بۆچـی بیانکوژیـن؟ بـێ گوناهـن.

ئنجا (كعب بن أسد) گوتی: ئەگەر بەمەش هەر ڕازی نین،

سێیەم: ئـەم شـەو شـەوی شـەممەیە و، موحەممـەد ﷺو هـاوەڵانی لێمان دڵنیـان لـەم شـەودا، ئنجـا وەرن بـا بڕۆیـن و دابەزیـن، بەڵکـو دەرفـەت لـە موحەممـەدو هـاوەڵانی ببینیـن و گـوێ نەدەینـە شـەممە شـكاندن (جوولەكـەكان لـە شـەوانی شـەممە و ڕۆژانی شـەممەدا هیـچ شـتێكیان نەكـردوە)، گوتیـان: شـەممەی خۆمـان بشـكێنین و شـتێكی تێـدا بكەیـن كـە دەزانیـن ئەوانـەی پێـش ئێمـە كـە شـەممەیان شـكاندوە، چییـان بەسـەرهاتوە!

[كە لە سوورەتی (الأعراف)دا بەسەرهاتەكەیان هاتوە كە خوا ﷻ لەو بارەوە دەفەرموێ:

﴿ وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ لَا تَأۡتِيهِمۡۚ كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٣ وَإِذۡ قَالَتۡ أُمَّةٞ مِّنۡهُمۡ لِمَ تَعِظُونَ قَوۡمًا ٱللَّهُ مُهۡلِكُهُمۡ أَوۡ مُعَذِّبُهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗاۖ قَالُواْ مَعۡذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ١٦٤ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ أَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذۡنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٥ فَلَمَّا عَتَوۡاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنۡهُ قُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ١٦٦ ﴾.

تەفسیری ئایەتی كۆتایی (١٦٦):

واتـە: كاتێـك كـە لـەوەی لێـی قەدەغەكرابـوون، سەركێشـیان كـردو سـەرپێچییان كـرد، پێمانگوتـن: ببنـە مەیمـوونی زەبـوون.

خـوای دادگـەر كـردوونی بـە مەیمـوون، بەڵكـو لـە هەنـدێ ڕیوایەتانـدا هاتـوە: كـە كـراون بـە مەیمـوون و بـەراز، بـە تەمەنەكانیـان بوونـە بـەراز و، كەم تەمەنەكانیشـیان بوونـە مەیمـوون].

ئنجا کە ئەو پێشنیارەشیان ڕەفز کرد، کەعبی کوڕی ئەسەد گوتی: هیچ کامێك لە ئێوە لەوەتی لە دایکی خۆی بووە، حەزم و عەقڵ و تێگەیشتنی نەبووە!

[واتە: هەر کام لەو سێ پێشنیارە کە هیچتانیان قبووڵ نەکردن، ئێوە عاقڵ و تێگەیشتوو نین].

٢٦)- دوایی بەنو قوڕەیزە ناردیانەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتیان: (أبو لُبابة بن عبدالمنذر وأخي بن عمرو بن عوف)مان بۆ بنێرە (بەنی قوڕەیزە کاتی خۆی هاوپەیمانی هۆزی ئەوس بوون، ئەبوو لوبابەش لە هۆزی ئەووس بووە، لەسەردەمی نەفامییداو دۆستایەتیی و پەیوەندیی لەگەڵ بەنی قوڕەیزەدا بەهێز بووە)، گوتیان: ئەبوو لوبابەمان بۆ بنێرە تاکو ڕاوێژی پێ بکەین، لە بارەی حاڵی خۆمانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوو لوبابەی ناردە لایان، کاتێك بینییان پیاوەکان بۆی هەڵسان (وەك پێشوازیی) و، ئافرەت و منداڵیش دەستیان کرد بە گریان لە ڕوویدا، ئەویش بەزەیی پێدا هاتنەوە دڵی پێسووتان، گوتیان: ئەی ئەبوو لوبابە! ئایا ڕات وایە ئێمە بە پێی ڕای موحەممەد ﷺ ڕازیبین، ئەو چ بڕیارێکمان لە بارەوە دەدات؟ (واتە: عەقڵت دەیبڕێ کە موحەممەد ﷺ دەڵێ: لە قەڵاکان وەرنە خوارەوەو تەسلیم بن، دوای ئەوەی کە لە جەنگدا شکستیان خواردوە، ئایا بێینە خوار بەبێ مەرج تەسلیم بین؟).

ئەبوو لوبابەش گوتی: بەڵێ، بەڵام ئاماژەی کرد بۆ گەردنی، [یانی: هەمووتان دەکوژرێن سەر دەبڕدرێن! کە ئەو هەڵوێستەی ئەبوو لوبابە ﷺ هەڵە بووە، ئەوەی کە بە ئیجتیهادی خۆی هەڵیهێنجاوە، یاخود لە پێغەمبەری ﷺ بیستوە کە حوکمی بەنی قوڕەیزە کە خیانەتی مەزن (الخيانة العظمى) یان کردووەو لە پشتەوە خەنجەریان لە سوپای ئیسلام و مسوڵمانان داوە و، دەستیان لەگەڵ دوژمنی دەرەکیی دا تێکەڵ کردوە و، پەیمانیان شکاندوە، جگە لەوەش زۆر جنێوو قسەی ناشیرینیان گوتوە، نە دەبووایە ئەبوو لوبابە ئەو نهێنیە بدرکێنێ، بەڵام بە هەرحاڵ مرۆڤە مرۆڤەو، هاوەڵیش بێ دەگونجێ تووشی گوناهو هەڵەبێ]، ئەبوو لوبابە دەڵێ: سوێند بە خوا هەر لە شوێنی خۆم بووم کە زانیم خیانەتم

لـە خـواو پێغەمبەرەکـەی کـرد ﷺ (نهێنییـەکی درکانـدوە کـە نەدەبووایـە بیدرکێنـێ)، دوایـی ئەبـوو لوبابـە ڕۆیشـت و نەهاتـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـات خـۆی بـە کۆڵەکەیـەك لـە کۆڵەکـەکانی مزگەوتـەوە بەسـتەوە و، گوتیـشی: لـە شـوێنی خـۆم ناجووڵێـم، هەتـا خـوا لـەوەی کـە کـردم، تۆبـەم لـێ قبـووڵ نـەکات، (دیـارە هـەر ئـەو کاتی پەشـێمان بۆتـەوە، بـەڵام گوتوویـەتی: ڕووم نیـە بچمـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ تاکـو خـوا تۆبەکـەم لـێ قبـووڵ نـەکات و)، پەیـمانی بـە خواشـدا کـە هەرگیـز نەچێتـە سـەر زەمینـی بـەنی قورەیـزەوە، (هەرگیـز نابـێ لـە شـوێنێك ببیـنرێ کـە ناپاکیـی بەرانبـەر بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ تێداکـردوە).

(إبـن هِشَـام) دەڵـێ: وەك (سـفیان بـن عُيَينـة) گوتوویـەتی: لـە (إسـماعیل بـن أبي خالـد) لـە (عبداللـه بـن أبي قتـادة)ەوە گێڕاویەتـەوە، خـوا لـە بـارەی ئەبـوو لوبابـەوە ئـەو ئایەتـەی نـاردە خـوار: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَـٰنَـٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾الأنفـال.

واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! خیانـەت بـە خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ مەکـەن و، خیانـەت بـە سـپاردەکانتان مەکـەن، لـە حاڵێکـدا کـە دەزانـن، واتـە: دەزانـن خیانـەت چەنـد گوناهێـکی گەورەیـە.

(إبـن إسـحاق) دەڵـێ: کاتێـك کـە پێی وەخـراو پێچـوو هـەر نەهاتـەوەو، پێغەمبەری خـوا ﷺ هەواڵەکـەی پێگەیشـت، فەرمـووی: (إِنَّـهُ لَـوْ جَـاءَنِي لَاسْـتَغْفَرْت لَـهُ فَأَمَّـا إِذْ قَـدْ فَعَـلَ مَـا فَعَـلَ، فَـمَا أَنَـا بِالَّـذِي أُطْلِقُـهُ مِـنْ مَكَانِـهِ حَتَّـى يَتُـوبَ اللَّـهُ عَلَيْـهِ)، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: ئەگـەر هاتبـا بـۆ لای مـن، داوای لێبوردنـم بـۆ لـە خـوا دەکـرد، بـەڵام ئێسـتا کـە ئـەوەی کـردوە، کـە کردوویـەتی، مـن بـەری نـادەم، (واتـە: کـە خـۆی بەسـتۆتەوە بـە کۆڵەکەیەکـەوە) نایکەمـەوە تاکـو خـوا تۆبـەی لـێ قبـووڵ نـەکات.

(إبـن إسـحاق) دەڵـێ: (يَزِيـد بْـن عَبْـدِ اللّـهِ بْـنِ قُسَـيْطٍ) بـۆی باسـکردووم کـە تۆبـە قبووڵکـران لـە ئەبـوو لوبابـە کاتێـك بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاتـە خـوار دەمـەو سـەحەر بـوو [(سـحر) واتـە: پێـش بەرەبەیـان]، لـە حاڵێکـدا کـە پێغەمبـەری خـوا

ﷺ لە ماڵەکەی (أم سلمة) بوو لە ژوورەکەی ئەودا بوو، ئوممو سەلەمە گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ لە کاتی سەحەردا پێدەکەنی، [کەواتە: دیارە پێغەمبەر ﷺ هەندێ جاران بە دەنگیش پێکەنیوە، نەك وەك هەندێك لە مێژوو نووسان دەڵێن: تەنیا زەردەخەنەی هەبووە! بەڵکو پێکەنیوەو دەنگی پێکەنینیشی هاتوە]، ئوممو سەلەمە دەڵێ: گوتم: بەچی پێدەکەنی ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ خوا هەمیشە زەردەخەنە بخاتە سەر ددان و لێوت؟ ئەویش فەرمووی: (تِيبَ عَلَى أَبِي لُبَابَةَ)، واتە: تۆبە لە ئەبوو لوبابە قبووڵکراوە؟[1].

(ئوممو سەلەمە دەڵێ:) گوتم: ئایا هەواڵی پێ بدەم، موژدەی پێ بدەم، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بەڵێ ئەگەر پێت خۆشە هەواڵی پێبدە، ئوممو سەلەمەش لە دەرگای ژوورەکەی دەوەستێ، ئەویش ئەو کاتە بووە بەر لەوەی بخرێنە پشت پەردەوە و، دەڵێ: ئەی ئەبوو لوبابە! موژدەت لێبێ خوا تۆبەی لێ قبووڵ کردووی، ئوممو سەلەمە دەڵێ: خەڵك ڕۆیشتن تاکو بەریبدەن و بیکەنەوە لەو کۆڵەکە، کە خۆی پێوە بەست بۆوە، ئەبوو لوبابە گوتی: نەخێر سوێند بە خوا دەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی خۆی بەرهەڵدام بکات و لەو کۆڵەکە بمکاتەوە، ئنجا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کە چوو بۆ نوێژی بەیانیی، ئەبوو لوبابەی لە کۆڵەکەکەی کردەوەو دەربازی بوو.

(إبن هشام) دەڵێ: ئەبوو لوبابە شەش شەوان بەو کۆڵەکەیەوە بوو، هاوسەرەکەی دەهات هەموو کاتی نوێژەکان لە کۆڵەکەکەی دەکردەوە بۆ نوێژ، دوایی دووبارە خۆی بە کۆڵەکەکەوە دەبەستەوە، ئنجا ئەو ئایەتەش لە بارەی پەشێمان بوونەوەو قبووڵکرانی تۆبەی ئەبوو لوبابەوە، هاتۆتە خوار کە دەفەرموێ: ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٠٢ ﴾التوبة، واتە: هەندێکی دیکەش هەن لە بڕواداران، دانیان بە هەڵەی خۆیاندا هێناوە، کردەوەیەکی باش و یەکی خراپیان تێکەڵکردوە، نیزیکە خوا تۆبەیان لێ قبووڵ بکات، بێگومان خوا لێبووردەی بەبەزەییە.

---

(١) تأريخ الطبري: ج٢، ص١٠٠، عيون الأثر: ج٢، ص١٠٣.

۲۷)- (إبن إسحاق) دەڵێ: دوایی (ثعلبة بن سعية) و (أسيد بن سعية) و (أسد بن عبيد) كە ئەوانە كۆمەڵێك بوون لە (بني هدل) و لە (بنو قريظة) نەبوون و لە (بنو النضير)یش نەبوون، ڕەچەڵەكیان لە سەرووی هی ئەوانەوە بوو، ئەوان كاتێك بەنی قورەیزە ڕازی بوون بە حوكمی پێغەمبەر ﷺ كە خۆیان بەدەستەوە بدەن، لەو شەوەدا مسوڵمان بوون، (واتە: ئەو سێیەیان خۆیان و ماڵ و منداڵیان و، كێی دیكەشیان لەگەڵدا بووە، مسوڵمان بوون).

[دەڵێم: ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ كە كەسانێك لە بەنی قورەیزە مسوڵمان بووبن، ڕزگارو ئازاد بوون و حوكمی كوشتنیان وەك دیلی جەنگ، كە لە جەنگدا بە ناچاریی تەسلیم دەبن، مامەڵەیان لەگەڵدا نەكراوە، بەڵام ئەوانەی كە لەسەر جوولەكایەتیی سوور بووبن و، دوای ئەوەش كە تێكشكابوون لە جەنگدا ئامادە نەبوون بێنە نێو ئیسلامەوە، ئەوانە سزای دیلی جەنگ كە بە ناچاریی تەسلیم دەبێ، بەسەریاندا چەسپێنراوە].

۲۸)- (إبن إسحاق) و (إبن هشام) دەڵێن: دوای ئەوەی كە بە حوكمی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازیبوون، هۆزی ئەوس كە كاتی خۆی هاوپەیمانی (بنو قريظة) بوون، هەروەك چۆن خەزرەجییەكان هاوپەیمانی (بنو النضير) بوون، هۆزی ئەوس هاتن بە كۆمەڵ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەوانە هاوپەیمانی ئێمەن، جیا لە خەزرەجییەكان و، لە ڕابردوودا لەگەڵ هاوپەیمانانی برایانمان (واتە: هاوپەیمانانی برایانیان لە خەزرەجییەكان كە هاوپەیمانەكانیان بەنو نەزیر بوون) ئەوەت كرد كە بۆ خۆت دەزانی (كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڕۆن یەكی باری وڵاخێك بەرن و خانوو جێ و ڕێیەكانتان بەجێبێڵن، چونكە پەیمانتان شكاندوە، واتە: هەمان شتیش لەگەڵ ئەو هاوپەیمانانەی ئێمەدا بكە، كە بەنی قورەیزەن، كە دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش هۆزی بەنی قورەیزە، ئابڵووقەی قەڵاو شوێنەكانی هۆزی (بنو قينقاع)یدا كە هاوپەیمانی خەزرەجییەكان بوون و، ئەوان ڕازیبوون بە حوكمی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش (عبدالله بن أبي بن سلول) داوای بەخشرانی كردن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەوە بە تۆم بەخشین، (بني بنو قينقاع)یش كە هاوپەیمانی خەزرەجییەكان بوون و سەرۆكی خەزرەجییەكان (سعد بن عبادة) بوو،

(عبدالله بن أبي بن سلول)یش کە سەرۆکی موونافیقەکان بووە، هەر لە خەزرەجییەکان بووەو یەکێك بووە لە بڕیار بەدەستانیان]، ئنجا کاتێ هۆزی ئەوس پێغەمبەری خوایان ﷺ لەو بارەوە دواند، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (أَلا تَرْضَوْنَ يا مَعْشَرَ الأَوْسِ! أَنْ يَحْكُمَ فِيهِمْ رَجُلٌ مِنْكُمْ؟ «قَالُوا: بَلَى، قَالَ: فَذَاكَ إِلى سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ)، واتە: ئەی کۆمەڵی ئەوس! (هۆزی ئەوس) ئایا ڕازی نین پیاوێك لە خۆتان لە بارەیانەوە دادوەریی بکات؟ گوتیان: با، ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ، فەرمووی: ئەوە عایدی سەعدی کوڕی موعازە.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێشتر سەعدی کوڕی موعازی لە چادرێکدا کە هی ئافرەتێك بووە لە هۆزی ئەسلەم، دایناببوو، ئەو ئافرەتە پێی دەگوترا: (رُفَيدَة)، کە ئەویش هەر لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺدا بووە، بەڵام چادرەکە هی ئەو ئافرەتە بوو، کە ئەو ئافرەتە عادەتی وابوو بریندارەکانی چارەسەرو تیمار دەکردن و، تەنها لەبەر خوا خۆی تەرخانکرد بوو بۆ خزمەتی برینداران و مسوڵمانانی نەخۆش، پێغەمبەریش ﷺ بە هۆزی ئەوسی فەرموو بوو، بە خزمەکانی سەعد کاتێك تیرەکەی پێکەوتبوو، لە چادرەکەی ڕوفەیدەدا داینێن، تاکو لێم نیزیك بێ بۆ سەردان، ئنجا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوی کردە دادوەر لە بارەی بەنی قورەیزەوە، هۆزی ئەوس هاتنە لای و، سەعدیان بە سواری کەرێك برد، شتێکیان لەسەر ئەو کەرە ڕاخست وەك جل و کورتان لە چەرم بوو، سەعد پیاوێکی بە خۆوەو جوان بوو، دوایی لەگەڵ خۆیان هێنایان بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو، دەیانگوت: (يَا أَبَا عَمْرو) [بە کونیەکەی بانگیان کردوە، وەك ڕێزو حورمەت]، لە بارەی هاوپەیمانەکانتەوە کە لە سەردەمی نەفامییدا هاوپەیمانت بوون، چاکەکار بە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە ئەو شتەی عایدی تۆ کردوە، تاکو چاکەیان لەگەڵدا بکەی! کاتێ ئەوان زۆریان دووبارە کردەوە گوتی: کاتی ئەوە هاتوە کە سەعد لە ڕازیکردنی خوادا، گوێ نەداتە سەر کۆنە کردن و لۆمەی لۆمەکاران! ئنجا هەندێك لەوانەی کە لەگەڵی بوون لە هۆزەکەی، گەڕانەوە بۆ لای داروبەندی (عبد الأشهل) کە دیارە قۆناغێکی هۆزی ئەوس بووە، لەوێ هەواڵی مەرگی بەنی قورەیزەیان بڵاو کردەوە، کە سەعد کە پێغەمبەر ﷺ

کردوویـەتی بـە دادوەر، لەبـەر ئـەوەی کـە هاوپەیـمانی بـەنی قورەیـزە بـوون لـە پێـش ئیسـلام، وا پێدەچـێ بڕیارێـکی خەتەریـان لـە بـارەوە بـدات و، هەواڵـی مەرگـی بـەنی قورەیزەیـان بڵاوکـردەوە، بـەر لـەوەی سـەعد بگاتـە وێ، بـە هـۆی ئـەو وشـەوە کـە لێیـان بیسـت.

٢٩)- کاتێك سەعد گەیشتە لای پێغەمبەرو ﷺ مسوڵمانان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُم**) واتە: هەڵسن بۆ گەورەکەتان، ئنجا کۆچکەران لە قورەیش دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی پشتیوانەکان بووە، پشتیوانەکانیش دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ بە گشتیی مەبەستی بووە، ئیدی ئەوەندەی پێویست بکات، هەڵدەستن کە لە گوێدرێژەکە بیهێننە خوارێ و، پێی دەڵێن: (**يَا أَبَا عَمْرٍو**) پێغەمبەر ﷺ بۆیە ئەو کارەی بە تۆ سپاردوە، تاکو چاکە لەگەڵ هاوپەیمانەکانی ڕابردووتدا بکەی، واتە: کە لە ڕابردوودا هاوپەیمانت بوون، سەعدیش گوتی: پەیمان و بەڵێنی خواتان لەسەربێ، کە من چ بڕیارێك بدەم ئایا هەمان بڕیار جێبەجێ دەکرێ؟ گوتیان: بەڵێ، سەعد، گوتی: هەروەها ئەو بڕیارە کە دەیدەم کەسێك لەم لایەشە دەگرێتەوە، [ئاماژەی کرد بۆ ئەو شوێنەی کە پێغەمبەری ﷺ لێبووە، پێی جوان نەبووە بڵێ ئایا بڕیارەکەی من پێغەمبەریش پێوەی پابەند دەبێ؟! بەڵکو ئاوا ئاماژەی بۆدا، وەك ڕێزلێگرتن]، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، سەعد، گوتی: (**أَنْ تُقْتَلَ الرِّجَالُ وَتُقَسَّمَ الْأَمْوَالُ، وَتُسْبَى الذَّرَارِيُّ وَالنِّسَاء**)، گوتی: من بڕیارم وایە: پیاوەکانیان بکوژرێن و، ماڵ و سامانیان دابەش بکرێ و بکرێتە دەستکەوتی جەنگ و، منداڵ و ئافرەتەکانیشیان بە دیل بگیرێن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**لَقَدْ حَكَمْتَ فِيهِمْ بِحُكْمِ اللهِ مِنْ فَوْقِ سَبْعَةِ أَرْقِعَة**)، بە دڵنیایی تۆ دادوەرییەکەت لە بارەوە کردن حوکمێکت بۆ دان، کە حوکمی خوایە لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە.

٣٠)- دوای ئەوەی سەعدی کوڕی موعاز لەسەر داوای بەنی قورەیزە: کە با یەکێك لە هۆزی ئەوس، کە هاوپەیمانیان بوون لەسەردەمی نەفامییدا، بڕیاریان لە بارەوە بدات، دوای ئەوەی ئەو بڕیارەی بۆ دان، هێندرانە خوار لە قەڵایەکەیان و، پێغەمبەری خوا

ﷺ لە ماڵێکدا لە مەدینە بە ناوی ماڵی (بنت الحارث) کە ئافرەتێك بوو لە (بني النجّار) لە وێدا کۆیکردنەوەو سجنی کردن، دوایی پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ بازاڕی مەدینە، کە ئێستا بازاڕی مەدینەیەو ئەو کاتە شوێنێکی چۆڵ بووە، لەوێ چەند خەندەکێکی لێدان و، دوایی ناردی و لە گەردنیان دان و، لەو خەندەکانەدا نێژراون، کۆمەڵ کۆمەڵ دەچوون، لە نێویاندا دوژمنی خوا (حُيي بن أخطب النضري)یش هەبوو و، هەروەها (كعب بن أسد القرظي) کە ئەوانە سەرۆکی خەڵکەکە بوون، (حُيي) سەرۆکی بەنوو نەزیر بوو، (كعب)یش سەرۆکی بەنوو قورەیزە بوو، ئەو پیاوانەی کوژران، لە نێوان شەشسەد (٦٠٠) تاکو حەوتسەد (٧٠٠) بوون، ئەوانەی زۆر بڵێن، دەڵێن: (٨٠٠) کەس (٩٠٠) کەس بوون، بەڵام ئەوانی دیکە دەڵێن: (٦٠٠ تاکو ٧٠٠) کەس بوون، جوولەکەکان بە (كعب بن أسد)یان گوت: لە کاتێکدا کە دەیانبردن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، کۆمەڵ کۆمەڵ، گوتیان: ئەی کەعب! پێت وایە چیمان لێ دەکات؟ کەعب گوتی: ئایا ئێوە لە هەموو وەختاندا هەر تێناگەن؟! ئەدی تەماشا ناکەن، هەر کەس دەچێت ناگەڕێتەوە و، ئەوەی کە بانگ دەکات، هەر بانگ دەکات و، ئەوەش کە دەچێ ناگەڕێتەوە؟ سوێند بە خوا ئەوە کوشتنە، ئیدی بەو شێوەیە هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لێیان بۆوەو کۆتایی پێهێنان، (حُيي بن أخطب)یش دوژمنی خوا، هێنرا کە پۆشاکێکی فوقاحی لەبەر دابوو، (جۆرە پۆشاکێکی نایاب و ڕازاوە)، بەڵام لە هەموو لایانەوە بە ئەندازەی پەنجان لەتی کرد بوو، بڕیبووی، بۆ ئەوەی کەسێك کە لێی دەستێنێ، یاخود بەرگەکەی لێ دادەڕنێ، لێی بەهرەمەند نەبێ و، پەتێك لەلای ملی گرێدرابوون کاتێك تەماشای پێغەمبەری خوای کرد ﷺ گوتی: (أَمَا وَاللهِ مَا لُمْتُ نَفْسِي فِي عَدَاوَتِك، وَلَكِنَّهُ مَنْ يَخْذُلُ اللهُ، يُخْذَلْ، ثم أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّهُ لَا بَأْسَ بِأَمْرِ اللهِ كِتَابٌ وَقَدَرٌ وَمَلْحَمَةٌ كَتَبَهَا اللهُ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ، ثُمَّ جَلَسَ فَضُرِبَتْ عُنُقُهُ)، واتە: سوێند بە خوا ڕەخنەم لە خۆم نەگرتوە کە دژایەتییم کردووی، بەڵام هەر کەسێ خوا تێی بشکێنێ، تێدەشکێ، دوایی ڕووی لە خەڵکەکە کرد، گوتی: ئەی خەڵکینە! فەرمانی خوا قەیدێناکات، ئەوە تۆمارێکەو نووسراوێکەو جەنگێکە لەسەر (بنو إسرائيل) خوا نووسیبووی، دوایی دانیشت و لە گەردنیان داو کۆتایی پێهات.

(إبن إسحاق) دەڵێ: لە عائیشەوە خوا لێی ڕازیبێ دایکی بڕواداران گوتوویەتی:

لـە ئافرەتەکانیـان، تەنیـا ئافرەتێـك کـوژرا، ئەویـش ئـەوە بـوو کـە بەرداشـێکی، یاخـود دەسـتاڕێکی لـە سـەریێ ڕا هەڵدایـە سـەر (خـلاد بـن سـويد) کـە یەکێـك بـوو لـە هـاوەڵان و کوشـتوویەتی، وەك تۆڵـە تەنیـا ئـەو ئافرەتەیـان لـێ کـوژراوە، ئەگەرنـا ئـەوانی دیکـە هەموویـان بەدیـل گیـراون.

٣١)- (إبن إسحاق) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە لە پیاوەکانیان ئەوانەیان کە باڵغ بوون و پیاون، تەنیا ئەوانەیان بکوژرێن، ئەوەش کە باڵغ نەبوو بێ و منداڵ بوو بێ لە نێرینەکانیان، بە دیل گیراون.

یەکێـك لەوانـە (عطیـة القُرَظِـي) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـانی کـرد هـەر کـەس لـە بـەنی قوڕەیـزە کـە باڵـغ بـووە، [کـە نیشـانەی باڵـغ بـوون ئەوەیـە، مـووی لـە هەندێـك شـوێنی تایبـەت بـوو بـێ، یاخـود دیـار بـێ سـمێل و ڕیشـی هاتبـێ، ئەوانـەی کـە موویـان لێهاتـوە سـەرو ڕیشـیان لێهاتـوە، بـە پیـاو لـە قەڵـەم دراون و حوکمیـان کوشـتن بـووە]، بـەڵام مـن گەنجێـك بـووم تەماشـایان کـردم کـە جـاریێ مـووم لـێ نەهاتـوەو سـمێل و ڕیشـم نەهاتـوون، بۆیـە نەکـوژراوم، دیـارە دواییـش مسـوڵمان بـووە.

٣٢)- کۆچی دوایی سەعدی کوڕی موعاز:

کاتێـك سـەعد تیرەکـەی پێدەکـەوێ دەڵـێ: خوایـە! ئەگـەر جەنگـمان مـاوە لەگەڵ قوڕەیشـدا بمهێڵـە، چونکـە جەنگـم لەگـەڵ قوڕەیشـدا بـە قـەدەر هیـچ کـەسی دیکـە پێخـۆش نیـە، کەسـانێك کـە پێغەمبـەری تۆیـان دەرکـردوە و، دژایەتیـی دینـی تۆیـان کـردوە، ئەگـەر جەنگیشـمان لەگـەڵ قوڕەیشـدا نەمـاوە، بـا ئـەو برینـە ببێتـە کۆتایـی ژیانـم، بـەڵام دڵخۆشیشـم بکـە، ببینـم تۆڵـە لـە بـەنی قوڕەیـزە دەسـێنرێتەوە، لـە ئەنجامـی ئـەو خیانەتـەدا کـە کردوویانـە.

(إبـن إسـحاق) دەڵـێ: دوای ئـەوەی کاری بـەنی قوڕەیـزە تـەواو بـوو، برینەکـەی سـەعد تەقییـەوە (واتـە: دووبـارە خوێنـی لێهاتـەوە) و، بـە شـەهیدیی کۆچـی دوایـی کـرد، (إبـن إسـحاق) بـە سـەنەدی خـۆی دەڵـێ: پێـم گەیشـتوە کـە جیبریـل سـەلامی

خوای لەسەر بێ، کاتێك کە سەعد گیانی دەکێشرێ، دێ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە مێزەرێکی بەستوە لە ئاوریشم و، پێی دەڵێ: ئەی موحەممەد! ﷺ ئەو کەسەی مردووە، کێیە؟ کە دەروازەکانی ئاسمانی بۆ کراونەوە و، عەرشی خوا بۆی لەرزی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێرایی هەڵدەستێ، کە کراسەکەی لە دوای خۆی ڕادەکێشێ، تەماشا دەکات: سەعد کۆچی دوایی کردوە.

دیسان (إبن إسحاق) هێناویەتی کە سەعد پیاوێکی بە خۆوە بووە، بە کەلەش بووە، بەڵام کاتێك جەنازەکەی هەڵدەگرن، سووك دێتە بەر دەستیان، هەندێك لە مونافیقەکان دەڵێن: ئەمە پیاوێکی زۆر بە خۆ وە و دامەزراو بوو، بەڵام بە خوا هیچ جەنازەیەکمان لەوە سووکتر هەڵنەگرتوە! ئنجا ئەوە بە پێغەمبەر ﷺ دەگاتەوە، ئەویش دەفەرموێ: (إِنَّ لَهُ حَمَلَةً غَيْرَكُمْ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ اسْتَبْشَرَتْ الْمَلَائِكَةُ بِرُوحِ سَعْدٍ، وَاهْتَزَّ لَهُ الْعَرْشُ)، واتە: ئەو جەنازەیە، هەڵگرانێکی دیکەی جگە لە ئێوەی هەن، (بۆیە بە دەستی ئێوە سووکە)، بە دڵنیایی فریشتەکان دڵخۆش بوون بە ڕووحی سەعد و، عەرشی خوای پەروەردگار بە هۆی کۆچی دوایی سەعدەوە، هەژا.

[هەژان و لە رزینەوەکە، هەندێ لە زانایان وایان تەفسیرکردوە، کە عەرشیش دڵخۆش بوو بە ڕووحی سەعد کە بەرز دەبێتەوە بۆ لای ئاسمان و، هەندێکیش دەڵێن: مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بووە کە کۆچی دوایی سەعد، کاریگەریی هەبووە لەسەر هەموو گەردوون بە سەروو و خواروویەوە].

٣٣)- (إبن إسحاق) دەڵێ: لە مسوڵمانان شەش کەس شەهید بوون، ئەوانیش لە (بني عبد الأشهل):

١- (سعد بن معاذ).

٢- (أنس بن أوس بن عتيب بن عَمْرو).

٣- (عبدالله بن سهل) سێ کەس.

له (بني جشم بن الخزرج وبن سلمة)یش:

٤- (الطفيل بن النعمان).

٥- (ثعلبة بن غُنيمة).

٦- (كعب بن زيد) تیرێکی نامۆی پێکەوت نەیانزانی لە کوێوەیەو کوشتی.

کەواتە: لە جەنگی خەندەکدا مسوڵمانان شەش شەهیدیان بوون.

٣٤)- کوژراوانی هاوبەش بۆ خوادانەران، لە ڕۆژی خەندەکدا ئەوانیش سێ کەس بوون:

١- لە: (بني عبدالدار بن قصي: منبّه بن عثمان بن عبيد بن سباق بن عبدالدار) ئەوە تیرێکی پێکەوتوەو، دوایی لە مەککە مردووە.

٢- لە: (بني مخزوم: يقظان بن عبدالله بن المغيرة) لەوانیش ئەو کوژراوە.

٣- (إبن هشام) دەڵێ: عەلی کوڕی ئەبووتالیبیش، (عمر بن ود بن عبد ود ابن حسن بن عَمْرٍو)ی کوشتوە، کەواتە: ئەوانیش ئەو سێ کەسەیان لێ کوژراون.

٣٥)- (إبن إسحاق) دەڵێ: لە ڕۆژی بەنی قورەیزەدا لە مسوڵمانان:

١- (خَلَّادُ بْنُ سُوَيْدِ بْنِ ثَعْلَبَةَ بْنِ عَمْرٍو) کوژرا، شەهید بوو، کە دەستاڕێکی بەسەردا بەردرابۆوە و، زۆر بە خراپی تێکی شکاندبو و، پێغەمبەر فەرموویەتی ﷺ پاداشتی دوو شەهیدی هەیە: (إِنَّ لَهُ لَأَجْرَ شَهِيدَيْنِ) .

٢- (وَمَاتَ أَبُو سِنَانِ بْنُ مِحْصَنِ بْنِ حُرْثَانَ) ئەویش بە مردنی خۆی کۆچی دوایی کردوە، لە کاتێکدا کە ئابڵووقەی بەنی قورەیزەیان داوە و، هەر لە گۆڕستانی بەنی قورەیزە کە ئێستا خەڵکی لێ دەنێژرێ، لە وێ بە خاك سپێردراوە.

کاتێـك کـە خەڵـکی خەنـدەك، واتـە: هاوەڵانێـك کـە لـە جەنگـی خەندەکـدا بەشـدار بـوون، دەگەڕێنـەوە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: (لَـنْ تَغْزُوَكُـمْ قُرَيْـشٌ بَعْـدَ عَامِكُـمْ هَـذَا، وَلَكِنَّكُـمْ تَغْزُونَهُـم)، لـە مـەودوا قورەیـش ناتوانـن پەلامـاری ئێـوە

بدەن و، هێرش بۆ سەر ئێوە بێنن، بەڵکو ئێوە لە مەودوا هێرش بۆ سەر ئەوان دەبەن و پەلاماریان دەدەن، [بە کردەوەش هەروا بوو، هەتا جەنگی ئازادکردنی مەککە، هیچ جەنگ روویان نەدا، دوایی مەککە ئازاد کراو لە دەسەڵاتی شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانەران پاککرایەوەو بوو بە شارێکی ئیسلام تێدا بەرپاکراو].

## مەسەلە گرنگەکان

مەسەلەی یەکەم: چاکەی خۆ بیرخستنەوەی خوا ﷻ بۆ بڕواداران کە دوای ئابلۆوقە درانیان لەلایەن ئەحزابەوە، بایەکی بەهێزو فریشتەکانی ناردوون و، هەرچەندە مسوڵمانان لەو پەڕی تەنگانەدا بوون و، زۆر توند ڕاتەکێنراون، بەڵام خوا لە فریایان هاتوەو، دەربازی کردوون:

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ۝٩ إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ۝١٠ هُنَالِكَ ٱبۡتُلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَزُلۡزِلُواْ زِلۡزَالٗا شَدِيدٗا ۝١١ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەم سوورەتە موبارەکەدا خوا ﷻ شەش جاران، ئەو ڕستەیەی دووبارە کردۆتەوە، کە ئەمە جاری یەکەمیانە، لەو شەش جارەی کە لە سوورەتی (الأحزاب)دا، خوا ﷻ بانگی بڕواداران دەکات، بە نازناوی ئیمان، یانی: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێبهێنن، بڕوا هێنان بە خوا ﷻ، بە فریشتەکانی خوا، بە کتێبەکانی خوا، بە پێغەمبەرانی خوا، بە ڕۆژی دوایی و، بە هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێداون لە خواوە.

٢)- ﴿ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ ﴾، چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە یاد بکەنەوە، واتە: چاکەکردنی خوا لەسەر خۆتانی یاد بکەنەوە، بیهێننەوە بیر خۆتان، لە بیرتان بێ، ئایا ڕووی دواندن تەنیا لە هاوەڵانی پێغەمبەرە ﷺ؟ پێموایە نەخێر، ئەگەرنا خوا دەیتوانی بفەرموێ: (يا صحابة رَسُولِ الله)، یان: (يا أيها الصَّحَابَة)، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، لە هەموو قورئاندا ئەو تەعبیرە زۆر دووبارە بۆتەوە، بۆ ئەوەیە کە ئێمەش ئێستا ئەو چاکەیەی خوا کە ئەو کاتە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بڕواداری دا کردوویەتی، لەگەڵ ئێمەش دایە و، لەگەڵ مسوڵمانانی پێش ئێمەشدایە و، لەگەڵ

مسوڵمانانی دوای ئێمەشە، کەواتە: ئەی بڕوادارینە! یادی چاکەو چاکەکردنی خوا بەسەر خۆتانەوە بکەنەوە، چ بە نسبەت هاوەڵانەوە خوا لێیان ڕازیبێ، کە یەکەمین جیلی بڕواداران بوون، چ بە نسبەت جیلەکانی دوایشیان، ئایا ئەو چاکەیە، چی بوو؟.

٣)- ﴿ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ ﴾، کاتێ کە سەربازانێك بۆتان هاتن، ئەمە زەمینە خۆشکردنە بۆ فەرمایشتی خوا کە دوایی دێ، کە شوێنی چاکەکاریی و منەتی خوایە.

ئنجا ئەو سوپایەی بۆ مسوڵمانان هاتن، سێ هێزی سەرەکیی بوون:

أ- قوڕەیش و هاوپەیمانەکانیان لە (أحَابيش).

ب- (غَطَفَان) و هاوپەیمانەکانیان.

ج- هۆزی بەنی قوڕەیزە کە پەیمانیان شکاند بوو، بەڵێنیان هەڵوەشاند بۆوەو لە پشتەوەڕا ویستیان خەنجەری غەدر لە مسوڵمانان بدەن.

٤)- ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ﴾، ئێمەش یەکسەر بایەك و سەربازانێك کە ئێوە نەتان دەبینین، ناردمانە سەریان.

وشەی (ریح) لە قوڕئاندا بە زۆریی بۆ سزادان بەکارهاتوە، کە زانایان گوتوویانە: (رِيحُ الصَّبَا، وَكَانَتْ بَارِدَةً وَقَلَعَتِ الأَوْتَادَ وَالأَطْنَابَ)، بای (صەبا) بوو زۆر سارد بوو گوڵمیخ و پەتەکانی چادرەکانی هەڵکەندن، بای صەبا وەك خاوەنی (مفردات ألفاظ القرآن)[1]، دەڵێ: (الصَّبَا: الرِّيحُ المسْتَقبلَة للقبلَة)، ئەو بایەی کە بەرەو ڕووگە (قیبلە) دێ، دیارە با لە هەر شوێن و دەڤەرێك ناوێکی هەیە، بۆ وێنە: لە پشدەر جۆرێك بای توندو وشك، پێی دەگوترێ: بای ژوورو، لە سلێمانیی پێی دەگوترێ: ڕەشە با، بەڵام بایەك کە لە خوارووەوە دێ، پێی دەگوترێ: شەماڵ، لەبەر ئەوەی فێنکەو بەسەر دەریادا دێ، بە نسبەت هەندێك شوێنەوە لەوانەیە پێی بگوترێ: بای ڕۆژهەڵات، لە هەندێ شوێن پێی دەڵێن: بای ڕۆژئاوا، لە هەندێ شوێن: باکوورە، یان باشوورە، یان بای قیبلەیە.

---

(١) ص ٤٦٥.

ئنجا ئەو بای صەبایە زۆر بەهێزو سارد بووە، سینگ و گوڵمیخی چادرەکانی کە پێیانیانەوە بەستبوونەوەو، پەتەکانیشیان کە لە سنگەکانیان خستبوون، هەموویان هەڵقەندن، واتە: بایەکی بە هێزی ماڵ کاولکەر بووە، هەروەها سەربازانێك کە نەتاندەبینین، (جنود) پێی دەگوترێ: کۆی کۆ (جمع الجمع)، چونکە (جنود) کۆی (جُند)ە، (جُند)یش کۆی (جندي)ە، واتە: سەرباز.

٥)- ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ﴾، خواش بینەری ئەوە بوو کە دەتانکرد، واتە: حاڵ و باڵی سەختی ئێوەی دەبینی، بۆیەش خوا بای نارده سەر دوژمنەکانتان، هەروەها فریشتەشی ناردن بۆ سەر دوژمنەکانتان، کە ترسیان بخەنە دڵ و، دڵی ئێوەش بە هێز بکەن.

٦)- ﴿ إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ ﴾، (ئەمە بە نسبەت شاری مەدینەوە)، واتە: لەسەرووتانەوە هاتن و، لە خواروو‌شتانەوە هاتن.

٧)- ﴿ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾، یاد بکەنەوە کاتێك کە چاوەکان ئەبڵەق بوون و کەوتوونە جووڵە جووڵ، (الزَّيْغُ: المَيْل عَنِ الإسْتِوَاءِ وَالإِنْحِرَاف)، (زیغ) ئەوەیە کە چاو هەر جارە بەلایەکدا بسوورێ، چاوتان دەسووڕان.

٨)- ﴿ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ ﴾، دڵەکانیش گەیشتنە گەروان، (الحَنْجرة: مُنْتَهَى الحُلْقُوم)، واتە: کۆتایی قوڕگ پێی دەگوترێ: (حُنْجُرَةَ) واتە: قورقوڕاگە.

٩)- ﴿ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴾، گومانی جۆراو جۆرتان بە خوا دەبردن، (ظنون) کۆی (ظن)ە، (أل) بۆ ناساندنی تێکڕا (التعريف للجنس)ە، چەندان جۆرە گومانتان بە خوا دەبردن، وشەی (ظُنُونَا) بە ئەلیفیش خوێنراوەتەوە: (وتظنون بالله الظنونا) هەورەها بە سەر (فتحة)یش خوێندراوەتەوە: (وتظنون بالله الظنونَ).

ئایا گومانەکانیان چۆن بوون؟:

أ- هەبووە گومانی وابووە کە خوا لە فریایان دێ و، یارمەتییان دەدات و پشتیان دەگرێ.

ب- هەبووە گومانی وابووە، کە نەخێر خوا بە گورگان خواردوویان دەدات و لێیان ناپێچێتەوە.

ج- هەشبووە ڕەنگە لەو نێوانەدا بوو بێ.

١٠)- ﴿ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾، لەو کات و لەو شوێنەدا، بڕواداران جەڕبێنران، (هُنَالِكَ) هەم ناوی شوێنە، هەم ناوی کاتە، (هُنَالِكَ) لەو کاتەدا، یان لەو شوێنەدا، ئەسڵی خۆی (هُنَالِكَ) بۆ شوێنە، بەڵام جاری وا هەیە ناوی شوێن و کات، لە جیاتی یەکدی بەکاردێن، لەو کات و لەو شوێنەدا بڕواداران تاقیکرانەوە.

١١)- ﴿ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴾، زۆر بە سەختیی تێکەوە ڕاشەقێنران و ڕاتەکێنران.

ئەوەی لێرەدا پێویستە باسی بکەم، ئەوەیە: خوا خاتری هیچ کەس ناگرێ، لە کاتی ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکاندا، لێرەدا خوا واقیعی مسوڵمانان و بڕواداران و هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ چۆن بووە، ئاوا دەیخاتەڕوو، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن، ئەوانەیان کە بێهێزبوون و، یان بێهێزییان دەربڕیوە، جارێکی دیکە پەند وەربگرن و، بێهێزنەبن لە بەرانبەر سەختیی و نارەحەتییەکاندا، وەك لە سوورەتی (آل عمران)دا، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ﴿١٥٢﴾ ﴾، واتە: هەتانبوو دنیای دەویست و، هەتانبوون ڕۆژی دوایی دەویست، یەکێ لە هاوەڵان، دەڵێ: هەتا ئەو کاتە نەمدەزانی کە تێماندا هەیە، مەبەستی زیاتر دنیایە، واتە: دەستکەوتی جەنگیی، هاندەرە سەرەکییەکەی ئەوە بوو کە هاتوە بۆ جەنگی ئوحود، ئەوانەش حیسابیان لە کۆی سوپایەکە تێکدا، کە بە تەماعی کۆکردنەوەی دەستکەوت و غەنیمەتەوە، هاتبوون، فەرمانی پێغەمبەریان شکاندو ﷺ، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی دوژمن، ئەو شوێنەی ئەوان بگرێتەوە و، سەرەنجام جەنگی ئوحود بدۆڕێنن.

هەروەها لە سوورەتی (الأنفال)دا کە خوا ﷻ لە بارەی مسوڵمانانەوە، کە بەرەو گرتنی کاروانەکەی (أبو سوفیان) دەچن، دەفەرموێ: ﴿ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ ﴿٧﴾ ﴾، ئێوەش دەتانویست ئەوەی دڕکی پێوە نیە بۆ ئێوە بێ، واتە: حەزتان نەدەکرد کە لەگەڵ سوپایەکەی (أبو جهل) دا، ڕووبەڕوو بنەوە، کە هەزار (١٠٠٠)کەس بوو، حەزتان دەکرد کاروانەکە بگرن، کە نێچیرێکی تووك نەرم و، پاروویەکی ئاسان بوو، خوا لە ڕوونکردنەوەی

ڕاستییەکاندا خاتری کەس ناگرێ، هەروەها یەکێك لە کافرەکان چاکەیەکی هەبێ، باسی دەکات و، بڕوادارانیش ئەگەر خاڵێکی بێهێزیان هەبێ و کەم و کوڕییەکیان هەبێ، دەیخاتە ڕوو.

مەسەلەی دووەم:

باسی هەڵوێستی بەزیوانەو ترسنۆکانەی موونافیق و دڵنەخۆشەکان و خۆدزینەوەیان بە پاساوی پووچ و درۆ و، بڵاوکردنەوەی ترس و لەرزو، فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە سەرزەنشت و سەرکۆنەیان بکات:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ لَءَاتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَٰرَ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴿١٥﴾ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆزدە (١٩) بڕگەدا:**

١)- ﴿وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا﴾، یاد بکەوە! کاتێك مونافیقەکان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە دەیانگوت: خواو پێغەمبەرەکەی بەس بەڵێنی فریودەریان پێداوین.

(المُنَافِقُون: الكَامِلُونَ فِي النِّفَاق)، ئەوانەی کە مونافیقی تەواو عیار بوون، واتە: ئەوانەی لە دڵدا کافر بوون، بەڵام بە ڕواڵەت خۆیان بە مسوڵمان پێشان دەدەن، ئەویش لە چییەوە هاتووە؟ لە (نفق) و (نافقاء)ەوە هاتووە، (نافقاء)یش کونی جرجەو دوو سەری هەن، لێرەوە تینی بۆ هات لەوێوە دەرەچێ، مونافیقیش دوو ڕووی هەن، لە لای مسوڵمانان بە ڕوویەك خۆی پێشاندەداو، کە دەگەڕێتەوە لای ئەهلی کوفریش بە ڕوویەکی دیکە: ﴿وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾﴾البقرة، واتە: کاتێك بە بڕوادارن دەگەن، دەڵێن: ئێمە بڕواداریـن و بڕوامان هێناوە، کاتێك دەچنەوە بۆ لای سەرکردەکانیان و شەیتانەکانیان دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەین، ئێمە تەنیا گاڵتە کەرین (بە مسوڵمانان).

﴿ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾، ئەوانـەی دڵیـان نەخۆشـیی تێـدا هەیـە، لێـرەدا وشـەی (مـرض) نەخۆشـیی بـە مانـای گومـان و دوو دڵییـە، کەواتـە: (وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ) واتـە: (المـتَرَدِّدُونَ بَيْنَ الإِسْلَامِ وَالكُفْـر)، ئەوانـەی کـە لـە نێـوان ئیسـلام و کوفـردا، هـەر لـە لەرەلـەر و لەقەلـەق دابـوون، نـە مسـوڵمانێکی بـە هـەق بـوون، نـە کافرێـکی موتڵـەق بـوون، بەڵکـو دڵنەخۆشـێکی بـە لەقـە لـەق بـوون، ئەوانـە چییـان دەگـوت؟

﴿ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴾، دەیانگـوت: خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ تەنیـا بەڵێنـی فریودەریـان بـە ئێمـە داوە، (الغُـرورُ: ظُهُـورُ الشَّيءِ المَكْرُوهِ فِي صُورَةِ المحْبُوب)، (غـرور) بریتیـە لـەوە کـە شـتێکی ناخۆشویسـتراو ناپەسـندو خـراپ، لـە شـێوەیەکی جوانـدا بێتـە بەرچـاو، کـە ئـەوە فریودانـە، بـۆ وێنـە: کەسـێك شـتێك بـۆ کەسـێك دەبـات، ڕواڵەتەکـەی زۆر جوانـە، بـەڵام نێوەڕۆکەکـەی وێرانـە، دەڵـێ: فڵانکـەس فریـوی دام، واتـە: شـتێکی کـە بـە ڕواڵـەت جـوان بـوو، بـەڵام بـە نێـوەڕۆك وێـران بـوو، بـۆ منـی هێنـا، یاخـود شـتێك کـە لـە حەقیقەتـدا بـاش نەبـوو، بـە شـێوەیەکی جـوان خسـتیە بەرچـاوم، ئەوانیـش دەیانگـوت: خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ تەنیـا بەڵێنـی فریـودەرو زرق و بـرق و بریقەداریـان بـە ئێمـەداوە.

٢)- ﴿ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ ﴾، یاد بکەوە! کاتێك کە کۆمەڵێك لەوان گوتیان: ئەی خەڵکی یەثریب مانەوە یان: شوێنی مانەوە بۆ ئێوە نیە.

ئنجا لـە هەنـدێ لـە تەفسیرەکاندا نـاوی هەنـدێ لـە کەسـەکان دێنـن، هەندێـك گوتوویانـە: (أوس بـن قيظـي) بـووەو، هەنـدێ گوتوویـان: (عبداللـه بـن أبي بـن سـلول) بـووە، کـە ڕەنگـە ئەوانـەش بووبـن و، هـی دیکـەش بـوو بـن، بـەس خـوا بـۆ خـۆی دەزانـێ کـێ و کـێ و چەنـد کـەس بوونـە، بـەڵام خـوا دەفەرمـوێ: کۆمەڵێکیـان گوتیـان.

﴿ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ ﴾: (یـثرب) نـاوی شـاری مەدینـە بـوو بـەر لـەوەی پێغەمبـەر ﷺ بچـێ، دوای چـوونی پێغەمبـەر ﷺ نـاوی لێنراوە: (المدينـة)، یـان (مدينـة

الرسـول)، یـان (المدینـة المنـورة)، دەیانگـوت: ئـەی خەڵـکی یەثریـب! مانەوەتان بـۆ نیە، (مُقَـام) خوێنراویشـەتەوە: (مَقـام)، (لا مَقـام لکـم)، مانـەوە، یاخـود شـوێنی مانـەوە بـۆ ئێـوە نیـە لێـرە (مَقـام) نـاوی شـوێنە، واتـە: (مـکان القیـام)، کەواتـە: (مُقـام و مَقـام) واتاکەیـان لێـك نیزیکـە، (مُقـام) هـەم بـە مانـای وەسـتان دێ، هـەم بـە مانـای شـوێنی وەسـتان دێ، بـەڵام (مَقـام) واتـە: شـوێنی لـێ ڕاوەسـتان، واتـە: شـوێنێك نیـە ئێـوە لێـی بمێننـەوە.

٣)- ﴿ فَٱرۡجِعُواْ ﴾، بگەڕێنەوە، بۆ کوێ؟ یانی: بۆ ماڵەکانتان، واتە: مەیدان چۆڵبکەن، ئێرە شوێنی شەڕ کردن نیە، ئەم جەنگە جەنگێك نیە، کە ئومێدێکتان هەبێ ببیەنەوە.

٤)- ﴿ وَيَسۡتَـٔۡذِنُ فَرِيقٞ مِّنۡهُمُ ٱلنَّبِيَّ ﴾، کۆمەڵێکیشیان مۆڵەتیان لە پێغەمبەر ﷺ وەردەگرت، ئەمانەش کۆمەڵێکی دیکەن، کۆمەڵێکیان هەر خەریکی بڵاوکردنەوەی ترس و لەرز و پڕوپاگەندە بوون، وایاندەکرد کە مسوڵمان بڵاوەی لێ بکەن و بچنەوە ماڵی خۆیان، کۆمەڵێکیشیان مۆڵەتیان لە پێغەمبەر ﷺ وەردەگرت:

٥)- ﴿ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوۡرَةٞ ﴾، دەیانگوت: ماڵەکانی ئێمە بۆشن، (العَوْرَةُ: الشَّقُّ فِي الثَّوْبِ أو البَاب، الثُّغْرَةُ: الخَلَل)، (عَوْرَة) هەم بە مانای درزو کەلێنێك دێ، کە لە دەرگادا بێ، لە دیواردا بێ، لە بەرگ و پۆشاکێکدا بێ، هەروەها بە مانای کەلێنێك دێ و، بە مانای بۆشایی دێ، واتە: ماڵەکانی ئێمە بۆشایین، هیچ شتێکمان بە دەورەوە نیە، یاخود بە ئاسانیی زەفەر بە ماڵەکانمان دەبردرێ.

خواش دەفەرموێ:

٦)- ﴿ وَمَا هِيَ بِعَوۡرَةٍ ﴾، لە حاڵێك دا ماڵەکانیان بۆش نەبوون، چۆڵ نەبوون، ماڵەکانیان ئەوەنەبوو کە بە ئاسانیی زەفەریان پێبردرێ، چونکە لەو کاتەدا شاری مەدینە مەحکەم کرابوو، هێزێکی فیداکاری جەنگاوەری زۆر مەرد دەیپاراست، پاشان خەندەکیش لێدرابوو لەو شوێنانەدا کە دوژمن بتوانێ بە پێڕۆ بۆیان بێ، یان بە سواری وڵاخ، شوێنەکانی دیکەش دیوارو قەڵاو بورجیان لێبوون و تێیان دا ئێشکە گیراوە، بۆیە خوا دەفەرموێ:

ماڵەکانیان بۆش نەبوون و، کەلێنی تێدانەبوو دوژمن بە ئاسانیی زەفەریان پێببات.

٧)- ﴿إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا﴾: تەنیا مەبەستیان ڕاکردن بوو، (مَا يُرِيدُونَ إلاَّ الهُرُوب) تەنیا مەبەستیان ڕاکردن و هەڵاتن بوو لە دوژمن.

٨)- ﴿وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا الْفِتْنَةَ﴾، ئەگەر دوژمن لە لایەکانی شار(ی مەدینە) لێیان وە ژوورکەوتبایە، ئنجا داوای فیتنەیان لێکرابایە، (الأَقْطَارُ: جَمْعُ قُطْر، الجَانِب وَالنَّاحِية)، لا، تەنیشت، یانی: لە هەرلایەکی مەدینەوە، دوژمن لێیان وە ژوورکەوتبایە.

﴿ثُمَّ سُئِلُوا الْفِتْنَةَ﴾، (فِتْنَة) دەگونجێ بە مانای شیرك بێ، واتە: داوایان لێکرابایە موشریك بن، یان هەڵبگەڕێنەوە، یاخود داوایان لێکرابایە: فێڵ و پیلان لە دژی مسوڵمانان بکەن، ئەگەر ئاوایان لێ داواکردبایە.

٩)- ﴿لَآتَوْهَا﴾، ئەوەی داوایان لێکرابایە دەیاندا، دەیانبەخشیی، خوێنراویشەتەوە: (لأَتَوْهَا) ئەوەی داوایان لێکرابایە، بۆی دەچوون و، سەریان پێوە نەبوو.

١٠)- ﴿وَمَا تَلَبَّثُوا بِهَا إِلَّا يَسِيرًا﴾، کەمێکیش نەبا لە جێبەجێکردنی ئەم داواکارییەدا (کە چوونە، یاخود: پێدانی ئەوەیە کە لێیان داوا دەکرێ)، نەیاندەوەخراند، (لَبِثَ: أَي اسْتَقَرَّ، أَي: مَا أَبْطَأوا بِهَا)، کەمێك نەبێ نەیاندەوەخراند، زوو ئەو داواکارییەیان جێبەجێ دەکرد.

کە ئەمەش جۆرێکە لە گاڵتەپێکردنیان.

١١)- ﴿وَلَقَدْ كَانُوا عَاهَدُوا اللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ الْأَدْبَارَ﴾، ئەوانە پێشتر بەڵێن و پەیمانیان بە خوا دابوو کە پشت هەڵناکەن، ڕاناکەن و هەڵنایەن.

﴿لَا يُوَلُّونَ الْأَدْبَارَ﴾، (الأَدْبَار: الظُهُور) واتە: پشتیان ناکەنە دوژمن، (التَّولِية: التَّوَجُّه بالشَّيء)، واتە: پشتیان ڕوو پێناکەنە دوژمن، کاتێ ئینسان پشتی خۆی ڕووپێدەکاتە دوژمن، مانای وایە ڕایکردوە، بەڵام ئەگەر سینگی خۆی بداتە

دوژمـن، مانـای وایـە لەگەڵـی ڕووبەڕووبۆتـەوە.

١٢)- ﴿ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴾، بەڵێنی خواش لێی دەپرسرێتەوە، واتە: هەر بەڵێنێك کە مرۆڤ لەگەڵ خوادا دەیدات، لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێ و، لێی دەپێچرێتەوە.

١٣)- ﴿ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ ﴾، (خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:) بڵێ: ڕاکردن سوودتان پێ ناگەیەنێ.

١٤)- ﴿ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ ﴾، ئەگەر لە مردن، یاخود لە کوشتن ڕابکەن، واتە: ئەگەر بەو دەردەش نەمرن و دوژمنیش نەیانکوژێ، بە دەردێکی دیکە دەمرن، ئەگەر بەوەش نەمرن کە ئێستا چاوەڕێی دەکەن، بە شتێکی دیکە دەمرن، سەرەنجام خەڵك هەمووی دەبێ مردن بچێژێ.

١٥)- ﴿ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، (ئنجا ئەگەر ڕاش بکەن لە دوژمن و پشتیش بکەنە دوژمن و، شوێنی مەترسییداریش بە حیسابی خۆتان بە جێبێڵن:) دیسان کەمێك نەبێ بەهرەمەند ناکرێن، واتە: لە دوای ڕاکردن ماوەیەکی کەم دەژین، چونکە ژیانی دنیا هەرچۆنێ بێ کەمە.

١٦)- ﴿ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، بڵێ: کێیە ئەو کەسەی لە خوا دەتانپارێزێ؟! (العِصْمَةُ: الوِقَايَةُ وَالمَنْعُ مِمَّا يَكْرَهُهُ المَعْصُومُ)، (عِصْمَة) بریتیە لە خۆپاراستن و بەرگریی لە خۆکردن لە شتێك، کە ئەو کەسەی دەپارێزرێ، ڕقی لێیەتی، بڵێ: کێ لە بەڵای خوا دەتانپارێزێ؟،

١٧)- ﴿ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا ﴾، ئەگەر (خوا) بیەوێ خراپەتان تووش بکات، (السُّوءُ: مَا يسوءُ الإِنْسَانَ ويتضررُ بِهِ)، (سُوء): هەر شتێکە کە بۆ مرۆڤ خراپ بێ و، بۆی مایەی زیان بێ.

١٨)- ﴿ أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ﴾: یان ئەگەر خوا بیەوێ بەزەییتان لەگەڵدا بنوێنێ، کێ دەتوانێ نەهێڵێ ئەو بەزەییەی خوا بۆ ئێوە بێ؟ واتە: ئەگەر خوا بیەوێ زیانتان لێ

بدات، هیچ کەس ئەو زیانەتان لێ دوور ناخاتەوە، هەروەها ئەگەر خواش بیەوێ: بەزەیی لەگەڵ ئێوەدا بنوێنێ و، چاکەیەکتان لەگەڵدا بکات، هیچ کەس ناتوانێ پەرچ و کۆسپ بخاتە بەردەم بەزەیی و چاکەی خواوە.

١٩)- ﴿ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾، ئەوان جگە لە خوا هیچ سەرپەرشتیارێك و پشتیوانێکیان وەچنگ ناکەوێ.

﴿ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾: (وَلِيّ: مَنْ يَتَوَلَّى غَيْرَه)، ئەوەی جگە لە خۆی سەرپەرشتیی دەکات، بەڵام (نَصِير: مَنْ يَنْصُرُ غَيْرَه)، ئەو کەسەی جگە لە خۆی پشتیوانیی دەکات، دیارە سەرپەرشتییکردن زۆر بەهێزترە لە پشتیوانییکردن، پشتیوانییکردن جارێك، لە هەڵوێستێکدا پشتیوانیی دەکات، بەڵام سەرپەرشتییکردن ئەوەیە کە بەردەوام سەرپەرشتیەتی و مشوورخۆریەتی و چاودێریەتی.

مەسەلەی سێیەم:

باسی کەسانێکی پروپاگەندە چیی، خەڵك ترسێنەری چرووك و ترسنۆك و زماندرێژ، کە دوای بڵاوبوون و ڕۆیشتنی حیزب و سوپا گەمارۆدەرەکانی مەدینەش، بڕوایان نەدەکرد ڕۆیشتبن و، خۆزگەشیان دەخواست لە بیابان بوونایەو، بەس لە

دوورەوە هەواڵی مسوڵمانانیان زانیبایە:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا
يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ
أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً
عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾ يَحْسَبُونَ
ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ
عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ ﴾، بە دڵنیایی خوا ئەوانە لە ئێوە دەزانێ کە خەڵك گێرەرەوەن، (عَاقَهُ عَنْ كَذَا: مَنَعَهُ وَثَبَّطَهُ عَنْه، وَالتَّضْعِيفُ لِلْشِدَّةِ مثل: قَطَّعَ الحَبْلَ، وَغَلَّقَتِ الأَبْوَاب)، (عَاقَهُ عَنْ كَذَا) واتە: گێڕایەوە لەوە، دوای خست، بەڵام کە دەفەرموێ: (مُعَوِّقِين، عَوَّق، يُعَوِّق، فهو مُعَوِّق)، کە گیرە (شدّة)ی خراوەتە سەر بۆ سەختیی کارەکەیە، وەك: (قَطَعَ الحَبْلَ) پەتەکەی پچڕیی، بەڵام (قَطَّعَ الحَبْلَ) واتە: زۆر بە قوەت پچڕیی، یان بڕ بڕی کرد، یان (غَلَقَتِ الأَبْوَابَ) دەرگاکانی داخستن، بەڵام (غَلَّقَتِ الأَبْوَابَ) واتە: زۆر بە مەحکەمی دایخستن، یان: دەرگای زۆری داخستن، کەواتە: (ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ) واتە: ئەوانەی زۆر بە سەختیی خەڵکی پەك دەخەن و، خەڵکی لە جەنگ دەگێڕنەوەو سارد دەکەنەوە.

٢)- ﴿ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ﴾، بێژەران بە برایەکانیان: وەرن بۆ لای ئێمە، (هَلُمَّ: إِسْمُ فِعْلِ أَمْرٍ: أَقبلْ لِلْوَاحِدِ والمُثَنَّى وَالجَمْعِ وَالمُذَكَّر وَالمُؤَنَّث)، واتە: وەرن بۆ لای ئێمە، ئەمە ناوی کار (إسم فعل)ە، بەڵام بۆ فەرمانە، کە بۆ تاك و دووان و کۆو، بۆ نێر و مێ بەکاردێ.

٣)- ﴿ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، کەمێکیش نەبێ ناچنە جەنگ، (البَأْسَ: الحَرْب)،

جەنگ، واتە: بایی ئەوەندە کە لۆمە لە خۆیان دووربخەنەوە، یاخود تۆمەتبار نەکرێن بە ترسنۆکیی، هەر بایی ئەوەندەو بایی شەرمێ رووان دەچن.

٤)- ﴿ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ﴾، (أشِحَّة جَمْعُ شَحِيح، والشُّحُّ: البُخْلُ بِمَا فِي الوِسْعِ مِمَّا يَنْفَعُ الغَيْر)، (شُحّ) بریتیە لەوەی شتێك كە لە تواناتدا هەیە، چرووكیی و ڕژدیی بنوێنێ، شتێك كە سوود بە بەرامبەرەكەت دەگەیەنێ، ئامادە نەبی بەكاری بێنی و خەرجی بكەی، (أشحة عليكم) لەسەر ئێوە زۆر چرووكن، یانی هیچ جۆرە سوودێكتان پێناگەیەنن، نە ماددیی و نە مەعنەویی، هەر خێرو چاكەیەك بۆ ئێوە سودبەخش بێ و بە دەست ئەوان بێ، دەستی لێدەگرنەوە.

٥)- ﴿ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ ﴾، كاتێ ترس هات، هاتن مەجازێكی زانراوە بۆ پەیدابوون و ڕوودانی شتێك، دەگوترێ: (جَاءَ العَدوّ)، یان (جَاءَ الخَوْفُ)، یان (جَاءَ الخَطَرُ)، مەبەست لە ترس لێرەدا، مەترسیی هاتن و پەیدابوونی جەنگە، ئەگەر جەنگ بقەومێ.

٦)- ﴿ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ ﴾، دەیانبینی، تەماشایان دەكردی، چاویان دەسووڕان، وشەی (دور، دوران) بریتیە لە شتێك كە وەك دەستاڕ بسووڕێ، یان وەك بەرداش، ئەمیش بۆ وێناكردنی حاڵەتی تەماشاكردنەكەیانە، تەماشاكردنێكی ترسنۆكانەی پڕ ترس و لەرز، كە بابای زۆر ترساوو خەجڵاو بە هەردوو چاوەكانی تەماشای ئەملاولا دەكات، مەترسیی هەیە داخۆ لە كوێوە ترسەكەی بۆ دێ، لە كوێوە ئەوەی كە هۆكاری مەترسیەتی، بۆی دێ؟ بۆیە چاو بە هەموو لایاندا دەگێڕێ.

٧)- ﴿ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ﴾، وەك كەسێك كە لە كاتی مردندا، بێهۆشیی بەسەردا دێ و، چاوی ئەبڵەق دەبن و دێن و دەچن.

٨)- ﴿ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ ﴾، ئنجا كاتێك ترس ڕەویەوەو ڕۆیشت.

٩)- ﴿ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ ﴾، بە زمانە تیژەكانی خۆیان لێتان دەدەن، (سَلَقُوكُم: أي عَضُوكُمْ بألسِنَةٍ ذَربة)، واتە: بە زمانی بڕندەكانیان لێتان دەدەن، قسەتان پێدەڵێن، توانج و

پلارتان تێدەگرن، (السَّلْقُ: قُوَّةُ الصَّوْتِ وَالصِّيَاحِ، سلقوكم: طَعَنُوكُم، وَحِدَادُ: جَمْعُ حَدِيد: كُلُّ شيءٍ نافذٍ)، (سَلَقُوكُم: ضَرَبُوكم) واتە: بەهێز لێتان دەدەن، زمانەکانیان، وەك نشتەرو تیرن لێتان دەدەن، زمانەکانیانی تەشبیهـ کردوون بە تیغە بڕندەکانە وەو، قسەی پێگوتنەکەی چواندوون بە لێدانەوە، (حداد) کۆی (حدید)ە، (حدید) هەر شتێکە کە لە شتێك بچێتە دەرێ و بیبڕێ، واتە: زمانەکانیان لە ئێوە وەگەڕدەخەن.

١٠)- ﴿ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ﴾: ئەوانە چرووکن بەرانبەر بە هەر چاکەیەك، واتە: هیچ چاکەیەکتان پێناگەیەنن، نە چاکەی ماددیی نە مەعنەویی.

١١)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُواْ ﴾، ئا ئەوان بڕوایان نەهێناوە، هەر لە بنەڕەتدا بڕوایان نەهێناوە، یاخود لەو هەڵوێستەیاندا بڕوایان نەهێناوەو بڕوادارنەبوون، بۆیە:

١٢)- ﴿ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، خوا کردەوەکانیانی هەڵوەشاندوونەوە، (الإِحْبَاطُ: جَعْلُ الشَّيءِ حَابطاً، والحَبطُ: فَسَادٌ مَا يُرَاد بِهِ الصَّلاَحُ وَالنَّفْعُ، أَحْبَطَهُ: أَبْطَلَهُ)، (إِحْبَاط) ئەوەیە شتێك (حَابط) بکەی، (حابط)یش واتە: شتێکی کەوتوو، (حَبْط) بریتیە لەوەی شتێك مەبەست پێی چاکەو سوود گەیاندن بێ، تێك بچێ، کەواتە: (أَحْبَطَهُ: أي أَبْطَلَهُ)، (حَبط) بریتیە لە ئاژەڵ لەوەڕ بخوات، بەڵام هێندە بخوات کە دوایی سکی پێی بچێ و تەندروستی پێی تێك بچێ.

١٣)- ﴿ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴾، ئەوەش لە لای خوا ئاسانە، واتە: ئەوە کە خوا کردەوەکانیان هەڵبوەشێنێتەوە، لە لای خوا ﷻ ئاسانە، بەڵێ کردەوە چاکەکان لە لای خوا تۆمار دەکرێن، بەڵام کاتێ مرۆڤ ئەو ئیمان و عەقیدەیەی کە دەبێ پاڵی پێوەبنێ بۆ کردەوەی چاك، نایمێنێ، وەك ئەوە وایە دیوارێك بناغەکەی لە بن دەربێنی، بێگومان دەڕووخێ.

١٤)- ﴿ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُواْ ﴾، پێیان وایە حیزبەکان نەڕۆیشتوون، واتە: وادەزانن حیزبە گەمارۆدەرەکانی شاری مەدینە، نەڕۆیشتوون، ترس وا چووەتە نێو دڵیانەوە، بڕواناکەن، ئەو حیزبانەی گەمارۆی شاری مەدینەیان دابوو، ئەو هێزانەی ئەهلی کوفر ڕۆیشتووشن، بەڵام بڕواناکەن ڕۆیین.

١٥)- ﴿ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ ﴾، ئەگەر حیزبەکان لە داهاتووش دا بێن، جارێکی دیکە ئەو هێزانە کۆببنەوەو بێن.

١٦)- ﴿ يَوَدُّواْ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِي ٱلْأَعْرَابِ ﴾، ئەوانە خۆزگە دەخوازن لە بیابان بوونایە لە لای عەرەبە خێڵە دەشتەکییەکان، (البَادِي: سَاكِن البَادِيَة)، (بادي) ئەو کەسەی لە (بادية) یە، بیابانشینە، یان لە دەشت و چۆڵایی، نیشتە جێیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ سَوَآءً ٱلْعَـٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِ ﴾ الحج، واتە: لە حەرەمی مەککەدا، ئەو کەسەی نیشتەجێیە، لەوێداو، ئەو کەسەش کە لە دەرەوە هاتوە، لە بیابانەوە هاتوە، هەردووکیان تێیدا یەکسانن و، وەك یەك مافیان پێوەی هەیە.

کە دەفەرموێ: ﴿ فِي ٱلْأَعْرَابِ ﴾، (الأَعْرَابُ: سُكّان البَوادِي)، دانیشتووانی بیابان، یاخود دەوارنشین، کە دەفەرموێ: (يودّوا لو أنهم) ئەمە مانای خۆزگە خواستن دەگەیەنێ، هەرکاتێ (لو) لە دوای (ودّ، يودّوا) یان وێنەی ئەوانەوە، هات، مانای خۆزگە خواستن و بریا دەگەیەنێ.

١٧)- ﴿ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ﴾، خۆزگە دەخوازن: ئەگەر جارێکی دیکە حیزبە گەمارۆدەرەکان بێنەوە، لە بیابان بن، لە نێو عەرەبە خێڵەکییەکاندا، لەوێوە لە بارەی هەواڵەکەتانەوە بپرسن، ئنجا مەبەستیشیان لە هەواڵ پرسین دوو ئامانج بووە:

١- بۆ ئەوەی بزانن داخۆ بەڵایەکیان بەسەرهاتوە، تاکو دڵخۆش بن.

٢- بۆ ئەوەی سیخوڕییان بەسەرەوە بکەن.

واتە: هەواڵ پرسینەکەشیان بۆ دوو ئامانجی خراپ بووە:

أ- بۆ ئەوەی دڵخۆش بن بەو بەڵایەی کە بەسەریان هاتوە.

ب- بۆ ئەوەی سیخوڕییان بەسەرەوە بکەن، عەوڕەت و کەلێنەکەیان بخەنە بەرچاوی دوژمن، دوژمنیش زیاتر بتوانێ زەفەریان پێ بەرێ.

کە دەفەرموێ: (عن أنبائكم) (أنباء) کۆی (نبأ)ە، (نبأ) بریتییە لە هەواڵێك کە

گرنگ بێ و، سوود بەخش بێ، بەلای کەمەوەش ئەگەر یەقینی لەسەر نەبێ، گومانی زاڵی لەسەربێ.

١٨)- ﴿ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم ﴾، ئنجا ئەگەر ئەو دڵنەخۆشانە لە نێویشتاندا بوونایە.

١٩)- ﴿ مَّا قَٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، کەمێك نەبا، جەنگیان نەدەکرد، واتە: کەمێك نەبا، شانی خۆیان نەدەدایە بەر ئەو جەنگە، جەنگکردنەکەشیان هیچ سوودی نەبوو، تەنیا ڕیابازیی بوو، تاکو بە ترسنۆك تۆمەتبار نەکرێن.

پێشەوا (الطبري) لە شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکانەدا دەڵێ: (**هَـؤُلَاءِ نَاسٌ مِنَ الْمُنَافِقِينَ كَانُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمْ: مَا مُحَمَّدٌ وَأَصْحَابُهُ إِلَّا أَكَلَةُ رَأْسٍ، وَلَوْ كَانُوا لَحْمًا لَالْتَهَمَهُمْ أَبُو سُفْيَانَ وَأَصْحَابُهُ، دَعُوا هَـذَا الرَّجُلَ فَإِنَّهُ هَالِكٌ**)[1].

واتە: ئەوانە کۆمەڵێك لە مونافیقەکان بوون، خەڵکیان دەترساندو بە برایەکانی خۆیانیان دەگوت: (وەرن بۆ لای ئێمە و، خۆتان بە فەوتان مەدەن، سەری خۆتان بە فەتارەت مەدەن)، موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی تەنیا بایی ئەوەندەن سەری ئاژەڵێك بخۆن، (بۆیان لێبنرێ و بیخۆن، وەك لە کوردەواریی دا دەڵێین: بە مەنجەڵە یاپراخێك تێر دەخۆن)، ئەوانە ئەگەر گۆشت بوونایە، ئەبوو سوفیان و هاوەڵەکانی هەڵیاندەلووشین، لێی گەڕێن لەو پیاوە، با بۆ خۆی بفەوتێ، (ئەو دەفەوتێ، ئێوەش لەگەڵ ویدا سەری خۆتان بە فەتارەت مەدەن).

هەر لەو بارەوە (الطبري) بە سەنەدێکی ڕاست، هێناویەتی و، (السيوطي) لە (الدر المنثور)داو، (إبن أبي حاتم)یش، هێناویانە، ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوەو[2] دەڵێ:

(**قَالَ ابْنُ زَيْدٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ﴾الأحزاب: ١٨، إِلَى آخِرِ الآيَةِ، قَالَ: هَـذَا يَوْمُ الْأَحْزَابِ، انْصَرَفَ رَجُلٌ مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَوَجَدَ أَخَاهُ بَيْنَ يَدَيْهِ شِوَاءٌ وَرَغِيفٌ وَنَبِيذٌ، فَقَالَ لَهُ: أَنْتَ هَهُنَا فِي الشِّوَاءِ وَالرَّغِيفِ وَالنَّبِيذِ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ الرِّمَاحِ وَالسُّيُوفِ؟ فَقَالَ: هَلُمَّ إِلَى هَـذَا،**

---

(١) جامع البيان: ج٢١، ص١٧٣، رقم: ٢٨٤٢١.

(٢) جامع البيان: ج٢١، ص١٧٤، رقم: ٢٨٤٣٢.

**فَقَـدْ بَلَـغَ بِـكَ وَبِصَاحِبِـكَ، وَالَّـذِي يُحْلَـفُ بِـهِ، لَا يَسْـتَقْبِلُهَا مُحَمَّـدٌ أَبَـدًا، فَقَـالَ: كَذَبْـتَ وَالَّـذِي يُحْلَـفُ بِـهِ، قَـالَ، وَكَانَ أَخَـاهُ مِـنْ أَبِيـهِ وَأُمِّـهِ، أَمَـا وَاللـهِ لَأُخْبِرَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ أَمْـرَكَ، قَـالَ: وَذَهَـبَ إِلَى رَسُـولِ اللـهِ ﷺ لِيُخْبِرَهُ؛ قَـالَ: فَوَجَـدَهُ قَـدْ نَـزَلَ جِبْرَائِيـلُ عَلَيْـهِ السَّـلَامُ بِخَـبَرِهِ).**

واتـە: ئیبنـو زەیـد گوتوویـەتی: لـە ڕۆژی ئەحزابـدا بـوو، ئـەم ئایەتـە (هاتـە خـوار): ﴿ قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَالْقَائِلِينَ لِإِخْوَانِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ﴾، پیاوێـك لـەلای پێغەمبـەری خـواوە ﷺ گەڕایـەوە بـەرەو مـاڵ، برایەکـەی بینـی لەبەر دەسـتی گۆشـتی بـرژا و، نانی تـازە لـە تەنـدوور دەرهێـنراوو خۆشـاو، (شـەربەتی مێـوژ) بـرا بڕوادارەکـەی بـەوەی دیکـەی گـوت: تـۆ لێـرە لـە نێـو گۆشـتی بـرژاو و نـانی تـازەو خۆشـاودا [(نبیـذ) هـەم بـە جۆرێـك لـە شـەڕابیان گوتـوەو، هـەم بـە جۆرێـك لـە شـەربەت و خۆشـاویان گوتـوە]، پێغەمبـەری خـواش لـە نێـو ڕم و شمشـێراندا!! بـرا دڵنەخۆشـەکەی پێـی گـوت: وەرە بـۆ ئێـرە تـازە خـۆت و هاوەڵەکـەت حیسـابتان ڕۆیشـتوە، سـوێند بـەو کەسـەی کـە سـوێندی پـێ دەخـورێ، تـازە موحەممـەد هەرگیـز هیـچ داهاتوویـەکی نیـە، (واتـە: لێـی دەربازنابـێ)، بـرا بڕوادارەکـەش گـوتی: درۆ دەکـەی، سـوێند بـەو کەسـەی کـە سـوێندی پـێ دەخـورێ (کـە بـرای دایـك و باوکیـشی بـوو)، سـوێند بـە خوا ئـەم هەڵوێسـتەی تـۆ بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕادەگەیەنـم، چـوو بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەواڵەکـەی پێبـدات، کـە چـوو تەماشـای کـرد جیبریـل هاتۆتـە خـوار و ئـەو هەواڵـەی پێداوە، خـوا ئـەم ئایەتـەی لـەو بـارەوە ناردۆتـە خـوار: ﴿ قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَالْقَائِلِينَ لِإِخْوَانِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا وَلَا يَأْتُونَ الْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ ﴾.

## مەسەلەی چوارەم:

**سەرمەشـقی هـەرە چـاك بـوونی پێغەمبەری خـوا ﷺ بۆ بـڕواداران و، ستایشـکردنی مسـوڵمانان لەلایـەن خـواوە، لەسـەر خۆڕاگریـی و فیداکارییـان و، نەلەخشـانیان لـە بەرانبـەر حیزبـەکانی کوفـرداو، مەدحکـردنی پیاوانێـکی فیـداکاری بـڕوادار، کـە**

**پەیمانیـان لەگـەڵ خـوادا ڕاسـت بردۆتـە سـەر و، سـەرەنجامیش پاداشـتدانەوەی ڕاسـتان و، سـزادانی دەغـەڵان، ئەگـەر نەگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ قَالُوا هَٰذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ لِّيَجْزِيَ اللَّهُ الصَّادِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ إِن شَاءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾، سوێند بە خوا، بە دڵنیایی لە پێغەمبەری خوادا ﷺ بۆ ئێوە سەر مەشقییەکی هەرە باش هەیە، وشەی (**أُسوَةٌ**) خوێنراویشەتەوە: (**إِسوة**)، (**إسوة وأُسوة**) ناون بۆ هەر کەسێك کە چاوی لێ بکرێ و بکرێتە سەرمەشق بۆ کارێك کە ئەو کردوویەتی، کە دەفەرمویٚ: (**فِي رَسُولِ الله**) لە پێغەمبەری خوادا ﷺ واتە: خودی پێغەمبەری خوا ﷺ نەك یەکێك لە سیفەتەکانی، بۆ وێنە بفەرموێ: (**لقد كان لكم فِي شجاعة رسول الله، فِي علمه، أو فِي تقواه**)، بێگومان لە ئازایەتیی پێغەمبەری خوادا، لە زانیارییەکەی دا، لە پارێزکارییەکەی دا، بەڵکو لە خودی پێغەمبەری خوادا ﷺ، بۆ ئەوەی هەموو سیفەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بگرێتەوە، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووی بووناسیی تەواوو دروستەوە، لە ڕووی ئیمان و عەقیدەی ڕاست و ساغەوە، لە ڕووی خواپەرستیی چاك و پاکەوە، لە ڕووی ڕەوشتی بەرزو جوانەوە، لە ڕووی هەڵسوکەوتی ڕەندو پەسندەوە، لە ڕووی فیداکاریی و ئازایەتییەوە، لە ڕووی سەخاوەتەوە، لە ڕووی ڕەحم و بەزەییەوە، لە ڕووی دادگەریی و ئینسافەوە، لە هەموو ڕوویەکەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێوە سەرمەشقە، بەڵام بۆ کێ؟

٢)- ﴿لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ﴾، بۆ هەر کەسێك بە ئومێدی (بەزەیی) خواو (پاداشتی) ڕۆژی دوایی بێ.

٣)- ﴿وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا﴾، زۆریش یادی خوا بکات، عادەتیشی وابێ زۆر یادی خوا بکات.

ئەمە جۆرێکە لە توانج و پلارتێگرتنی مونافیقەکان، کە ئەوان، نە بە تەمای بەزەیی خوابوون، نە بە تەمای پاداشتی ڕۆژی دوایی بوون، نە زۆریشیان یادی خوا کردوە، واتە: ئەی ئەوانەی بە تەمای پاداشتی خواو، ڕۆژی دواییـن و زۆر یادی خوای دەکەن! پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێوە باشترین سەرمەشقە.

شایانی باسە: شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ و بەسەر مەشقگرتنی، تەنیا یەك حاڵەتی نیە، بەڵکو لەو شتانەدا کە فەڕزن، یان بەبێ وان مرۆڤ نابێتە مسوڵمان، بەسەر مەشقگرتنی پێغەمبەر ﷺ فەڕزەو مەرجی مسوڵمانێتییە، بۆ وێنە: دەبێ ئیمانمان وەك ئیمانی پێغەمبەر ﷺ بێ، بەنداتیەتییمان بۆ خوا، وەك هی ئەو بێ، یانی: لەو شتانەدا کە پێویستن، بەسەر مەشقگرتنی پێغەمبەر ﷺ پێویستە و، لەو شتانەدا کە پەسندن، بەسەر مەشقگرتنی پەسندنەو، لەو شتانەش دا کە ڕەوان، بەسەر مەشقگرتنی ڕەوایە، واتە: بە پێشڕەو گرتنی پێغەمبەر، تەنیا یەك حوکمی نیە، بەڵکو چاو لە پێغەمبەر ﷺ کردن و، کردنی بەسەر مەشق، حوکمەکەی دەگۆڕێ لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێك و، لە کارێکەوە بۆ کارێك.

٤)- ﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ﴾، کاتێك بڕواداران حیزبەکانیان بینی، ئەو کۆمەڵانەیان بینی، واتە: قوڕەیش و هاوپەیمانەکانی و (غطفان) و هاوپەیمانەکانی، هەروەها بەنوو قوڕەیزە.

٥)- ﴿قَالُوا۟ هَـٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾: گوتیان: ئەمە ئەوەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بەڵێنیان پێداوین، ئنجا ئایا مەبەست لەوە چییە؟

لە سوورەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ

﴿ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾﴾.

دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە سوورەتی (البقرة)دا، کە پێش سوورەتی (الأحزاب) دابەزیوە، لە ساڵی یەکەم و دووەم و سێیەمی کۆچییدا، واتە: ئەمە ئەوەیە کە خوا بەڵێنی پێداوین، کە دەفەرموێ: ئایا پێتان وایە بچنە بەهەشتێ، بەر لەوەی ئەوەتان بەسەربێ کە تووشی ئەوانی پێش ئێوە هاتوە، کە هەژاریی و نەداریی و نەخۆشیی و ناخۆشییان تووشبوو و تێکەوە ڕاشەقێنران - لە ئەنجامی هەڕەشەو گورەشەو شەڕ پێ فرۆشتنی دوژمندا - هەتا ڕاددەیەك کە پێغەمبەر و ﷺ ئەوانەی بڕوایان لەگەڵ هێناوە گوتوویانە: یارمەتیی خوا کەنگێیە؟ ئاگاداربن! یارمەتیی خواو سەرخستنی خوا نیزیکە.

کەواتە: ئەوە بەڵێنی خوایە، کە هەر کاتێ مسوڵمانان دەکەونە نێو تەنگانەو نارەحەتیی، خوا لە فریایان دێ، گوتیان: ئەمە ئەوەبوو کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بەڵێنیان پێداوین، چونکە (وعد) هەواڵپێدانی هەواڵپێدەرە بە هەواڵپێدراو، کە کارێکی بۆ دەکات.

٦)- ﴿وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ﴾، (گوتیان:) خواو پێغەمبەرەکەشی ﷺ ڕاستیان کردوە، واتە: ئەو بەڵێنەی داویانە، کە کاتێك مسوڵمانان زۆر نارەحەت دەبن و، داوای یارمەتیی لە خوا دەکەن، خوا لە فریایان دێ، ڕاستیانکرد.

٧)- ﴿وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَـٰنًا وَتَسْلِيمًا﴾، دیتنی ئەو کۆمەڵە تابڵووقەدەرانەی ئابڵووقەی مەدینەیان داوە، هەر ئیمان و زیاتر ملکەچ بوونی بۆ خوا، تێدا زیاد کردن، وەك چۆن تیغی ڕەسەن هەتا شتی پێ ببڕی، زیاتر بڕندە دەبێ و سپی و ساف دەبێ، بە پێچەوانەی تیغی نارەسەنەوە، کە شتێکی پێ ببڕی، نووکەکەی دەپاچێتەوە، بەڵام ئینسانی ئیماندار تیغی ڕەسەنە، هەتا زیاتر لەگەڵ سەختییەکاندا ڕووبەڕوو بێتەوە، زیاتر قاییم و تۆکمەو مەحکەم دەبێ، وەك گوتراوە: (الشَّدائد صَيْقَلُ الرِّجَال)، سەختییەکان تیف تیفە دەری پیاوانن، سافیان دەکەن و خلتەو خاڵی ترسنۆکیی و دنیا ویستییان، پێوە ناهێڵن.

کەواتـە: ئـەوەی بینییـان، کـە بینینـی حیزبـەکان بـوو، لـە دەوری مەدینـە بـوون و گەمارۆیـان دابـوون، هـەر ئیـمانی تێـدا زیادکـردن و، ملکەچیـی بـۆ خـوا تێدا زیـاد کردن، ئەمـەش بەڵگەیـەکی یەکلاییکەرەوەیـە لـەو بـارەوە، کـە ئیـمان بـە کـردەوەی چـاك زیـاد دەکات، هـەروەك بـە گوناهـو تاوانـان کـەم دەکات، وەك پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: **(لاَ يَـزْنِي الـزَّانِي حِـينَ يَـزْنِي وَهُـوَ مُؤْمِـنٌ، وَلا يَـشْرَبُ الْخَمْـرَ حِـينَ يَشْرَبُهَـا وَهُـوَ مُؤْمِـنٌ، وَلا يَـسْرِقُ السَّـارِقُ حِـينَ يَـسْرِقُ وَهُـوَ مُؤْمِـنٌ) (أخرجـه أحمـد: ٨١٨٧، والبخـاري: ٢٣٤٣، ومسـلم: ٥٧، والنسـائي: ٤٨٧٠، وابـن ماجـه: ٣٩٣٦)** واتـە: کەسـێك کـە زینـا دەکات و، کەسـێك کـە شـەڕاب دەخواتـەوەو، کەسـێك کـە دزیـی دەکات، لـە کاتی گوناهەکەیـدا ئیمانـدار نیـە، یـانی: ئـەو ئیمانـە تـەواوەی لـەلا نیـە، بیگێڕێتـەوە لـەو گوناهانـە، کەواتـە: بـە هـۆی گوناهـان ئیـمان کـەم دەکات و، بەهـۆی طاعەتیشـەوە، ئیـمان زیـاد دەکات.

٨)- ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ﴾، لە نێو بڕواداراندا پیاوانێك هەن.

٩)- ﴿صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيْهِ﴾، ئەو بەڵێنەی بە خوایانداوە، ڕاستیانکردوە لەو بەڵێنەدا، ئەو پەیمانەی کە بە خوایانداوە، پەیمانەکەیان هێناوەتە دی.

وشـەی (صـدق) لێـرەدا وەك (صَدَقَـهُ الخَـبَرَ)، بـە تێپەڕکـەر (متعـدّي) بەکارهاتـوە، چونکـە دەتوانیـن بڵێیـن: (صَـدَقَ مُحَمَّـد) موحەممـەد ﷺ ڕاسـتییکرد، ئـەوە کـرداری لازیمـەو پێویسـتیی بـە بـەرکار (مفعـول بـه) نیە، بـەڵام (صَدَقَـهُ الخَـبَرَ) لـە هەواڵەکەدا ڕاسـتیکرد لەگەڵیـدا، (صـدق) تێپەڕکـەر (متعـدّي)ە، (صَدَقُـوا مـا عاهـدوا اللـه عليـه) ئـەو پەیمانـەی لەگـەڵ خـوادا بەسـتبوویان، لـە پەیمانەکەیانـدا ڕاسـتیان کـرد، وەك عـەرەب دەڵێـن: (صَديقُـكَ مَـنْ صَدَقَـكَ، لاَ مَـنْ صَدَّقَـكَ)، بـرادەرت ئەوەیـە ڕاسـتت لەگـەڵ بـکات، نـەك هـەر بڵـێ ڕاسـت دەکـەی.

١٠)- ﴿فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ﴾، ئنجا (کە لە پەیمانەکەیان ڕاستیانکردوە)، هەیانە نەزرەکەی خۆی، بەڵێنەکەی خۆی تەواو کردوە بردوویەتە سەر.

١١)- ﴿وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ﴾، هەشیانە چاوەڕێ دەکات، ئنجا هەندێ گوتوویانە: (نحبه

أي: نَذْرَه)، بەڵام هەندێکیان گوتوویانە: (نحبه: عهده) بەڵێن و پەیمانەکەی، (نحْب) واتە: بەڵێن و پەیمان، لە فەرمایشتدا هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: [طَلْحَةُ مِمَّنْ قَضَى نَحْبَهُ] (أخرجه الترمذي برقم٣٧٤٠، قَالَ أَبُو عِيسَى هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وابن ماجه: ١٢٧، والطبراني في الكبير برقم ٧٣٩)، واتە: طەلحە لەوانەیە کە نەزری خۆی هێناوەتە دی، بەڵێن و پەیمانی خۆی بردۆتە سەر.

١٢)- ﴿ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا ﴾، هیچ گۆڕانکارییان نەکردوە لەو بەڵێن و پەیمانەدا، کە دەفەرموێ: هەیانە نەزرەکەی تەواو کردوەو، هەشیانە چاوەڕێ دەکات، هەندێ ناوایان لێکداوەتەوە: هەیانە شەهید بووە و ڕۆیشتوەو، هەشیانە چاوەڕێی شەهیدیی دەکات و، هیچ گۆڕانکارییان نەکردوە، [تبديلاً: مفعولٌ مطلق مُؤَكِّد لـ(بدَّلوا)]، هیچ جۆرە گۆڕانکارییان لەو بەڵێن و پەیمانەدا نەکردوە.

١٣)- ﴿ لِّيَجۡزِيَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدۡقِهِمۡ ﴾، بۆ ئەوەی خوا بە هۆی ڕاستییانەوە پاداشتی ڕاستان بداتەوە، (ل) بۆ (تعليل)ە، واتە: (أَمَرَ اللهُ بالجهَاد لِيَجْزِيَ الصَّادِقِينَ فِي الأَخِرَة بِصِدقِهِم)[1]، واتە: خوا فەرمانی کردوە بە جیهادو جەنگ و فیداکاریی، تاکو لە دواڕۆژدا پاداشتی ڕاستان بە هۆی ڕاستییەکەیانەوە بداتەوە.

دەشگونجێ بڵێین، واتە: بڕواداران لە پەیمانی خۆیاندا ڕاستیانکردوە، بەڵام مونافیق و دەغەڵەکان بەڵێنەکەیان گۆڕیوە، تاکو خوا پاداشتی ڕاستان بە هۆی ڕاستییانەوە بدات و، سزای مونافیقەکانیش بدات.

١٤)- ﴿ وَيُعَذِّبَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ ﴾، هەروەها مونافیقەکانیش سزا بدات، ئەگەر بیەوێ، یاخود بگەڕێتەوە سەریان و تۆبەیان لێوەربگرێ، (تاب عليه) واتە: (رجع إليه)، ئەوان تۆبە بکەن و، خواش بگەڕێتەوە بۆ لایان و تۆبەکەیان لێ قبووڵ بکات، کە دیارە تۆبە لە نیفاق، ئەوەیە کە ئینسان ئیمانەکەی بۆ خوا ساغ بکاتەوە.

١٥)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە، کەواتە:

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ص١٣٠، ١٣١.

لێبوردن و بەزەیی نواندن، دوو سیفەتی زاتی خوای پەروەردگارن، لەگەڵ زاتیدان و بێ سەرەتان، هەروەك بێ كۆتاییشن.

## مەسەلەی پێنجەم:

گێڕانـەوەی خـوا و ﷺ بەرپەرچدانـەوەی بـۆ بێبڕوایـان بـە ڕق و تووڕەیـی و

**پەستییانەوە، بێ ئەوەی هیچ دەستکەوتێکیان ببێ و، جەنگ لە کۆڵ بڕواداران کرانەوە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُواْ خَيْرًاۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيْظِهِمْ﴾، خوا ﷻ ئەوانەی بێبڕوا بوون بە پەستیی و تووڕەییانەوە، بەرپەرچی دانەوە، **(الرَّدُّ: الإرْجَاعُ إلى المكَانِ الَّذِي صَدَرَ مِنْهُ)**، واتە: **(رد)** بریتیە لە گێڕانەوەی شتێك بۆ ئەو شوێنەی كە لێوەی هاتوە، **(الغَيْظُ: أَشَدُّ الغَضَبِ وَالحَنَقُ)**، **(غَيْظ)** بریتیە لە تووڕەییەكی زۆر و، ڕق و كینەیەكی زۆر، داخ لە دڵیی، كە دەفەرموێ: **(بغيظهم: أي رَدَّهم مُغَيَّظِين)**، خوا ئەوانی بەرپەرچدایەوە لە حاڵێكدا كە زۆر پەست و تووڕەو دڵ پڕ لە ڕق بوون.

٢)- ﴿لَمْ يَنَالُواْ خَيْرًا﴾، دەستیان نەگەیشتە هیچ چاكەیەك و، هیچ ئامانجێكیان بۆ دەستەبەر نەبوو، لەو ئامانجانەی بۆیان هاتبوون، **(أي: لَمْ يُحَصِّلوا شَيْئَاً خَيْرَاً لَهُم)**، واتە: هیچ شتێك كە بۆ ئەوان چاك بێ، وەدەستیان نەهێنا.

٣)- ﴿وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ﴾، خواش جەنگی لە كۆڵ بڕوادارن كردەوە، ئەویش بەو شێوەیە كە ئەوانەی هاتبوون گەمارۆی مەدینەیان دابوو، گەلەكۆمەكییان لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان دەكرد، بە هۆی ترس خرانە نێو دڵیان، لە ڕێی فریشتەكانەوەو، بە هۆی ئەو بایە توندو بەهێزەوە كە ناردبوویە سەریان، بڵاوەیان پێكرد و، ئاڵقەی گەمارۆیەكە شكاو، هەر كەسە چۆوە شوێنی خۆی، **(كَفَى: أَغْنَى أي: أَرَاحَهُم مِنْ كُلفَةِ القِتَالِ بأَنْ صَرَفَ الأَحْزَاب)**، واتە: خوا ئەركی جەنگكردنی لە كۆڵكردنەوە، كە حیزبەكانی لاداو بە ڕێی كردن.

مانگێـك یـان كەمـتر ئابڵووقـەی شـاری مەدینەیانـدا، بـەڵام جەنگـی بـە كـردەوە دەسـتی پێنەكـرد، ئەگەرنـا لـە هـەردوو لایان كـوژراو و برینـداری زۆر دەبوون، وشـەی

(كَفَى: يتعدّي إلى مفعولين)، دیارە (کفی) تەعەددا دەکات بۆ دوو بەرکاران، دوو بەرکاران دەخوازێ: ﴿وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ﴾، (ألله) بکەر (فاعِل)ی، (کفی) یە، ئنجا (المؤمنين) بەرکاری یەکەمیەتی و، (القتال) بەرکاری دووەمیەتی.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە خوا ئەرکی جەنگکردنی لە کۆڵ بڕواداران کردەوە، بە هۆی ئەوەوە کە نەیهێشت جەنگەکە ڕووبدات.

٤)- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا﴾، خوا هەمیشە و بەردەوام بەهێزی باڵادەست بووە، واتە: ئەو دوو سیفەتە لە خوای پەروەردگاردا بێ سەرەتان، لە ئەزەلەوە هەر سیفەتی بوون و، خوا بەردەوام بەهێزی زاڵ و باڵادەست بووە.

**مەسەلەی شەشەم:**

**لە قەڵایەکانیان هێنانە خواری، خاوەن کتێبە پشتیوانەکانی حیزبە کافرە**

**گەمارۆدەرەکانی مەدینەو، ترس خستنە نێو دڵیان و، سەرەنجام کوژرانی هەندێکیان و، بەدیلگیرانی هەندێکیان و، بە میراتگیرانی سەرزەمین و خانوو سامانیان و ژن و منداڵیان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا ﴿٢٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ ﴾، ئەوانەی کە پشتیوانییان لێکردن، لە خاوەن کتێبەکان لە قەڵایەکانیان هێنانیە خوار.

(**ظَاهِرُوهُم: أي نَاصَرُوهُم**)، (**الَّذِين**) بە سیاق دەزانرێ کە مەبەست پێی هۆزی بەنو قورەیزەیە لە جوولەکەکان، کە سەرۆکی ئەو هۆزە (**كعب بن أسد**) بوو، بەڵام (**حُيَي بن أخطب**)یش، چووە پاڵی و پەیمانی پێدا کە ئەگەر شتێك بوو لەگەڵت دێمە نێو قەڵاکە و، لەگەڵی چووە نێو قەڵایەکەی و، لەگەڵیاندا سەری بە فەتارەت چوو.

﴿ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ ﴾، ئەوانەی کە لە خاوەن کتێبەکان پشتیوانییان لێکردن، بە تەئکید پشتیوانییان لە هێزی سەرەکیی ئەحزاب کرد، کە هاوبەش بۆ خوا دانەرانی قورەیش بوون و، ژمارەیان دەوری چوار هەزار (٤٠٠٠) کەس زیاتر بوو، هەروەها هاوپەیمانەکانیشیان لەگەڵیان و، هێزی دووەمی پێکهێنەری ئەحزاب هۆزی (**غطفان**) بوو، لەگەڵ ئەوانیشدا هەندێ خەڵکی دیکە و، هەندێ وردە هۆزو عەشیرەتی دیکەشیان کەوتبوونە گەڵ، ئنجا بەنو قورەیزەش بوو بوونە سەربار، خوا لە قەڵایەکانیان دایبەزاندن، (**صَيَاصِي: جَمْعُ صِيصِيَةَ، أو جمع صِيْصَة وَهِيَ الحِصْن**)، کەواتە: (صياصي) یانی: (حصون)، ئنجا

(صیصة و صیصیة)، وێـڕای قـەڵا بـە قۆچـی ڕەشـە وڵاخیـش دەگوتـرێ، قـەڵاش بۆیـە ئـەو نـاوەی لێـنراوە، چونکـە وەك چـۆن گا بـە قۆچـەکانی خـۆی دەپارێـزێ، بـە هەمـان شـێوەش گـەل و کۆمەڵـگای ئـەو کاتـە، بـە هـۆی قەڵایەکانـەوە خۆیـان پاراسـتوە، شـایانی باسـە: هـۆزی بەنـو قورەیـزە لـە ڕووی جوگرافییـەوە ماڵەکانیـان لـە باشـووری ڕۆژهـەڵاتی شـاری مەدینـەوە (جنـوب شرقـي المدينة)بـوون .

٢)- ﴿ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ﴾، خوا ترس و سامی خستە دڵ و دەروونیانەوە (القَذْفُ: الإلقَاءُ السَّرِيع)، (قذف) بریتیە لە تێفڕێدان و تێخستنێکی خێرا.

٣)- ﴿ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴾، کۆمەڵێکیانتان دەکوشت، واتە: لە خاوەن کتێبە پشتیوانەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، دیارە ڕووی دواندن لە مسوڵمانانە.

٤)- ﴿ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴾، کۆمەڵێکیشتانیان بە دیل دەگرتن، کە مەبەست پێی ئافرەت و منداڵەکانیانە.

٥)- ﴿ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ ﴾، سەر زەمینەکەیان و خانووبەرەکانیان، ماڵ و سامانەکانیانی کردە میراتتان، وایکرد بکەوێتە دەستی ئێوە، وەك چۆن میراتی کەسێك دەکەوێتە دەستی میراتگرەکانی، ئەوانیش کە نەمان، خانووبەرەو، سەرزەمین و ماڵ و سامانیان و هەموو شتێکیان، بۆ ئێوە بەجێما، وەك میراتتان لێگرتبن، وایە.

٦)- ﴿ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ﴾، هەروەها سەر زەمینێکیش کە پێتان تێنەخستبوو، لە سەرەتای سووڕەتی (الحشر)دا، خوای پەروەردگار باسی سەر زەمینی خەیبەر دەکات، کە بەبێ جەنگ کەوتە دەستی مسوڵمانان، دوای ئەوەی جوولەکەکانی خەیبەر خیانەتیان کرد، پێغەمبەر ﷺ سەرپشکی کردن لە نێوان جەنگ کردن و، بەجێهێشتنیدا، ئەوە بوو کە بە جێیان هێشت بەبێ جەنگ، واتە: هەروەها سەر زەمینێکیش کە ئێوە جارێ نەیچووبوونە نێو، پێتان تێنەخستبوو، ئەویشی کردە میراتتان، ئەویشی کردە دەستکەوتتان، کە هەندێ لە زانایان دەڵێن: مەبەست پێی سەر زەمینی (جوولەکەکانی خەیبەرە)، کە دواتر ئەوانیش خەریکی فێڵ و تەڵەکە بوون و خیانەتیان کرد و، سەرەنجام سزادراون، هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی سەر زەمینی (بنو النضير)ە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ

مەبەست پێی سەر زەمینی (خەیبەر)بێ، چونکە بەنوو ننەزیر پێشتر دەرکرابوون.

٧)- ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٗا ﴾، خواش لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، هەڵبەتە بەنوو ننەزیر، لە ساڵی چوارەمی کۆچییدا خیانەتیان لێ ئاشکرا بوو، پێغەمبەریش ﷺ دەری کردن لەسەر زەمینەکەی خۆیان.

## جەنگی ئەحزاب و دوازدە (١٢) هەڵوەستە

١)- جەنگی ئەحزاب دوا هەوڵی هاوبەش بۆ خوادانەرانی قورەیش بوو لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان، پێشەوا (طبري) لە تەفسیرەکەی داو، هەروەها سەرچاوەکانی دیکەی مێژووش گوتوویانە: ئەو سەربازانەی کە هاتن کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ ٩﴾، سەربازانێك لە دژتان هاتن کە بریتی بوون: لە حیزبەکان (الأحزاب)، سێ پێکهاتەی سەرەکیی هەبوون:

یەك: هاوبەش بۆ خوا دانەرانی قورەیش.

دوو: هۆزی (غطفان).

سێ: هۆزی بەنو قورەیزە.

هەڵبەتە هەر کام لە هاوبەش بۆ خوا دانەرانی قورەیش و، (غطفان)، ئەوانیش چەند تیرەو هۆزێك لەگەڵیاندا هاوپەیمان بوون، ئەوانیشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا بوو، هەروەها بەنوو قورەیزە کە بەس خۆیان بوون، ئەوە بوو کە (حُيي بن أخطب النضري)، کە هانیدان و سەرەنجام ئەویش لەگەڵ ئەواندابوو، ژمارەی هەموو حیزبەکان، هەموو هێزە گەمارۆدەرەکانی مەدینە لە دە هەزار (١٠،٠٠٠) کەس کەمتر یان زیاتر بوون.

٢)- ئاگری بن (کا)ی ئەو جەنگە، جوولەکان بوون، سێ تیرەکانی جوولەکە کە لە مەدینەدا هەبوون: (بنو قينقاع، بنو النضير، بنو قريظة)، هەرچی بەنوو قەینوقاع بوون، لە ساڵی دووەمدا دوای ئەوەی پەیمانیان هەڵوەشاندەوە، ئەو پەیمانەی کە ناوی لێنرابوو (الوثيقة) یان (الصَّحيفة) و، پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای نیشتەجێ بوونی لە مەدینەدا، پەیمانێکی لە نێوان: جوولەکەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرانی مەدینە، لەگەڵ مسوڵمانەکاندا (وثيقة)یەکی کە لە شوێنی دەستووری ئێستا بوو، لە نێوانیان دا نووسیبوو، بەڵام بەنوو قەینوقاع خیانەتیان کرد، دوای ئەوەی مسوڵمانان لە جەنگی بەدر گەڕانەوە، جوولەکەکانی بەنوو قەینوقاع گوتیان: بەوە لە خۆتان بایی مەبن، کە شەڕتان لەگەڵ

کەسانێکدا کردوە، کە شارەزای جەنگ نەبوون، ئەگەر لەگەڵ ئێمەدا بەشەڕ بێن، ئەوجار دەزانن جەنگ چۆنە! ئنجا بەوەندەش لێنە گەڕان و، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی بەنوو قەینوقاع لە سێ تیرە جوولەکەکان دەربکرێ.

هەرچی هۆزی بەنوو ئەلنەزیریش بوو، لە ساڵی چوارەمی کۆچییدا ئەوانیش دیسان دوای ئەوەی پەیمانیان شکاند و خیانەتیان کرد، لە جێگاو ڕێگاکانی خۆیان دەرکران، ئەو دوو تیرەیە بەبێ جەنگ، دوای ئەوەی تابلووقەدران، خۆیان ئەوەیان هەڵبژارد کە جەنگ نەکەن، چونکە دەیانزانی جەنگەکەیان بۆ ناکرێ و سەرباری خیانەتیشیان لێ ئاشکرا بووە و، بەبێ شەڕ ماڵ و حاڵ و سەر زەمینی خۆیان بەجێهێشت و مەدینەیان چۆڵکرد.

مابۆوە هۆزی بەنوو قورەیزە کە ئەوانیش لە کۆتایی جەنگی ئەحزابدا کە لە کۆتایی ساڵی پێنجەمی کۆچییدا، ڕوویداوە، ئەوانیش پەیمانیان شکاند و، خەنجەری غەدریان لە پشتەوەڕا لە مسوڵمانانددا، یان بەتەما بوون لێیان بدەن و، سەرەنجام تووشی سزای خۆیان بوون، دیارە ئاگری بن (کا)ی ئەو جەنگە، جوولەکەکان بوون بەو شێوەیە کە باسمانکرد هەم لە سیرەی (إبن هشام)دا هێناومانە و، هەم (الطبري) باسی دەکات لە مێژووەکەی خۆیدا و، لە تەفسیرەکەشیدا، هەروەها (القرطبي)یش لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] باسی ئەوە دەکات و دەڵێ:

(أن نفراً من اليهود منهم: كنانة بن الربيع بن أبي الحقيق، وسلام بن أبي الحقيق، وسلام ابن مشكم، وحيي بن أخطب النضريون، وهوذة بن قيس، وأبو عمار من بني وائل، وهم كلهم يهود، هم الذين حزّبوا الأحزاب وَألّبوا وجمعوا، خرجوا في نفر من بني النضير ونفر من بني وائل، فأتوا مكة فدعوا إلى حرب رسول الله ﷺ، وواعدوهم من أنفسهم بعون من انتدب إلى ذلك، فأجابهم أهل مكة إلى ذلك، ثم خرج اليهود المذكورون إلى غطفان، فدعوهم إلى مثل ذلك، فأجابوهم، فخرجت قريش يقودهم أبو سفيان بن حرب، وخرجت غطفان، وقائدهم عيينة بن حصن

---
(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ص١٠٧.

**بـن حذيفـة بـن بـدر الفـزاري عـلى فـزارة، والحـارث بـن عـوف المـري عـلى بنـي مـرة، ومسـعود بـن رخيلـة).**

واتـە: کۆمەڵـێ لـە جوولەکـەکان کـە لـە نێویانـدا (**كنانـة بـن الربيـع بـن أبي الحقيـق، وسـلام بـن أبي الحقيـق، وسـلام ابـن مشـكم، وحيـي بـن أخطـب النضريـون، وهـوذة بـن قيـس وأبـو عـمار مـن بنـي وائـل**)، ئەوانە بـوون حیزبەکانیـان کۆکردنـەوەو هانیـان دان، خڕیـان کردنـەوە، چـوون بـۆ مەککـە و لـەوێ هاوبـەش بـۆ خوادانـەرانی مەککەیـان هانـدا لـە دژی مسـوڵمانان و، گوتیـان: ئەگـەر کارێـك بکـەن، ئێمـە لـە پشـتتانین، دوایـی هـەر ئـەو جوولەکانـە کـە باسـکران چـوون بـۆ لای هـۆزی (**غطفـان**) کـە فەرماندەکەیـان (**عيينـة بـن حصـن بـن حذيفـة بـن بـدر الفـزاري عـلى فـزارة، والحـارث بـن عـوف المـري عـلى بنـي مـرة، ومسـعود بـن رخيلـة**) بـوون، لەگـەڵ ئەوانیشـدا قسـەیانکرد و، هەموویـانی سـازکردن و، خۆشـیان دیـارە لـە نێـو سـنووری شـاری مەدینـەدا بـوون، کـە دەردی ئـەوان لـە هەمـوو دەردان گرانـتر بـوو بـۆ مسـوڵمانان و، زۆر لەسـەر دڵیـان قـورس بـوو.

**٣)- ڕاوێژکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی بۆ بەرەنگاربوونەوە، کە بە وردیی دیراسەی بارودۆخەکەیان کرد و، هەر لەو ئان و ساتەشدا بوو کە سەلمانی فارسیی ﷺ پێشنیاری کرد گوتی: ئێمە کاتی خۆی کە لە وڵاتی فارس بووین، ئەگەر شەڕمان بووبایە لەگەڵ دوژمنێکدا، ئەگەر شوێنەکەمان پێدەشت بووایە، لەو شوێنەی کە پێدەشت بوو خەندەکمان لێدەدات، شوێنەکانی دیکەش بورج و قەڵامان دادەنان و ئێشکەمان تێدادەگرتن، بۆ ئەوەی دوژمن نەتوانێ زەفەرمان پێ بەرێ و لە پێ دەشتەکانەوە بۆمان بێ، پێغەمبەر ﷺ پێشنیارەکەی سەلمانی وەرگرت، بە مەزەندە پێدەچێ درێژیی ئەو خەندەکە دەوری شەش هەزار (٦،٠٠٠) مەتر، واتە: شەش (٦) کیلۆمەتر بووبێ.**

**٤)- کارکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا، بۆ هەڵقەندنی خەندەکەکە و، کاری جیددیی نەك تەنیا بۆ ڕووپامایی و ڕیکلام و بانگەشە، تەنانەت پێغەمبەر ﷺ وا بە جیددیی کاری دەکرد، هاوەڵان ئەوانەی کە دەستی شیعر و هەڵبەستیان هەبوو، چەندان هەڵبەستیان**

گوتوە لە کاتی هەڵقەندنی خەندەکدا، یەکێ لە شیعرەکانیان ئەوەبوو دەیانگوت:

لَئِنْ قَعَدْنا وَالنَّبي يَعْمَلُ ... لَذاكَ مِنّا العَمَلُ المُضَلَّلُ

ئەگەر ئێمە دابنیشین و پێغەمبەر ﷺ کار بکات

ئەوە لە ئێمەوە کارێکی ون بووەو سەر لێتێکچوویە.

٥)- هەڵبەست و گۆرانیی گوتنی هاوەڵان لە کاتی کارکردندا، چەندان هەڵبەست و گۆرانیی و سروود گێڕراونەوە کە هاوەڵان خوا لێیان ڕازیبێ، لە کاتی هەڵقەندنی خەندەکەکە و لە کاتی کارکردندا گوتوویانن، دیارە شیعرو هەڵبەست گوتن و گۆرانیی گوتن لە کاتی کاردا جۆرێك لە ئاسوودەیی بە دڵ و دەروون و، عەقڵ و هەست و نەستی مرۆڤ دەدات و، وزە و توانای زیاتر دەکات بۆ کارکردن، یەکێ لەو گۆرانیی و هەڵبەستانە کە دەیانگوتن:

اللَّهُمَّ لَوْلا أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنَا ... وَلَا تَصَدَّقْنَا وَلَا صَلَّيْنَا

فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا ... وَثَبِّتْ الْأَقْدَامَ إِنْ لَاقَيْنا

إِنَّ الْأُولَى قَدْ بَغَوْا عَلَيْنَا ... وَإِنْ أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا

واتە: ئەی خوایە! ئەگەر تۆ نەبووایەی ڕێی ڕاستمان نەدەگرت و، هەروەها خێر وچاکەمان نەدەکرد و، نوێژمان نەدەکرد، بۆیە ئارامیی دابڕژێنە سەرمان و، پێیەکانمان بچەسپێنە لە کاتێکدا کە ڕووبەڕوو دەبینەوە لەگەڵ دوژمندا، ئا ئەوانە دەستدرێژییمان دەکەنە سەر، ئەگەر بیانەوێ هەڵمانگێڕنەوە، ئێمە ئامادە نابین و ملیان بۆ کەچ ناکەین.

ئنجا پێغەمبەری خواش ﷺ کاتێ کە هاوەڵان ئەو شیعرەیان دەگوت، ئەویش کۆتاییەکانی لەگەڵ دەگوتنەوە، بۆ وێنە: (ولا صلَّينا، إن لاقينا، أَبَيْنا) لەگەڵ دەگوتنەوەو دەنگی پێ درێژدەکردنەوە.

کاتێ خۆی شیعرێکی دیکەشمان هێنا، یەکێ لە هاوەڵانی ناوی (جُعیل) بووە، (جُعیل) واتە: قالۆنچۆکە، پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی لێنا (عَمْرو)، ئنجا ئەویشیان کرد بوو شیعر دەیانگوت:

سَمَّاهُ مِنْ بَعْدِ جُعَيْلٍ عَمْرًا ... وَكَانَ لِلْبَائِسِ يَوْمًا ظَهْرًا

واتە: پێغەمبەر ﷺ دوایی ناوی لە (جعیل)ەوە گۆڕی بۆ (عمرو)و، کاتێک پشت و پەنا بووە، بۆ بابای ستەملێکراو.

٦)- ئەحزاب ژمارەیان دە هەزار (١٠،٠٠٠) کەس دەبوو، چوار (٤٠٠٠) هەزاریان لە هۆزی قوڕەیش و ئەوانی دیکەش لەوانی دیکە بوون، بە زۆریی لە دوای قوڕەیش زۆربەی هێزەکە بریتیی بوو لە هۆزی (غطفان) بە سەرکردایەتیی: أ- (عیینة بن حصن) و، ب- (الحارث بن العوف)و، ج- (مسعود بن رخیلة) ئەو سێیانە بوون، هەروەها هێزی بەنوو قوڕەیزەش بە بەڵگەی ئەوە کە (٦٠٠ - ٧٠٠) یاخود (٨٠٠ - ٩٠٠)یان لێ کوژراوە، دیارە هێزەکەیان لە دەوروبەری هەزار (١٠٠٠) کەسدا بووە.

٧)- جەنگ و گەمارۆیەکە، هەندێك لە مێژوو نووسان دەڵێن: بیست (٢٠) ڕۆژ و هەندێ دەڵێن: بیست و پێنج (٢٥) ڕۆژ و، هەندێکیان دەڵێن: سی (٣٠) ڕۆژی درێژە کێشاوە، واتە: مانگێك ئەو ئابڵووقەیە هەبووە، ئنجا مانگێك شارێك یان وڵاتێك ئابڵووقەبدرێ و، ئەو خەڵکە هەمووی دەستی لەسەر دڵی بێ، بە تەئکید ئەوانە لە حاڵەتێکی دەروونیی زۆر ناڕەحەت دابوون لە هەموو لایەك، چونکە مەترسیی هەبووە لە هەر کاتێکدا، کە ئەوانە هێرش بێنن لە شوێنێکەوە، ئاڵقەیەك کە بەبێ هێزی بزانن بێنە نێو شارەوەو دەست بکەن بە قەتڵعام و بنبڕکردنی مسوڵمانان، وەك ئەسڵی ئەخشەکە کە جوولەکان دایاناوە لەگەڵ قوڕەیش و (غطفان)دا، لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون و بۆ ئەوە بووە کە مسوڵمانان قڕە بڕ بکەن و قەلاچۆیان بکەن.

٨)- ژمارەی مسوڵمانان دەوری سێ هەزار (٣٠٠٠) کەس بووە و، بۆ هەڵقەندنی خەندەکەکەش هەر دە (١٠) کەس چل (٤٠) باسك واتە: بیست (٢٠) مەتریان گەیشتۆتێ و بۆیان

دیاریکراوە، کەواتە: درێژیی خەندەکەکە، ئەگەر سێ هەزار دابەشی بیست (٢٠) مەتر بکەی بۆ هەر دە کەس، مانای وایە دەکاتە دەوری شەش کیلۆمەتر درێژ بووە، واتە: شەش هەزار (٦،٠٠٠) مەتریان هەڵقەندوە، دیارە بە قووڵاییەکی واش کە بە ئاسانیی پڕنەکرێتەوە، بەلای کەمەوە حەوت هەشت (٧ - ٨) مەتریان قووڵکردوە، چونکە ئەگەر قووڵاییەکی کەم بێ بەخێرایی دەیانتوانی پڕی بکەنەوە، هەڵبەتە گڵ و خۆڵەکەشیان فڕێداوەتە دیوی خۆیان، واتە: ئەو شوێنەی کە دەکەوێتە لای مسوڵمانان، بۆ ئەوەی لەلای کافرەکان نەبێ و یەکسەر پڕی بکەنەوە، ئنجا دەبێ هێندەش پان بوو بێ، کە نەتوانن نەك خۆیان لێی باز بدەن، بەڵکو بە ئەسپیش لێی باز بدەن، هەر بۆیەش (عمرو بن ود و، عكرمة بن أبي جهل) و چەند سوارێك لە شوێنێك کە تۆزێ بەرتەسك بوو، لەوێوە ئەسپەکانیان بە غار هێناوەو، بازی ئەسپ زۆر خێراترە لە هی مرۆڤ، لەوێ توانیویانە بپەڕنەوە، کەواتە: خەندەکێکی هێندە قووڵ و هێندە فراوان و هێندەش درێژ، مانای وایە کارێکی زۆر گەورە کراوە و، ئەرکێکی زۆر گەورە کێشراوە، بەڵام بە باشترین شێوەش ئامانجی خۆی پێکاوە، ئەویش بریتی بووە لەوەی ئەو خەندەکە کەلێنی هێزێکی زۆری بۆ مسوڵمانان پڕکردۆتەوە، چونکە ئەوان خۆیان ژمارەیان سێ هەزار کەس بووەو، دوژمن سێ بەرانبەری ئەوان زیاتر بوون.

٩)- پێغەمبەری خوا ﷺ سەرجەم ئامرازەکانی لەو جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەیەداو، لە هەموو جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەکانی دیکەش دا، ڕەچاو کردوون، بۆ وێنە:

یەکەم: خۆڕاگریی و یادی خواو پشت بە خوا بەستن، کە ئەوە عادەتی هەمیشەیی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بووە.

دووەم: بەرزکردنەوەی مەعنەویاتی مسوڵمانان و موژدە پێدانیان، وەك لە کاتی هەڵقەندنی خەندەکەکەدا، شوێنێکیان لێ عاسێ بووە، پێغەمبەر ﷺ دابەزیوەتە نێو چاڵەکەو سێ چوار پاچی لێداوەو بڵێسەی لێ بەرزبۆتەوەو فەرموویەتی: کۆشکەکانی وڵاتی فارس و ڕۆم و وڵاتی حەبەشەم لێدەرکەوتن.

سێیەم: لە ڕووی هەواڵگرییەوە، پێغەمبەر ﷺ کاری کردوە، وەك نموونەیەك: ئەوە بوو کە حوزەیفەی کوڕی یەمانی نارد، تاکو بزانێ دەنگ و باسیان چییە؟

**چوارەم: لە ڕووی جەنگی دەروونییەوە، دیسان گرنگیی پێداوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ (نعیم بن مسعود) کە تازە مسوڵمان بوو بوو، نە (غطفان) بە مسوڵمانەتییەکەی زانیبوو، نە قوڕەیش و نەجوولەکەکانیش، لە نێوان ئەو سێ کۆمەڵەدا، (نعیم) ڕۆڵێکی زۆر زیرەکانەی گێڕا، لەوەدا کە متمانەیان بە یەکدی نەمێنێ و، دڵیان سارد بێتەوە لەسەر جەنگەکەیان.**

**پێنجەم: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی لە مەیداندا بووە، سەرکردەیەکی مەیدانیی بووە، نەك بە هەواڵ ناردن و بە بەریدو پۆستە قیادەیی بکات لە دوورەوە، بەڵکو بۆ خۆی لە نێو جەرگەی کارەکاندا بووە و، بۆ خۆی لە خەندەك هەڵقەندن دا بووە، بۆ خۆی لە بەرەنگاربوونەوەدا بووە، بۆ خۆی سەرماو گەرمای جەنگەکەی بینیوە، بۆ خۆی لە نێو هەموو ڕووداوەکاندا بووە.**

**١٠)- کوشتنی عەلی ﷺبۆ عەمری کوڕی وەد، ئەویش بێگومان کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو کە لووتی بێبڕوایەکان بشکێنێ و، کاریگەریی گەورەی هەبوو بۆ ئەوە کە لە مەعنەوییاتیان دابەزێ.**

**بەڵام ئەوەی کە شیعە دەیڵێن، شیعەی دوازدە ئیمامیی و جۆرەکانی دیکەی شیعەش، بێگومان ئەوە زێدەڕۆییەکی زۆر بێ جێ و نالۆژیکییەکی بێ مانایە، بۆ وێنە: لە (بحار الأنوار)دا[1]، ئەم دەقە هاتووە کە لە ڕاستییدا، نە سەنەدو زنجیرەکەی چەسپاوە و، نە مانایەکەشی تەواوە، دەڵێ: (لَوْ وزِنَ اليومُ عملُك بعمل جميع أمة محمَّد، لَرَجح عَمَلُك على عملهم)، گوایە پێغەمبەر ﷺ ئەو ڕۆژە بە عەلی ﷺ فەرمووە: ئەگەر کردەوەی ئەمڕۆت هەڵسەنگێنرێ و بخرێتە تەرازووەوە، لەگەڵ کردەوەی هەموو ئوممەتی موحەممەددا ﷺ کردەوەی ئەمڕۆی تۆ لە هی هەموو ئوممەت قورسترە! کە بێگومان ئەوە زێدەڕۆییەکی دیارە، عەلی ﷺ ئامۆزای پێغەمبەرە ﷺ، پاڵەوانی ئیسلام بووەو پیاوێکی زۆر ئازا بووە، بەڵام کە ئەو کابرایەی کوشتوە، ئەو کابرایە هەر یەکێك بووە لە پاڵەوانەکانی موشریکەکان، بەڵام سەرۆکی سوپایەکە نەبووە، تاکو بگوترێ: بە هۆی ئەوەوە شکاون، ئنجا دوای کوشتنی (عەمرو)یش سوپاکەیان نەشکاوە، بەڵکو ئەوە لە سەرەتای جەنگەکەدا بووە، باشە ئەوە کارێکی باشەو لووتی ئەو سوپایەی پێ شکاوە،**

---

(١) ج١٢ ص٣١٦.

بەڵام ئەوە کە ئەو کردەوەیە، لەگەڵ هەموو کردەوەکانی ئۆممەتدا بخرێتە تەرازووەوە، لە هەموویان قورسترە! قسەیەکی عاتیفییانەیە، بە داخەوە کە شیعە کاتێ قسە دێتە سەر عەلی ﷺ و حەسەن و حوسێن و فاتیمە و، پێشەوایەکانی دیکەیان، کە جێی ڕێز و حورمەتن لە لای هەموو ئۆممەت، عەقڵیان زۆر لە دەست دەدەن و، بە دوای ئەسپی عاتیفە دەکەون و، هەرچی دەربارەیان لە کتێباندا هاتوە، بەبێ ئەوەی سەنەدو زنجیرەیەکی هەبێ، هەمووی وەردەگرن، مادام مەدحی عەلی تێدابێ، یان حەسەن و حوسێن، یان یەکێ لە ئیمامەکانیان خوا لێیان ڕازیبێ و خوا لێیان خۆشبێ، کە زۆرینەی مسوڵمانان کە بە ئەهلی سوننەت و جەماعەت ناسراون، ڕێزو حورمەتیان هەبووە بۆ هەموو ئەوانەی کە خزمانی پێغەمبەر ﷺ بوون و زانا بوون، وەك باقی زانایانی دیکەو، فەرقیان نەکردوە بە جەعفەری صادیق و مالیك و ئەبوو حەنیفەو زەیدو ئەوی دیکەو ئەوی دیکە، ڕێزیان بۆ هەموویان هەبووە، خوا لە هەموویان ڕازیبێ.

١١)- ئەوەی جەنگەکەی یەکلایی کردەوە بە قازانجی مسوڵمانان، ئەوە بوو کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾﴾، بایەکی بەهێزمان ناردنە سەریان و، سەربازانێك کە نەتاندەبینین.

کەواتە: بە دەقی ئایەت ئەوە سەرەنجامی جەنگەکەی یەکلایی کردۆتەوە.

١٢)- خوا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! یادی چاکەی خوا بەسەرخۆتانەوە بکەنەوە کە سەربازانێك لە دژتان هاتن و بۆتان هاتن، ئێمەش بایەکی بەهێزو سەربازانێك کە نەتاندەبینین بۆمان ناردن، خواش بینەری ئەوە بوو، کە دەتانکرد، کەواتە: ئەو چاکەیە کە خوا کاتی خۆی کە لەگەڵ پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانیدا کردوویەتی، چاکە بووە لەگەڵ هەموو مسوڵمانان و ئیمانداراندا، هەتا دوا کەسی ئۆممەت، چونکە ئەگەر ئەوان بنبڕ کرابانایە - وەك بێبڕوایان نەخشەیان کێشا بوو - بە تەئکید ئەو ئیسلامە نەدەگەیشتە دەستی ئێمە.

## جەنگی بەنی قورەیزەو حەوت هەڵوەستە

١)- (كعب بن أسد القرظي) سەرۆكی هۆزی بەنی قورەیزەی جوولەكەكان، وەك پێشتر هێنامان، دان بەوەدا دێنێ كاتێك كە (حُيي بن أخطب النضري) وای لێدەكات ئەو پەیمانەی كە لەگەڵ موحەممەددا ﷺ بەستوویەتی، بیشكێنێ و، بە هەموویان دژی بن، هێزی قورەیشی هێناوەو، (غطفان)ی هێناوەو، لە فلان شوێن و فلان شوێنی داناون، چەند جارێك دووبارەی دەكاتەوە دەڵێ: من جگە لە وەفاو ڕاستگۆیی و پاكیی لە موحەممەد ﷺم نەبینیوە و، پەیمان ناشكێنم، بەڵام ئەو هەر زۆر ئیحراجی دەكات و دەڵێ: تۆ لەبەر ئەوەتە كە پاروە نانێكت لەگەڵ نەخۆم! ئیدی سەرەنجام كڵاوی لەسەردەنێ و ئەویش وەك خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ! ئنجا ئەوەیە كە دەڵێ: **(والفضل ما شَهِدتْ بهِ الأعداء)**، چاكەكاریی ئەوەیە، دوژمنانیشت و بەرانبەرەكانیشت، دانی پێدابنێن، پێغەمبەری خواش ﷺ **(كعب بن أسد القرظي)** دانی پێدا دێنێ و دەڵێ: غەیری وەفاو ڕاستگۆییم لە موحەممەد ﷺ نەبینیوە.

٢)- لە پشت ڕا خەنجەری غەدر وەشاندن، كە تاوانێكی نەبەخشراوە، بەنوو قورەیزەش وایانكرد، نەك هەر پەیمانیان هەڵوەشاندەوە، بەڵكو جنێوو قسەشیان بە پێغەمبەر ﷺ گوتبو و، زۆر بێ شەرمانە، هەروەها هەموو توانای خۆیان سەرفكرد، بۆ پشتگیریی كردنی ئەو گەلە كۆمەكییەی لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان كرابوو و، ئەگەر ئەو پیلان و فێڵە سەری گرتبایەو، خوای پەروەردگار بە فریای مسوڵمانان نەهاتبایە، بە تەئكید ئەو كاتە هەر پارچەو پرمۆڵەی مسوڵمانێك بە دەست جوولەكەیەك و بە دەست موشریكێكەوە دەبینرا، ئنجا سەیر ئەوەیە كە هەندێك ئێستا لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا دوای چواردە، پازدە، سەدە فرمێسكی تیمساحیی دەڕێژن بۆ جوولەكەكانی بەنوو قورەیزە، بەڵام ئەگەر پیلان و نەخشەی جوولەكەكان، كە لە ئەسڵدا شەڕەكە ئەوان ئاگری بن (كا)ی بوون و، ئەوان نەخشە داڕێژەری بوون، ئەگەر ئەوە سەری گرتبایەو مسوڵمانان قەلاچۆكرابان، دەبێ، ئەوانەی كە ئێستا بۆ جوولەكەكان دەگریەن، بۆ جوولەكە پەیمان

شكێنەكان و، جوولەكە لە پشتەوە ڕا خەنجەری غەدر وەشێنەكان، دەبێ ئەوانە چییان بۆ مسوڵمانان كردبایە!! مسوڵمانانێك كە پەیمانیان لە دژ دەشكێنرێ و، گەلەكۆمەكییان لە دژ دەكرێ، مسوڵمانانێك كە پەیامی خوا بە دنیا ڕادەگەیەنن، پەیامی دادگەریی و برایەتیی و تەبایی، پەیامی هۆشیاریی و زانست و مەعریفەت؟!

٣)- سزادانی بەنوو قورەیزە بە پێی بەڵێن و پەیمان و داب و نەریتی خۆشیان بووە، جگە لە حوكمی شەرع، چونكە ئەوان ڕازیبوون كە سەعدی كوڕی موعاز كە هاوپەیمانیان بووە، لە سەردەمی نەفامییدا، ببێتە دادوەر، ئنجا سەعدی كوڕی موعازیش دوای ئەوەی ئاماژەی بۆ بەنو قورەیزە كرد: ئایا ئێوە ڕازین بە دادوەریەتیی من؟ گوتیان: بەڵێ، ئنجا ئاماژەشی بۆ لای مسوڵمانان كرد، بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئایا ئەوەی لەو لایەنەشە - وەك ڕێزو حورمەت بۆ پێغەمبەر ﷺ - ئەویش ڕازییە بە دادوەریی من؟ گوتیان: بەڵێ، ئنجا گوتی: من بەو شێوەیە حوكم دەكەم، كە پیاوەكانیان بكوژرێن و، ئافرەت و منداڵیشیان بەدیل بگیرێن و، ماڵ و سامانیشیان غەنیمەت و دەستكەوت بێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەو شێوەیە دادوەرییت كرد، كە خوا پێی خۆشە لەسەرووی حەوت ئاسمانانەوە، ئنجا ئەمە، جگە لە حوكمی شەرع، كە هەر كەسێ مسوڵمان بێ، نابێ ڕەخنە لەو حوكمە بگرێ، بەڵام پێش حوكمی شەرع، عەقڵ و داب و نەریت و، پاشان بەدان پێداهێنانی خۆیان، (والمرء مؤاخَذٌ بإقراره)، (مرۆڤ بە دان پێداهێنانی خۆی دەگیرێ)، ئەوانیش خۆیان ڕازیبوون كە سەعدی كوڕی موعاز سەرۆكی هۆزی ئەوس، كە ئەو كاتە برینداریش بوو بە تیری ئەحزاب، خۆیان ئەویان پێشنیار كرد لەبەر ئەوەی كاتێ خۆی هاوپەیمان بووە لەگەڵیاندا، وایانزانیوە وەك چۆن (عبدالله بن أبي بن سلول) كە هاوپەیمان بووە لەگەڵ بەنوو نەزیردا لە ساڵی چوارەمی كۆچییدا و، داوای لە پێغەمبەر ﷺ كردو ئیلحاحی لێكرد، كە بەویان ببەخشێ، ئەویش پێی بەخشین، وایانزانی سەعدی كوڕی موعازیش وا دەكات، بە تەئكید ئەگەر سەعدیش وای كردبایە، پێغەمبەر ﷺ بە سەعدی دەبەخشین، بەڵام نەخێر سەعد دەیزانی كە ئەوانە دەبێ سزا بدرێن و، چەندان كەسی دیكەش كە چاویان لە پەیمان شكاندن بوو و، خەنجەری غەدر وەشاندن بوون، تەمبێ خواردن بن، بە درێژایی مێژوو، بۆ ئەوەی وانەزانن مسوڵمانان كڵاویان لەسەر دەنرێ و هەڵدەخەڵەتێنرێن.

٤)- سەعدی کوڕی موعاز دادگەرانە حوکمی داو، بە قسەی سۆزو عاتیفەی نەکرد، بەڵام (أبو لُبابة) کە ئەویش کاتی خۆی لەگەڵ بەنوو قوڕەیزەدا، لە سەردەمی پێش ئیسلامدا جۆرێك لە کەین و بەین و دۆستایەتیی هەبووە، (أبو لُبابة) کە هەڵوێستەکەیمان باسکرد، نهێنیی مسوڵمانانی ئاشکرا کرد، (أبو لُبابة) لە هەڵوێستەکەیدا کەوت، بەڵام دوایی هەستایەوەو خوای پەروەردگاریش لێی خۆشبوو.

هەڵبەتە گرنگە کە نەکەوی، وەك سەعدی کوڕی موعاز، بەڵام گرنگیشە کە کەوتی، هەڵسیەوە وەك: (أبو لُبابة) نەك لەسەرکەوتنی خۆت بەردەوام بی.

٥)- هەر کەس ناپاکیی مەزن (الخيانة العظمی)ی لێ دەربکەوێ، جگە لە سزادان، هیچ شتێکی دیکەی شایستە نیە و، بێگومان لە ئەگەری سەرکەوتنی ئەحزابدا، دیارە مسوڵمانان و ئیسلام چۆن کۆتاییان پێدەهات و، ئیسلام ئەو پەیامە بەرزو مەزنەی خوای پەروەردگار، چۆن خەفە دەبوو، دەکوژایەوە، هەر بۆیەش جیبریل (علیه السلام) و مەلائیکە هەر بەردەوام بوون، کاتێ پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی چوونەوە بۆ ماڵ، وایانزانی کۆتایی بە جەنگ هاتوە، جیبریل چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، کە مێزەرێکی بەستبوو، سواری ئەسپێك بوو، لەو شێوەیەدا هاتۆتە بەرچاوی پێغەمبەر ﷺو گوتی: من فریشتەکانم ناردوە بۆ سەر بەنوو قوڕەیزە بۆ ئەوەی ترسیان بخەنە دڵ، ئێمە وەك فریشتەکان کۆتاییمان بە جەنگ نەهێناوە، بەڵکو ئەو جەنگە جارێ جەولەی یەکەمی تەواو بووە، بەڵام جەولەی دووەمی ماوە، لەگەڵ بەنوو قوڕەیزەی پەیمان شکێنی غەدرکەری لە پشتەوە خەنجەری غەدر وەشێنەردا، کە ئەگەر ئابلۆوقەکە، بیست و پێنج ڕۆژ تاکو مانگێکی پێچووە، ئابلۆوقەی ئەحزاب بۆ مەدینە، بە هەمان شێوە، ئابلۆوقەی پێغەمبەر ﷺیش بۆ قەڵاکانی هۆزی بەنوو قوڕەیزەی جوولەکەش دەوری مانگێکی پێچووە، کەواتە: جەنگەکە دوو قۆناغ بووە:

قۆناغی یەکەمی شکانی ئەو گەمارۆیە بووە، کە ئەحزاب بە دەوری مەدینەیاندا دانـاوە و، قۆناغی دووەمیش بریتی بووە لە کۆتایی پێهێنانی پەیمان شکێنانی هۆزی بەنوو قوڕەیزە، کەواتە: کوژرانی پیاوانی جەنگاوەری بەنوو قوڕەیزە، پێویستیی بە پینەو پەڕۆیان، یان نکووڵییلێکردن لە ڕاستیی مێژوویی ناکات و شتێکی دادگەرانەو حەکیمانە بووە.

ئەگـەر کەسـانێکیش تانـە بـدەن لـە سـەنەدی ڕیوایەتەکانـی سـیرە و سـوننەت نـەدی چـی لـە ئایەتەکانـی (٢٦ و ٢٧) الأحـزاب، دەکـەن؟!

٦)- کوژرانی پیاوانی بەنوو قورەیزەش، تایبەت بووە بە جەنگاوەرەکانیان، ئەوانەیان کە مسوڵمان نەبوون، واتە: تەنیا جەنگاوەرەکان کوژراون و، لەوانیش ئەوانەیان کە مسوڵمان نەبوون و، ئەگەر خەڵکیان تێدا بوو بێ، ڕاهیب بووبێ، یان پیرو کەنەفت بوو بێ، یان نەخۆش بوو بێ، بە تەئکید ئەوانە نەکوژراون، وەك لە هەموو جەنگەکانی ئیسلام لەگەڵ ئەهلی کوفردا، هەروا بووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بابای ڕاهیب، بابای کرێکار، بابای پیرو کەنەفت، بابای نەخۆش، مەکوژن، تەنیا پیاوە جەنگاوەرەکانیان کوژراون، ئەوانەی کە مسوڵمان نەبووبن، کۆمەڵێکیان کە مسوڵمان بوون، دیارە ئەوانە نەکوژراون، ئنجا ئەوانەش کە کوژراون، لەبەر ئەوە بووە کە لە جەنگدا گیراون، ئەوە نەبووە کە بە ئاشتییانە بگیرێن، چونکە لە ئیسلامدا دیل ناکوژرێ، بەڵام ئەوانە جەنگاوەربوون و، دوای ئەوەی کە شەڕەکەیان دۆڕاندوە، خۆیان بەدەستەوە داوە، ئەویش لەسەر قسەی کەسێك کە خۆیان پێشنیاریان کردوە کە سەعدی کوڕی موعازە، کە ئەو دادوەر بێ، بۆیە تەنیا ژنێك لە بەنوو قورەیزە کوژرا، ئەویش ئەو ئافرەتە بوو کە بەرداشێکی، یاخود دەستاڕێکی بەسەر یەکێ لە هاوەڵاندا دابوو، کوشتبووی، وەك تۆڵە (قصاص)، تەنیا ئەو ئافرەتە کوژرا.

٧)- هەمیشە دوژمنانی نێوخۆ، لە هی دەرەکیی مەترسیدارترن، هەر بۆیەش پێویستە دوژمنانی نێوخۆ، بە تایبەت کە بەڵێن و پەیمان هەبێ، کاتێ کە بەڵێن و پەیمان دەشکێنن و لە پشتەوەڕا خەنجەری غەدر دەوەشێنن، پێویستە زۆر بە سەختیی سزابدرێن، بۆ ئەوەی خۆشیان جارێکی دیکە ئەوە دووبارە نەکەنەوە و، خەڵکی دیکەش لێیان عیبرەت گرتوو بێ و، دەرس و پەندیان لێوەربگرێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان هەشت ئایەت دەگرێتە خۆی: (٢٨- ٣٥)، کە جگە لە ئایەتی کۆتایی، هەموویان لەبارەی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خواوەن ﷺ، (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەوانیش دوو ئایەتی سەرەتا (٢٨ و ٢٩)، لە بارەی سەرپشککردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوسەرەکانیەوەن، پێنج ئایەتەکەی دیکەش، هەموویان ئامۆژگاریی و ڕێنمایی خوای دادگەرو کارزانن، بۆ هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ، کە چۆن هەڵس و کەوت بکەن، لەگەڵ خواو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺداو، لە ژیانی ڕۆژانەیاندا، لەگەڵ کۆمەڵگاو دەوروبەریاندا.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ
وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ
أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٢٩﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ
يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿٣٠﴾ وَمَن يَقۡنُتۡ مِنكُنَّ لِلَّهِ
وَرَسُولِهِۦ وَتَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا نُّؤۡتِهَآ أَجۡرَهَا مَرَّتَيۡنِ وَأَعۡتَدۡنَا لَهَا رِزۡقٗا كَرِيمٗا ﴿٣١﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ
لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّۚ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ
قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴿٣٢﴾ وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ
وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ
أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ
وَٱلۡحِكۡمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ

وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئـەی پێغەمبـەر! بـە هاوسـەرەکانت بڵـێ: ئەگـەر ژیـانی دنیـاو جوانییەکەیتـان دەوێ، وەرن یـەکێ دیارییەکتـان بدەمـێ و، بەدەسـت لێبەردانێـکی جـوان و پەسـند، دەسـتتان لـێ بـەر بـدەم (لێتـان جیاببمـەوە) ﴿٢٨﴾ ئەگـەر خـواو پێغەمبەرەکـەی و، مەنزڵـگای کۆتاییشـتان دەوێ، بێگومـان خـوا بـۆ چاکـەکاران لـە ئێـوە، پاداشـتێکی مـەزنی دانـاوە ﴿٢٩﴾ ئـەی ئافرەتـانی پێغەمبـەر! هەرکامێکتـان خراپەیـەکی ئاشـکرا (یاخیبـوون و سـەرپێچیی) بـکات، سـزاو ئـازاری بـۆ دوو قـات دەکـرێ و، ئـەوەش بـۆ خـوا ئاسـانە ﴿٣٠﴾ هـەر کەسێکیشـتان ملکەچـی خـواو پێغەمبەرەکـەی بـێ (گوێڕایەڵیـان بـێ) و، کـردەوەی بـاش بـکات، دوو کەڕەتـان پاداشـتەکەی دەدەینـەوە (پاداشـتی دوو قـات دەدەینـەوە) و، بژیوێـکی باشیشـمان (لـە بەهەشـتدا) بـۆ سـاز کـردوە ﴿٣١﴾ ئـەی ئافرەتـانی پێغەمبـەر! ئەگـەر پارێـز (لـە خـوا) بکـەن، وەك هیـچ کام لـە ئافرەتـان نیـن (لـە پلـە و پایـەدا) بۆیـە قسـەی نـەرم و ناسـك (لەگـەڵ پیـاوان دا) مەکـەن، کـە سـەرەنجام ئـەو کەسـەی دڵـی نەخۆشـیی تێدایـە، تەماع(تـان تـێ) بـکات و، قسـەیەکی پەسـندیش بکـەن ﴿٣٢﴾ لـە ماڵەکانیشـتاندا سـەقامگیر بـن و وەك (جوانیـی) خـۆ دەرخسـتنی (سـەردەمی) نەفامێتیـی یەکـەم، خۆتـان دەرمەخـەن و، نوێـژ بەرپـا بکـەن و زەکات بـدەن و، فەرمانبەریـی خـواو پێغەمبەرەکـەی بکـەن، بـە دڵنیایـی ئـەی هاوسـەرانی ماڵـی پێغەمبـەر، خـوا (بـەم ڕێنمایـی و ئامۆژگارییانـەی) دەیـەوێ پیسـیی (گوناهـو خراپە)تـان لـێ لابـەرێ و، بـە پاککردنەوەیـەکی تایبـەت

پاکتـان بکاتـەوە ﴿٣٣﴾ هەروەهـا یـادی ئـەو ئایەتانـەو ئـەو حیکمەتـەش بکـەن، کـە لـە ماڵەکانتانـدا دەخوێنرێنـەوە، بێگومـان خـوا پەنهانـزانی شـارەزایە ﴿٣٤﴾ بـە دڵنیایـی پیـاوانی (بـۆ خـوا) ملکـەچ و ئافرەتـانی ملکـەچ و، پیـاوانی بـڕوادار و ئافرەتـانی بـڕوادار و، پیـاوانی فەرمانبـەرو ئافرەتـانی فەرمانبـەر و، پیـاوانی ڕاسـت و ئافرەتـانی ڕاسـت و، پیـاوانی خۆڕاگـرو ئافرەتـانی خۆڕاگـر و، پیـاوانی بـە تـرس و بیـم (بەرانبـەر بـە خـوا) و، ئافرەتـانی بـە تـرس و بیـم و، پیـاوانی ماڵبەخشـەرو ئافرەتـانی ماڵبەخشـەر و، پیـاوانی ڕۆژووگـرو ئافرەتـانی ڕۆژووگـر و، پیـاوانی پارێـزەری داوێنـی خۆیـان و ئافرەتـانی پارێـزەری داوێنـی خۆیـان و، پیـاوانی زۆر خـوا یادکـەرو ئافرەتـانی زۆر (خـوا) یادکـەر، خـوا لێبـوردن و پاداشـتێکی مـەزنی بـۆ دانـاون ﴿٣٥﴾].

## ڕشیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَتَعَالَيْنَ): واتـە: وەرن، (تَعَال: إسْم فِعْلِ أَمْرٍ بِمَعْنَى أَقْبِلُوا) (تَعَال) نـاوی کاری فەرمانـە، واتـە: (أَقْبِل)، وەرە، (تَعَالَيْن) بـۆ کۆمەڵێـك لـە ئافرەتانـە، واتـە: وەرن.

(أُمَتِّعْكُنَّ): سـەرو دیارییتـان بدەمـێ، (المَتَاعُ والمُتْعَةُ: مَا يُعْطَى المطَلَّقَةُ لِتَنْتَفِعَ بِهِ مُدَّةَ عِدَّتِهَا)، (متاع و متعة) بریتیـە لـەوەی کـە دەدرێ بـە ئافـرەتی تەڵاقـدراو، تاکـو لـە مـاوەی عیددەکەیـدا لێـی بەهرەمەنـد بـێ.

(وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا): واتـە: دەسـتتان لـێ بـەردەدەم، بـە دەسـت لـێ بەردانێـکی جـوان، (التَّسْرِيحُ: الطَّلَاق).

(بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ): واتـە: گوناهێـکی ناقـۆڵای ئاشـکرا، (الفُحْشُ وَالفَحْشَاء وَالفَاحِشَةُ: مَا عَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ وَالأَقْوَال)، هـەر کام لـەم وشـانە بریتیـن لـەو کـردەوەو قسـانەی کـە ناشـیرینییەکەیان زۆر مـەزن بـێ، ئنجـا (فاحشـة مُبَيِّنـة) و (فاحشـة مُبَيَّنـة) بـە هـەردووك شـێوەکەی خوێنراوەتـەوە (مُبَيِّنـة) واتـە: دەرخـەر، ئاشـکراکەر، (مُبَيَّنـة) واتـە: ئاشـکراو ڕوون.

(ضِعْفَيْنِ): دوو قـات، (ضَعَفْـتُ الـشَّيءَ وَضَاعَفْتُـهُ: ضَمَمْـتُ إِلَيْـهِ مِثْلَـهُ فَصَاعِـداً)، (ضِعْفَـين: أي مثلين)، واتـە: وێنـەی خۆیـم خسـتە گـەڵ و زیاتریـش، مـەرج نیـە کـە دەگوترێ: (ضِعْفَـين) یـان (مِثْلَيْن) تەنیا دوو هێنـدە بێ، بـە ڕای هەنـدێ لـە زانایـان دەڵـێ: واتـە چەنـد بەرانبـەر، ئنجـا دوو بەرانبـەرە، سـێ بەرانبـەرە، چـوارە....

(يَقْنُتْ): (القُنُوتُ: لُزُومُ الطَّاعَةِ مَعَ الخُضُوعِ)، (قنوت): بریتیـە لـە پابەندیـی بـە گوێڕایەڵییـەوە، لەگـەڵ ملکەچیـی دا، واتـە: هـەم فەرمانەکـە جێبەجـێ بـکات، هـەم ملکەچیـش بـێ لـە دەروونـەوە.

(وَقَرْنَ): واتـە: نیشـتەجێ بـن، دەگوتـرێ: (قَـرَّ فِي الْمَـكَانِ يَقَـرُّ قَـرَاراً ثَبَـتَ ثُبُوتـاً جَامِـداً، وَأَصْلُـهُ مِـنَ القُـرِّ، وَهُـوَ الـبَرْدُ)، واتـە: چەسـپا لـە شـوێنی خـۆی دەچەسـپێ، چەسـپان، وەك شـتێکی وشـك، نەجـووڵاو چەسـپا، لـە ئەسـڵدا وشـەی (قَـرّ) لـە (قُـرّ) ەوە هاتـوە، کـە بـە مانـای (بَـرْد) سـەرما دێ، لەبـەر ئـەوەی کـە لـە حاڵـەتی سـەرمادا دروسـتکراوەکان زیاتـر دادەسـەکنێن و نیشـتەجێ دەبـن، لـە حاڵـەتی گەرمـادا زیاتـر دەکەونـە جموجـۆڵ.

(تَبَرَّجْنَ): (تَبَرَّجَـتِ المـرْأَةُ: تَشَـبَّهَت بالـبُرجِ «القَـصْر» فِي إِظْهَـارِ المَحَاسِـنِ)، (بُـرج) یـانی: کۆشـك، (تـبرُّج) خـۆی دەرخسـت، وەك قـەڵا، ئنجا ئافرەتیـش ئەگـەر جوانییەکانی خـۆی دەربخـات و ئاشـکرا بـکات، لـەوەوە هاتـوە.

(الرِّجْسَ): (الرِّجْـسُ: الـشَّيءُ القَـذِرُ، رَجُـلٌ رِجْـسٌ، وَرِجَـالٌ أَرْجَـاسٌ»، وَالرِّجْـسُ: شَرْعَـاً وَطَبْعَـاً وَعَقْـلاً وَثَلاَثَتُهُـم)، (رجـس) بریتیـە لـە شـتێکی پیـس و، دەگوتـرێ: (رَجُـلٌ رِجْسٌ)، پیاوێـکی پیـس و (رجـال أرجـاس) پیاوانێـکی پیـس، (رجـس)، واتـە: شـتێکی پیـس، چ لـە ڕووی شـەرعەوە پیـس بـێ، یاخـود لـە ڕووی سروشـتەوە مـرۆڤ پێـی پیـس بـێ، یاخـود بـە عەقـڵ دیـار بـێ، یاخـود بـە هەرسـێکیان و بـە هەرسـێ واتایەکـەی.

(أَهْلَ الْبَيْتِ): (أَهْـلُ الرَّجُـلِ: مَـنْ يَجْمَعُـهُ وَإِيَّاهُـم نَسَـبٌ أو دِيـنٌ، أو مَـا يَجْـرِي مَجْرَاهُـمَا)، ئەهـلی پیـاو ئەوەیـە کـە ئـەو و ئـەوان ڕەچەڵەکێـك یـان دینێـك، یاخـود شـتێکی وەك وان، پێکـەوە کۆیـان بکاتـەوە، (أَهْـلُ الرَّجُـلِ فِي الأَصْـلِ: مَـنْ يَجْمَعُـهُ وَإِيَّاهُـم مَسْـكَنٌ وَاحِـد)، ئەهـلی پیـاو لـە ئەسـڵدا ئـەو کەسـانەن کـە لـە یـەك ماڵـدا کۆببنـەوە.

وشـەی (أهـل البیت)یـش زیاتـر بـۆ خێزانـەکانی پێغەمبـەر ﷺ بەکارهێـنراوە و، (تأهَّـل) واتـە: (تـزوَّج) واتـە: ئەهـلی پەیـدا بـوو، هاوسـەری پەیـدا بـوو، (بیـت: أهـل البیـت: مَـأْوَى الإِنْسَـانِ باللَّيـلِ، بَـاتَ: أَقَـامَ باللَّيـلِ).

کەواتـە: (بیـت) ئـەو شـوێنەیە کـە مـرۆڤ شـەو پشـوویی تێـدا دەدات، (أهـل البیـت) واتـە: هاوسـەر، ژن، یاخـود ژنـەکان، بۆچـی؟ چونکـە ئـەوان زیاتـر لـە ماڵێـن و، ئـەوان زیاتـر لـەو ماڵـەدا پشـوو دەدەن، پیـاو بـای دەرێیـە، بـەڵام ئافـرەت بـە حوکمـی شـەرع و عەقـڵ و عـورف (شَرْعَـاً وَعَقْـلاً وَعُرْفَـاً) زیاتـر پەیوەسـتە بـە مـاڵ و حاڵـی خۆیـەوە، مەگـەر لـە خوارِسـك هەڵگەڕابێتـەوە و، پێشـبڕکێ لەگـەڵ پیـاودا بـکات کـە دەبـێ لـە هـەر شـوێنێك پیـاوی لێبـێ، ئافرەتیـشی لـێ بـێ! کـە ئـەوەش پێچەوانـەی سروشـتی خۆیـەتی، ئەگەرنـا لـە ئەسـڵدا ئافـرەت پێـی خۆشـە لـە ماڵـێ بـێ و، لـە ڕاسـتییدا نشـینگەی ئافـرەت زیاتـر ماڵـە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم دوو ئایەتە کە خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ٢٨ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا ٢٩﴾، لەو بارەوە چەند گێڕدراوەیەك هەن، دووانیان لێ دێنین: کە کتێبی (الإستیعاب في بیان الأسباب)[1] هێناونی، بەڵام لەبەر درێژیی دەقە عەرەبییەکەی گێڕراوە (راویة)ی یەکەمیان ناهێنین و، یەکسەر وەرگێڕراوە کوردییەکەی دێنین:

أ)- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازیبێ) دەڵێ: من سوور بووم، (لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: ساڵێك مامەوە) دەمەویست لە عومەر ﷺ، بپرسم، دەربارەی ئەو دوو

---

(١) ج٣، ص ٩٥ -٩٩، هەروەها بڕوانە: صحیح البخاري: ٢٤٦٨ و ٥١٩١ و، صحیح مسلم: ١٤٧٩ ٣١ -٣٤.

ئافرەتە لە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ کە خوا ﷻ پێیان دەفەرموێ: ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴿٤﴾ ﴾التحريم، واتە: ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، شتێکی باش دەکەن، چونکە دڵتان لایداوە، بەڵام نەمدەتوانی لێی بپرسم، لەبەر ئەوەی زۆر سامم لێی دەکرد، لە لام زۆر بە قەدر بوو، (لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: کاتێکی واو، شوێنێکی وام، دەست نەدەکەوت لێی بپرسم)، هەتا عومەر بۆ سەفەری حەج چوو، منیش لەگەڵیدا چووم بۆ حەج، کاتێك کە گەڕایەوە و، ئێمە لە هەندێ لە ڕێگایان، (لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: لە (ظهران) بووین)، عومەر ﷺ لایدابووە لای هەندێ لە درەختی ئەراك کارێکی هەبوو دەستی بە ئاو گەیاند، منیش لەگەڵی چووم و، ئاوێك کە تارەتی پێبگرێ، بۆیم برد، ئیدی عومەر ﷺ تارەتی گرت، منیش ڕاوەستام تاکو گەڕایەوە، کە گەڕایەوە گوتی: (أَدْرِكْنِي بالوَضُوء) ئاوی دەست نوێژم بۆ بێنە، منیش لەو دەفرەی ئاوی تێدا بوو بە دەستمداکرد دەست نوێژی گرت و، منیش لەو کاتەدا شوێن و کاتێکم دەستکەوت کە ئەو پرسیارەی ماوەیەکی زۆرە لە دڵمدایە لێی بکەم، گوتم: ئەی سەرکردەی بڕواداران! ئەو دوو ئافرەتانە لە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ کە خوا پێیان دەفەرموێ: ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٤﴾ ﴾التحريم، ئەو دووانە کێن؟ (عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ:) قسەکەم تەواو نەکرد بوو، عومەر ﷺ گوتی: ئای سەرسامیی لە تۆ ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس! (واتە: سەرسامیی لە تۆ کە تۆ گەنجێکی هێندە سووری بە دوای زانستدا دەگەڕێی زانستی ورد)، ئەو دووانە عائیشەو حەفصە بوون، منیش گوتم: سوێند بە خوا، ئەوە ماوەی ساڵێکە دەمەوێ ئەوەت لێ بپرسم، بەڵام نەمدەتوانی هەیبەتم لێ دەکردی، ئەویش گوتی: وامەکە، هەر شتێك تۆ پێت وابوو من زانیاریم لە لایە، لە بارەیەوە لێم بپرسە، ئنجا ئەگەر بیزانم، هەواڵت پێدەدەم، (عەبدوڵڵا) دەڵێ: دوایی عومەر گوتی: سوێند بە خوا ئێمە لەسەردەمی نەفامیدا هیچ شتێکمان بۆ ئافرەتان دانە دەنا، (واتە: هیچ مافێکمان بۆ دانە دەنان، بە هیچمان نەدەزانین)، هەتا خوا لە بارەیانەوە ئەوەی دایبەزاند دایبەزاند و، ئەوەی بۆی دیارییکردن لە پشك و بەش، بۆی دیارییکردن، (لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: کاتێك ئیسلام هات، خوا باسی کردن)، ئنجا زانییمان کە ئەوانیش مافیان لەسەر ئێمە هەیە، بەڵام پێمان وابوو کە بۆیان نیە دەست وەردەنە کاروباری ئێمە، (واتە: کاروباری پیاوان).

دوایی عومەر بەردەوام بوو لەسەر قسەكانی خۆی گوتی: من دراوسێیەكم هەبوو لە پشتیوانەكان لە (بني أمية بن زيد) كە لە باكووری شاری مەدینە بوون و، ئێمە بە نۆرە دادەبەزینە لای پێغەمبەر ﷺ، ئەو ڕۆژێك دادەبەزی، منیش ڕۆژێك، (واتە: ئەو ڕۆژەی یەكیان دابەزیوە، بۆ وێنە: عومەر دابەزیوە، ئەو مسوڵمانە پشتیوانە، كارو كەسابەتی كردوە، ئەو ڕۆژەش كە پشتیوانەكە دابەزیوە، عومەر خەریكی كارو كەسابەتی خۆی بووە، ڕۆژ نا ڕۆژێك تەرخانیان كردوە بۆ ئەوەی لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بن)، دەڵێ: ئەگەر من دابەزیبامایە هەواڵی ئەو ڕۆژەم بۆ دەهێنا و، لە ڕیوایەتێكدا دەڵێ: ئەگەر وەحیی، یان هەر شتێكی دیكە بووایە بۆم دەهێنا، ئەگەر ئەویش دابەزیبایە بە هەمان شێوە وایدەكرد و، ئێمە كۆمەڵی قورەیش زاڵ بووین بەسەر ئافرەتاندا، بەڵام كاتێك هاتینە لای پشتیوانەكان، تەماشامان كرد ئەوان ئافرەتان بەسەریاندا زاڵن و، ئافرەتانی ئێمەش لە ئەدەب و كلتووری ئافرەتانی پشتیوان فێربوون و وەریانگرت.

دەڵێ: ڕۆژێك من خەریكی كارێك بووم بیرم لێدەكردەوە، ژنەكەم گوتی: ئەگەر ئاواتكرد بایەو، ئاواتكرد بایە، دەڵێ: منیش بەسەریدا هاوارمكرد، گوتم: بۆچی قسەی وا دەكەی؟ ئەویش وەڵامی دامەوە و، منیش نكووڵییم لەوەكرد كە وەڵامم بداتەوە و، پێم گوت: تۆ چ پەیوەندییت بە كاری پیاوانەوە هەیە؟ بۆچی شتێك كە من دەمەوێ ئەنجامی بدەم، تۆ خۆتی تێ هەڵدەقورتێنی؟ ئەویش گوتی: ئنجا بۆچی نكووڵییم لێدەكەی، كە من وەڵامت بدەمەوە! (شەڕە قسەت لەگەڵدا بكەم)، سوێند بە خوا هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ قسە لە قسەیدا دەكەن و مشت و مڕی لەگەڵ دا دەكەن، جاری وایە یەكێكیان لە سەرەتای ڕۆژێ تاكو شەوێ نایدوێنێ.

لە ڕیوایەتێكدا دەڵێ: سەرسامیی بۆ تۆ ئەی كوڕی خەتتاب! دەتەوێ كەس قسە لە قسەتدا نەكات! كەچی كچەكەت قسە لە قسەی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەكات، هەتا ڕۆژەكەی هەمووی لێی تووڕە دەبێ، دەڵێ: كە وایگوت: ئەوە زۆر ترساندمی و، بە ژنەكەمم گوت: هەر كامێكیان كارێكی وابكات، ئەوە زۆر

پەشێمانییەکی مەزنی تووش دەبێت و گوناهێکی گەورە دەکات و لەسەری پەشێمان دەبێتەوە، دوایی خۆم پۆشتە کرد و، چوومە لای حەفصە، پێم گوت: ئایا یەکێک لە ئێوە ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ تووڕە دەکات، تاکو شەوێ؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، گوتم: هەر کەسێ وابکات ئەوە پەشێمانەو زیانبارە، ئایا تۆ دڵنیای،

لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: گوتم: کە خوا تووڕە ببێ لەسەر تووڕە بوونی پێغەمبەرەکەی ﷺ و بفەوتێی؟ دەڵێ: دوایی پێم گوت: ئەچی زۆر پێوەبچی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لەسەر شتێك زۆر قسەی لەگەڵ دابکەی، یاخود نەیدوێنی و قسەی لێببڕیەوە، هەر شتێکت پێویست بوو، لە من داوا بکە، (واتە: زۆر پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵمەپێچە)، بەوە فریو مەخۆ کە دراوسێیەکەت لە تۆ جوانترەو، لە تۆش لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویسترە.

لە ڕیوایەتێکدا گوتی: ئەو ئافرەتەی کە جوانییەکەی و خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی، لە خۆی بایی کردوە (کە مەبەستی عائیشەیە)، وەك ئەو مەکە، دوایی چوومە دەرێ هەتا چوومە لای (أم سلمة) لەبەر ئەوەی خزمایەتییم لەگەڵی هەبوو، قسەم لەگەڵدا کرد، (أم سلمة)ش گوتی: سەیرە ئەی کوڕی خەتتاب! تۆ دەست وەردەدەیە هەموو شتێك، هەتا دەتەوێ بێیە نێو کاروباری پێغەمبەرو ﷺ هاوسەرەکانیشی؟! دەڵێ: بە خوا کە (أم سلمة) بە توندیی وای پێگوتم، ئەو قسەیە گرمی و، هەندێك لەو تووڕەیی و شیددەتەی هەم بوو لێی شکاند، لەلای وی چوومە دەرەوە ((أم سلمة)م، بەجێهێشت)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەوروبەری هەمووی بۆ ڕێك بوو بوو (واتە: هاتبوونە نێو ئیسلام)، تەنیا پادشای غەسسان مابوو لە شام، ئێمە مەترسییمان هەبوو کە بەسەرمان دا بدات و، قسەمان دەکرد کە هۆزی غەسسان پێڵاویان دروستکردوون بۆ جەنگ لە دژی ئێمە و، سینەمان پڕبوو بوو لە ترس لەوان، (دیارە پادشا بووەو دەوڵەت و دەسەڵاتێکی هەبووە)، دەڵێ: ڕۆژێ هاوەڵە پشتیوانییەکەم لە نۆرەکەی خۆی چوو بوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتێك شەو گەڕایەوە وەختی نوێژی خەوتنان، زۆر بە توندیی لە دەرگای ماڵەکەمانی دا و، گوتی: خەوتووی؟

لە ڕیوایەتێکدا گوتی: عومەر لەوێیە؟ دەڵێ: منیش ترسام و ڕاچڵەکیم و چوومە دەرێ، گوتی: کارێکی مەزن ڕوویداوە، گوتم: چییە؟ غەسسان هاتوە؟! گوتی: نا، بەڵکو لەوە گەورەترو مەزنتر، لە ڕیوایەتێکدا گوتی: (أهول) بێزراتر، پێغەمبەری خوا ﷺ ژنەکانی تەڵاقداوە، لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: گوتی: کەناری لێگرتوون.

لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: گوتم کەواتە: حەفصە پەشێمانەو زیانبارە، من گومانم وابوو کە ئەوە ڕوودەدات، بۆیە خۆم پۆشتە کرد و چووم هەتا نوێژی بەیانییم لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ کرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنێکی هەبوو، ئاو و شتی تێدا دانرابوو، شوێنێکی پەنا بوو، بە پەیژۆکەیەکدا سەرکەوت، چەند قادرمەیەك بوو سەرکەوت و چوو بۆ ئەوێ، لەو شوێنەدا کەناری گرتبوو لە هاوسەرەکانی و نەدەچوو بۆ لایان، منیش چوومە لای حەفصە، تەماشامکرد حەفصە دەگریا، گوتم: چ شتێك دەتگریەنێ؟ ئایا من هۆشدارییم پێ نەدای! نەمترساندی؟ ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ تەڵاقی داون؟ گوتی: نازانم، ئەوە بۆ خۆی لەو بانیژۆکەیە دایە، دەڵێ: چوومە لای مینبەر تەماشامکرد: لەوێ کۆمەڵێکی لێبوون هەندێکیان دەگریان، منیش تۆزێ لەلایان دانیشتم، دوایی ئەو حاڵەتەی کە بۆم دروستبوو، بەسەرمدا زاڵبوو، هاتم بۆ لای ئەو شوێنەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێیبوو، ئەو خزمەتکارە ڕەشە کە لەسەری پەیژەکە وەستابوو، پێمگوت: مۆڵەت بۆ عومەر وەربگرە، ئەویش چووە ژوورێ و، قسەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا کرد، دوایی هاتە دەرێ گوتی: تۆم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، بەڵام بێ دەنگ بووە، منیش ڕۆیشتم، چووم بۆ لای ئەو کۆمەڵە خەڵکە کە لە لای مینبەرەکە بوون، بەڵام دووبارە حاڵەتەکە بەسەرمدا زاڵبوو هاتمەوە، دیسان بە غوڵامەکەم گوت، ئەویش دیسان بە هەمان شێوە باسیکردەوە کە بۆ پێغەمبەرم ﷺ باسکردوە، بەڵام بێ دەنگ بووە، دووبارە چوومەوە لای ئەو کۆمەڵە خەڵکەکەی لەلای مینبەرەکە دانیشتبوون، (دەکاتە جاری سێیەم) دووبارە ئەو حاڵەتە بەسەرمدا زاڵ بوو (ئەو خەم و خەفەتە)، دیسان هاتمەوە بە غوڵامەکەم گوت: دیسان مۆڵەتی بۆ عومەر وەرگرت، دیسان وەك جاری پێشێ باسیکرد کە بۆ پێغەمبەری

ﷺ باسکردوە، بەڵام بێ دەنگ بووە، کاتێك ڕۆیشتم و پشتم تێکرد، غوڵامەکە بانگی کردم گوتی: ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوی، ئیدی لە پێغەمبەری خوا ﷺ وە ژوور کەوتم، لەسەر حەسیرێکی شڕ ڕاکشا بوو، کە لە نێوان ئەوو حەسیرەکەدا هیچ شتی دیکە نەبوو، (قوماشێك دۆشەکێك شتێك)، حەسیرەکە شوێنکەی لەلا تەنیشتی کرد بوو، ئەویش پاڵیدا بۆوە لەسەر سەرینێك کە لە چەرم بوو و، نێواخنەکەشی پووشی دارخورما بوو، سەلامم لێکرد، دوایی کاتێك کە وەستا بووم، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئایا ئافرەتەکانت تەڵاقداوە؟ ئەویش سەری بۆ لا بەرزکردمەوەو فەرمووی: نەخێر، دەڵێ: منیش گوتم: (ألله أكبر) خوا گەورەترە، دوایی لە کاتێکدا کە ڕاوەستا بووم، ویستم زیاتر لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ هۆگریی دروست بکەمەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەگەر تێمەت بینیبایە ئێمەی کۆمەڵی قورەیش کە بەسەر ئافرەتانماندا زاڵبووین، کاتێ هاتینە مەدینە، ئافرەتەکانی مەدینە بەسەر پیاوانیان دا زاڵ دەبن، کە ئەوەم باسکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد، دوایی پێمگوت: ئەگەر منت بینیبایە کە چوومە لای حەفصەو پێم گوتوە: ئەوە فریوت نەدات کە دراوسێیەکەت لە تۆ جوانترەو، لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویسترە، (واتە: عائیشە)، لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: ئەوەم بۆ باسکرد کە لەگەڵ حەفصە و (أم سلمة)دا باسم کرد بوو و، ئەوەی کە (أم سلمة) وەڵامی دابوومەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکی دیکەش زەردەخەنەی کرد، ئنجا کاتێك کە بینیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەی کرد، دانیشتم، دوایی سەرم بەرزکردەوە، چاوم بەماڵەکەیدا گێڕا، بە خوا هیچ شتێکم نەبینی چاو بگێڕێتەوە، (بکەوێتە بەرچاو)، جگە لە سێ پێستە، لەلای دیکەیەوە پێستێکی دەباغکراو هەبوو، دەڵێ: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ داوا بکە، لە خوا کە ماڵ و سامان بۆ ئۆممەتت فراوان بکات، چونکە ئەها فارس و ڕۆم چۆن گوزەرانیان بۆ فراوانکراوە لە دنیادا ئەوەیان پێدراوە کە پێیاندراوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەندایەتیی بۆ خوا ناکەن، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە پاڵیدا بۆوە دانیشت، فەرمووی: (أو في

**شـك أنـت يـا ابـن الخطـاب! إن أولئـك قـوم عُجلِّـت لهـم طيباتهـم في الحيـاة الدنيـا)**، واتـە: ئـەی كـوڕی خەتتـاب! ئایا تـۆ دوو دڵـی؟ ئەوانـە كۆمەڵێكـن خۆشـییەكانی ژیـانی دنیایـان بـۆ پێشـخراون.

لـە ڕیوایەتێكـدا دەڵـێ: گریـام، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: چ شـتێك دەتگریەنـێ؟ گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! كیسـڕاو قەیسـەر (واتـە: پادشـای فـارس و ڕۆم) لـەو حاڵەتـەدان كـە تێیـدان، تـۆش پێغەمبـەری خـوای و ﷺ ئـەوەش وەزعەكەتـە! پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: **{أَمَـا تَـرْضَى أَنْ تَكُـونَ لَهُـمُ الدُّنْيَـا وَلَنَـا الآخِـرَةُ}**[1]، واتـە: ئایـا ڕازی نـابی كـە ئـەوان دنیایـان هەبـێ و، ئێمـەش دواڕۆژمـان هەبێ؟ دەڵێ: دوایـی گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ داوای لێبوردنـم بـۆ لـە خـوا بكـە، (واتـە: لـەو قسـەیەی كـە كـردم).

ئنجـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەبـەر ئـەو قسـەیەی حەفصـە بـڵاوی كردبـۆوەو بـە عائیشـەی گوتبـوو، بیسـت و نـۆ (٢٩) شـەو مایـەوە، كەنـاری لێگرتـن و، فەرمـوو بـووی: مـاوەی یـەك مانـگ ناچمـە لایـان، لەبـەر ئـەوەی زۆر لێیـان بـە گلەیـی بـووە، خـوا لـە سـووڕەتی (التحريـم)دا كـە لۆمـەی كـردوە كـە بۆچـی بـۆ ڕازییكـردنی هاوسـەرانت ئـاوا دەكـەی؟ كاتێـك كـە بیسـت و نـۆ شـەوەكە تێپەڕیـن، دەچـێ بـۆ لای عائیشـە لـەوەوە دەسـت پێـدەكات، عائیشـە خـوا لێـی ڕازیبـێ پێـی دەڵـێ: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ تـۆ سـوێندت خـوارد بـوو كـە مـاوەی مانگێـك نەیـەی بـۆ لامـان، ئێسـتا بیسـت و نـۆ (٢٩) شـەوە، مـن هەموویـم ژمـاردوە، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرمـووی: **(الشـهر تسـع و عـشرون، وكان هـذا الشـهر تسـعاً وعشريـن)** واتـە: مانـگ بیسـت و نـۆ شـەوە و، ئـەم مانگـە بیسـت و نـۆ شـەوە، عائیشـە دەڵـێ: دوایـی ئایـەتی سەرپشـككردن دابـەزی و لـە منـەوە دەسـتی پێكـرد، یەكەمیـن لـە ئافرەتـەكانی پێـی فەرمـووم:

**{إِنِّي ذَاكِـرٌ لَـكِ أَمْـرًا، فَـلاَ عَلَيْـكِ أَنْ لاَ تَعْجَـلِي حَتَّـى تَسْـتَأْمِرِي أَبَوَيْـكِ، قَالَـتْ: وَقَـدْ عَلِـمَ أَنَّ أَبَـوَيَّ لَـمْ يَكُونَـا يَأْمُـرَانِي بِفِرَاقِـهِ، قَالَـتْ، ثُـمَّ قَـالَ: إِنَّ اللـه جَـلَّ ثَنَـاؤُهُ قَـالَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا**

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٦٢٩)، ومسلم: ١٤٧٩، وابن ماجه: ٤١٥٣.

ﭐلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا ﴾، إلى ﴿أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾، قَالَتْ: فَقُلْتُ فَفِي أَيِّ هَذَا أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ؟ فَإِنِّي أُرِيدُ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ، قَالَتْ: ثُمَّ فَعَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَ مَا فَعَلْتُ)[1].

واتە: من شتێکت بۆ باس دەکەم بەڵام ئەگەر پەلە نەکەی باشترە، تاکو ڕاوێژ بە باب و دایکت دەکەی، عائیشە دەڵێ: دەیزانی کە باب و دایکم فەرمانم پێ ناکەن لێی جیاببمەوە دوایی فەرمووی: بێگومان خوا (جَلَّ ثَنَاؤُهُ) فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا ﴾، إلَى ﴿أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾، دەڵێ: گوتم: چۆن لەوەدا من ڕاوێژ بە باب و دایکم بکەم؟ من خواو پێغەمبەری ﷺ خواو مەنزڵگای کۆتاییم دەوێ، دەڵێ: دوایی پێغەمبەر ﷺ ئافرەتەکانی دیکەشی سەرپشککردو هەموویان وەك من چۆنم گوت، ئەوانیش وایان گوت.

ئنجا بەپێی ئەم ڕیوایەتە بێ، ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری توورە بووە، ئەوە بووە کە نهێنییەکەی لە لای حەفصە باسکردوەو ئەویش بۆ عائیشەی باسکردوە، عائیشەو حەفصە جۆرێك لە پشتگیریی یەکدییان کردوە، بە شێوەیەك کە بۆتە هۆی نیگەرانیی پێغەمبەر ﷺ و، خوای پەروەردگار لەسەر ئەوە سەرەتای سوورەتی (التحریم) دادەبەزێنێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَٰجِكَ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١﴾ ﴾، واتە: لەسەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ لێیان بە گلەیی دەبێ و، سوێند دەخوات کە ماوەی مانگێك نەچێ بۆ لایان، دوایی ئەو ئایەتەی سەرپشککردنی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ هاتۆتە خوار.

بەڵام ڕیوایەتێکی دیکە هەیە کە من ئەویانم لە لا پەسندە، دەگونجێ ئەوەش بووبێ، بەڵام ئەوەیان ڕاستەوخۆ پەیوەستە بەوەوە، کە ئەمیان دەقە عەرەبییەکەشی دێنم:

---

(١) أخرجه البخاري في: كتاب التفسير: سورة الأحزاب: باب قوله: إن كنتن تردن الله ورسوله والدار الآخرة.

ب)- {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما، قَالَ دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَوَجَدَ النَّاسَ جُلُوساً بِبَابِهِ لَمْ يُؤْذَنْ لأَحَدٍ مِنْهُمْ «قَالَ» فَأُذِنَ لأَبِي بَكْرٍ فَدَخَلَ، ثُمَّ أَقْبَلَ عُمَرُ فَاسْتَأْذَنَ، فَأُذِنَ لَهُ فَوَجَدَ النَّبِيَّ ﷺ جَالِساً حَوْلَهُ نِسَاؤُهُ وَاجِمًا سَاكِتاً «قَالَ» فَقَالَ لأَقُولَنَّ شَيْئًا أُضْحِكُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! لَوْ رَأَيْتَ بِنْتَ خَارِجَةَ، سَأَلَتْنِي النَّفَقَةَ، فَقُمْتُ إِلَيْهَا فَوَجَأْتُ عُنُقَهَا، فَضَحِكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَقَالَ: «هُنَّ حَوْلِي كَمَا تَرَى يَسْأَلْنَنِي النَّفَقَةَ»، فَقَامَ أَبُو بَكْرٍ إِلَى عَائِشَةَ يَجَأُ عُنُقَهَا، فَقَامَ عُمَرُ إِلَى حَفْصَةَ يَجَأُ عُنُقَهَا، كِلاَهُمَا يَقُولُ: تَسْأَلْنَ رَسُولَ اللهِ ﷺ مَا لَيْسَ عِنْدَهُ؟ فَقُلْنَ وَاللهِ لاَ نَسْأَلُ رَسُولَ اللهِ ﷺ شَيْئاً أَبَداً لَيْسَ عِنْدَهُ، ثُمَّ اعْتَزَلَهُنَّ شَهْرًا أَوْ تِسْعًا وَعِشْرِينَ، ثُمَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ ﴾، حَتَّى بَلَغَ: ﴿لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾﴾ قَالَ: فَبَدَأَ بِعَائِشَةَ، فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ! إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَعْرِضَ عَلَيْكِ أَمْرًا أُحِبُّ أَنْ لاَ تَعْجَلِي فِيهِ حَتَّى تَسْتَشِيرِي أَبَوَيْكِ»، قَالَتْ: وَمَا هُوَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَتَلاَ عَلَيْهَا الآيَةَ، قَالَتْ: أَفِيكَ يَا رَسُولَ اللهِ أَسْتَشِيرُ أَبَوَيَّ؟ بَلْ أَخْتَارُ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ، وَأَسْأَلُكَ أَنْ لاَ تُخْبِرَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِكَ بِالَّذِي قُلْتُ، قَالَ: «لاَ تَسْأَلُنِي امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ إِلاَّ أَخْبَرْتُهَا، إِنَّ اللهَ لَمْ يَبْعَثْنِي مُعَنِّتاً وَلاَ مُتَعَنِّتاً، وَلَكِنْ بَعَثَنِي مُعَلِّمًا مُيَسِّرًا»}[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازیبێ) دەڵێ ئەبوو بەکر ﷺ مۆڵەتی خواست لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە خەڵك لە دەرگاکەی دانیشتبوون، مۆڵەتی هیچ کامیان نەدرابوو، بەڵام مۆڵەت بە ئەبوو بەکر درا چووە ژوورێ، دوایی عومەر هات مۆڵەتی خواست، ئەویش مۆڵەتدراو چووە ژوورێ، تەماشای کرد پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتووەو هاوسەرەکانیشی لە دەورینی و پێغەمبەری خوا ﷺ مات و بێ دەنگە، جابیر دەڵێ، عومەر گوتی: دەبێ شتێك بڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ بهێنمە پێکەنین، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەگەر کچی خاریجەت بینیبایە (واتە: هاوسەرەکەی خۆی) داوای نەفەقەی لێکردم، (بۆی زیاد بکەم)، منیش هەڵسام و تۆزێك ملیم ئەزیەتدا، (ڕەنگە بە جۆرێك لە جۆرەکان ملی گرتبێ، دەستی گرتبێ، بەڵام تەعبیرەکە لە عورفی زمانی عەرەبییدا وایە، ڕەنگە دەستی گرتبێ زللەیەکی لێدابێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەوەی لە

(١) أخرجه مسلم، باب: بَيَانِ أَنَّ تَخْيِيرَ امْرَأَته لَا يَكُونُ طَلَاقًا إِلَّا بِالنِّيَّة، رقم: ٢٧٦٣.

عومـەر بیسـت، پێکـەنی، فەرمـووی: ئەوانـەش ئەوەتـان لـە دەورمـن داوا دەکـەن، نەفەقـەو خەرجییـان بـۆ زیـاد بکـەم، ئەبـوو بەکـر هەڵسـا کـە سـزای عائیشـە بـدات، عومەریـش هەڵسـا سـزای حەفصـە بـدات و، هەردووکیـان دەیانگـوت: شـتێك لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ داوا دەکـەن کـە نیـەتی؟ ئەوانیـش گوتیـان: سـوێند بـە خـوا هیـچ شـتێك لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ داوا ناکەیـن، کـە لـەلای نەبـێ، دوایـی پێغەمبـەر ﷺ مـاوەی مانگێـك، یاخـود بیسـت و نـۆ شـەو، کەنـاری گـرت لـە هاوسـەرەکانی، تاکـو ئـەو ئایەتـە بـۆ لای دابـەزی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ ﴾ هەتـا گەیشـتە: ﴿لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾﴾.

پێغەمبـەر ﷺ لـە عائیشـەوە دەسـتی پێکـرد گـوتی: ئـەی عائیشـە! مـن کارێکـت پێدەڵێـم، حـەز دەکـەم پەلـەی تێدا نەکـەی، تاکـو ڕاوێـژ بـە دایـك و بابـت دەکـەی، ئەویـش گـوتی: چ کارێکـە، ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ؟ ئەویـش ئایەتەکـەی بەسـەردا خوێنـدەوە، عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ئایـا لـە بـارەی تـۆوە ڕاوێـژ بـە دایـك و بابـم بکـەم! بەڵکـو مـن خـواو پێغەمبـەری خـواو ﷺ مەنزڵـگای کۆتایـی هەڵدەبژێـرم، بـەڵام داوات لێدەکـەم ئـەوەی مـن گوتوومـە، هـەواڵ بـە هیـچ کام لـە هاوسـەرەکانت نـەدەی، ئەویـش فەرمـووی: هیـچ کام لـە ئافرەتەکانـم لێـم ناپرسـێ، مەگـەر هەواڵـی پـێ دەدەم، چونکـە خـوا منـی نەنـاردوە کـە سـەغڵەتکەرو نارەحەتکەربـم، بەڵکـو منـی نـاردوە کـە فێرکـەرو ئاسـانکەربم.

هەڵبەتـە ئەمەیـان زیاتـر لەگـەڵ نێـوەڕۆکی ئایەتەکانـدا دەگونجـێ، دەشـگونجێ هۆکارەکـەی ئـەوە بووبـێ کـە لـە سـوورەتی (التحریـم)دا هاتـوە، بـەڵام لـە ئەنجامـی ئـەوەدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەو هەڵوێسـتەی نواندبـێ.

٢)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ﴿٣٣﴾﴾.

لەو بارەوە سێ ڕیوایەت هەن:

أ)- {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا فِي قَوْلِهِ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾﴾، قَالَ: نَزَلَتْ فِي نِسَاءِ النَّبِيِّ ﷺ خَاصَّةً}[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و باوکی ڕازیبێ) لە بارەی فەرمایشتی خواوە: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾﴾، دەڵێ: ئەوە بە تایبەت لە بارەی هاوسەرانی پێغەمبەرەوە ﷺ دابەزیوە.

ب)- {عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ -وكان في حجر النبيِّ ﷺ- قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾﴾، فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، فَدَعَا فَاطِمَةَ وَحَسَنًا وَحُسَيْنًا، فَجَلَّلَهُمْ بِكِسَاءٍ وَعَلِيٌّ خَلْفَ ظَهْرِهِ فَجَلَّلَهُ بِكِسَاءٍ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ هَؤُلَاءِ أَهْلُ بَيْتِي، فَأَذْهِبْ عَنْهُمْ الرِّجْسَ وَطَهِّرْهُمْ تَطْهِيرًا، قَالَتْ: أُمُّ سَلَمَةَ وَأَنَا مَعَهُمْ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ: أَنْتِ عَلَى مَكَانِكِ وَأَنْتِ عَلَى خَيْرٍ}[2].

واتە: عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە (کە لە ژێر سەرپەرشتیاریی پێغەمبەردا ﷺ بەخێو کراوە)، دەڵێ: کاتێک ئەم ئایەتە دابەزیە سەر پێغەمبەر ﷺ ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾﴾، لەماڵی ئوممو سەلەمە دابوو، بانگی فاتیمەو حەسەن و حوسێنی کرد و، بە پۆشاکێک دایپۆشین، عەلییش لە پشتیەوە بوو، ئەویشی خستە نێو پۆشاکەکەو دوایی فەرمووی: ئەی خوایە! ئەوانە بنەماڵەی منن، پیسییان لێ لابەرەو پاکیان بکەوە، ئوممو سەلەمە گوتی: منیش لەگەڵیاندام، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: تۆ لە شوێنی خۆت بە، بەڵام تۆ هەر بەرەو خێرو چاکەی.

---

(١) رواه ابن حاتم في تفسيره كما في تفسير القرآن العظيم: ج٣، ص٤١٩، وابن عساكر في تأريخ دمشق: (١١١/٧٣)، وابن مردويه كما في الدر المنثور: ج٦، ص٦٠٣، قلنا وهذا سند حسن، انظر: الإستيعاب: ج٣، ص١٠٤.

(٢) أخرجه الترمذي: ٣٢٠٥، قَالَ هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، و قال الشيخ الألباني: صحيح، قال مؤلفا، الإستيعاب في بيان الأسباب: وله شاهد آخر عن حديث عائشة عند مسلم بنحوه: ٢٤٢٤.

ج)- [عَنْ أَبِي عَمَّارٍ، قَالَ: إِنِّي لَجَالِسٌ عِنْدَ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ إِذْ ذَكَرُوا عَلِيًّا ﷺ، فَشَتَمُوهُ؛ فَلَمَّا قَامُوا، قَالَ: اجْلِسْ حَتَّى أُخْبِرَكَ عَنْ هَذَا الَّذِي شَتَمُوا، إِنِّي عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، إِذْ جَاءَهُ عَلِيٌّ وَفَاطِمَةُ وَحَسَنٌ وَحُسَيْنٌ، فَأَلْقَى عَلَيْهِمْ كِسَاءً لَهُ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ هَؤُلَاءِ أَهْلُ بَيْتِي، اللَّهُمَّ أَذْهِبْ عَنْهُمُ الرِّجْسَ وَطَهِّرْهُمْ تَطْهِيرًا»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ وَأَنَا؟ قَالَ: «وَأَنْتَ»، قَالَ: فَوَاللهِ إِنَّهَا لَأَوْثَقُ عَمَلِي عِنْدِي][1].

واتە: ئەبو عەممار دەڵێ: من دانیشتبووم لە لای (وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ) یەکێك لە هاوەڵان، لەو کۆڕو مەجلیسەدا باسی عەلییان کرد و قسەیان پێکوت، کاتێ هەڵسان، ئەبوو عەممار دەڵێ: (وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ) پێیکوتم: وەرە دانیشە، تاکو لە بارەی ئەو کەسەوە کە جنێویان پێدا، هەواڵت پێ بدەم: من لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، کە عەلی و فاتیمەو حەسەن و حوسێن هاتنە لای، پۆشاکێك کە پێی بوو بەسەریدادان، دوایی فەرمووی: ئەی خوایە! ئەوانە خێزانی منن، ئەی خوایە! پیسییان لێ لابەرەو پاکیان بکەوە بە پاککرانەوە، (وَاثِلَةَ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ منیش؟ فەرمووی: تۆش، دەڵێ: بە خوا ئەوە مەحکەمترین کردەوەیە لە لام.

(کە پێغەمبەر ﷺ منیشی لە ڕیزی بنەماڵەو خێزانی خۆیدا ئەژمارکردوە).

٣)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ ... ﴿٣٥﴾﴾، لەو بارەوەش ئەم گێڕدراوەیە هاتوە:

(عن أُمُّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ تَقُولُ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: مَا لَنَا لَا نُذْكَرُ فِي الْقُرْآنِ، كَمَا يُذْكَرُ الرِّجَالُ؟ قَالَتْ: فَلَمْ يَرُعْنِي ذَاتَ يَوْمٍ ظُهْرًا إِلَّا نِدَاؤُهُ عَلَى الْمِنْبَرِ، قَالَتْ: وَأَنَا أُسَرِّحُ رَأْسِي، فَلَفَفْتُ شَعْرِي، ثُمَّ خَرَجْتُ إِلَى حُجْرَةٍ بَيْتِي، فَجَعَلْتُ سَمْعِي عِنْدَ الْجَرِيدِ، فَإِذَا هُوَ يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللهَ يَقُولُ فِي كِتَابِهِ»: ﴿إِنَّ

---

(١) رواه أحمد: ٢٦٦٣٩، والطبراني في الكبير: ١٥٩، وأبو يعلى: ٧٠٢١، قال حسين سليم أسد: رجاله رجال الصحيح، تعليق شعيب الأرنؤوط على المسند: حديث صحيح.

ﭐﻟْﻤُﺴْﻠِﻤِﻴﻦَ وَﭐﻟْﻤُﺴْﻠِﻤَٰﺖِ وَﭐﻟْﻤُﺆْﻣِﻨِﻴﻦَ وَﭐﻟْﻤُﺆْﻣِﻨَٰﺖِ وَﭐﻟْﻘَٰﻨِﺘِﻴﻦَ وَﭐﻟْﻘَٰﻨِﺘَٰﺖِ ﴾، إلى قَوْلِهِ: ﴿ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾ ﴾[1].

واتە: ئوممو سەلەمە (خوا لێی ڕازیبێ) دەڵێ: ڕۆژێك بە پێغەمبەری خوام ﷺ گوت: ئەوە بۆچی ئێمە لە قورئاندا باس ناکرێین، وەك چۆن پیاوان باس دەکرێن؟ دەڵێ: ڕۆژێ لای نیوەڕۆ بوو، هەر ئەوەندەم زانی لەسەر مینبەر پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد، لەو کاتەدا من قژی خۆم دادەهێنا، یەکسەر سەری خۆم پێچا و، چوومە لای ژووری ماڵەکەم (کە ژوورەکەی دەرگاکەی بەسەر مزگەوتەوە بووە)، گوێی خۆم خستە سەر ئەو پووشی دارخورمایە کە دەرگاکەی پێگیرابوو، پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە! خوا لە کتێبەکەی خۆیدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ ﴾، تاکو دەگاتە: ﴿ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾ ﴾، واتە: پیاوانی مسوڵمان، ئافرەتانی مسوڵمان، پیاوانی بڕوادار، ئافرەتانی بڕوادار، تاکو کۆتایی خوا لێبوردنێك و پاداشتێکی مەزنی بۆ داناون.

کەواتە: پیاوان و ئافرەتان کە خاوەنی ئەو دە (١٠) سیفەتەن لە پاداشتداو، لەوەدا کە خوا لێیان دەبووریّ، یەکسانن.

---

(١) رواه النسائي في تفسيره: ٤٢٥، والطبراني في الكبير: ٦٥٠، والطبري في تفسيره: ٢٨٥٣٧، وقال الحافظ إبن حجر): هذا حديث حسن، هەردوو نووسەری (الإستيعاب) دەڵێن: (قلنا وهذا سند حسن) بەرگی (٣) لەپەڕە (١١٠).

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ بـۆ جـاری دووەم لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەدوێنـێ، کـە وەك گوتمـان خـوا لـەم سـوورەتەدا پێنـج جـاران دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، ئـەی پێغەمبـەر ﷺ! ئنجـا ئەمـە جـاری دووەمـە، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ ﴾، ئـەی پێغەمبـەر ﷺ! بـە هاوسـەرەکانت بفەرمـوو: ئەگـەر ئێـوە ژیـانی دنیاتـان دەوێ و، جوانیـی ژیـانی دنیاتـان دەوێ، وەرن یـەکی دیارییەکتـان پـێ بـدەم.

سـوننەتە کاتێـك مـرۆڤ دەسـت لـە هاوسـەرەکەی هەڵدەگـرێ، دیارییـەکی پـێ بـدات بـۆ دڵڕاگرتنـی، ﴿ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴾، ئنجـا بـە شـێوەیەکی جـوان دەسـتتان لـێ بـەردەم و دەسـت بەردارتـان ببـم، ئەگـەر جوانیـی ژیـانی دنیـا هەڵدەبژێـرن.

﴿ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴾، ئەگـەر ئێـوە خـواو پێغەمبەرەکەیتـان ﷺ دەوێ و، مەنزڵـگای کۆتاییتـان دەوێ، واتـە: ژیـانی بەهەشـت، ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا بـۆ ئەوانەتـان کـە چاکـەکارن، پاداشـتێکی مـەزنی دانـاوە.

ئـەم دوو ئایەتـە (آيتـا التخيير)یـان پـێ دەگوتـرێ: دوو ئایـەتی سەرپشـککردن، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە فەرمـانی خـوا، هاوسـەرە بەڕێـزەکانی سەرپشـك کـردن، بـژاردەی دایـە دەسـتیان، کـە ئایـا دەیانـەوێ لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ وەك هاوسـەر بمێننـەوە، بـەڵام بـەو ژیانـە سـادەیەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕازیـبن و، قەناعـەت بکـەن و خۆڕاگربـن لەسـەر ژیـانی سـادە؟ یاخـود ئەگـەر بـە تەمـای ژیانێـکی خۆشـگوزارانەن، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆی دابیـن ناکـرێ و، لـە خـۆی ناوەشـێنێتەوە، نـەك لەبـەر ئـەوەی توانـای ماددیـی نیـە، بەڵکـو لەبـەر ئـەوەی

نەیویستوە بە شێوەیەکی خۆشگوزەرانانە، ژیان بەرێتە سەر، ئەگەر خوازیاری ئەوەن، ئەوە بە لە باریی و بە شێوەیەکی جوان دەستبەردارتان دەبێت، ئەگەر نا مادام بە ژیانی زاهیدانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازیبن، خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵبژێرن بەسەر زرق و برقی ژیانی دنیادا، خوا بۆ چاکەکاران لە ئێوە پاداشتێکی مەزنی داناوە.

ئێمە لە هۆی هاتنە خوارەکەی دا باسمان کرد، کە لە ئەنجامی ئەو سەرپشککردنەی پێغەمبەردا ﷺ بۆ هاوسەرە بەڕێزەکانی، دایکانی بڕواداران خوا لێیان ڕازیبێ، هەموویان خواو پێغەمبەری خوا ﷺ و، ڕۆژی دواییان هەڵبژارد بەسەر ڕابواردنی ژیانی کەمی دنیاو، خۆشگوزەرانیی و، جوانیی ژیانیی دنیادا، بۆیە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ وەك دایكانی بڕواداران و هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، مانەوە.

پێشێ خوا ڕوویکردە پێغەمبەر ﷺ، ئنجا ڕوو دەکاتە هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازیبێ و دەفەرموێ: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ﴾، ئەی ئافرەتانی پێغەمبەر ﷺ! (کە بە تەئکید مەبەست پێی هاوسەرەکانیەتی)، هەر کامێك لە ئێوە گوناهێکی ناشیرین و لە سنوور بەدەری خۆ ئاشکراکەر، یاخود: (مُبيِّنة) ئاشکراو ڕوون بکات، ﴿يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِ﴾، سزای بۆ دووقات دەکرێتەوە، واتە: چەند بەرانبەر سزا دەدرێ، مەرج نیە بەس دوو بەرانبەر بێ، وەك هەندێ لە زانایان گوتوویانە: (ضِعْفَين) واتە: چەند بەرانبەر دەکرێتەوە، ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا﴾، ئەوەش لەسەر خوا ئاسانە.

لێرەدا مەبەست لە (فاحشةٍ مُبيِّنة)، یان (فاحشة مُبيَّنة) بە (إسم فاعل) یان بە (إسم مفعول) (مُبيِّنة) واتە: ئاشکراکەر، (مُبيَّنة) واتە: ڕوون و ئاشکرا، کە مەبەست پێی یاخیبوونی ژنە لە مێردو، دەمەوەربوونیەتی و، بێزارکردنی مێردەکەیەتی، ئەگەرنا مەبەست پێی زینا نیە، بەڵکو وشەی (فَاحِشَة) ئەگەر

بـە تەنیـا بـێ، مەبەسـت پێـی زینایـە، بـەڵام (فاحشـة مُبيِّنـة) یـان (مُبيِّنـة) واتـە: گوناهێـکی ناشـیرینی لـە سـنوور بـەدەری خـۆ ئاشـکراکەر، یاخـود ئاشـکرا، مەبەسـت پێـی یاخیبـوونی ژنـە لـە مێردەکـەی، یاخـود نـاکارو ڕەفتـار خراپیـەتی، بـە شـێوەیەکی وا کـە بێـزاری بـکات.

﴿وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، هەریـەك لـە ئێـوەش ملکـەچ بـێ بـۆ خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ، ﴿وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا﴾، کـردەوەی باشـیش بـکات، ﴿نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ﴾، پاداشـتەکەی دوو جـاران دەدەینـەوە، دوو کەڕەتـان پاداشـتەکەی دەدەینـەوە، دوو بەرانبـەر، یـان چەنـد بەرانبـەری دەکەینـەوە، ﴿وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا﴾، بژیوێـکی پـڕ ڕێـزو حورمـەت، یاخـود بژیوێـکی زۆر پەسـندو چاکیشـمان بـۆ ئامـادە کـردوە.

ئنجـا بـە بەڵگـەی بەراوردپێکـردنی (فاحشـة مُبيِّنـة) لەگـەڵ ﴿وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾دا، ئەمـە بەڵگەیـەکی زۆر پتـەوە لەسـەر ئـەوە کـە (فاحشـة مُبيِّنـة) بـە مانـای یاخیبـوونی ژن لـە مێـردە، چونکـە بەچـی بـەراوردی پێکـراوە؟ بـە ملکـەچ بـوون بـۆ مێـرد، بـە قسـەکردنی مێـرد، کەواتـە: هـەر کەسـێ لـە ئێـوە ملکـەچ بـێ بـۆ خـوا و پێغەمبەرەکـەی ﷺ، لـە بەرانبەریشـدا، یاخیبوونـە لـە پێغەمبـەر ﷺ و ڕەفتـار خراپیـە لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ.

جارێـکی دیکـەش خـوا ﷻ بانگـی هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ دەکات: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ﴾، ئـەی ئافرەتـانی پێغەمبـەر ﷺ! ﴿لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ۚ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ﴾، ئەگـەر پارێـز بکـەن، وەك هیـچ کام لـە ئافرەتـان نیـن، واتـە: پێگـەو پلـەی ئێـوە و، ڕێـز و حورمـەتی ئێـوە، وەك هـی هیـچ کام لـە ئافرەتـانی دیکـە نیـە، وەك ئافرەتـانی ئاسـایی تەماشـای خۆتـان مەکـەن، ﴿فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ﴾، قسـەی نـەرم و ناسـك مەکـەن، قسـەی وا مەکـەن کـە قسـەکە بـە لای نـەرم و ناسـکیی و بـە لای ئـەوەدا بچـێ کـە نەرمیـی نوانـدن بـێ لـە بەرانبـەر پیاوانـدا، قسـەی وا مەکـەن، ﴿فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ﴾، کـە سـەرەنجام ئـەو کەسـەی نەخۆشـیی لـە دڵیـدا

هەیە، تەماع بکات، ﴿ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴾، مانای وا نیە هیچ قسە مەکەن: قسە بکەن، بەڵام قسەی پەسند و باش بکەن.

دوایی جارێکی دیکە خوا ﷻ بە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ ﴾، لە ماڵەکانی خۆشتاندا نیشتەجێبن، واتە: لەوێدا سەقامگیربن، زیاتر با شوێنی مانەوەتان ماڵەکانی خۆتان بێ، ﴿ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ ﴾، واتە: ئەگەر چوونە دەر لە ماڵ، وەك خۆ دەرخستنی نەفامیی یەکەم، خۆتان دەرمەخەن، دیارە لە ماڵێدا ئافرەت هەر پۆشاکێك لەبەر بکات بۆ مێردەکەی، هیچ سەغڵەتیی لەسەر نیە، واتە: زیاتر لە ماڵێ نیشتەجێ بن و، ئەگەر چوونە دەرێش بۆ کارو نیشێك، بۆ ئەنجامدانی یەکێك لە دروشمەکانی خواپەرستیی، بۆ وێنە: نوێژی جومعە، یان نوێژی بە کۆمەڵ، یان نوێژی جەژنەکان، یان نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران، یان نوێژی داواکردنی باران، یان هەر بۆنەیەکی دیکە، یاخود بۆ کارێکی دنیایی چوونەدەر، جوانیی خۆتان دەرمەخەن، وەك خۆ دەرخستنی نەفامیی یەکەم، کە ئافرەتان جوانیی خۆیان بۆ پیاوان دەردەخست، ﴿ وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ ﴾، نوێژ بەرپا بکەن و زەکات بدەن، ﴿ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﴾، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەشی بکەن.

﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ ﴾، بە دڵنیایی خوا دەیەوێ پیسییتان لێ لابەرێ، ئەی خاوەنانی ماڵ! واتە: خاوەنانی ماڵی پێغەمبەر ﷺ کە مەبەست پێی هاوسەرانی پێغەمبەرە ﷺ، ئەی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر! ﷺ کە لە ماڵی ئەودان، خوا بەو فەرمانانەی دەیەوێ پیسییتان لێ لابەرێ، پیسیی گوناهو تاوان، ﴿ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾، هەروەها پاکتان بکاتەوە، بە پاککردنەوەیەکی ناوازە.

﴿ وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ ﴾، یادی ئەو ئایەتانەی خوا و ئەو حیکمەتەش بکەن، کە لە ماڵتاندا دەخوێنرێتەوە، کە

دیارە قورئانەو هەم ئایەتەکانی خوایە و، هەم دانایی و پێکانی هەق و ڕاستیی تێدایە، لە قورئاندا، ئەوە بخوێننەوە، یاخود یادی بکەنەوە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا﴾، بە دڵنیایی خوا زۆر پەنهانزانی شارەزایە.

لە کۆتاییدا خوا بەراوردێك دەکات لە نێوان پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕواداردا، بە دە (١٠) لە سیفەتەکانیان، دوایی ڕایدەگەیەنێ کە ئەوانەی خاوەنی ئەو دە (١٠) سیفەتەن، خوا لێبوردن و پاداشتێکی مەزنی بۆ داناون، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ﴾، واتە: بە دڵنیایی پیاوانی بۆ خوا ملکەچ و، ئافرەتانی بۆ خوا ملکەچ، ﴿وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾، پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار، ﴿وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ﴾، پیاوانی گوێڕایەڵ بۆ خواو، ئافرەتانی گوێڕایەڵ بۆ خوا، ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ﴾، پیاوانی ڕاست و ئافرەتانی ڕاست، ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ﴾، پیاوانی خۆڕاگر و پشوو درێژ و، ئافرەتانی پشوو درێژو خۆڕاگر، ﴿وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ﴾، پیاوانی بە ترس و لەرزو بۆ خواو ملکەچ و، ئافرەتانی بە ترس و لەرزو بۆ خوا و ملکەچ، ﴿وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ﴾، پیاوانی ماڵ بەخشەرو، ئافرەتانی ماڵ بەخشەر، ﴿وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ﴾، پیاوانی ڕۆژووگرو ئافرەتانی ڕۆژووگر، ﴿وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ﴾، پیاوانی پارێزەری داوێنی خۆیان و، ئافرەتانی پارێزەری داوێنی خۆیان، لە گوناهو حەرام، ﴿وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ﴾، پیاوانی زۆر خوا لە یادو، ئافرەتانی زۆر خوا لە یادو خوا یادکەر، ئا ئەوانە: ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾، خوا لێبوردنێکی تایبەت و پاداشتێکی مەزنی بۆ ئامادە کردوون.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کە هاوسەرەکانی سەرپشك بکات، لە نێوان هەڵبژاردنی ژیانی دنیا و، دەست لێ بەردانی بۆیان و، هەڵبژاردنی خواو پێغەمبەرو ﷺ مەنزڵگای کۆتایی دا:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٢٩﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

**١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، ئەمە جاری دووەمە لەم سوورەتەدا، خوا پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ، ئەی پێغەمبەر! ﷺ.**

**٢)- ﴿ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ ﴾، بە هاوسەرەکانت بڵێ، واتە: ئەو هاوسەرانەی کە ئێستا لە ژێر نیکاحتدان، لە چوارچێوەی ماڵی پێغەمبەردان ﷺ، کە ئەو کاتە نۆ (٩) ئافرەت بوون، نۆ هاوسەربوون، کە ئەمانەن: (سودة بنت زمعة، عائشة بنت أبي بكر، حفصة بنت عمر، أم سلمة، أم حبيبة، زينب بنت جحش، جويرية بنت الحارث، صفية بنت حُيي بنتِ أخطب، ميمونة بنت الحارث)[1]، پێغەمبەری خوا ﷺ چی بە هاوسەرەکانی بفەرمووێ؟**

**٣)- ﴿ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا ﴾، ئەگەر ئێوە ژیانی دنیاو، جوانیی دنیاتان دەوێ!**

---

(١) جامع البيان رقم: ٢٨٤٨٦.

٤)- ﴿ فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴾، وەرن، دیارییتان بدەمێ و بە وازلێهێنانێکی جوان دەستبەردارتان بم.

(أُمَتِّعْكُنَّ) واتە: (أُعْطِيكُنَّ مُتْعَةَ الطَّلاقِ)، وەك (الطبري) دەڵێ: دیاریی دەست لێك بەردانتان پێ بدەم، کە لە سوورەتی (البقرة)دا خوا ﷻ باسی (مُتْعَة الطلاق) ی کردوە، دەفەرموێ: ﴿ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلْمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلْمُقْتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعًۢا بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٣٦﴾ ﴾البقرة، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ ﴾البقرة، واتە: ئەگەر ئافرەتانتان وازلێ هێنان (دەست پێشخەریی لە پیاو بوو، وازی لە ئافرەت هێناو تەڵاقی دا)، دیارییان پێ بدەن، ئەو کەسەی توانای زیاترە بە پێی خۆی، ئەو کەسەش کە توانای کەمە، بە پێی خۆی، دیاریی پێدانێکی پەسند، ئەوە لەسەر چاکەکاران پێویستە.

لە ئایەتەکەی دیکەدا دەفەرموێ: لەسەر پارێزکاران پێویستە، کەواتە: (أمتعكن) واتە: سەرو دیارییتان پێ بدەم، ئەندازەیەك لە ماڵ و سامان، بۆ ئەوەی ئەو ئافرەتە لە ماوەی جیابوونەوەی لە مێردەکەیدا، کە دەبێ عیددە بشوات، سێ مانگ، یان سێ حەیز، یان ئەگەر تۆلدار بێ، تاکو حەملەکەی دادەنێ، بەو ئەندازە ماڵ و سامانە، کە لەلایەن مێردەکەیەوە پێیدراوە، کە دەستی لێی بەرداوە، مەداری پێ بکات، تاکو پێویستیی بە خەڵك نەبێ، تاکو دەرفەتی دەبێ شوو دەکاتەوە، یاخود دەچێتەوە ماڵی بابی، یان بە شێوەیەك لە شێوەکان، ژیانی خۆی دابین دەکات.

﴿ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴾، (الطبري) ئەم ئایەتەی ئاوا تەفسیرکردوە: (وَأُطَلِّقْكُنَّ عَلَى مَا أَذِنَ اللهُ بِهِ، وَأَدَّبَ بِهِ عِبَادَهُ)، وازتان لێ بێنم بەو شێوەیەی کە خوا مۆڵەتی داوە و، بەو شێوەیە کە خوا بەندەکانی خۆی پێ ئەدەب داداوەو پێ پەروەردە کردوە، ئەوە لە حاڵێکدا، کە ژیانی دنیاو جوانیی ژیانی دنیایان بوێ.

٥)- ﴿ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴾، بەڵام ئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرەکەیتان ﷺ دەوێ و مەنزڵگای کۆتاییتان دەوێ.

٦)- ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾، بە دڵنیایی خوا بۆ ئەوانەتان کە چاکەکارن، پاداشتێکی مەزنی داناوە، ئەوانەی چاکەکارن کێن؟ (الطبري) دەڵێ: (وَهُنَّ الْعَامِلَاتُ مِنْهُنَّ بِأَمْرِ اللهِ وَأَمْرِ رَسُولِهِ)، ئەوانەن کە کار دەکەن بە فەرمانی خواو فەرمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ.

ئەمە پێویستە تۆزێك تیشکی زیاتری بخەینە سەر، با سەرەتا ئەم دەقە بێنین:

(قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: لَمَّا نَزَلَ الْخِيَارُ، قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَذْكُرَ لَكِ أَمْرًا، فَلَا تَقْضِي فِيهِ شَيْئًا حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ»، قَالَتْ: قُلْتُ: وَمَا هُوَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: فَرَدَّهُ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: مَا هُوَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: فَقَرَأَ عَلَيْهِنَّ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا ﴾ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ؛ قَالَتْ: قُلْتُ: بَلْ نَخْتَارُ اللهَ وَرَسُولَهُ؛ قَالَتْ: فَفَرِحَ بِذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ)[1].

واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازیبێ، دەڵێ: کاتێك کە سەرپشککردن دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ پێیگوتم: من دەمەوێ شتێکت بۆ باس بکەم، تۆ هیچ بڕیار مەدە، هەتا ڕاوێژ بە دایك و بابت نەکەی، عائیشە (خوا لێی ڕازیبێ) دەڵێ: گوتم: ئەو کارە چییە! کە بۆم باس دەکەی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ دوایی جارێکی دیکە دیسان پێغەمبەر ﷺ بۆی دووبارە کردەوە، (فەرمووی: کارێکت بۆ باس دەکەم، هەتا ڕاوێژ بە باب و دایکت نەکەی، هیچ بڕیارێك مەدە)، دووبارە دایکمان عائیشە گوتی: ئەو کارە چییە! ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دوو ئایەتەی بەسەردا خوێندنەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾، دەڵێ: منیش گوتم: بەڵکو ئێمە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ هەڵدەبژێرین، پێغەمبەریش ﷺ بەوە زۆر دڵخۆش بوو.

---

(١) رواه الطبري في تفسيره: ٢٨٤٩٠، وأحمد في المسند: ج ٦، ص٧٧و ١٥٢، والبخاري: ٤٧٨٥، ومسلم: ١٤٧٥.

هەڵبەتە لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە کە دایکمان عائیشە دەڵێ: خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەبژێرم و، لەو شتەدا پێویست ناکات ڕاوێژ بە دایك و بابم بکەم، دوایی پێغەمبەر ﷺ دڵخۆش دەبێ، بەڵام دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەو ڕایەی من بە هاوسەرەکانی دیکەت مەڵێ، پێغەمبەریش دەفەرموێ ﷺ: خوا منی نەناردوە بە توندوتیژیی و شت قورسکەربم لەسەر خەڵك، بەڵکو منی بە ڕەحمەت و نەرم و نیانیی ناردوە، هەرکامێکیان لێم بپرسێ، دەڵێم: عائیشە ئەوەی هەڵبژاردوە.

لێردا قسەیەکی (الشوكاني) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دێنم، کە پوختەی ڕای توێژەرەوانی قورئان دێنێ، دەڵێ:

(قَالَ الْمُفَسِّرُونَ: إِنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ سَأَلْنَهُ شَيْئاً مِنْ عَرَضِ الدُّنْيَا، وَطَلَبْنَ مِنْهُ الزِّيَادَةَ فِي النَّفَقَةِ، وَآذَيْنَهُ بِغَيْرَةِ بَعْضِهِنَّ عَلَى بَعْضٍ، فَآلَى رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْهُنَّ شَهْراً، وَأَنْزَلَ اللهُ هَذِهِ الآيَةَ، وَكُنَّ يَوْمَئِذٍ تِسْعاً: عَائِشَةُ، وَحَفْصَةُ، وأمُّ سَلَمَةَ، وأمُّ حَبِيبَةَ، وسودة، هَؤُلاَءِ مِنْ نِسَاءِ قُرَيْشٍ، وَصَفِيَّةُ الْخَيْبَرِيَّةُ، وَمَيْمُونَةُ الْهِلاَلِيَّةُ، وَزَيْنَبُ بِنْتُ جَحْشٍ الأَسَدِيَّةُ، وَجُوَيْرِيَّةُ بِنْتُ الْحَارِثِ الْمُصْطَلَقِيَّةُ).

واتە: مانا لێکدەرەوانی قورئان گوتوویانە: هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ شتێکیان لە ژیانی دنیا لە پێغەمبەری خوا ﷺ داواکردوە و، داوایان لێکرد کە نەفەقە و بژیویان بۆ زیاد بکات، (وەك خەڵکی دیکە بژین)، بە هۆی ئەوەوەش کە هەندێکیان غەیرەیان هەبوو، [هەستی هەوێدارییان هەبوو] بەرانبەر بە هەندێکیان، پێغەمبەریان ئەزیەتدا، پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی لێ خواردن، بۆ ماوەی مانگێك لێیان کەنار بگرێ و، خواش ﷻ ئەم ئایەتەی سەرپشککردنی ناردە خوار، کە ئەو کاتە نۆ هاوسەر بوون، لە ماڵی پێغەمبەردا ﷺ: (عَائِشَةُ، وَحَفْصَةُ، وأمُّ سَلَمَةَ، وأمُّ حَبِيبَةَ، وسودة (ئەمانە لە ئافرەتانی قورەیش)، وَصَفِيَّةُ (ی خەیبەریی)، وَمَيْمُونَةُ (ی هیلالیی)، وَزَيْنَبُ بِنْتُ جَحْشٍ (ی ئەسەدیی)، وَجُوَيْرِيَّةُ بِنْتُ الْحَارِثِ (ی موصطەلەقیی)).

---

(١) فتح القدير: ج٤، ص٣٢٣.

لە بارەی ئەوەوە کە ئایا پێغەمبەر ﷺ چۆن سەرپشکی کردوون؟ دوو ڕا هەن:

(الْقَوْلُ الأَوَّلُ أَنَّهُ خَيَّرَهُنَّ بِإِذْنِ اللهِ فِي الْبَقَاءِ عَلَى الزَّوْجِيَّةِ، أَوِ الطَّلَاقِ فَاخْتَرْنَ الْبَقَاءَ، وَالْقَوْلُ الثَّانِي: أَنَّهُ إِنَّمَا خَيَّرَهُنَّ بَيْنَ الدُّنْيَا، فَيُفَارِقُهُنَّ، وَبَيْنَ الآخِرَةِ، فَيُمْسِكُهُنَّ، وَلَمْ يُخَيِّرْهُنَّ فِي الطَّلَاقِ، وَالرَّاجِحُ الأَوَّلُ)[1].

ڕای یەکەم: دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەر پشکی کردن لە نێوان مانەوەدا، وەك هاوسەر لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ، یاخود تەڵاق دانیان، ئەوانیش مانەوەیان هەڵبژارد.

ڕای دووەم: دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەرپشکی کردن، لە نێوان ژیانی دنیادا، کە دەستیان لێ هەڵبگرێ، (هەڵبژاردنی ژیانی دنیاو جوانیی دنیا)، یاخود مەنزڵگای کۆتایی هەڵبژێرن و بیانهێڵێتەوە، لە لای خۆی، ئەوانیش مەنزڵگای کۆتاییان هەڵبژاردوە، بەڵام ڕای یەکەم بەهێزترە.

لەو بارەوە ئەم دەقەش لە دایکمان عائیشەوە دەهێنن، (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: خَيَّرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَاخْتَرْنَاهُ، فَلَمْ يَعُدَّهُ طَلَاقًا)(أخرجه البخاري: ٥٢٦٣، ومسلم: ١٤٧٧).

واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی سەرپشك کرد (لە نێوان مانەوە لەگەڵیدا وەك هاوسەر و، ڕازیبوون بەو شێوە ژیانە سادەیەی کە دەژیا، یاخود جیابوونەوەو هەڵبژاردنی زرق و برقی دنیا)، ئێمەش پێغەمبەری خوامان ﷺ هەڵبژارد (و شێوە ژیانە سادەکەیمان هەڵبژارد)، بۆیە ئەوەی بە تەڵاق لە قەڵەم نەدا.

---

(١) فتح القدير: ج٤، ص٣١٧.

**مەسەلەی دووەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە هەر کام لە هاوسەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ یاخیی و ئاکار خراپ بێ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، سزای بۆ دوو قات دەکرێتەوە و، هەر کەسێکیش ملکەچ و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بێ ﷺ و، کرداری باش بێ، پاداشتی دوو قاتە، یان چەند بەرانبەرە لە قیامەتدا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿٣٠﴾ وَمَن يَقۡنُتۡ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا نُّؤۡتِهَآ أَجۡرَهَا مَرَّتَيۡنِ وَأَعۡتَدۡنَا لَهَا رِزۡقٗا كَرِيمٗا ﴿٣١﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ﴾، ئەی ئافرەتانی پێغەمبەر ﷺ! کە وەك گوتمان: ئەم بانگکردنە بۆ هەر کام لەو نۆ (٩) هاوسەرەی پێغەمبەرە ﷺ، بۆ هەر کامیان تاك بە تاك و، بۆ هەمووشیان بە کۆ.

٢)- ﴿مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ﴾، هەر کامێك لە ئێوە گوناهێکی خۆ ئاشکراکەر بکات، گوناهێکی ناقۆڵا، (مُبَيِّنَة) خوێنراویشتەوە: (مبيَّنة)، هەر کامێك لە ئێوە گوناهێکی ناقۆڵای ئاشکرا بکات، هەڵبەتە (مَنْ يَأْتِ) خوێنراویشەتەوە: (مَن تَأتِ مِنكُنَّ)، (مُبَيِّنَة: قُبْحها بنفسها)، هەر کامێك لە ئێوە گوناهێکی ناقۆڵاو بزێو و ناشیرینی خۆ ئاشکرا کەر بکات، بەڵام ئەگەر بخوێندرێتەوە: (فَاحِشَة مُبيَّنة) واتە: هەر کامێك لە ئێوە گوناهێکی ناقۆڵا و ناشیرینی ئاشکرا بکات، (مُبَيَّنة: بَيَّنَ الشَّرْعُ وَالعَقْلُ قُبْحَهَا)، عەقڵ و شەرع ناشیرینییەکەیان دزێوییەکەیان ئاشکرا کردوە، هەر کام لە ئێوە وابکات.

٣)- ﴿يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِ﴾، سزا و ئازاری بۆ دوو قات دەکرێتەوە، خوێنراویشەتەوە: (يُضَعَّفْ لهُ العَذَاب)، کە هەریەك واتایان هەیە.

٤)- ﴿ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴾، ئەوەش لەسەر خوا ئاسانە، واتە: پەرچ و ڕێگرییەك نیە لەبەردەم خوادا، كە سزا بۆ ئێوە دووقات، یان چەند قات و چەند بەرانبەر بكاتەوە، لەسەر ئەوە كە گوناهێكی ناقۆڵای ئاشكراكەر، یان ڕوون و ئاشكرا ئەنجام دەدات، كە مەبەست پێی یاخیی بوونە لە پێغەمبەر ﷺ و، بێزاركردنیەتی و، ئاكار خراپ بوون لە خزمەتیدا.

٥)- ﴿ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾، هەر كامێك لە ئێوەش ملكەچ بێ بۆ خوا و، بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ، (**القُنُوتُ: الطَّاعَةِ مَعَ الخُضُوعِ**)، (قنوت): بریتیە لە گوێڕایەڵیی لەگەڵ ملكەچیی و، شەرم لێكردن و سام لێكردن.

٦)- ﴿ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا ﴾، كردەوەی چاكیش بكات، خوێندراویشەتەوە: (**ويَعمَلْ صَالِحًا**): كە هەر یەك واتایان هەیە.

٧)- ﴿ نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ ﴾، ئەوە پاداشتەكەی دوو جاران دەدەینەوە، (**مثلي ثَوَابِ عمل غيرهنَّ مِنَ النساء**)، دوو بەرانبەری پاداشتی ئافرەتانی دیكەی دەدەینەوە.

٨)- ﴿ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ﴾، بژیوێكی خۆش و پەسند، یاخود پڕ ڕێزو حورمەتمان بۆ ئامادە كردوە، (**الكَرِيْمُ: الجَيِّدُ مِنْ نَوْعِهِ**)، (كَريم) بریتیە لە پەسندو چاك لە جۆری خۆی، هەروەها (كریم) بە مانای بەڕێزو پەسندیش دێ ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾یوسف.

## کورتە باسێک لە بارەی
## چەمک و واتای: (فَاحِشَة مُبَيِّنَة)ەوە

شایانی باسە: ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (النساء)دا، کە بەرگی سێی ئەم تەفسیرەیە، هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (النور)یشدا لە بارەی (فاحشة مبيِّنة)وە، قسەمان کردوە، بەلام لێرەش بە کورتیی دووبارەی دەکەینەوە، ڕەنگە هەندێ شتی تازەش بڵێین، کە لەوێ نەمانگوتبێ، ئەویش لە سێ بڕگەدا:

**بڕگەی یەکەم:** وشەی (فَاحشة مُبَيَّنَة)، یان (فَاحِشة مُبَيِّنة) کە بە هەردوو جۆر خوێنراوەتەوە، تەنیا لە سێ شوێنی قورئاندا هاتوە:

أ)- خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًاۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ ﴾النساء، کە کاتی خۆی تەفسیرمان کردوە.

ب)- هەروەها خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ ﴾الأحزاب.

ج)- دیسان خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمْۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥۚ لَا تَدْرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴿١﴾ ﴾الطلاق.

**بڕگەی دووەم:** بە سەرنج دانی وردیش لەم سێ ئایەتە، زۆر بە دڵنیاییەوە بۆمان دەردەکەوێ کە:

ناگونجێ لە هیچ کامیاندا وشەی (فَاحِشَة مُبَيِّنَة) بە مانای زینا بێ، کە بەداخەوە زۆربەی هەرە زۆری ڕوونکەرەوانی قورئان و مانا لێدەرەوانی قورئان، وایان مانا کردوە، بەڵکو مەبەست لە (فَاحِشَة مُبَيِّنَة، مبيِّنة) وەك هەندێك لە ڕوونکەرەوانی واتاکانی قورئان گوتوویانە: (النشوز وسوء الخلق) بریتیە لە یاخیی بوون و، بەد ڕەفتاریی و ئاکارخراپیی، بۆ نموونە:

(قال ابن عباس بِفَاحِشَة مُبَيِّنَة: وهي النشوز وسوء الخلق)[1]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتوویەتی: (فَاحِشَة مُبَيِّنَة) بریتیە لە یاخیی بوونی ژن لە مێردی و، ڕەوشت خراپیی لەگەڵیدا، وەك دەمەوەربوون، بە بۆڵە بۆڵ کردن و ناڕەحەت و بێزارکردنی مێردەکەی بە ناهەق.

برگەی سێیەم: سێ بەڵگە لەسەر ئەوە کە (فَاحِشَة مُبَيِّنَة) بە مانای زینا نیە:

بەڵگەی یەکەم: زینا لە قورئاندا، هەروەها (لواط وسحاق)یش، واتە: نێربازیی و خۆ لێکخشاندنی ئافرەتانیش، وشەی (فاحشة)یان بۆ بەکارهاتوە، بۆ نموونە:

أ)- خوا لە سوورەتی (الإسراء)دا: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾الإسراء، توخن (نیزیك)ی زینا مەکەون، چونکە فاحیشەیە و، خراپترین ڕێیە.

(فاحشة)ش (الفُحْشُ وَالفَحْشَاء وَالفَاحِشَة) بریتیە لە هەر قسەو کردەوەیەك، یان هەر گوناهو خراپەیەك کە ناقۆڵایی و ناشیرینییەکەی سنووری بەزاند بێ.

ب)- لە سوورەتی (النساء)دا، خوا دەربارەی ئەوە کە هەر کەسێك توانای نەبوو ئافرەتانی ئازاد بێنێ، کاتێ خۆی کەنیزەك هەبوون، با ئەوان بێنێ، دەفەرمووێ:

﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ

---

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير ص ١٠٨٦.

﴿وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍۚ فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْۚ وَأَن تَصْبِرُواْ خَيْرٌ لَّكُمْۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٥﴾﴾ النساء.

خوا دەفەرموێ: هەر کەسێ نەیتوانی لەگەڵ ئافرەتانی بڕواداری ئازاددا، هاوسەرگیری بکات، با لەوانەی لەبەر دەستتانن لەگەڵ کچە بڕوادارەکانتان دا هاوسەرگیری بکات (واتە: کەنیزەکەکان) لەبەر ئەوەی ئافرەتانی ئازاد مەسرەفیان گرانتر بووەو، مارەییان زیاتر بووە، ئافرەتی کەنیزەك بە ئاسانتر هێنراوە، دوایی دەفەرموێ: ئنجا ئەگەر ئەو ئافرەتە کەنیزەکانە کە هاوسەرگیرییتان لەگەڵیان کردوە، فاحیشەیان ئەنجامدا، نیو هێندەی ئافرەتانی ئازاد، سزایان لەسەرە!

سزای ئافرەتانی ئازاد کە زینا بکەن، یەکی سەد قەمچییە، کەواتە: ئافرەتی کەنیزەك ئەگەر زینای کرد، سزایەکەی پەنجا قەمچییە، کەواتە: فاحیشە لێرەدا بە مانای زینایە.

ج)- لە بارەی ئەوەوە کە (فاحشة) بە مانای نێربازییش هاتوە لە قورئاندا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾﴾ الأعراف، واتە: یادی لووط بکەوە! کاتێك بە گەلەکەی خۆی گوت: ئایا فاحیشە ئەنجام دەدەن، کە لە پێش ئێوەدا هیچ کەسێك لە جیهانییان ئەنجامی نەداوە، ئێوە دەچنە لای پیاوان بە ئارەزووەوە لە جیاتی ئافرەتان، بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکی زێدەڕۆییکارن.

کەواتە: بە ئاشکرا دیارە لێرەدا مەبەست لە فاحیشە نێربازییە.

د)- هەروەها فاحیشە بە مانای خۆ لێکخشاندنی ئافرەتان (**مساحقة النساء**)یش هاتوە بۆ تێرکردنی غەریزەی جینسییان پێکەوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّٰتِي يَأْتِينَ ٱلْفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَٱسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا ﴿١٥﴾﴾ النساء.

واتـە: ئـەو ئافرەتانـەی کـە فاحیشـە ئەنجـام دەدەن لـە ئێـوە، چـوار شـایەدیان لـێ بگـرن، ئنجـا ئەگـەر شـایەدییان لەسـەردان، لـە ماڵەکانـدا زیندانییـان بکـەن، هەتـا دەمـرن، یاخـود خـوا ڕێیەکیـان بـۆ دەبینێتـەوە، (واتـە: خـوا لـە دڵیـان دەنـێ کـە بگەڕێنـەوەو واز لـەو کارە قێزەونـە بێنـن).

هـ)- هەروەها لە ئایەتی ژمارە (١٦)ی سووڕەتی (النساء)دا، وشەی فاحیشە بە مانای نێربازیی هاتوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾ ﴾، واتە: ئەو دوو پیاوەتان کە فاحیشە ئەنجام دەدەن، (کە دیارە فاحیشەیەك دوو پیاو ئەنجامی بدەن، نێربازییە، هەروەك فاحیشەیەك لە نێوان ئافرەتاندا بە تەنیا ئەنجام بدرێ بریتیە: لە خۆ لێکخشاندنیان).

بەڵگـەی دووەم: هیـچ کام لـەم سـێ سـیاقە، ناگونجـێ تێیانـدا وشـەی: (فاحِشَـة مُبَيِّنَـة) بـە مانـای زینـا بەکارهێنرابـێ، چونکـە:

یەکەم: ئایەتی (١٩)ی سووڕەتی (النساء)، خوا دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بۆتان حەڵاڵ نیە، ئافرەتان بە زۆریی بە میرات بگرن، (واتە: ناچاریان بکەن دەستبەرداری ماڵ و سامانیان بن بۆ ئێوە)، هەروەها ڕێگەی شوکردنەوەیان لێ مەگرن، (ئنجا ئەو ئافرەتە چ کچ و خوشکە، چ خێزانە کە تەڵاقدراوە، ڕێگەی هاوسەرگیریی کردنەوەیان لێ مەگرن)، تاکو هەندێك لەو ماڵەی کە پێتان داون بتاندەنەوە، (جاری وا هەبووە پیاوێك ژنەکەی خۆی تەڵاق دەدا، دوایی نەیدەهێشت شوو بکاتەوە، یان خزمێکی خۆی نەیدەهێشت شوو بکاتەوەو دەیگوت: دەبێ ئەوەندە پارەم بدەیە، ئنجا ڕێگات دەدەم، خوا دەفەرموێ: بۆ ئەوەی هەندێك لەوەی پێتان داون، لێیان وەربگرنەوە، ڕێگرییان لێ مەکەن، پێشگیرییان لێ مەکەن، لەوەی شوو بکەنەوە)، ﴿ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ ﴿١٩﴾ ﴾النساء، مەگەر گوناهێکی ناقۆڵا بکەن، خۆ ئاشکراکەر، یان ئاشکرا، (کە مەبەست پێی ئەوەیە ئەو ئافرەتە کە لە ماڵێدایە و، ئەو پیاوە دەیەوێ دەستی لێ هەڵبگرێ، نابێ بڵێ: دەبێ ئەوەندە پارەم بدەیە، ئنجا دەستت لێ هەڵدەگرم)، مەگەر

پێکەوە نەگونجێن، ئەو ئافرەتە یاخیی بێ لە مێردەکەی و لەگەڵی نەگونجێ، (ئەو کاتە پیاوەکە بۆی هەیە هەندێك لە مارەییەکەی لێی وەربگرێتەوە، یان هەندێك ماڵی لێوەربگرێ و لە بەرانبەر ئەوەدا دەستبەرداری بێ، ئەگەر ئافرەتەکە خۆی داوا بکات کە لەو پیاوە جیابێتەوە، بەڵام ئەگەر پیاوەکە دەستپێشخەر بێ، بۆی نیە هیچی لێوەربگرێتەوە)، ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ١٩﴾النساء، لەگەڵیشیاندا بە چاکە مامەڵە بکەن.

ئاشکراشـە لێـرەدا ناگونجـێ مەبەسـت لـە: (فَاحِشَـةٍ مُبَيِّنَـةٍ) زینـا بـێ، چونکـە پـارە وەرگرتـن لەبەرانبـەر ئـەوەدا هێنـدە ناشـیرینە، نامـەوێ لـەم تەفسـیرەدا وشـەو تەعبیرەکـەی بڵێـم!.

دووەم: هەروەها لە سوورەتی (الأحزاب)دا، هیچ ماقووڵ نیە و، گونجاو نیە خوای کاربەجێ بە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بفەرموێ: هەر کامێك لە ئێوە زینا بکات! خوا شتی وا لەگەڵ هاوسەرانی پێغەمبەردا ﷺ نافەرموێ، ئنجا هۆی هاتنە خواری ئایەتەکانیش ئەوە نەبووە، هۆی هاتنە خواری ئایەتەکان ئەوە بووە کە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریان ﷺ هەڵپێچاوە، بۆ ئەوەی نەفەقەیان بۆ زیاد بکات و، لە ڕووی خۆشگوزەرانیی دنیاوە زیاتر دەستیان ئاوەڵا بکات، یاخود لە بارەی هەوێدارییەوە دڵی پێغەمبەریان ﷺ نیگەران و بێزار کردوە، بە بەڵگەی ئەوە کە دواییش خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ٣١﴾، واتە: هەر کامێك لە ئێوە ملکەچ بێ بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ کەواتە: ئەوەی پێشێیان بریتی بووە لە سەرپێچیی، چونکە ملکەچ بوون، پێچەوانەکەی سەرپێچییە، کەواتە: (فَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ) واتە: یاخیبوون و ڕەفتار خراپ بوون.

سێیەم: ئایەتەکەی سوورەتی (الطلاق) کە باسی تەڵاقە، کە خوا دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر! ﷺ هەر کاتێ ئافرەتانتان تەڵاقدا لە پێش عیددەکەیانەوە تەڵاقیان بدەن، واتە: لە پاکییەکدا کە نەچووبنە لایان، وەك توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: (طَلِّقوهنَّ مُسْتَقْبِلاَتٍ لعدتِهنَّ أي: فِي طُهرٍ لَمْ تجَامعوهُنَّ فيه)، لە پاکییەکدا کە نەچووبنە لایان،

عیددەش بژمێرن و، پارێز لە پەروەردگارتان بکەن و، لە ماڵەکانیان دەریان مەکەن، با خۆشیان نەچنە دەر، مەگەر گوناهێکی ناقۆڵا و خۆ ئاشکراکەر بکەن.

کە بە تەئکید لێرەدا مەبەست ئەوە نیە مەگەر زینا بکەن! بەڵکو مەبەست ئەوەیە مەگەر ئەو ئافرەتە مێردەکەی بێزار بکات، کەس و کاری مێردەکەی بێزار بکات، ڕەوشت و ڕەفتارو ئاکاری خراپ بێ، ئەو کاتە حەقی مانەوەی لە ماڵەکەیدا - دوای ئەوەی تەڵاقدراوە - ئەو حەقەی دەفەوتێ، بە هۆی ئەوەوە کە هەڵناکات و مەدار ناکات لەگەڵ مێردەکەیدا، یاخود لەگەڵ کەس و کاری مێردەکەی و بێزاریان دەکات، مێردەکە بۆی هەیە بڵێ: بچۆ دەرێ.

کەواتە: (فَاحِشَة مُبَيِّنَة) لەو سێ سیاقەدا کە هەر لەو سێ شوێنەشدا لە قورئاندا هاتوە، ناگونجێ بە مانای زینا بێ.

ئنجا کردەوەکانی زینا و نێربازیی و سوحاق، خۆیان لە زاتی خۆیاندا دزێو خراپ و قێزەونن و، قێزەونیی و خراپییان ئاشکرایە و، خۆ ئاشکراکەرە، (مُبَيَّنَة، مُبَيِّنة)یە و حەوجێیان بە سیفەتی (مُبَيِّنَة و مُبَيَّنة) نیە، بخرێتە پاڵیان، بەڵام ئەوە یاخیبوون و ڕەفتار خراپییە کە پێویستیی بەوە هەیە، دیارو خۆ دیارخەر (مُبَيَّنَة، مُبَيِّنة) بێ، چونکە لە ئەسڵدا یاخیبوونی ژن لە مێردەکەی و، دەمەوەربوونی و، بێزارکردنی بۆ مێردەکەی، شتێکی ڕێژەیی (نسبية)یەو، بواری مشت ومڕی تێدایە، بۆیە دەبێ خۆ ئاشکراکەربێ (مُبَيِّنَة)بێ یاخود ئاشکراو ڕوون بێ (مُبَيَّنة)بێ، ئەو ڕەفتار خراپییەو ئەو یاخیبوونە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**چەند ڕێنماییەکی گرنگ و بنەڕەتیی بۆ هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ لە بارەی هەڵس و کەوتیان لە کۆمەڵگادا و، لە بواری قسەکردن و چوونە دەرو پەرستشەکانیان و، فەرمان پێکرانیان بە خوێندنەوەی قورئان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ٣٢ وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ٣٣ وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ٣٤ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:**

**١)- ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ ﴾، ئەی ئافرەتانی پێغەمبەر! ﷺ کە مەبەست پێی هاوسەرانی بەڕێزیەتی.**

**٢)- ﴿ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ ﴾، ئەگەر پارێزکار بن، وەك هیچ کام لە ئافرەتان نین، واتە: پێگەی ئێوە، ڕێزو حورمەتی ئێوە، بەرزترە لە هی ئافرەتانی ئاسایی، بۆیە ئەرکیشتان قورسترە و، ئەگەر گوناهو لادان بکەن، سزاشتان قورسترەو ئەگەر چاکەش بکەن، پاداشتتان زیاترە.**

**٣)- ﴿ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ ﴾، کە قسە دەکەن، قسەکەتان با بە نەرمیی و ملکەچانە نەبێ.**

**کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ ﴾، (البَاءُ: فِي بالقَوْلِ، يَجُوزُ أَنْ تَكُونَ للتعديةِ بِمَنْزِلَةِ همزة التعدية أي: فَلاَ تُخضِعْنَ القَوْلَ)، یانی: قسە بەلای ملکەچییدا مەکەن، قسەیەك مەکەن کە قسەکە ملکەچانەو زەبوونانە بێ.**

تەعبیری: قسـەی ملکەچانـە مەکـەن، ئاماژەیـە بـۆ ئاگادارکردنەوەیـان لـەوە کـە زیـاد بـێ لـە حاڵـەتی ئاسـایی قسـەی ئافرەتـان، ئافرەتـان بـۆ خـۆی دەنگیـان نـەرم و ناسـکە، بـەڵام بـا بـە ئەنقەسـت دەنگـی خۆیـان نـەرم و ناسـك نەکـەن، وا نەکـەن کـە لایـەنی بەرانبـەر لێیـان، وە تەمـاع بکـەوێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ﴾، وا باشـترە لەسـەر (إن اتقيـتن) بوەسـتی و وەسـتان (وقـف) لـەوێ بـێ، نـەك بگوتـرێ: ﴿إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ﴾، ئەگـەر ویسـتتان پارێـز لـە خـوا بکـەن، قسـەی نـەرم و ناسـك مەکـەن، ئـەو مانایـە بـاش نیـە، بەڵکـو مانـای ڕاستتر ئەوەیـە کـە ئێـوە وەك هیـچ کام لـە ئافرەتـان نیـن، ئەگـەر پارێـز بکـەن، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ﴾، قسـەی نـەرم و ناسـك مەکـەن.

٤)- ﴿فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ﴾، کە سەرەنجام ئەو کەسەی دڵی نەخۆشیی تێدایە، نەخۆشیی گومان و دوو دڵیی، یان نەخۆشیی داوێن پیسیی و خراپەی تێدایە، وە تەماع بکەوێ، دیارە (فيطمع) پەیوەستە بە شتێکەوە، بەڵام لەبەر ڕێزو حورمەتی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ قرتێنراوە، یانی: (فَيَطْمَعُ فيكنَّ الَّذِي فِي قَلبِهِ مَرَض) لێتان وە تەماع بکەوێ و، تەماعتان تێ بکات، ئەو کەسەی دڵی نەخۆشیی تێدایە.

٥)- ﴿وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا﴾، قسەیەکی پەسند و چاك و زانراو بکەن، (المَعْرُوفُ: مَا يَألفُهُ النَّاس بحَسَبِ العُرْفِ العَام: شَكْلاً وَمَضْمُوناً) کە دەفەرموێ: قسەی پەسند بکەن، قسەی بە چاك زانراو، بکەن، یانی: ئەوەی کە بە پێی باوی خەڵك، هەم لە ڕووی نێوەڕۆکەوە و، هەم لە ڕووی شێوازی قسەکەوە، چاك و ڕێك بێ.

٦)- ﴿وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ﴾، لە ماڵەکانی خۆشتاندا نیشتەجێ بن.

(قَـرْن) خوێنراویشـەتەوە: (قِـرْنَ)، هەردووکیـان بـە مانـای نیشـتەجێ بـوون و، بـەردەوام بـوونی، لـە ماڵـەوە بـوون، دێـن، یاخـود (قِـرْن) دەشـگونجێ لـە (الوَقَـار) ەوە هاتبـێ و، دەشـگونجێ: (أَقْـرِرْنَ عيونـاً فِي بيُوتِكُـنَّ)، دڵتـان خۆشـبێ لـە ماڵـەکانی

خۆتانـدا و، دەشـگونجێ لـە سـەقامگیر بـوون (الإِسْتِقْرَار)ەوە هاتبـێ، واتە: نیشـتەجێ بـن لـە ماڵـەکانی خۆتانـدا.

وشـەی (بیوت)یـش، هـەم لێـرە هـەم لـە شـوێنەکانی دیکـەش، هـەم بـە (بُیـوت) بـە بـۆر (ضَمَّـة)ی (ب) و بـە (بِیـوت) بـە ژێـر (کسرة)ی (ب) خوێنراوەتـەوە، (بُیُـوت) کـۆی (بیـتٌ)ە، ئەویـش ئـەو شـوێنەیە کـە مـرۆڤ شـەو تێیـدا دەخـەوێ.

٧)- ﴿وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ﴾، وەك خۆپێشاندانی نەفامیی یەکەم خۆتان پێشان مەدەن، واتە: جوانیی خۆتان دەرمەخەن، (التَّبَرُّجُ: إِظْهَارُ المرْأَةِ مَحَاسِنَ ذَاتِهَا وَثِيَابِهَا وَحُلِيِّهَا بِمَرْأَى الرِّجَالِ)، (تبرّج) بریتیە لەوە کە ئافرەت جوانییەکانی خۆی دەربخات، جوانیی جەستەی، یاخود جوانیی پۆشاکی، یان خشڵەکەی، بە شێوەیەك کە پیاوان ببینن.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ﴾، زانایـان زۆریـان قسـە لـەو بـارەوە کـردوە، هەندێکیـان گوتوویانـە: مەبەسـت پێـی نەفامیـی دوای (نـوح)ە، هـی دووەمیشـیان هـی پێـش ئیسـلامە، هەندێکیـش دەڵێـن: (الجَاهِلِيـةِ الأُولى) سـەردەمی نەفامییـە، کـە پێـش ئیسـلام و دوای نـووح و هەمـوو ڕۆژگارو چاخـەکان دەگرێتـەوە، منیـش ئـەو ڕایـەی دووەمیانـم پـێ پەسـندترە.

٨)- ﴿وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، هەروەها نوێژ بەرپا بکەن.

٩)- ﴿وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾، دیسان زەکات بدەن.

١٠)- ﴿وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن، واتە: ئەوەی کە لەسەری بوون، لەسەری بەردەوام بن، ئەگەرنا وەنەبێ تازە نوێژ بکەن و زەکات بدەن و، تازە گوێڕایەڵیی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن!.

ئنجا دوایی حیکمەتی ئەوە دەردەخات و دەفەرموێ:

١١)- ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ﴾، بە دڵنیایی خوا دەیەوێ پیسییتان لێ لابەرێ، ئەی خاوەنانی ماڵەکە (ماڵی پێغەمبەر).

(الرِّجْس) واتـە: پیسـییەك كە لاشـەی مـرۆڤ قێـزەون دەكات، لێرەدا خوازراوەتەوە بـۆ گوناهـو نـا تەواوییـە نایینییـەكان كـە ڕووحی مـرۆڤ پیـس دەكەن.

ڕانـاوی نێرینـەشی بەكارهێنـاوە، لەبـەر ئـەوەی پێغەمبـەر ﷺ خـاوەنی ماڵەكەیـەو ڕاناوی نێرینـە بـۆی بـەكاردێ، ئـەوەش (تغلیـب)ە، چونكـە هـەر كات كۆمەڵێـك پیاوو ئافـرەت پێكـەوە بـوون، ڕانـاوی نێرینـە بـەكاردێ، وەك زاڵكـردنی نێرینـان لەسـەر مێینـان (تَغْلیبُ الذكُـور عَـلَى الإنَـاث)، ئەمـە بنچینەیـەكی گشـتیی زمانی عەرەبییـە، یاخـود: ئـەوە بـەس ڕێـزو بـە مەزنگرتنـی پێگـەو مەقامـی هاوسـەرانی پێغەمبـەرە، وەك لـە سـوورەتی (هـود)دا، فریشـتەكان بـە سـارە خاتـوون دەڵێـن: ﴿ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ﴿٧٣﴾ ﴾، كـە بـە تەئكیـد دوێنراوەكـە سـارە خاتوونـە، چونكـە لەوێـدا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾ ﴾هـود، ئنجـا وشـەی: (عَلَيْكُمْ) لەگـەڵ (أَتَعْجَبِينَ ) هـەر ڕوویـان لـە یـەك دوێـنراوە، كـە سـارە خاتوونـە، لێـرەش: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ﴾، بـە هەمـان شـێوە مەبەسـت پێـی هاوسـەرانی بـە ڕێـزی پێغەمبـەر دایـكانی بڕوادارانـە خـوا لێیـان ڕازی بـێ.

١٣)- ﴿ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾، هەروەها (خوا دەیەوێ) بە پاككردنەوەیەكی تەواو پاكتان بكاتەوە.

١٤)- ﴿ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ﴾، یادیش بكەنەوە (یاخود بخوێننەوە)، ئەوەی لە ماڵەكانتان دەخوێنرێتەوە، لە ئایەتەكانی خواو لە حیكمەت.

١٥)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴾، بە ڕاستیی خوا پەنهانزانی شارەزایە.

لـە ڕاسـتییدا هـەر كەسێك تەماشـای ئایەتـەكان بـكات، زۆر بـە ڕوونیـی دیـارە، كـە بـە گشـتیی ڕوویـان لـە هاوسـەرانی پێغەمبەرە، تەنیـا شـتێك بویسـترێ وەك گێچەڵێك بە

لێتێگەیشتنی ئـەو ئایەتانـە بکرێ، ئەوەیـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾، ئەویـش وێنەمـان هەیـە لـە قورئانـدا، لـە سـوورەتی (هـود)دا: ﴿ رَحْمَتُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ ﴿٧٣﴾ ﴾هـود، لێرەشـدا ڕانـاوی نێرینـە بەکارهاتـوە بـۆ سـارە خاتـوون، خێـزانی (خلیـل اللـه) ئیبراهیـم، ئەگەرنـا ناگونجـێ ئـەو ڕاناوانـەی پێشـێ هەموویـان ڕوویـان لـە کـۆی هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ بـێ و، ئەوانـەی دواییـش هەموویـان، بـەڵام لـەو ئێوەڕاسـتەدا، جگـە لـە هاوسـەرانی پێغەمبـەر ﷺ مەبەسـت بـێ، ئـەوە شـتێکی زۆر بـێ جێیـە!

چونکـە فەرمایشـتی خـوا وەك ئاڵقـەکانی زنجیـر یەکـدی دەبەسـتنەوە، (هـەر تیـرە لـە کەندالێـك نیـە)، پاشـان کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾، ئـەم هـۆکار دۆزیـی (تعلیـل)ە، بـۆ ئـەو قسـانەی پێشـێ دەهێنرێتـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ئـەی هاوسـەرانی پێغەمبـەر ﷺ! ئێـوە وەك هیـچ کام لـە ئافرەتـان نیـن، ئەگـەر پارێـز بکـەن، قسـەی نـەرم و ناسـك مەکـەن، تاکـو کەسێکە کـە دڵـی نەخۆشـییەکی تێدایـە، تەماعتـان تـێ بـکات و، قسـەی پەسـندو بـاش بکـەن و، لـە ماڵـەکانی خۆتانـدا نیشـتەجێ بـن و، وەك نەفامیـی یەکـەم، خۆتـان پێشـان مـەدەن، نوێـژ بەرپـا بکـەن و، زەکات بـدەن و فەرمانبەریـی خـواو پێغەمبەرەکـەی بکـەن ﷺ ئنجـا ئـەوە هەمـووی بۆچـی؟ ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾، چونکـە ئـەی خاوەنـانی مـاڵ! ئـەی ئافرەتـەکان! خـوا دەیـەوێ پیسـییتان لـێ لاببـەرێ، واتـە: پیسـی مەعنەویـی، ﴿ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾، هەروەهـا بـە پاککردنەوەیـەکی چـاك، پاکتـان بکاتـەوە، بـە هـۆی پابەندیی بـە شـەریعەتەوە، دوایـی دیسـان دەفەرمـوێ: ﴿ وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ ﴾، هەروەهـا ئـەوەی کـە لـە ماڵەکانتانـدا دەخوێنرێتـەوە، لـە ئایەتـەکانی خـواو لـە حیکمـەت، بیخوێننـەوە، یـادی بکـەن، فێـری بـن، ﴿ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا پەنهانـکاری شـارەزایە.

بـە نسـبەت ئـەوە شـەوە کـە لـە سـوننەتدا هاتـوە، کـە پێشـتر چەنـد دەقێکـمان لـەو بـارەوە هێنـان، ئـەوە ئەوپـەڕی بریتیـە: لـە پەیوەسـتکردنی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ

ئـەو چـوار کەسـە، واتـە: (عَـلِي، فَاطِمَـة، حَسَـن، حُسَـيْن) خـوا لێیـان ڕازیبـێ، بـە هاوسـەرەکانیەوە، بـەڵام مەبەسـتی ئایەتـەکان، هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەرە ﷺ سـیاقەکە هەمـووی لـە بـارەی ئەوانەوەیـە، بەسـەرهاتەکەو هـۆی هاتنـە خواریـش لـە بـارەی ئەوانەوەیـەو، ڕواڵـەتی ئایەتەکانیـش بـەس ئـەوان دەگەیەنـێ، بـەڵام کـە لـە سـوننەتدا هاتـوە پێغەمبـەر ﷺ (عَـلِي و فَاطِمَـة و حَسَـن و حُسَـيْن) خـوا لێیـان ڕازیبـێ عەبایـەك، پۆشـاکێکی بەسـەردا داون و دوعـای بـۆ کـردوون: ئـەی خوایـە! ئەوانـە خێـزانی منـن پاکیـان بکـەوە، واتـە: ئەوانـەش لـە میـانی خێـزان و هاوسـەرانی منـدان، لـە نێـو ماڵەکـەی منـدان، ئەوانـەش پاکبکـەوە، وەك چـۆن هاوسـەرەکانم بـە هـۆی پابەندیـی بـە شـەریعەتەوە، بـە هـۆی ئیـمان و تاعـەت و عیبـادەت و ڕۆژوو زەکات و قورئـان و شـوێنکەوتنی قورئـان و سـوننەتەوە، پاکیـان دەکەیـەوە، ئـەو چوارانـەش لـە ڕیـزی ئەوانـەدا پاکبکـەوە، هـەروەك چـۆن خـوای پـەروەردگار حەڕەمـی مەککـەی دانـاوە، بـەڵام پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ئـەوە منیـش مەدینـەم حەڕامکـرد، یـانی: وەك چـۆن خـوای پـەروەردگار، یـان ئیبراهیـم مەککـەی حـەڕام کـردوەو کردوویـەتی بـە حـەڕەم، منیش ئـەوە مەدینـەم کـرد بـە حـەڕەم، واتـە: مەدینـەشی بـە مەککـەوە پەیوەسـت کـرد.

ئنجـا بـە دڵنیایـی ئـەوەی شـیعە دەیڵێـن: (بـە تایبـەت شـیعەی دوازدە ئیمامیـی) کـە هەڵدەسـتن بـە زەوتکـردنی چەمـکی (أهـل البيـت)، بـۆ ئـەو چـوار کەسـە و، دوور خسـتنەوەی لـە هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ، ئـەوە دژی قورئانـە، ئـەو دەقـەش کـە پێـی دەگوتـرێ: فەرمـوودەی پۆشـاك (حَدِيـثُ الكِسَـاء) لەگـەڵ ئایەتەکانـدا دژ نیـە، بەڵکـو پێغەمبـەر ﷺ ویسـتوویەتی تێـمان بگەیەنـێ کـە ئایەتـە موبارەکـەکان بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ هاوسـەرەکانی دەگرنـەوە و، بـە شـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ ئـەو خزمـە نیزیکانـەشی دەگرنـەوە، ئنجـا گریـمان ئـەو دەقـەی سـوننەت لەگـەڵ ئایەتەکـەدا دژ بوەسـتێ، یەکسـەر دەبـێ بـە دیـواری دابدەیـن، چونکـە مەحاڵـە پێغەمبـەر ﷺ شـتێك بفەرمـوێ، کـە لەگـەڵ فەرمایشـتی خـوادا دژ بوەسـتێ.

**مەسەلەی چوارەم:**

**بەراوردكـردنی پیـاوان و ئافرەتـان لـە دە (١٠) خەسـڵەتی گـەورەو گرنگیانـدا: ملكەچیـی، ئیـمان، بـۆ خـوا زەبوونیـی، ڕاسـتیی، تـرس و بیـم بەرانبـەر بـە خـوا، خێركـردن، خۆڕاگریـی، ڕۆژووگرتـن، داوێنپاكیـی، زۆر یـادی خـوا كـردن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ﴾، بە دڵنیایی بۆ خوا ملكەچان لە پیاوان و، بۆ خوا ملكەچان لە ئافرەتان، واتە: پیاوانی بۆ خوا ملكەچ و، ئافرەتانی بۆ خوا ملكەچ.

٢)- ﴿وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾، پیاوانی بڕوادار و، ئافرەتانی بڕوادار.

٣)- ﴿وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ﴾، پیاوانی گوێڕایەڵ و فەرمانبەر و، ئافرەتانی گوێڕایەڵ و فەرمانبەر (بۆ خوا).

٤)- ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ﴾، پیاوانی ڕاست، (نەك هەر ڕاستگۆ، بەڵكو دڵیان ڕاستە و زمانیان ڕاستەو كردەوەیان ڕاستەو پەنهانیان ڕاستەو ئاشكرایان ڕاستەو، لەگەڵ خواو خۆیان و خەڵكدا ڕاستن)و ئافرەتانی ڕاست.

٥)- ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ﴾، پیاوانی خۆڕاگر و پشوو درێژ و، ئافرەتانی خۆڕاگرو پشوو درێژ، لە سوورەتی (البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ

﴿ٱلۡبَأۡسِ ۝١٧٧﴾ البقرة، واتە: خۆڕاگران لە كاتی نەدارییدا و، لە كاتی نەخۆشیی و ناخۆشییدا و، لە كاتی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا.

٦)- ﴿وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ﴾، پیاوانی بە ترس و بیمەوە بۆ خوا ملكەچ و، ئافرەتانی بە ترس و بیمەوە بۆ خوا ملكەچ.

٧)- ﴿وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ﴾، پیاوانی خێركەرو ماڵی خۆ بەخشەر و، ئافرەتانی خێركەرو ماڵی خۆ بەخشەر.

٨)- ﴿وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ﴾، پیاوانی ڕۆژووگرو، ئافرەتانی ڕۆژووگر.

٩)- ﴿وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ﴾، پیاوانی داوێنی خۆ پارێزو، ئافرەتانی داوێنی خۆپارێز (لە حەڕام).

١٠)- ﴿وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ﴾، پیاوانی زۆر خوا یادكەرو، ئافرەتانی زۆر خوا یادكەر.

(مُجَاهِدْ) لەو بارەوە دەڵێ: [قَالَ مُجَاهِدٌ: لَا يَكُونُ ذَاكِراً للهِ حَتَّى يَذْكُرَهُ قَائِماً وَجَالِسَاً وَمُضْطَجِعَاً)[1]، واتە: مرۆڤ ناچێتە ڕیزی ئەوانەوە كە یادی خوا دەكەن، تاكو یادی خوا نەكات بە پێوە و، بە دانیشتنەوەو بە ڕاكشانەوەو بە پاڵكەوتنەوە.

ئنجا ئەوانەی خاوەنی ئەو دە سیفەتەن، لە پیاوان و ئافرەتان:

١١)- ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا﴾، خوا لێبوردنێكی تایبەت و پاداشتێكی مەزنی بۆ داناون.

پێشتر لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكاندا چەند دەقێكمان هێنان، ئێستاش ئەمە دێنین: [عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُذْكَرُ الرِّجَالُ فِي كُلِّ شَيْءٍ، وَلَا نُذْكَرُ؟ فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ ...﴾][2].

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ص١٥٠.

(٢) جامع البيان برقم: ٢٨٥٣٤.

واتــە: ئوممــو ســەلەمە (خــوا لێــی ڕازیبــێ) هاوســەری بەڕێــزی پێغەمبــەر ﷺ دەڵێ: گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ئایـا پیـاوان لـە هەمـوو شـتێکدا بـاس دەکرێـن و، ئێمـە بـاس ناکرێیـن، (واتـە: حیکمـەتی چییـە؟) خـوا ﷻ ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوار: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ ... ﴾.

کـە لـە هـەر دە (١٠) بـوارە سـەرەکیی دینداریـی و مسـوڵمانێتییدا: ئیسـلام و ئیـمان و ملکەچیـی و تـرس و بیـم لـە خـوا و بەخشـین و خۆڕاگریـی و ڕۆژوو گرتـن و داوێنـی خـۆ پاراسـتن و، یـادی خواکـردن، ئـەو دە (١٠) ئەرکـە هەمـوو لایـەن و ڕەهەنـدەکانی دیـن و ژیـن دەگرنـەوە، خـوا بـەراوردی کـردوە لـە نێـوان ئافرەتـان و پیاوانـدا، ئەوانـەی کـە لـە پیـاوان و ئافرەتـان، خـوا لێبوردنێـك و پاداشـتێکی مـەزنی بـۆ دانـاون.

هەروەهـا هـەر لـەو بـارەوە ئـەم دەقـەش هەیـە: [عَـنْ أُمِّ عُـمَارَةَ الْأَنْصَارِيَّـةِ رَضِيَ اللهُ عَنْهَـا، أَنَّهَـا أَتَـتِ النَّبِـيَّ ﷺ، فَقَالَـتْ: مَـا أَرَى كُلَّ شَيْءٍ إِلَّا لِلرِّجَـالِ، مَـا أَرَى النِّسَـاءَ يُذْكَـرْنَ بِـشَيْءٍ، فَنَزَلَـتْ: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ.... ﴿٣٥﴾ ﴾]، (أخرجـه الترمـذي: ٣٢١١، وَصَحَّحَـهُ الألبـاني في صحيـح سـنن الترمـذي).

واتــە: ئوممــو عومــارەی ئەنصارییــی (خــوا لێــی ڕازیبــێ) هاتــە لای پێغەمبــەری خــوا ﷺ گــوتی: بۆچــی دەبینــم هەمــوو شــتێك بــەس بــۆ پیــاوان بــاس دەکرێــت، ئافرەتـان بـاس ناکرێـن؟ ئنجا ئـەو ئایەتـە موبارەکـە هاتـە خـوار: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ...﴿٣٥﴾ ﴾.

دیـارە ئافرەتـان ئـەو کاتـەش ئـەو هەسـتەیان هـەر هەبـووە، کـە وەك پیـاوان حیسـاب ناکرێـن، یاخـود بـە پێگەیـەکی کەمـتر دادەنرێـن، دوایـی خـوای بـەرز ئـەو وەهمـەی بـۆ ڕەواندوونـەوە و، ئـەو ڕاستییەی بـۆ ڕوونکردنـەوە، کە نەخێـر نێرایەتیی و مێیایەتیـی نابێتـە هـۆی بەرزیـی و نزمیـی مرۆڤـەکان، بەڵکـو ئـەو سـیفەتانەیانن، ئـەو کردەوانەیانـن کـە خۆیـان ئەنجامیـان دەدەن، دەبنـە هـۆی بەرزبوونیـان، یاخـود نـزم بوونیـان، بـەڵام ڕەگەزیـان بـە دەسـت خۆیـان نیـە، تاکـو خـوا ﷻ بیکاتـە هـۆکاری بەرزییـان، یـان نزمییـان، نـە پیـاو بـە هـۆی نێـر بوونیـەوە، چـاك دەبـێ،

نە ئافرەت بە هۆی مێینە بوونیەوە، خراپ دەبێ، هەروەها بە پێچەوانەشەوە، بەڵکو ئەوەی کە مرۆڤ چاك دەكات نێر بێ، یان مێ، كردەوەی باشیەتی، ئەوەی کە خراپیشی دەكات، كردەوەی خراپیەتی.

کەواتە: ئەو ئایەتە موبارەکە یەکسانیی پیاوان و ئافرەتان، لە ئەرکە شەرعییەکەیاندا بە گشتیی دەخاتە ڕوو:

١- (إسلام): ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ﴾، کە پێنج پایەکانی ئیسلام دروشمە سەرەکییەکانی مسوڵمانەتیین، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنْ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ البَيْتِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ} (أخرجه البخاري: ٨، ومسلم: ١٦، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، واتە: ئیسلامەتیی لەسەر پێنج پایان بنیات نراوە: شایەدیی دان بەوە کە جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین و، موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە و، نوێژ بەرپاکردن و، زەکات دان و، حەجکردنی ماڵی خوا و، ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ﴾، یانی: ئیسلامەتیی بە هەر پێنج پایەکەیەوە.

٢- (إيمان): ﴿وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾، ئیمان بە هەر شەش پایەکەی کە لە قورئان و سوننەتدا هاتوون، {الإِيمَانُ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ} (أخرجه البخاري: ٨، ومسلم: ١٦)، ئیمان ئەوەیە ئیمان بێنی: بە خواو بە فریشتەکان و بە کتێبەکانی و، بە پێغەمبەرانی و، بە ڕۆژی دوایی و، بە قەدەر، کەواتە: ﴿وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾، واتە: ئیمان بە هەر شەش پایەکانیەوە، کە پیاوو ئافرەت تێیدا یەکسانن.

٣- (قنوت): ﴿وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ﴾، واتە: گوێڕایەڵان لە پیاوان بۆ خوا و، گوێڕایەڵان بۆ خوا لە ئافرەتان، ئەمیش سەرجەم بوارەکان دەگرێتەوە.

٤- (صدق): ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ﴾، ڕاستیی دڵ و زمان و کردەوە، ئەمیش پیاوو ئافرەت تێیدا یەکسانن.

٥- (خشوع): ﴿ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ ﴾، واتە: ئەوانەی بە ترس و بیمەوە بۆ خوا ملکەچن، زەبوونیی دەردەبڕن، پیاوان و ئافرەتان تێیدا یەکسانن.

٦- (تصدُّق): ﴿ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ ﴾، ئەوانەی مـــاڵ و سامـــانی خـــۆیان دەبەخشن لە پیاوان و ئافرەتان.

٧- (صبر): ﴿ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ ﴾، خۆڕاگران لە پیاوان و ئافرەتان، خۆڕاگران لە هەژاریی و نەدارییدا، لە نەخۆشیی و ناخۆشییدا، لە جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا، پیاوان و ئافرەتان تێیدا یەکسانن.

٨- (صـیام): ﴿ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ ﴾، ڕۆژووگرتن، پیـــاوان و ئـافرەتان تێیدا یەکسانن.

٩- (حفظ الفرج): ﴿ وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ ﴾، پیاوانی داوێنی خۆ پارێز، هەروەها ئافرەتانی داوێنی خۆ پارێز.

١٠)- (ذكر الله تعالى كثيراً): ﴿ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ ﴾، پیاوانی زۆر خوا لە یادو، ئافرەتانی زۆر خوا لە یادیش یەکسانن.

هەمـوو ئەوانـەی کـە بـەو شـێوەیەن و، خـاوەنی ئـەو دە (١٠) سـیفەتەن، لـە پیـاوان و لـە ئافرەتـان، لـە نێـر ومـێ: ﴿ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾، خـوا لێبوردنێـکی تایبـەت و پاداشـتێکی مـەزنی بـۆ ئامادەکـردوون.

لە کۆتایی دا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین، دەفەرموێ:

[إِذَا اسْـتَيْقَظَ الرَّجُـلُ مِـنَ اللَّيْـلِ، وَأَيْقَـظَ امْرَأَتَـهُ، فَصَلَّيَـا رَكْعَتَـيْنِ، كُتِبَـا مِـنَ الذَّاكِرِيـنَ اللـهَ كَثِـيراً وَالذَّاكِـرَاتِ] (أخرجـه أبـو داود: ١٤٥١، والنسـائي في الكـبرى: ١٣١٠، وابـن ماجـه: ١٣٣٥، وأبـو يعـلى: ١١١٢، وابـن حبـان: ٢٥٦٩، والحاكـم: ١١٨٩، وقـال: صحيـح عـلى شرط الشـيخين، ووافقـه الذهبـي، عـن أبي سـعيد الخـدري، وأبي هريـرة).

واتــە: هــەر کــە پیـاو ژنەکـەی خـۆی لـە شـەوێدا بێدارکـردەوە و، پێکـەوە دوو ڕکاتیـان کـردن، ئـەو شـەوە لـە: ﴿وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ﴾، لـە ڕیـزی ئەوانـەدا دەنووسرێـن، ئـەو پیـاوو ئافرەتانـەی زۆر یـادی خـوا دەکـەن.

ئـەم ئایەتـە موبارەکـە بـە ڕاسـتیی بەهێزتریـن بەڵگەیـە، لەسـەر ئـەوە کـە لـە تـەرازووی خـوادا، لـە پێـوەری خـوادا، ڕەگـەز ناخوێنرێتـەوە، ڕەنـگ و زمـان و پێگـەی کۆمەڵایەتیـی ناخوێنرێتـەوە، ڕەچەڵـەك ناخوێنرێتـەوە، بەڵکـو خـودی مرۆڤەکـە، ئیـمان و عەقیدەکـەی، کردەوەکـەی، ڕەوشـت و ئاکارەکـەی، ئەوانـە سـەنگی مەحـەك و پێـوەری هەڵسـەنگاندنی ئـەو مرۆڤـەن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــزان!

ئـەم دەرسـەمان لـە پێنج ئایەتـان پێکهاتـوە، ئایەتـەکانی: (٣٦ - ٤٠)، کـە تێیانـدا بـاسی بەسـەرهاتی زەیـد و زەینـەب و لێـك جیـا بوونەوەیـان و، مارەکـردنی خـوای کارزان زەینـەب لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ، کـراوە.

هەروەهـا بـاسی ئـەوە کـراوە کـە گەیەنـەرانی پەیامـەکانی خـوا، جگـە لـە خـوا شـەرم لـە هیـچ کـەس ناکـەن و، لـە هەمـوو دنیـا بـێ باکـن، موحەممەدیـش ﷺ کۆتایـی پێغەمبـەرانی خوایـە و، بـە هاتنـی موحەممـەد ﷺ دەرگای وەحیـی و پێغەمبەرایـەتی گاڵـە دراوەو، داخـراوەو، کۆتایـی پێهاتـوە.

﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ
وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ
عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ
وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ
حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ مَّا كَانَ عَلَى
ٱلنَّبِىِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ۖ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا
﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا
﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ
بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها هیچ پیاوێکی بڕوادارو ئافرەتێکی بڕوادار، هەر کات خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری کارێکیاندا، بۆیان نیە بۆ کارەکەیان (مافی) سەرپشك بوونیان هەبێ و، هەر کەسێکیش سەرپێچیی لە خواو پێغەمبەرەکەی بکات، بێگومان بە گومڕاییەکی ئاشکرا گومڕا بووە ﴿٣٦﴾ (ئەی موحەممەد!) یادیش بکەوە کە بەو کەسەت دەگوت کە خواش چاکەی لەگەڵدا کرد بوو و، تۆش چاکەت لەگەڵدا کرد بوو: هاوسەرەکەت بگرە (بهێڵەوەو وازی لێ مەهێنە) و پارێز لە خوا بکە، ئەوەش کە خوا دەرخەریەتی (کە بریتیە لە مارەکردنی زەینەب لە تۆ پاش جیابوونەوەی لە زەید) دەتشاردەوەو (لە قسەو قاڵی) خەڵکی دەترسای و، خواش شایستەتر بوو کە لێی بترسی! ئنجا هەر کات زەید پێویستیی پێی نەما (بە زەینەب)، ئەوە لە تۆمان مارەکرد، (حیکمەتی ئەو یاسایەش ئەوەیە) کە بڕواداران سەبارەت بە هاوسەرگیریی کردن لەگەڵ هاوسەران (ی تەڵاقدراو) ی پیاوانی بە کوڕ گیراویاندا، سەغڵەتییان لەسەر نەبێ، هەر کات (لێیان جیابوونەوەو) پێویستییان پێیان نەماو، فەرمانی خواش جێبەجێکراوە (لە لایەن بڕوادارانی ڕاستەقینەوە) ﴿٣٧﴾ پێغەمبەر لەوەدا کە خوا بۆی بڕیارداوە، هیچ سەغڵەتیی لەسەر نیە (ئەمە) یاسای خوایە لەو (کۆمەڵ)انەدا کە پێشتر ڕابردوون و، فەرمانی خواش، نەخشەیەکی دانراوە (پێویستە وەك خۆی ئەنجام بدرێ، لە لایەن بڕوادارانەوە) ﴿٣٨﴾ (پێغەمبەران) ئەوانەی پەیامەکانی خوا دەگەیەنن و، بە مەزنگرتنەوە سامی لێدەکەن و، جگە لەوی سام لە هیچکەس ناکەن و، خواش بەسە لێپرسەرەوە بێت ﴿٣٩﴾ موحەممەد بابی هیچ کام لە پیاوانتان نیە، بەڵکو ڕەوانەکراوی خواو کۆتایی پێغەمبەرانەو، خواش (هەمیشە) بە هەموو شتێك زانا بووە ﴿٤٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلْخِيَرَةُ ): (مَصْدَرُ تَخَيَّرَ كَالطِّيَرَة، إسْمُ مَصْدَرِ تَطَيَّر، قِيْلَ لَمْ يُسْمَع فِي هَذَا الوَزْنِ غَيْرُهُمَا)، وشەی (خِيَرَة) ناوی چاوگە لە (تَخَيَّر)ەوە هاتوە، وەك (طِيَرَة) ناوی چاوگە لە (تَطَيَّرَ)ەوە هاتوە، (طِيَرَة) واتە: فاڵگرتنەوە، یان ڕەشبینیی و گەشبینیی، گوتراوە: کە لەسەر ئەم کێشە، تەنها ئەو دووە هاتوونە: (خِيَرَة) سەرپشك بوون و، (طِيَرَة) گەشبینیی و ڕەشبینیی.

(قَضَىٰ ): (أي أَتَمَّ، وَاسْتَوْفَى)، واتە: پێویستیی پێی نەما، کاری پێی نەما.

(وَطَرًا ): (الوَطَرُ: الحَاجَةُ المُهِمَّةُ وَالنَّهْمَةُ)، (قَضَاءُ الوَطَرِ: بُلُوغُ مُنْتَهَى مَا فِي النَّفْسِ مِنْ شَيءٍ)، (وَقِيْلَ: الوَطَرُ: الشَّهْوَةُ وَالمَحَبَّةُ)، (وَقِيْلَ: الأَرَبُ وَالحَاجَةُ)، (وَطَر) واتە: پێویستییەکی گرنگ، ئارەزوویەك لە شتێکدا، (قَضَاءُ الوَطَر) واتە: گەیشتن بە نەوپەڕی ئامانج، کە لە شتێکدا ئینسان ڕەچاوی کرد بێ، گوتراوە: (وَطَر) بە مانای ئارەزوو دێ، بە مانای خۆشەویستیی دێ، گوتراویشە: بە مانای پێویستیی دێ.

(حَرَجٍ ): (أي: ضِيق وإثْمٌ)، واتە: (حَرَج) بە مانای سەغڵەتیی و بە مانای گوناهیش دێ.

(حَسِيبًا ): (مُحَاسِبًا أو حَافِظًا)، (حَسِيب) هەم بە مانای ژمێرەر دێ، هەم بە مانای پارێزەر دێ.

(وَخَاتَمَ ): (إسْمُ فَاعِلٍ مِنْ خَتَم)، (خَاتَم) ناوی بکەر لە (خَتَم)ەوە هاتوە (خَتَمَ) یانی: تەواوی کرد، کەواتە: (خَاتَمْ) تەواوکار، بە (خَاتِم)یش خوێنراوەتەوە، (خَاتِم)، واتە: کۆتایی پێهێنەر، (خَاتَمْ) واتە: کۆتایی.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾.

لەو بارەوە ئەم گێڕراوەیە هەیە:

{عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَبَّاسَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِزَيْنَبَ: «إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُزَوِّجَكِ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ، فَإِنِّي قَدْ رَضِيتُهُ لَكِ»، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! لَكِنِّي لَا أَرْضَاهُ لِنَفْسِي، وَأَنَا أَيِّمُ قَوْمِي، وَبِنْتُ عَمَّتِكَ، فَلَمْ أَكُنْ لِأَفْعَلَ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ﴾، يَعْنِي زَيْدًا، ﴿وَلَا مُؤْمِنَةٍ﴾، يَعْنِي زَيْنَبَ، ﴿إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ﴾، أَمْرًا يَعْنِي النِّكَاحَ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ: ﴿أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾، يَقُولُ: لَيْسَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ، خِلَافَ مَا أَمَرَ اللهُ بِهِ: ﴿وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾ قَالَتْ: قَدْ أَطَعْتُكَ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ، فَزَوَّجَهَا زَيْدًا وَدَخَلَ عَلَيْهَا}[1].

ئەمە بە چەند سەنەدێك هاتوە كە دیارە لە بێهێزیی خاڵیی نین، بەڵام بە هەموویان تیشكمان بۆ دەخەنە سەر هۆكارو چۆنیەتیی دابەزینی ئەو ئایەتانە.

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەینەبی فەرموو: (كە كچە پووری خۆی بوو)[2]، فەرمووی: دەمەوێ لە زەیدت مارە ببڕم و، من ئەوم بە هاوسەر بۆ تۆ پەسند كردوە، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ بەڵام من بۆ خۆمی بە پەسند نازانم، من ئافرەتی دیارو

---

(١) ذَكَرهُ السّيوطِيُّ في «الدّر المَنْثُور» ج٦، ص١١٠، وَنَسَبَهُ لابْنِ مرْدَوَيْه، الإستيعاب، ج٣ ص ١١٧، والطبري: (٢٨٥٣٨، ٢٨٥٣٩، ٢٨٥٤٠، ٢٨٥٤١) بأسانيد لا تخلو من ضعف.

(٢) واتە: كچی خوشكی بابی بوو، زەینەب كچی ئومەیمەیە، ئومەیمەش كچی عەبدولموتتەڵیبە، عەبدولموتتەڵیبیش بابی ئومەیمەو، بابی عەبدوڵڵای بابی پێغەمبەر ﷺ بووە.

بێ هاوسەری خەڵکەکەی خۆمم و، کچی پوور (خوشکی باپی) تۆم، من بەوە ڕازی نیم، ئیدی ئەم ئایەتە هاتە خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ ﴾، هیچ پیاوێکی بڕوادار بۆی نیە - کە مەبەست پێی زەیدە - {لێرەدا وایگوتوە، بەڵام لە ڕاستییدا مەبەست پێی عەبدوڵڵای برای زەینەب بووە، چونکە عەبدوڵڵا ڕازی نەبوو، ئەگەرنا زەید ڕازی بوو، ئیدی بە هەر حاڵ لێرە وا هاتوە، بەڵام ئەسڵ ئەوەیە کە زەینەب و عەبدوڵڵای برای ڕازی نەبوون و لێرەدا وشەی (زَيْدًا) بە هەڵە هاتوە}، ﴿ وَلَا مُؤْمِنَةٍ ﴾، هیچ ئافرەتێکی بڕوادار، کە زەینەبی کچی جەحشە (خوا لێی ڕازیبێ)، بۆیان نیە ﴿ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ ﴾، هەر کاتێ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بڕیارێکیاندا، لێرەدا مەبەست مارەکردنە لەو شوێنەدا، ﴿ أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ﴾، کە مافی سەرپشك بوونیان هەبێ لە بارەی کاری خۆیانەوە، واتە: مافی سەرپشك بوونیان نیە، لە کاری خۆیاندا پێچەوانەی ئەوەی خوا فەرمانی پێکردوە، ﴿ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴾، هەر کەسێکیش سەرپێچیی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ﷺ، بە شێوەیەکی ئاشکرا گومڕا بووە، ئنجا کە ئەوە هاتە خوار، زەینەب گوتی: (قَدْ أَطَعْتُكَ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ)، ئەوە گوێڕایەڵم بۆت، ئەوەی کە حەزت لێیە وا بکە، ئیدی ئەویش لە زەیدی مارەکرد و، زەید گواستیەوە.

هەڵبەتە عەبدوڵڵای براشی کە زانی خوا بڕیاری داوە، ئەویش ڕازیبوو.

٢)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە خوا تێیدا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ ﴾.

لەو بارەوە، چەند گێڕدراوەیەك هاتوون، ئێمە سێیان دێنین:

أ)- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: إِنَّ هَذِهِ الْآيَةَ: نَزَلَتْ فِي شَأْنِ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ وَزَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا} (أخرجه البخاري: ٤٧٨٧).

واتــە: ئەنــەسی کــوڕی مالیــك ﷛ دەڵــێ: ئــەم ئایەتــە لــە بــارەی زەینــەبی کچــی جەحــش و زەیــدی کــوڕی حاریســەوە، خــوا لێیــان ڕازیبــێ، هاتــە خــوار.

ب)- {عَنْ أَنَسٍ ﷛ قَالَ: جَاءَ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ يَشْكُو زَيْنَبَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقُولُ: اتَّقِ اللهَ وَأَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ، قَالَ أَنَسٌ: لَوْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ كَاتِمًا شَيْئًا لَكَتَمَ هَذِهِ الْآيَةَ، فَكَانَتْ تَفْخَرُ عَلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ تَقُولُ: زَوَّجَكُنَّ أَهَالِيكُنَّ، وَزَوَّجَنِيَ اللهُ مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَمَوات} (أخرجه البخاري: ٦٩٨٤).

واتــە: ئەنــەس ﷛ دەڵــێ: زەیــدی کــوڕی حاریســە هــات ســکاڵای هەبــوو لــە هاوســەرەکەی زەینــەب، پێغەمبەریــش ﷺ هــەر دەیفەرمــوو: پارێــز لــە خــوا بکــەو هاوســەرەکەت بهێڵــەوە، (دەســتی لێ بەرمــەدە)، ئەنــەس دەڵــێ: ئەگــەر پێغەمبــەری خــوا ﷺ هیچــی شــاردبایەوە، ئــەم ئایەتــەی دەشــاردەوە، دوایــی (زەینــەبی کچــی جەحــش) شــانازیی بەســەر هاوســەرانی دیکــەی پێغەمبــەردا دەکرد ﷺ دەیگــوت: ئێوە کــەس و کارتــان مــارەی بڕیــون، بــەڵام خــوای بــەرز لەســەرووی حــەوت ئاســمانانەوە، منــی مــارە بڕیــوە! (لــە پێغەمبــەر ﷺ).

ج)- {عَنْ أَنَسٍ ﷛، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ﴾، فِي شَأْنِ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، جَاءَ زَيْدٌ يَشْكُو، فَهَمَّ بِطَلَاقِهَا ﷺ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ﴿أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ ﴿٣٧﴾﴾} (أخرجه أحمد: ١٢٥٣٣، والبخاري: ٦٩٨٤، والترمذي: ٣٢١٢، وقال: صحيح، وابن حبان: ٧٠٤٥، والحاكم: ٣٥٦٣).

واتــە: ئەنــەس ﷛ دەڵێ: کــە خوا دەفەرمــوێ: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ﴾، لــە بــارەی زەینــەبی کچــی جەحشــەوە هاتــە خــوار، کــە زەیــدی هاوســەری هــات بــۆ لای پێغەمبــەر ﷺ ســکاڵای کــردو ویســتی تەڵاقــی بــدات، پێغەمبەریــش فەرمــووی ﷺ: ژنەکــەت لــە لای خــۆت بهێڵــەوەو، پارێــز لــە خــوا بکــە.

**پێشتریش گوتمان:**

زەینەب دایکی ناوی ئومەیمە بووە، کچی عەبدولموتتەلیب، کە دەکاتە خوشکی بابی پێغەمبەری خوا ﷺ (عبداللـه) واتە: پووری.

ئنجا بابی زەینەب، ناوی (جەحش) بووە لە هۆزی (بەنی ئەسەد) و ئەویش لە (بەنی خوزەیمە)و، بابی هاوپەیمان بووە لەگەڵ (بنو عبدالشمس)دا، لە مەککە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم ئایەتانەدا باسی ڕووداوێکمان بۆ دەکات، کە ڕووداوێکی گرنگ و هەستیار بووە لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ، ئەویش بریتی بووە لەوە، کە دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەب - کە کچە پووری خۆیەتی، کچی خوشکی بابیەتی - دەیخوازێ بۆ زەیدی کوڕی حاریسە، کە کاتی خۆی کۆیلە بووەو، پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی بە کوڕی خۆی، لە سەردەمی پێش پێغەمبەرایەتییدا، هەرچەندە زەینەب و عەبدوڵڵای برای، ناڕازیی دەبن، بەڵام دوای ئەوەی زەیدو زەینەب ماوەیەك پێکەوە دەبن، پێکەوە ناگونجێن و، زەید چەند جارێك سکاڵای خۆی لە چنگ زەینەب دەباتە لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش پێی دەفەرموێ: هاوسەرەکەت بگرەو بیهێڵەوە، لە حاڵێکیشدا کە خوا ﷻ بە شێوەیەك لە شێوەکان، پێغەمبەری ﷺ حاڵیکردوە کە دوای ئەوەی زەید لە زەینەب جیا دەبێتەوە، خوا دەیکاتە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ، لەو بارەوە ئەم ئایەتانە هاتوونە خوار، کە مشت و مڕی زۆریان بە دوای خۆیاندا هێناوە.

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ﴾، هیچ پیاوێکی بڕوادار و، هیچ ئافرەتێکی بڕوادار بۆیان نیە، ﴿إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا﴾، هەر کاتێ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بڕیارێکیان دەرکرد، ﴿أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾، کە

بـە نسـبەت خۆیانـەوە لـە کاری خۆیانـدا مـافی سەرپشـك بوونیـان هەبـێ، کـە ئایـا ئـەو فەرمـان و بڕیـارەی خـوا، جێبەجـێ بکـەن یـان نـا؟! ﴿ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾، هـەر کەسـێکیش سـەرپێچیی لـە خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ بـکات، ﴿ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴾، ئـەوە بـە گومـڕا بوونێـکی ئاشـکرا، گومـڕا بـووە.

ئنجـا هەرچەنـدە وشـەی (زَیْد)یـان لـە جیـاتی (عبداللـه) بەکارهێـنراوە لـە هەنـدێ ڕیوایەتانـدا، بـەڵام وشـەی: ﴿ لِمُؤْمِنٍ ﴾، مەبەسـت پێـی عەبدوڵـڵای بـرای زەینەبـەو وشـەی: ﴿ مُؤْمِنَةٍ ﴾، مەبەسـت پێـی زەینـەبی کچـی جەحشـە، کـە پێغەمبـەر وەك کچـە پوورێـکی خـۆی کـە تێیڕادیـوە، فەرموویـەتی: تـۆ مـارە دەکـەم لـە زەیـدی کـوڕی حاریسـە، ئەویـش ڕەچەڵـەك و نەسـەبی خـۆی پـێ بەرزتـر بـوو لـە هـی وی و ڕازیـی نەبـوو، هەتـا خـوا لەسـەری کـردە شـتێکی ئیجباریـی و ناچاریـی، هەڵبەتـە بـۆ زەینـەب ئـەوە شـتێکی ناخـۆش بـووە و، هەروەهـا بـۆ عەبدوڵـڵاش، بـەڵام خـوا حیکمەتێـکی گەورەتـری لـەو پێناخـۆش بوونـەی ئـەوان لـە کارەکـەدا بینیـوە، ئەویـش بریتـی بـووە لـە هەڵوەشـاندنەوەی ئـەو نەرێتـەی سـەردەمی نەفامیـی کـە کاتێـك پیاوێـك کەسـێکی کـردوە بـە کـوڕی خـۆی، دوایـی لـە هەمـوو شـتێکدا وەك کـوڕی خـۆی مامەڵـەی لەگەڵـدا کـردوە، بـۆ وێنـە: بـۆی نەبـووە هاوسـەرێك کـە هـی ئـەو کـوڕە بـووە، دوای ئـەو مـارەی بـکات، وەك چـۆن مـرۆڤ ناتوانـێ بـووکی خـۆی، واتـە: هاوسـەری کـوڕی ڕاسـتەقینەی خـۆی مـارە بـکات، بـەو شـێوەیە مامەڵەیـان کـردوە، ئنجا خوا ویسـتوویەتی ئـەو عادەتـە هەڵبوەشـێنێتەوە، ئنجـا بەڵـێ بـۆ زەینـەب و برایەکـەی ناخۆش بـوو، بەڵام حیکمەتێـکی گەورەتـر لـە پێناخـۆش بـوونی ئـەوان، لـە کارەکـەدا هەبـووە، پاشـانیش خوا هـەم بـۆ زەینـەب، هـەم بـۆ برایەکـەی ئـەوە قەرەبـوو دەکاتـەوە، دوای ئـەوەی زەینەب لـە زەیـد جیـا دەبێتـەوە، دەبێتـە هاوسـەری پێغەمبـەر ﷺ کـە شـانازییەکی زۆر گـەورە بـووە، بـۆ زەینـەب و برایەکـەی و بـۆ خزمەکانیـشی.

﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ ﴾، یـاد بکـەوە! کاتـێ کـە تـۆ بـەو کەسـەت دەگـوت، کـە خـوا ﷻ چاکـەی لەگەڵـدا کـرد بـوو، بـەوە کـە بـە مرۆڤـی خوڵقانـدوەو، هیدایـەتی داوەو، هێناویـەتی بـۆ لای

پێغەمبەر ﷺو، هاتۆتە نێو ئیسلامەوە، ﴿وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ﴾ تۆش چاکەت لەگەڵدا کرد بوو، کە کۆیلە بوو، ئازادت کرد بوو، دوایی کردبووت بە کوڕی خۆت و ڕێزت لێنا بوو، دواییش کچە پووری خۆتت بۆ خواستبوو، هەرچەندە کچە پوورەکەشت پێی ناخۆش بوو لەگەڵ برایەکەی، یاد بکەوە! کاتێک کە پێت دەگوت: ﴿أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ﴾، ژنەکەت بهێڵەوە لە لای خۆت، دەستی لێ بەرمەدە.

چونکە زەید دەهاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سکاڵای دەکرد، کە زەینەب خۆی بەسەرمدا هەڵدەکێشێ، دەڵێ: ڕەچەڵەکی من لە هی تۆ بەرزترە، تۆ کۆیلە بووی و ئازاد کراوی، من واو تۆ وا، لێی بێزار بوو بوو، پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: بیهێڵەوە لە لای خۆت.

﴿وَاتَّقِ اللَّهَ﴾، پارێز لە خوا بکە، ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ﴾، شتێکت لە دڵی خۆتدا پەنهان دەکرد، کە خوا ﷻ دەرخەرو ئاشکراکەریەتی، کە بریتی بوو لە چی؟ بریتی بوو لەوە کە زەینەب دوایی دەبێتە هاوسەری تۆ، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ زانیویەتی و پەنهانی کردوە لە لای خۆی، ئەوەیە کە خوا بە شێوەیەک لە شێوەکان حاڵیی کردوە کە زەینەب دوای ئەوەی لە زەید جیادەبێتەوە، دەبێتە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ، ئەوە مانا ڕاستەکەیەتی، نەک ئەوە کە کەسانێکی دڵ نەخۆش، پێیان وایە پێغەمبەر ﷺ عاشقی زەینەب بووە و، خۆشەویستیی زەینەبی لە دڵی خۆیدا پەنهان کردوە!! بەڵام ئەوە هەر ڕێی تێناچێ، نە بێژەکانی قورئان دەیگەیەنن، نە سیاقەکەش دەیگەیەنێ و، نە لە پێغەمبەری خواش ﷺ دەوەشێتەوە، نە عەقڵ و مەنتیقیش قبووڵی دەکات،.

﴿وَتَخْشَى النَّاسَ﴾، هەروەها لە خەڵک دەترسای واتە: شەرمت لە خەڵک دەکرد و، مەترسییت لێیان هەبوو، کە دوایی قسەت لەسەر بکەن و لۆمەت بکەن، ﴿وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ﴾، بەڵام خوا ﷻ شایستەتر بوو کە ترست لێی هەبێ و، شەرمی لێ بکەی.

بۆیە: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا﴾، کاتێک کە زەید کارو پێویستیی پێی نەما، پێویستیی خۆی لێ ئەنجامدا، دڵی لەسەری نەما، ﴿زَوَّجْنَٰكَهَا﴾، ئەوە لە تۆمان مارە بڕی، ئایا ئەوە حیکمەتەکەی چییە؟ ﴿لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ﴾، بۆ ئەوەی لەسەر بڕواداران هیچ سەغڵەتیی نەبێ، ﴿فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ﴾، لە مارەکردنەوەی هاوسەرانی ئەوانەدا کە کردوویانن بە کوڕی خۆیان، ﴿إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا﴾، هەر کاتێ پێویستییان پێیان نەما و وازیان لێهێنان، کە بتوانن مارەیان بکەنەوە، نەک وەک هاوسەری کوڕی ڕاستەقینەیان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، وەک کچی خۆیان بن، ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا﴾، فەرمان و کاری خواش ئەنجامدراوە.

کەواتە: ئەوەی خوا ﷻ دەریخستوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ﴾، لە نەفسی خۆتدا، لەبەر خۆتەوە شتێک پەنهان دەکەی کە خوا ئاشکراکەرەتی، ئەوەی خوا ئاشکرای کردوە، هەر ئەوەیە کە زەینەبی لێ مارە کردوە، هیچی دیکەی ئاشکرا نەکردوە، ئنجا حیکمەتەکەشی بەس ئەوە بووە کە ئەرێتە نەفامییەکە هەڵبوەشێنێتەوە، کە هاوسەرانی ئەوانەی پیاوەکان کردوویانن بە کوڕانی خۆیان، کاتێ لێیان جیا دەبنەوە، بزانن کە وەک ئافرەتانی دیکە، بۆیان ڕەوا و حەڵاڵن، هاوسەرگیرییان لەگەڵ بکەن.

﴿مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ﴾، پێغەمبەر ﷺ هیچ سەغڵەتیی لەسەر نیە، لە شتێکدا کە خوا بۆی دیاریی دەکات، بۆی بڕیار دەدات، ﴿سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ﴾، ئەوەش یاسای خوایە لە گەلانێکدا کە لەوەو پێش ڕابردوون، ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾، فەرمانی خواش ئەندازەگیریی بۆ دانراوو کراوە، نەخشەی بۆ دانراوەو جێبەجێکراوە.

﴿ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ﴾، ئەوانەی پەیامەکانی خوا دەگەیەنن و، لێی دەترسێن و جگە لە خوا لە کەسی دیکە ناترسێن، واتە: تۆش لە ڕیزی ئەوانە دای، ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا﴾، خواش بەسە بۆ لێپرسینەوە.

لـە کۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ ﴾، موحەممـەد ﷺ بـابی هیـچ کام لـە پیاوەکانتـان نیـە، چونکـە لـە سـەردەمی نەفامیـداو دواتریـش کـە ئیسـلام هـات، هـەر بـە زەیدیـان دەگـوت: (زیـد بـن محمـد) زەیـدی کـوڕی موحەممـەد، خـوا ئـەوەی هەڵوەشـاندەوەو فەرمـووی: موحەممـەد بـابی هیـچ کامێـك لـە پیاوەکانتـان نیـە، بۆچـی نەیفەرمـووە: بـابی ئافرەتەکانتـان نیـە؟ چونکـە هیـچ ئافرەتێـك پێغەمبـەری خـوا ﷺ تەبەننیـی نەکـردوە، بیـکات بـە کچـی خـۆی، تاکـو بفەرمـوێ: بـابی هیـچ کام لـە پیـاوان و ئافرەتانتـان نیـە، تەنیا زەیـدی کـرد بـوو بـە کـوڕی خـۆی لـە پێـش پێغەمبەرایەتییـدا، هەڵبەتـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ چـوار کچیـشی هەبـوون: (رقیـة و أم کلثـوم و زینـب و فاطمـة) خـوا لێیـان ڕازی بـێ.

﴿ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾، بەڵکـو موحەممـەد ﷺ ڕەوانەکـراوی خوایـەو کۆتایـی پێغەمبەرانـە، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴾، خـواش ﷻ بـە هەموو شـتێك (هـەر لـە ئەزەلـەوە) زانـا بـووە و، هەمـوو شـتێك دەزانـێ، هەمـوو شـتێکی لـێ عەیانـەو، هەمـوو شـتێك بـۆ خـوا ﷻ ئاشـکرایە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە بابای بڕوادار، نێر بێ یان مێ، پیاو بێ یان ئافرەت، بۆی نیە لە بەرانبەر بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەیدا ﷺ مافی سەرپشك بوون و هەڵبژاردن بە خۆی بدات، بەڵکو دەبێ ملکەچ و پابەند بێ، بە حوکم و بڕیارێکەوە کە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، یان پێغەمبەرو ڕەوانەکراوەکەیەوە ﷺ، دەردەچێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ﴾، هیچ پیاوێکی بڕوادار و، ئافرەتێکی بڕوادار بۆیان نیە.

٢)- ﴿إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا﴾، هەر کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانێکیان کرد، بڕیاری فەرمانێکیاندا، بڕیاری ئەرکێکیاندا.

٣)- ﴿أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾، کە لە کاروباری خۆیاندا مافی سەرپشك بوونیان هەبێ، خوێنراویشەتەوە: (أَنْ تَكُوْنَ لَهُمُ الخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ)، هەردووکیان یەك واتایان هەیە، (الخِيَرَةُ: إسْمُ مَصْدَرِ تَخَيَّرَ، مِثْلُ الطِّيَرَةَ مِنْ تَطَيَّرَ)، شارەزایانی زمان دەڵێن: تەنیا ئەو دوو وشەیە هەن، کە چاوگەکەیان لەسەر کێشی (فِيَعلة)ە بێ، (خِيَرَة) واتە: هەڵبژاردن، سەرپشك بوون، (طِيَرَةَ) واتە: باڵندە فڕاندن، یاخود گەشبینیی و ڕەشبینیی کردن، کە (خِيَرَة)، لە (تَخَيَّر)وە هاتوە، واتە: هەڵیبژارد (طِيَرَةَ) لە (تَطَيَّرَ)وە هاتوە، لە ئەصڵدا واتە:

باڵندەی فڕاند، بەڵام بۆ ئەوەیان بەکارهێناوە، کە ئەگەر باڵندەکە بە لای ڕاستدا ڕۆیی و گوتوویانە: (تَيَامُنُوا) واتە: ئەو سەفەرە، یان ئەو کارە خێرو خۆشییە، بیکەن، بەڵام ئەگەر بە لای چەپدا ڕۆیبێ، گوتوویانە: (تَشَاءَمُوا) واتە: ڕەشبینیی گرتوونی و ئەو کارەیان نەکردوە، کە ویستوویانە بیکەن.

٤)- ﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾، هەر کەسێك سەرپێچیی لە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات.

٥)- ﴿فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾، بە گومڕا بوون و سەر لێشێوانێکی ئاشکرا، گومڕا بووەو سەری لێشێواوە، وشەی (ضَلَّ) هەم بە تێپەڕکەر (مُتَعَدِّي) دێ، بۆ وێنە: (ضَلَّ الطَّرِيْقَ)، ڕێیەکەی ونکرد، هەم بە بەرکار نەخواز (لازِم)یش دێ، وەك: (ضَلَّ عَنِ الطَّرِيْقَ) واتە: لە ڕێیەکە ون بوو، لێرەدا: وشەی (ضَلَّ) هەردوو واتایەکەی لەگەڵدا دەگونجێن، دەگونجێ بڵێی: خۆی ون بووە بە ون بوونێکی ئاشکرا، یاخود: ڕێی ونکردوە بە ڕێ ونکردنێکی ئاشکرا.

## لەو بارەوە ئەم گێڕدراوەیە دەخەینە ڕوو:

(الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناویەتی: [قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا: انْطَلَقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى فَتَاهُ زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ، زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ، فَاسْتَنْكَفَتْ، وَأَبَتْ، وَأَبَى أَخُوهَا عَبْدُ اللهِ بْنُ جَحْشٍ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾، فَتَابَعَتْهُ وَرَضِيَتْ][(1)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ ئەوەی بۆ گەنجەکەی خۆی زەیدی کوڕی حاریسە، زەینەبی کچی جەحش (کە کچە پووری خۆی بوو) بیخوازێ، بەڵام ئەو خۆی بە زلگرت، ئامادە نەبوو، هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی جەحش (کە برای زەینەب بوو) ئامادە نەبوو، ئیدی خوای بەرز لەو بارەوە ئەمەی ناردە خوار: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا

(١) جامع البيان برقم: ٢٨٥٤١.

مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴾، کاتێـك خـوا ﷻ لـە سـەرووی حـەوت ئاسـمانانەوە بڕیـاری دەرکـرد، ئنجـا زەینـەب ڕازیـی بـوو و شـوێن پێغەمبـەر ﷺ کـەوت، عەبدوڵڵاش بـە هەمـان شـێوە.

ئێمـە پێشـتر ڕیوایەتێکـمان هێنـا، دەڵـێ: مەبەسـت لـە (مُؤْمِنَةٍ ) زەینەبـە، بـەڵام مەبەسـت لـە (مؤمـن) زەیـدە! کـە بێگومـان ئـەوە ڕاسـت نیـە، چونکـە داخوازییەکـە بـۆ زەیـد کـراوەو زەیـد پێیخـۆش بـووە، نـەك ڕازی نەبـێ و، بـە زۆر ئـەو ژن هێنانـەی بەسـەردا بسـەپێنرێ، شـتی وانـە بـووە، بـەڵام ئافرەتەکـە ڕازی نەبـووە ئەویـش لەبـەر ئـەوەی کـە ڕەچەڵـەك و نەسـەبی خـۆی پـێ بەرزتـر بـووە لـە هـی زەیـد، گوتوویـەتی: مـن کچـە پـووری پێغەمبـەرم ﷺ، بـەڵام زەیـد کاتێ خـۆی کۆیلـە بـووەو ئـازاد کـراوەو، پێغەمبـەری خـوا ﷺ کردوویـەتی بـە کـوڕی خـۆی، ئنجا ئـەو عادەتـەی بـە کوڕگرتـن (تبنيٌ)یـش بـە هـۆی زەیـدەوە بـە پلـەی یەکـەم هەڵوەشـێنراوەتەوە.

کەواتـە: مەبەسـت لـە: (مؤمـن) بـە پلـەی یەکـەم عەبدوڵڵای کـوڕی جەحشـە بـرای زەینـەب، بـەڵام وەك زانایـان گوتوویانـە: (إِنَّ خُصُـوصَ السَّـبَبِ لاَ يَمْنَعُ شُـمُولَ المَعْنَـى)، واتە: تایبـەت بـوونی هـۆکاری دابەزینـی ئایەتێـك، نابێتـە ڕێگـر لـە گشـتگیربوونی واتایەکـەی، لێرەدا خـوا ﷻ نەیفەرمـووە: (وَمَـا كَانَ لعَبْـدُ اللـهِ بْـنُ جَحْـشٍ ولَا لِزَيْنَـب بِنْـت جَحْـشٍ)، یـان (وَلَا لأخْتِـهِ) بەڵکـو فەرموویـەتی: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ ﴾، هیـچ پیاوێـکی بـڕوادارو ئافرەتێـکی بـڕوادار بۆیـان نیـە، کاتێـك کـە خـوا فەرمانێـك دەر دەکات و، پێغەمبـەری خـوا ﷺ بڕیارێـك دەدات، مـافی سەرپشـك بـوون بـە خۆیـان بـدەن.

کـە دەفەرمـوێ: (مِنْ أَمْرِهِمْ )، (مِـنْ: للتَّبْعِيـضِ، أَمْرِهِـمْ: شَـأْنِهِمْ، وَالمَعْنَـى: مَـا كَانَ اخْتِيَارُ بَعْضِ شُـؤُونِهِمْ مِلْـكاً يَمْلِكُوْنَـهُ، بَـلْ يَتَعَيَّنُ عَلَيْهِـمْ اتِبَاعُ مَـا قَضَى اللـهُ بِـهِ وَرَسُـوْلُهُ)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ﴾، (مِنْ ) بـۆ هەندێکـە، (أَمْرِهِمْ ) یـانی: حـاڵ و کاروباریـان، ماناکـەشی ئەوەیـە کـە هەڵبـژاردنی هەندێـك لـە کارەکانیـان موڵـکی ئـەوان نیـە، بەڵکـو لەسـەریان پێویسـتە شـوێن ئـەوە بکـەون، کـە خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ بڕیـاری لەسـەر دەدەن.

## سێ کورتە سەرنج

١)- مرۆڤی مسوڵمان نێر، یان مێ، گەورە یان گچکە، لە بەرانبەر فەرمانی خوادا و، لە بەرانبەر فەرمانی پێغەمبەری خوادا ﷺ، جگە لە ملکەچ بوون و فەرمانبەربوون، هیچ هەڵوێستێکی دیکەیان لێ ناوەشێتەوەو بۆ ڕەوا نیە.

٢)- لێرەشدا پلەو پایەی هاوەڵان بە نێرو مێیانەوە، دەردەکەوێ، کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چەند ملکەچ بوون بۆ بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، با لە دڵیشدا پێیان خۆش نەبووبێ، بەڵام پابەندیی بە ئایین و بەرنامەی خواوە و، پابەندیی بە فەرمانی سەرووی خۆوە، نەبەستراوەتەوە بەوەی هەمیشە مرۆڤ ئەو شتەی لە شانی خۆش بێ و پێیخۆشبێ، وەك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ، فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ؛ فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ**} (أخرجه أحمد: ٦٢٧٨، والبخاري: ٦٧٢٥، ومسلم: ١٨٣٩، وأبو داود: ٢٦٣٦، والترمذي: ١٧٠٧، والنسائي: ٤٢٠٦، وابن ماجه: ٢٨٦٤، عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ).

واتە: مرۆڤی مسوڵمان لەسەری پێویستە گوێڕایەڵ بێ و فەرمانبەر بێ، لە شتێکدا کە حەزی لێ دەکات و، لە شتێکدا کە حەزی لێ ناکات، مادام فەرمانی پێ نەکرێ بە سەرپێچیی، ئنجا ئەگەر فەرمانی پێکرا بە سەرپێچیی، نەگوێڕایەڵیی هەیەو، نە فەرمانبەریی.

٣)- لە ڕوونکەرەوانی واتاکانی قورئان، ئەوەندەی من سەرنجم داون، کە نیزیکەی سی (٣٠) تەفسیرم لە لایە، تەنیا (**محمد الطاهر بن عاشور**) لە تەفسیرەکەیدا[1] گوتوویەتی: ئایەتی ژمارە (٣٦)، مەککەییە، چونکە زەیدو زەینەب (خوا لێیان ڕازیبێ) لە مەککە هاوسەرگیرییان کردوە پێش کۆچکردن بۆ مەدینە! ئەوانی دیکە هەموویان ڕایان وایە،

---

(١ ) التحرير والتنوير: ج٢٢، ص٣٦.

کە نەخێر ئەو مەسەلەیە لە مەدینە بووە و، ئەو ئایەتە موبارەکەش بە پێی قسەی ئەو بێ، دەبێ لە مەککە دابەزیبێ و دوایی خرابێتە گەڵ سوورەتی (الأحزاب)!

بەڵام لە ڕاستییدا هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیە، بۆیە ڕایەکەی بە بێهێز و ڕەتکراوە دادەنرێ، چونکە سوورەتی (الأحزاب) هەمووی بە یەکەوە هاتوە، ئنجا ئەو دەڵێ: ئەو ئایەتە پێشتر هاتوە بە تەنیا، بەڵام دوایی مەسەلەی جیابوونەوەی زەیدو زەینەب لە مەدینە ڕوویداوە، بەڵام بەڵگەیەکی وای نەهێناوە، بۆیە پشتی پێ نابەسترێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**سووکە گلەییەك لە لایەن خوای کارزانەوە لە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ، بە هۆی شەرم و ترس هەبوونیەوە لە خەڵك، لە مەسەلەی هاوسەرگیریی کردنی لەگەڵ زەینەبی کچە پووریدا، پاش جیابوونەوەی لە زەید و، ڕاگەیاندنی خوا ﷻ: کە دوای پەیوەندیی نەمانی زەید بە زەینەبەوە، زەینەبی لێ مارە کردوە و، حیکمەتەکەیشی هەڵوەشاندنەوەی نەریتی نەفامانەی بە کوڕ کردن (تبنّي) بووە، کە لە سەردەمی نەفامییدا بووە:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْاْ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ ﴾، یاد بکەوە! کاتێك بەو کەسەت دەگوت: کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوە و، تۆش چاکەت لەگەڵ کردبوو، ئەو کەسە بە تەئکید زەیدی کوڕی حاریسەی شەڕاحیلی کەلبییە، کە لە هۆزی (الكَلْبِي) بووە.**

**٢)- ﴿ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ ﴾، ژنەکەت لە لای خۆت بهێڵەوەو، پارێز لە خوا بکە.**

ئایا چاکە کردنی خوا لەگەڵ زەیددا چی بووە؟ بێگومان زۆر شت بووەو ئەمانە هەندێ لە چاکەکانن:

یەکەم: کە زەیدو هەموو مرۆڤەکان تێیدا بەشدارن، کە خوا لە نەبوونەوە هێناویەتە دی و، بە مرۆڤێکی تێر و تەواو خوڵقاندوویەتی.

دووەم: کە تایبەتمەندیی زەیدو بڕواداران بووەو، ئەویش ئەوە بووە کە دوایی خوا هیدایەتی داوە و، ئیمانی هێناوەو هاتۆتە نێو ئیسلامەوە.

سێیەم: کە تایبەتمەندیی خودی زەید بووەو جیا کەرەوەی بووە لەوانی دیکە، بریتی بووە لەوە کە:

أ- قسمەتی کەوتۆتە گەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێش ئیسلام، قسمەتی چۆتە لای موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتتەلیب ﷺ و ئەوی هەڵبژاردوە بەسەر کەس و کارەکەیدا.

ب- پێغەمبەریش ﷺ لە پاداشتی ئەوەدا، ئەوی کردوە بە کوڕی خۆی، کە ئەوە شانازییەکی گەورە بووە بە زەید دراوە، بۆیەش باب و مام و برایەکەی کە هاتن بە دواییدا، ڕازی بوون و، پێغەمبەریش ﷺ پێش ئیسلام زەیدی کردوە بە کوڕی خۆی و، قورەیشی بە شایەد گرتوەو بە زەیدیان گوتوە: (زَيْدُ بْنُ مُحَمَّد).

ج- هەروەها ئەوە کە خوا زەیدی لە چنگ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەربازکردوە.

د- دواییش موحەممەد ﷺ خوا کردوویەتی بە پێغەمبەری کۆتایی خۆی ﷺ و، زەیدیش یەکەمین کەسێك بووە لەوانەی لێی نیزیك بوون و بڕوای پێهێناوە.

ئەوانە هەموویان چاکەی خوا بوون لەسەر زەید ؓ.

چاکەی پێغەمبەریش بەسەر زەیدەوە ئەوە بووە کە:

١- ئازادی کردوە لە کاتێکدا کۆیلە بووە و، کردوویەتی بە کوڕی خۆی.

٢- خۆشەویستییەکی تایبەتیی بۆی هەبووە.

٣- كچە پووری خۆی بۆی خواستوە.

٤- پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ سوپایەکی نەناردوە، یان بەشێك لە سوپایەك کە زەیدی کوڕی حاریسەیان تێدابوو بێ، مەگەر زەیدی کردوە بە فەرماندەیان، دیارە زەید پیاوێکی شایستەو لێوەشاوە بووە.

هەڵبەتە خەڵکێکیش تانەیان لەو کردوەو هەڵوێستەی پێغەمبەر ﷺ داوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی نەداوە بە تانە لێدانی ئەوان، چونکە تانە لێدانی ئەوان لەبەر ئەوە نەبووە، زەید شایستە نەبێ و کەفائەتی نەبێ، بەڵکو لەبەرئەوە بووە کە کاتی خۆی کۆیلە بووە و ئازادکراوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ ﴾، ژنەکەت هەر لەلای خۆت بهێڵەوەو مامەڵەی لەگەڵدا بکە، (فَالْإِمْسَاكُ: مُسْتَعَارٌ لِبَقَاءِ الصُّحْبَةِ، تَشْبِيهًا لِلصَّاحِبِ بِالشَّيْءِ الْمُمْسَكِ بِالْيَدِ)، وشەی (إِمْسَاك) خوازراوەتەوە بۆ مانەوەی هاوەڵایەتیی، کە ئەو هاوەڵە، تەشبیە دەکرێ بە شتێکەوە کە بە دەستیەوەیەتی، ئنجا لەبەر ئەوەی پیاو ئافرەت دەخوازێ، هێشتنەوەو دەست لێبەردانی ژن بە دەستی پیاوە، بۆیە فەرموویەتی: لە لای خۆت بیهێڵەوە.

﴿ وَاتَّقِ اللَّهَ ﴾، واتە: پارێز لە خوا بکە، لە مامەڵەت لەگەڵ زەینەبدا، لێبوردنت هەبێ، سەماحەتت هەبێ و، تەحەممولی بکە، چونکە زەینەب خۆی بەسەر زەیددا هەڵکێشاوە، خۆی پێ لەو بەرزتر بووە، وەك لە هەندێ ڕیوایەتاندا هاتوە.

٣)- ﴿ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ ﴾، یاد بکەوە! کاتێك کە تۆ ئەوەی خوا ئاشکراکەریەتی، لە دڵی خۆتدا پەنهانت دەکرد، ئنجا ئایا ئەوە چی بووە کە خوا دوایی دەریخستوە؟ بریتی بووە لە هاوسەرگیریی کردن لەگەڵ زەینەبدا.

خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی موحەممەد ﷺ ئاگادار کردۆتەوە، کە دوای ئەوەی زەید دەست لە زەینەب هەڵدەگرێ و، لێك جیادەبنەوە، لەبەر ئەوەی پێکەوە

ناگونجێن، زەینەب دەبێتە هاوسەری تۆ، تاکو ئەو نەریتەی سەردەمی نەفامیی بەوە هەڵبوەشێنێتەوە، کە بە کوڕ کراو (مُتَبَنّى)یان بە کوڕی ڕاستەقینەیان دادەنا، کەواتە: هاوسەرەکەیشیان بە مەحرەم دادەنا، بۆ ئەو کەسەی ئەو پیاوەی بە کوڕی خۆی کردوە.

بەڵام کاتێک زەینەب کە هاوسەری زەید بووە، خوا لە پێغەمبەری خۆی ﷺ مارەی کرد، کە کاتی خۆی موحەممەد بە حیساب باوکی زەید بووە، مانای وایە ئەو عادەتە لە ڕەگ و ڕیشەوە هێنراوەتە دەرێ و هەڵوەشێنراوەتەوە، خوای پەروەردگار پێغەمبەری خۆی، موحەممەدی ﷺ بۆ ئەو ئەزموونە قورسە هەڵبژاردوە.

کەواتە: ﴿وَتُخۡفِي فِي نَفۡسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبۡدِيهِ﴾، ئەوە کە خوا ئاشکراکەریەتی لە دڵی خۆتدا پەنهانی دەکەی، بریتیی بووە لە هاوسەرگیریی کردن لەگەڵ زەینەبدا، چونکە خوا دوایی هەر ئەوەی دەرخستوە.

٤)- ﴿وَتَخۡشَى ٱلنَّاسَ﴾، سام لە خەڵکی دەکەی، وشەی (ٱلنَّاسَ)، (أل) بۆ ناساندنی (عَهْد)ە، یانی: لە خەڵکەکە، خەڵکە زانراو و ناسراوەکە، واتە: مونافیقەکان و دڵنەخۆشەکان، لەوانە دەترسێی، هەڵبەتە لێ ترسانەکە مەبەست ئەوە بووە: شەرمیان لێ دەکەی، ترس و بیمی ئەوەت هەیە دوایی قسەت لەسەر بکەن.

٥)- ﴿وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَىٰهُ﴾، بەڵام خوا شایستەترە کە شەرمی لێ بکەی، ترست بەرانبەری هەبێ، نەك ئەو خەڵکە دڵنەخۆش و مونافیقە، (الخَشْيَةُ: هُنَا كَرَاهِيَةُ مَا يُرْجِفُ بِهِ المُنَافِقُوْن)، لێرەدا مەبەست لە (خَشْيَة) پێناخۆش بوونی ئەوەیە، کە دوایی مونافیقەکان بیکەنە کەرەستەی پڕ و پاگەندەو بانگەشەی خراپ لە دژی پێغەمبەر ﷺ.

زانایان باسیان کردوە کە ئایا ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەنهانی کردوە لە دەروونی خۆیدا، چی بووە؟

بە داخەوە کە هەندێك لە تەفسیرە موعتەبەرەکان وەك تەفسیری (الطبري) و (القرطبي)و ژمارەیەکی دیکە لە تەفسیرەکان، هەرچەندە دوایی (القرطبي)

ڕایەکەی دیکەی زاڵ کردوە، بەڵام هەندێکیان دەڵێن: ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەروونی خۆیدا پەنهانی کردوە، بریتی بووە لە خۆشەویستیی و عیشقی بۆ زەینەب!!

بەڵام بە تەئکید ئەو ڕایە ڕاست نیە، چونکە ئەوەی خوا دەفەرموێ: ئەوە لە دڵی خۆتدا پەنهان دەکەی، کە خوا ئاشکراکەرەیەتی، ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ﴾، یانی: (مَا اللهُ مُظْهِرُهُ) ئایا خوا دوایی چی دەرخستوە؟ خوا ئەوەی دەرخستوە کە زەینەب لە تۆ مارە دەکەین، کەواتە: خوای پەروەردگار پێغەمبەری ﷺ خۆی ئاگادار کردۆتەوە، دوای ئەوەی زەیدو زەینەب لێك جیا دەبنەوە، ئێمە زەینەب لە تۆ مارە دەکەین، ئنجا ئایا ئەوە لە چ ڕێیەکەوە خوا ﷻ ئەوەی بە پێغەمبەر ڕاگەیاندوە؟ یان بە ئیلهام بووە، یان بە وەحیی بووە، یاخود لە خەونێکدا بووە، هەروەك چۆن پێش ئەوەی دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازیبێ) بێنێت، جیبریل وێنەکەی پێشانداو پێیگوتوە: ئەوە دەبێتە هاوسەری تۆ، وەك دایکمان عائیشە گێڕاویەتەوە:

[عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أُرِيتُكِ فِي الْمَنَامِ مَرَّتَيْنِ، إِذَا رَجُلٌ يَحْمِلُكِ فِي سَرَقَةِ حَرِيرٍ، فَيَقُولُ: هَذِهِ امْرَأَتُكَ فَأَكْشِفُهَا، فَإِذَا هِيَ أَنْتِ، فَأَقُولُ: إِنْ يَكُنْ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللهِ يُمْضِهِ] (أَخْرَجَهُ البخاري: ٣٦٨٢، ومُسْلِم: ٢٤٣٨)

واتە: عائیشە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەی عائیشە!) دوو جاران لە خەون دا تۆیان پێشاندام، پیاوێك لە پۆشاکێکی ئاوریشم دا هەڵیگرتبووی (وێنەکەت) دەیگوت: ئەمە ئافرەتەکەتە، منیش پەردەکەم لا دەدا، تۆ بووی، منیش دەمگوت: ئەگەر ئەمە لە خواوە بێ دەیرۆێنێ.

٦)- ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا﴾، دوای ئەوەی زەید پێویستیی پێی نەما و، کاری خۆی لەگەڵ تەواو کرد، (قَضَى: أَي أَتَمَّ وَاسْتَوْفَى) تەواوی کرد، (الْوَطَر: الحَاجَةُ الْمُهِمَّة)، پێویستیی گرنگ، یاخود ئارەزوو، دوای ئەوەی زەید ئارەزووی لێ نەما، یاخود چیی دیکە مەبەستی نەبوو لە لای خۆی بیهێڵێتەوە، لێی بێزار بوو.

٧)- ﴿ زَوَّجۡنَٰكَهَا ﴾، لە تۆمان مارە بڕی، لە نێو هەموو هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەردا ﷺ ناوی زەید لە قورئاندا هاتوە، ئەویش لێرەدا هاتوە، یەك جار.

كە دەفەرموێ: ﴿ زَوَّجۡنَٰكَهَا ﴾، واتە: لە تۆمان مارەبڕی:

هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: (أَذِنَّـا لَـكَ أَنْ تَتَزَوَّجَهَـا) ئـەوە مۆڵەتمـان دای، كـە مـارەی ببـڕی، خوازبێنـی بكـەی، بیخـوازی لـە كـەس و كاری و مـارەی بكـەی.

بـەڵام ڕای یەكەمیـان بەهێزتـرە و خـوای كارزان كـە مـارەی كـردوە و، پێویسـتیی بـەوە نەبـووە لـە كـەس و كاری بیخـوازێ، چونكـە خـوا لـە سـەرووی حـەوت ئاسـمانانەوە، لێـی مـارە بڕیـوە.

ئنجـا ئایـا حیكمـەتی ئـەوە چییـە كـە دەفەرمـوێ: ﴿ زَوَّجۡنَٰكَهَا ﴾، كـە خوێنراویشـەتەوە: (زَوَّجْتُكَهَا)، لـە تۆمـان مـارە بـڕی، هـەردوو خوێنراوەكـە هەریـەك واتایـان هەیـە؟ حیكمەتەكـەی ئەوەیـە كـە دەفەرمـوێ:

٨)- ﴿ لِكَيۡ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ حَرَجٞ فِيٓ أَزۡوَٰجِ أَدۡعِيَآئِهِمۡ إِذَا قَضَوۡاْ مِنۡهُنَّ وَطَرٗا ﴾، بۆیە (زەینەب)مان لە تۆ مارە كرد، تاكو بڕواداران سەغڵەتییان لەسەر نەبێ، بەرانبەر بە هاوسەرانی بە كوڕ كراوەكانیان، دوای ئەوەی پێویستییان پێیان نامێنێ و لێیان جیا دەبنەوە، واتە: هۆكاری ئەوە كە خوا ﷻ زەینەبی لە تۆ مارە بڕی، ئەوەیە كە ئەو نەریتەی پێ هەڵبوەشێنێتەوە و، بڕواداران لە بەرانبەر هاوسەرانی ئەو كەسانەدا، كە پێشتر بە كوڕی خۆیانیان كردوون، هەست بە سەغڵەتیی نەكەن، هەر كات لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا ویستیان ببنە هاوسەری یەكدی، لەبەر ئەوەی دوێنێ هاوسەری بابایەك بووە، كە ئەو پیاوە ئەو بابایەی كردوە بە كوڕی خۆی.

٩)- ﴿ إِذَا قَضَوۡاْ مِنۡهُنَّ وَطَرٗا ﴾، كاتێك پێویستییان پێیان نامێنێ و، لێیان جیا دەبنەوە.

١٠)- ﴿ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ مَفۡعُولٗا ﴾، فەرمانی خواش جێبەجێكراوە، (أَيْ مُتَّبَعٌ مُمْتَثَلٌ، فَلَا يَتَنَزَّهُ أَحَدٌ عَنْهُ)، فەرمانی خوا دەبێ پەیڕەویی لێكراو بێ و، جێبەجێكراو بێ و هیچ كەس خۆی لێ بە پاك نەگرێ، واتە: پێی وابێ، كە نابێ ئەو فەرمانە جێبەجێ بكرێ.

بـە عەرەبیـی ئـاوای لـێ دێتـەوە: (أي: فَلَـمَّا اسْـتَتَمَّ زَيْـدٌ مُـدَّةَ مُعَـاشَرَةِ زَيْنَـب، فَطَلَّقَهَـا، فَلَـمْ يَبْـقَ لَـهُ حَاجَـةٌ فيْهَـا زَوَّجْنَاكَهَـا)، هـەر کاتێـك زەیـد مـاوەی مامەڵـە و هەڵسـوکەوتی ژن و مێردایەتیـی لەگـەڵ زەینەبـدا تـەواو کـرد، وازی لـێ هێنـاو کاری پێـی نەمـا، یاخـود ئـارەزووی لێـی نەمـا، (زەینەب)مـان لـە تـۆ مـارە بـڕی، هەڵبەتـە دوای ئـەوەی عیـددەی بەسـەر دەچێـت.

(وَطَـرٌ) کـە بـە (أَوْطَـار) کۆدەکرێتـەوە، هـەروەك (الشـوكاني) کتێبێـکی هەیـە بـە نـاوی (نیـل الأوْطَـار)، (وَطَـرٌ) بـە مانـای پێویسـتیی دێ، بـە مانـای ئـارەزووش دێ، بـە مانـای کاری گرنگیـش دێ، پێویسـتییەکی گرنـگ (الحَاجَـةُ المُهِمَّـةُ).

کە دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا﴾، ئەمە دوو واتایان دەگەیەنێ:

أ- مەبەست فەرمانی تەشریعیی خوایە، فەرمانێ خوا کە دەینێرێ بە پێغەمبەردا ﷺ جێبەجێکراوە، واتە: هەر دەبێ جیبەجێ بکرێ و، لام و جیمی تێدا نەکرێ.

ب- مەبەست لە (أَمْر) فەرمانی تەکوینیی خوایە، ئەوەی خوا ویستی لەسەر بێ، جێبەجێ دەبێ و، هیچ شتێك ناتوانێ لە ڕێیدا ببێتە پەرچ.

ئنجا خوا لەسەر ئەو بابەتە بەردەوام دەبێ و، دەفەرموێ:

١١)- ﴿مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ﴾، پێغەمبەر ﷺ هیچ سەغڵەتیی و گوناهێکی لەسەر نیە، لەوەدا کە خوا بۆی دیارییکردوە.

﴿فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ﴾، (أي: قَـدَّرَهُ اللـه لَـهُ)، خـوا بـۆی دیارییکـردوە، یاخـود (أَذِنَ اللـه لَـهُ بِـهِ)، خـوا مۆڵـەتی داوە.

١٢)- ﴿سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلُ﴾، واتە: ئەوە یاسای خوایە، لەوانەدا کە پێشتر ڕابردوون، (سُنَّةَ: مَفْعُولٌ مُطْلَق)ە، (سنة) بەرکاری ڕەهایە، یانی: (سَنَّ اللهُ سُنَّةً فِي الَّذِيْن خَلَوْا مِنْ قَبْلُ)، ئەوە یاسای خوایە دایناوە لە گەلانی ڕابردووشدا، یاخود لە پێغەمبەرانی ڕابردووشدا، ئەگەر خوا شتێکی بۆ پێویست کرد بن، شتێکی بۆ دانابن، مۆڵەتێکی دابن،

هیچ سەغڵەتییان لەسەر نیەو گوناهیان ناگات و، کەسیش بۆی نیە ئەوەیان بۆ بکاتە مایەی تانە لێدان.

(سُنَّةَ) بە مانای یاسا دێ، لە ئەسڵی زمانی عەرەبییدا (**السُّنَّةُ: السِّيْرَةُ مِنْ عَمَلٍ أو خُلُقٍ يُلَازِمُهُ صَاحِبُهُ**)، (**سُنَّة**) بە مانای ڕەفتار لە کردارو ئاکار دێ، کە خاوەنەکەی پێوە پەیوەست بێ و لەسەری بەردەوام بێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُ ﴾، (**أي: سَنَّ اللهُ سُنَّتَهُ فِي الَّذِيْنَ مَضَوْا سَابِقاً**) ئەمە یاسای خوایە دایناوە، لەوانەدا کە پێشتر ڕابردوون، ئنجا چ مەبەست پێغەمبەران بێ، چ گەلان و کۆمەڵگاکان، بن.

١٣)- ﴿ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ قَدَرٗا مَّقۡدُورًا ﴾، فەرمانی خواش بڕیارێکی ئەندازەگیریی کراوە، (**قَضَاءً مَقْضِيّاً**)، (**القَدَرُ: إِيْجَادُ الأَشْيَاءِ عَلَى صِفَةٍ مَقْصُودَةٍ، وَهُوَ مُشْتَقٌّ مِنَ «القَدْرِ» وَهُوَ الكَمِيَّةُ المَضْبُوطَة**)، واتە: (**قَدَرُ**) بریتیە لە هێنانە دیی شتەکان، لەسەر سیفەتێکی بە ئامانجگیراو، کە وشەی (**قَدَرُ**) لە (**قَدْر**)ەوە هاتوە، (**قَدْر**)یش بە ئەندازەی دیارییکراوی شتێك دەگوترێ.

کەواتە: ﴿ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ قَدَرٗا مَّقۡدُورًا ﴾، واتە: فەرمانی خوا بڕیارێکی ئەندازەگیریی زانراو و دیارییکراوە، واتە: دەبوو هەر بەو شێوەیە بێت.

لێرەش دا دەگونجێ (أَمۡرُ ٱللَّهِ) مەبەست پێی (**الأمر التكويني**) بێ، واتە: فەرمانی هێنانەدی خوا ﷻ.

دەشگونجێ مەبەست پێی (**الأمر التشريعي**) بێ، واتە: فەرمانی یاسایی خوا، کە لە میانی ویستی مرۆڤەکاندا، یاساکانی خوا جێبەجێ دەبن، یان جێبەجێ نابن.

١٤)- ﴿ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ ﴾، کێن ئەوانەی لە پێش پێغەمبەردا ڕابردوون؟ ئەوانەی کە پەیامەکانی خوا دەگەیەنن.

١٥)- ﴿ وَيَخۡشَوۡنَهُۥ وَلَا يَخۡشَوۡنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ﴾، بەس لەو دەترسێن و سامی لێ دەکەن و، جگە لە خوا ﷻ لە کەسی دیکە ناترسێن و، سام لە کەسی دیکە ناکەن، شەرم لە کەسی دیکە ناکەن.

١٦)- ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴾، خواش ﷻ بەسە بۆ ژماردن و پاراستن، چونکە (حَسِيب) دەگونجێ بە مانای (مُحَاسِب) بێ، واتە: ژمێرەر و، دەشگونجێ بە مانای (حَافِظ) بێ، بە مانای پارێزەر، خوا ﷻ بۆ سەر ژمێرکردنی شتەکان و ژماردنیان و، بۆ پاراستن و کۆنترۆڵکردنیان، بەسە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، کە موحەممەد ﷺ بابی هیچ کام لە پیاوانی بڕوادار نیە، بەڵکو نوێنەری خواو کۆتایی پێغەمبەرانە:**

ئەم ئایەتانە هەموویان پێکەوە پەیوەستن، هەموویان بۆ هەڵوەشاندنەوەی عادەتی بە کوڕ کردن (تَبَنّي)، هاتوون، چونکە هەمیشە بە زەیدیان دەگوت: (زَيْدُ بنُ مُحَمَّد)، بەڵام زەید بابی ناوی حاریسەش کوڕی شەڕاحیل بوو، لە عەشیرەتی (كَلْبي) بوو:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ ﴾، موحەممەد ﷺ بابی هیچ کام لە پیاوانتان نیە، واتە: نە بابی زەیدە، نە بابی جگە لە زەیدیشە لە پیاوان، ئایا بۆچی باسی ئافرەتانی نەکردوە؟ چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ ئافرەتێکی تەبەننیی نەکردوە، پێش پێغەمبەرایەتیی، هەروەها دوای پێغەمبەرایەتییش، کە هەتا ئەم ئایەتانە هاتوونە خوارو بەکوڕکردن (تبنّي)یان قەدەغە کردوە، هەر ڕەوا بووە، هەروەك چۆن شەڕاب خواردن و قوماریش ڕەوا بوون، تاکو خوا قەدەغەی کردوون.

٢)- ﴿ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ ﴾، بەڵام موحەممەد ﷺ ڕەوانەکراوی خوایە، وشەی (رَّسُولَ ) بە مانای (مُرْسَل)ە، واتە: نێردراو، ڕەوانەکرا و، (نَبِي) یان (فَعِيْل)ی بە مانای (فَاعِل)ە، (نَبِي) واتە: (مُنْبِي) کەسێك کە هەواڵ دەدات، یاخود (فَعِيْل)ی بە مانای (مَفْعُول)ە، بە مانای (مُنْبَأ)، کەسێك کە هەواڵی پێ دەدرێ، کە پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام) هەموویان هەم هەواڵ دەربوون، هەم هەواڵ پێدرا و بوون، هەم هەواڵیان داوە بە خەڵك، هەواڵی تایبەت کە خوا بۆی ناردوون، هەم بەشێوەی تایبەتیش خوا هەواڵی پێداون و بۆی ناردوون.

وشەی: ﴿ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ ﴾، بە سێ شێوە خوێندراوەتەوە:

یەك: ﴿ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ ﴾.

دوو: (وَلَكِنَّ رَسُولَ اللهِ).

سێ: (وَلَكِنْ رَسُولُ اللهِ).

ئەمانە سێ جۆرە خوێندنەوە (قراءة)ن و هەر سێکیان یەك واتایان هەیە.

٣)- ﴿ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾، هەروەها کۆتایی پێغەمبەرانە.

ئەویش بە ﴿ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾، خوێندراوەتەوەو، خوێنراویشەتەوە: (وَلَكِنْ رَسُولُ اللهِ وَخَاتَمُ النَّبِيِّنَ)، بە بۆر (ضَمْ) خوێندراوەتەوە، هەروەها وشەی (خَاتَمْ) یش یانی: کۆتایی، بە (خَاتِمْ)یش خوێنراوەتەوە واتە: کۆتایی پێهێنەر.

٤)- ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴾، خواش بە هەموو شتێك زانایە.

کەواتە: (خَاتَمْ: أي خُتِمُوا بِهِ كَالخَاتَمِ وَالطَّابِعِ لَهُمْ)، وەك چۆن شتێك مۆر دەکرێ، ئاوا پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە موحەممەد ﷺ خەتم کراون و کۆتاییانە، هەروەها (خَاتِمْ: خَتَمَهُم وَجَاءَ آخِرَهُمْ)، واتە: ئەو خەتمی کردوون، ئەو کۆتایی پێهێناون، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکیدا دەفەرموێ:

{إِنَّ مَثَلِي وَمَثَلُ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتاً، فَأَحْسَنَهُ، وَأَجْمَلَهُ، إِلاَّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ، وَيَعْجَبُونَ لَهُ، وَيَقُولُونَ: هَلاَّ وُضِعَتْ هَذِهِ اللَّبِنَةُ! فَأَنَا اللَّبِنَةُ، وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ} (أَخْرَجَهُ البُخَارِي: ٦٨٥٤، وَمُسْلِم: ٢٢٨٣).

واتە: بێگومان وێنەی من و وێنەی پێغەمبەرانی پێش من، وەك ئەوە وایە کە پیاوێك کۆشکێکی دروستکردبێ، زۆری چاککردبێ و جوانکردبێ، بەڵام یەك خشت مابێت لە گۆشەیەکدا، خەڵك بە دەوریدا بێن و بچن، بڵێن: چەند جوان و چەند ڕێکە، خۆزگە ئەو خشتەش ڕۆنرابایە! ئنجا من خشتی ئەو گۆشەیەم و، من کۆتایی پێغەمبەرانم.

## لافلێدەرانی پێغەمبەرایەتیی و بابییەکان و بەهائییەکان

شایانی باسە: لە دوای پێغەمبەر موحەممەد ﷺ و، بەڵکو لە ڕۆژگاری خۆیدا، هەندێك لە ساختەچیی و درۆزنەکان، لافی پێغەمبەرایەتییان لێدەوە، وەك (مُسَیْلِمَةُ الْکَذَّابِ) کە ناودارترینیانە و، (أسود العنسي)، لە پیاوان و، (سَجَاحِ الیمامة) لە ئافرەتان، کە دوایی (سَجَاح) مێرد بە (مُسَیْلِمَةُ الْکَذَّاب) دەکات.

هەروەها لە دوای پێغەمبەرەوەش ﷺ جارجار کەسانێك بوون، لافی پێغەمبەرایەتییان لێداوە، بەڵام هیچیان بۆیان نەچۆتە سەر و، هەموویان وەك گوتراوە: (مەیدانی درۆ کورتە)، دوای ماوەیەك یان لە بەین چوون، یان هەموو کەس زانیویەتی درۆزنن، یان بۆ خۆیان پەشێمان بوونەوەو، ئنجا هەیانبووە مسوڵمان بووەو، هەیانە لە شێتخانەدا خۆی بینیوەتەوە.

دوو تاقم لەو دواییانەدا لە سەدەکانی دواییدا پەیدابوون لە (شیعة) بوون، یەکیان (البَابیّة)، ئەوەی دیکە (البهائیّة).

### ا)- بابییەکان (البابیة):

لە وڵاتی فارس پەیدابوون لە ساڵی (١٢٠٦) کۆچییدا، کە پیاوێك دایمەزراند بە ناوی (علي محمد) کە لە شیعە تیپەڕێنەرەکانی ئیمامیی بوو، خەڵکی شیراز بوو، کارتێکراو بوو بە شێخ (أحمد الأحسائي)، کە بابایەکی صۆفیی باطینیی بوو، ڕێبازەکەی بە (الطَّرِیْقَةُ الشَّیْخِیّة) مەشهوورە، ئەو (علي محمد)ە، نازناوی خۆی دەنێ بە (بَابُ العِلم)، دوایی هەر پێی دەگوترێ: (البَاب) واتە: دەرگا، شوێنکەوتووانی بە (البابیّة) ناسراون، لافی پێغەمبەرایەتیی لێداوەو، کتێبێکی نوسیوە بە ناوی: (البَیَان)، کە دوایی لە ساڵی (١٢٦٦ز)دا، واتە: لە تەمەنی شەست ساڵییدا لە (تەبرێز) دەکوژرێ، لە سێدارە دەدرێ و، کۆتایی پێ دێ، بەڵام ئێستاش لەگەڵدابێ، خەڵکی پەڕاگەندە لە شوێنکەوتووانی ماون.

هەڵبەتە من لە مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا)، لە کتێبی سێیەمدا: (تەوژمە فیکرییەکانی مێژووی مسوڵمانان)، لەوێدا درێژتر لەو بارەوە دواوم و، لە بارەی هەموو جم و جۆڵە باتینییەکانەوە دواوم، کە ژمارەیان چواردە جووڵانەوەی باتینیی بووە و، هەمووشیان لە هەناوی شیعەگەرایەتیی دا پەیدابوون، مەگەر چۆن ئەگەرنا هەموویان لەوێوە هاتوون.

### ٢)- بەهائییەکان (البهائية):

دیارە ئەمانە لقێك بوون لە بابییەکان (البابية)و پاڵدەدرێتە لای دامەزرێنەرەکەی، کە بە (بهاء الله) ناسراو بووەو، ناوی (میرزا حسێن عەلی) بووە، خەڵکی تاران بووە، بۆتە قوتابی عەلی موحەممەد (باب) لە ڕێی نامە نووسینەوەو، بە زۆر لە وڵاتاندا گەڕاوەو لە هەندێکیان نەفیی کراوە، لە هەندێکیان سەفەری کردووەو، لە ساڵی (١٣٤٠) کۆچییدا لە (حیفاء) مردووە، ئەویش دیسان لافی پێغەمبەرایەتیی لێداوە و، سرووتە ئایینیەکانیان، وەك سرووتی ماسۆنییەکان دەچن، تەنها ئەوەندە هەیە ماسۆنییەکان لافی وەحیی بۆ هاتن لێ نادەن، بەڵام دیارە ئەو میرزا حسێن عەلییە، لافی ئەوەی لێداوە کە وەحیی بۆ دێ.

لەو مەوسووعەیەی ناوبراودا، باسی (البهائية)م، وردتر کردووەو ئاماژەم کردووە بەسەرچاوە مێژووییەکان، هەروەها بە بۆنەی ئەوەوە کە موحەممەد ﷺ کۆتایی پێغەمبەرانە و، دەرگای پێغەمبەرایەتیی و وەحیی بە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ گاڵەدراوەو داخراوە، بۆیە باسی ئەو دوو تاقمەم کرد، ئەم کورتەیەم بە تۆزێ دەستکارییەوە لە تەفسیرەکەی[1] (محمد الطاهر بن عاشور) وەرگرت.

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٢، ص٤٦، ٤٧.

## کورتە باسێک لە بارەی بەسەرهاتی زەیدو زەینەبەوە

**ئێمە لە دوازدە (١٢) خاڵدا، کورتە باسەکە دەخەینە ڕوو:**

**١)- ئەرکی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دوای خوا بە یەکگرتن، بریتیە لە پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی کۆمەڵگا و، هەڵوەشاندنەوەی ڕەفتارو نەریتە نەفامییەکان، دیارە پێغەمبەران خۆیان پاڵەوانی ئەو کارە بوون و، هەر شتێکی قورس بوو بێ، خۆیان دەستیان داوەتێ، خۆیان تاکە سواری ئەو مەیدانە بوون.**

**٢)- کۆتایی پێغەمبەران موحەممەد ﷺ لەو بارەوە، لە لای هەموو کەس ئاشکرایە، کە پشکی شێری پێبڕاوە، نەوە تەنیا سێسەدو شەست (٣٦٠) بتەکەی نێو کەعبە نەبوون، کە موحەممەد ﷺ شکاندنی، لە ساڵی هەشتەمی کۆچییدا، دوای ئازادکرانی مەککە، بەڵکو بەر لەوە، بتەکانی کە لە ڕووی فیکریی و، دەروونیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسیی و، خێزانیی و، لە هەموو ڕووەکانەوە هەبوون، ئەو بتانەی شکاندن لە عەقڵ و دڵی خەڵکدا.**

**٣)- یەکێك لەو نەریتانەش کە لە سەردەمی نەفامییدا هەبوون، نەریتی بە کوڕ کردن (تَبَنِّي) بوو، کە بریتیە لەوەی کەسێك، کوڕێکی گەنج، یاخود بە تەمەن، بکات بە کوڕی خۆی، کە لە هەموو ڕوویەکەوە بە کوڕی ئەو دانراوەو، بە مەحرەم دانراوە بۆ خێزانی و بۆ کچەکانی و میراتی لێ بردوە و ...هتد، ئنجا خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی خۆی موحەممەدی ﷺ بۆ ئەو ئەرکە، گرنگە هەڵبژاردوە، کە ئەو نەریتە نەفامییەی پێ هەڵوەشێنێتەوە لەگەڵ دوو کەسی دیکەی زۆر نیزیکی دا:**

**یەکەم: زەینەب، کە کچی پووری بووە، کچی ئومەیمە بووە، ئومەیمەش کچی عەبدولموتتەڵیبە.**

**دووەم: زەیدی کوڕی حاریسە، کە کەسێکی زۆر نیزیك و تایبەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، هەم پێش ئیسلام و، هەم دوای ئیسلام.**

٤)- هەر کەسێ سەرنجی ئایەتەکانی: (١ - ٥) سەرەتای سوورەتی (الأحزاب) بدات، هەروەها ئایەتەکانی: (٣٦ - ٤٠)، زۆر بە ڕوونیی بۆی دەردەکەوێ، کە لەو ئایەتانەدا ئەوەی بە ئامانج گیراوە، هەڵوەشاندنەوەی ئەو نەریتە نەفامییەیە، زۆر بە ئاشکرا دیارەو خوا ﷻ هەر لە سەرەتاوە کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١﴾﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔى تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ ۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾﴾، هەروەها دواتر لە ئایەتەکانی: (٣٦ - ٤٠)دا، زۆر بە ئاشکرا دیارە، کە ئەوەی بە ئامانج گیراوە، لەو ئایەتە موبارەکانەدا، هەڵوەشاندنەوەی ئەو نەریتە بووە.

٥)- ئەو گێڕدراوانە (المرويات)انەی، لەو بارەوە هاتوون کە (الطبري) و (القرطبي) و (الشوكاني) و (إبن عاشور) هێناویانن، بەڵام دیارە هەر کام لە (القرطبي، وإبن عاشور) بۆ ئەوە نەیانهێناون پشتگیرییان بکەن، بە پێچەوانەی (الطبري والشوكاني)ەوە، کە هێناویانن و پشتگیرییان کردوون، هەروەها زۆربەی تەفسیرەکانی دی، بەڵام (القرطبي) ڕایەکەی دیکەی بەهێز کردوە، (إبن عاشور)یش بۆیە هێناونی، کە ڕەخنەیان لێ بگرێ، بەڵام گوتوویەتی: لە گریمانی ڕاست بوونی ئەو ڕیوایەتانەشدا، دیسان پێغەمبەری خوا ﷺ بەوە تانەی لێ نادرێ، ئنجا هەموو ئەو گێڕدراوانە، زانایانی لێکۆڵەرەوە (مُحقِّق) هیچ ئیعتیبارِیان بۆ دانەناون.

دیارە (الطبري) لە (جامع البيان)دا بە ژمارە: (٢٨٥٤٤) ئەو گێڕدراوەیەی هێناوەو، (القرطبي)یش لە تەفسیرەکەیدا[1] هێناونی و، (الشوكاني) لە (فتح القدير) دا[2]، هێناونی و، (محمد الطاهر بن عاشور) لە (التحرير والتنوير)ەکەی خۆیدا هێناونی[3].

---

(١) ج١٤، ص١٥٣

(٢) ج١٤، ص٣٤٤

(٣) ج٢٢، ص٣٥، ٣٦

أ)- (القاسمي)، له تەفسیرەکەی خۆیدا گوتوویەتی[1]: (قَالَ ابْنُ كَثِيْر: ذَكَرَ ابْنُ أَبِي حَاتِمٍ، وَابْنُ جَرِيرٍ هَا هُنَا آثَارًا، أَحْبَبْنَا أَنْ نَضْرِبَ عَنْهَا صَفحاً، لِعَدَمِ صِحَّتِهَا، فَلَا نُورِدُهَا).

واتـە: (إبْـنُ كَثِـيْر) دەڵـێ: (ابْـنُ حَاتِـمٍ وَابْـنُ جَرِيـر) لێـرەدا چەنـد شـوێنەوارێکیان هێنـاون، حەزمـان کـرد کـە پشـتگوێیان بخەیـن، چونکـە ڕاسـت نیـن بۆیـە نایانهێنیـن.

ب)- (إبن العربي) له کتێبەکەی خۆی دا[2]، دوای ئەوەی ئەو دەقەی هێناوە، گوتوویەتی: (إِنَّهُ لَا يَصِحُّ وَإِنَّ النَّاقِلِين لَهُ، المُحْتَجِّينَ بِهِ عَلَى مُزَاعِمِهِم فِي فَهْمِ الآيَة، لَمْ يَقدِروا مَقَامَ النُّبوَّةِ حَقَّ قدْرِه، وِلَمْ تُصِبْ عُقُولُهُم مِنْ مَعْنَى الصحَّةِ كَنْهَهَا).

دەڵـێ: ئـەو گێڕدراوەیـە ڕاسـت نیـە و ئەوانـەی کـە نەقڵیـان کـردوە و بـە بەڵگـە هێناویانـە لەسـەر بـۆ چوونـەکانی خۆیـان، لـە تێگەیشـتنی ئایەتەکـەدا، وەك پێویسـت ڕێـز و پێگـەی پێغەمبەرایەتیـان نەزانیـوەو، عەقڵەکانیـان هیـچ ڕاسـتیی و هەقیـان نەپێـکاوە.

٦)- ئەوانەی پشتیان بەو گێڕدراوانە بەستوە، فەرمایشتی خوا، کە دەفەرموێ: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ۝٣٧﴾، ئەوەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، گوایە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ شاردوویەتەوە بریتی بووە: لە عاشق بوونی بۆ زەینەب! بەڵام ڕواڵەتی ئایەتەکە ئەوە بە درۆ دەخاتەوە، چونکە: خوا فەرموویەتی: ئەوەی پەنهانی دەکەی، خوا دەری دەخات!

ئنجـا ئایـا ئـەوەی خـوا دەریخسـتوە چـی بـووە؟ بێگومـان تەنیـا ئـەوە بـووە کـە زەینـەبی پـاش جیابوونـەوەی لـە زەیـد، لـە پێغەمبـەر ﷺ مـارەی کـردوە: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَـٰكَهَا﴾، خـوا ﷻ بـەس ئـەوەی دەرخسـتووەو فەرمووشـیەتی: تـۆ ئـەوە پەنهـان دەکـەی کـە خـوا دەرخەریـەتی و ئاشـکراکەریەتی، خـواش تەنیـا ئەوەنـدەی ئاشـکرا کـردوە، کەواتـە: هـەر ئـەوە بـووە کـە پێغەمبـەر ﷺ پەنهـانی

---

(١) محاسن التأويل: ج٨، ص٢٦٨.

(٢) أحكام القرآن: ج٣، ص٥٧٦ الى ٥٧٨.

کردوە، ئەویش ئەوە بووە: خوا پێیڕاگەیاندوە کە زەینەب دوای ئەوەی لە زەید جیادەبێتەوە، دەبێتە هاوسەری تۆ، پێغەمبەریش ﷺ لە شەرمی خەڵك و لە ترسی زمانی خەڵك، ئەوەی پەنهان کردوە و، نەیدرکاندوەو لە لای خۆی هێشتۆتەوە، تاکو ئەو کاتەی خوا ﷻ ئایەتەکەی دابەزاندوە.

٧)- خوا ﷻ لە بارەی حیکمەتی هاوسەرگیریی موحەممەد ﷺ لەگەڵ زەینەبدا (خوا لێی ڕازیبێ)، فەرموویەتی: ﴿لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾﴾، بۆ ئەوەی بڕواداران سەغڵەتییان لەسەرنەبێ، لە بەرانبەر هاوسەرگیریی کردن لەگەڵ هاوسەرانی بە کوڕ کراوانیاندا، دوای ئەوەی کە لێیان جیادەبنەوەو پێویستیان پێیان نامێنێ.

کەواتە: جگە لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو نەریتە نەفامییە، هیچ هۆکارێکی دیکە نەبووە، بۆ ئەو هاوسەرگیرییەی موحەممەد ﷺ لەگەڵ زەینەبدا.

٨)- هەروەها ئایەتی: ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾﴾.

دیسان هەمان ئامانج دووپات دەکاتەوە، کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) نابێ لە گەیاندنی پەیامەکانی خوادا، شەرم و سام لە هیچ کەس بکەن، جگە لە خوا.

٩)- هەروەها ئایەتی: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ ۗ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾﴾.

دیسان هەر بەو ئامانجەوە پەیوەستە، چونکە بیانووی دڵنەخۆشەکان بۆ ڕەخنە گرتن لەو هاوسەرگیرییە، ئەوە بوو دەیانگوت: (تَزَوَّجَ مُحَمَّد زَوْجَة ابْنَهُ زَيْد بْنِ حَارِثَة)! موحەممەد ﷺ هاوسەری کوڕەکەی خۆی مارە کردوە! بەڵام لە ڕاستییدا زەیدی کوڕی حاریسە، کوڕی باپی خۆی بووە و، کوڕی موحەممەد ﷺ نەبووە، هەرچەندە پێش ئیسلام کرد بووی بە کوڕی خۆی، کە ئەوە نەریتێکی سەردەمی نەفامیی بووە.

١٠)- لەم خاڵی دەیەمەدا، حەوت بەڵگەی دیکە دەخەینە ڕوو:

یەك: زەینەب کە کچی (أُمَيْمَة بنْتِ عَبْدُ المُطَّلِب)بووە، پێغەمبەر ﷺ وەك کچی خۆی سەرپەرشتییکردوەو، هەمیشە بینیویەتی و لەبەر چاوی بووە، واتە: زەینەب کە بۆتە هاوسەری زەید، بە داخوازییکردنی پێغەمبەر ﷺ بووەو، زەینەب ڕازی نەبووەو عەبدوڵڵای کوڕی جەحش، برای زەینەبیش ڕازی نەبووە، نەسەب و ڕەچەڵەکی خۆیان پێ لە هی زەید بەرزتر بووە، بەڵام لەسەر داوا و داکۆکیی پێغەمبەر ﷺ، ئنجا زەینەب و عەبدوڵڵای برای ملیان داوە، ئنجا عەجەبا پێغەمبەر ﷺ تاکو ئەو کاتە کە زەینەب لەبەرچاوی خۆی بووە، پێی سەرسام نەبووە، دوایی کە دەبێتە هاوسەری زەید، پێی سەرسام دەبێ!

دوو: بێگومان کچی شونەکردوو لەبەرچاوترە، لە بێوەژنی تەمەنکردوو! دیارە هەموو پیاوێکی سروشتیی پێی خۆشە، ئەو ئافرەتەی هاوسەرگیریی لەگەڵ دەکات، دەستی لێ نەدرابێ و، هاوسەرگیریی نەکردبێ، ئەگەر بۆی بگونجێ ئەوەی پێ چاکترە، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو مرۆڤ، ئەگەر بۆی بکرێ خواردنێك دەخوات، کە لێی نەخورا بێ، گوڵێك بۆن دەکات، کە بۆن نەکرابێ، کەل و پەلێك بەکاردێنێ، کە بەکارنەهێنرابێ، مرۆڤ زیاتر دڵی بە لای ئەوەیاندا دەچێ، هەڵبەتە ئەوەی دیکەش ناڵێین: خراپە، مادام پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی بە سوننەتێك، کە ئافرەتانی بێوەژنی هێناون و، هەموو هاوسەرگیرییەکانی پێغەمبەر ﷺ حیکمەتی زۆریان تێدان، بۆچی بە زۆریی ئافرەتانی بێوەژن بوون؟ بێگومان مەبەستی زیاتر سەرپەرشتییکردنیان بووەو، سەرپەرشتییکردنی منداڵەکانیان بووە، یاخود بەهێزکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیی و، سیاسییەکان بووە، وەك لە کتێبی: (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ)، لە چاپی سێیەمیدا بە تەفصیل لە بارەی هاوسەرەکانی پێغەمبەرەوە باسمانکردوەو، لە کتێبی: (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت)یش دا، لە چاپی دووەمیدا، باسێکمان کردوە دەربارەی هاوسەرانی پێغەمبەری خوا.

سێ: شتێکی نالۆژیکییە، کەسێك کت وپڕ عاشقی ئافرەتێك بێ، کە بە گچکەیی دیتوویەتی و پێکەوە ژیاون!

چوار: شتێكی سەیرە كەسێك بە ئافرەتێك سەرسام بێ، كەچی بۆ كەسێكی دیكەی بخوازێ و، مەیلەو ناچاریشی بكات كە شووی پێ بكات!

پێنج: ئەوانەی ئەو گومانە بە پێغەمبەر ﷺ دەبەن، نایناسن و نازانن كێیەو چۆنە؟ ئەو كەسەی خوا پێی فەرمووە: ﴿ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ ﴾طه، واتە: چاوەكانت مەبڕە، ئەو جوانییەی كە هەندێك لە ئەهلی كوفرمان پێ بەهرەمەند كردوە، لە ژیانی دنیادا تاكو تاقییان بكەینەوە.

شەش: گلەیی خواش ﷻ لەسەر ئەوە بووە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاد لە پێویست حیسابی بۆ ڕەخنەو گلەیی خەڵكی دڵنەخۆش كردوە و، دەست و بردی نەكردوە لە كارەكە، یاخود باسی نەكردوە، یاخود لە دڵدا زۆر حیسابی بۆ خەڵك كردوە و، مەترسیی لێیان هەبووە.

حەوت: ئایا بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەیدی فەرموو: ﴿ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ ﴿٣٧﴾ ﴾؟! لە حاڵێكدا كە زانیویەتی پاش جیابوونەوەی لە زەینەب، زەینەب دەبێتە هاوسەری؟

وەڵامەكەی ئەوەیە:

أ)- یان هەتا ئەو كاتە، خوای پەنهانزان موحەممەدی ﷺ ئاگاداری نەكردۆتەوە، لەو بارەوە كە زەینەب دوای جیابوونەوەی لە زەید، دەبێتە هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ و لێی مارە دەكات.

ب)- یان ئەو وەك ئەركی خۆی كە دڵسۆزییە بۆ هەموو لایەك، ئەوەی بە زەید فەرمووە و، هەر واشی لێدەوەشێتەوە و، ئەوەش دوانەتیی (إزدواجیة) نیە، چونكە لەو كاتەدا دوو ئەرك ڕوو لە پێغەمبەر ﷺ دەكەن:

یەكەمیان: جێبەجێكردنی فەرمانی خوا: كە خوا ﷻ لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە زەینەبی لێ مارە دەكات، پێغەمبەر ﷺ پابەند (مُلزَم)ە، كە فەرمانی خوا ﷻ جێبەجێ بكات.

دووەمیان: دڵسۆزیی نواندن بۆ ژن و مێردێکی مسوڵمان: کە پێکەوە دەمەقاڵێی و مشت و مڕو ناکۆکییان بووە، هەر دەبێ ئامۆژگارییان بکات، هەر دەبێ ئامۆژگاریی پیاوەکە بکات، کە تۆ هاوسەرەکەت لە لای خۆت بهێڵەوە، چونکە زەید هاتوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺو گوتوویەتی: دەمەوێ زەینەب تەڵاق بدەم، لەبەر ئەوەی شانازییم بەسەردا دەکات و پێکەوە ناگونجێین، بێزارم دەکات، خۆی پێ لە من بەرزترە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاریی زەیدی کردوە، ئنجا ئەگەر زەینەب پێویستیی بە ئامۆژگاریی بووایە، ئامۆژگاریی ئەویشی دەکرد، بەڵام زەید بە تەما بووە، دەست لە زەینەب هەڵبگرێ، ئنجا پێغەمبەر ﷺ زانیویەتی کە کاتی خۆی زەینەب ئەو هاوسەرگیرییەی بە نا بە دڵیی کردوە، ئنجا ڕەنگە پێغەمبەر ﷺ چەند جار ئامۆژگاریی زەینەبیشی کردبێ، بەڵام بۆ ئێمە نەقڵ نەکرابێ، بەڵام بە لۆژیکیی و ماقووڵی نەزانیوە ئامۆژگاریی ئافرەتێك بکات، کە ئەو ناچاری کردوە، ئەو هاوسەرگیرییە بکات، چونکە بۆی هەبوو بڵێ: تۆ ناچارت کردم، ئەگەرنا هەر لە ئەوەڵەوە من ڕازی نەبووم[1].

١١)- قسەیەکی (شیخ محمد عَبْده) دێنین، هەر لە بارەی زەید و زەینەبەوە، کە دەڵێ:

**(أمَا والله ! لَولاَ مَا أدْخَلَ الضُعَفَاءُ أو المدَلِّسُونَ مِنْ مِثْل هَذِهِ الرِّوَايَةِ، مَا خَطَرَ ببَالِ مُطَّلِعٍ عَلَى الآيَة الكَرِيْمَةِ، شَيءٌ مِمَّا يَرْمُونَ إلَيْهِ، فَإنَّ نَصّ الآيَة ظَاهِر جَلِيٌّ لاَ يَحْتَمِلُ مَعْنَاهُ التَّأويلَ، ولاَ يَذْهَبُ إلى النَّفْسِ مِنْه، إلاَّ أنَّ العِتَابَ كَانَ عَلَى التمَهُّلِ فِي الأَمْر، والترَيُّث بِهِ، وأنَّ الَّذي كَانَ يُخْفِيهِ فِي نَفْسِهِ، هو ذلكَ الأمْرُ الإلَهي الصَّادِر إلَيْهِ، بأَنَّ يَهْدِمَ تِلكَ العَادَةَ المتَأصِّلَةَ فِي نُفوسِ العَرَبِ، وأن يَتَنَاول المعْوَلَ لهَدْمِهَا بنَفْسِهِ،**

---

(١) ئێمە سوودمان لە چەند سەرچاوەیەك وەرگرتوە، هەڵبەتە بە گشتیی لە تەفسیرەکان، بەڵام بە تایبەت لە:

١- (إعراب القرآن الكريم وبيانه، لمحي الدين الدرويش)، (ج٨، ص ٢١ - ٢٤).

٢- (الجامع لأحكام القرآن، للقرطبي) (ج١٤، ص ١٥٣).

٣- (أحكام القرآن، لابن العربي) (ج٣، ص ٥٧١ – ٥٧٨).

٤- (التحرير والتنوير، لمحمد الطاهر بن عاشور)، (ج٢٢، ص ٣٥- ٣٨).

**كَمَا قُدِّرَ لَهُ أَنْ يَهْدِمَ أَصْنَامَهُم بِيَدِهِ لأَوَّلِ مَرَّةٍ، عِنْد فَتْحِ مَكَّةَ، وَكَمَا هُوَ شَأْنُهُ فِي جَمِيعِ مَا نَهَى عَنْهُ مِنْ عَادَاتِهِم)**[1].

**دەڵێ: ئاگادار بن! سوێند بە خوا، ئەگەر کە خەڵکی بێهێزو لە بنەوە بڕو ساختەچیی، ئەم جۆرە گێڕدراوانەیان نەهێنابانە نێو باسەکەوە، هیچ کەس کە ئایەتە بەڕێزەکەی دەخوێندەوە، بە دڵیدا نەدەهات، ئەوەی کە ئەوان ئێستا باسی دەکەن، (کە گوایە پێغەمبەر ﷺ سەرسام بووە بە زەینەب)، چونکە دەقی ئایەتەکە زۆر ئاشکراو درەوشاوەیە و، مانایەکەی هیچ تەئویلێك هەڵناگرێ و، هیچ مانایەك لە ڕواڵەتی ئایەتەکەوە نایەتە نێو دڵی مرۆڤ، ئەوە نەبێ کە خوا گلەیی لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، لەبەر ئەوەی کاوە خۆیی تێدا کردوە و، وەخرانی تێدا کردوە و، ئەوەش کە پێغەمبەر ﷺ لە دەروونی خۆیدا شاردوویەتەوە، هەر ئەو فەرمانە خواییە بووە، کە لە خواوە بۆی هاتوە: کە ئەو نەرێتە ڕیشەدارە لە دڵ و دەروونی عەرەبەکاندا بڕووخێنێ، خۆی پاچ دەستبداتێ و بە دەستی خۆی بیڕووخێنێ، وەك چۆن بۆی ئەندازەگیریی کراوە، کە بە دەستی خۆی بتەکان بشکێنێ، بۆ یەکەمجار لە کاتی ئازادکردنی مەککەدا، هەروەك تەنیا ئەوە حاڵی بووە لە هەموو ئەو شتانەدا، لە نەرێتەکانی سەردەمی نەفامیی کە ڕێگریی لێکردوون.**

**١٢)- نابێ بە بیانووی بەرگریی لە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ، پشت بەو ڕیوایەتانە ببەستین کە شتی قێزەون پاڵدەدەنە لای پێغەمبەرانی دیکە، لە (پەیمانی کۆن)دا، بۆ وێنە:**

**أ- (القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا[2]، دەڵێ: داوود سەد (١٠٠) ژنی هەبووە و، سێسەد (٣٠٠) کەنیزەکی هەبووە و، سولەیمان سێسەد (٣٠٠) ژنی هەبووە و، حەوتسەد (٧٠٠) کەنیزەکی هەبووە، ئەوە هەزار (١٠٠٠)!.**

---

(١) إعراب القرآن: ج٨ ، ص ٢٥.

(٢ ) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ص ٥٧.

ب- (محمد الطاهر بن عاشور)یش کە یەکێکە لە باش ڕوونکەرەوەکانی قورئان و، هاوچەرخ بووە و، بەڕاستیی بۆ چوونی زۆر وردو قووڵی هەن، لە بارەی تێگەیشتنی زۆر لە ئایەتەکانەوە، لە تەفسیرەکەیدا[1]، دەڵێ: (دَاوُد تَزَوَّج زَوجة أُوريَّا الحِثيّ بَشْتْبَع! كَمَا جَاءَ فِي سِفر الملوك! كَمَا يَأتِي فِي سُورَةِ ص)، واتە: داوود ژنەکەی (أوريا)ی (الحِثّي) کە ناوی (بشتبع) بوو مارە کردەوە، وەك لە (سفر الملوك)دا هاتووەو لە تەفسیری سووڕەتی (ص) دا، دێ.

هەڵبەتە ئێمە جارێکی دیکەش بەو بۆنەوە، لە تەفسیری سووڕەتی (النور) دا، ڕەخنەمان لە (محمد الطاهر بن عاشور) گرت و بە ڕاستیی پێم سەیرە هەرچەندە لێکۆڵەرەوەیەکی زۆر باشی قورئانە، بەڵام لە (پەیمانی کۆن)ەوە، وەك شتی سەلمێنراو، قسە دێنێ! کە لە تەفسیری سووڕەتی (النور)دا، ئەو سەرچاوانەی ئاماژەیان پێدەکات، ئێمە گەڕاوینەوە بۆ خودی سەرچاوەکان، کە گوایە: (أوريا الحثي) ژنێکی هەبووە بە ناوی (بشتبع) ئافرەتێکی زۆر جوان بووەو، داوود ڕۆژێك لەسەر بان بووە، چاوی پێکەوتوە، لە کاتی خۆ شۆردنداو عاشقی بووە، دوایی لە دوای ناردوەو لەگەڵی جووت بووە، کە جارێ هەر هاوسەری (أوريا) بووە! دوایی (أوريا)ی ناردۆتە جەنگ و گوتوویەتی: با بچێتە پێشەوەی جەنگ، ڕیزەکانی پێشەوە و، دوایی پشتی چۆڵ بکەن، بۆ ئەوەی بکوژرێ، دوایی کە کوژراوە ژنەکەشی مارە کردۆتەوەو گوایە سولەیمان لەو ئافرەتە بووە!!.

کە بە تەئکید مسوڵمانێکی عەوام شتی ئاوا لە خۆی ناوەشێنێتەوە و، جوولەکەکانیش شتی وایان زۆر بووە، کە بۆ پێغەمبەران هەڵیانبەستوەو، لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای پێغەمبەرانیان کردوە! بۆیە ئەو قسانە بە هیچ جۆرێك پشتیان پێ نابەسترێ و، ئێمەش بۆ ئەوەی بەرگریی لە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ بکەین، نابێ بڵێین: ئەها داوودیش وایکردوە، ئەها سولەیمانیش وایکردوە، بۆ ئەوەی بەرگریی لە پێغەمبەری خۆمان (محمد) ﷺ بکەین، نابێ

---

(١ ) التحرير والتنوير: ج٢٢، ص ٤١.

پێغەمبەرانی دیکە بشکێنین، بە بەسەرهات و حیکایەتی هەڵبەستراو و بێ بنەما، خاوەنی ئەو دوو تەفسیرەش: (القرطبي) و (إبن عاشور) لەو مەسەلەیەدا خراپ بە هەڵەداچوون و نەیانپێکاوە.

هەڵبەتە ئێمە لە چەند بەرهەمێکیشماندا، باسی ئەو مەسەلەیەی زەیدو زەینەبمان (خوا لێیان ڕازیبێ) کردوە، بۆ وێنە: لە مەوسووعەی عەرەبییەکەماندا (**الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله**)، لە باسی پێغەمبەران دا (**عليهم الصلاة والسلام**) کە دەبێتە کتێبی شەشەم، لە چاپی دووەمدا، لەوێدا باسمان کردوە، هەروەها لە (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ) لە وێشدا باسمان کردوە، ئەوەی لێرەدا باسمان کرد، شێوەی ئەوەشمان لەو دوو شوێنەدا باسکردوە، کە ئایەتەکان تەنیا ئەوە دەگەیەنن کە باسمان کرد، بەڵام وەك (**شیخ محمد عبده**) ڕەحمەتی خوای لێبێ، گوتوویەتی: ئەوەی کە حیسابەکەی لە خەڵك تێکداوەو سەری لە خەڵك شێواندوە، ئەو ڕیوایەت و گێڕدراوە بێ بنەمایانە بوون، کە (**إبن كثير**) هەم مێژوو نووسە و، هەم ڕوونکەرەوەی قورئانە و، هەم فەرمووده‌ناسیشە، دەڵێ: پشتگوێم خستن، چونکە هیچیان سەنەدیان ڕاست نیە و، هیچیان لەگەڵ عەقڵ و مەنتیقدا ناگونجێن و، لەگەڵ ڕواڵەتی ئایەتەکانیشدا ناگونجێن.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هەشـت ئایـەت پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (٤١ - ٤٨)، كـە تێیانـدا خـوای میهرەبـان چەنـد ڕێنمایـی و ئامۆژگارییـەكی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و، بـڕوادارانی شـوێنكەوتووی دەكات، ئەویـش لەمیـانی بـۆ جـاری دووەم (لـە حـەوت جـاری ئـەم سـووڕەتەدا)، دواندنـی بڕوادارانـدا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾﴾! هەروەهـا جارێـك دوانـدنی پێغەمبـەری خـوا ﷺ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ﴾! كـە جـاری سـێیەمە، لـە پێنـج جـاران لـەم سـووڕەتەدا.

كـە هـی بـڕواداران، پەیوەسـتە بـە زۆر یادی خـوا كردنیانـەوە و، هـی پێغەمبەریش ﷺ پەیوەسـتە بـە ئـەركی سەرشـانی و، مامەڵـەی لەگـەڵ بـڕواداران و كافـران و دەغەڵانـدا.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ
ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ
رَحِيمًا ﴿٤٣﴾ تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ ۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ
شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ
بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ
عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٤٨﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

[ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! بـە یـاد کردنێـکی زۆر یـادی خـوا بکـەن ﴿٤١﴾ هەروەهـا بەیانیـان و ئێـواران بـە پـاکی بگـرن ﴿٤٢﴾ ئـەو (خـوا) کەسـێکە خـۆی و فریشـتەکانی صەڵاواتتـان لـێ دەدەن، تاکـو لـە تاریکاییـان دەرتـان بێنـێ بـەرەو ڕووناکیـی و، خـوا هـەر میهرەبانیـش بـووە بەرانبـەر بـە بـڕواداران ﴿٤٣﴾ سـڵاویان لـە ڕۆژێکـدا کـە پێیدەگـەن (بـە دیـداری خـوا شـاد دەبـن) سـەلامە و، پاداشـتێکی پەسـندو بایەخداریـشی بـۆ ئامـادە کـردوون ﴿٤٤﴾ ئـەی پێغەمبـەر! ئێمـە تۆمـان (بـۆ لای خەڵـکی) نـاردوە: چاودێـرو دڵخۆشـکەرو ترسـێنەری ﴿٤٥﴾ هەروەهـا بـۆ لای خـوا بانگـەوازکاری و چرایـەکی ڕۆشـنکەرەوەی ﴿٤٦﴾ مـوژدەش بـە بـڕواداران بـدە، کـە لـە خـواوە بەخششـێکی گەورەیـان بـۆ هەیـە ﴿٤٧﴾ فەرمانبەریـی کافـرو مونافیقەکانیـش مەکـەو، گـوێ مـەدە ئازاردانیـان و، پشـت بـە خـوا ببەسـتەو، خـوا بەسـە کارپـێ سـپێرراو بێـت ﴿٤٨﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يُصَلِّي): (الصَّـلَاةُ: هِـيَ الدُّعَـاءُ وَالتَّبْرِيْـكُ وَالتَّمْجِيْـد)، (صَلَّيْـتُ عَلَيْـهِ: دَعَـوْتُ لَـهُ وَزَكَّيْـتُ، وَصَـلَاةُ اللهِ لِلْمُسْـلِمِيْنَ هُـوَ فِي التَّحْقِيْـقِ: تَزْكِيَتُـهُ إِيَّاهُـمْ، وَمِـنَ المَلَائِكَـةِ وَالنَّاسِ: الدُّعَـاءُ وَالإِسْـتِغْفَارُ)، (صَّـلَاة) بریتیـە لـە دوعـاو پاڕانـەوە، هەروەهـا بریتیـە لـە داواکـردنی پێـز و، داواکـردنی پایـە بەرزیـی بـۆ کەسـێك، دەگوتـرێ: (صَلَّيْـتُ عَلَيْـهِ)، واتـە: بـۆی پاڕامـەوە و، بـە پاکـم دانـا و، صـەڵاتی خـوا بـۆ مسـوڵمانان، لـە ڕاسـتییدا بریتیـە لـە چـاك و پاککـردنی بۆیـان و، بەزەیـی نوانـدنی لەگەڵیانـدا، بـەڵام صـەڵات لـە فریشـتانەوە و لـە خەڵکـەوە، بریتیـە: لـە پاڕانـەوەو داوای لێبـوردن کـردن.

(تَحِيَّتُهُمْ): واتـە: سـڵاوکردنیان، (أَصْـلُ التَحِيَّـةِ مِـنَ الحَيَـاةِ، يُقَـالُ حَيَّـاكَ اللـه: أي: جَعَـلَ لَـكَ حَيَـاةً، وَذَلِـكَ إخْبَـارٌ، ثُـمَّ يُجْعَـلُ دُعَـاءً)، وشـەی (تَحِيَّـةِ) لـە ڕیشـەدا لـە (حَيَـاةِ)ەوە هاتـوە، دەگوتـرێ: (حَيَّـاكَ اللـه) واتـە: خـوا ژیانـت پـێ بـدات، دوایـی کـراوە بـە پاڕانـەوە، کەواتـە: کـە دەگوتـرێ: (حَيَّـاكَ اللـه) ئـەوە بـۆ پاڕانەوەیـە، واتـە: خـوا تـۆ بژیەنـێ.

(شَاهِدًا): (أي: رَقِيْبَاً)، (الشَّـاهِدُ: المُخْـبِرُ عَـنْ حُجَّـةِ المُدَّعِـي وَدَفْـعِ دَعْـوَى المُبْطِـلِ)، واتـە: (شَـاهِدُ) هەواڵـدەرە بـە بەڵگـەی بابـای دەعواکـەر (داواکار)و، بەرپەرچدانەوەی دەعـوای کەسـێکە کـە لەسـەر ناهەقـە.

(وَسِرَاجًا): (سِرَاج) بـە مانـای چـرا دێ، (الزَّاهِـر بِفَتِيْلَـةٍ وَدُهْـنٍ وَيُعَـبِّرُ بِـهِ عَـنْ كُلِّ مُضِيءٍ)، دیـارە چـرا چییـە، فانۆسـە، لامپایـە، یـان بە شـێوەیەك لـە شـێوەکان فتیلەیەکی هەبـووە، ڕۆنی تێکـراوە و، ئێسـتا نـەوتی تـێ دەکـرێ، بـەڵام ئـەوە بەکاردەهێـنرێ و تەعبیـری پێدەکـرێ، لـە هـەر شـتێکی کـە ڕووناککـەرەوەو خـاوەن ڕووناکیـی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم سـوورەتەدا بـۆ جـاری دووەم، ڕوو دەکاتـە بـڕواداران و دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرًا كَثِيرًا ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێـنرێ، زۆر یـادی خـوا بکـەن، بـە یـاد کردنێـکی زۆر، یـادی خـوا بکـەن، ئنجـا یـاد کـردن، واتـە: بـە دڵـی خۆداهێنـان و، بـە زمـان گـۆ کـردن و، باسـکردن، ئنجـا چ دوای لـە بیرچوونـەوە بـێ، شـتێك بێتـەوە یـادت، یاخـود بەبـێ لـە بیرچوونـەوە بـێ، کـە بریتیـە لـەوەی بـاسی بکـرێ و یـادی بکـرێ، ﴿ وَسَبِّحُوهُ بُكۡرَةً وَأَصِيلًا ﴾، خـوا بـە پـاك بگـرن بەیانیـان و ئێـواران، واتـە: بڵێـن: (سُبْحَانَ اللـه) یـان بـە هـەر شـێوەیەك لـە شـێوەکانی بـە پاکگرتـن، بـە پاکگرتـن واتـە: خـوا ﷻ بـە پـاك و بـەرز بگـرن، لـە هـەر شـتێك کـە شایسـتەی نیـە، لـە

هەر هەڵە و پەڵەیەك، لە هەر کەم و کوڕییەك لە زاتیداو، لە سیفەتەکانیدا و، لە ناوەکانیدا و، لە بەرنامەکەیدا و، لە پێغەمبەرەکانیدا و، لە پێغەمبەرەکەیدا موحەممەد ﷺ و، لە کردەوەکانیدا و، لە دروستکراوەکانیدا و، خوا بە پاك بگرن، کە هیچ کەم و کوڕیی و هەڵەو پەڵەیەك، ڕوو لە خوا ناکات، خوا لە هەر لەکەو پەڵەیەك دوورەو بەرییە.

کە دەفەرموێ: ﴿بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا﴾، لە بەیانیان و ئێواران دا، واتە: لە بەیانیان تاکو ئێوارە، یاخود لەو دوو کاتە تایبەتەدا، کە بەیانیان ڕەمزو هێمای پەیدابوونی دروستکراوەکانە و، ئێواران ڕەمزو هێمای لە بەین چوونیان و کۆتایی پێ هاتنیانە، دوو کاتی زۆر دڵبزوێن و سەرنج ڕاکێشن، یاخود مەبەست ئەوەیە: لە بەیانیەوە تاکو ئێوارەو لە ئێوارەوە تاکو بەیانی.

﴿هُوَ ٱلَّذِي يُصَلِّي عَلَيۡكُمۡ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە خۆی و فریشتەکانی صەڵاواتتان لێ دەدەن، صەڵاتی خوا واتە: خوا بەزەییتان لەگەڵ دەنوێنێ، چاکتان دەکات و پاکتان دەکات و، شکۆدارتان دەکات و، فریشتەکانیش داوای چاکیی و پاکیی و بەزەیی و پێزتان بۆ لە خوا دەکەن، ﴿لِيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾، بۆیە خۆی و فریشتەکان صەڵاواتتان لێ دەدەن، تاکو لە تاریکاییان دەربازتان بکەن، بەرەو ڕۆشنایی، لە تاریکایی بووناسیی و، لە تاریکایی نەبوونی ئیمان و عەقیدەیەکی ڕاست و، لە تاریکایی بە هەڵەداچوون لە پەرستندا، لە تاریکایی ڕەوشت و ئاکاری دزێو و، لە تاریکایی ستەم و بێدادیی و، لە تاریکایی نەریتە نەفامییەکان، بۆ ڕۆشنایی بووناسییەکیی ڕاست و دروست و، ئیمان و عەقیدەیەکی تەواوو، خوا پەرستییەکی بێ خڵتە و، ڕەوشت و ئاکارێکی بەرزو پەسندو ...هتد، ﴿وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا﴾، هەمیشە خوا بەرانبەر بە بڕواداران بە بەزەیی و بەخشندە بووە.

﴿تَحِيَّتُهُمۡ يَوۡمَ يَلۡقَوۡنَهُۥ سَلَٰمٞ﴾، سڵاوکردنیان ئەو ڕۆژەی کە پێی دەگەن، واتە: ئەو ڕۆژە کە بە خوا دەگەن، سڵاوکردنیان بریتییە لە سەلام، خوا دەفەرموێ: (السَّلامُ عَلَيْكُم) وەك لە سووڕەتی (یس)دا، دەفەرموێ: ﴿سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ

﴿...﴾ ﴿٥٨﴾ یس، سەلامێکە لە خواوە دەگوترێ، لە لایەن پەروەردگارێکی میهرەبان و خاوەن بەزەییەوە.

(تَحِيَّتُهُمْ) ئەو تەحییەی کە سڵاویان پێ لێدەکرێ، یاخود: (تَحِيَّتُهُمْ) ئەو سڵاوەی کە کاتێك دەگەنە خزمەت خوای پەروەردگار، ئەوەی کە سڵاوی پێ لە یەکدی دەکەن، بریتیە لە سەلام، یاخود فریشتەکان سەلامیان لێ دەکەن، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم ﴿٢٤﴾﴾الرعد، واتە: فریشتەکان لە هەموو دەروازان لێیان دەچنە ژوورێ، پێیان دەڵێن: (السَّلَامُ عَلَيْكُم)، ﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا﴾، پاداشتێکی پەسند و باش و پڕ ڕێزو حورمەتی بۆ داناون، ئەم چوار ئایەتە دەربارەی بڕواداران بوون، چوار ئایەتی دیکەش دەربارەی پێغەمبەرن، واتە: ئەم چوار ئایەتە ئامۆژگاریی و ڕێنمایی خوای پەروەردگار بوون بۆ بڕواداران.

ئنجا ئەم چوارەشیان ئامۆژگاریی و ڕێنمایی خوای پەروەردگارن بۆ موحەممەد ﷺ پێغەمبەری کۆتایی، ئەمە جاری سێیەمە، لەم سوورەتەدا خوا بانگی پێغەمبەر ﷺ دەکات بە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾، ئەی پێغەمبەر! ﷺ بە دڵنیایی ئێمە تۆمان ڕەوانە کردوە: چاودێر بی، موژدە دەربی، ترسێنەر بی، یان دڵخۆشکەربی، هۆشیارکەرەوەبی.

أ- چاودێربی واتە: چاودێریی شوێنکەوتووان بکەی و، سەرپەرشتییان بکەی و ئاگات لێیان بێ.

ب- موژدە دەربی واتە: موژدەی بەهەشت و ڕەزامەندیی خوایان پێ بدەی و، موژدەی سەرکەوتن و بەختەوەریی دنیایان پێ بدەی، ئەگەر پابەند بن بە شەریعەتی خواوەو بەندایەتیی ساغ و بێ خلّتە بۆ خوا بکەن.

ج- بیانترسێنی و، ترسێنەریان بی و هۆشیارکەرەوەیان بی، لە لادان لە خلیسکان و، لەوە کە گرفتار بێن بە شیرك و کوفرو گوناهو تاوانەوە.

﴿ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴾، هەروەها تۆمان ڕەوانە كردووە كە بانگەوازكار بی بۆ لای خوا و، بە مۆڵەتی خوا چرایەكی تیشكدەر بی، واتە: وەك چرایەك بی ڕێیان بۆ ڕۆشن بكەیەوە، ئنجا چرا بۆ خۆی ڕوونە، بەڵام ﴿ مُّنِيرًا ﴾، ئەوە بۆ جەختكردنەوەیە واتە: چرایەك بی، زۆر ڕێیان بۆ ڕۆشن بكەیەوە.

﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴾، موژدەش بدە بە بڕواداران كە لەلایەن خواوە بەخششێكی گەورەیان بۆ هەیە، ﴿ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ﴾، گوێڕایەڵیی بێبڕوایەكان و مونافیقەكان مەكە، فەرمانبەریان مەكەو بە قسەیان مەكە، ﴿ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ ﴾، ئازارەكەشیان پشتگوێ بخەو نادیدەی بگرە، با پەكت نەخات و نەتگێڕێتەوە لە ڕۆیشتن بەرەو ئامانجەكانت، ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾، پشتیش بە خوا ببەستە، پشتت بە خوا قاییم بێ، ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾، خواش بەسە پشت پێ بەستراو بێ و، كارپێ سپێردراو بێ، هەر كەسێك كاری خۆی بە خوا بسپێرێ و پشتی خۆی بە خواوە بدات، بە تەئكید خوا پشتی لە زەوی نادات و، كارەكەشی زایە ناكات.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**فەرمانكردنی خوا بە بڕواداران كە زۆر یادی خوا بكەن و، بە پاكیی بگرن بەیانیان و ئێواران و، هەواڵپێدانیان كە خواو فریشتەكانی صەڵاواتیان لێدەدەن، تاكو لە تاریكاییان بەرەو ڕووناكییان بێنن و، موژدە پێدانیان كە لە ڕۆژی دیداری خوادا، بە سەلام سڵاویان لێ دەكرێ و، خوا پاداشتی پەسند و بایەخداری بۆ داناون:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾ تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ ۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

**١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، ئەم ڕستەیە لەم سوورەتەدا، ئەمە بۆ جاری دووەمە، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! واتە: بڕواتان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.**

**٢)- ﴿ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا﴾، بە یاد كردنێكی زۆر یادی خوا بكەن، یانی: لە جیاتی چەلەحانێ و مشت ومڕ لەگەڵ دەغەڵ و كافرەكاندا، بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو تۆمەت و تانەدانانە، كە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەیانلێن، یان بۆ ئیمانداران و بۆ قورئان و ئیسلام دەیانلێن، لە جیاتی ئەوە، یادی خوا بكەن، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (البقرة)، كە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ﴿٢٠٠﴾﴾، واتە: ئەگەر خواپەرستییەكانی حەجتان تەواو كردن، یادی خوا بكەن، وەك یاد كردنتان بۆ باب و باپیرانتان یاخود، یاد كردنێكی زیاتریش.**

چونکـه عه‌ره‌بـه‌کان لـه سـه‌رده‌می نه‌فامیـدا نه‌ریتیـان وابـوو کـه هه‌نـدێ لـه خـوا په‌رسـتییه‌کانیان تـه‌واو ده‌کـردن، ئنجـا ده‌که‌وتنـه سـه‌ر مـه‌دح و سـه‌نای بـاو باپیرانیـان و پێشـینانیان، خـواش ده‌فه‌رمـوێ: لـه جیـاتی ئـه‌وه، یـادی خـوا بکـه‌ن.

٣)- ﴿ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾، هه‌روه‌ها (یادی خوا بکه‌ن و) به پاکی بگرن به‌یانیان و ئێواران، واته: سه‌ره‌تای ڕۆژ و کۆتایی ڕۆژ، یاخود لێره‌دا مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه: له هه‌موو کاته‌کاندا له به‌یانییه‌وه تاکو ئێواره، یان له ئێواره‌وه تاکو به‌یانیی، یادی خوا بکه‌ن و، هیچ کاتێ له خوا بێ ئاگا (غافل) مه‌بن و، هه‌میشه به پاکی بگرن، لێره‌دا باسی ستاییشکردنی نه‌کردوه، چونکه سیاقه‌که له‌گه‌ڵ به پاکگرتنی خوادا ده‌گونجێ، خوا به پاکبگرن له‌وه‌ی که پێغه‌مبه‌رێك بنێرێ بگونجێ په‌ڵه‌یه‌کی پێوه بێ، بگونجێ له‌که‌یه‌ك ڕووی تێ بکات، بگونجێ شتێك بکات، که پێی ناشیرین و پێی عه‌یبدار بێ، وه‌ك موونافیق و ده‌غه‌ڵ و دڵنه‌خۆشه‌کان گومانی پێ ده‌به‌ن، به‌ڵکو پێغه‌مبه‌ر ﷺ پاك و چاکه، خوایه‌ك ناردوویه‌تی بۆ ئه‌وه‌ی پاکیی و چاکیی فێری خه‌ڵك بکات و، خوا وه‌ك چۆن بۆ خۆی پاکه، پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی ﷺ خۆشی به پاکیی ده‌هێڵێته‌وه‌و ده‌یپارێزێ، تاکو سه‌ر مه‌شقێکی پاك و چاك بێ بۆ خه‌ڵك و، دینداریی و به‌ندایه‌تییه‌کیی ڕاست و ساف و ساغ و چاکیان فێر بکات.

٤)- ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ ﴾، خوا ئه‌و زاته‌یه که خۆی و فریشته‌کانی صه‌ڵاواتتان له‌سه‌ر لێ ده‌ده‌ن، صه‌ڵات له خواوه ﷻ به مانای به‌زه‌یی نواندن و چاك و پاککردن و، پله به‌رزکردنه‌وه، دێ، که خوا ئه‌وه ده‌کات له‌گه‌ڵ به‌نده‌کانی دا، صه‌ڵات له فریشته‌کانه‌وه، داواکردنی ئه‌و شتانه‌یه واته: به‌زه‌یی خواو، به‌خششی خواو، چاك و پاککردنی خوا بۆ مرۆڤه‌کان، هه‌روه‌ها صه‌ڵات له مرۆڤه‌کانیشه‌وه، داواکردنی ئه‌و شتانه‌یه له خوا ﷻ، بۆچی خواو ﷻ فریشته‌کانی صه‌ڵاوات له‌سه‌ر بڕواداران ده‌ده‌ن؟

٥)- ﴿ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾، تاکو له تاریکاییه‌کان ده‌رتان بێنن بۆ ڕووناکیی، (ٱلظُّلُمَٰتِ ) بۆیه به کۆ هاتوه، چونکه تاریکیی جۆرا و جۆر هه‌ن، به‌ڵام ڕووناکیی یه‌ك شته، به‌ڵام تاریکیی هه‌ور هه‌یه و، تاریکیی شه‌و هه‌یه و، تاریکیی په‌ناو

پەسیو هەیە، تاریکاییەکان جۆراو جۆرن، بۆیە خوا بە کۆ دەیانهێنێ، هەروەك هەمیشە هەق یەکە، بەڵام باتیڵ جۆراو جۆرە، بۆ وێنە: دوو کۆ دوو دەکاتە چوار (٢ + ٢ =٤)، ئەنجامە ڕاستەکە، تەنیا چوارە، بەڵام دەگونجێ بڵێی: سێ، پێنج، هەزار، چەند، چەند، هەموویان هەڵەن، کەواتە: هەمیشە هەق یەکە، بەڵام ناهەق زۆرەو جۆراو جۆرە.

ئنجا ئایا ئەو تاریکاییانەی کە خوا بە هۆی صەڵاواتدانی خۆی و فریشتەکانی، بڕوادارانیان لێ دەردێنێ، چین؟:

١- تاریکایی بوونناسیی، ئەوە کە مرۆڤ نەزانێ ئەم گەردوونە چییە؟ خاوەنی کێیە؟ بۆچی هاتۆتە دیی؟ مرۆڤ خۆی چییە؟ شوێنی لە ئیعراب دا چییە؟ لە کوێ هاتوە؟ بۆچی هاتوە؟ بۆ کوێ دەچێ؟ ژیانی دنیا چییە؟ ئایا ئەم ژیانە قۆناغی دیکەی بەدوا دادێ، یان نا؟ بە تەئکید ئەوانە تاریکایین (تاریکایی بوونناسیی).

٢- تاریکایی لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، کە مرۆڤ نەزانێ خوا کێیە؟ چۆنی بپەرستێ؟ چۆن بەندایەتیی بۆ بکات؟ ڕۆژی دوایی و، فریشتەکانی خوا و، کتێبەکانی خوا و، پێغەمبەران، ئەوەش تاریکاییە کە مرۆڤ لەو بارەوە بەرچاوی ڕوون نەبێ.

٣- هەروەها لە بارەی خواپەرستییەکانەوە، ئینسان چۆن بەندایەتیی بۆ خوا بکات.

٤- لە بارەی ڕەوشت و ئاکارەکانەوە.

٥- لە بارەی باری کەسێتییەوە.

٦- لە بارەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە.

٧- لە بارەی ئیدارەدانی وڵاتەوەو چۆنیەتیی بەڕێوەبردنی کاروباری ئابووریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە، ئەوانە هەموویان تاریکایین.

ڕووناکییەکەش بریتیە لە:

١- لە ڕووناکیی بوونناسیی و، ئیمان و عەقیدەیەکی ڕاست.

٢- ڕووناکیی خوا پەرستیی و، ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسند.

٣- ڕووناكیی تۆكمەیی خێزان و توندو تۆڵیی كۆمەڵگا، ئەدەب و ڕەوشتە جوانەكانی كە دەبێ كۆمەڵگا خۆییان پێ بڕازێنێتەوە.

٤- ڕووناكیی ئیدارەدانی وڵات بە شێوەیەكی دادگەرانەو، ڕێك و پێك و سیستماتیك و، بە پێی دامەزراوەكان، ئەوەش هەمووی ڕووناكییە، خوا ﷻ و فریشتەكانی صەڵاواتتان لێ دەدەن، كە لە ئەنجامی ئەو صەڵاوات لێدانی خواو، بەزەیی چەسپانی خوا بەسەر ئێوەداو، هی فریشتەكان كە بۆتان لە خوا داوا دەكەن، ئێوە لە تاریكاییان دەرباز دەبن، بەرەو ڕووناكیی دێن.

٦)- ﴿ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴾، خوا ﷻ هەر لە سەرەتاوەو هەمیشە بەرانبەر بە بڕواداران میهرەبان بووە.

٧)- ﴿ تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ ﴾، سڵاوكردنیان لە ڕۆژێكدا كە پێی دەگەن، واتە: ئەو ڕۆژە كە ئامادە دەبن لە خزمەت خوای پەروەردگاردا، لەو شوێنەدا كە خوا دەیەوێ، لەو ڕۆژەدا ئیمانداران بە سەلام، سڵاویان لێ دەكرێ، (تَحِيَّة) ئەو قسەیە كە لە كاتی پێككەیشتندا بەكاردەهێنرێ و، لە ڕاستییدا (تَحِيَّة) لە ئەسڵدا لە (حَيَّاكَ الله) هاتوە، واتە: خوا بتژیەنێ، ئنجا (تَحِيَّة) گشتییە، سڵاوكردن، بەڵام سەلام (تَحِيَّة)یەكی تایبەتە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ ﴾، ئەمە سێ واتای هەن:

١- ئەو سڵاوەی كە لێیان دەكرێ لە ڕۆژی دیداری خوادا، بریتیە لە سەلام، واتە: خوا سەلامیان لێ دەكات، وەك لە سوورەتی (یس)دا، دەفەرموێ: ﴿ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴿٥٨﴾ ﴾یس، سەلام قسەیەكە دەگوترێ، لە پەروەردگارێكی میهرەبانەوە.

٢- دەگونجێ مەبەست پێی سەلامكردنی فریشتەكان بێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾الرعد.

٣- دەشگونجێ مەبەست پێی سەلامكردنی نێو خۆیان بێ، واتە: خۆیان كە سەلام لە یەكدی دەكەن، دروشمەكەیان بریتیە لە: سەلام.

٨)- ﴿ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴾، خوا پاداشتێکی پڕ ڕێزو حورمەتی بۆ داناون، وشەی (سَلَٰمٌ) پاڕانەوەیە بۆ سەلامەتیی و هێمنیی و ئاساییش، بۆیە سەلام کراوە بە دروشمی مسوڵمانەتیی: (السَّلَامُ عَلَيْكُم) واتە: سەلامەتییت لەسەر بێ، یاخود تۆ لە لایەن ئێمەوە سەلامەت بی، تۆ لە لای ئێمەوە لە هێمنیی و سەلامەتیی و ئاشتییدای، ﴿ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴾، (أَجْرًا) بە مانای: پاداشت و کرێ دێ و، بە مانای: خەڵاتکردن دێ، (الكَرِيم: النَّفِيسُ مِنْ نَوْعِهِ) شتی پەسندو چاکە لە جۆری خۆی.

**مەسەلەی دووەم:**

**خستنە ڕووی چەند ڕێنماییەکی گەورەو گرنگ بۆ پێغەمبەر ﷺ لە بارەی ئەرکی سەرشانی و، چۆنیەتیی مامەڵەکردنی لەگەڵ بڕوادارانی شوێنکەوتووی و، دوژمن و ناحەزانی ئاشکراو پەنهانیدا، کە ناحەزو دوژمنی خۆی و خواو بەرنامەکەینی و، گوێ نەدان بە ئازارو ناڕەحەتییەکانیان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٤٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، ئەمە جاری سێیەمە، لەم سوورەتە موبارەکەدا، کە خوا پێغەمبەری خۆی ﷺ دەدوێنێ، بە نازناوی پێغەمبەرایەتیی، ئەی پێغەمبەر ﷺ! واتە: ئەی ئەو کەسەی بە شێوەی تایبەت هەواڵت پێ دەدرێ، یاخود هەواڵە تایبەتەکان بە خەڵك ڕادەگەیەنی!

٢)- ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە تۆمان ناردوە، چاودێر بی، موژدە دەربی، ترسێنەر بی.

٣)- ﴿ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ ﴾، هەروەها بانگەوازکار بی بۆ لای خوا، بە مۆڵەتی خوا.

٤)- ﴿ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴾، دیسان چرایەکی تیشك دەربی و، ڕێ ڕۆشنکەرەوە بی.

٥)- ﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴾، موژدەش بدە بە بڕواداران، کە لە خواوە پاداشتێکی گەورەیان هەیە.

کەواتە: خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی ﷺ پێغەمبەری کۆتایی (محمد)ی بە شەش وەسفان پێناسە کردوە:

١- ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ ﴾، ئێمە تۆمان ڕەوانە کردوە، کەواتە: ڕەوانەکرانی پێغەمبەر ﷺ لە خواوەیە، لە خۆوە نەهاتوە ملی ڕێ بگرێ، خوا ناردوویەتی و، خۆی هیچ چاوەڕوانییەکی نەبووە، خوا ڕەوانی بکات، ﴿ وَمَا كُنتَ تَرۡجُوٓاْ أَن يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبُ إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ ﴿٨٦﴾ ﴾القصص، واتە: تۆ پێشتر بە تەما نەبووی کتێبت بۆ لا بنێردرێ، مەگەر لە بەزەیی خواوە بۆت هات، واتە: هەر خوا بەزەیی لەگەڵ نواندی، ئەگەرنا تۆ چاوەڕوانییت نەبوو.

٢- ﴿ شَٰهِدٗا ﴾، ئێمە تۆمان ناردوە کە چاودێر بی، (شَاهِد) بریتیە لە هەواڵدەر بە بەڵگەی بابای دەعواکەر و، بەرپەرچدانەوەی قسەی بابای ناهەق، یاخود (شَاهِد) بە مانای چاودێر دێ، هەروەها بە مانای ئاگادار و سەرپەرشتیار و مشوورخۆر دێ.

٣- ﴿ وَمُبَشِّرٗا ﴾، تۆمان ناردوە کە موژدە دەربی، دڵخۆشکەربی، (المُبَشِّرُ: المُخْبِرُ بِالبَشَارَةِ وَالبُشْرَى)، هەواڵدەر بە شتێك کە دڵخۆشیی و شادمانییە، کە مەبەست پێی ئەوەیە تۆ دڵخۆشکەری بڕواداران بی، کە: ئەگەر بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ بکەون و، پەیڕەویی لە قورئان بکەن، خوا لە دنیادا بەختەوەرو سەر بەرزو پاك و چاکیان دەکات، لە دوارۆژیشدا بە ڕەزامەندیی خۆی و بە بەهەشتی خۆییان دەگەیەنێ.

٤- ﴿ وَنَذِيرٗا ﴾، تۆمان ناردوە کە ترسێنەر بی، وریاکەرو هۆشیارکەرەوە بی، (نَذِيْر) لە (إنْذَار)ەوە هاتوە، ئەویش بریتیە لە هەواڵدان بە شتێك کە خراپ بێ، بۆ ئەو کەسەی ڕووی تێ دەکات.

٥- ﴿ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ ﴾، هەروەها بانگەوازکاری بۆ لای خوا، واتە: خەڵك بانگ دەکەی بۆ لای خوا، بۆ لای ئایین و بەرنامەی خوا، ﴿ بِإِذۡنِهِۦ ﴾، واتە: بە ئاسانکاریی خوا، یاخود بە فەرمانی خوا، یان: بە مۆڵەتی خوا، لە خۆتەوە نیە.

٦- ﴿ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴾، تۆمان ناردوە چرایەکی ڕوونکەرەوەی، ئەمە: (تَشْبِيهٌ بَلِيْغٌ كَالسِّرَاجُ المُضِيء) وەك (شِعْرٌ شَاعِر) شیعرێکی شیعر، یاخود (لَيْل أَلْيَل) شەوێکی شەو، ﴿ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴾، واتە: چرایەکی ڕوونکەرەوە، تیشکدەر، کە بە تەئکید چرا هەر ڕوونکەرەوەیە، بەڵام ئەمە بۆ زیاتر تۆخکردنەوەی مانایەکەیەتی.

٦)- ﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴾، موژدەش بدە بە بڕواداران، کە لەلایەن خواوە بەخششێکی گەورەیان بۆ هەیەو.

ئەوە بە نسبەت بڕوادارانەوە.

٧)- ﴿ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ﴾، هەروەها گوێڕایەڵیی کافران و مونافیقەکان مەکە، کافران واتە: بێبڕوایانی بە ئاشکرا کە هەقیان بۆ دێ، دەیپۆشن و بڕوای پێناکەن، مونافیق واتە: دەغەڵ و دوو ڕووەکان، ئەوانە کە لە دڵدا کوفریان هەیە، بەڵام بە ڕواڵەت خۆیان بە مسوڵمان پێشان دەدەن، کە دەفەرموێ: بە قسەیان مەکە، فەرمانبەرییان مەکە، گوێڕایەڵییان مەکە، واتە: ئەوەی ئەوان دەیڵێن، وا مەکە.

٨)- ﴿ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ ﴾، گوێش بە ئازارەکەیان مەدە، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- (أي أُتْرُكْ أذاهُمْ) واز لە سزادانیان بێنە.

ب- (أهْمِل أذاهُمْ لَكَ) ئازاردانی ئەوان بۆ خۆت، پشتگوێ بخە.

من مانای دووەمم بەلاوە بەهێزترە، واتە: ئەوە کە ئازارت دەدەن، پشتگوێی بخەو نادیدەی بگرەو، بەهیچی دابنێ، ﴿ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ ﴾، نەك لە سزادانیان واز بێنەو لێی بگەڕێ، هەڵبەتە ئەوەش لە ڕووی ڕواڵەتی زمانی عەرەبییەوە هەر دەگونجێ، بەڵام بەپێی سیاقەکە و، ڕووحی ئیسلامیش، زیاتر مەبەست پێی ئەوەیە کە تۆ گوێ مەدە بە ئازاردانی ئەوان، وەك لە شوێنی دیکە، دەفەرموێ: ﴿ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ۝١٠ ﴾المزمل.

٩)- ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾، پشت بە خوا ببەستەو پشتت بە خوا قایم بێ و، خواش بەسە پشت پێ بەستراو بێ، (التَّوَكُّلُ: الإعْتِمَادُ وَتَفْوِيْضُ الأمْرُ إلى اللهِ)، (تَوَكُّلُ) بریتیە لە پشت بە خوا بەستن و، کاری خۆ بە خوا سپاردن، ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾، خواش بەسە کە کار پێسپێردراو بێ و، هەر کەسێ کاری خۆی بە خوا بسپێرێ و پشتی بە خوا ببەستێ، خوا بۆ ئەو بەسە و، هەموو کەلێنانی بۆ پڕ دەکاتەوە.

## حەوت ڕێنمایی گەورەو گرنگ بۆ پێغەمبەر ﷺ

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، ئەی موحەممەد! تۆ پێغەمبەری ﷺ. ئنجا (ٱلنَّبِيُّ) یان (فعیل)ی بە مانای (فاعل)ە، واتە: تۆ (مُنْبِئ)ی هەواڵدەری لە خواوە، یاخود (فعیل)ی بە مانای (مفعول)ە واتە: هەواڵپێدراو (مُنْبَأ)ی، کەواتە: تۆ دەبێ بزانی خوا بە شێوەی تایبەت هەواڵت پێدەدا و، تۆش هەواڵە تایبەتەکانی خوا بە خەڵك دەگەیەنی، تۆ کەسێکی ئاسایی نی.

٢)- ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ ﴾، ئێمە تۆمان ڕەوانکردوە، واتە: کە هەواڵی تایبەتمان پێداوی، تۆ هەواڵەکانی خوا ڕابگەیەنی، ئێمە بەوەندە ئیکتیفامان نەکردوە کە تۆ تەنیا پێغەمبەر (نبيّ) بی، بەڵکو تۆمان کردوە بە نێرراو (رَسُول)یش، تۆمان ڕەوانە کردوە بەو پەیامەی خۆمانەوە.

٣)- ﴿ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴾، تۆ دەبێ چاودێر بی، موژدە دەر بی، ترسێنەربی، بانگەوازکاربی بۆ لای خوا، بە مۆڵەتی خوا و، چرایەکی تیشکدەر بی، دەبێ هەموو ئەو سیفەتانە لە تۆدا هەبن، کە بە تەئکید هەموو ئەو سیفەتانە پڕ بە پێستی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون، بە مانای وشە: شاهیدو چاودێر بوو بەسەر ئوممەتیەوە و، موژدە دەرو دڵخۆشکەر بووە بۆیان، بە پاداشتی خواو بەرزیی و بەختەوەریی لە دنیاو دواڕۆژدا و، ترسێنەر بووە بۆیان، لە لادان و خلیسکان و، بانگەوازکار بووە بۆ لای خوا بە مۆڵەتی خوا و، بەڕاستیی موحەممەد ﷺ چرایەکی تیشکدەر بووە، ڕێ ڕۆشنکەرەوە بووە و، ئیسلامی لە خۆیدا بەرجەستە کردوە، وەك دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازیبێ گوتوویەتی: {كَانَ خُلُقُ نَبِيِّ اللَّه ﷺ الْقُرْآنَ}[1].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوشت و ئاکاری قوڕئان بووە.

---

(١) {عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، قَالَ سَأَلْتُ عَائِشَةَ رضي الله عنها فَقُلْتُ: أَخْبِرِينِي عَنْ خُلُقِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَتْ كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ} أخرجه أحمد: ٢٥٣٤١، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

چ تەماشـای پێغەمبـەری خـوا ﷺ بکـەی و لێـی وردبیـەوە و، چ قورئـان بخوێنیەوە، یـەك هەقیقـەت دەبینـی کـە حەقیقـەتی بەندایەتییـە بـۆ خـوا و، هەقیقـەتی بـۆ خـوا صوڵحـان و پاکیـی و چاکییـە، ڕاسـتیی و سـاغییە.

٤)- ﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴾، موژدەش بدە بە بڕواداران و، دڵیان خۆش بکە، کە لە خواوە پاداشتێکی گەورەیان هەیە، بەخششێکی گەورەیان هەیە، (الفَضْلُ: العَطَاءُ الَّذِي يَزِيْدُ المُعْطِي زِيَادَةً للمُعْطِى)، واتە: (فَضْل) بریتیە لەو زیادەیەی کە بابای بەخشندە دەیبەخشێ بە بابای پێ بەخشراو، یانی: بێ ئەوەی هەقی بێت، واتە: خوا لە بەخششی خۆی زیادەتان پێ دەدات.

٥)- ﴿ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ ﴾، بە قسەی کافران و مونافیقان مەکە، گوێڕایەڵیان مەبە، فەرمانبەریان مەبە و، ئەوەی کە ئەوان دەیڵێن لەگەڵیاندا گونجاو مەبە و، بەو شێوەیەی کە ئەوان لاتبدەن، بە قسەیان مەکە لە ناهەقیدا.

٦)- ﴿ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ ﴾، ئازارەکەیان پشتگوێ بخە، نیهمالی بکە، نادیدەی بگرە، با هاوسەنگییت تێك نەدات و شلوێت نەکات و نەتشڵەژێنێ، چونکە ئازاری ئەوان بریتی بوو لە: پڕو پاگەندەو قسەو قاڵ و، لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشاکردن و، تانە لێدانی پێغەمبەر ﷺ کە ئەوە بەردەوام هەیە، بۆ هەموو دۆستانی خوا.

٧)- ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾، پشتیش بە خوا ببەستەو، خواش بەسە وەکیل و کارپێسپێردراو بێ و، پشت پێ سپێردراو بێ، هەر کەسێ پشت بە خوا ببەستێ، پشتی لە زەوی نادرێ و، هەر کەسێ کاری خۆی بە خوا بسپێرێ، خوا کارەکەی زایە ناکات، بەڵکو کارەکەی بۆ چاك دەکات.

## کورتە باسێک لە بارەی یادی خوا کردنەوە

خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بە یاد کردنێکی زۆر، یادی خوا بکەن و، بەیانیان و ئێواران بە پاکی بگرن.

بەڕێــزان!

ئێمە ئەم کورتە باسە لە بارەی یادی خوا کردنەوە، لە پێنج تەوەردا، دەخەینە ڕوو، کە بە پوختکردنەوەوە لە بەرگی چوارەمی مەوسووعەی: (خواپەرستیی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا)، (پێنجەمین دروشمی خواپەرستیی: زیکری خوا کردن)، وەریدەگرین[1]:

### ا)- واتا و پێناسەی یادی خوا (ذکر الله):

**أ- پێناسەی یادی خوا، لە ڕووی زمانەوە:**

زانایان بە چەند شێوەیەك، پێناسەی (ذِکر)یان کردوە، کە وشەیەکی عەرەبییەو بە کوردیی وشەی (ذِکر) دەبێتە (یاد کردن) و (باسکردن)، (ذَكَرَهُ) هەم بە مانای (یادی کرد) یان (هاتەوە یادی)، هەروەها هەم بە مانای (باسیکرد) دێ، بۆ وێنە:

١- خاوەنی کتێبی (مختار الصحاح)[2]، دەڵێ: (الذِّكْرُ: والذِكْرَى، والذُّكْرَةُ ضِدُّ النِّسْيَان)، هەر کام لە (ذِكْر، ذِكْرَى، ذُكِرَة) دژی لە بیرچوونەوەن، کەواتە: (ذکر) واتە: لە بیربوون و بیر هاتنەوە.

---

(١) بڕوانە: لاپەڕە: ٣٤٣ - ٤٤١، چاپی دووەم.

(٢) ص ٢٢١، ط ١ / ١٩٢٦م.

٢- (راغب الأصفهاني) دەربارەی وشەی (ذِکر) دەڵێ:

(وَتَارَةً يُقَالُ لِحُضُورِ الشَّيءِ القَلْبَ، أو القَوْلَ، وَلِذَلِكَ قِيلَ الذِّكْرُ ذِكْرانِ: ذِكرٌ بِالْقَلْبِ وذِكْرٌ بِاللِّسَانِ، وَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا ضَرْبَانِ: ذِكْرٌ عَنْ نِسْيَانٍ وَذِكْرٌ لا عَنْ نِسْيَانٍ)[1].

واتە: وشەی (ذِکر) جاری وایە بەوە دەگوترێ کە شتێك لە دڵدا ئامادە بێ، لە یادو فیکردا، یاخود لەسەر زمان و بە گوتن ئامادە بێ، هەر بۆیە گوتراوە: زیکر دوو زیکرە: یاد کردنێك بە دڵ و، یاد کردنێك بە زمان، هەر کامێکیش لەمانە دوو جۆرن: یاد کردنێك دوای لە بیرچوونەوەو، یاد کردنێك بەبێ لەبیرچوونەوە.

٣- (الزمشخري)یش هەر لەو بارەوە لە کتێبی (أساس البلاغة)[2]دا، دەڵێ: (وَاجْعَلْهُ مِنِّي عَلَى ذِكْرٍ أي: لَا أَنْسَاهُ)، واتە: وام لێ بکە فڵانشتەم لە بیربێت، واتە: لە بیرم نەچێ.

٤- هەروەها هەر کام لە (إبن منظور) لە (لِسان العَرَب)[3]دا.

٥- نووسەرانی (المعجم الوسيط)[4] هەر هەمان قسەی پێشوویان دووبارە کردۆتەوە، لە بارەی پێناسە و چەمك و واتای وشەی (ذِکْر)ەوە.

**ب- یادی خوا لە زاراوی شەرعدا:**

بە زۆریی وایە شەرع هەر بە پێی مانا زمانەوانییەکەیان، وشەکان بەکاردێنێ، ئنجا دەتوانین بڵێین: بە کورتیی و گوشراویی (ذکر) لە زاراوەی شەرعدا، ئەوە پێناسەکەیەتی:

**[(ذِکر) بریتیە: لە بەسەر دڵ و زماندا هێنانی یادی خواو، سیفەتە بەرزەکانی و، ناوە پەسندەکانی و، بە پاك گرتنی و ستایشکردن و بە گەورەو بەرز گرتنی].**

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ١٨١.

(٢) لفظ : ذكر.

(٣) ج٤ ص ٣٠٨، ٣٠٩.

(٤) ص ٣١٣.

ئەمە شیلەو پوختەی هەموو ئەو پێناسەیانەیە کە زانایانی شەرعزان لەو بارەوە گوتوویانن:

بۆ وێنە:

١- (مُجاهد)[١] کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین دەڵێ: ئینسان ناچێتە ڕیزی:﴿ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ ﴾ەوە، هەتا بە پێوە و، بە دانیشتنەوەو، بە ڕاکشانەوە، یادی خوا نەکات.

٢- (سعید بن جُبیر)[٢] گوتوویەتی: هەر کەسێك لە فەرمانبەریی خوادا بجووڵێ و کار بکات، ئەوە یادی خوای کردوە.

٣- (عطاء الخراساني)[٣] دەڵێ: کۆڕەکانی زیکر بریتین: لە کۆڕەکانی حەڵاڵ و حەرام و، باسکردنی چۆن دەکڕیی و، دەفرۆشیی و، چۆن نوێژ دەکەی و، بە ڕۆژوو دەبی و، ژن دێنی و تەڵاق دەدەی و، چۆن حەج دەکەی و... هتد؟!.

٤- لە (إبن صلاح الشهرزوري)[٤] پرسیار کراوە: ئایا ئینسان بە چ ئەندازەیەك لە یادی خوا کردن دەچێتە ڕیزی: ﴿ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ ﴾؟ واتە: پیاوان و ئافرەتانی زۆر خوا لە یاد؟ ئەویش گوتوویەتی: ئەگەر لەسەر ئەو جۆرە زیکرو ویردانە بەردەوام بێ، کە لە ڕێی ڕاستەوە ئیسپات بوون، لە بەیانیان و ئێوارانداو، لە حاڵەتە جۆراو جۆرەکانی ڕۆژدا کە دەگوترێن، ئەوە ئەو مرۆڤە دەچێتە ڕیزی ئەوانەوە کە خوا بە: ﴿ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ ﴾ ناوی هێناون.

٥- (القرطبي)[٥] لەو بارەوە دەڵێ: کۆڕی زیکر، یانی: کۆڕی زانست و ئامۆژگاریی و، ئەو کۆڕانەی کە قورئانی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ تێیاندا دەخرێنەڕوو، هەروەها هەواڵی پێشینە چاکەکان و، پێشەوایانی پێشووی دنیا بە کەمگر، کە دوور بوون لە ڕیاکاریی

---

(١) فقه السنة، ج٢ ص ٨٦.

(٢) الأذكار، للنووي، ص٤١، ٤٢.

(٣) هەمان سەرچاوە.

(٤) هەمان سەرچاوە.

(٥) هەمان سەرچاوە.

و، داهێنان و دنیا ویستیی و تەماع، ئەو کۆڕانەی کە بەسەرهاتی ئەوانیان تێدا دەگێڕدرێنەوە، کۆڕی زیکرن.

٦- (عبدالحميد الكشك)(١)، دەڵێ: (إنَّ الذِّكْرَ عَلَى سَبْعَةِ أنْحَاءُ فَذِكْرُ: العَيْنَيْنِ البُكَاءُ، وذِكْرُ الأُذُنَيْنِ الإصْغَاءُ، وَذِكْرُ اللّسَانِ الثَّنَاءُ، وَذِكْرُ اليَدَيْنِ العَطَاءُ، وَذِكْرُ البَدَنِ الوَفَاءُ، وَذِكْرُ القَلْبِ التَّسْلِيْمُ وَالرِّضَاءُ، وَذِكْرُ الرُّوحِ الخَوفُ والرجَاء).

واتە: یادی خوا کردن حەوت جۆرە، یادی خواکردنی چاوان گریانەو، هی گوێیان گوێهەڵخستنە، (واتە: بۆ قسەی باش و، بۆ قورئان خوێندن)، یادکردنی زمان مەدح و ستایشی خواکردنە و، یادی دەستان بەخشینە و، یادی جەستە وەفاداریی و جێبەجێکردنەو، یادکردنی دڵ گەردنکەچیی و ڕازیبوونەو، یادکردنی ڕووحیش ترس و ئومێدە.

ئنجا ئەگەر بمانەوێ ئەمانە هەموویان پوخت بکەینەوە، دەتوانین بڵێین:

زیکری خوا، ئەوەیە کە ئینسان خوای پەروەردگارو بێ وێنەی لە بیر بێت و، بە ناو سیفەتە بەرزو پەسندەکانی باسی بکات و، بە پاکگرتن و ستاییشکردن و بە گەورەو مەزن و بەرزو پیرۆزگرتنی خوا ڕابگەیەنێ، ئنجا بێگومان هەتا ئینسان سەر گەرمی فەرمانبەریی و بەندایەتییکردن بێ بۆ خوا، بە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی فەرمانبەریی و بەندایەتیی، ئەوە خوای بەرزو مەزنی لە یادە و لە بیرەو، ئاگای لێی نەبڕاوەو ئەو کردەوانەی بۆی بە یادی خوا کردن لە قەڵەم دەدرێن، بە چەمکە گشتییەکەی زیکر.

چونکە (ذِکر) دەگونجێ بڵێین: چەمکێکی تایبەتیی هەیە و، چەمکێکی گشتییشی هەیە کە بریتیە: لە باسکردنی هەر شتێك کە پەیوەندیی بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺو، بە ئایین و بەرنامەی خواوە هەبێ.

---

(١) رياض الجنة، ص ١٤٠.

## ٢)- گرنگیی و پلە و پایەی زیکری خوا:

ئەم تەوەرە لە سێ بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

١- لەبەر تیشکی ئایەتەکانی قورئاندا.

٢- لەبەر تیشکی دەقەکانی سوننەتدا.

٣- لەبەر ڕووناکیی قسەو بۆ چوونی زاناو پێشەوایاندا.

**یەکەم: گرنگیی و پلەو پایەی زیکر، لە قورئاندا:**

**(إبن قیم الجوزیة)** لە کتێبی: **(مدارج السالکین، شرح منازل السائرین)**[1]دا، دەڵێ: گرنگیی و پلەو پایەی یادی خوا لە قورئاندا، بە دە (١٠) شێوە خراوەتە ڕوو:

**١)- فەرمان پێکردنی:**

خوای بەخشندە ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! یادی خوا بکەن، بە یاد کردنێکی زۆر و، بەیانیان و ئێواران بە پاکی بگرن.

**٢)- قەدەغەکردنی بێئاگایی لە خوا:**

کە ئەوە پێچەوانەی زیکرە، وەك خوای پەنهانزان فەرموویەتی: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ﴿٢٤﴾﴾الكهف، واتە: هەر کاتێك لە یادت چوو، یادی پەروەردگارت بکە.

هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾﴾الأعراف، واتە: یادی پەروەردگارت بکە، لەبەر خۆتەوە بە لالانەو بە ترسەوە، بە بێ دەنگ بەرزکردنەوە، بەیانیان و ئێواران و، لە بێ ئاگایان مەبە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿١٩﴾﴾الحشر، وەك ئەوانە مەبن کە خوایان لە بیر کرد، خوایان فەرامۆشکردو، خواش خۆیانی لە بیربردنەوە، ئا ئەوانەن دەرچوون.

---

(١) ج٢ ص ٤٢٤-٤٢٨.

٣)- پێیەوە پەیوەست کردنی سەرفرازیی:

وەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ الأنفـال، واتـە: زۆر یـادی خـوا بكـەن، بەڵكـو سـەرفرازبن.

٤)- مەدح و ستایشكرانی ئەنجامدەرانی زیكرو، پاداشتی بەرز بۆ دانرانیان:

وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٣٥﴾ ﴾الأحـزاب.

٥)- هەواڵدان بە زەرەرمەندیی و، زیانباریی وازلێهێنەرانی یادی خوا:

وەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٩﴾ ﴾المنافقـون، واتـە: ئـەی ئـەو كەسـانەی بڕواتـان هێنـاوە! بـا مـاڵ و سـامانتان و ڕۆڵەكانتـان لـە یـادی خوا بـێ ئاگاتـان نەكـەن، چونكـە بێگومـان هـەر كەسـێ وابـكات ئـا ئەوانـەن زیانبـاران.

٦)- خوا، یادكردنی خۆی بۆ بەندەكانی، كردۆتە پاداشت و بەرانبەری، یادی ئەوان بۆ وی:

وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾ البقـرة، واتـە: یـادم بكـەن، منیـش یادتـان دەكـەم و، سوپاسـگوزارییم بـۆ بكـەن و سـپڵەییم بەرانبـەر مەكـەن، واتـە: ئەگـەر ئێمـە یـادی خـوا بكەیـن، خـوا یادمـان دەكات، كەواتـە: یادكـردنی خـوا بـۆ ئێمـە، پاداشـتی یادكـردنی ئێمەیـە بـۆ وی.

٧)- هەواڵدان بەوە، كە زیكری خوا، لە هەموو شتێك گەورەترە:

وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ

(٤٥) ﴾العنكبوت، واتە: ئەوەی کە لە کتێبی خوا بۆت سروشکراوە، بیخوێنەوە و، نوێژ بەرپا بکە، بێگومان نوێژ (خاوەنەکەی) قەدەغە دەکات لە هەرچی قسەو کردەوەی ناشیرین و خراپە و، یادی خواش گەورەترە و، خواش دەزانێ چی دەکەن!

٨)- ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە خوا لە یادان، خاوەن عەقڵ و سوودمەندن لە نیشانەکانی خوا:

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ (١٩٠) ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ (١٩١) ﴾آل عمران، واتە: بەڕاستیی لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و، جیاوازیی و جێگۆڕکێی شەو ڕۆژدا، نیشانە گەلێك هەن، بۆ خاوەن عەقڵان، ئەوانەی کە بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان، یادی خوا دەکەن و بیر لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە، (سەرەنجام دەڵێن:) پەروەردگارمان! ئەمەت بە پووچیی دروست نەکردوە پاکیی بۆ تۆ، دەجا لە ئازاری ئاگر چەپاڵەمان بدە!

٩)- گێڕانی یادی خوا بە کۆتایی سەرجەم خوا پەرستییەکان و کردەوە چاکەکان، بۆ وێنە: لە بارەی نوێژەوە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ (١٠٣) ﴾النساء، ئنجا هەر کاتێك نوێژتان تەواو کرد، یادی خوا بکەن بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتەکانتان.

کەواتە: خوا، یادی خواکردنی خستۆتە کۆتایی نوێژەوە.

هەروەها لە بارەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُواْ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (١٨٥) ﴾البقرة، کە بە ڕای تێکڕای

زانایــان و توێــژەرەوانی قورئــان دەڵێــن: مەبەســت لــە: ﴿ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ ﴾، (اللــە أکـبر)ەکانی پێـش نوێــژی جــەژنی رەمەزانــە.

دیســان لــە دوای حەجیـش، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ﴿٢٠٠﴾ ﴾البقــرة، واتــە: هــەر کاتــێ خــوا پەرســتییەکانی حەجتــان تــەواو کــردن، وەك بــاس و خواســیی بــاب و باپیرانتــان و بگــرە زیاتــرو چاکتریــش، یــادی خــوا بکــەن.

لـە دوای نوێـژی جومعـەوەش، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠﴾ ﴾الجمعـة، واتە: ئەگـەر نوێــژ تــەواو بــوو، بــە زەوییــدا بڵاوببنــەوەو، لــە بەخشــشی خــوا داوا بکــەن، (واتــە: کارو کاســبیی بکــەن)و زۆریــش یــادی خــوا بکــەن، بەڵکــو ســەرفرازبن.

١٠)- جووتکردنی یادی خوا، لەگەڵ سەرجەم کردەوە چاکەکاندا و، گێڕانی بە ڕووح و کاکڵیان، وەك خوا لە بارەی نوێژەوە، فەرموویەتی: ﴿ إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدْنِى وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ ﴿١٤﴾ ﴾طه، واتە: بێگومان منم خوا، جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە، دەجا بمپەرستەو نوێژ بەرپا بکە بە مەبەستی یادکردنی من.

کەواتە: یادی خواکردن، ئامانجەو نوێژ ئامرازە.

هەروەها خوا لەگەڵ ڕۆژوو، حەجیشدا باسیکردووە، کە پێشتر ئایەتەکانمان هێنان.

دیســان لەگــەڵ جەنــگ و جیهادیشــدا، یــادی خــوا هــەر هەیــە، وەك خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُوا۟ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾الأنفـال، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! هـەر کاتێ بـە کۆمەڵێـك گەیشـتن (بەرەنـگاری کۆمەڵێـك لـە دوژمنانتـان بوونـەوە) چەسـپاو بـن و، یـادی خـوا زۆر بکـەن، بەڵکـو سـەرفراز بـن، واتـە: ئـەو جەنگەتـان ببەنـەوە و، تێیـدا بـە ئامانـج بگـەن.

**دووەم: گرنگیی و پلەو پایەی یادی خوا، لە سوننەت دا:**

دەقی سوننەت لە بارەی گرنگیی و، گەورەیی و، پلەو پایەی بەرزی زیکری خوا کردنەوە، یەکجار زۆرن، ئەم پێنجەیان وەك نموونە دەخەینە ڕوو:

**١)- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ، قَالُوا: وَمَا الْمُفَرِّدُونَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الذَّاكِرُونَ اللهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتُ} (أخرجه أحمد: ٩٣٢١، ومسلم: ٢٦٧٦، وابن حبان: ٨٥٨).**

واتە: تاقبووەوەکان پێش هەموو خەڵکی کەوتوونەوە (لە چاکەدا)، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ تاقبووەوەکان کێن؟ فەرمووی: پیاوان و ئافرەتانی زۆر خوا لە یاد.

**٢)- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {لَا يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللهَ، إِلَّا حَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ}، (أخرجه أحمد: ١١٨٩٣، وعبد بن حميد: ٨٦١، ومسلم: ٢٧٠٠، وأبو يعلى: ١٢٥٢، وابن حبان: ٨٥٥، الترمذي: ٣٣٧٨، وقال: حسن صحيح، عن أبي هريرة).**

واتە: هیچ کۆمەڵێك لە شوێنێکدا دانانیشن و، یادی خوای تێدا ناکەن، مەگەر فریشتەکان دەوریان دەدەن و، بەزەیی خوا دایان دەپۆشێ و، ئارامیی و ئۆخژنیان بۆ دێنێتە خوار و، خوا لە لای ئەوانەی کە لە لاین (واتە: فریشتە زۆر نیزیکەکان) باسیان دەکات.

**٣)- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لا يَذْكُرُ رَبَّهُ، مَثَلُ الحَيِّ وَالمَيِّتِ} (أخرجه البخاري: ٦٠٤٤، ومسلم: ٧٧٩، وابن حبان: ٨٥٤، وهذا اللفظ البخاري، عن أبي موسى الأشعري ﷺ).**

واتە: وێنەی کەسێك کە یادی خوای پەروەردگاری دەکات و، کەسێك کە یادی پەروەردگاری ناکات، وەك زیندوو و مردوو، وایە.

**٤)- هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە درێژەی فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {وَآمُرُكُمْ أَنْ تَذْكُرُوا اللَّهَ، فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ خَرَجَ الْعَدُوُّ فِي أَثَرِهِ سِرَاعًا، حَتَّى إِذَا أَتَى عَلَى حِصْنٍ حَصِينٍ، فَأَحْرَزَ نَفْسَهُ مِنْهُمْ، كَذَلِكَ الْعَبْدُ لَا يُحْرِزُ نَفْسَهُ مِنَ الشَّيْطَانِ إِلَّا بِذِكْرِ اللَّهِ} (أخرجه الترمذي: ٢٨٦٣، عن الحارث الأشعري ﷺ، وصَحَّحَهُ، وكذلك صَحَّحَهُ كُلّ من ابن حبّان والحاكم والألباني).**

واتــە: فەرمانتـان پـێ دەكـەم كـە يـادی خـوا بكـەن، چونكـە وێنـەی كەسـێك كـە يـادی خـوا دەكات، وەك پياوێـك وايـە كـە دوژمـن بـە خێرايـی بەدوايـدا بچـێ، هەتـا خـۆی دەگەيەنێتــە قەڵايـەكی قايـم و، خـۆی لەوێـدا لـە چنـگ دوژمـن دەپارێـزێ، بەنـدەش ئاوايـە بـە يـادی خـوا نەبـێ، خـۆی پێ لـە شـەيتان پەنـا نـادرێ و ناپارێززرێ.

٥)- عەبدوڵڵای كوڕی بوسر ﷺ ، دەگێڕێتەوە كە پياوێك هاتۆتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتوويەتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ڕێيەكانی چاكەكردن زۆرن و منيش ناتوانم هەموويان ئەنجام بدەم، ئنجا شتێكم پێ بڵێ كە جەختی لەسەر بكەم، بەڵام با زۆر نەبێ لە بيرم بچێتەوە! ئەويش پێی دەفەرموێ: [لَا يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ] (أخرجه أحمد: ١٧٧١٦، والترمذي: ٣٣٧٥، وابن أبي شيبة: ٢٩٤٥٣، وابن ماجه: ٣٧٩٣، وابن حبان: قم ٨١٤، والحاكم: ١٨٢٢، وقال: صحيح الإسناد، وَصَحَّحَهُ الألباني).

واتە: با بەردەوام زمانت بە يادی خوا تەڕو پاراو بێ.

سێيەم: گرنگيی و پلەو پايەی زيكری خوا، لە ڕوانگەی زانايانەوە:

بێگومـان زانايانيـش هـەر ئـەوەی كـە لـە قورئـان و لـە دەقـەكانی سـوننەتدا هاتوە، قسـەكانی خۆيـان لەوانـە هەڵێنجـاوە، كـە هەندێكيـان بـە نموونـە لـێ دێنينەوە:

١)- [قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: إِنَّ اللهَ لَمْ يَفْرِضْ عَلَى عِبَادِهِ فَرِيضَةً إِلَّا جَعَلَ لَهَا حَدًّا مَعْلُوماً، ثُمَّ عَذَرَ أَهْلَهَا فِي حَالِ عُذْرٍ، غَيْرَ الذِّكْرِ، فَإِنَّ اللهَ لَمْ يَجْعَلْ لَهُ حَدًّا يَنْتَهِي إِلَيْهِ، وَلَمْ يَعْذُرْ أَحَدًا فِي تَرْكِهِ، إِلَّا مَغْلُوبًا عَلَى تَرْكِهِ، فَقَالَ: ﴿فَاذْكُرُوا اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۝١٠٣﴾ النِّسَاءِ، بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ، فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ، وَفِي السَّفَرِ وَالْحَضَرِ، وَالْغِنَى وَالْفَقْرِ، وَالصِّحَّةِ وَالسَّقَمِ، وَالسِّرِّ وَالْعَلَانِيَةِ، وَعَلَى كُلِّ حَالٍ][1].

واتـە: عەبدوڵـڵای كـوڕی عەببـاس (خوا لێيـان ڕازيبێ) دەڵـێ: خوا ﷻ هيـچ فەرزێكی لەسـەر بەنـدەكانی پێويسـت نەكـردوە، مەگەر سـنوورێكی دياريكـراوی بۆ دانـاوە لە كاتی بـۆ نەگونجانيشـدا، مۆڵـەتی خەڵكەكـەی داوە كـە نەيكـەن، بێجگـە لـە زيكـر، كـە خـوا

---

(١) جامع البيان رقم: ١٠٢٨٠، فتح القدير للشوكاني: ج٤، ص٤١٠.

سنووریکی بۆ دانەناوە، لەوێ کۆتایی پێبێنن، مەگەر کەسێك هۆشی لەسەر خۆی نەمابێ، ئەگەرنا مۆڵەتی بە کەس نەداوە بۆ نەکردنی، خوا فەرموویەتی: بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتتان یادی خوا بکەن، یانی: بە شەوێ و بە ڕۆژێ، لە وشکانیی و لە دەریادا، لە سەفەرێ و لە ماڵێ، بە دەوڵەمەندیی و بە هەژاریی، بە نەخۆشیی و بە ساغیی، بە پەنهانیی و بە ئاشکراو، لە هەموو حاڵاندا.

٢)- (الحسن البصري) ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەو بارەوە دەڵێ: {الذِّكْرُ ذِكْرَانِ: ذِكْرُ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ بَيْنَ نَفْسِكَ وَبَيْنَ الله عَزَّ وَجَلَّ، مَا أَحْسَنَهُ أَعْظَمَ أَجْرَهُ، وَأَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ: ذِكْرُ اللهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عِنْدَمَا حَرَّمَ الله عَزَّ وَجَلَّ}[1] (إحياء علوم الدين).

واتە: حەسەنی بەصرایی گوتوویەتی: یادی خوا کردن دوو جۆرە، یادی خوا (عَزَّ وَجَلَّ) کردن لە نێوان خۆت و خوادا (عَزَّ وَجَلَّ) چەندە چاکەو چەندە پاداشتەکەی مەزنە، بەڵام لەوە گەورەترو چاکتر، یادی خوا (عَزَّ وَجَلَّ) کردنە ﷻ لەو کاتانەدا کە خوا قەدەغەی کردوون، یانی: ئەو شتانەی خوا قەدەغەی کردوون، لەوێ یادی خوا بکەی و، سنووری قەدەغەکانی خوا (عَزَّ وَجَلَّ) نەشکێنی.

٣)- قسەیەکی (أحمد بن عطاءالله الأسكندري) کە لە حیکمەتەکانی خۆیدا هێناویەتی، بەڵام من لە (إيقاظ الهمم في شرح الحكم)دوە، هێناومە، کە لەو بارەوە زۆر شتی گوتوە، بۆ وێنە:

{لاَ يَسْتَحْقِرُ الوِرْدَ إلاَّ جَهُولٌ، الوَارِدُ يُوجَدَ فِي الدَّارِ الأَخِرَةِ، وَالوِرْدُ يَنْطَوِي بانْطِوَاءِ هذِهِ الدار، وأولى ما يُعْتَنَى بِه، مَا لَا يُخْلَفُ وَجُودُهُ، الوِرْدُ هُوَ طَالِبُهُ مِنْكَ، وَالوَارِدُ أَنْتَ تَطْلُبُهُ مِنْهُ، وَأَيْنَ مَا هُوَ طَالِبُهُ مِنْكَ، مِنْ مَا هُوَ مُطْلَبُكَ مِنْهُ، الوِرْدُ الإِمْدَاد بِحَسَبِ الإِسْتِعْدَاد، وَشُرُوق الأَنْوَارِ عَلَى حَسَبِ صَفَاءِ الأَسْرَارِ}.

ئەم قسانە هەندێك وردبوونەوەیان دەوێ، باش لێیان تێبگەین:

واتە: بابای نەفام نەبێ، ویرد بە کەم ناگرێ، (ویرد: واتە: ئەو زیکرانەی کە مرۆڤ دیارییان دەکات و دووبارەیان دەکاتەوە)، بەرهەمی ویرد لە مەنزڵگای

---

(١) ج٢ ص ٤٦٢.

دوارۆژدایە، بەڵام بە پێچەوانەوەی ئەم ژیانە دنیاییە، ویرد خوێندن کۆتایی دێ، (واتە: «وَارِدُ» کە بەرهەمی «وِرْدٌ»ە، لە دوارۆژدا پێی دەگەی، بەڵام ویردەکە لە دنیادا کۆتایی دێ و سنووردارە)، لە پێشترین شتیش کە دەبێ بایەخی پێ بدرێ، شتێکە کە بە هیچ شتێ پڕ نابێتەوە، (ویردیش بە هیچ شتێك شوێنی پڕنابێتەوە)، ویرد خوا لێی داوا کردووی، بەڵام بەرهەمی ویرد (بۆ وێنە: کەرامەت) تۆ لەوی داوا دەکەی، ئنجا ئەوەی ئەو لە تۆی داوا کردوە، زۆر جیاوازە، (واتە: بەرزو چاکترە) لەوەی تۆ لەوی داوای دەکەی، ویرد هاتنی یارمەتیی مەعنەوییە بەپێی ئامادەییە و، لە دڵدا پەیدابوونی ڕووناکییەکانی هیدایەت، بە گوێرەی پاکیی و سافبوونەوەی دەروونەکانە.

مەبەستی (إبن عطاء الله) ئەوەیە کە بە هۆی بەردەوام بوون لەسەر زیکرو ویردەوە، ئینسان ئامادەیی بۆ لا هاتنە خوارەوەی پێ بەخشرانی یارمەتیی و هیدایەتیی خوایی پەیدا دەکات و، هەتا زیاتر ئەهلی زیکر بێت، دڵی سافترو دەروونی پاکتر دەبێ و، لە ئاکامی ئەوەشدا زیاترو چاکتر شایستەیی ئەوەی تێدا پەیدا دەبێ، کە ڕووناکیی هیدایەتی خوا دڵ و دەروونی ڕۆشن و شوعلەوەر بکات.

### ٣)- جۆرەکانی یادی خوا کردن: (أنواع الذِّكْر):

جۆرەکانی یادی خواکردن، دەگونجێ زۆر زۆریان قسە لەسەر بکرێ، بەڵام ئێمە دە (١٠) جۆرمان لە جۆرەکانی یادی خواکردن هێناون، هەڵبەتە هەر کام لەو دە جۆرانەش، جاری وایە چەند لقێکی لێ دەبنەوە:

**جۆری یەکەم: قورئان خوێندن:**

١- قورئانخوێندن گەورەترین جۆری یادی خواکردنە، قورئان هەر یەكێك لە ناوەكانی بریتیە لە زیکر: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾النحل، لەو بارەوەش فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ زۆر زۆرن، کە قورئان گەورەترین جۆری یادی خواکردنە و، لە هەموو جۆرەکانی دیکە پاداشتی زیاترە بە گشتیی، بۆ وێنە:

٢- {اقْرَءُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لأَصْحَابِهِ}، (أخرجه مسلم: ٨٠٤، عن أبي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ)، واتە: قورئان بخوێنن، چونکە ڕۆژی قیامەتدا دێت، تکاکارە بۆ هاوەڵەکانی (یان: تکا بۆ خاوەنەکانی دەکات).

٣- {الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَهُوَ مَاهِرٌ بِهِ، مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ}، (أخرجه البخاري: ٤٦٥٣، ومسلم: ٧٩٨، وأبو داود: ١٤٥٤، عن عائشة رضي الله عنها)، واتە: ئەو كەسەی قورئان دەخوێنێ، تێیدا کارامەیە، لەگەڵ نوێنەرە بەرزە چاکەکارەکانە، واتە: لەگەڵ فریشتەکانە.

٤- {مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللهِ، فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لا أَقُولُ «ألم» حَرْفٌ، ولَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ، ولَامٌ حَرْفٌ، ومِيمٌ حَرْفٌ} (أخرجه الترمذي: ٢٩١٠، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ، وقال: حديث حسن صحيح).

واتـە: هـەر کەسـێك پیتێـك لـە کتێبـی خـوا بخوێنـێ، چاکەیـەکی بـۆ دەنـووسرێ، هـەر چاکەیـەك بـە دە (١٠) دەنـووسرێ، ناشـڵێم (ألم) هەمـووی پیتێکـە، بەڵکـو (أ) پیتێکـە، (ل) پێتێکـە، (م) پێتێکـە.

**جۆری دووەم: پاڕانەوە:**

دەشـگونجێ پاڕانـەوە بـە شـتێکی جیاواز لـە یـادی خـوا دابـنرێ، بـەڵام لە ڕاسـتییدا چەمـك و واتـای فـراوانی یـادی خواکـردن، دوعـاش دەگرێتـەوە، چونکـە تـۆ کاتێـك لـە خـوا دەپاڕێیـەوە، چ لـێ پاڕانـەوەی داواکـردن، چ لـێ پاڕانـەوەی مـەدح و سـتایش کـردن، تـۆ بـە تەنکیـد یـادی خـواش دەکـەی، بۆیـەش خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ادْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۞٦٠﴾ غافـر، واتـە: لێـم بپاڕێنـەوە، وەڵامتـان دەدەمـەوە.

هەروەهـا پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: {الدُّعَـاءُ هُـوَ ٱلْعِبَـادَةُ} (أخرجـه أحمـد: ١٨٤١٥، والبخـاري في الأدب المفـرد: ٧١٤، وأبـو داود: ١٤٧٩، والترمـذي: ٢٩٦٩، عَـنِ النُّعْـمَانِ بْـنِ بَشِـيرٍ رَضِيَ اللـهُ عَنْهُـمَا)، واتـە: هـەر پاڕانـەوە خواپەرسـتییە.

لـە فەرموودەیـەکی دیکـەدا دەفەرمـوێ: {لَيْـسَ شَيْءٌ أَكْـرَمَ عَـلَى اللـهِ مِـنَ الدُّعَـاءِ}، (أخرجـه أحمـد ٨٧٣٣، والبخـاري في الأدب المفـرد: ٧١٢، والترمـذي: ٣٣٧٠، وابـن حبـان: ٨٧٠، وابـن ماجـه: ٣٨٢٩، والحاكـم: ٨٠١، وقـال: صحيـح الإسـناد).

واتە: هیچ شتێك لە پاڕانەوە بەڕێزتر نیە، لە لای خوا.

بەڵام پاڕانەوەش لە خوا ﷻ، - دەبێ چەند مەرجێك و چۆنیەتیی و شێوازی تایبەتی تێدا ڕەچاو بكرێن، بۆ ئەوەی كە جێی خۆی بگرێ، بۆ وێنە:

١)- كەسێك كە دەیەوێ لە خوا بپاڕێتەوە، دەبێ خۆی لە حەڕام بپارێزێ، لەو بارەوەش فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ هەیە، كە كەسێك خۆی لە حەڕام نەپارێزێ، دوعاكەی قبووڵ نابێ.

٢)- دەبێ ستاییشی خواكردن و، بە بەرزو پاككرتنی و، صەڵات و سەلام ناردن بۆ پێغەمبەر ﷺ پێش داواكردنی هەر شتێك لە خوای بەخشەر، بكاتە پێشەكیی بۆ پاڕانەوەكەی، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**{إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِتَمْجِيدِ رَبِّهِ جَلَّ وَعَزَّ وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ، ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ يَدْعُو بَعْدُ بِمَا شَاءَ} (أخرجه أبو داود: ١٤٨١، والطبراني في الكبير: ٧٩٣، وابن خزيمة: ٧١٠، قال الأعظمي: إسناده صحيح).**

واتە: یەكێك لە ئێوە كە ویستی بپاڕێتەوە، با پایە بەرزیی پەروەردگاری ڕابگەیەنێ و ستاییشی بكات، دوایی سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات، ئنجا دوایی ئەوەی دەیەوێ داوای بكات.

٣)- دەبێ بە دڵی بێدارو بە كڕووزانەوەو لالانەوەوە، پاڕانەوەكەی بكات، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱدْعُواْ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾الأعراف، واتە: بە لالانەوەو بە پەنهانیی لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە، چونكە ئەو سنوور بە زێنانی خۆشناوێن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **{أَيُّهَا النَّاسُ! فَاسْأَلُوهُ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالإِجَابَةِ، فَإِنَّهُ لاَ يَسْتَجِيبُ لِعَبْدٍ دَعَاهُ عَنْ ظَهْرِ قَلْبٍ غَافِلٍ} (أخرجه الترمذي: ٣٤٧٩، وقال: حديث غريب، والحاكم: ١٨١٧، وقال: مستقيم الإسناد، وحسّنه الألباني).**

واتە: ئەی خەڵكینە! بپاڕێنەوەو داوا لە خوا بكەن، لە حاڵێكدا كە ئێوە دڵنیان لە وەڵامدرانەوەتان، چونكە خوا وەڵامی پاڕانەوەی كەسێك كە لە دڵێكی بێ ئاگاوە دێ، ناداتەوە.

**٤)- بە پەلە نەبوون لە گیرابوونی وەڵامدرانەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {يُسْتَجَابُ لأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ دَعَوْتُ؛ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي} (أخرجه البخاري: ٦٣٤٠، مسلم: ٢٧٣٥ عن أبي هريرة ﷺ).**

واتـە: یەکێکتـان کـە دەپاڕێتـەوە مـادام پەلـە نـەکات، وەڵامـی دەدرێـتەوە، کـە بڵـێ پاڕامـەوەو وەڵامـم نەدرایـەوە.

**٥)- نەپاڕانەوە بۆ شتێکی گوناهو تاوان، دیارە مرۆڤ نابێ بۆ شتێك لە خوا بپاڕێتەوە کە لە خودی خۆیدا گوناهو تاوان بێ، ئەوەش لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ ئەو بەندەی خراوەتە سەر، وەك دەفەرموێ:**

**{مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَدْعُو بِدَعْوَةٍ لَيْسَ فِيهَا إِثْمٌ، وَلاَ قَطِيعَةُ رَحِمٍ، إِلاَّ أَعْطَاهُ اللهُ بِهَا إِحْدَى ثَلاَثٍ: إِمَّا أَنْ يُعَجِّلَ لَهُ دَعْوَتَهُ، وَإِمَّا أَنْ يَدَّخِرَهَا لَهُ فِي الآخِرَةِ، وَإِمَّا أَنْ يَكُفَّ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثْلِهَا، قَالُوا: إِذًا نُكْثِرُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: اللهُ أَكْثَرُ}، (أخرجه ابن أبي شيبة:٢٩١٧٠، وأحمد: ١١١٤٩، وعبد بن حميد: ٩٣٧، وأبو يعلى: ١٠١٩، والحاكم: ١٨١٦، وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان: ١١٢٨، عن أبي سعيد الخدري ﷺ).**

واتـە: هیـچ مسـوڵمانێك نیـە کـە لـە خـوا بپاڕێتـەوە، بـە پاڕانەوەیـەك کـە گوناهـو خزمایەتیـی پچڕانـدنی تێـدا نەبـێ، مەگـەر خـوا بـەو پاڕانەوەیـە، یەکێـك لـە سـێ شـتانی دەداتـێ:

أ- یان پاڕانەوەکەی گیراو جێبەجێ دەبێ.

ب- یان بۆی هەڵدەگیرێ بۆ ڕۆژی دوایی.

ج- یان بە ئەندازەی ئەو شتەی داوای کردوە، شەڕو خراپەی لێ لادەدرێ، هاوەڵەکان گوتیان: کەواتە: ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمەش زۆر دەپاڕێینەوە، فەرمووی: بەخششی خوا زیاترە لە پاڕانەوەی ئێوە.

**٦)- خەفتان لەو کات و حاڵەتانەی، کە پاڕانەوەیان چاکتر تێداگیرا دەبێ، بۆ وێنە: کۆتایی دوای نوێژە فەرزەکان و، قووڵایی شەو و، لە کاتی سەجدە بردندا.**

ئنجا پێویستە چەند ئەدەبێکیش لە کاتی پاڕانەوەدا ڕەچاو بکرێن: وەك:

أ- ڕووکردنە قیبلە ئەگەر بۆی بگونجێ.

ب- دەست بەرزکردنەوە.

ج- دووبارە کردنەوەی پاڕانەوەکان سێ جار، سێ جار.

د- هەندێ لە زانایان گوتوویانە: دەست بە دەم و چاودا هێنان لە کۆتاییدا.

دیارە لە قورئان و لە سوننەتی پێغەمبەریش دا ﷺ جۆرەکانی پاڕانەوە، زۆر زۆرن.

جۆری سێیەم: زیکری خوا، لەکاتی خەو هەڵسانەوە تاکو کاتی نووستن:

پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو حاڵەتە جۆراو جۆرەکان، جۆرە زیکرو یادی خواکردنێکی دیاریکردوە، بۆ وێنە:

١- لە کاتی لە خەو هەڵساندا:

{الـحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا، وإِلَيْهِ النُّشُورُ} (أخرجه البُخاري: ٥٩٥٣، عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ).

واتە: ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە دوای ئەوەی مراند بووینی، زیندووی کردینەوەو، هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە.

٢- لە کاتی بەرەبەیاندا، پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی فێردەکرد، دەیفەرموو:

{إذا أصبح أحدكم فلْيَقُلْ: اللَهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا، وَبِكَ أَمْسَيْنَا، وَبِكَ نَحْيَا، وَبِكَ نَمُوتُ، وَإِلَيْكَ النُّشُور} (أخرجه أبو داود: ٥٠٦٨، والنسائي في» عمل اليوم والليلة»: ٥٦٤، والترمذي: ٣٣٩١، وابن ماجه: ٣٨٦٨).

واتە: ئەگەر یەکێکتان بەیانیی کردەوە با بڵێ: ئەی خوایە! بە تۆ بەیانییمان کردەوەو، بە تۆ ئێوارەمان لێداهات و، هەر بەتۆ دەژین و، هەر بە تۆش دەمرین و، گەڕانەوەش بەس بۆ لای تۆیە.

٣- کاتێك کە مرۆڤ لە ماڵ دەچێتە دەرێ، پێغەمبەر ﷺ دایناوە کە بڵێین:

{بِسْـمِ اللَّـهِ، توكَّلْـتُ عَـلَى اللَّـهِ، وَلَا حَـوْلَ ولا قُـوةَ إلاَّ بِاللَّـهِ} (أخرجـه أبـو داود: ٥٠٩٥، والنسـائي في الكـبرى: ٩٩١٧، وابـن السـني: ١٧٧، وابـن حبـان: ٨٢٢).

واتـە: بـە نـاوی خـوا، پشـتم بـە خـوا بەسـت و، لادان نیـە لـە گوناهـو تـاوان و، هێـز نیـە بـۆ چاکـە، مەگـەر بـە خـوا.

٤- هەروەها لە کاتی چوون بۆ تارەتگرتن و خۆ شۆردندا، دەبێ بگوترێ:

{أَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُـوذُ بِـكَ مِـنَ الْخُبُـثِ وَالْخَبَائِـثِ} (أخرجـه البخـاري: ١٤٢، ومسـلم: ٣٧٥، وأبـو داود: ٤، والترمـذي: ٥، والنسـائي: ١٠، وابـن ماجـه: ٢٩٦، عـن أنـس ﷺ).

واتە: ئەی خوایە! پەنات پێدەگرم لە شەیتانە نێرو مێیەکان.

٥- هەروەها کاتێك کە تەواو دەبێ، داوای لێبوردن لە خوا بکرێ و بگوترێ:

{غُفْرَانَكَ} (أخرجه أحمد: ٦٥٥، وأبو داود: ٣٠، والترمذي: ٧، وابن ماجه: ٣٠٠، والنسائي في «عمل اليوم والليلة»: ٧٩، وابن حبان: ١٤٤٤، والحاكم: ١٨٥، من حديث عائشة ﷺ).

٦- هەروەها لە کاتی ڕووکردنە مزگەوتدا، دوعا هەیە، بە تایبەت لە دوای بانگی بەیانیی، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو:

{اللَّهُـمَّ اجْعَـلْ فِي قَلْبِـي نُـورًا، وَاجْعَـلْ فِي لِسَـانِي نُـورًا، وَاجْعَـلْ فِي سَـمْعِي نُـورًا، وَاجْعَـلْ فِي بَـصَرِي نُـورًا، وَاجْعَـلْ خَلْفِـي نُـورًا، وَأَمَامِـي نُـورًا، وَاجْعَـلْ مِـنْ فَوْقِـي نُـورًا، وَمِـنْ تَحْتِـي نُـورًا، اَللَّهُـمَّ وَأَعْظِـمْ لِي نُـورًا} (أخرجـه أبـو داود: ١٣٥٥، وابـن خزيمـة: ٤٤٨، وغيرهـما).

٧- هەروەها لە کاتی چوونە نێو مزگەوت و، هاتنەدەرو، بیستنی بانگ و قامەتدا، بۆ وێنە: لە کاتی چوونە نێو مزگەوتدا، دەیفەرموو:

{أَللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ} (أخرجه مسلم: ١٦٨٥).

٨- لە کاتی هاتنەدەریش دا دەیفەرموو:

{اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ} (أخرجه مسلم: ١٦٨٥).

٩- له کاتی بیستنی (بانگ)دا وەڵامی بانگبێژ بدرێتەوە: (إذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل ما يقول المؤذن إلاّ في الحيّ علتين فقولوا: لا حول ولا قوة إلاّ بالله) أخرجه مسلم: ٤٨٣.

١٠- له کاتی جل وبەرگ داناندا بۆ خۆ شۆردن، یان بۆ خەوتن، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی دەبێتە پەردە لە نێوان چاوی جندەکان و عەورەتی مرۆڤدا، ئەوەیە کە مرۆڤی مسوڵمان کاتێ پۆشاکی دادەنێ، بڵێ:

{بِسْمِ اللهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ} (أخرجه ابن السني في عمل اليوم والليلة: ٢٧٢).

واته: به ناوی ئەو خوایەی کە جگە لەو هیچ پەرستراو نین.

١١- هەروەها لە کاتی خەوتندا چەند دوعایەك دیاریکراون، بۆ نموونە:

{بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ أَمُوتُ وَأَحْيَا} (أخرجه البخاري: ٥٩٦٥، عن حذيفة ﷺ).

واته: بەناوی تۆ ئەی خوایە بە ناوی تۆ دەمرم و دەژیم.

١٢- لە حاڵەتی بێداربوونەوەش دا، کە مرۆڤ بێدار دەبێتەوە، بڵێ:

{الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُور} (أخرجه البخاري: ٥٩٦٥، عن حذيفة ﷺ).

جۆری چوارەم: زیکری دوای نوێژە فەرزەکان:

لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، سوننەتە تینسان کە سڵاو دەداتەوە لە نوێژە فەرزەکان، سێ جاران (أَسْتَغْفِرُ اللهَ) بکات و، لە هەندێ فەرمایشتاندا هاتوە (اللهُ أَكْبَر) بکات، دوایی سێ جاران بڵێ: (أَسْتَغْفِرُ اللهَ، أَسْتَغْفِرُ اللهَ، أَسْتَغْفِرُ اللهَ)[1].

ئنجا بڵێ: {اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ} دوایی (٣٣) (سُبْحَانَ اللهِ) و (٣٣) (الحَمْدُللهِ) و (٣٣) (اللهُ أَكْبَر) بکات و، جاری

---

(١) أخرجه مسلم: ١٣٦٢.

سەدەمین بڵێ: {لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} (أخرجه مسلم: ٥٩١، وغيره عن ثوبان ﵁).

هەروەها بڵێ:

{اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ، وَشُكْرِكَ، وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ} (أخرجه أحمد: ٢٢١٧٢، وأبو داود: ١٥٢٢، والنسائي في الكبرى: ٩٩٣٧، والحاكم: ١٠١٠، وقال: صحيح الإسناد على شرط الشيخين، وابن حبان: ٢٠٢١ عَن مُعاذ ﵁).

واتە: ئەی خوایە! یاریدەم بدە لەسەر یاد کردنت و سوپاسکردنت و، چاك پەرستنت.

جۆری پێنجەم: زیکری خوا لە سەفەردا:

چ لە کاتێك کە لە ماڵ دەچێتە دەرەوە و، ئەوانەی ماڵێ بەجێ دێڵێ، چ لە کاتێکدا کە سواری ئەو ئامرازە دەبێ کە سەفەری پێ دەکات، بۆ وێنە: واباشە کەسێك کە بەسەفەر دەچێ، ئەوانەی کە بەجێیان دهێڵێ، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، پێیان بڵێ:

{أَسْتَوْدِعُكُمُ اللهَ الَّذِي لَا تَضِيعُ وَدَائِعُهُ} (أخرجه ابن ماجه: ٢٨٢٥، والطبراني في «الدعاء» ٨٢٠، وابن السني في عمل اليوم والليلة: ٢٧٢٥٠٤، عن أبي هريرة ﵁).

واتە: هەر کەسێك ویستی بە سەفەر بچێ، با بەو کەسانە بڵێ: کە بەجێیان دێڵێ: بەو خوایەتان دەسپێرم کە پێسپێردراوەکانی، نافەوتێن.

بەڵام ئەگەر کەسێك کەسێکی بۆ سەفەر بەڕێدەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

{أَسْتَوْدِعُ اللهَ دِينَكَ، وَأَمَانَتَكَ، وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ} (أخرجه أبو داود: ٢٦٠٠، والترمذي: ٣٤٤٣، وقال: حسن صحيح غريب، عن عبدِ الله بنِ عمر رضي الله عنهما).

واتە: ئایینی تۆو سپاردەت و سەرجەم کردەوەکانت بە خوا دەسپێرم.

لە کاتی سواربوونی ئامرازی سەفەردا، ئەوە بگوترێ لە سوورەتی (الزخرف) دا هاتووە: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ الزخرف.

**جۆری شەشەم: یادی خواکردن، لە کاتی جەنگ و جیهاددا:**

پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەش چەند جۆرە زیکرێکی داناون، بۆ وێنە: کاتێک کە لەگەڵ دوژمندا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، سوننەتە ئەوە بڵێین کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: {**اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ، وَمُجْرِيَ السَّحَابِ، وَهَازِمَ الأَحْزَابِ، اهْزِمْهُمْ وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ**} (**أخرجه البخاري: ٢٨٠٤، ومسلم: ١٧٤٢**).

واتە: ئەی خوایە! دابەزێنەری کتێب و، ڕۆێنەری هەورو، تێکشکێنەری پێڕو تاقمەکان، تێکیان بشکێنەو سەرمان بخە.

ئەبو مووسای ئەشعەریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لە دوژمنێك ترسابایە، دەیفەرموو: {**اللَّهُمَّ إِنَّا نَجْعَلُكَ فِي نُحُورِهِمْ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شُرُورِهِمْ**} (**أخرجه أبو داود: ١٥٣٧، والنسائي في «الكبرى»: ٨٦٣١**).

واتە: خوایە! ئێمە تۆیان بە گژدا دەکەین و، لە خراپەیان و زیانیان پەنا بە تۆ دەگرین.

**جۆری حەوتەم: زیکری خوا کردن لە کاتی خواردن و خواردنەوەدا:**

**١- {عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ رضي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنْتُ غُلَامًا فِي حَجْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي رَسُولُ الله ﷺ: يَا غُلَامُ! سَمِّ اللهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ، فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ}(أخرجه البخاري: ٥٠٦١، ومسلم: ٢٠٢٢).**

واتە: عومەری کوڕی ئەبوو سەلەمە (خوا لێیان ڕازیبێ) دەڵێ: من گچکە بووم، لە ژێر چاودێریی و خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم، دەستم لە قاپەکە دەگێڕا (لە کاتی خواردندا)، {دیارە (**بسم الله**)شی نەکردوە}، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کوڕیژگە! ناوی خوا بهێنەو، بە دەستی ڕاستت بخۆ و، لە پێش خۆشتەوە بخۆ، بەردەوام دوای ئەوە خواردنی من ئاوایە.

**٢- لە دایکمان عائیشەوە (خوا لێی ڕازیبێ) گێڕدراوەتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان لە بیری چوو لەسەرەتای خواردنەوە (بِسْمِ الله) بکات با هەرکاتێك هاتەوە**

یادی بڵێ: {بِسْمِ اللهِ أَوَّلَهُ وآخِرَهُ} (أخرجه أبو داود: ٣٧٦٧، والترمذي: ١٨٥٨، وقال: حسن صحيح، والحاكم: ٧٠٨٧، وقال: صحيح)، واتە: بە ناوی خوا لە سەرەتای و لە کۆتاییەوە.

٣- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الْأَكْلَةَ، فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا، أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ، فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا} (أخرجه أحمد: ١١٩٩٢، ومسلم: ٢٧٣٤، والترمذي: ١٨١٦) وَقَالَ: حسن، عن أنس ﷺ).

واتــە: خــوا بەوەنــدە لــە بەندەکــەی ڕازی دەبــێ، کــە خواردنێــك دەخــوات، ســتاییشی خــوای لەســەر بــکات و، کاتــێ خواردنــەوە دەخواتــەوە، ســتاییشی خــوای لەســەر بــکات.

جۆری هەشتەم: لە حاڵەتە جیاجیاکاندا:

١- بۆ وێنە: بەیانیان و ئێواران، بە پاکگرتن و ستایشکردنی خوا ڕابگەیەنرێ، کە لە چەند شوێنێکی قورئاندا هاتوە: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ﴿١٣٠﴾﴾طه، ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴿٥٥﴾﴾غافر.

٢- هەروەها لە کاتی خەم و خەفەت و گرفتارییدا، پێغەمبەر ﷺ دایناوە کە جۆرە زیکرێك بخوێنرێ، بۆ وێنە:

{لَا إِلَـهَ إِلَّا اللـهُ الْعَظِيـمُ الْحَلِيـمُ، لَا إِلَـهَ إِلَّا اللـهُ رَبُّ الْعَـرْشِ الْعَظِيـمِ، لَا إِلَـهَ إِلَّا اللـهُ رَبُّ السَّـمَوَاتِ، وَرَبُّ الْأَرْضِ، وَرَبُّ الْعَـرْشِ الْكَرِيـمِ} (أخرجـه البخـاري: ٦٣٤٦، ومسـلم: ٢٧٣٠، عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِيَ اللـهُ عَنْهُـمَا).

٣- لە کاتی بەڵاو نارەحەتیی و تاقیکردنەوەدا، وەك لە ئوممو سەلەمە خوا لێی ڕازیبێ دایکی بڕوادارانەوە هاتوە، کە سوننەتە بڵێی:{إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي، وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا} (أخرجه مسلم: ٩١٨، وابن ماجه: ١٥٩٨).

واتــە: ئێمــە هــەر هــی خوایــن و، هەموومــان بــۆ لای خــوا دەگەڕێینــەوە، خوایــە! لــەو بەڵایەمــدا پاداشــتم بــدەوە و، لــەوەی کــە لێــوەت گرتــم، چاکــترم پــێ ببەخشــە.

٤- لە کاتی قەرزداریی و قەرز پێنەدرانەوەدا، بگوترێ: {اللَّهُمَّ اكْفِنِي بِحَلَالِكَ عَنْ حَرَامِكَ، وَأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ } (أخرجه الترمذي: ٣٥٦٣، وَحَسَّنَهُ الألباني).

٥- لە کاتی خوتخوتەو دنەدانی شەیتاندا، بگوترێ: {أعوذ بالله من السيطان الرجيم} متفق عليه.

٦- لە کاتی مەترسیی هەبوون لە شەیتان و، لە جڕو جانەوەرو چاوی پیسدا، بگوترێ: {أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ} (أخرجه البخاري: ٣١٩١).

٧- لە کاتی سەردان و هەواڵ پرسینی نەخۆشدا: {لا بَأْسَ، طَهُورٌ إِنْ شَاءَ الله}، (أخرجه البخاري: ٥٦٥٦، عن ابن عباسٍ رضي الله عنهما)، یان بە هەر جۆرێك دڵی خۆشبکرێ و دوعای بۆ بکرێ.

جۆری نۆیەم: چەند زیکرێکی گەورەو گرنگ:

١- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {أَفْضَلُ الذِّكْرِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَفْضَلُ الدُّعَاءِ الْحَمْدُ لِلَّهِ} (أخرجه الترمذي: ٣٣٨٣، وقال: حسن غريب، وابن ماجه: ٣٨٠٠، وابن حبان: ٨٤٦، والحاكم: ١٨٣٤، وقال: صحيح، عن جابر بن عبدالله)، واتە: گەورەترین جۆری زیکر بریتیە: لە گوتنی: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیەو، باشترین پاڕانەوەش بریتیە: لە ستاییش کردنی خوا.

٢- هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {أَفْضَلُ مَا قُلْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّونَ مِنْ قَبْلِي: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ} (أخرجه مالك: ٥٠٠، والترمذي: ٣٥٨٥، وقال: حسن غريب، قَالَ الألباني: حسن)، واتە: چاکترین شتێك کە من و پێغەمبەرانی پێش من گوتوومانە بریتیە: لە گوتنی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ)، بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیەو، تاکەو هیچ هاوبەشی نین.

٣- یەکێکی دیکە لە زیکرە گەورەو گرنگەکان ئەوەیە، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

{سَيِّدُ الِاسْتِغْفَارِ، أَنْ يَقُولَ الْعَبْدُ: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، خَلَقْتَنِي، وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي؛ فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ}[1].

(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٦٣٠٦، وليس عنده لفظ:» العبد» وإن كان عند غيره، وزاد:» من قالها من

کە من لە کتێبی ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چووندا، ئەم زیکرەم لە دە (١٠) بڕگەدا شیکردۆتەوە:

واتە: گەورە سەروەری داوای لێبوردن کردن لە خوا، ئەوەیە کە بەندە بڵێ:

ئەی خوایە! تۆ پەروەردگارمی، جگە لە تۆ هیچ پەرستراوێك نیە، دروستت کردووم و منیش بەندەتم و، من هەتا لە توانامدایە هەر لەسەر پەیمان و بەڵێنی تۆم، لە چنگ خراپەی ئەوە کە کردوومە، پەنات بۆ دێنم، دان بە چاکەی تۆدا دێنم لەسەر خۆم و، پێ لە گوناهەکانم دەنێم، دەجا لێم ببوورە، بێگومان جگە لە تۆ هیچ کەس لە گوناهان نابووریّ.

جۆری دەیەم و کۆتایی: صەڵات و سەلام ناردن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ:

کە دیارە صەڵات و سەلام ناردن بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، وێڕای جێبەجێ کردنی بەشێك لە ئەرکی سەرشان بەرانبەر بە پێغەمبەری کۆتایی ڕابەرو پێشەوامان، جۆرێکیشە لە جۆرە گرنگەکانی یادی خواکردن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦﴾ الأحزاب، واتە: خواو فریشتەکانی صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەدەن، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، سەڵاواتی لەسەر بدەن و سەلامی بۆ بنێرن.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا) (أخرجه أحمد: ٨٨٦٩، ومسلم: ٤٠٨ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ).

هەر کەسێك یەك صەڵاواتم لەسەر بدات، خوا بەو صەڵاتە دە صەڵاواتی لێ دەدات.

خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ئەگەر صەڵاوات لەسەر ئێوە بدەم، دەبێتە هۆی ئەوە کە لە تاریکاییان دەرتان بێنم، وەك لە سوورەتی (الأحزاب)دا خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا ٤١ وَسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا

---

النهار، موقناً بها، فمات من يومه قبل أن يمسي، فهو من أهل الجنة، ومن قالها من الليل، وهو موقن بها، فمات قبل أن يصبح، فهو من أهل الجنة»، و« أبوء»: أعترف.

﴿٤٢ هُوَ ٱلَّذِي يُصَلِّي عَلَيۡكُمۡ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَكَانَ
بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا ٤٣﴾ الأحـزاب.

**واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! زۆر یـادی خـوا بکـەن و، بـە پـاکی بگـرن بەیانیـان و ئێـواران، خـوا ئـەو کەسـەیە کـە خـۆی و فریشـتەکانی صەڵاتتان بـۆ دەنێرن، تاکـو لـە تاریکییـان بـەرەو ڕووناکیـی دەرتـان بێنـێ و، خـوا میهرەبانـە بەرانبـەر بـە بـڕواداران، کەواتـە: لـە ئەنجامـی صەڵاواتـدانی ئێمـە لـە پێغەمبـەر ﷺ و لـە سـەلام ناردنمانـدا بـۆی، خـواو فریشـتەکانی صەڵاواتمـان لـێ دەدەن، لـە ئەنجامـی صـەڵاوەت لێـدانی خـواو فریشتەکانیشـیدا لـە ئێمـە، لـە تاریکاییـان دێینـەدەر بـەرەو ڕۆشـنایی.**

## ٤)- چۆن زیکری خوا بکەین:

**ئەگـەر سـەرنج لـە ئایەتـەکانی کتێبـی خـوا بدەیـن و، سـەرنجی دەقـەکانی ڕێبـازی پێغەمبـەری پێشـەوا بدەیـن ﷺ، بۆمـان دەردەکـەوێ، کـە یـادی خواکـردن، کـە عەبدوڵڵای کـوڕی عەبباس (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) گوتوویـەتی: گشـتگیرە بـۆ هەمـوو حاڵەتـە جـۆرا و جـۆرەکانی مـرۆڤ، هەروەهـا دایکـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازیبـێ)، لـە بـارەی یادکـردنی پێغەمبـەرەوە بـۆ خـوا ﷺ، گوتوویـەتی: {کَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَذْكُرُ اللهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ} (أخرجـه مُسْـلِم: ٣٧٣، عـن عائشـة رَضِيَ اللـهُ عنهـا)، واتـە: پێغەمبـەر ﷺ لـە هەمـوو حاڵەتەکانـدا یـادی خـوای دەکـرد.**

## ئێمە لە چوار ڕووەوە
## باسی چۆنیەتیی یادی خواکردن دەکەین

### ١)- لە ڕووی قیافەی جەستەییەوە:

بێگومان ئینسان لە ڕووی قیافەی جەستەییەوە، لە هیچ کاتێکدا لە سێ شێوە بەدەر نیە: ڕاوەستان، دانیشتن، ڕاکشان و پاڵکەوتن، ئنجا خوا ﷻ لە هەر سێ حاڵەتەکەدا، فەرمانی پێکردووین کە یادی بکەین، بۆ وێنە:

أ- لە سووڕەتی (النساء)دا: ﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ١٠٣﴾، واتە: هەر کاتێك نوێژتان تەواوکرد، یادی خوا بکەن، بە پێوەو، بە دانیشتنەوەو، لەسەر تەنیشتەکانتان.

ب- لە سووڕەتی: (آل عمران)یشدا، بە هەمان شێوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ ١٩١﴾، واتە: ئەوانەی بە پێوەو بە دانیشتنەوەو، بە ڕاکشانەوە، یادی خوا دەکەن، بە ڕاکشانەوەش جاری وا هەیە لەسەر تەنیشتی چەپ یان ڕاست، یاخود لەسەر پشت بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان.

### ٢)- لە ڕووی دەرخستن و دەرنەخستنەوە:

ئینسان لەو ڕووەوەش دوو حاڵەتی هەن: یان بە ئاشکرا یادی خوا دەکات (ذِكْـرُ اللـهِ عَلَانِيَـةً)، یاخود بە پەنهانیی (ذِكْـرُ اللـهِ سِرًّا).

دیارە لەو ڕووەوە ئینسان حاڵەتێکی دیکەی سێیەمی نیە، یان دەنگ هەڵدەبڕێ، یاخود دەنگ کپ دەکات، جا هەم دەنگ هەڵبڕینەکە، هەم دەنگ کپ کردنەکەش، ئەویش پلە پلەیە، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە:

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ، ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلإٍ، ذَكَرْتُهُ فِي مَلإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ} (أخرجه مسلم: ٢٦٧٥، والترمذي: ٣٣٨٨، وقال: حسن صحيح).

واتـه: ئەبـوو هورەیـرە ﷺ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: خـوای بـەرز دەفەرمـوێ: مـن بـە پێـی بـۆ چـوونی بەندەکەمـم، لـە بارەمـەوە، مـن هـەر لەگەڵیدام، هەتـا یـادم بـکات، ئنجـا ئەگـەر لـە دڵـی خۆیـدا (بـە پەنهانیـی) یـادم بـکات، منیـش لـە لای خۆمـەوە یـادی دەکـەم و، ئەگـەر لـە نێـو کۆمەڵێکـدا (بـە ئاشـکرا)، یـادم بـکات، منیـش لـە نێـو کۆمەڵێـکی باشـتر لـەوەی ئـەودا، یـادی دەکـەم.

**٣)- لە ڕووی دەنگەوە:**

دیسـان ئینسـان لـە سـێ حاڵەتـان بـەولا نیـە، یـان دەنـگ بەرزکردنـەوە، یـان دەنـگ کـپ کـردن و نزمکـردن، یاخـود میانجیـی، واتـە: نـە زۆر دەنـگ هەڵهێنـان، نـە زۆر دەنـگ بەرزکـردن، ئـەوەی پێشـیان لـە بـارەی ئاشـکراو پەنهانـەوە بـوو بـە گشـتیی، بـەڵام ئەمەیـان لـە ڕووی دەنگەوەیـە، یـان زۆر بـەرز دەکـرێ، یـان کـپ دەکـرێ، یاخـود لـەو نێوەڕاسـتە دایـە.

لـەو بارەشـەوە خـواو ﷻ پێغەمبـەر ﷺ فەرمانیـان پێکـردوون و، ڕێنماییـان کردووین، کـە بـە هـەر سـێك جـۆرەکان، یـادی خـوا بکەیـن، بـۆ وێنـە:

**أ- یادی خواکردن بە دەنگی نزم:**

یەك: خوا ﷻ لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ ﴾، واتە: لەبەر خۆتەوە بە لالانەوەو گەردنکەچیی و ترس و بیمەوە و، بەبێ دەنگ بەرزکردنەوە، یادی پەروەردگارت بکە.

دوو: هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)دا: ﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾، واتە: بە کڕووزانەوەو بە پەنهانیی، لە پەروەردگارتان وەپاڕێن، بێگومان ئەو (خوا) سنوور شکێنانی خۆش ناوێن.

ب- یادی خوا کردن دەنگێکی میانجیی:

خوا ﷻ لە سوورەتی (الإسراء)دا، فەرموویەتی: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ ﴾، واتە: بڵێ: لە خوا، یان لە ڕەحمان بپاڕێنەوە، بە هەر ناوێك بانگی بکەن، خوا خاوەنی ناوە هەرە چاکەکانە و، پاڕانەوەکە با نە بە دەنگی بەرزو، نە بە دەنگی کپ بێ و، لە نێوانیاندا ڕێیەك بدۆزەوە.

بە تەئکید مەبەست لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ﴿١١٠﴾ ﴾الإسراء، (صَلَاة) لێرەدا مەبەست پاڕانەوەیە، چونکە هەم لە ئەسڵدا (صَلَاة) بە مانای پاڕانەوەیە، دوایی لە زاراوی شەرعدا، بۆ نوێژیش خوازراوەتەوە و، هەم سیاقی ئایەتەکەش ئەوە دەگەیەنێ.

ج- یاد کردنی خوا بە دەنگی بەرز:

هەندێك لە زانایان یاخود هەندێك کەس پێیان وایە، کە زیکرکردن بە دەنگی بەرز دروست نیەو بیدعەتە! بەڵام لە ڕاستییدا وانیە، وەك لە دەقەکانی سوننەتدا دەردەکەوێ و، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەر سێك شێوەکانی دەنگ نزم و ناوەنجیی و بەرز، یادی خوای کردوە.

(النووي) لە کتێبی (الأذكار)دا[1] دەڵێ:

{جَاءَتْ آثَارٌ بِفَضِيلَةِ رَفْعِ الصَّوْتِ بِالقُرآنِ، وَآثَارٌ بِفَضِيلَةِ الإسْرَارِ؛ قَالَ العُلَمَاءُ: وَالجَمْعُ بَيْنَهُمَا أَنَّ الإسْرَار أَبْعَدُ مِنَ الرِّيَاءِ، فَهُوَ أَفْضَلُ فِي حَقِّ مَنْ يَخَافُ ذَلِكَ، فَإِنْ لَمْ يَخَفِ الرِّيَاءَ، فَالجَهْرُ أَفْضَل، بِشَرْطِ أَلَّا يُؤْذِي غَيْرَهُ مِنْ مُصَلٍّ، أو نَائِمٍ، أو غَيْرِهِمَا}.

---

(١) لاپەڕە: ٣١١، چاپی یەکەم، ساڵی: ١٩٨٣.

واتە: چەند شوێنەوارێك هاتوون كە دەنگ بەرزكردنەوە بە قورئان بە چاكتر دادەنێن، هەندێكیشیان دەنگ نزمكردنەوە بە باشتر دادەنێن، زانایان گوتوویانە: ئەو دەقانە بەوە كۆدەكرێنەوە كە بگوترێ: كەسێك لە ڕیابازیی بترسێ، دەنگ نزمكردنەوەكەی چاكترە، بەڵام كەسێك ئەو ترسەی نەبێ، دەنگ بەرزكردنەوەی بۆ باشترە، بە مەرجێك ئازاری جگە لە خۆی نەدات، لە نوێژكەرو خەوتوو هی دیكەش.

عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، ئەم دەقە لەو بارەوە دێنێت، كە پێغەمبەر ﷺ لە كاتی پاڕانەوەدا، كە جۆرێكە لە جۆرەكانی یادی خوا كردن لە جەنگی بەدردا، دەنگی بەرزكردۆتەوە، دەڵێ:

{قَالَ رَسُولَ ﷺوَهوَ فِي قُبَّةٍ: اَللَّهم أَنْشُدُكَ عَهْدَكَ وَوَعْدَكَ، اَللَّهُمَّ إِنْ شِئْتَ لَمْ تُعْبَدْ بَعْدَ اليَوْمِ أَبَدَاً، فَاخَذَ أبو بَكْرٍ بيَدِ رَسولَ اللهِ ﷺ، وَقَالَ حَسْبُكَ يا رَسولَ اللهِ، فقَدْ أَلْحَحْتَ علَى رَبِّكَ} (أخرجه البخاري: ٣٩٥٣).

{وَفِي لَفْظِ مُسْلِم، فَاسْتَقْبَلَ نَبِيُّ اللهِ ﷺ الْقِبْلَةَ، ثُمَّ مَدَّ يَدَيْهِ، فَجَعَلَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ: اَللَّهُمَّ أَنْجِزْ لِي مَا وَعَدْتَنِي} (أخرجه مسلم: ٤٦٨٧).

واتە: پێغەمبەر ﷺ لە كاتێكدا كە لە چادرەكەیدا بوو فەرمووی: ئەی خوایە! من پەیمان و بەڵێنەكەتت لێ داوا دەكەم، ئەی خوایە! ئەگەر بتەوێ ئەم كۆمەڵە مسوڵمانە بفەوتێنی لەمڕۆ بەدواوە ناپەرسترێی، ئنجا ئەبوو بەكر خوا لێی ڕازیبێ دەستی پێغەمبەری ﷺ گرت، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بەستە ﷺ چونكە زۆر داكۆكییت لە پەروەردگارت كرد.

لە ڕیوایەتی موسلیمدا: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوویكردە قیبلە، پاشان دەستەكانی بەرەو ئاسمان درێژكردن و، بە دەنگی بەرز هاواری دەكردە پەروەردگاری و دەیفەرموو: ئەی خوایە! ئەوەی بەڵێنت پێدام بۆم جێبەجێ بكە.

(النووي) گوتوویەتی: (قُلْتُ: يَهْتِفُ بِفَتْحِ أَوَّلِهِ وكَسْرِ ثَالِثِهِ وَمَعْنَاهُ: يَرْفَعُ صَوْتَهُ بِالدُّعَاءِ)، واتە: دەنگی لە پاڕانەوەكەی دا بەرز دەكردەوە.

هەروەها لە زیکری دوای نوێژەکاندا، ئەم فەرموودەیە هاتوە:

{أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ كَانَ يُهَلِّلُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ يَقُولُ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ، لاَ نَعْبُدُ إِلاَّ إِيَّاهُ، لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الْفَضْلُ، وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ»، ثُمَّ يَقُولُ ابْنُ الزُّبَيْرِ : كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُهَلِّلُ بِهِنَّ دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ} (أخرجه مُسْلِم: ٥٩٤).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەنگی بەرز دەکردەوە دوای هەر نوێژێکی فەڕز، بەم وشانە، دەیگوت: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، تاکەو هیچ هاوەڵی نین، حوکمڕانیی هەر هی ئەوە و، ستاییش هەر شایستەی ئەوە، ئەو لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، لادان نیە لە گوناهو، هێز نیە بۆ چاکە، مەگەر بە مۆڵەتی خوا، جگە لەو ناپەرستین، هەر ئەو خاوەنی چاکەیە، هەر ئەو خاوەنی بەخششە و، هەر ئەو شایستەی مەدح و پێهەڵگوتنی چاکە، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، گەردن کەچیی خۆمان بۆ وی ساغ دەکەینەوە، هەرچەندە بێبڕوایەکان پێیان ناخۆش بێت، پاشان دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگی بەرز دەکردەوە، دوای هەر نوێژێکی فەڕز، بەم وشانە.

وشەی (يُهَلِّلُ) واتە: دەنگی بەرز دەکردەوە، دەنگی هەڵدەهێنا.

هەروەها بوخاریی و موسلیم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازیبێ)، گێڕاویانەتەوە، گوتوویەتی: {مَا كُنَّا نَعْرِفُ انْقِضَاءَ صَلاَةِ رَسُولَ اللهِ ﷺ إِلاَّ بِالتَّكْبِيرِ} (أخرجه البخاري: ٨٠٥، ومسلم: ١٣٤٥، واللَّفظ لمسلم)، واتە: بەوە دەمانزانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژ بۆتەوە کە (الله أكبر)ی دەکرد بە دەنگی بەرز.

هەروەها بوخاریی لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە (خوا لێیان ڕازیبێ)، گوتوویەتی: {كُنَّا إِذَا صَعِدْنَا كَبَّرْنَا، وإِذَا نَزَلْنَا سَبَّحْنَا} (أخرجه البخاري: ٢٩٩٣).

واتــە: ئێمــە لــە ســەفەر لەگــەڵ پێغەمبــەر ﷺ دابوویــن، کاتێــك کــە بــەرز دەبووینــەوە لــە بەرزاییــەك (اللــە أکبر)مــان دەکــردو، کــە نــزم دەبووینــەوە (ســبحان اللە)مــان دەکــرد.

کەواتــە: هــەر ســێ حاڵەتــەکان هــەن، بــەڵام بــە تەئکیــد حاڵــەتی پەنهــان، زیاتــر جەختــی لەســەر کراوەتــەوە، بــەڵام لــە هەنــدێ حاڵــەتی جیاوازیشــدا، کــە پێویســت بــکات، دەنــگ هەڵێنانیــش ڕەوایــە، هــەروەك لــەو نێوانەشــدا، نــە زۆر دەنــگ هەڵێنــی و نــە دەنگیــش زۆر کــپ بکــەی، ئەویــش هــەر هەیــە.

٤)- لە ڕووی تەنهایی و تێکەڵییەوە:

لــەو ڕووەوەش مــرۆڤ دوو حاڵــەتی هــەن: یــان بــە تەنیایــە (عــلى انفــراد)، یاخــود تێکەڵــە (حالــة الإختــلاط والإجتــمّاع).

ئنجــا دیســان لــە هــەردوو حاڵــەتی بــە تەنیــا بــوونی مــرۆڤ و، لەگــەڵ خەڵکــدا بــوون دا، دیســان فەرمــان بــە یــادی خــوا کــراوە، جــارێ لــە حاڵــەتی تەنیــا بــوون، کــە وەك گوتــم حاڵــەتی تەســڵیی و بنچینــەی گشــتیی یــادی خــوا کردنــە، بــەڵام جــاری وا هەیــە کــە بــە کۆمەڵیــش دەگونجــێ یــادی خــوا بکــرێ، وەك لــەم فەرمایشــتەی پێغەمبــەرەوە ﷺ دیــارە:

[إِنَّ للهِ مَلَائِكَةً يَطُوفُونَ فِي الطُّرُقِ، يَلْتَمِسُونَ أَهْلَ الذِّكْرِ، فَإِنْ وَجَدُوا قَوْمًا يَذْكُرُونَ اللهَ، تَنَادَوْا: هَلُمُّوا إِلَى حَاجَتِكُمْ قَالَ: فَيَحُفُّونَهُمْ بِأَجْنِحَتِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا] (أخرجـه أحمـد: ٨٩٦٠، والبخـاري: ٦٠٤٥، ومسـلم: ٢٦٨٩، وابـن حبـان: ٨٥٦، عـن أبي هريـرة رضي الله عنه).

واتــە: خــوا چەنــد فریشــتەیەکی هــەن، (کــە لــە نووســینی کــردەوەکانی خەڵــکی زێــدەن، جگــە لــەوەی کــە تەرخــانی کــردوون بــۆ نووســین و تۆمارکــردنی کــردەوەکانی مرۆڤــان)، ئنجــا بــە ڕێ و بانانــدا دەگەڕێــن و لــە ئەهــلی زیکــر دەخەفتێــن، هــەر کاتێــك کۆمەڵێکیــان دۆزینــەوە کــە یــادی خــوا بــەرز دەکــەن، یەکســەر بانگــی یەکــدی

دەکەن، وەرن بۆ ئەوەی لێی دەگەڕان، فەرمووی: بە باڵەکانیان دەوریان دەدەن، هەتا سنووری ئاسمانی نیزیک (ئاسمانی یەکەم).

هەروەها لەو بارەوە ئەم دەقەی سوننەتیش هاتوە:

{إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ عَلَى حَلْقَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: مَا أَجْلَسَكُمْ؟ قالوا: جَلَسْنَا نَذْكُرُ الله وَنَحْمَدُهُ، عَلَى مَا هَدَانَا للإِسْلاَمِ وَمَنَّ بِهِ عَلَيْنَا، قَالَ: آللهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلاَّ ذَاكَ؟ قَالُوا: وَاللهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلاَّ ذَاكَ، قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، ولكِنَّهُ أَتَانِي جِبرِيلُ فَأَخْبَرَنِي أَنَّ اللهَ يُبَاهِي بِكُمُ المَلاَئِكَةَ} (أخرجه أحمد: ١٦٨٨١، ومسلم: ٢٧٠١، واللفظ له، والترمذي: ٣٣٧٩، وقال: حسن غريب، والنسائي ٥٤٢٦، وابن حبان: ٨١٣).

واتە: پێغەمبەر ﷺ کە بە لای کۆمەڵێکدا ڕابرد کە کۆبوو بوونەوە، فەرمووی: بۆچی دانیشتوون و کۆبوونەتەوە؟ گوتیان: دانیشتووین یادی خوای بەرز دەکەین و ستایشی دەکەین، کە ڕێ ڕوونیی کردووین بۆ ئیسلام و، بە هۆی ئەوەوە منەت و چاکەی خستۆتە سەرمان، فەرمووی: تووخوا بەس بۆ ئەوە کۆبوونەتەوە؟ گوتیان: بە خوا بەس بۆ ئەوە دانیشتووین، فەرمووی: بزانن لەبەر بێ متمانەییم پێتان سوێندم نەدان، بەڵام جیبریل هاتە لام و هەواڵی دامێ، کە خوای بە پیت و پێز و بەرز، شانازییتان پێوە دەکات بەسەر فریشتەکانەوە.

### ٥)- بەرهەمی زیکری خواکردن:

ئایا ئەگەر بەو جۆرەی کە باسکرا، بە هەموو جۆرو شێوازەکان و، لە هەموو حاڵەتەکاندا یادی خوامان کرد، بەرهەمی ئەوە چییەو چیمان دەست دەکەوێ؟.

ئێمە لە هەشت بڕگان دا، پوختەیەکی بەرهەمەکانی یادی خوا کردن دەخەینەڕوو، بەڵام زۆر بەگوشراویی:

**١)- بەرهەمی یادی خوا، لە بواری پەیوەندیی لەگەڵ خوادا:**

بێگومان یادی خوا، لەلایەن مرۆڤەوە، دەبێتە هۆی ئەوە کە خوا لێی ڕازیبێ و، یادی بکات، چونکە خوا دەفەرمویٚ: هەر کەسێك یادم بکات یادی دەکەم: ﴿ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾البقرة، واتە: یادم بکەن، یادتان دەکەم، بێگومانیش کاتێ خوا بەندەکانی خۆی یاد بکات، مانای وایە ئاگای لێیان دەبێ و، سەرپەرشتییان دەکات و دەیانپارێزێ و، ڕاستە ڕێیان دەکات.

هەروەها خوا بە هۆی یادکردنی بەندەوە بۆ خوا، لە مرۆڤ ڕازی دەبێ و، دیارە ڕازیبکردنی خوا ﷻ و، ڕازیبوونی خواش، گەورەترین ئامانجە لە ژیاندا، وەك خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾ ﴾التوبة، واتە: ڕازیبوونێك لە خواوە، گەورەترە، یانی: گەورەترە لە بەهەشتیش و، لە هەر شتێك کە بە زەینی مرۆڤدا دێت، ئنجا لە ئەنجامی یادکردنی خوادایە، کە خوا ﷻ لە مرۆڤ ڕازی دەبێ و یادی دەکات.

**٢)- بەرهەمی یادی خوا، لە بواری پەیوەندیی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ و لەگەڵ فریشتەکاندا:**

بێگومان خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ و شوێنکەوتنی، لەسەر هەموو مسوڵمانێك فەرزە و، خوا ﷻ کردوویەتی بە بەڵگەو نیشانەی بڕوا پێبوون و خۆشویستنی خۆیشی، وەك دەفەرمویٚ: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾آل عمران.

خوا بە پێغەمبەر دەفەرمویٚ ﷺ: تۆ پێیان بفەرموو: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خواش خۆشی دەوێن و، لە گوناهەکانتان دەتانبووریٚ و، خوا لێبوردەی میهرەبانە.

ئنجا ئەگەر ئینسان ئەو ویردانە و ئەو زیکرانە بخوێنێت، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە حاڵەتە جۆرا و جۆرەکاندا فەرمووني و دیاریکردوون، ئەوە دیارە شوێن

پێغەمبەر ﷺ کەوتوەو، مانای وایە هەمیشە پێغەمبەری خوای ﷺ لەبەرچاوە، لەبەر چاوی عەقڵ و دڵیەتی، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوە کە پەیوەندیی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ گەرم و گوڕ بێت و، پتەو و دامەزراو بێ.

٣)- لە سۆنگەی یادی خوا کردنەوە، مرۆڤ دەبێتە هاودەم و هاوڕازو دۆستی فریشتە پاکەکانی خوا:

وەك خوای پەروەردگار دەفەرمویّ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾﴾ فصلت.

واتە: بێگومان ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگارمان خوایە، پاشان ڕاوەستا و دەبن لەسەر ئەوە، فریشتەکان دادەبەزنە لایان و پێیان دەڵێن: مەترسن و پەژارەتان نەبێ و، موژدەتان لێبێ بەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێدەدرا، ئێمە دۆستتانین لە ژیانی دنیاو لە دوارۆژیشدا.

کەواتە: بە هۆی یادی خواوە، ئینسان لەگەڵ فریشتە پاك و چاکەکاندا دەبێتە هاودەم و هاوڕاز و، ئەوان لێی نیزیك دەبن، چونکە فریشتەکان دۆستی پلەیەکی خوای پەروەردگارن: ﴿لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾﴾ التحریم، واتە: هەرچی خوا فەرمانیان پێ بکات، سەرپێچیی ناکەن و، هەرچی فەرمانیان پێبکرێ، جێبەجێی دەکەن، فریشتەکان خوا وای خوڵقاندوون وەك چۆن ئاسن بەلای موگناتیسدا دەکشێ، فریشتەکانیش بە لای دۆستانی خوادا و، بەلای ئەوانەدا دەچن کە بۆ خوا صوڵحاون، دیارە یادی خوا کردنیش، وا لە مرۆڤ دەکات زیاتر لە خوا نیزیك بێ و، بۆ خوا صوڵحاو بێ و، بە هۆی یادی خواوەش، فریشتەکان زیاتر لە مرۆڤ نیزیك دەبنەوە.

**٤)- لە بواری فەرمانبەریی و گوێڕایەڵییدا:**

**أ- یەکەمین بەرهەمی یادی خوا، لە بواری فەرمانبەریی خوادا، ئەوەیە کە یادی خوا دەبێتە هۆی چاکە بۆ نووسران و، خراپە لێ لابران و، پلە بۆ بەرزکرانەوە، وەك لە فەرمایشتەکاندا هاتوە:**

**{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَنْ قَالَ: لَا إِلَـهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، كَانَتْ لَهُ عِدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ حِرْزًا مِنْ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ، إِلَّا أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ} (أخرجه البخاري: ٣١١٩، ومسلم: ٢٦٩١).**

واتە: هەر کەسێك ڕۆژێ سەد جار بڵێ: (**لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**)، ئەوە بۆی بە بارتەقای پاداشتی ئازادکردنی دە (١٠) کۆیلە دادەنرێ و، سەد (١٠٠) چاکەی بۆ دەنوسرێ و، سەد (١٠٠) خراپەی لێ دەسڕێتەوە و، لەو ڕۆژەدا هەتا ئێوارە بۆی دەبێتە پەنا و پارێزەر لە شەیتان، ....

**ب- دووەمین بەرهەمی یادی خوا، لە بواری فەرمانبەریی دا، ئەوەیە کە خاوەنەکەی لە گوناهو تاوان دەپارێزێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ ﴾الأعراف، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی کە پارێزکاریی دەکەن، هەر کاتێك خوتخوتەیەکی شەیتانیان گەیشتێ، خوایان دێتەوە یادو یەکسەر دەبینن( و شەیتان ناتوانێ فێڵیان لێ بکات و لە خشتەیان بەرێ).**

**ج- سێیەمین بەرهەمی یادی خوا، لەبواری فەرمانبەریی دا ئەوەیە کە یادی خواکردن جێگای زۆر لە کردەوە چاکەکان دەگرێتەوە، بەڵام هیچیان کەلێنی وی پڕناکەنەوە، وەك لەم فەرمایشتەدا دیارە:**

**{عن عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ أَبْوَابَ الْخَيْرِ كَثِيرة، وَلَا اسْتَطِيعُ القيام بِكُلِّهَا، فأخبرني بِعملٍ أَتَشَبَّثُ بِهِ، وَلَا تُكْثِرْ عَلَيَّ فَأَنْسَى، قَالَ: لَا يَزَالُ**

**لِسَانُكَ رَطْبَاً بِذِكْرِ اللهِ تَعَالَى]، (أخرجه أحمد: ١٧٧١٦، والترمذي: ٣٣٧٥، وابن ماجه: ٣٧٩٣، وابن حبان: ٨١٤، والحاكم: ١٨٢٢، وقال: صحيح الإسناد).**

واتە: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! دەرگاكانی چاكە زۆرن و، ناتوانم هەمووان جێبەجێ بكەم، ئنجا كردەوەیەكم پێ بڵێ دەستی پێوە دەگرم، بەڵام با زۆر نەبێ لە بیرم بچێ، فەرمووی: با بەردەوام زارت بە یادی خوای بەرز تەڕو پاراو بێ.

كەواتە: بەردەوام زمان تەڕ بوون و زمان پارا و بوون بە یادی خوا، كەلێنی زۆر لە كردەوەكانی دیكە پڕ دەكاتەوە.

هەروەها لەو فەرموودەیەشدا كە بوخاریی و موسلیم لە **(أبو هريرة)**ەوە هێناویانە، كە هەژارە كۆچكەرەكان ڕۆژێك دەچنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و سكاڵای ئەوەی لەلا دەكەن، كە خاوەن ماڵ و سامانەكان پلە بەرزەكانی بەهەشت بۆ خۆیان قۆرخ دەكەن، بەهۆی ئەوەوە كە ماڵ و سامانی خۆیان دەبەخشن، چونكە وێڕای نوێژو ڕۆژوو، كە هەژارو دەوڵەمەند تیاندا بەشدارن، ئەوان ماڵ و سامانیشیان هەیە، كە حەج و عومرەی پێدەكەن و، جیهادی پێدەكەن، خێری پێ دەكەن، پێغەمبەریش ﷺ پێیان دەفەرموێ:

**[أَفَلَا أُعَلِّمُكُمْ شَيْئًا تُدْرِكُونَ بِهِ مَنْ سَبَقَكُمْ وَتَسْبِقُونَ بِهِ مَنْ بَعْدَكُمْ؟ وَلَا يَكُونُ أَحَدٌ أَفْضَلَ مِنْكُمْ، إِلَّا مَنْ صَنَعَ مِثْلَ مَا صَنَعْتُمْ؟ قالوا: بلى يارسول الله، قال: تُسَبِّحون الله دُبُرَ كُلِّ صلاةٍ ثلاثاً وثلاثين وتحمدون ثلاثا وثلاثين، وتكبِّرون ثلاثا وثلاثين] (أخرجه مسلم: ٥٩٥).**

واتە: ئایا شتێكتان پێ بڵێم كە پێی دەگەنەوە ئەوانەی پێشتان كەوتوونەوە و، پێش ئەوانەش دەكەونەوە كە لە دواتانەوەن، هیچ كەس لە ئێوە چاكتر نیە، مەگەر یەكێك وەك ئێوە بكات، گوتیان: با، ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ، فەرمووی: دوای هەر نوێژێكی فەرز (**سبحان الله، الحمدلله، الله أكبر**) بكەن [واتە: سی و سێ جار بۆ هەر یەكێكیان].

**٥)- یادی خواکردن، لە خزمەت پێکردنی عەقڵ و دڵ و جەستەدا:**

**بەهۆی یادی خواوە، هەم خزمەت بە عەقڵ دەکرێ، هەم خزمەت بە دڵ و جەستە دەکرێ، ئنجا ئەوەش تۆزێك پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە:**

**أ- بە نسبەت دڵەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾الرعد، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو دڵیان بە یادی خوا ئارام دەگرێ، ئاگادار بن! تەنیا بە یادی خوا دڵان ئارام دەگرن.**

**بێگومان کاتێکیش مرۆڤ دڵی بە یادی خوا ﷻ ئارام دەگرێ، مانای وایە لەسەر ڕاستە شەقامی خوا بەردەوام دەبێ و، دەپارێزرێ لە خلیسکان و لادان و هەڵەو تاوان، لە ئەنجامی خوا لە یاد بووندا، شەیتان لە ئینسان دوور دەکەوێتەوە، هەر کاتێ لە خوا بێ ئاگا بوو، خوتخوتەی بۆ دەکات و، هەر کاتێ یادی خوای کرد، لێی دوور دەکەوێتەوە.**

**وەك بوخاری ئەم دەقەی بە (معلّق)ی هێناوە[1]: (عن ابن عباس رضي الله عنهما، قال : الْوَسْوَاسُ: إذا وُلِدَ خَنَسهُ الشَّيطانُ ، فإذا ذُكِرَ اللّهُ ذَهَبَ، إذا لم يُذْكَرِ اللّهُ ثبت على قَلْبِهِ).**

**واتە: مرۆڤ کە لە دایك دەبێ شەیتان نقورچکی لێدەدات و، هەر کاتێ یادی خوای بەرزی کرد، خۆی پەنهان دەکات و، هەر کاتێ لە خوا بێ ئاگا بوو، خوتخوتەو دنەدانی خراپی بۆ دەکات.**

**ب- بە نسبەت زیهن و فکرو هۆشەوە، ئێستا زانایانی دەروونزان وەك ڕاستییەك بۆیان دەرکەوتوە، کە لە ئەنجامی ئەوەدا مرۆڤ زەین و فیکری خۆی کۆ بکاتەوە، دەتوانێ داهێنان بکات و، بەرهەمی فیکریی باشی هەبێت و، دەتوانێ نەخشەو پلانی چاك دابنێ، بەڵام لە ناکامی زیهن و هۆش پەرت بوون و بڵاوبووندا، مرۆڤ هیچی پێ ناکرێ، بۆ وێنە: دکتۆر (أحمد عزت راجح) لە کتێبی (أصول علم النفس)دا[2] دەڵێ:**

---

(١) أخرجه البخاري تعليقاً في التفسير، باب سورة: قل أعوذ برب الناس. ذكره البخاري بغير إسناد.

(٢) ص ٤٨.

(پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکات کە زەین بڵاویی و بیر پەرت بوون، ئەگەر بوو بە خوویەکی چارەسەر نەکراو، چەندان شوێنەوارو ئەنجامی بەد و دڵتەزێنی دەبن، زۆر لە خوێندکاران دەڵێن: ئەو نەخۆشییە، هۆیەکی سەرەکیی و بنەڕەتیی بووە، لە دواکەوتن و کەوتنیان جار لە دوای جار، ئەمەو جگە لەوەش خووی گۆڕین، دەبێتە هۆی هەستکردن بە ناتەواویی و هەستکردن بە دەستەوسانیی، لە ئاقار لە خۆ چارەسەرکردندا، بگرە تەنانەت ڕق لە خۆ هەستانیشدا).

ئنجا یادی خوا کردن، کە مرۆڤ لەسەر یەك چەق و خاڵ، دڵ و زەین و هۆشی خۆی چڕ دەکاتەوە، بێگومان ئەوە زۆر هاوکاری دەبێ، کە ئەم حاڵەتی بیر چەسپاندنی بۆ بێتە دی، بە تایبەت لە نوێژدا کە فەرزە ئینسان داڵغەی بەولاو بەولادا نەچێ و، بیری لەسەر نوێژەکەی بێ و، کە لە خزمەت خوادا وەستاوە، زەینی بەولا و بەولادا نەچێ.

ج- ئایا یادی خوا، چ خزمەتێك بە مرۆڤ دەکات، لە ڕووی جەستەییەوە؟

ئێمە لە کتێبێکدا کە لە ساڵی (١٩٨٧ز)دا چاپکراوە، بە ناوی: (یادی خوا)، لەو بارەوە زۆر قسەمان کردووەو، زانیارییەکانمان لە کۆمەڵێك سەرچاوەوە هێناون[1].

زانایانی پسپۆڕی دەروونناسیی تێکڕای ئەو تێکچوون و نەخۆشییانەی کە باسیان دەکەین و، پازدەمان لێیان هێناون، دەڵێن هەموویان زادەو هەڵقوڵاوی حاڵەتە دەروونییە ناتەواوەکان و، حاڵەتە نەخۆشەکانی دروونن:

١)- تێکچوونی کۆئەندامی سووڕی خوێن.

---

(١) ١- الإنسان ذلك المجهول، الكسيس كارليل.
٢- النفس وانفعالاتها وأمراضها وعلاجها، للدكتور علي كمال.
٣- أصول علم النفس، د. أحمد عزت راجح.
٤- ألله يتجلى في عصر العلم، مجموعة مؤلفين.
٥- روح الدين الإسلامي، عفيف عبدالفتاح طبارة.
٦- جدِّد حياتك، للشيخ محمد الغزالي.

٢)- بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

٣)- سەر ئێشەی نیمچەیی.

٤)- تێکچوونی کۆئەندامی هەرس.

٥)- قەڵەویی.

٦)- خواردن پێ نەخوران.

٧)- برینداریی گەدە.

٨)- تێکچوونی کۆئەندامی هەناسەدان.

٩)- تێکچوونی کۆئەندامی ئێسکیی و ماسوولکەیی و، ڕۆماتیزمی جومگەکان و، ئازاری پشت و ماسوولکە گرژبوون.

١٠)- تێکچوونی کۆئەندامی دەمار.

١١)- تێکچوونی کۆئەندامی زاووزێ.

١٢)- نەخۆشییەکانی پێست.

١٣)- هەندێ جۆری نەخۆشیی شێرپەنجە.

١٤)- نەخۆشیی ڕیخۆڵەی گەورە، (**قولون**).

١٥)- تێکچوونی لوولە ڕژێنەکانی نێوەوەی لەش.

ئەو سەرچاوانەی ئاماژەمان پێدان دەڵێن: ئەو نەخۆشییە جەستەییانە هەموویان لە حاڵەتە دەروونییە ناتەواوە نەخۆشەکانەوە پەیدادەبن.

کە لە ڕاستییدا حاڵەتە دەروونییە ناتەواوەکانیش، لە ئەنجامی دوورکەوتنەوە لە خواو، تێکچوونی ئۆخژن و ئارامیی دەروون و، نەمانی ئۆقرەییە لە دڵ و

دەروونـدا، کـە بـە هـۆی یـادی خـواوە پەیـدا دەبـن، وەك خـوا فەرموویـەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾الرعـد، واتـە: ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو، دڵەکانیـان بـە یـادی خـوا ئۆخژنیـان بـۆ دێ، ئەهـا! دڵان بـەس بـە هـۆی یـادی خـواوە ئـارام دەگـرن.

٦)- یادی خوا کردن هۆکاری لە بەرانبەر شەیتان و دوژمناندا وەستان و پێویرانیانە:

أ- خوای پەروەردگار بە شەیتان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾الحجر، واتە: (ئەی ئیبلیس!)بێگومان بەندەکانی من، تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا نیە، مەگەر ئەوانەی کە لە بێمرادان شوێنت دەکەون.

ب- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾ ﴾الإسراء، واتە: بە دڵنیایی بەندەکانی من، تۆ ناتوانی بیانخەیە ژێر ڕکێفی خۆتە وەو، پەروەردگاریشت بەسە کە (کار) پێسپێردراو بێ.

ج- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾النحل، واتە: هەر کاتێك قورئانت خوێند، پەنا بە خوا بگرە لە شەیتانی دوورخراوە، (یان: نەفرین لێکراو)، بە دڵنیایی ئەو دەسەڵاتی نیە، بەسەر ئەوانەدا کە بڕوایان هێناوەو پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.

د- پێغەمبەری خواش ﷺ لە بارەی شەیتانەوە، دەفەرموێ: {إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَذَكَرَ اللهَ عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: لاَ مَبِيتَ لَكُمْ وَلاَ عَشَاءَ} (أخرجه أحمد: ١٥١٤٨، ومسلم: ٢٠١٨، وأبو داود: ٣٧٦٥، وابن ماجه: ٣٨٨٧، وابن حبان: ٨١٩).

واتـە: هـەر کاتێـك پیاوێـك (کـە کوڕەکـە کـوڕی پیاوانـە، نەگەرنـا بـۆ نافرەتیـش هەروایـە)، چـۆوە ماڵەکـەی خـۆی یـادی خـوای کـرد، لـە کاتی چوونـە ژووریـدا و لـە کاتی خواردنیـدا، شـەیتان بـە سـەربازەکانی دەڵـێ: نـە شـەو مانەوەتـان بـۆ هەیـە لـەو ماڵـە و، نـە خواردنیشـتان دەسـت دەکـەوێ، خـواردنی ئێـوارە [بـڕۆن].

هەروەها یادی خوا دەبێتە مایەی خۆڕاگریی و پێ چەسپان و پێ وێران، لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی جەنگدا، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾﴾الأنفال، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کاتێ بەرەنگاریی کۆمەڵێك لە دوژمنانتان بوون، چەسپاو خۆڕاگربن، زۆر یادی خوا بکەن بۆ ئەوەی سەرکەتوو سەرفراز بن، واتە: بۆ ئەوەی لە بەرانبەر دوژمنەکانتاندا خۆڕاگربن و پێیان بوێرن.

٧)- بەرهەمی یادی خواکردن، لە بواری برایەتیی و یەکڕیزیی مسوڵماناندا:

بێگومان کەسانێك هەمیشە یادی خوا، ویردی سەر زمانیان بێ و، دڵیان بە یادی خوا ﷻ ڕووناك و ئاوەدان و درەوشاوە بێ، ناتوانن بەندە دڵسۆزو نیزیکەکانی خوایان خۆشنەوێن و، ئەرك و مافی برایەتیی و، خوشك و برایەتییان لەگەڵدا جێبەجێ نەکەن.

وەك خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾﴾الكهف، واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ!) ئارامبگرە و لەگەڵ ئەوانەدا بمێنەوە، کە بەیانیان و ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، ڕەزامەندیی (یان دیداری) ویان دەوێ و، چاوتیان لێ لامەدە، جوانیی ژیانی دنیات مەبەست بێ و، بە قسەی کەسێك مەکە کە دڵیان لە یادی خۆمان بێئاگا کردووەو، بە دوای ئارەزووی خۆی کەوتووەو کاری لە کار ترازاوە.

هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ باسی ئەوە کراوە، کە دەفەرموێ:

(لَيَبْعَثَنَّ اللهُ أَقْوَامًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي وُجُوهِهِمُ النُّورُ، عَلَى مَنَابِرِ اللُّؤْلُؤِ، يَغْبِطُهُمُ النَّاسُ، لَيْسُوا بِأَنْبِيَاءَ وَلَا شُهَدَاءَ»، قَالَ: فَجَثَا أَعْرَابِيٌّ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! حَلِّهِمْ لَنَا نَعْرِفْهُمْ. قَالَ: «هُمُ الْمُتَحَابُّونَ فِي اللهِ، مِنْ قَبَائِلَ شَتَّى، وَبِلَادٍ شَتَّى، يَجْتَمِعُونَ عَلَى ذِكْرِ اللهِ يَذْكُرُونَهُ) (أخرجه الطبراني كما في مجمع الزوائد، وقال

الهیثمـي: إسـناده حسـن).

واتـە: خـوا لـە ڕۆژی دوایيـدا کەسـانێك دێنـێ، کـە دەم و چاویـان ڕووناکیـی تێدایـە، لەسـەر چەنـد دوانگەیـەکی گەوهەریـی، کـە خەڵـك ئیرەییـان پێدەبـات، (خۆزگەیـان پـێ دەخـوازێ) نـە لـە پێغەمبـەران و نـە لـە شەهیدانیشـن، عەرەبێـکی خێڵەکیـی لەسـەر ئەژنۆیـان دانیشـت و گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ وەسـفیان بۆمـان بکـە، بیانناسـینەوە، فەرمـووی: ئەوانـە کەسـانێکن لەبـەر خـوا یەکدییـان خۆشویسـتوە، لـە هـۆزی جیاجیـا و لـە وڵاتی جیاجیـان، کۆدەبنـەوە لەسـەر یـادی خـواو، یـادی خـوا دەکـەن.

بـە تەئکیـد ئەوانـەی لەبـەر خـوا یەکدیيان خۆشـدەوێ، شـوێن ڕێبـازی پێغەمبەری خـوا ﷺ دەکـەون، ئـەو یـادی خواکردنـە، وەك چـۆن دەزوویـەك دەنکـە تەسـبیحەکان پێـوە گرێـردەدات، یـادی خـواو پەیوەندیـی لەگـەڵ خـواش دا، ئـاوا مسـوڵمانان بەیەکـەوە گـرێ دەدات، برایەتیـی و تەبایـی و دۆسـتایەتییان بەهێـز دەکات، یـان برایەتیـی و خوشـکایەتییان بەهێـز دەکات و پێکیانـەوە دەبەسـتێ و، پێکیانـەوە جـۆش دەدات.

٨)- دروستبوونی کەسایەتییەکی ساغ و تێر و تەواو:

لـە ئەنجامـی یـادی خـوادا، مـرۆڤ کەسـایەتییەکی سـاغ و سـەلیم و، تێـر و تـەواوی دەبـێ، هەڵبەتـە ئەوانـەی باسـمان کـردن لـە حـەوت خاڵـی ڕابـردوودا، ئـەو حـەوت بەرهەمـە، هەموویـان دەبنـە پێشـەکیی بـۆ ئـەو دەرەنجامـەی کـە لـەم بەرهەمـی هەشـتەمدا هاتـوە، چونکـە لـە کاتێکـدا کـە مرۆڤـی مسـوڵمان:

١- یادی خوا، دڵی پاك دەکات.

٢- زەینی کۆ دەکاتەوە.

٣- جەستەی لە نەخۆشیی و دەرد دەپارێزێ.

٤- پاشان یادی خوا ﷻ لە بەرانبەر شەیتاندا بەهێزی دەکات و، لە بەرانبەر دوژمندا دامەزراوی دەکات.

٥- لەگەڵ ئەهلی ئیماندا نیزیك و تەبای دەكات، ئەو جۆرە كەسە دەبێتە خاوەنی كەسایەتییەكی ساغ و سەلیم و تێر و تەواو.

چونكە ئێمە خوا ﷻ دوو شتی لەسەر پێویست كردووین، لە سوورەتی (**الفاتحة**)دا، كە ئێمە رۆژانە چەند جاران دەیخوێنین: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝﴾ الفاتحة، (خوایە!) بەس تۆ دەپەرستین و، یارمەتیش بەس لە تۆ دەخوازین، ئەم رستەی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ ﴾، دوو شتی تێدا بەرجەستەن: یەكەم: خوا بەیەكگرتن (**التوحيد**)، دووەم: یەكڕیزیی (**الوحدة**).

خوا بەیەكگرتن و تەنیا خوا پەرستن، بەڵام بە كۆمەڵ و پێكەوەش، واتە: خوایە! من لەگەڵ باقی مسوڵماناندا بە پیاو و ئافرەتەوە، بەندایەتیی بۆ تۆ دەكەم، هەموومان پێكەوە بەندایەتیی بۆ تۆ دەكەین.

بەڵێ لە ڕاستییدا یادی خواكردن و خوا ﷻ لە یاد بوون، وەك تاكە بەدیهێنەرو، تاكە پەروەردگارو، تاكە خاوەن و، تاكە مشوورخۆر و، تاكە پەرستراو، ئاوا یادی خواكردن، دەبێتە هۆی ئەوە، كە هەموو ئەوانەی لە خزمەت خوادان و لە خوا نیزیكن و دۆستی خوان و، بەندەی خوان، خۆشت بوێن و، بە پێچەوانەشەوە: هەموو ئەوانەی كە دژی خوان و، دژی پێغەمبەرەكەی و ئایین و بەرنامەكەیی و دژی دۆستەكانی خوان، ڕقت لێیان بێ، ئەم جۆرە یادی خواكردنە، بە تەئكید دەبێتە هۆی ئەوە كە مرۆڤ هەر كام لە مسوڵمانان، هەر كام لە خوا یادكەران، لە زاتی خۆیاندا، خاوەنی كەسایەتییەكی تۆكمەو دامەزراو ساغ و سەلیم بن، هەم لە ڕووی ڕووحەوە ساغ بن و، هەم لە ڕووی زەین و هۆشەوە تێرو تەواوبن، هەم لە ڕووی جەستەوە و، هەم لە ڕووی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانیانەوە.

خوا لە بە لوتف و كەرەمی خۆی یارمەتیی هەموو لایەكمان بدات، كە بە هۆی یادی خواوە، هەمیشە پاك و چاك بین، لە زاتی خۆماندا و، لەگەڵ

دەووربەرماندا، بەو شێوەیە بین، کە شایستەی ئەوە بین، پێمان بگوترێ: بەندەی خوا و، پێمان بگوترێ: شوێنکەوتووی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە چـوار ئایـەت پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (٤٩ - ٥٢)، ئایـەتی یەكەمیـان: دەربـارەی بڕوادارانێكـە كـە ئافرەتانێـك مـارە دەكـەن، بـەڵام بـەر لـە گواسـتنەوە (چوونـە لایـان) لێیـان جیادەبنـەوە، كـە پێویسـتە دیارییـان بدەنـێ، كـە پێـی دەگوتـرێ: (مُتْعَـة)و، بـە جوانیـی دەسـتیان لـێ بەربـدەن.

سـێ ئایەتەكـەی دیكـەش (٥٠ و ٥١و ٥٢) لـە بـارەی چۆنیەتیـی مامەڵەكـردنی پێغەمبـەری خـواوەن ﷺ لەگـەڵ هاوسـەرانی بەڕێزیـدا (خـوا لێیـان ڕازیبـێ) و، چەنـد وردەكارییـەك لـەو بـارەوە كـە حیكمـەت تێیانـدا، ئاسـانكارییە بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺو، دڵخـۆش بـوون و ڕازیبـوونی دایـكانی بـڕواداران، كـە بزانـن پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەسـتكراوەیە، بـۆ مامەڵەكـردن لەگەڵیانـدا، كەواتـە: كـە دادگەرییـان لـە نێـوان دا ڕەچـاو دەكات، تەنیـا بەخششـێكی خـۆی و چاكەیـەكی خۆیـەتی بەرانبەریـان.

هەروەهـا ڕاگەیانـدنی خوایـە بـۆ ئـەوە كـە: پێغەمبـەر ﷺ دوای ئـەو هاوسـەرانەی كـە ڕۆژی دوایـی و مانـەوە لەگـەڵ ئەویانـدا، هەڵبـژاردوە، بەسـەر زرق و برقـی ژیـانی دنیـاو جیابوونـەوەدا، هیـچ ئافرەتێـكی دیكـەی وەك هاوسـەر بـۆ ڕەوا نیـە، كـە هاوسـەرگیریی لەگەڵـدا بـكات، جگـە لەوانـەی كـە وەك كەنیـزەك دەكەونـە بەردەسـت، ئەوانـە هەڵاوێـردراون.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ
فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَاۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ٤٩ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحۡلَلۡنَا لَكَ أَزۡوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيۡتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ
عَلَيۡكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِي هَاجَرۡنَ مَعَكَ

وَٱمۡرَأَةٗ مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا خَالِصَةٗ لَّكَ مِن دُونِ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَۗ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا فَرَضۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ لِكَيۡلَا
يَكُونَ عَلَيۡكَ حَرَجٞۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٥٠﴾ تُرۡجِي مَن تَشَآءُ مِنۡهُنَّ وَتُـٔۡوِيٓ إِلَيۡكَ
مَن تَشَآءُۖ وَمَنِ ٱبۡتَغَيۡتَ مِمَّنۡ عَزَلۡتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكَۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعۡيُنُهُنَّ وَلَا
يَحۡزَنَّ وَيَرۡضَيۡنَ بِمَآ ءَاتَيۡتَهُنَّ كُلُّهُنَّۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا
حَلِيمٗا ﴿٥١﴾ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ
حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴿٥٢﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! هــەر کات ئافرەتـانی بڕوادارتـان مارەکـردن، دوایـی بـەر لـەوەی دەسـتیان بگەیەنـنێ (و بچنـە لایـان و بیانگوازنـەوە)، تەڵاقتاندان، ئێـوە مافتـان لەسـەریان نیـە عیددەیـان لەسـەر بژمێـرن، ئنجـا بەهرەمەندیـان بکـەن (دیارییـان پێبـدەن) و، بـە دەسـت لێبەردانێـکی جـوان، دەسـتیان لـێ بەربـدەن ﴿٤٩﴾ ئـەی پێغەمبـەر! ئێمـە هاوسـەرانێکت کـە پاداشـت و کـرێ (مارەیـی)ت، پێـداون و، ئـەو (ئافرەت)انـەی بـە دەسـتی ڕاسـتتەوەن (کەنیزەکـەکان) لـەوەی خـوا بـۆ لای گێڕاویـەوە (کردوویەتـە دەسـتکەوتت) و کچـانی مامـت و، کچـانی پوورەکانـت و، کچانی خاڵـت و، کچـانی پلکەکانـت، کـە کۆچیـان لەگەڵـت کـردوەو، ئافرەتێـکی بـڕوادار کـە خـۆی بـە پێغەمبـەر ﷺ دەبەخشـێ (خـۆی پێشـکەش دەکات)، ئەگـەر پێغەمبـەر ﷺ ویسـتی مـارەی بـکات، ئەمـە تەنیـا بـۆ تۆیـە، جیـا لـە بـڕواداران، ئەوانەمـان بـۆ ڕەوا کـردووی، بـە دڵنیایـی دەزانیـن چیـمان (لەسـەر مسـوڵمانان) پێویسـتکردوە لـە بـارەی هاوسـەرانیان و، ئـەو (ئافرەت)انـەوە، کـە خاوەنیانـن (بۆیـەش دەسـتی تۆمـان لـەو بـارەوە کـراوە کـرد) تاکـو لـەو بـوارەدا دووچـاری سـەغڵەتیی نەبیـت و، خـواش

هـەردەم لێبـوردەی بـە بەزەیـی بـووە ﴿٥٠﴾ هـەر کامیانـت بـوێ لـە هاوسـەرانت دوای دەخـەی (لـە نـۆرەی خـۆی)و، هـەر کامێکیشـیانت مەبەسـت بـێ، بـۆ لای خـۆتی دێنی (بـا نـۆرەشی نەبـێ)، هەروەهـا هـەر کامێکیـان کـە دوورت خسـتۆتەوە، گوناهـت لەسـەر نیـە، ئـا ئـەوەش نیزیکـترو چاکـترە (بـۆ ئـەوە) کـە هەموویـان شـادمان بـن (بـە چۆنیەتیـی مامەڵـەت لەگەڵیـان، کـە بزانـن دەسـتکراوەی، بـەڵام لەگەڵیانـدا چاکـەکاری)و دڵتەنـگ نەبـن و ڕازی بـن، خـواش دەزانـێ چـی لـە دڵەکانتـان دایـەو، خـوا هـەردەم زانـای هێدیـی بـووە ﴿٥١﴾ لەمـەودواش ئافرەتانـت بـۆ ڕەوا نیـن (هاوسـەرگیریان لەگـەڵ بکـەی)و بـۆ شـت نیـە، بـە هاوسـەرانی دیکـە بیانگـۆڕی (یەکیـان تـەڵاق بـدەی و، یـەکی دیکـە لـە جێـی بێنـی) هەرچەنـدە جوانییشـیان سەرسـامت بـکات، جگـە لەوانـەی دەبیـە خاوەنیـان (وەك کەنیـزەك) خواش هەمیشـە بەسـەر هەمـوو شـتێکەوە چاودێـر بـووە ﴿٥٢﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(نَكَحْتُمُ): (أَصْلُ النِّكَاحِ لِلعَقْدِ، ثُمَّ اسْتُعِيرَ للجِمَاعِ، ومُحَالٌ أَنْ يَكُونَ فِي الأَصْلِ للجِمَاعِ، ثُمَّ اسْتُعِيرَ لِلْعَقْدِ، لأَنَّ أَسْمَاءَ الجِمَاعِ كلُّها كِنَايَاتٌ)، وشـەی (نَكَحْتُم) لـە ئەسـڵدا بـە مانـای گرێبەسـتە، مـارە کردنـە، دوایـی خوازراوەتـەوە بـۆ لەگـەڵ جووتبـوون، ناگونجـێ لـە ئەسـڵدا بـە مانـای لەگەڵـدا جووتبـوون بـێ و، دوایـی خوازرابێتـەوە بـۆ مـارە کـردن، چونکـە نـاوەکانی جووتبـوونی پیـاو و ژن، لـە قورئانـدا بـە کنـارە (كِنَايَـة) هاتـوون، هیچیـان بـە ئاشـکرا نەهاتـوون.

(عِدَّةٍ): (عِدَّةُ الْمَرْأَةِ: هِيَ الأَيَّامُ الَّتِي بِانْقِضَائِهَا يَحِلُّ لَهَا التَّزَوُّج) واتـە: عیـددەی ئافـرەت ئـەو ڕۆژانـەن، کـە بە تـەواو بوونیـان بـۆی ڕەوا دەبـێ، هاوسـەرگیریی بکاتەوە.

(فَمَتِّعُوهُنَّ): واتـە: دیارییـان پـێ بـدەن، (الْمَتَاعُ: كُلُّ مَا يُنْتَفَعُ بِهِ مِنْ وَجْهٍ مَا، فَهُوَ مَتَاعٌ ومُتْعَةٌ)، هـەر شـتێك بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان، بەهـرەی لێوەربگیـرێ، پێـی

دەگوترێ: (مَتَاعٌ، وَمُتْعَةٌ)، ئەو دیارییەی کە پیاو بە ئافرەتی دەدات، کاتێ لێی جیا دەبێتەوە و، بەر لەوەی کە دەستی گەیاندبێتێ و لەگەڵی جووت بووبێ، لەبەر هەر هۆیەك بێ، ئەو دیارییە پێی دەگوترێ: موتعە و مەتاع.

(سَرَاحًا): دەست لێ بەردان، لە ئەسڵدا (السَّرْحُ: شَجَرٌ لَهُ ثَمَرٌ، الوَاحِدَةُ: سَرْحَةٌ، وسَرَّحْتُ الإبِلَ، أصْلُهُ: أنْ تُرْعِيَهُ السَّرْحَ)، وشەی (سَرْح) بە درەختێك دەگوترێ: کە میوەی هەبێ، کۆیە و، تاکەکەی بریتیە لە: (سَرْحَةٌ) و، دەگوترێ: (وسَرَّحْتُ الإبِلَ)، حوشترەکەم بەرەڵا کرد، لە نێو ئەو درەختانەدا کە میوەیان هەیە، یاخود گەڵایان پێوە بووە، بۆ ئەوەی بلەوەڕێ، دوایی هەموو جۆرە ناردنێك بۆ لەوەڕاندن، پێی گوتراوە: (سَرْح)، (السَّرَاحُ الجَمِيلُ) بریتیە لە دەست لێ بەردانێك، تەڵاقێك کە جوان و ڕێك بێ و، دەمەقاڵێی و ناکۆکیی لە دوا نەبێ، ئەوەش زیاتر بە پیاوەکە دەکرێ، بەو شێوەیە بێ، ئەو ئافرەتە با لێشی جیابێتەوە، بەڵام بە حورمەت و ڕێزەوە دەستی لێ بەردات.

(تُرْجِي): (الإرْجَاءُ: التَّأْخِيرُ، أرْجَأْتُ الأمْرَ وَأرْجَيْتُهُ: أخَّرْتُهُ)، (تُرْجِي)، واتە: دوای دەخەی، (تُؤَخِّر) دەگوترێ: (الإرْجَاءُ)، واتە: دواخستن، (وَأرْجَيْتُهُ: أخَّرْتُهُ) هەردووکیان، واتە: دوامخست.

(وَتُئْوِي): (وَالإيْوَاءُ: جَعْلُ الشَّيْءِ آوِيًا، أيْ رَاجِعاً إلَى مَكَانِهِ، وَهُوَ هُنَا مَجَازٌ فِي مُطْلَقِ الإسْتِقْرَارِ)، (إيْوَاءُ) لە ئەسڵدا ئەوەیە کە وابکەی شتێك بگەڕێتەوە جێی خۆی، کە لێرەدا مەبەست پێی نیشتەجێکردنە.

(عَزَلْتَ): (الإعْتِزَالُ: تَجَنُّبُ اسْتِعْمَالُ الشَّيءِ، عَزَلْتُهُ، وَاعْتَزَلْتُهُ، وَتَعَزَّلْتُهُ) (إعْتِزَال) بریتیە لەوە کە ئینسان خۆی دوور بگرێ لە بەرکاهێنانی شتێك، دەگوترێ: (عَزَلْتُهُ، وَاعْتَزَلْتُهُ، وَتَعَزَّلْتُهُ) هەر سێکیان بەیەك واتان، واتە: کەنارم لێی گرت، لێی دوورکەوتمەوە.

(حَلِيمًا): (الحِلْمُ: ضَبْطُ النَّفْسِ وَالطَّبْعِ عَنْ هَيَجَانِ الغَضَبِ)، (حِلْم) بریتیە لە خۆڕاگریی و، خۆ کۆنتڕۆڵ کردن لە کاتی هەڵچوونی توورەییدا.

(رَقِيبًا): (الرَّقِيبُ: الحَافِظُ، وَذَلِكَ إِمَّا لِمُرَاعَاتِ رَقَبَةِ المَحْفُوظِ، أَو لِرَفْعِهِ رَقَبَتَهُ)، (رَقِيبُ) واتە: پارێزەر، بۆیەش بە پارێزەر، گوتراوە: (رَقِيبُ) لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی دەیپارێزێ، لە پشتەوەڕا تەماشای پشتە ملی دەکات، یاخود لەبەر ئەوەی ملی خۆی بەرز دەکاتەوە تاکو ئەو شتەی پێسپێردراوە، چاودێریی بکات و ئاگای لێی بێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە: ﴿تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴿٥١﴾﴾.

ئەم ئایەتە موبارەکە، دوو ڕیوایەتی لە بارەوە دێنین:

أ- (عَن عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، فَقَالَتْ: أَمَا تَسْتَحِي الْمَرْأَةُ أَنْ تَهَبَ نَفْسَهَا لِلرَّجُلِ؟ فَلَمَّا نَزَلَتْ: ﴿تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ ...﴾، قُلْتُ: يَا رَسُول اللهِ ﷺ! مَا أَرَى رَبَّكَ إِلَّا يُسَارِعُ فِي هَوَاكَ) (أخرجه البخاري: ٤٨٢٣، ومسلم: ٥٦٤).

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازیبێ)، (دەربارەی ئەوە کاتێ خۆی ئافرەتێك[1] خۆی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ کردوە)، دەڵێ: ئایا ئافرەت شەرم ناکات خۆی پێشکەشی پیاو بکات؟ بەڵام کاتێ فەرمایشتی خوا هاتە خوار: ﴿تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ... ﴿٥١﴾﴾، دەڵێ:

---

(١) یاخود زیاتر، خۆیان پێشکەشی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کردوە، کە نەزانراوە، هیچ کام لەوانەی خۆیان پێشکەشیکرد، بوونە هاوسەری و هاوسەرگیریی لەگەڵدا کردبن.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ من هەر ئەوە دەبینم کە پەروەردگارت ئەوەی تۆ حەزی پێ دەکەی، بە خێرایی ئەوەت بۆ جێبەجێ دەکات.

ئەوەش بۆچوونی دایکمان عائیشە بووە (خوا لێی ڕازیبێ)، وای هاتۆتە بەرچاو، کە خوا ﷻ ئاگای لە پێغەمبەری خۆیەتی و ﷺ کار ئاسانیی بۆ دەکات.

٢)- [عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنْتُ أَغَارُ عَلَى اللاَّتِي وَهَبْنَ أَنْفُسَهُنَّ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَقُولُ أَتَهَبُ الْمَرْأَةُ نَفْسَهَا؟! فَلَمَّا أَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ... ﴾، فَقُلْتُ: وَاللهِ مَا أُرَى رَبَّكَ إِلاَّ يُسَارِعُ لَكَ فِي هَوَاكَ] (أخرجه البخاري: ٤٨٢٣، ومسلم: ٣٧٠٤).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازیبێ)، دەڵێ: ئەوانەی کە خۆیان پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ دەکرد، غەیرەم بەرانبەریان هەبوو، (واتە: هەستیاریی و هەستی هەوێداریی)و دەمگوت: ئایا ئافرەت خۆی پێشکەش دەکات؟! بەڵام کاتێ خوای زاڵی پایەدار ئەوەی دابەزاند: ﴿ تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ...﴿٥١﴾ ﴾، گوتم: بە خوا پەروەردگارت هەر دەبینم خێرایی دەکات لە جێبەجێ کردنی ئەوەدا کە تۆ پێت خۆشە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

پێشتر گوتمان: لەم سوورەتەدا، حەوت جار وشەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، هاتووەو، پێنج جاریش وشەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ ﴾، هاتووە، بۆ جاری سێیەم لەم سوورەتەدا، لە حەوت جاران، خوا ﷻ ڕوو لە بڕواداران دەکات، شایانی باسە: کە ئەم سوورەتە وێڕای دواندنی بڕواداران بۆ حەوت جارو، دواندنی پێغەمبەر ﷺ پێنج جاران، بەڵام زیاتر پەیوەستە بە باری خێزانیی پێغەمبەری خواوە ﷺ، جارجاریش ئاماژە دەکات بە هەندێ شتی کۆمەڵایەتیی کە بڕوادارانیش بە

گشتیی دەگرێتەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ سەرمەشق و پێشڕەوی بڕواداران بووەو ئەو بڕوادارانە، پێویستە لە هەموو شتێکدا چاوی لێبکەن، جگە لەو شتانەی کە تایبەتمەندیی ئەون، زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن.

ئنجا لێرەدا بۆ جاری سێیەم، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکات ئافرەتانی بڕوادارتان مارەکردن، گرێبەستی هاوسەرگیرییتان لەگەڵ بەستن، دوایی دەستبەرداریان بوون، بەرلەوەی دەستیان بگەیەننێ، واتە: بەر لەوەی بیانگوازنەوەو بچنە لایان و لەگەڵیان جووت بن، ﴿فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ﴾، واتە: مافی ئێوە نیە لەسەر ئەوان کە بچنە عیددەیەکەوە، ئێوە لەسەریان بژمێرن، عیددەش وەك لە تەفسیری سووڕەتی (البقرة)دا باسکراوە، عیددەی ئافرەت کە مێردی دەست بەرداری دەبێ، بریتیە لە سێ (قرء)، ﴿وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴿٢٢٨﴾﴾البقرة، (قرء)یش هەم بە مانای پاکیی (طهر)ە، هەم بە مانای حەیز (حیض)یشە، بەڵام ئافرەتێك تۆڵدار بێ و تەڵاق بدرێ، بە دانانی تۆڵەکەی (کۆرپەکەی) عیددەکەی تەواو دەبێ، هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: دەبێ دوورترینی دوو کاتەکان (أقصى الأجلين) کامیان دوورتر بێ، ئەویان دەبێتە عیددەی واتە: سێ مانگەکە، یاخود دانانی تۆڵەکەی، بەڵام ئافرەتێك کە هاوسەری دەمرێ، مێردەکەی دەمرێ، عیددەکەی دیاریکراوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ﴿٢٣٤﴾﴾البقرة، ئەوانەتان کە دەمرێن و ژنان بە جێ دێڵن، ئەوانە چوار مانگ و دە (١٠) شەو دەبێ بچنە عیددەوە.

(عِدَّة)ش ئەو شەوو ڕۆژانەن کە ئافرەت دەیانژمێرێ، تاکو دوای ئەوەی تەواوی کردن، دەستی کراوەبێ، بۆ دووبارە هاوسەرگیریی کردنەوە.

﴿فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا﴾، ئەو ئافرەتانەی کە دەستبەرداریان دەبن و تەڵاقیان دەدەن، بەر لەوەی دەستیان بگەیەننێ و بچنە لایان، مافی ئێوەیان

لەسەر نیە، کە بچنە عیددەوە، واتە: سێ مانگ بە نسبەت ئافرەتانێکەوە کە لە حەیز چوونەتەوە، یاخود جارێ نەگەیشتوونە تەمەنی کەوتنە حەیز، یاخود سێ پاکیی دوای بێ نوێژیی، یاخود: سێ کەوتنە بێ نوێژیی، سێ حەیز، ئەوەتان لەسەریان نیە، بەڵام ﴿ فَمَتِّعُوهُنَّ ﴾، دیارییان پێ بدەن و بەهرەمەندیان بکەن، ﴿ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴾، هەروەها بە دەست بەردانێکی جوان و ڕێك، دەستبەرداریان بن.

لە تەفسیری سوورەتی (البقرة)دا، باسی موتعەی تەڵاق کراوە، واتە: بەهرەمەندکردنی پیاو بۆ ئافرەتێك، کە دەست بەرداری دەبێ و تەڵاقی دەدا، ئنجا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان بێ، بە ڕای بەشێك لە زانایانەوە فەرزە، بە ڕای هەندێکیشیانەوە، شتێکی پەسندو باشە، کە ئەو پیاوە دیارییەك بدات بەو ئافرەتە، بۆ ئەوەی دڵی چاك بێتەوەو، دڵی نارەحەت نەبێ، هەروەها بۆ سومعەو ڕێزیشی لە نێو خەڵك دا، بۆ ئەوەی گومانی خراپی پێ نەبردرێ و، بۆ ڕێزلێگرتنی خزم و کەس و کاریشی.

ئنجا خوا ﷻ ڕوو دەکاتە پێغەمبەر ﷺ، کە ئەمە جاری چوارەمە، لەم سوورەتە موبارەکەدا و دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ اللَّاتِي آتَيْتَ أُجُورَهُنَّ ﴾، ئەی پێغەمبەر ﷺ! بە دڵنیایی ئێمە ئەو هاوسەرانەت کە مارەییت پێداون، بۆمان ڕەوا کردووی، (أجور) کۆی (أجْر)ە، کە بە مانای پاداشت دێ و، بە مانای کرێش دێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی مارەییە، ئەو ئافرەتانەت کە مارەییت پێداون، بۆ تۆمان حەڵاڵ کردوون، ﴿ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ ﴾، هەروەها ئەوەی دەکەوێتە دەستی ڕاستتەوە، بە دەستی ڕاستتەوە دەبێت، کە مەبەست پێی کەنیزەکە، ﴿ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكَ ﴾، لەوانەی خوا گێڕاونیەوە بۆ لای تۆ، وەك دەستکەوتی جەنگیی، ﴿ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّاتِكَ ﴾، هەروەها کچانی مامت و، کچانی پوورەکانت، (عمة) کە بە (عمات) کۆدەبێتەوە واتە: خوشکی باب، ﴿ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَالَاتِكَ ﴾، هەروەها کچانی خاڵت و کچانی پلکەکانت، (خالة) کە بە (خالات) کۆ دەبێتەوە، خوشکی دایکە، ﴿ اللَّاتِي

هَاجَرْنَ مَعَكَ ﴾، ئەوانەی کە لەگەڵ تۆدا کۆچیان کردوە، ئەوانەت بۆ حەڵاڵن، ﴿ وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ ﴾، هەروەها ئافرەتێکی بڕوادار، ئەگەر خۆی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ کردو خۆی بۆ کردە دیاریی.

﴿ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا ﴾، هەر کات پێغەمبەر ﷺ ویستی مارەی بکات، ئەگەرنا تەنیا بە خۆ پێشکەش کردن و خۆ بەخشین بە پێغەمبەر ﷺ نابێتە هاوسەری، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئارەزووی لە مارەکردنی و هاوسەرگیریی لەگەڵ کردنی نەبێ، ﴿ خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئا ئەوەیان کە ئافرەتێك خۆی پێشکەشی پیاوێك بکات و مارەیی نەبێ و، خۆی پێ ببەخشێ، ئا ئەوەیان ساغ بۆ تۆیە، جیا لە بڕواداران، واتە: تایبەتە بە تۆوە، بەڵام بڕواداران ئەگەر ئافرەتێکیش خۆیان پێشکەش بکات، تەنیا بەو پێشکەشکردنە نابنە هاوسەریان، بەڵکو دەبێ مارەییان پێ بدەن، بە پێی ئەو ئەدەب و ڕێ و ڕەسمە کە دیاریکراوە، هاوسەرگیریی لەگەڵ ئافرەتانی بڕواداردا بکەن.

﴿ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِىٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە زانیمان چیمان لەسەر بڕواداران پێویستکردوە، لە بواری هاوسەرەکانیانداو لە کەنیزەکانیشیاندا، ئەو ئافرەتانەی کە بەدەستی ڕاستیانەوە دەبن و دەبنە خاوەنیان، ئەو ئافرەتانەی ئەو پیاوە بڕوادارانە دەبنە خاوەنیان، ﴿ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ ﴾، (ئەوەمان زانیوە کە لەسەریانمان پێویستکردوە، لە بواری هاوسەرانیان و کەنیزەکانیاندا) تاکو تۆ سەغڵەتیت لەسەر نەبێ، واتە: هی ئەوان دیارەو هی تۆش دیاربێت، ئەگەر خوای پەروەردگاریش شتێکی تایبەتیی بۆ تۆ ڕەواکرد، لەبەر ئەوەی پێگەکەت وا دەخوازێ، بەرپرسیارییەتەکەت وادەخوازێ کە دەبێ دەست کراوەتربی و، کار ئاسانییت بۆ بکرێ و هیچ سەغڵەتییت لەسەر نەبێ، یانی: ئەوان بزانن سنووری ئەوان تاکو کوێیەو، سنووری تۆش تاکو کوێیەو، تایبەتمەندییەکانی تۆ چین؟ ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، بە دڵنیایی خواش لێبووردەی بە بەزەییە، بەرانبەر بە تۆش و، بەرانبەر بە بڕوادارانیش، ئەگەر تووشی هەڵەو پەڵەیەك ببن.

﴿ تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ ﴾، هەر کام لە هاوسەرەکانت بوێ، دوای دەخەی، واتە: لە نۆرەی خۆی دوای دەخەی، با نۆرەشی بێ، دەگونجێ دوای بخەی لە نۆرەکەی، ﴿ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ﴾، هەروەها بۆ لای خۆتی دێنی هەر کامێك لەو هاوسەرانەت، ئەگەر بتەوێ، ئەوە واتایەکی.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: کە هەر کامێك لەو هاوسەرانەت دووردەخەیەوە، یان دوای دەخەی، مەرج نیە لە نۆرەی خۆیشی، هەر جۆرە دواخستنێك و کەنار گرتنێك، کەناری لێدەگری، ﴿ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ﴾، هەر کامێکیشیانت مەبەست بێ، لە خۆتی وەنیزیك دەخەی، ﴿ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى قُلُوبِكُمْ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴾، هەروەها ئەگەر یەکێکیشیان کەنارت لێ گرتبێ، بەڵام دوایی بیخوازی و بیهێنیەوە لای خۆت، دیسان هیچ سەغڵەتیی و گوناح لەسەر تۆ نیە.

﴿ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ ﴾، ئا ئەو دەستکراوەییەش بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ لە بواری مامەڵەت لەگەڵ هاوسەرەکانتدا، کە تۆ دەستت کراوەیەو پابەند نەکراوی بەوەوە کە دادگەرییان لە نێواندا ڕەچاو بکەی، یانی: پابەند نەکراوی بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەی، کە بڕواداران مولزەمن لەگەڵ هاوسەرانیاندا مامەڵە بکەن، ئا ئەوە نیزیکترە، بۆ ئەوەی شادمان بن ﴿ تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ ﴾، (قَرَّتْ عَيْنُه)، (فرِحَتْ، سَرّت) دڵخۆشبوو، یانی: دڵخۆش بن، شادمان بن، ﴿ وَلَا يَحْزَنَّ ﴾، هەروەها دڵتەنگ نەبن، ﴿ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ﴾، ڕازیش بن بەوەی کە پێتداون، هەموویان بە بەشی خۆیان ڕازی بن.

واتە: خوا ﷻ کە دەستی تۆ دەکاتەوە، ئەی پێغەمبەر! ﷺ بۆ مامەڵە لەگەڵ هاوسەرەکانتداو، ئەو قەیدو بەندانەت لەسەر لادەبات و دەستت کراوە دەکات، ئا ئەوە وا دەکات، کە هاوسەرەکانت بەو بەشەی کە پێیان دەدرێ، ڕازی و شادمان بن، چونکە ئەو کاتە دەزانن کە تۆ دەستت کراوەیە، خوا ﷻ دەستی کردوویەوە، لەبەر پێویستیی پێگەکەت و بەرپرسیارییەتە قورسەکەت، بۆیە ئەو بەشەی کە پێیان دەدرێ، پێی دڵخۆش دەبن، نەك چاوەڕوانیی زیاتریان هەبێ.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە: خوا ﷻ دەستی پێغەمبەری خۆی ﷺ کردۆتەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هەر پابەند بووە بە دادگەریی لە نێوان هاوسەرەکانیدا (خوا لێیان ڕازیبێ)و، بە پێی ئەو دەستکراوەییە، کاری نەکردوە، مەگەر بە دەگمەن، ئەو کاتە هاوسەرەکانی (خوا لێیان ڕازیبێ)، زانیویانە کە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەیکات، هەر چاکەو بەخشینێکەو ئاگا لێبوونێکە، لە لایەن خۆیەوە، نەك پابەندکرابێ کە دەبێ هەروا بکات، ئەوەش زیاتر دەبێتە هۆی ئەوە، کە هەست بە منەت و چاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، لەسەریان و، دڵخۆش بن و ڕازیی بن، ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمۡ ﴾، خواش ئەوەی لە دڵەکانتاندا هەیە، دەیزانێ، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴾، خواش هەر لە ئەزەلەوە زاناو هێدیی و مەندبووە.

لە کۆتاییدا، خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ ﴾، لەمەودوا ئافرەتان بۆ تۆ حەڵاڵ نین، کە هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەی، واتە: دوای ئەوەی کە نۆ هاوسەرەکەت سەرپشککردن و، ئەوانیش مانەوە لەگەڵ تۆو، پاداشتی ڕۆژی دواییان هەڵبژارد، دوای ئەوە، بۆت نیە هاوسەرگیریی لەگەڵ ئافرەتانی دیکەدا بکەی، ﴿ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ ﴾، هەروەها بۆشت نیە، کە لەو نۆیە، یەکێکیان دەست لێبەربدەی و، هاوسەرێکی دیکە بێنیە شوێنی، ﴿ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ ﴾، هەرچەندە جوانییەکەشیان تۆ سەرسام بکات، ﴿ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ ﴾، جگە لەوەی کە دەکەوێتە دەستی ڕاستتەوە، جگە لەوەی کە دەکەوێتە بەردەستت و دەبێتە کەنیزەك.

﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴾، خواش هەر لە سەرەتاوە چاودێر بووە، بەسەر هەموو شتێکەوەو، ئاگاداری هەموو شتێکەو، هەموو شتێك لە ژێر چاودێریی وردی خوای پەروەردگاردا بەڕێوە دەچێ.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**ڕێنمایی خوا ﷻ بۆ پیاوانی بڕوادار، کە هەرکات ئافرەتانیان مارەکردو، دەستبەرداریان بوون، پێش گواستنەوەیان، دیاریان بدەنێ و خەڵاتیان بکەن، هەروەها ئەو ئافرەتانە عیددەشیان لەسەر پێویست نیە، کە بێ ئەوەی هاوسەریان بچنە لایان، دەست بەرداریان بوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَاۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ٤٩﴾

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەمە جاری سێیەمە لەم سوورەتەدا لە حەوت جاران کە خوا ﷻ بانگی مسوڵمانان دەکات، بە نازناوی ئیمان، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە: بە خوا ﷻ بە فریشتەکانی خوا، بە کتێبەکانی خوا، بە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بە ڕۆژی دوایی، ئەو پێنج پایە کە لە قورئاندا هاتوون، هەروەها بە قەدەرو ئەخشەو ئەندازەگیریی خوا، کە لە لایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ خراوەتە گەڵ ئەو پێنج پایەو، کراوە بە پایەی شەشەمی ئیمان، ئەی ئەوانەی بەو شەشانە هەموویان بڕواتان هێناوە!

٢)- ﴿إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾، هەرکاتێك ئافرەتانی بڕوادارتان مارەکردن، (نَكَحَ) بە مانای: مارەی کرد (عَقَدَ عَلَيْهَا)یە، واتە: (نَكَحَ الرَّجُلُ المَرْأَةَ: عَقَدَ عَلَيْهَا) واتە: مارەی کرد، هاوسەرگیریی لەگەڵ کرد، بەڵام (نَكَحَ) بە مانای (وَطَأَ) نایەت، چونکە لە هەموو

قورئاندا، خوا ئەگەر ویستبێتی باسی پرۆسەی پێکەوە جووتبوونی پیاو ئافرەت بکات، بە کنارەو لەبەر ڕاهاویشتن (کنایة) ئەو تەعبیرەی بەکارهێناوە، بۆ وێنە:

﴿وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ﴿٢١﴾﴾النساء، هەندێکتان چوونە لای هەندێکتان یان: ﴿أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ ﴿٤٣﴾﴾النساء، دەستتان گەیاندە ژنان، یان: ﴿قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ ﴿٤٩﴾﴾الأحزاب، بەر لەوەی دەستیان بگەیەنن.

بەو شێوەیە خوا ﷻ لە پەناڕا باسی ئەو حاڵەتە دەکات، کەواتە: وشەی (نِكَاح) لە ئەسڵی زمانی عەرەبییداو لە بەکارهێنانی قورئاندا، بە مانای گرێبەستە، بە مانای مارەکردنە، لێرەش زۆر ڕوونە کە بەو مانایەیە.

٣)- ﴿ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ﴾، دوایی بەرهەڵداتان کردن، دەست بەرداریان بوون، بەر لەوەی دەستیان بگەیەنن، واتە: (مِنْ قَبْلِ أَنْ تُجَامعوهُنَّ) بەرلەوەی لەگەڵیان جووتبن، بەرلەوەی بچنە لایان، کە ئەمە کینایەیە بۆ لەگەڵ جووتبوون، (مَسُّهُ) واتە: دەستی گەیاندێ، هەروەها: (لَا مَسْتم) یان (أفضى) یان (مَسّ) ئەوانە هەموویان تەعبیری کنارەیی (كنائي) ین، خوا ﷻ بۆ جووتبوونی پیاوو ئافرەت بەکاری هێناون، ئنجا دەفەرموێ: کاتێ ئافرەتانی بڕوادارتان مارەکردن، دوایی تەڵاقتان دان بەر لەوەی دەستیان بگەیەنن واتە: بیانگوازنەوەو لەگەڵیان جووتبن.

٤)- ﴿فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا﴾، مافی ئێوە نیە لەسەر ئەوان، کە عیددەیەکیان لەسەر بژمێرن، (عِدَّةٍ) بریتیە لەو شەوو ڕۆژانەی کە ئافرەت دەیانژمێرێ، تاکو لە کۆتاییەکەیاندا، بۆی ڕەوابێ هاوسەرگیریی دیکە بکات، ﴿فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا﴾، (مِنْ إِحْصَاءِ أَقْرَاءٍ، وَلَا أَشْهُرٍ تُحْصُونَهَا عَلَيْهِن) کە حەیز، یاخود پاکیی دوای حەیزیان لێ بژمێرن، یاخود: مانگەکانیان لەسەر بژمێرن، ئەو مافەتان نیە، واتە: عیددەیان لەسەر پێویست نیە، چونکە عیددە کە ئافرەت دەیشوات، بۆ ئەوەیە کە بزانرێ: منداڵدانی پاکە لە تۆوی ئەو پیاوە، ئنجا کە پیاوەکە نەچووبێتە لای، پێویستیی بەوە ناکات.

٥)- ﴿فَمَتِّعُوهُنَّ﴾، (أي: أعْطُوهُنَّ مَا يَسْتَمْتِعنَ بِهِ مِنْ عَرَضٍ، أو عَيْنِ مَالٍ) واتە: شتێکیان بدەنێ لە کەل وپەل، یاخود لە ماڵ و سامان، کە لێی بەهرەمەندبن.

٦)- ﴿ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴾، دوایی بە دەست لێ بەردانێکی جوان، دەستیان لێ بەردەن، واتە: (خَلُّوا سَبِيلَهُنَّ تَخْلِيَةً بِالمَعْرُوف) واتە: بەرهەڵدایان بکەن، دەستیان لێ بەردەن، بە شێوەیەکی پەسندو بە چاکزانراو.

پێشتریش ئاماژەمان پێدا، کە ئێمە لە سوورەتی (البقرة)دا، لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (٢٣٦)و، هەروەها ئایەتی ژمارە (٢٤١)دا، لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرەدا، بە درێژیی لەو بارەوە دواوین و، لەوێدا باسی موتعەی تەڵاق کراوە، بۆ وێنە کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا۟ لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلْمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلْمُقْتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعًۢا بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٣٦﴾ ﴾البقرة.

واتە: گوناهتان ناگاتێ ئەگەر ئافرەتانتان تەڵاقدان، مادام دەستتان نەیانگەیاندبێ (واتە: نەتانگواستبنەوە)، هەروەها مارەییەك کە فەرزە لەسەرتان، بۆتان دیاریی نەکردبن، بەڵام بەهرەمەندیان بکەن، (دیارییان پێبدەن)، بابای دەوڵەمەندو خاوەن سامانی فراوان بە پێی خۆی، ئەوەش کە توانای کەمە، بە پێی خۆی، دیاریی پێدانێك بە شێوەیەکی پەسند، ئەوە مافێکە لەسەر چاکەکاران.

لێردا دەفەرموێ: ﴿ حَقًّا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، مافێکە لەسەر چاکەکاران کە دەگونجێ وا تەفسیر بکرێ: ئەوەی نەیویست، چاکە بکات، لەسەری پێویست نیە، بەڵام دوایی خوا ڕوونی دەکاتەوە لە ئایەتی ژمارە (٢٤١)دا، کە مەبەست لە چاکەکاران لێرەدا ئەوە نیە ئەگەر پێیان خۆشبێ بیکەن، ئەگەرنا نەیکەن، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ ﴾البقرة، واتە: بۆ ئافرەتانی دەست لێبەردراو، مافیانە بەهرەمەند بکرێن بە شێوەیەکی پەسند، ئەمە مافێکە لەسەر پارێزکاران، واتە: کەسێك بیەوێ بە پارێزکار لە قەڵەم بدرێ، ئەو مافەی لەسەرە، هەر کات دەستی لە ئافرەتێك بەردا، کە مارەی کردوە، ئنجا چ مارەیی بۆ دیاریکرد بێ، چ بۆی دیاریی نەکردبێ، مادام نەچووبێتە لای و دەستی نەگەیاندبێتێ، لەسەری پێویستەو، مافێکە لە ئەستۆیدا کە دیاریی پێبداو، بەهرەمەندی بکات.

**(العِـدّةُ: في الأَصْـلِ إِسْـمُ هَيْئَـةٍ مِـنَ العَـدّ، وَهُـوَ الحِسَـابُ، فأُطْلِقَـتِ العِـدّةُ عَـلَى الـشَّيءِ المَعْـدُودِ، وَفي اصْطِـلَاحِ الشَّـرْعِ: هِـيَ المُـدّةُ المُحَـدَّدَةُ لانْتِظَـارِ المَـرْأة زَوَاجـاً ثَانِيـاً)، (تَعْتَدُّونَهَـا: أي: تَعُدُّونَهَـا عَلَيْهِـنّ أي تَعُـدُّونَ أيَّامَهَـا عَلَيْهِـنّ، وَاعْتَـدّتِ الـمَرْأَةُ أي: قَضَـتْ أيّـامَ عِدّتِهَـا).**

**(عِـدَّة)** لـە بناغـەدا بریتیـە لـە شـێوەی ژمـاردن كـە بریتیـە: لـە ژمـاردنی شـتێك، دوایـی وشـەی (عِـدَّة) بەكارهێـنراوە بـۆ شـتێكی ژمێـردراو، ئەمـە لـە ئەسـڵی زمانـدا، بـەڵام لـە زاراوەی شـەرعدا بریتیـە: لـەو مـاوە دیارییكـراوەی كـە ئافـرەت چـاوەڕێ دەكات تەواوبـێ، تاكـو بـۆ جـاری دووەم (یاخـود: بـۆ جارێـكی دیكـە مەرج نیـە دووەم بـێ، دەكـرێ ئـەو ئافرەتـە بـۆ جـاری سـێیەم و چوارەمـە) هاوسـەرگیریی بـكات.

**(تَعْتَدُّونَهَـا)** واتـە: ئێـوە دەیژمێـرن لەسـەریان، واتـە: ڕۆژەكانی، یاخـود حەفتـەو مانگـەكانی دەژمێـرن، لەسـەر ئافرەتەكـە، كـە دەگوتـرێ: **(اعْتَـدّتِ الـمَرْأَةُ)** واتـە: ڕۆژەكانی ئـەو ماوەیـەی كـە دەبـێ چـاوەڕێ بـێ، تـەواوی كـردن، واتـە: ئافرەتەكـە ماوەكـەی تەواوكـرد، ئـەو ماوەیـەی كـە دەبـوو چـاوەڕێ بـێ، تاكـو دەسـتی كـراوە دەبـێ بـۆ هاوسـەرگیرییەكی دیكـە، دوای ئـەوەی لـە مێردەكـەی جیابۆتـەوە.

**مەسەلەی دووەم:**

**چەند ڕێنماییەك بۆ پێغەمبەر ﷺ لە بواری هاوسەرگیریی کردن و، مامەڵەی لەگەڵ هاوسەرانیداو، دەست کراوەکردنی، تاکو تووشی سەغڵەتیی نەبێ و، هاوسەرانی شادمان و ڕازی بن، کە پێغەمبەر ﷺ بێ ئەوەی لەسەری فەرز بێ، وەك بەخشش ئاگای لێیانەو، دادگەرییان لە نێواندا دەکات، بە پێی توانای:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۗ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِيٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٠﴾ تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴿٥١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە بیست و دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، ئەمە جاری چوارەمە لەو پێنج جارەی، کە لەم سوورەتە موبارەکەدا خوا بانگی موحەممەد پێغەمبەری کۆتایی ﷺ دەکات، (ٱلنَّبِيُّ) هەم دەگونجێ (فعيل)ی بە مانای (فاعل)بێ، (نبيّ) واتە: (مُنْبِئ) هەواڵدەر، دەشگونجێ (فعيل)ی بە مانای (مفعول) بێ، وەك (قَتِيل) بە مانای (مَقْتُول)، واتە: (مُنْبَأ) هەواڵ پێدراو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ و هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هەم لە لایەن خواوە هەواڵیان پێدراوە (مُنْبَأ)ن و، هەم (مُنْبِئ)یشن ئەوەی کە لە لایەن خواوە پێیان ڕاگەیێنراوە، هەواڵ بە خەڵك دەدەن، خوا بانگی پێغەمبەر دەکات ﷺ دەفەرموێ:

٢)- ﴿إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِىٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئەو هاوسەرانەت کە مارەییت پێداون بۆ تۆمان حەڵاڵ کردوون، بۆ تۆمان ڕەواکردوون، پرسیار دەکرێ: هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ حەڵاڵ بوون، بۆچی خوا ﷻ لێرە ئەوە دەفەرموێ؟

ئەمــە هەواڵدانــە بــۆ چەســپاندنی یاســایەکی پێشــتر، لێــرەدا مەبەســت پێــی چاکـەو منـەتی خوایـە لەسـەر پێغەمبەرەکـەی ﷺو، بـۆ ئـەوەی کەسـێکیش گومـانی پەیدانەبـێ، کـە خـوا کاتێـك فەرمـانی بـە پێغەمبـەر کـرد ﷺ: هاوسـەرەکانی سەرپشـك بـکات، کەسـێك دوو دڵیـی و دڵ لـە دڵدانێـکی بـۆ پەیدانەبـێ کـە: ئـەو هاوسـەرانەی پێغەمبـەر ﷺ هیـچ کـەم و کورییـەك لـە ڕەوایانـدا پەیدابووبـێ! بـۆ ئـەوەی ئـەو جـۆرە گومـان و دوو دڵییانـە لابچـن، ئەگـەر هەبـن لـە دڵـی کەسـێکدا، خـوا ئـەوەی فەرمـووە، ئـەوە لـە تەفسـیرەکاندا نەمبینیـوە، بـەڵام ئێسـتا هاتـە دڵـم.

کــە دەفەرمــوێ: ﴿ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ﴾، (أُجُــور) کــۆی (أَجْــرٌ)ە، واتــە: کــرێ، پاداشــت، خــەڵات، کــە بــە تەئکیــد لێــرەدا بــە مانــای (مَهْــر) مارەیــی دێ، واتــە: ئەوانــەی کــە مارەییــت پێــداون و هاوســەرتن و لەگەڵــتن.

٣)- ﴿وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ﴾، هەروەها ئەوەی کە بە دەستی ڕاستتەوەیە، لەوانەی کە خوا گێڕاونیەوە بۆ لای تۆ، وەك دەستکەوتی جەنگیی، (وَمَا أفاءَ الله عَلَيك)، (صِفَةٌ لِمَا مَلَكَتْ يَمِيْنُك)، لەوانەی خوا گێڕاونیەوە بۆ لای تۆ، واتە: وەك دەستکەوتی جەنگیی، ئەمەش یانی: هەرچی کە لەبەر دەستی کافرانە، لە ئەصڵدا هی بڕوادارانە، خوا ﷻ بە هۆی جەنگەوە، یان بەهۆی حاڵەتێکەوە کە دێتە پێش، دەیگێڕێتەوە بۆ لای بڕواداران، بۆ لای خاوەنە ئەسڵییەکەی، ئەوانەشت بۆ حەڵاڵن، ئەو کەنیزەکانەی کە بەدەستی ڕاستتەوەن و تۆ خاوەنیانی.

٤)- ﴿وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ﴾، هەروەها کچانی مامت و کچانی پوورەکانت، ﴿وَبَنَاتِ عَمِّكَ﴾، (أي: بَنَاتُ إِخْوَةِ أَبِيْه) واتە: کچانی برایەکانی بابی (وبنات عماتك)، (أي: بنات إخوة أبيك) واتە: کچانی خوشکانی بابت، (بَنَاتُ عبدالمطلب)، کچانی عەبدولموتتەڵیب،

واتە: کچانێك کە لە ئافرەتانێك پەیدابوون، کە کچانی عەبدولموتتەڵیبن، کە دەبنە خوشکانی بابی پێغەمبەر ﷺ.

٥)- ﴿وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَالَاتِكَ﴾، هەروەها کچانی خاڵت و، کچانی خاڵەتەکانت، لە ناوچەی بادینان بە خوشکی دایك دەڵێن: خاڵەت، هەروەك بە خوشکی باب دەڵێن: مەت، کە هەر لە (خالة وعمة)ی عەرەبیی وەرگیراون، منیش وشەی (پوور) بۆ خوشکی باب بەکاردێنم و، وشەی (پلك) بۆ خوشکی دایك بەکاردێنم، واتە: (خالة)، کەواتە: ﴿وَبَنَاتِ خَالِكَ﴾، واتە: کچانی بنەماڵەی (عبدالمناف بن الزهرة) کە خاڵەکانی پێغەمبەرن ﷺ، ﴿وَبَنَاتِ خَالَاتِكَ﴾، واتە: کچانی خوشکانی دایکت.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش: بۆچی وشەی (عم و خال) بە تاك، هاتوون بەڵام (عمات و خالات) بە کۆ؟! ﴿وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّاتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَالَاتِكَ﴾.

شارەزایانی زمانی عەرەبیی زۆریان قسە لێکردوە، بەڵام ئەو وەڵامە، ڕەنگە لە هەموویان بەجێتربێ:

لەبەر ئەوەی (عم) بۆ برای باب و، بۆ برای باپیرو سەرتریش بەکاردێ، (خال)یش بۆ برای دایك و، بۆ برای نەنك و بۆ سەرتریش بەکاردێ، بەڵام (عمة و خالة) واتە: خوشکی باب و خوشکی دایك، مەبەست پێیان جینس نیە، بۆیە کۆکراونەوە، دیارە وشەیەك کە مەبەست پێی جینس بێ، پێویست بە کۆکردنەوە ناکات، هەروەها ئەگەر مەبەست پێی چاوگ (مصدر) بێ، پێویست بە کۆکردنەوە ناکات، بەڵام کە مەبەست پێی چاوگ یان جینس نەبوو، تاکەکانی ئەو شتە کۆدەکرێنەوەو (عمة و خالة)ش بەو جۆرەن.

٦)- ﴿اللَّاتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ﴾، هەموو ئەو ئافرەتانە واتە: کچانی مام و پوورو، کچانی خاڵ و پلك، ئەوانەی کە کۆچیان لەگەڵتدا کردوە، بەڵام ئەوانەی کە جارێ هەر لە شاری مەککەن، یان لە هەر شوێنێکی دیکەن و نەهاتوونە نێو مەدینە، ئەوانەت بۆ ڕەوا نیە.

٧)- ﴿وَٱمۡرَأَةٗ مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ﴾، هەروەها ئافرەتێکی بڕوادار کە خۆی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ کرد، خۆی پێبەخشی، یانی: **(تَجْعَلُ نَفْسَهَا لَهُ هِبَةً دُوْنَ مَهْرٍ)** واتە: خۆی پێشکەش دەکات، بێ ئەوەی چاوەڕوانیی مارەیی لێبکات.

٨)- ﴿إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا﴾، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ویستی، مارەی بکات، **(أَنْ يَنْكِحَهَا)** کە مارەی بکات، بەڵام **(يَسۡتَنكِحَهَا)**، مانایەکەی بەهێزتر دەکات، کە مارەی ببڕێ، گرێبەستی هاوسەرگیریی لەگەڵ ببەستێ.

ئایا بۆچی ئەمە هێنراوە: ﴿إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا﴾؟ ئەمە بۆ خۆپاراستنە لە نەریتێکی عەرەبەکان، کە پیاو کاتێ ئافرەتێک خۆی پێشکەش دەکرد، لەسەری پێویست بوو قبووڵی بکات، واتە: بە پێی ئەو نەریتە کار ناکرێ، لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هەر ئافرەتێک خۆی پێشکەش کرد بڵێت: بڵێ! وەك لە هەندێ ڕیوایەتاندا هاتوە کە ئافرەت هەبووە خۆی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ کردوە، ئەویش تەماشایەکی کردوەو، هیچ دەنگی نەکردوە، دوایی یەکێك لە هاوەڵان گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەگەر پێویستیت پێی نیە، لە منی مارە بکە، ئەویش فەرموویەتی: چیت هەیە؟ دوایی لەسەر شتێك کە ئافرەتەکەش پێی ڕازیبووە، مارەی کردوە، هەبووە نەداربووە فەرموویەتی: چەندە قورئانت لەبەرە؟ ئەوەندە قورئانەی بۆ دیارییکردوە فێری بکات و، کردوویەتی بە مارەیی.

٩)- ﴿خَالِصَةٗ لَّكَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، ئا ئەوە تایبەتە بە تۆوە جیا لە بڕواداران، ﴿خَالِصَةٗ لَّكَ﴾، **(تِلْكَ الْمَرْأَةُ خَالِصَةٌ لَكَ)** واتە: ئەو ئافرەتە بە تایبەتی کە خۆی پێشکەش دەکات، تایبەتە بە تۆوە، بۆ تۆ ساغ بۆتەوە، واتە: پیاوانی بڕوادار بۆیان نیە هەر ئافرەتێك خۆی پێشکەشکردن، بەبێ مارەیی، بۆیان ڕەوا نیە، دەبێ مارەیی بێ و، بە پێی ڕێ و ڕەسمی خۆی بێ.

١٠)- ﴿قَدۡ عَلِمۡنَا مَا فَرَضۡنَا عَلَيۡهِمۡ﴾، واتە: ئێمە دەزانین کە چیمان بۆ داناون، چیمان لەسەر پێویست کردوون، چونکە **(فَرَضَ لَهُ: فَرَضَ عَلَيْهِ)** واتە: بۆی دانا، بۆی دیارییکرد، واتە: دەزانین چیمان بۆ بڕیارداون، ئەوەی کە شایستەیانە وەك ئۆممەت بە گشتیی.

١١)- ﴿فِيٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ﴾، لە هاوسەرانیانداو لە کەنیزەکەکانیاندا، واتە: لەو ئافرەتانەدا کە لەبەر دەستیانن و ئەوان خاوەنیانن.

بۆچی دەفەرموێ: (فِي)؟ لێرەدا دەڵێن: (فِي: ظَرْفٌ مَجَازٌ، لِأنَّ المَظْرُوفَ: الأحْكَامُ الشَّرْعِيَّةُ، لَا ذَوَاتُ الأزْوَاجِ، وَلَا ذَوَاتُ مَا مَلَكَتْهُ الأيْمَانُ) واتە: (فِي) تێدابوو (ظرف)ێکی مەجازە، چونکە ئەوەی کە (مَظْرُوف)ە، شتەکەی تێدا هەیە، بریتیە لە حوکمە شەرعییەکان، نەك خودی هاوسەرەکانیان، یاخود خودی کەنیزەکەکانیان.

١٢)- ﴿لِكَيۡلَا يَكُونَ عَلَيۡكَ حَرَجٞ﴾، (دەزانین چیمان بۆ بڕیارداون لەبارەی هاوسەرانیان و کەنیزەکەکانیان و بۆ بڕواداران بە گشتیی)، تاکو تۆ هیچ سەغڵەتییت لەسەر نەبێ، (الحَرَجُ: الضِّيْقُ) سەغڵەتیی و تەنگیی.

١٣)- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بە بەزەییە، واتە: کە ئەوەی داناوەو، بۆی بڕیارداون، بەرهەمی لێبوردن و بەزەیی خۆیەتی.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر بابەتێکی دیکەو دەفەرموێ:

١٤)- ﴿تُرۡجِي مَن تَشَآءُ مِنۡهُنَّ﴾، خوێنراویشەتەوە: (تُرجِىءُ)، واتە: لە هاوسەرانت هەرکامێکیان کە مەبەستت بێ، دوای دەخەی، (الإرْجَاءُ: التَّأخِيْرُ، وَفِعْلُهُ يَنْصَرِفُ إلى الأحْوَالِ لَا للذَّوَاتِ) واتە: نۆرەکەی دوا دەخەی، یان حاڵەکەی دوا دەخەی.

١٥)- ﴿وَتُـٔۡوِيٓ إِلَيۡكَ مَن تَشَآءُ﴾، (تُئْوِي: أي تَضُمُّ وَتُقَرِّبُ) واتە: نیزیکی دەخەیەوە لە خۆت، بۆ لای خۆتی دێنی، هەر کامێکیان لەو هاوسەرانەت ئەگەر بتەوێ، بۆ لای خۆتی دێنی.

هەڵبەتە هەندێك لە زانایان (تُرْجِي، وَتُئْوِي)، یان وا مانا کردوون، کە (تُرْجِي) تەڵاقدان و، (إيواء)یش بە (إبْقَاء) هێشتنەوە، واتە: هەر کامێکیانت بوێ دووری دەخەیەوەو وازی لێدێنی و، هەر کامێکیانت بوێ، دەیهێڵیەوە، بەڵام ئەوە ڕایەکی بێهێزە!

بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە هەر کامێکیان لە نۆرەی خۆیدا، یان لە جگە لە نۆرەی خۆی دا، بتەوێ دووری دەخەیەوە، یان دوای دەخەی و، هەر کامێکیانت بوێ، نیزیکی دەخەیەوە، یاخود بۆ لای خۆتی دێنی.

١٦)- ﴿ وَمَنِ ٱبۡتَغَيۡتَ مِمَّنۡ عَزَلۡتَ ﴾، هەروەها ئەگەر کەنارت لە یەکێکیان گرتبێ، بە هەر هۆیەکەوەبێ، بەڵام دوایی بیخوازیەوە، بیهێنیەوە.

١٧)- ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكَ ﴾، هیچ سەغڵەتیی لەسەر تۆ نیە، (**وَالْمَعْنَى: فَإِنْ عَزَلْتَ بِالْإِرْجَاءِ إِحْدَاهُنَّ، فَلَيْسَ الْعَزْلُ بِوَاجِبٍ اسْتِمْرَارُهُ، بَلْ لَكَ أَنْ تُعِيدَهَا، إِنِ ابْتَغَيْتَ الْعَوْدَ إِلَيْهَا**) واتە: ئەگەر یەکێکیانت بە هۆی دواخستنەوە کەنارلێگرتبوو، ئەوە مەرج نیە ئەو کەنارگرتنەو، ئەو دواخستنە، هەر بەردەوام بێ، بەڵکو بۆت هەیە، ئەگەر ویستت بیهێنیەوە بۆ لای خۆت و، ویستت بگەڕێیەوە بۆ لای.

کەواتە: ئەوەی کە لە کۆی ئەو ڕستە موبارەکەدا وەردەگیرێ، ئەوەیە کە خوا پێغەمبەری ﷺ بۆ مامەڵە لەگەڵ هاوسەرانی بەڕێزی دا، دەستی کراوە کردوە، چونکە دوایی حیکمەتی ئەوە ڕووندەکاتەوەو دەفەرموێ:

١٨)- ﴿ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعۡيُنُهُنَّ ﴾، ئەوە نیزیکترە بۆ ئەوەی دڵیان خۆشبێت، (ذَٰلِكَ) واتە: ئەو دەستکراوەییە، یاخود (**ذَلِكَ: الإِبْتِغَاءُ بَعْدَ الْعَزْلِ**) واتە: ئەو دووبارە گێڕانەوەی دوای کەنارگیرییە، بەڵام زیاتر مەبەست پێی دەستکراوەییە، ئەو دەستکراوەییە بۆ تۆ نیزیکترە لە پێشترە کە هاوسەرەکانت دڵخۆش و شادمان بن، (**قَرَّتْ عَيْنُه**) واتە: چاوی فرمێسکی شادیی پێدا هات، چونکە (**قَرّ**) بە مانای ساردییە، پێچەوانەی (**حَرّ**) بە مانای گەرمییە.

١٩)- ﴿ وَلَا يَحۡزَنَّ ﴾، هەروەها دڵتەنگ نەبن.

٢٠)- ﴿ وَيَرۡضَيۡنَ بِمَآ ءَاتَيۡتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ﴾، هەروەها هەموویان ڕازی بن بەوەی کە پێتداون و شادمان بن، وشەی (**تَقَرّ**) خوێنراویشەتەوە: (**تُقِرّ**)، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَرۡضَيۡنَ بِمَآ ءَاتَيۡتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ﴾، (**إِشَارَةٌ إِلَى أَنَّ الْمُرَادَ: الرِّضَا الَّذِي يَتَسَاوَيْنَ فِيْه**) واتە: ئاماژەیە بۆ

ڕەزامەندییەك كە هەموویان تێیدا یەكسان بن، واتە: هەموویان شادمان و دڵخۆشبن، بە شێوەی مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیاندا، ئەگەر پاش و پێشێك لەگەڵیاندا بكرێ، بزانن كە پێغەمبەر ﷺ خوا ئاوا دەستی كردۆتەوە، كە چی پێغەمبەر ﷺ بەبێ جیاوازیی مامەڵەی لەگەڵدا كردوون، ئەوە زیاتر دەبێتە هۆی ئەوە كە هەست بە خۆشەویستیی پێغەمبەرو ﷺ دڵڕاگرتنی بۆیان و، ڕێزلێگرتنی لێیان و، ئاگاداربوونی لێیان، بكەن.

٢١)- ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ﴾، خواش ئەوە دەزانێ كە لە دڵەكانتاندا هەیە.

٢٢)- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمٗا﴾، خواش هەر لە ئەزەلەوە، زاناو هێدیی و مەندبووە.

دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازیبێ) گوتوویەتی: [عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أَنَّهَا قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي أَمْرَيْنِ، إِلاَّ أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا] (أخرجه: البخاري:٣٥٦٠، ومسلم: ٢٣٢٧).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ كات سەرپشك نەكراوە لە نێوان دوو شتاندا، مەگەر كامەیان ئاسانترە، ئەوەی هەڵبژاردوە، ئەگەر گوناح نەبووبێ، واتە: بۆ خەڵك كامەیان ئاسانترە.

(القرطبي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا[1]، دەڵێ: [وَاخْتَلَفَ الْعُلَمَاءُ فِي تَأْوِيلِ هَذِهِ الآيَةِ، وَأَصَحُّ مَا قِيلَ فِيهَا، التَّوْسِعَةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي تَرْكِ الْقَسْمِ، فَكَانَ لَا يَجِبُ عَلَيْهِ الْقَسْمُ بَيْنَ زَوْجَاتِهِ].

واتە: زانایان ڕاجیاییان هەیە لە تەفسیری ئەو ئایەتەداو، ڕاسترین شت كە لە بارەی ئەم ئایەتەوە گوتراوە، ئەوەیە كە خوا فراوانیی داناوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و دەستی كراوە كردوە، لە ڕەچاوكردنی دادگەریی لە نێوان هاوسەرەكانیداو، لەسەری پێویست نەبووە هەركامیان بەشی خۆی بە یەكسانیی پێبدات.

ئنجا كە پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیەی كردوە، هاوسەرەكانی زیاتریان هەستیان بە چاكەو فەزڵی پێغەمبەری خوا ﷺ كردوە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ص١٧٢.

دیسـان (القرطبي) لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا[1]، کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ﴾، دەڵـێ: (أَيْ ذَٰلِكَ التَّخْيِيرُ الَّذِي خَيَّرْنَاكَ فِي صُحْبَتِهِنَّ أَدْنَىٰ إِلَىٰ رِضَاهُنَّ، إِذْ كَانَ مِنْ عِنْدِنَا، لِأَنَّهُنَّ إِذَا عَلِمْنَ أَنَّ الْفِعْلَ مِنَ اللهِ، قَرَّتْ أَعْيُنُهُنَّ بِذَٰلِكَ وَرَضِينَ، لِأَنَّ الْمَرْءَ إِذَا عَلِمَ أَنَّهُ لَا حَقَّ لَهُ فِي شَيْءٍ، كَانَ رَاضِيًا بِمَا أُوتِيَ مِنْهُ وَإِنْ قَلَّ).

واتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ﴾، واتـە: ئـەو دەسـتکراوەییە کـە تۆمـان تێـدا سەرپشـك کـردوە، لـە چۆنیەتیـی مامەڵەکـردن لەگـەڵ هاوسـەرەکانتدا، نیزیکـترە بـۆ ڕازی بـوونی ئـەوان، چونکـە ئەگـەر ئـەوان زانییـان ئـەوە لـە لایـەن خواوەیـە، ئـەو کاتـە دڵیـان خـۆش دەبـێ و بـەوە ڕازی دەبـن، چونکـە مـرۆڤ ئەگـەر زانی لـە شـتێکدا مـافی نیـە، هەرچەنـدە لـەو شـتە کەمێکیـشی پێبـدرێ، پێـی ڕازی دەبێ (لەبـەر ئـەوەی دەزانـێ ئـەوە مـافی نیـە، بـەڵام چاکـەی لەگەڵـدا کـراوە).

بـەڵام زانایـان و، گێـڕەرەوانی بەسـەرهاتی پێغەمبـەر ﷺ دەڵێـن: پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەم مافـەی لەگـەڵ هاوسـەرانیدا کـە خـوا پێیـداوە، بەکارنەهێنـاوە، بۆچـی؟

چونکـە پێغەمبـەر ﷺ کاری بـە باشـترین و بەرزتریـن ڕەوشـت کـردوە، کـە بریتیـە لـە ڕەچاوکـردنی دادگەریـی لـە نێـوان هاوسـەرەکانیدا، بۆیـە ئـەو دەسـتکراوەییە کـە خـوا دەسـتی کردۆتـەوە، کاری پـێ نەکـردوە، بـەڵام خـوا بۆچی ئـەوەی خسـتۆتە ڕوو؟ تاکـو هـەر کام لـە هاوسـەرەکانی پێغەمبـەر ﷺ ئەگـەر ئـەو کەمیـشی بـۆ کـرا ئـاگای لێـی بێ، ڕازی بـن و دڵخـۆش بـن و بزانـن کـە پێغەمبـەر ﷺ دەیتـوانی ئـەو مافـەش نـەدا، بـەڵام کـە ئـەو مافەیـان پێـدەدا، ئـەوە لـە بەخشـش و چاکـەو جوامێریـی خۆیـەتی، ئەگەرنـا لـە لایـەن خـوای پـەروەردگارەوە دەسـتی کراوەیـەو، لەسـەری فـەرز نەکـراوە، دادگەریـی لـە نێـوان هاوسـەرانیدا بـکات، ئنجـا کـە دادگەرییەکـەی کـرد، مانـای وایـە ئـەوە شـتێکە لـە خۆیەوەیـەو لـە چاکـەی خۆیـەتی.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ص١٧٣.

دوا قسە لەو بارەوە: دوای ئەوەی خوا لەو ئایەتە موبارەکەدا دەستی پێغەمبەر ﷺ دەکاتەوە، سەبارەت بە چۆنیەتیی مامەڵەکردنی لەگەڵ هاوسەرە بەڕێزەکانیداو، حیکمەتی ئەوەش دەخاتە ڕوو، ئەویش ئەوەیە کە هەموویان بە یەکسانیی دڵخۆش بن و، دڵتەنگ نەبن، ڕازی بن بەو ئەندازە مافەی تۆ بە هەر کامیانی دەدات، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ﴾، خواش دەزانێ چی لە دڵەکانتاندا هەیە، هەم دڵی پێغەمبەر ﷺو هەم دڵی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ و، هەم دڵی هەموو خەڵکی دیکەش، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمٗا﴾، خواش هەمیشە زانای هێدیی و مەند بووە، ئەم تەعبیرەش مەبەست پێی ئەوەیە: کەواتە تۆش ئەی پێغەمبەر ﷺ! لە مامەڵە لەگەڵ هاوسەرەکانتدا زانابەو هێدیی و مەندیش بە، زانابە، بزانە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەی، هێدیی و مەندیش بە، چونکە (حِلم) پێچەوانەی زوو تووڕە بوون (سُرْعَةُ الغَضَب)ە، واتە: خێرا تووڕە مەبەو هێدیی و مەندو لێبوردە بە.

هەموو ئەو تەعقیبانەی کە خوا ﷻ لە کۆتایی ئایەتەکاندا دەیانفەرموێ، دەبێ ئینسان لێیان ورد بێتەوە، چونکە بە زۆریی وایە خوا لە میانیان دا باسی هەندێك لە سیفەتەکانی خۆی دەکات، کە پەیوەستن بە نێوەڕۆکی ئەو بابەتەوە کە ڕابردوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕاگەیاندنی قەدەغەکرانی هاوسەرگیریی کردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئافرەتانی دیکەی جگە لەوانەدا کە باسکران، مەگەر کەنیزەك:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴿٥٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ ﴾، ئافرەتانت بۆ حەڵاڵ نین لەمەودوا، وشەی: ﴿ مِنۢ بَعۡدُ ﴾، دوو واتای هەن: (مِنْ بَعْدِ مَنْ ذُكِر) دوای ئەوانە کە باسکران، یاخود: (مِنْ غَيْرِ مَنْ ذُكِرَ) جگە لەوانەی باسکران.

٢)- ﴿ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ ﴾، هەروەها بۆ شت نیە جێگۆڕکە بکەی بە هاوسەرەکان، (تَبَدَّلَ: أي تَتَبَدَّلَ أي: بِتَعْوِيْضِ إِحْدَاهُنَّ بِجَدِيْدَةٍ)، هەروەها بۆشت نیە کە جێگۆڕکێ بکەی بە هاوسەرەکان، واتە: یەکێکیان تەڵاق بدەی و هاوسەرگیرییەکی دیکە بکەی و، ئافرەتێکی دیکە بهێنیە شوێنی ئەو هاوسەرەی تەڵاقتداوە.

٣)- ﴿ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ ﴾، هەرچەندە جوانیی ئەو ئافرەتانە، کە دەتەوێ هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەی، تۆش سەرسام بکات، واتە: لە هیچ حاڵاندا بۆ تۆ ڕەوا نیە، تەنانەت لە حاڵی سەرسامکردنی جوانیی ئەوانیش دا بۆ تۆ.

٤)- ﴿ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَ ﴾، جگە لەوەی دەکەوێتە دەستی ڕاستت، ئەمە هەڵاواردنێکی دابڕاوە (إِسْتِثْنَاءٌ مُنْقَطِعٌ: أي لَكِنْ مَا مَلَكَتْ يَمِيْنُكَ حَلَالٌ فِي كُلِّ حَالٍ)، بەڵام ئەو کەنیزەکەی دەکەوێتە دەستت و تۆ دەبیە خاوەنی، بۆ تۆ حەڵاڵە لە هەموو حاڵاندا.

٥)- ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴾، بە دڵنیایی خواش بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرەو، هەموو شتێك لە ژێر کۆنتڕۆڵ و چاودێریی خوادایە.

ئـەو ئایەتـە موبارەکـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ﴾، دەگونجـێ بـە بەڵگـە بهێنرێتـەوە، لەسـەر ئـەوە کـە ڕەوایـە، پیـاو تەماشـای ئـەو ئافرەتـە بـکات کـە دەیـەوێ بیهێنـێ، هـەروەك ئافرەتیـش بـە هەمـان شـێوە، بـۆی هەیـە پیـاوە لـە دڵگیراوەکـەی خـۆی ببینـێ.

لەو بارەوە ئەو سێ فەرموودەیە دێنین:

١- پێغەمبەر ﷺ یەکێك لە هاوەڵانی هاوسەرگیریی کردبوو، پێی فەرموو: تەماشات کردوە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: (فَانْظُرْ إِلَيْهَا فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا) (أخرجه ابن ماجه ١٨٦٥، قال البوصيري: إسناد صحيح رجاله ثقات، وعبد بن حميد: ١٢٥٤، وابن حبان: ٤٠٤٣، والحاكم: ٢٦٩٧، وقال: صحيح على شرط الشيخين عن أنس ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني)[1]، واتە: تەماشای بکە، چونکە ئەوە شایستەترە، کە دوایی پەیوەندییتان پێکەوە بەردەوامبێ، ئولفەتتان پێکەوە هەبێ، (ئەگەر تۆ ببینی و ئەو تۆ ببینێ و، یەکدی پەسند بکەن).

٢- هەروەها لەو بارەوە هاتوە، کە یەکێك لە هاوەڵان، دیارە لە کۆچکەران بووە، هاوسەرگیریی کردوە لەگەڵ ئافرەتێکی پشتیوانیی (أنصاري)دا، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: (أنْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّ فِي أَعْيُنِ الْأَنْصَارِ شَيْئاً) (أخرجه مسلم: ١٤٢٤، والنسائي: ٣٢٤٧)، واتە: تەماشای بکە، چونکە چاوی پشتیوانەکان شتێکی تێدایە، (شتێك هەیە لە چاوی پیاوان و ئافرەتانی خەڵکی مەدینەدا).

لـە شـەرحی ئـەم فەرموودەیـەدا هاتـوە دەڵـێ: خەڵـکی مەدینـە بـە گشـتیی بـە نسـبەت خەڵـکی مەککـەوە، چاویـان بچووکـتر بـووە، واتـە: ئـەوەك ئێسـتا چـاك سـەرنجی نـەدەی، دوایـی کـە بـوون بـە حەڵاڵـی یەکـدی، ئنجـا لـەوێ عەیبـی لـێ بگـری، نـا، ئێسـتا تەماشـای بکـە!

---

(١) حديث المغيرة بن شعبة: أخرجه أحمد: ١٨١٦٢، والترمذي: ١٠٨٧، وقال: حسن، والنسائي: ٣٢٣٥، وابن ماجه: ١٨٦٦، واللفظ للنسائي.

**٣- فەرموودەیەکی دیکە لەو بارەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِذَا خَطَبَ أَحَدُكُمْ الْمَرْأَةَ، فَإِنِ اسْتَطَاعَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى مَا يَدْعُوهُ إِلَى نِكَاحِهَا، فَلْيَفْعَلْ} (أخرجه أبو داود: ٤٠٨٢، والحاكم: ٢٦٩٦ وغيرهم، قال الألباني : حسن).**

**واتە: هەر کات یەکێکتان ئافرەتێکی خواست، ئەگەر توانی ئەوەندە سەرنجی بدات، کە پاڵنەربێ بۆ ئەوەی مارەی بکات، با سەرنجی بدات، (واتە: بۆی ڕەوایە تەماشای بکات و لە سەرەتاوە باشی ببینێ، هەروەك ئافرەتەکەش بە هەمان شێوە، مافی هەیە).**

**سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە شەش (٦) ئایەت پێکهاتوە: (٥٣ - ٥٨)، کە تێیاندا چەند ڕێنماییەك بۆ بڕواداران خراونەڕوو، بۆ چۆنیەتیی مامەڵەکردنیان لەگەڵ هاوسەرانی پێغەمبەری خوادا ﷺ و، لە بواری هامۆشۆکردنیان بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺو، خۆپاراستنیان لە ئازاردانی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە تایبەت لە بواری خێزانیی دا.

دواتر ئەوە خراوەتەڕوو کە هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ (خوا لێیان ڕازیبێ) دایکانی بڕواداران، گوناهیان ناگات کە مەحرەمەکانیان بیانبینن، وەك باب، کوڕ، برا، برازا، خوشکەزا، ئافرەتانی بڕوادارو، بەردەستەکانیان، (کۆیلەو کەنیزەکیان).

دواییش خوا ﷻ ڕایگەیاندوە کە صەڵاتی لە پێغەمبەر ﷺ داوەو، فەرمانیشی بە مسوڵمانان کردوە کە صەڵات و سەلامی بۆ بنێرن.

لە کۆتاییشدا خوا ڕایگەیاندوە کە نەفرینی لە ئازاردەرانی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ کردوەو، سزای ڕیسواکەری بۆ داناون و، ئەوانەش کە ئازاری مسوڵمانان دەدەن، بێگومان بوختان و گوناهێکی ئاشکرا هەڵدەگرن، واتە: ئەو گوناهە لە کۆڵێ دادەنێن، بۆ قیامەت کە لەوێ بە تەئکید تووشی سزایەکەی دەبن.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَـٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُواْ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ ۖ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَـٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ

كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ إِن تُبْدُوا۟ شَيْـًٔا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا
﴿٥٤﴾ لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِىٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ
أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ ۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
شَهِيدًا ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ ۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ
وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَأَعَدَّ
لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟
فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٨﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! مەچنـە ماڵـەکانی پێغەمبـەرەوە، مەگـەر مۆڵەتتـان بـدرێ (بانـگ بکرێـن) بـۆ خواردنێـك، کـە نابـێ (دابنیشـن) چاوەڕێـی پێگەیشـتنی بکـەن، بـەڵام ئەگـەر بانگهێشـت کـران بـۆ خـواردن، بچنـە ژوورو هـەرکات خواردتـان (بچنـە دەرو) بـڵاوەی لێبکـەن، هەروەهـا نابـێ (دابنیشـن) بـە قسـانەوە بـە یەکـدی هۆگرانـە، بخافڵێـن، ئـا ئـەو (ڕەفتار)ەتـان پێغەمبـەر بێـزار دەکات و، شەرمیشـتان لـێ دەکات (بڵـێ: هەڵسـن)، بـەڵام خـوا لـە گوتنـی هەقـێ شـەرم نـاکات، هەروەهـا هـەر کات (قسـەتان لەگـەڵ هاوسـەرانی پێغەمبـەردا کـرد) کـەل و پەلێکتان لـێ داواکردن (لە پێویسـتییەکانی مـاڵ) لـە پشـت پـەردەوە لێیـان بخـوازن، ئـا ئـەو (شـێواز)ەتان پاکـترە بـۆ دڵـەکانی ئێـوەو، دڵـەکانی ئەوانیـش و، هەرگیزیـش بۆتـان (ڕەوا) نیـە کـە پێغەمبەری خـوا (بـە قسـەو کـردەوەی خـراپ) ئـازار بـدەن، هەروەهـا بـە هیـچ شـێوەیەك و هەرگیـز بۆتـان نیـە هاوسـەرانی پێغەمبـەری خـوا، دوای خـۆی مـارە بکەنـەوە، ئـا ئـەو ڕەفتارەتـان لـە لای خـوا (تاوانێـکی) مەزنـە ﴿٥٣﴾ ئەگـەر شـتێك دەربخـەن یـان پەنهـانی بکـەن (خـوا دەیزانـێ) چونکـە بێگومـان خـوا بـە هەمـوو شـتێك زانایـە ﴿٥٤﴾

(هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ) گوناهیان ناگات ئەگەر (ڕەچاوی پەردەگرتنەوە نەکەن) لە مامەڵە لەگەڵ باوکانیانداو، کوڕەکانیانداو، براکانیانداو، کوڕانی براکانیانداو، کوڕانی خوشکەکانیانداو، ئافرەتەکانیانداو، بەردەستەکانیان (کۆیلەو کەنیزەکەکانیان) داو، پارێزیش لە خوا بکەن (ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر!) بێگومان خوا ئاگاداری هەموو شتێکە ﴿٥٥﴾ بە دڵنیایی خواو فریشتەکانی صەڵەوات لەسەر پێغەمبەر دەدەن، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! (ئێوەش) صەڵاتی لەسەر بدەن و، سەلامی تێر و تەواوی بۆ بنێرن ﴿٥٦﴾ بێگومان ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی دەدەن (بە قسەی ناخۆش و ناشیرین) خوا لە دنیاو دوارۆژدا، نەفرینی لێکردوون و ئازارێکی ڕیسواکەری بۆ داناون ﴿٥٧﴾ ئەوانەش کە ئازاری پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار دەدەن، بە هۆی کارێکەوە کە نەیانکردوە، بوختانێك و گوناهێکی ئاشکرایان هەڵگرتوە (بۆ ڕۆژی خۆی) ﴿٥٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(غَيۡرَ نَٰظِرِينَ): واتە: چاوەڕێکەرانە مەبن، (بۆ کوڵین و پێگەیشتنی خواردنەکە).

(النَّظَرُ: الإِنْتِظَارُ، النَّاظِرُ: المُنْتَظِرُ، النَّاظِرُ: إِسْمُ فَاعِلٍ مِنْ نَظَرَ: أَي انْتَظَر)، (نَظَرْ) واتە: (إِنْتِظَار) چاوەڕوانیی، (نَاظِر) واتە: (مُنْتَظِر): چاوەڕێکەر، ئنجا (النَّاظِرُ) ناوی بکەر (إسم فاعل)ە، لە (نَظَرَ)ەوە هاتوە، (نَظَرَ) یانی: (انْتَظَرَ) چاوەڕێی کرد.

(إِنَىٰهُ): دەگوترێ: (آنَ الشَّيءُ وَأَنَى: قَرُبَ إِنَاهُ)، (وإِنَاهُ: أَي: وَقْتُهُ، أَو وَقْتُ نَضْجِهِ)، واتە: (إِنَاه)ەکەی نیزیك کەوتەوە، (إِنَاه) هەم بە مانای کات دێ، کاتەکەی نیزیك کەوتەوەو، هەم بە مانای کاتی پێگەیشتنی دێت، کاتی کوڵین و پێگەیشتن و ئامادەبوونی خواردن.

(مُسْتَئْنِسِينَ): (الإسْتِئْنَاسُ: طَلَبُ الأُنْسِ مَعَ الغَيْرِ، أي: وَلَا مُسْتَأْنِسِيْنَ لِاجْلِ حَدِيْثٍ يَجْرِي بَيْنَكُمْ)، (إسْتِئْنَاس) بریتیە لەوە کە مرۆڤ خوازیاری ئولفەت گرتن بێ لەگەڵ یەکێکی دی، هۆگری بێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا مُسْتَئْنِسِينَ لِحَدِيثٍ﴾، واتە: بە هۆگر بوونی یەکدییەوە، بە قسانەوە مەخافڵێن، بە هۆی قسانەوە هۆگری یەکدی بن و، بخافڵێن لە ماڵی پێغەمبەردا ﷺ.

(فَيَسْتَحْيِۦ مِنكُمْ): ئەو شەرمتان لێدەکات، واتە: شەرم دەکات لەوەی ئاگادارتان بکاتەوە، کە ئەو دانیشتنەی ئێوە لە کاتی نەگونجاودا، ئازاری دەدات، (الحَيَاءُ: والإسْتِحياء: انْقِبَاضُ النَّفْسِ عَنِ القَبَائِحِ وَتَرْكُهُ)، (حَيَاء) بریتیە: لەوە کە نەفس بێتەوە یەك لە شتی خراپ و، وازی لێ بێنێ، (إسْتَحْيَا فَهُوَ مُسْتَحِي، وَاسْتَحَى فَهُوَ مُسْتَحٍ)، واتە: (إسْتَحْيَا واسْتَحِى) بە (ي) و بە تەنوین، هەردووکیان یەك واتایان هەیە، واتە: شەرمی کرد، ئەو شەرمکەرە.

(حِجَابٍ): واتە: پەردە، (الْحَجْبُ وَالحِجَابُ: المَنْعُ مِنَ الوُصُولِ، وَالحِجَابُ: مَا يَحْجُبُ البَصَرَ)، (حَجْب و حِجَاب) واتە: ڕێگرتن لە گەیشتنی شتێك، (حِجَاب) هەر شتێکە کە ڕێبگرێ لە دیتن، زۆربەی خەڵکی تەنانەت هەندێك لەوانەش کە ئەهلی عیلمن، وشەی حیجاب بۆ پۆشاکی ئافرەت بەکاردێنن، بەڵام لە ڕاستییدا حیجاب کە لێرەدا هاتووەو لە شوێنی دیکەی قورئانیش دا هاتوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأعراف)دا هاتوە، بە مانای پەردەیە.

(يُصَلِّ): (الصَّلَاةُ: هِيَ الدُّعَاءُ وَالتَّبْرِيكُ وَالتَّمْجِيدُ)، (صَلَاة) بریتیە لە پاڕانەوەو، پیز بۆ داواکردن و شکۆمەند کردن.

(لَعَنَهُمُ اللَّهُ): واتە: خوا نەفرینی لێکردوون، (اللَّعْنُ: الطَّرْدُ وَالإبْعَادُ عَلَى سَبِيْلِ السَّخَطِ)، (لَعْن) بریتیە لە دەرکردن و دوور خستنەوە، بەشێوەی لێ تووڕەبوون.

(بُهْتَٰنًا): (البُهْتَانُ: الكَذِبُ الَّذِي يُبْهِتُ سَامِعَهُ لِفَظَاعَتِه)، (بُهْتَان) ئەو درۆیەیە کە کەسێك بیبیستێ، بیسەرەکەی سەرسام و سەراسیمە دەکات، لەبەر زۆر ناشیرینیی و زۆر ناقۆڵایی.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە خوا تێیدا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَٰعٗا فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٖۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّۚ وَمَا كَانَ لَكُمۡ أَن تُؤۡذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزۡوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦٓ أَبَدًاۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ ﴾.

لەوبارەوە دوو گێڕدراوە دێنین:

**أ- [عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا تَزَوَّجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ، دَعَا الْقَوْمَ فَطَعِمُوا، ثُمَّ جَلَسُوا يَتَحَدَّثُونَ، وَإِذَا هُوَ كَأَنَّهُ يَتَهَيَّأُ لِلْقِيَامِ، فَلَمْ يَقُومُوا، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ قَامَ، فَلَمَّا قَامَ، قَامَ مَنْ قَامَ، وَقَعَدَ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ لِيَدْخُلَ، فَإِذَا الْقَوْمُ جُلُوسٌ، ثُمَّ إِنَّهُمْ قَامُوا، فَانْطَلَقْتُ، فَجِئْتُ فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَنَّهُمْ قَدِ انْطَلَقُوا، فَجَاءَ حَتَّى دَخَلَ، فَذَهَبْتُ أَدْخُلُ، فَأَلْقِيَ الحِجَابَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ ﴾، الآيَةَ] (أخرجه البخاري: ٤٧٩١، ومسلم: ١٤٢٨، وغيرهما).**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ [کە خزمەتکاری پێغەمبەربوو ﷺ] دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی کچی جەحشی هێنا، (کچە پووری خۆی، دوای ئەوەی لە زەیدی کوڕی حاریسەی کوڕی شەراحیل جیابۆوە)، خەڵکەکەی بانگ کرد، نانیان خوارد، دوایی دانیشتن قسەیان دەکردن، پێغەمبەریش ﷺ هەڵسا کە بڕوا، بە حیساب ئەوانیش هەڵسن، بەڵام ئەوان هەڵنەستان، (وەک چۆن جاری وا هەیە خانە خوێ ڕادەسێ هەڵسێ، بۆ ئەوەی میوانەکانیش تێبگەن و ئەوانیش هەڵسن)، بەڵام هەر هەڵنەستان، کاتێ ئەوەی بینی ئەو هەڵسا، بەڵام دوای

ئەوەی هەڵسا، هەندێکیان لەوانە کە دانیشتبوون، هەڵسان، بەڵام سێ نەفەر دانیشتن و مانەوە، دوایی پێغەمبەر ﷺ هات، (لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە کە چووە بۆ لای هاوسەرەکانی دیکەی، بۆ ژوورەکانیان و سڵاوی لێکردوون)، دوایی هات بۆ ئەوەی بچێتە ژوور، بەڵام تەماشای کرد ئەو خەڵکە هەر دانیشتبوو، (ئەو سێ کەسە)، دوایی (کە هەستیان بە هەڵەکەی خۆیان کرد)، ئەوانیش هەڵسان، ئەنەس دەڵێ: منیش ڕۆیشتم هەواڵم دا بە پێغەمبەر ﷺ کە ئەوانە ڕۆیشتوون، ئەویش هاتە ژوور، منیش ویستم بچمە ژوور، (هەر ئەو ژوورەی کە خۆی و هاوسەری [زەینەبی کچی جەحشی لێبوون، کە دیارە هەر ئەو شەوو ڕۆژە بووە، گوازراوەتەوە]، بەڵام پەردە خرایە نێوان من و پێغەمبەرەوە ﷺ.

واتە: خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوار، کە لەمەودوا لە پشت پەردەوە، قسە لەگەڵ هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەردا ﷺ بکەن.

لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، کە ئەو سێ کەسە هەر دانیشتوون و بە قسان خافڵاون، زەینەبیش خوا لێی ڕازی بێ کە بووکەو گوازراوەتەوە، پشتی لەوان کردبوو، ڕووی لە دیوارەکە کردبوو، پێغەمبەریش ﷺ دیارە دوو سێ جار هاتۆتەوەو، چۆتەوە دەرێ، تاکو ئەوان فیکریان پێ بشکێ و هەڵسن، بەڵام دیارە لەو جۆرە کەسانە بوون، کە بە ئاسانیی حاڵیی نابن! هەتا خوا ﷻ لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە، ئامۆژگاریی ئەوان و، جگە لە ئەوانیشی کردوە.

ب- **{عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بن الخَطَّاب رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ! إِنَّ نِسَاءَكَ يَدْخُلُ عَلَيْهِنَّ الْبَرُّ وَالْفَاجِرُ، فَلَوْ أَمَرْتَهُنَّ أَنْ يَحْتَجِبْنَ، فَنَزَلَتْ آيَةُ الْحِجَابِ} (أخرجه البخاري: ٤٩١٦، وبلفظ آخر عن مسلم: ١٤٢٨).**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێیان ڕازی بێ)، ڕۆژێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئافرەتەکانت چاك و خراپ لێیان وەژوور دەکەوێ، ئەگەر فەرمانت کردبایە (بە دایکانی بڕواداران) پەردە بگرنەوە[1]، هەتا خوا ئایەتی حیجاب (واتە: ئایەتی پەردەگرتنەوە)ی ناردە خوار.

---

(١) دیارە پێغەمبەر ﷺ هەندێ شت کە زانیبێتی یاسایەکی شەرعیە، تاکو خوا فەرمانی پێ

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

خوا ﷻ بۆ جارى چوارەم لەم سوورەتە موبارەكەدا، ڕوو لە بڕواداران دەكات، بڕواداران دەدوێنێ، دەربارەى چۆنيەتيى هەڵسوكەوتكردنى لێزانانەو، بە سەليقانە، لەگەڵ ماڵى پێغەمبەردا ﷺ، لەگەڵ هاوسەرانى بەڕێزى پێغەمبەردا ﷺ، ئەمە تەوەرە سەرەكييەكەيەتى.

دواييش خوا ﷻ باسى ئەوە دەكات، كە ئايا هاوسەرانى بەڕێزى پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ مەحرەمەكانيشدا، هەر مولزەمن كە پەردە بگرنەوە؟ دەيخاتە ڕوو، كە نەخێر، هەروەها باسى ڕێزو حورمەت و پلەو پايەى بەرزى پێغەمبەر ﷺ دەكات، لە لاى خوا ﷻ كە صەڵاتى بۆ دەنێرێ، هەروەها فريشتەكانيشى، ئنجا دوايى ڕايدەگەيەنێ كە ئەوانەى ئازارى خواو پێغەمبەرەكەى دەدەن، خوا نەفرينى لێكردوون، هەروەها ئەوانەى ئازارى بڕواداران دەدەن بە پياو ئافرەتەوە، ئەوانە گوناهێكى گەورە دەكەن.

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ ﴾، ئەى ئەوانەى بڕواتان هێناوە! مەچنە ماڵەكانى پێغەمبەرەوە ﷺ، مەگەر مۆڵەت بدرێن و بەرەو خواردنێك بانهێشت بكرێن، بەڵام چاوەڕێى پێگەيشتنى مەكەن، واتە: نەچن دابنيشن تاكو چێشتەكە دەكوڵێ، هەتا خواردنەكە ئامادە دەبێ، ﴿ وَلَـٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُوا۟ ﴾، بەڵام ئەگەر بانگكران واتە: خواردنەكە پێگەيى و پێغەمبەر ﷺ كەسێكى بەدواتاندا نارد، بچنە ژوور، ﴿ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟ ﴾، ئنجا ئەگەر خواردنەكەتان خوارد، بڵاوەى لێبكەن، ﴿ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ﴾، هەروەها پێكەوە مەخافڵێن،

---

نەكردبێ، نەيكردوە، بەڵام هەندێك شتى ديكە كە زانيبێتى لە مەوداى عەقڵ و هەڵس و كەوتەكانداىەو، عەقڵ زياتر دەورى تێدا دەبينێ، پێشنيارى خەڵكى وەرگرتوە، چەند جارێك عومەر ئەو پێشنيارەى بۆ كرد، بەڵام وەرى نەگرت، تاكو خوا وەحيى بۆ نارد.

هۆگری یەکدی بن، بەهۆی قسەکردنەوەو وابزانن بەس خۆتانن! ئەوە ماڵی پێغەمبەرە ﷺ، ئەویش قسەیەکی تایبەتیی دەبێ و هەڵس و کەوتێکی تایبەتیی دەبێ لەگەڵ ماڵ و خێزانی دا، پێکەوە هۆگرانە بە قسانەوە، مەخافڵێن، ﴿إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي ٱلنَّبِيَّ﴾، ئا ئەمەتان ئەو شێوە ڕەفتارەتان، پێغەمبەری خوا ﷺ ئازاردەدات، دڵی دەڕەنجێنێ و بێزاری دەکات، ﴿فَيَسْتَحْيِۦ مِنكُمْ﴾، ئەویش شەرمتان لێدەکات، واتە: شەرمتان لێدەکات پێتان بڵێ: من بێزاربووم و، شەرمتان لێدەکات کە ئاگادارتان بکاتەوە: هەڵسن، ﴿وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْيِۦ﴾، بەڵام خوا لە هەق (لە گوتنی هەق) شەرم ناکات، خوا ﷻ خوایە، هەر هەقێک پێویست بێ، دەیفەرموێ، بەو شێوەیە کە بۆ خۆی چاکترو ڕاستتری دەزانێ، ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا﴾، هەروەها هەر کاتێک هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ دایکانی بڕواداران پێویستییەکتان لێ داواکردن، کەل وپەلێک، حەواجێک، ﴿فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ﴾، لە پشت پەردەوە لێیان داوا بکەن، ﴿ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ﴾، ئا ئەو ئاکارەتان، کە لە پشت پەردەوە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بدوێنن، پاکترە بۆ دڵەکانی ئێوەو بۆ دڵەکانی ئەوانیش، ﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ﴾، بۆشتان نیە هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ ئازار بدەن، بە قسەیەک، بە ڕەفتارێک و ئاکارێک، ﴿وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا﴾، هەروەها هەرگیزیش بۆتان نیە لە دوای پێغەمبەر ﷺ هاوسەرەکانی مارە بکەنەوە، ﴿إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا﴾، بە دڵنیایی ئا ئەوەتان لە لای خوا مەزنە، واتە: گوناهێکی مەزنە.

﴿إِن تُبْدُوا۟ شَيْـًٔا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾، ئەگەر شتێك ئاشکرا بکەن، یاخود پەنهانی بکەن، بەدڵنیایی خوا بە هەموو شتێك زانایە، خوا نێو دڵتان دەخوێنێتەوە، نیازو مەبەستتان دەخوێنێتەوە.

ئنجا باسی ئەوە دەکات کە ئایا هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، دەبێ هەر لە پشت پەردەوە، لەگەڵ مەحڕەمەکانیشیان دا قسە بکەن؟

خـوا ﷻ ڕوونی دەکاتـەوە، کە نەخێـر، دەفەرمـوێ: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ﴾، گوناهیـان ناگاتـێ بـە نسـبەت مامەڵەیـان لەگـەڵ بابەکانیانـدا، ﴿وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ﴾، هەروەهـا کوڕەکانیانـدا، ﴿وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ﴾، هەروەهـا برایەکانیانـدا، ﴿وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ﴾، هەروەهـا کـوڕانی برایەکانیانـدا، ﴿وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ﴾، هەروەهـا کوڕانی خوشـکەکانیاندا، ﴿وَلَا نِسَآئِهِنَّ﴾، هەروەهـا ئافرەتانیان، ئافرەتـانی بڕواداردا، ﴿وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ﴾، هەروەهـا ئەوانـەی کـە بەدەسـتیانەوەن، بەردەسـتیانن، واتـە: کۆیلـەو کەنیزەکەکانیانـدا، هەرچەنـدە هەندێکیـان گوتوویانـە: تەنیـا کەنیزەکەکانیان، ئەگەرنـا کۆیلەکانیـان دەبـێ هـەر لـە پشـت پـەردەوە مامەڵەیـان لەگەڵـدا بکـەن، ﴿وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ﴾، ئـەی هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەر! ﷺ پارێزیـش لـە خـوا بکـەن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾، بـە دڵنیایـی خـوا نـاگاداری هەمـوو شـتێکە، چاودێـرە بەسـەر هەمـوو شـتێکەوە.

هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾، مەبەسـت پـەردە گرتنـەوە نیـە، بەڵکـو مەبەسـت مەسـەلەی خـۆ داپۆشـینە، بـە نسـبەت ئەوانـەوە کـە مەحرەمـن، ئەگـەر خۆشـیان دانەپۆشـن واتـە: سەرپۆشـیش دابنێـن، فەیـدێ نـاکات، بـەڵام مـادام بـاس بـاسی پەردەگرتنەوەیـەوە، دیـارە مەبەسـت پێـی ئەوەیـە، ئەگەرنـا بـە تەئکیـد ئافـرەت بـە نسـبەت بـاب و کـوڕو بـراو بـرازاو خوشـکەزاو...هتدەوە، کـە مەحرەمـن، لەسـەری پێویسـت نیـە، وەك چـۆن لـە خەڵـکی دیکـە خـۆی دادەپۆشـێ، لـەوان خـۆی داپۆشـێ، بـەڵام لێـرەدا سـیاقەکە ئـەوە دەگەیەنـێ کـە مەبەسـت پێـی پەردەگرتنەوەیـەو، پەردەگرتنـەوە لەگـەڵ مەحرەمانـدا، لەسـەر هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ پێویسـت نیـە.

ئنجـا خـوا ﷻ بـۆ ئـەوەی بـڕواداران، بـە پیـاوو ئافرەتـەوە بزانـن، کـە پێگـەو پلـەو پایـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە لای خـوا، چەنـدە بـەرزو ناوازەیـە، دەفەرمـوێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ ﴾، بە دڵنیایی خواو فریشتەکانی صەڵات لە سەر پێغەمبەر دەدەن ﷺ، صەڵاتی خوا واتە: خوا پلەی پێغەمبەر ﷺ بەرز دەکاتەوەو بەزەیی پێیدادێ، پاکی دەکاو چاکی دەکات، صەڵاتی فریشتەکانیش ئەوەیە کە ئەوەی خوا بۆ پێغەمبەر ﷺ دەیکات، لە پلە بەرزکردنەوەو بەزەیی و چاك و پاککردن، ئا ئەوەی لە خوا بۆ داوا بکەن، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئێوەش صەڵاتی لێبدەن، با تەواوییش سەلامی لێبکەن، صەڵات لە سەر پێغەمبەر ﷺ واتە: داوای بەزەیی خوا و، پلە بەرزکردنەوە و، پاکیی و چاکیی خوا، بۆ پێغەمبەر ﷺ بکەن، دیسان سەلامی بۆ بنێرن واتە: داوای سەلامەتیی و سەربەرزیی و هێمن و ئاسایشی بۆ بکەن، یاخود سڵاو ڕێزو حورمەتی بۆ پێشانبدەن.

ئنجا باسی ئەوانە دەکات کە ئازاری خواو پێغەمبەرەکەیان ﷺ داوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەدەن، ﴿ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ ﴾، خوا لە دنیاو لە مەنزڵگای کۆتایی دا، لە ڕۆژی دواییدا نەفرینیان لێدەکات، هەم لە دنیادا لە بەزەیی خۆی دووریان دەخاتەوە، هەم لە دواڕۆژدا، چونکە (لَعْن): (هُوَ الطَّرْدُ وَالإبْعَادُ عَلَى سَبِيْلِ السُخَطْ)، (لَعْن) بریتیە لە دەرکردن و دوورخستنەوە بە شێوەی لێ تووڕە بوون، ﴿ وَأَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴾، سزایەکی ڕیسواکەریشی بۆ ئامادەکردوون، ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەدەن.

دیارە ئازاری خوا، بەوە دەدرێ کە هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێ ئەدەبیی بەرانبەر بکرێ، گومانی خراپی پێ ببردرێ، قسەی ناشایستەی بەرانبەر بکرێ.

ئازاری پێغەمبەریش ﷺ دیارە بە قسەی ناشایست، بە ڕەفتاری ناشایست و هەڵسوکەوت و، مامەڵەی نەگونجاو بێ سەلیقانە، دەبێ، یان بە قسەکردن لە بارەی خۆی، یان لە بارەی خێزانەکانی، یان لە بارەی هاوەڵەکانیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)... هتد، هەر شتێك دڵی پێغەمبەری ﷺ لێ خەمبارو ناڕەحەت بێ، هەمووی دەگرێتەوە.

هەموو ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی دەدەن، خوا ﷻ لە دنیاو دواڕۆژدا نەفرینیان لێدەکات، واتە: لە بەزەیی خۆی دووریان دەخاتەوەو، لە دواڕۆژیشدا سزایەکی ڕیسواکەرو زەبوونکەریان بۆ دادەنێ، چونکە ئەوانە بێ ڕێزیی بەرانبەر بە خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، بە حیساب دەیانەوێ لە پێگەی بەرزو بێ وێنەی خوا دابەزێنن، هەروەها دەیانەوێ لە پلەو پایەی ناوازەی پێغەمبەر ﷺ دابەزێنن، خواش بە پێچەوانەی مەبەستەکەی خۆیان، سزایان دەدات، کە بریتیە لە ڕیسواکردن و زەبوونکردن و بچوککردنەوە لە دواڕۆژدا، هەروەها لە دنیاشدا، دووریان دەخاتەوە لە بەزەیی خۆی.

﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ ﴾، ئەوانەش کە ئازاری پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار دەدەن بە شتێك کە نەیانکردوە، واتە: شتێکیان پاڵدەدەنە لا، کە نەیانکردوە، یان قسەیەکیان پاڵدەدەنە لا، کە نەیانگوتوە، یان سیفەتێکیان لێ هەڵدەدەن، کە لێی دوورن، ﴿ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾، ئەوە بە دڵنیایی بوختانێکی مەزن و، گوناهێکی ئاشکرایان هەڵگرتوە.

﴿ بُهْتَٰنًا ﴾، بریتیە لە پاڵدانی کارێك، یان سیفەتێك، یان قسەیەك بۆ لای کەسێك، کە شتێکی ناشیرین و خراپ بێ و، ئەویش نەیکردبێ.

دەربارەی (غیبة) پرسیار کراوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا وەڵامی دەداتەوە و پێناسەی (بهتان)یشی کردوە: {قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا الْغِيبَةُ؟ قَالَ: «ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ»، قِيلَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: «إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ مَا تَقُولُ، فَقَدْ بَهَتَّهُ »} (أخرجه أحمد: ٨٩٧٣، ومسلم: ٢٥٨٩، وأبو داود: ٤٨٧٤).

واتە: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا! غەیبەت چییە؟ فەرمووی: ئەوەیە بە شێوەیەك باسی برایەکەت بکەی کە پێی ناخۆش بێ (پاشملە بە خراپە باسکردن)، گوترا: ئەدی ئەگەر ئەو برایەی کە باسی دەکەم بە خراپە، ئەو

سیفەتەی تێدابێ (ئایا هەر غەیبەتە)؟ فەرمووی: ئەگەر ئەو سیفەتە خراپەی (کە تۆ باسی دەکەی، کە ئەگەر پێی بگاتەوە پێی ناخۆش بێ، سیفەتەکەی) تێدابوو ئەوە غەیبەتە، بەڵام ئەگەر سیفەتەکەی تێدا نەبێ، ئەوە بوختانت پێ کردوە.

واتە: شتێکت بۆ هەڵبەستوە، کە ئەو سیفەتەی تێدانیە، کەواتە: بوهتان کە بە کوردیی دەڵێن: «بوختان» لە غەیبەت گەورەترە، بۆیەش خوا دەفەرموێ: ئەوانەی ئازاری پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار دەدەن، بە شتێك کە نەیانکردوە، ئەوە هەم بوختانێکیان هەڵگرتوەو، هەم گوناهێکی ڕوون و ئاشکراشیان بۆ خۆیان تۆمارکردوەو هەڵگرتوە.

بێگومان خوا ﷻ لەم ئایەتە موبارەکانەدا، کە تەوەری سەرەکییان چۆنیەتیی مامەڵەکردنی بڕوادارانە بە پیاوو ئافرەتەوە - بە تایبەت پیاوان - لەگەڵ هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەردا ﷺ، بۆیە دەڵێین: بە تایبەت پیاوان، چونکە ئاشکرایە پیاوو ئافرەتانی بڕواداران کە کاتی خۆی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازیبێ) بوون، هەر دەبێ ڕێزو حورمەت و ئەدەب و نەجابەت لە مامەڵە لەگەڵ پێغەمبەرو ﷺ ماڵ و خێزانیدا، بەکاربێنن، بەڵام سیاقەکە ئەوە دەخوازێ، کە بە تایبەت مەبەست پیاوانن، چونکە ئافرەتان بۆیان هەبووە بچنە ماڵەکانی پێغەمبەرەوەو، قسە لەگەڵ هاوسەرەکانیدا بکەن و لێیان وەژووربکەون، بەبێ ڕەچاوکردنی پەردە، هەڵبەتە دوای مۆڵەت وەرگرتن، بۆیان هەبووە بچنە لایان و دابنیشن، ئنجا ئافرەتانی پێغەمبەریش ﷺ هاوسەرە بەڕێزەکانی، مولزەم نەکراون بەوەی خۆیان لە ئافرەتان داپۆشن.

ئەوەتا کە خوا دەفەرموێ: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾، (... وَلاَ نِسَآئِهِن) ئافرەتەکانیان، واتە: ئافرەتانی بڕوادار، هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ پابەند نەکراون بەوەوە کە خۆیانیان لێ پشت پەردە بکەن، یان لەبەر ئەوان خۆیان داپۆشن، چونکە

ئافرەتـان لـە یەکـدی مەحرەمـن و، بـۆ یەکـدی ڕەوایـە تەماشـای ئـەو ئەندامانـەی یەکـدی بکـەن، کـە ئابـێ بـۆ پیـاوان دەربخرێـن.

ئـەم ئایەتانـە تـەوەرە سـەرەکییەکەیانە، بـەڵام لـە پەنـای ئـەو تـەوەرە سـەرەکییەی چۆنیەتیـی مامەڵەکـردن لەگـەڵ مـاڵ و خێـزانی پێغەمبـەردا ﷺ، خـوای پـەروەردگار بـاسی ئـەوەشی کـرد کـە پلـەو پایـەو پێگـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە لای خـوا چەنـدە بـەرزە! کـە ئەمـەش دەبێتـە هانـدەری بـڕواداران، بـۆ ئـەوەی زیاتـر ڕەچـاوی ئـەدەب و ڕێـزو حوڕمـەت و نەجابـەت بکـەن، لەگـەڵ ماڵـی پێغەمبـەر ﷺ و، لەگـەڵ خـودی پێغەمبـەری خـوادا.

ئنجـا هـەر بـەو بۆنـەوەش خـوای پـەروەردگار بـاسی ئـەوە دەکات، کـە ئەوانـەی ئـازاری خـواو پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەدەن، خـوا نەفرینیـان لێـدەکات و سـزایەکی ڕیسـواکەری بـۆ دانـاون، بـۆ ئـەوەی خۆیـان بپارێـزن لـە ئـازاردانی پێغەمبـەر ﷺ، ئنجـا چ ڕاسـتەوخۆ، خـۆی، یاخـود قسـەکردن لـە بـارەی مـاڵ و خێزانییـەوە، بـە شـێوازێکی ناشایسـت و خـراپ.

هەروەهـا خـوا بـاسی ئـەوەش دەکات، کـە ئەوانـەی ئـازاری پیـاوانی بـڕوادارو ئافرەتـانی بـڕوادار دەدەن، بـەوە کـە شـتێکیان پاڵدەدەنـە لا، کـە نەیانکـردوە، ئەوانەش بـە هەڵگـری بوختـان و هەڵگـری گوناهێـکی ئاشـکرا لـە قەڵـەم دەدرێـن، چونکـە وەك چـۆن ئـازاردانی پێغەمبـەر و ﷺ هاوسـەرانی و مـاڵ و خێـزانی، گوناهـە، بـە هەمـان شـێوە، ئـازاردانی پیـاوانی بـڕوادارو ئافرەتـانی بڕوادارییـش، هـەر گوناهـە، واتـە: تـەوەرە سـەرەکییەکە، چۆنیەتیـی مامەڵەکردنـە لەگـەڵ مـاڵ و خێـزانی پێغەمبـەردا ﷺ، بـەڵام بـەو بۆنـەوە، ئـەو شـتانەی دیکـەش لـە پەراوێـزدا باسـکراون.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**چەنـد ڕێنماییـەك بـۆ چۆنیەتیـی مامەڵەکـردنی مسـوڵمانان، لەگـەڵ مـاڵ و خێزانـەکانی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ، لـە بـواری خـواردن و خـۆراك و دانیشـتنی بـەرو مەجلیـس و، داواکـردنی کـەل وپـەل و، حەواجێـك لـە دایـکانی بـڕواداران (خـوا لێیـان ڕازیبـێ):**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَـٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُواْ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ ۖ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَـٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ إِن تُبْدُواْ شَيْـًٔا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٥٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شازدە بڕگەدا:

**١)- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕوایان هێناوە! ئەمە جاری چوارەمە لەم سووڕەتە موبارەکەدا، کە خوا بە نازناوی ئیمان بانگی مسوڵمانان دەکات، جاری چوارەمە لە حەوت جاران.**

لێـرەدا قسـەکەی عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازیبـێ)، بـە بیـر خۆمـان بێنینـەوە کـە دەڵـێ: هـەر جارێـك کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا

ﭐلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئـەی ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوە! دەبـێ ئینسـانی مسـوڵمان گـوێ قـوڵاغ بێـت، بـاش سـەرنجبدات و گـوێ هەڵخـات، چونکـە خـوا هیـچ جارێـك بانگـی بـڕواداران نـاکات، مەگـەر یـان ئەرکێکیـان پـێ دەسـپێرێ جێبەجێـی بکـەن، کـە لـە بەرژەوەندیـی دنیـاو قیامەتیانـە، یـان قەدەغەیەکیـان پـێ دەڵـێ خۆیـانی لـێ دووربگـرن، کـە بـە زیـانی دنیـاو دوا ڕۆژیـان تـەواو دەبـێ.

٢)- ﴿لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ ﴾، (ئەی ئەوانـــەی بڕواتان هـــێناوە!) مەچنە ماڵــەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ.

٣)- ﴿إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ ﴾، مەگەر مۆڵەت بدرێن بۆ خواردنێك، واتە: بانگهێشت بکرێن بۆ خواردنی خۆراکێك، ﴿يُؤۡذَنَ لَكُمۡ ﴾، مادام بەرکاری خواستوە بە (إلى) مانای (تُدْعَوْن)ەی خراوەتە نێو، ﴿يُؤۡذَنَ لَكُمۡ ﴾، یانی: بانگ بکرێن (تُدْعَوْنَ)، مۆڵەت بدرێن بەرەو خواردنێك و بانگهێشت بکرێن، لە زمانی عەرەبییدا بنچینەیەك هەیە، پێی دەگوترێ: (تضمين) خستنە نێو، جاری وا هەیە کردارێك کە عادەت نیە بە پیتێك تەعەددا بکات بۆ بەرکار (مفعول به) کاتێك بەو پیتە بەرکار دەخوازێ، وێڕای مانا ئەسڵییەکەی، مانایەکی دیکەش دەگەیەنێ، لێرەش: ﴿يُؤۡذَنَ لَكُمۡ ﴾، عادەت نیە بە پیتی (إلى) تێپەڕ بکات و، بەرکار بخوازێ، ئنجا کە لێرەدا بە (إلى) بەرکاری خواستوە، مانای بانگ دەکرێن (تُدْعَوْن)ی خراوەتە نێو، کەواتە: خوا دەفەرموێ: ئەی بڕوادارینە! مەچنە ماڵەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ مەگەر مۆڵەت بدرێن و بانگهێشت بکرێن، بۆ بەهرەمەندبوون لە خواردن و خۆراکێك کە لە ماڵی ئەواندا ئامادەکراوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ ﴾، ئـەم تەعبیـرە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی مـاڵ هـی پیـاوەو پاڵدەدرێتـە لای پیـاو، دەگوتـرێ: ماڵـی فلانکـەس، بـەڵام یەکێـك بـۆی هەیـە بڵـێ: ئـەدی بۆچـی لـە ئایەتـەکانی پێشـتردا، خـوا لـە کاتی دوانـدنی هاوسـەرەکانی پێغەمبـەردا ﷺ فەرمـووی: ﴿ وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ ﴾، لـە ماڵـەکانی خۆتانـدا نیشـتەجێ بن، ئەی هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەر! ﷺ لـە وەڵام دا دەڵێیـن: ئەمـە وەك پاڵـدانی ماڵـە، بـۆ لای کەسـێك کە لەو ماڵـەدا نیشـتەجێیە، نـەك خـاوەنی بـێ، توێـژەرەوان هەندێکیـان ئـاوا دەڵێـن.

بەڵام من پێموایە: دەگونجێ ماڵ پاڵبدرێتە لای پیاو، بەو ئیعتیبارە کە ئەو خاوەن و مشوورخۆریەتی و، دەبێ پەیدای بکات: ﴿ أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ ﴿٦﴾ ﴾الطلاق، ﴿ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ﴿٢٣٣﴾ ﴾البقرة، دابینکردنی خواردن و خۆراك و پۆشاك و جێگەو ڕێگە، لەسەر پیاوە، لەسەر بابە بۆ منداڵەکانی و، لەسەر مێردە بۆ ژنەکەی، بەڵام ئەوە مانای وانیە کە ژنیش بەشی بەو ماڵ و حاڵەوە نیە، بۆیە ماڵەکان پاڵدراونە لای هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ، لێرەش پاڵدراونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، وەك خاوەندارێتیی دیارە پیاو خاوەنە، بەڵام ئافرەتیش پشك و بەشی هەیە بەو ماڵ و حاڵەوە.

ئنجا ئایا هەر کاتێك مۆڵەتدران و بانگهێشت کران بۆ خواردنێك، دەبێ پێش وەخت بچن؟ نەخێر، خوا دەفەرموێ:

٤)- ﴿ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ ﴾، چاوەڕێکەرانەی پێگەیشتنی، مەبن.

نابێ چاوەڕێی پێگەیشتنی بکەن، یانی: (غَيْرَ مُنْتَظِرِيْنَ وَقْتَ نُضْجِهِ)، واتە: چاوەڕێکەری کاتی پێگەیشتنی خواردنەکە مەبن، پێش وەخت بچن لەوێ دابنیشن، تاکو خواردنەکە سەعاتێکە دوو سەعاتە پێدەگات، کەواتە: وشەی (إِنَاهُ: مَصْدَر أَنَى الشَّيءُ، أي: حَانَ)، (إِنَاهُ) چاوگە، واتە: شتەکە پێگەیشت، یان وەختی هات، کاتی هات، هەندێکیان دەڵێن: (إِنَاهُ) واتە: کاتی پێگەیشتن و کوڵان و ئامادە کردنی ئەو خواردنە.

٥)- ﴿ وَلَـٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا ﴾، بەڵام ئەگەر بانگهێشتکران بچن، (وَلَكِنْ: للإسْتِدْرَاك) (لكن) بەڵام، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەیە کە وەك چۆن نابێ لە پێش وەختی پێگەیشتنی خواردنەکەدا مرۆڤ بچێ، واش باشە لە دوای بانگکرانەش دوانەکەوێت و لە کاتی خۆیدا بچێ، بۆ ئەوەی خواردنەکە سارد نەبێتەوە، یان ئەوانی دیکەی کە لەوێن، یان خاوەن ماڵ چاوەڕێ نەکات، بە داخەوە هەندێ کەس ئەو سەلیقەیەی نیە، جاری وا هەبووە کە بانگهێشتکراوە، خواردن دانراوەو وایانزانی لە کاتی خۆیدا دێ، دوایی ساربۆتەوە، یاخود بە پێویست زانراوە دووبارە گەرم بکرێتەوە، کە ئەوە بێ سەلیقەییە، بە پێی

ئەم ئایەتە موبارەکانە، وا باشە ئینسان نەپێش وەخت بچێ، بە تایبەتیی کە بزانێ ئەو ماڵە سەرقاڵی ئامادەکردنی خواردنەکەن، یاخود کاری دیکەیان هەیە، هەروەها لە کاتی پێگەیشتنی خواردنەکەش، دوانەکەوێ، واتە: بە وردیی لەو کاتەدا بچێ، کە خواردنەکە پێگەیشتوەو، لەو کاتەدا کە خاوەن ماڵ چاوەڕێ دەکات، وا باشە لە کاتی خۆیدا ئەو کەسەی بانگهێشتکراوە بۆ خواردن، بچێ.

٦)- ﴿ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟ ﴾، ئنجا ئەگەر خواردنتان خوارد، بڵاوەی لێبکەن، (فَإِذا طَعِمْتُم: أكَلْتُم)، (فَٱنتَشِرُوا۟)، (الإنْتِشَارُ: يُطْلَقُ عَلَى الخُرُوجِ مَجَازاً)، (إنتشار): بەکارهێنراوە بۆ چوونە دەر، واتە: بڵاوەی لێبکەن و بچنەدەر، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مۆڵەتدران بۆ چوونە ژووری ماڵێك و، بانگهێشتکردن بۆ خواردنێك، تەنیا بۆ ئەو کاتەیە کە ئەو مرۆڤە بانگدەکرێ بۆ خواردن لەو ماڵەدا و پەیوەستە بەوێوە، بەڵام کە خواردنەکەی خوارد، کە ئەوی بۆ بانگکراوە، حاڵەتەکە دەگەڕێتەوە سەر ئەصڵی خۆی، کە ئەو خاوەن ماڵە پێویستە ئازاد بێ، لەگەڵ ماڵ و حاڵی خۆی داو، ئەو کەسانەی بانگهێشتکراون بۆ ئەو ئامانجە، کە بریتیە لە خواردن، یان خواردنەوەی شتێك، دوای جێبەجێکردنی ئەو کارەو، ئەنجامدرانی ئەو نانخواردنە، کە تەواو دەبێ، دۆخەکە دەچێتەوە بۆ حاڵەتی پێشێ، کە ئەصڵ ئەوەیە خاوەن ماڵەکان ئازادبن لە چوار چێوەی ماڵەکەی خۆیانداو، کەس سەغڵەتیان نەکات و تەنگیان پێ هەڵنەچنێ.

٧)- ﴿ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ﴾، هەروەها بە قسە کردنەوە هۆگری یەکدی مەبن، کە دەفەرموێ: ﴿ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ ﴾، واتە: چاوەڕێی کوڵان و پێگەیشتنی مەکەن، ﴿ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ﴾، (و)ی بادانەوە، ئەم ڕستەیە بادەداتەوەو دەیگێڕێتەوە، بۆ ئەوێ، واتە: نە چاوەڕێی پێگەیشتنی بکەن و، نە بەیەکدی هۆگرانەوە بە هۆی قسە کردنەوەش بمێننەوە، دوای نان خواردن، (الإسْتِئْنَاس: طَلَبُ الأُنْسِ مَعَ الغَيْر)، (إستئناس) داوای ئولفەت و هۆگرییە لەگەڵ هی دیکەدا.

﴿ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ﴾، (ل)ی سەر (لحَدِيث) (لام العلة)ەیە واتە: (وَلَا مُسْتَأنِسِيْنَ مِنْ أجَلِ الحَدِيث)، واتە: هۆگری یەکدی مەبن، بە هۆی قسەکردنەوە، بە قسەکردن و چوونە نێو باس و خواسەوە، لە کاتێکدا خاوەن ماڵ ئەو

میوانانـەی بانگکـردوە بـۆ خـواردن، دوای ئـەوەی خـواردن خواردنەکـە تـەواو دەبـێ، نابـێ بـە قسـانەوە بخافڵێـن و ڕەزای خۆیـان گـران بکـەن و، سـێبەری خۆیـان قـورس بکـەن، لـە لای خـاوەن مـاڵ، بـەوە کـە ئازادیـان لـێ تەسـك بکەنـەوەو، تەنگیـان پـێ هەڵبچنـن.

٨)- ﴿إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي ٱلنَّبِيَّ﴾، ئا ئەوەتان ئازاری پێغەمبەر دەدات، ئەو ڕەفتارەتان کە پێش ئەوەی خواردنەکە پێ بگات، بچن چاوەڕێ بن و، دوای ئەوەی خواردیشتان بە قسانەوە بخافڵێن، هۆگرانە بە یەکدییەوە بە قسانەوە بخافڵێن، ئەوە ئازاری پێغەمبەر ﷺ دەدات.

٩)- ﴿فَيَسْتَحْيِۦ مِنكُمْ﴾، پێغەمبەریش ﷺ شەرمتان لێ دەکات، واتە: شەرمتان لێ دەکات کە پێتان بڵێ: بە مانەوەی ئێوە، یان بە خافڵانی ئێوە بە قسانەوە، سەغڵەتم، یان ماڵ و منداڵم سەغڵەتەو، ئاگادارتان بکاتەوە!

(إبـن عاشـور) ئـەم ڕسـتەیەی: ﴿فَيَسْتَحْيِۦ مِنكُمْ﴾، ئـاوا تەفسـیر کـردوە دەڵـێ: [أي: لَا تَحْضُرُوا الْبُيُوتَ لِلطَّعَامِ قَبْلَ تَهْيِئَةِ الطَّعَامِ لِلتَّنَاوُلِ، فَتَقْعُدُوا تَنْتَظِرُونَ نُضْجَهُ][1].

واتـە: لـە ماڵـەکانی پێغەمبـەردا ﷺ پێـش ئامادەکـردنی خـۆراك مەچنـە مـاڵان و دامەنیشـن، چاوەڕێـی کـوڵان و پێگەیشـتنی بکـەن.

هەروەهـا کـە خواردنەکـەش دەخـورێ، پێویسـتە بـڵاوەی لێبکـرێ، بـۆ ئـەوەی میوانـەکان سـێبەری خۆیـان گـران نەکـەن، ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: ئـا ئـەو ڕەفتارەتـان، ئەگـەر بـەو شـێوەیە بکـەن -کـە خـوا دەفەرمـوێ وا مەکـەن- ئـەوە ئـازاری پێغەمبـەر ﷺ دەدات و، ئەویـش شـەرم دەکات لـەوەی پێتـان بڵـێ: مـن بەوە بێزارم و سـەغڵەتم.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿يُؤْذِي ٱلنَّبِيَّ﴾، وشـەی، (الأذَى: كُلُّ مَا يُسِيءُ قَوْلًا أو فِعْلًا)، (الأذَى) بریتیـە: لـە هـەر شـتێك کـە مـرۆڤ ناڕەحـەت بـکات بـە قسـە بـێ، یاخـود بـە

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٢، ص٨٢.

ڕەفتار بێ، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ ﴾، ئەمە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو هەست و خەیاڵەیە کە پێیان وابوو بێ، پێغەمبەر ﷺ ڕازییە بە مانەوەی ئەوان، بە بەڵگەی ئەوەی بێ دەنگە! نا، بێدەنگیی جاری وا هەیە لەبەر شەرمکردنەو، لەبەر زێدە ڕێزو نەجابەت و خانەدانییە ئەو مرۆڤە قسە ناکات، بەڵام مەرج نیە ڕازیبێ.

١٠)- ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾، خواش شەرم لە هەقێ ناکات، (حق) یانی: شتی ڕاست و چەسپاو، پێچەوانەی (بَاطِل)ە، واتە: شتی پووچ و بێ بنەما، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾، واتە: (واللهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنْ إِظْهَارِ الحَقِّ، وقَوْلُ الحَقِّ وبَيَان الحَقِّ) واتە: خوا شەرم ناکا لەوەی هەقێ دەربخات، هەقێ ڕوون بکاتەوەو هەقێ بفەرموێ.

ئەم تەعبیری: ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾، هاوەڵان دوایی وەك تەعبیرێك بەکاریان هێناوە، وەك لە هەندێ فەرمایشتدا هاتووە، بۆ وێنە: [جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ اللهِ لا يَسْتَحِي مِنَ الْحَقِّ، هَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ مِنْ غُسْلٍ إِذَا هِيَ احْتَلَمَتْ؟ قَالَ: نَعَمْ، إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ] (أخرجه البخاري: ٥٧٧٠، ومسلم: ٧٣٧).

واتە: ئوممو سولەیم (خوا لێی ڕازیبێ) هاتە لای پێغەمبەرو ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ خوا شەرم لە گوتنی هەقێ ناکات، ئایا ئافرەت غوسڵی لەسەر پێویستە، کاتێك ئحتیلامی بوو؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر ئاوی بینی، ئەگەر ئحتیلامی بوو و، ئاوی هاتبۆوەو پێویستە خۆی بشۆرێ.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسێکی دیکەی پەیوەست بە چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ ماڵەکانی پێغەمبەردا ﷺ، لە لایەن مسوڵمانانەوە، دەفەرموێ:

١١)- ﴿ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ﴾، هەروەها هەر کاتێك پێویستیی و حەواجێکتان لێ داواکردن (لە دایکانی بڕواداران، هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ)، لە پشت پەردەوە لێیان بخوازن، (مَتَاع) وشەیەکی گشتییە بۆ هەر شتێك کە لە قاپ و قاچاغ و کەل و پەل، هەروەها لە پێداویستییەکانی دین و ژین، داوا دەکرێ، بۆیە هەندێ لە زانایان

وایان لێکداوەتەوە، کە مەرج نیە هەر بۆ داواکردنی کەل و پەل و شمەکێك و پێویستییەکی ماڵ بێ، هی ژیان و گوزەرانی دنیا، بەڵکو بە پێی ئەو ڕایە ئەگەر پرسیارێکیشیان هەبێ، لە بارەی کاروبارێکی دینداریەوە، ئەویش هەر دەگرێتەوە، چونکە ئەویش (مَتَاع)ە، واتە: مایەی بەهرەمەندبوونی مرۆڤە لە ڕووی مەعنەوییەوە.

کە دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَـٰعًا﴾، وشـەی (هُـنَّ)، دەگەڕێتـەوە بـۆ لای هاوسـەرانی پێغەمبـەر ﷺ کـە لـە بـاسی (بُيُوتَ) دەفامرێتـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ﴾، بۆچـی؟ چونکـە هاوسـەرە بەڕێـزەکانی پێغەمبـەر ﷺ لـەو ماڵانـەدان، ئنجـا بەڵـێ تاکـو ئێـرە، بـە ڕاشـکاویی نـاوی هاوسـەرانی پێغەمبـەر ﷺ نەهاتـوە، بـەڵام ڕانـاوی (هُـن) لـە: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَـٰعًا﴾، هـەر دیـارە کـە پەیوەسـتە بـە ماڵـەکانی پێغەمبـەرو ﷺ هاوسـەرانی بەڕێزیـەوە (خـوا لێیـان ڕازیبـێ).

کە دەفەرموێ: ﴿فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ﴾، لە پشـت پەردەوە لێیـان داوا بکەن، حیجـاب واتـە: پـەردە، نێـوان، (الحِجَاب: السِّتْرُ المُرْخَى عَلَى بَابِ البَيْتِ)، (حجـاب) ئـەو پەردەیـە کـە بـە دەرگادا دراوەو، دەرگاش بکرێتـەوە، تاکـو پەردەکـە لانـەدەی، نێوماڵ دەرناکـەوێ، یاخـود جـاری وایـە کەسـێك بـەس ژوورێـکی هەیـەو، ژوورەکـە دەکاتـە دوو بـەش و، پەردەیـەکی بـە نێـودا ڕادەهێڵـێ، ئەویـش هـەر دەگونجێ.

توێـژەرەوانی قوڕئـان و ڕوونکـەرەوانی مانـاکانی قوڕئـان، دەڵێـن: (كَانَـتِ السُّتُور مُرْخَاة عَلَى أَبْوَاب بُيُوتِ النَّبِيِّ الشَّارِعَةِ إِلَى المَسْجِد) واتـە: عـادەت وا بـووە ماڵـەکانی پێغەمبـەر ﷺ کـە دەرگایـان بەسـەر مزگەوتـەوە بـووە، پەردەیـان پێـدا دراوە، پێشـێ هـەر دەرگابـوو، ئەگـەر کرابایـەوە، یەکسـەر نێـو ماڵەکـە دەردەکـەوت، هەر کەسـێکی لێبایـە، بـەڵام دوایـی پـەردە دادرا بـۆوە بەسـەر دەرگاکانـداو، لـە پشـت دەرگاکـەوە ئەگـەر دەرگاشـت کردبایـەوە، تاکـو پەردەکـە لانەدرابایـە، دەرنەدەکـەوت، یەکسـەر ڕووی دەرگاکانیـش بەسـەر مزگەوتـەوە بـووە.

ئنجـا ئایـا دەرگای دیکەشـیان هەبـوون، یـان هـەر ئـەو دەرگایانـە بـوون؟ وا پێدەچـێ بـەس ئـەو دەرگایانـە بووبـن، کـە بەسـەر مزگەوتـەوە بـوون.

١٢)- ﴿ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ﴾، ئا ئەوەتان (بەو شێوەیە مامەڵەکردنەتان کە لە پشت پەردەوە داوا لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بکەن، ئەگەر پرسیارێکتان بوو، ئەگەر کارێك، پێویستییەکتان بوو)، پاکترە بۆ دڵی ئێوەو، دڵی ئەوانیش.

١٣)- ﴿ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ ﴾، هەرگیزیش بۆتان نیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئازار بدەن و بێزارو ناڕەحەتی بکەن.

١٤)- ﴿ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا ﴾، هەروەها هەرگیزیش بۆتان نیە لە دوای خۆی هاوسەرەکانی مارە بکەنەوە، هاوسەرگیریی لەگەڵ هاوسەرانی دا بکەن، دوای ئەوەی ئەو کۆچیی دوایی دەکات.

١٥)- ﴿ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا ﴾، بە دڵنیایی ئا ئەمەتان لە لای خوا، زۆر مەزنە، واتە: تاوانێکی زۆر مەزنە، کەسێك تەماعی وابێ، کە یەکێك لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ دوای کۆچی دوایی خۆی، مارە بکاتەوە، حەڕامە.

١٦)- ﴿ إِن تُبْدُوا شَيْئًا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴾، ئەگەر شتێك ئاشکرا بکەن یاخود پەنهانی بکەن، بە دڵنیایی خوا بە هەموو شتێك زانایە.

ئەمە تەعبیرێکی گشتییەو کۆکەرەوەیە، وەك هاندان لە لایەکەوەو لەلایەکی دیکەوەش، وەك هۆشداریی پێدان، هەروەها جۆرێك لە هەڕەشەشی گرتۆتە نێو خۆی، کە خوا قسەو کردەوە ئاشکراو، پەنهان و شێردراوەکانتان دەزانێ و، دەبیستێ و دەبینێ.

## چـوار سەرنجی گرنگ

١)- خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا ﴾، هەر کاتێك خواردنتان خوارد (لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ) بڵاوبن، واتە: بڵاوەی لێبکەن و بچنەدەر، ئەمە چەند شتێکی لێوەردەگیرێ:

أ- چوونە ژووری ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ، هەروەها ماڵی هەر کەسێکی دیکە، قەدەغەیە، بەڵام ڕەوا کراوە لە حاڵەتی بانگهێشتکردندا بۆ خواردن، کەواتە: کاتێ خواردنەکە تەواو دەبێ، هۆکاری ڕەوا کردنەکە نامێنێ و، حاڵەتەکە دەگەڕێتەوە سەر دۆخە ئەصڵییەکەی خۆی کە بریتیە لە: قەدەغەبوون.

ب- هەروەها ئەم ڕستە قورئانییە بەڵگەی ئەوەشی تێدایە، کە بابای میوان ئەوەی دەیخوات، موڵکی خانەخوێیە دەیخوا، نەك موڵکی خۆی بێ، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا ﴾، (فَلَمْ يَجْعَل لَهُ أَكْثَرَ مِنَ الأَكْلِ)، هەرکاتێ خواردنتان خوارد بڵاوەی لێبکەن، واتە: زیاد لەوەی کە پێ دەخورێ، بەشی بەو خواردنەوە نیە.

هەڵبەتە ئەوە لە حاڵەتی ماڵاندایە، بەڵام کەسێك لە چێشتخانەیەك خواردن دەکڕێ و پارەی خۆی دەدات، ئەوەی کە لێی زیاد دەبێ، ئەگەر بیپێچێتەوە بۆ ئەوەی خەسار نەبێ، ئەوە نەك هەر ڕەوایە، بەڵکو شتێکی باشیشە، چونکە لە بەرانبەری دا پارە دراوەو هەقی خۆیەتی، بەڵام کەسێك لە ماڵی کەسێك خواردن دەخوات، هەر ئەوەندەی بەش پێوەیە کە دەیخوات، لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێین: (میوان ڕزقی خۆی لەگەڵ خۆی دێنێ)، بەڵام ئەو قسەیە بە ڕەهایی ڕاست نیە، خانە خوێ بە هێزی شانی خواردنەکەی ساز کردوە، مەعقووڵ نیە بابای میوان لێی بکاتە بێ منەتیی و بڵێ: ڕزقی خۆمەو لەگەڵ خۆمدا هێناومە! ئەوە هەر شتێکی عورفییە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا بابای میوان کە ماڵی خانە خوێیەکە دەخوات، موڵکی ئەوە دەیخوات، بەڵام بە بانگهێشتی ئەو و بە مۆڵەتی ئەو، بۆی هەیە بایی ئەوەندەی بۆی دەخورێ، بیخوات.

ج- هەر کۆبوونەوەیەك، سەردانێك بۆ هەر مەبەستێك بێ، پێویستە دوای هێنانەدی ئامانجەکە کۆتایی پێبێ، لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ ﴾، ئەگەر خواردنەکەتان خوارد، بڵاوەی لێبکەن، کەواتە: هەر کۆبوونەوەیەکی دیکەش، کاتێ کۆبونەوە دەکرێ بۆ چایی خواردنەوەیەك، بۆ میوە خواردنێك، سەردانی نەخۆشێك، هەر کۆبونەوەیەك، دوای ئەوە کارەکەی تەواو دەبێ، وا باشە بڵاوەی لێبکرێ.

٢)- کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّ ﴾، ئا ئەوەتان کە لە پشت پەردەوە، داوای شتێك لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر بکەن، پاکترە بۆ دڵی ئێوەو دڵی ئەوانیش.

ئەمەش چەند شتێکی لێوەردەگیرێ:

أ- خوای پەنهانزان هەقی ڕووت و ڕەهای لە لایەو، خاتری کەس ناگرێ، لە گوتنی هەقدا، خوا بە ڕوون و ئاشکرایی دەفەرموێ: ئەوە باشترە بۆ دڵی ئێوەش و، دڵی ئەوانیش، بۆ ئەوەی خەتەرەیەکی خراپتان لە دڵدا پەیدانەبێ، ئێوە بەرانبەر بە ئەوان، یاخود ئەوان بەرانبەر بە ئێوە، ئەوە ئەگەر ئێمە بین، هەرگیز شتی وا ناڵێین، بەڵام خوا ﷻ: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡ ﴿٢٩﴾ ﴾الکهف، بڵێ هەقی ڕەها لە لای پەروەردگارتانەوەیە، خوا شەرم لە کەس ناکات.

ب- هەرچۆنێك بێ مرۆڤەکان، وەهم و خەیاڵی گوناهیان هەر هەیە، مادام خوا بەرانبەر بە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازیبێ)و دایکانی بڕواداران (خوا لێیان ڕازیبێ) ئەو تەعبیرە بەکاردێنێ، کەواتە: مرۆڤ نابێتە فریشتەو هەرچۆن بێ، وەهم و خەیاڵی گوناهی هەر هەیەو، دەبێ خۆی بپارێزێ.

ج- نەبینرانی مرۆڤ، هۆکاری ئەوەیە کە زیاتر وێنای مەعنەویی بکرێ، نەك ماددیی، دایکانی بڕوادارانیش بەو شێوازە، پێگەو ڕێزی مەعنەویی شایستەیان زیاد دەکات، هەر ئەوەش هۆکاری ئەوەیە کە زۆر جاران دەستەڵاتداران کەم خۆیان پێشانی خەڵك دەدەن، بۆ ئەوەی خەڵك وێنەیەکی هێمایی و مەعنەویی، خەیاڵییان لە بەرانبەریان دا بۆ پەیدا ببێ!

کەواتــە: ئــەوە حیکمــەتی ئەوەیــە کــە خــوا ﷻ دوای ئــەوەی مســوڵمانان زۆر بــوون، خەڵکێـکی زۆر هاتۆتـە نێـو ئیسـلامەوە، ئـەو پەروەردەیـەی پێشـێ نەکـراون، ئـەو پـەروەردە ڕووحیـی مەعنەویـی و ئاکارییـەی پێشـێ، خەڵکێکی زۆر تـازە هاتـوە مســوڵمان بــووە، ڕەنگــە هــە بووبــێ هــەر مســوڵمانیش نەبووبــێ و بــە ڕواڵــەت خـۆی بـە مسـوڵمان پێشـاندابێ، ئنجـا ناکـرێ ئەوانـە هەموویـان هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ببینـن، کـە ژیانێـکی سـادەو، بـەرگ و پۆشـاکێکی سـادەو، حاڵێـکی سـادەیان هەبـووە، بۆیـە خـوا ﷻ لـەو قۆناغـەدا کـە کۆتایـی سـاڵی شەشـەمی کۆچییـە، کـە وردە وردە کۆمەڵـگای ئیسـلامیی فراوانـتر بـووە، خەڵـکی زۆر هاتۆتـە نێـو ئیسـلامەوە، ئـەم یاسـایەی دانـاوە کـە هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ پێویسـتە هەمـوو کـەس لێیـان وەژوور نەکـەوێ و، ڕووبـەڕوو قسـەیان لەگەڵـدا نـەکات، تاکـو ڕێـزو حورمـەت و هەیبەتیـان پارێزراوبـێ.

٣)- قسەیەکی عائیشە لە بارەی ڕەزاگرانانەوە: {قَالَتْ: عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهَا: حَسْبُكَ فِي الثُّقَلاءِ أنَّ اللَّهَ تَعَالَى لَمْ يَحْتَمِلْهم}[1].

واتــە: دایکــمان عائیشــە (خــوا لێــی ڕازیبــێ) دەڵــێ: ئەوەنــدەت بەســە بــۆ ڕەزاگرانــان، بــۆ ســێبەر قورســان، [ئەوانــەی خەڵــکی جــاڕس دەکــەن، خەڵــکی بێــزار دەکـەن، بـە هـۆی زۆر مانـەوە، یـان بـە هـۆی زۆر هاموشـۆکردنیانەوە]، کـە تەنانـەت خـوای بـەرز تەحەممـولی نەکـردوون، خـوای بـەرز لێیـان بـێ دەنـگ نەبـووە.

کەواتــە: دەبــێ بزانــرێ کــە مانــەوە لــە ماڵــی خەڵــك دا، بەبــێ پێویســتیی و، بێزارکـردن و سـەغڵەت کردنیـان، شـتێکی خراپـە، ئنجـا ئـەوەش پلـە پلەیـە، دەگونجێ ناپەسـندبێ، دەشـگونجێ حـەڕام بـێ، کاتێـك کـە ببێتـە هـۆی ئـەوەی ئـەو خانـە خوێیـە زۆر ئـازار بـدرێ و بێـزار بکـرێ و سـەغڵەت بکـرێ، ئـازاردانی مسـوڵمانانیش حەڕامـەو قەدەغەیـە، کەواتـە: ئـەو مرۆڤـە کارێـکی قەدەغـەی ئەنجامـداوە.

---

(١) إعراب القرآن الكريم: ج٨، ص ٤٢. تأليف: محي الدين الدرويش.

٤)- ڕستەی: ﴿فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ﴾، لە پشت پەردەوە داوایان لێبکەن، دوو ڕاستییان دەگەیەنێ:

أ)- ئەوە دەگەیەنێ کە دروستە دایکانی بڕواداران لە پشت پەردەوە پرسیاریان لێبکرێ و داوایان لێبکرێ، بۆ هەر پێویستییەك کە دێتە پێش، یاخود پرسیارێك کە لێیان دەکرێ، ئەوان زانیاریی و وەڵامەکەیان لە لایە.

ب)- هەروەها لەم ڕستەیە وەردەگیرێ کە شایەدیی دانی بابای کوێر دروستە، هەروەها بابای کوێر کە هاوسەرێکی هەیە، بەڵام بەهۆی دەنگیەوە دەیناسێتەوەو بە هۆی قسەکردنیەوە دەیناسێ، بۆی ڕەوایە کە لەگەڵیدا جووت بێ، لەبەر ئەوەی بە هۆی دەنگەوە دەیزانێ و دەیناسێ، ئەگەرنا نایبینێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**خستنەڕووی ئەو ڕاستییە کە دایکانی بڕواداران (خوا لێیان ڕازیبێ)، بۆیان هەیە، بەشێوەی ئاسایی لەگەڵ مەحرەمەکانیاندا تێکەڵ بن و هەڵس و کەوت بکەن، باب و کوڕو، براو برازاو، خوشکەزاو ئافرەتان و بەردەستەکانیان، ئەمە بۆ لابردنی سەغڵەتییە لەسەر هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ لە لایەکەوەو، لەسەر مەحرەمەکانیشیان کە ناگونجێ باب و کوڕو برازاو خوشکەزا، ئەوانە نەتوانن هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ ببینن، یاخود ئەوان بیانبینن، کە ئەو کاتە جۆرێك دەبێ لە پچڕانی پەیوەندیی خزمایەتیی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِىٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ ۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا ﴿٥٥﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دە بڕگەدا:**

١)- ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ﴾، گوناهیان ناگاتێ و سەغڵەتییان ناچێتە سەر، بە تەئکید مەبەست هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرە ﷺ.

(الطبري) دەڵێ: [لَا حَرَجَ عَلَى أَزْوَاجِ رَسُولِ اللهِ: (فِىٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ)، وَلَا إِثْمَاً، فِي وَضْعِ جَلَابِيبِهِن، وَتَرْكِ الإِحْتِجَابِ عَنْهُمْ)[1].

واتە: هاوسەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ گوناهیان ناگاتێ بە نسبەت بابەکانیان، کوڕەکانیان، براکانیان، کوڕانی برایان، کوڕانی خوشکەکانیان، بە نسبەت ئافرەتەکانیان و، بەردەستەکانیانەوە، (کۆیلەو کەنیزەکەکانیان)، لەوەدا کە جیلبابەکانیان دابنێن، هەروەها کە پەردە نەگرنەوە لە بەرانبەریان دا بۆ قسە لەگەڵدا کردنیان.

---

(١) جامع البیان برقم :٢٨٦٥١، ٢٨٦٥٢.

خـوای پـەروەردگار حـەوت جـۆرە کـەس بـاس دەکات کـە ئەوانـە یـان مەحرەمـن، یاخـود حوکمـی مەحرەمیـان هەیـە بـۆ هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ بـە نسـبەت پێویسـت نەبـوونی پەردەگرتنـەوە، یاخـود لـە پشـت پـەردەوە قسـە لەگـەڵ کردنیـان، هەروەهـا بـە نسـبەت ئـەوەوە کـە خۆیانیـان لـێ دانەپۆشـن، بەو خـۆ لێ داپۆشـینەی کـە لـە خەڵکی نامەحـرەم، دادەپۆشـن، ئنجا جیلبابـە سەرپۆشـە، هەرچـی هەیـە.

کەواتـە: حـەوت جـۆرە کـەس بـۆ هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەری خـوا (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، هەڵاوێـرراون لـەوە کـە پێویسـت بـێ لـە ئاسـتیان دا پـەردە پـۆش بـن و لـە پشـت پـەردەوە نەبـێ نەیاندوێنـن.

٢)- ﴿فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ﴾، لە ئاست بابەکانیاندا، بۆچی دەفەرموێ بابەکانیان؟ چونکە هەر کامێکیان بابێکی هەبووە، دەشگونجێ (ءَابَآئِهِنَّ)، بابیان و باپیریان و بابی باپیریان و تاکو سەرێ، مەبەست بێ.

٣)- ﴿وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ﴾، هەروەها لە ئاست کوڕەکانیاندا، ئنجا کوڕی کوڕو، هەروەها کوڕەزای کوڕ و...هتد، هەموویان دەگرێتەوە.

٤)- ﴿وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ﴾، دیسان لە ئاست برایەکانیاندا.

٥)- ﴿وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ﴾، هەروەها لە ئاست برازاکانیشیاندا، واتە: کوڕانی برایەکانیان و هەتا خوارێ.

٦)- ﴿وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ﴾، هەروەها لە ئاست کوڕانی خوشکەکانیاندا.

٧)- ﴿وَلَا نِسَآئِهِنَّ﴾، هەروەها لە ئاست ئافرەتەکانیاندا، (نِسَاء: إِسْمُ جَمْعُ امْرَأة، لَا مُفْرَدَ لَهُ مِنْ لَفْظِه، وَهُنَّ الإِنَاثُ البَالِغَات أو المُرَاهِقَات)، (نِسَاء) ناوی کۆی (إمْرَأة)ەیە، کە تاکی نیە لە بێژەی خۆی [واتە: ئافرەتان، بە یەکێك لە ئافرەتان دەگوترێ: (إمْرَأة) بە کۆیان دەگوترێ: (نِسَاء)]، کە بریتین لە ئافرەتانێ کە پێگەیشتوون، یاخود خەریکی پێگەیشتنن، واتە: هەموو ئافرەتانی مسوڵمان.

٨)- ﴿ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ ﴾، هەروەها لە ئاست ئەوانەدا، کە بەدەستی ڕاستیانەوەن، واتە: کۆیلەو کەنیزەکەکانیان، ئەوانەی کە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ خاوەنیانن.

هەنـدێ گوتوویانـە: لێـرەدا تەنیـا کەنیزەکـەکان مەبەسـتن، تەنیـا مێینەکانیـان، ئافرەتـە کۆیلـەکان، کـە کەنیزەکیـان پـێ دەڵێـن.

هەندێکیـش گوتوویانـە: بەڵکـو پیـاوان و ئافرەتـان مەبەسـتن، کـە عـادەت وایـە کەسێك خزمەتـکار بـێ، یاخـود کۆیلەبـێ، لـە ماڵێکـدا، گومـانی ئـەوەی لێناکـرێ تەماع و نیـازی خراپـی هەبـێ، بـەڵام لـە کاتێکـدا کـە ئەگـەری ئـەوەی هەبـێ، بـە تەئکیـد ئـەو کاتـە هـەروەك نامەحرەمـەکانی دیکـە مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکـرێ، بـە هـەر حاڵ هـەردوو ڕایـەکان لـە تەفسـیرەکاندا هـەن.

پێموایـە بۆیـە خـوا ﷻ بـە گشـتیی فەرموویـەتی: چونکـە دەگونجـێ بـۆ هەنـدێ کـەس وابـێ، بـە نسـبەت کۆیلـەو کەنیزەکـەوەو، بـۆ هەنـدێ کەسـیش وابـێ تەنیـا بـە نسـبەت کەنیزەکەکانـەوە، بـۆی هەبـێ وەك مەحـرەم مامەڵەیـان لەگەڵـدا بکـرێ، بۆیـە خـوا وشـەیەکی هێنـاوە، هـەردووك حاڵەتەکـە بگرێتـەوە.

پێموایـە زۆر لـەو کەسـانەی کـە لـە ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیاو لـە ئەفریقیـاوە دێـن و خزمـەتی خەڵـك دەکـەن، ئـەو ئافرەتـە، یـان ئـەو پیـاوەی دێ، پێموایـە تـا ڕاددەیـەکی زۆر، چۆنیەتیـی مامەڵەکـردن لەگـەڵ کۆیلـەو کەنیزەکـەکانی کاتی خۆیـدا، بـە کەڵـکی مامەڵەکـردن لەگـەڵ ئەوانـە دێ، هەڵبەتـە ئەوانـە ئـازادن کۆیلـەو کەنیـزەك نیـن، بـەڵام لـە ڕووی مامەڵـەی جـوان و ڕێزلێگرتـن و بەزەیـی پێداهاتنـەوەوە، وەك لـە فەرموودەکـەی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە: مـرۆڤ لـەوە دەرخـواردی کۆیلـەو کەنیزەکەی بـدات، کـە بـۆ خـۆی دەیخـوات و، لـەو پۆشـاکە پێـی بپۆشـێ، کـە خـۆی لێـی دەپۆشـێ و....هتـد[1].

---

(١) (إِخْوَانُكُمْ خَوَلُكُمْ جَعَلَهُمُ اللَّـهُ فِتْيَـةً تحـت أيديكـم، فمـن كان أخـوه تحـت يـده، فَلْيُطْعِمْـهُ مِـنْ طَعَامِـهِ، وَلْيُلْبِسْـهُ مِـنْ لِبَاسِـهِ، ولا يُكَلِّفْـهُ مَـا يَغْلِبُـهُ، فَـإِنْ كَلَّفَـهُ مَـا يَغْلِبُـهُ فَلْيُعِنْـهُ) أخرجـه أحمـد: ٢١٤٤٧، والبخـاري: ٢٤٠٧، ومسـلم: ١٦٦١، وأبـو داود: ٥١٥٨، والترمـذي: ١٩٤٥، وابـن ماجـه: ٣٦٩٠، عـن أبي ذر رضي اللـه عنـه.

٩)- ﴿وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ﴾، پارێزیش لە خوا بکەن، ئەی ئافرەتانی پێغەمبەر! ﷺ، (أي إحْذَرْنَ مِنْ تَجَاوزِ مَا خَطَّهُ اللهُ لَكُنَّ) واتە: وریابن و هۆشیاربن! لەوەی خوا ﷻ نەخشەی بۆ داناون خەتی بۆ کێشاون تێ نەپەڕێنن.

١٠)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾، بەدڵنیایی خوا چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوەو، لە هەموو شتێک ئاگادارە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕاگەیانـدنی صەڵاتـدانی خواو، فریشـتەکانی خوا ﷻ لـە پێغەمبەرەکـەی موحەممەد ﷺو، فەرمانکـردنی خـوا بـە مسـوڵمانان کـە صـەڵات و سـەلامی بـۆ بنێرن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ ﴾، بە دڵنیایی خواو فریشتەکانی صەڵاوات لە پێغەمبەر ﷺ دەدەن.

لێـرەدا کە خوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ ﴾، هەردووکیانی پێکـەوە هێناون، خواو فریشـتەکانی صەڵات لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ دەدەن.

پرسـیارێك دەکـرێ کـە بۆچـی لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە: کاتـێ کـە وتاربێژێـك خـواو پێغەمبـەری ﷺ پێکـەوە باسـکردوون، پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: تـۆ دوانـدەرو وتاربێژێـکی خراپـی؟ وەك لـەم دەقـەدا دەبیـنرێ:

**{عَـنْ عَـدِيِّ بْـنِ حَاتِـمٍ ﷺ، أَنَّ رَجُـلاً خَطَـبَ عِنْـدَ النَّبِـيِّ ﷺ فَقَـالَ مَـنْ يُطِـعِ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ فَقَـدْ رَشَـدَ، وَمَـنْ يَعْصِهِـمَا فَقَـدْ غَـوَى، فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ: «بِئْـسَ الْخَطِيـبُ أَنْـتَ، قُـلْ وَمَـنْ يَعْـصِ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ} (أخرجـه مُسْـلِم: ٢٠٤٧، وابـن حبـان: ٢٧٩٨).**

واتـە: عەدیـی کـوڕی حاتـەم ﷺ دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ پیاوێـك وتارێکیـدا لـە لای پێغەمبـەر ﷺ گـوتی: هـەر کەسـێك فەرمانبەریـی خـواو پێغەمبەرەکـەی بـکات ﷺ ئـەوە سـەر ڕاسـتە، بـە ئامانـج گەیشـتوویەو، هـەر کەسـێك سـەرپێچییان لێبـکات، بێمـرادو سـەرگەردانە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: تـۆ خراپتریـن وتاربێـژی، بڵێ: هەر کەسـێك سـەرپێچیی لـە خـواو لـە پێغەمبەرەکـەی بـکات، (نـەك بڵێـی (وَمَـنْ يَعْصِهِـمَا) پێکـەوە).

هەروەها دەقێکی دیکە هەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يَنْهَيَانِكُمْ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ} (أخرجه البخاري: ۲۹۹۱ ، ومسلم: ۱۳٥۸).

واتە: بە دڵنیایی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ گۆشتی کەریماڵیتان لێ قەدەغە دەکەن.

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ پێکەوەی هێناون، بەڵام لەوێ ڕەخنەی لە وتاربێژەکە گرتوە، لێرەش دەفەرموێ: (يَنْهَيَانِكُمْ) پێکەوە، خواو پێغەمبەری ﷺ لە یەك کرداردا هێناون؟

وەڵامەکەی ئەوەیە:

هۆکاری قەدەغەکردنی پێغەمبەر ﷺ لە سەرزەنشتکردنی بۆ وتاربێژەکە ئەوەیە، کە وای لێ تێگەیشتوە لەگەڵ خوادا یەکسانی بکات و بیخاتە ئاستی خواوە، لەگەڵ خوادا بیخاتە تەرازوویەکەوە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا ناڕەوا نیە، چونکە ئەوەتا بۆ خۆشی خواو پێغەمبەری ﷺ خوای پێکەوەو لە یەك کرداردا باسکردوون، کەواتە: پێغەمبەر ﷺ کە لەوێ ڕەخنەی لەو وتاربێژە گرتوە، وای لێ حاڵی بووە، کە پێی وایە پێغەمبەریش ﷺ لە ئاستی خوادایە، کە بە تەنکید ئەوە وانیەو شیرکەو حەرامە.

۲)- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەمە جاری پێنجەمە لەم سووڕەتە موبارەکەدا، ئەم تەعبیرە بێ.

۳)- ﴿ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾، ئێوەش صەلاتی لێبدەن (لە پێغەمبەر ﷺ)، سەلامیشی لێبکەن بە سەلامێکی تێرو تەواو.

## چۆنیەتیی پێکەوە پەیوەست بوونی ئایەتەکان

لـە بـارەی چۆنیەتیـی پێکـەوە پەیوەسـت بـوونی ئایەتەکانـەوە، ئـەم پێنـج خاڵـە دەخەینـە ڕوو:

١)- باسی سنووردانان بۆ مسوڵمانان، کە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی و خێزانی سەغڵەت نەکەن.

٢)- دوایی باسکردنی ڕێزو پلەو پێگەی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ.

٣)- ئنجا باسی مەحڕەمەکانیان کراوە، تاکو سەغڵەت نەبن، لە مامەڵەکردن لەگەڵ مەحڕەمەکانیاندا.

٤)- دوایی باسی قەدرو حورمەت و گەورەیی پێغەمبەر ﷺ لەلای خواو فریشتەکانی، کراوە.

٥)- پاشان باسی گەورەیی تاوانی ئەزیەتدانی پێغەمبەری خوا ﷺ کراوە، کە هەر کەسێك خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەزیەت بدات، لە دنیاو دواڕۆژدا، نەفرینیان لێدەکات و لە بەزەیی خۆی دووریان دەخاتەوەو، سزایەکی ڕیسواکەریشی بۆ داناون.

## کورتە باسێک لە بارەی
## صەڵات و سەلام دان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ

ئێمە ئەم کورتە باسە لە حەوت تەوەردا دەخەینە ڕوو:

### ا)- مانای (صَلَاة) و (سَلَام):

أ- وشەی (صَلَاة):

بوخاریی هێناویەتی: (عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ: قَالَ: «صَلَاةُ اللَّهِ عَلَيْهِ: ثَنَاؤُهُ عَلَيْهِ عِنْدَ الْمَلَائِكَةِ، وَصَلَاةُ الْمَلَائِكَةِ عَلَيْهِ: الدُّعَاءُ لَهُ»)[1].

(قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: يُصَلُّونَ: يُبَرِّكُونَ، أي: يَدْعُونَ بالبَرَكَة، وبالجملة: فالصلاة تكون بمعنى التمجيد والدُّعاء والرَّحمة)[2].

واتە: لە ئەبوو عالییەوە گێڕراوەتەوە کە گوتوویەتی: صەڵاتی خوا لەسەر پێغەمبەر ﷺ بریتیە: لە مەدحکردن و پیداهەڵدانی لە لای فریشتەکانی، بەڵام صەڵاتی فریشتەکان بریتیە: لە داواکردنی مەدحی خواو چاك و پاککردنی خوا بۆ پێغەمبەر ﷺ، لە خوا.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتوویەتی: کە دەفەرموێ: (يُصَلُّونَ)، واتە: داوای بەرەکەت و پیزی بۆ لە خوا دەکەن.

کەواتە: (صَلَاة) بە مانای شکۆدارکردن و پاڕانەوەو بەزەیی دێت، ئەگەر صەڵات لە خواوە بێ، واتە: خوا بەزەیی خۆی، شکۆدارکردنی خۆی، چاك و پاککردنی

---

(١) أخرجه البخاري في: «الصحيح» تعليقًا: «الفتح» ٨/ ٥٣٢، كتاب التفسير، سورة الأحزاب.

(٢) محاسن التأويل: ج٨، ص ٣٠١،٣٠٠.

خـۆی، بـۆ پێغەمبـەر ﷺ یـان بـۆ بـڕواداران ئەنجـام دەدات، ئەگـەر صـەڵات لـە فریشـتانەوە بێ، واتـە: ئـەوەی کـە خـوا دەیـکات لەگـەڵ پێغەمبـەرو ﷺ بڕوادارانـدا، لـە کاتی صـەڵات نـاردنی دا بۆیـان، فریشـتەکان ئـەوە داوا دەکـەن لـە خـوا، ئەگـەر لـە بڕوادارانـەوە بـێ، دیسـان هـەر بـە مانـای پاڕانـەوەو داواکـردنی پیـت و پێـزو بەرەکـەت و شـکۆمەندییە لـە خـواوە، بـۆ پێغەمبـەر ﷺ.

(**رَاغِـبُ الأَصْفَهَـانِي**) گوتوویـەتی: (**الصَّـلاةُ: الدُّعَـاءُ وَالتَّبْرِيْـكُ وَالتَّمْجِيْـد**)، (**صـلاة**) بریتیـە: لـە پاڕانـەوەو پیـت و پێـزو شـکۆدارکردن.

**ب)- وشەی سەلام:**

(**السلام: السَّلَامَةُ مِنَ الآفَاتِ وَالأَمْنِ وَالخَيْـرِ وَالصَّلَاح**).

واتـە: وشـەی سـەلام واتـە: بـێ مزەڕەتیـی و، بـێ زیانیـی لـە دەردو گرفتارییـەکان، هەروەهـا دابینکـردنی هێمنیـی و ئاسـاییش و، چاککـردن.

کەواتــە: کــە ئێمــە ســەلام بــۆ پێغەمبــەر ﷺ دەنێریــن و دەڵێیــن: (**صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ**) واتــە: هــەم شــکۆمەندیی و پێــزو پایــە بەرزیــی خــوا بــۆ پێغەمبــەر ﷺ داوا دەکەیــن، هــەم ســەلامەتیی و، بــێ مزەڕەتیــی و، بــێ زیانیــی لــە خــوای پــەروەردگارەوەی بــۆ داوا دەکەیــن.

## ٢)- حوکمی صەڵات و سەلام ناردن بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ:

(**القرطبي**) و (**الشوكاني**) لـە تەفسـیرەکانیان، ئـەم چەنـد دێـڕە دێنـن بـە شـێوەیەك کـە زۆر وێـك دەچـن، گوتوویانـە: [**وَاخْتَلَـفَ الْعُلَـمَاءُ فِي الصَّـلَاةِ عَـلَى النَّبِـيِّ ﷺ فِي الصَّلَاةِ، فَالَّـذِي عَلَيْـهِ الجَـمُّ الغَفِـيرُ وَالْجُمْهُـورُ الْكَثِيرُ: أَنَّ ذَلِـكَ مِـنْ سُـنَنِ الصَّـلَاةِ وَمُسْـتَحَبَّاتِهَا، قَـالَ ابْـنُ الْمُنْـذِرِ: يُسْـتَحَبُّ أَلَّا يُصَـلِّيَ أَحَـدٌ صَـلَاةً إِلَّا صَـلَّى فِيهَـا عَـلَى رَسُـولِ اللـهِ ﷺ، فَـإِنْ تَـرَكَ ذَلِـكَ، تَـارِكٌ، فَصَلَاتُـهُ مُجْزِيَـة فِي مَذَاهِـبُ مَالِـكٍ وَأَهْـلِ الْمَدِينَـةِ وَسُـفْيَانَ الثَّـوْرِيِّ وَأَهْـلِ الْكُوفَـةِ مِـنْ أَصْحَـابِ الـرَّأْيِ وَغَيْرِهِـمْ، وَهُـوَ قَـوْلُ جُـلِّ أَهْـلِ الْعِلْـمِ، وَحُـكِيَ عَـنْ مَالِـكٍ**

**وَسُفْيَانَ أَنَّهَا فِي التَّشَهُّدِ الْأَخِيرِ مُسْتَحَبَّةٌ، وأنَّ تَارِكَهَا فِي التَّشهد مُسِيٌّ، وَشَذَّ الشَّافِعِيُّ فَأَوْجَبَ عَلَى تَارِكِهَا فِي الصَّلَاةِ الْإِعَادَةَ، وَأَوْجَبَ إِسْحَاقُ الْإِعَادَةَ مَعَ تَعَمُّدِ تَرْكِهَا دُونَ النِّسْيَانِ)**(١).

دەڵێن: زانایان ڕاجیاییان هەیە لە بارەی حوکمی صەڵاتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا، ئەوەی کە زۆربەی هەر زۆریان و جەماوەری زانایان لە سەرینی، ئەوەیە کە صەڵاتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا لە سوننەتەکان و، شتە بە باشزانراوەکانی نوێژە، (ابْنُ الْمُنْذِرِ) دەڵێ: وا پەسندە مرۆڤ هیچ نوێژێك نەکات، مەگەر لە نوێژەکەیدا صەڵات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ بدات، بەڵام ئەگەر صەڵاتدانی لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکەیدا وازلێهێنا، ئەوە نوێژەکەی وەبەردەکەوێ، بەڕای مالیك و خەڵکی مەدینەو سوفیانی سەوریی خەڵکی کووفە [واتە: ئەبوو حەنیفەو هاوەڵەکانی]، هەروەها ئەوە قسەی زۆربەی ئەهلی زانستە.

هەروەها لە مالیك و لە سوفیانەوە گێڕدراوەتەوە کە لە تەحییاتی کۆتایی هەر نوێژێکدا، صەڵات ناردن بۆ پێغەمبەر ﷺ شتێکی باش و بە پەسند زانراوەو، کەسێك لە تەحییاتی کۆتاییدا صەڵات نەنێرێ بۆ پێغەمبەر ﷺ شتێکی خراپی کردوە.

بەڵام شافیعیی ڕێزپەڕ بووە لەو ڕایەو، بە پێویستی داناوە کە کەسێك صەڵات لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا وازلێبێنێ، پێویستە نوێژەکەی بگێڕێتەوە واتە: نوێژەکەی بەرناکەوێ.

ئیسحاقیش گێڕانەوەی نوێژەکەی کاتێك بە پێویست زانیوە، ئەگەر بە ئەنقەست بێ، نەك بە هۆی لەبیرچوونەوەوە، صەڵاتی بۆ پێغەمبەر ﷺ نەناردبێ.

ئەوە بە نسبەت صەڵات ناردنەوە لە نوێژدا بۆ پێغەمبەر ﷺ، بەڵام هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە مرۆڤ لە تەمەنیدا، جارێك لەسەری پێویستە صەڵات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ص١٩١،١٩٠، وفتح القدير: ج٤، ص: ٣٦٥.

لەو بارەوە کە صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ خوا پەرستییەکی بەرزو گەورەیەو، پاداشتێکی گەورەی هەیە، وەك بەڵگە، ئەم دوو فەرموودەیە دێنین:

**أ)- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {لَا تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيدًا، وَصَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ تَبْلُغُنِي حَيْثُمَا كُنْتُمْ} (أخرجه أبو داود:٢٠٤٢، والبيهقي في شعب الإيمان: ٤١٦٢، عن أبي هريرة ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني).**

واتە: گۆڕەکەی من مەکەن بە جەژن (واتە: وەك چۆن جەژنان لە شوێنێك کۆدەبنەوە، ئاوا لە دەوری کۆببنەوە، یان بە شێوەیەکی بەردەوام لە کاتانێکی دیاریکراودا، بێن وەك چۆن جەژن لە ڕۆژانێکی دیاریکراودا دووبارە دەبێتەوە)، هەروەها صەڵاواتم لێبدەن، چونکە صەڵاتی ئێوە لە هەر جێیەك بن، پێمدەگات.

**ب)- هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {أَوْلَى النَّاسِ بِي يَوْمَ الْقِيامَةِ أَكْثَرُهُم عَلَيَّ صَلَاةً} (أخرجه الترمذي ٤٨٤، وقال: حسن غريب، وابن حبان: ٩١١، والبيهقي في شعب الإيمان: ١٥٦٣، عن ابن مسعود ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني).**

واتە: نیزیکترین (لە پێشترین) کەس لە ڕۆژی قیامەتدا، لە من، ئەو کەسەیە کە زۆرترین صەڵاتی بۆ ناردووم.

### ٣)- چۆنیەتیی صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا:

یەك: بێژەی صەڵاوات ناردن، بە چەند شێوەیەك هاتوە، کە لە خوارەوە ئاماژەیان پێدەکەین:

**أ)- {اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّد وَعَلى آلِ مُحَمَّد، كَمَا صَلَّيتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَبَارك عَلَى مُحَمَّد وَعَلَى آلِ مُحَمد، كَمَا بَارَكتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ إنكَ حَمِيد مَجِيدٌ} (أخرجه البخاري: ٣٣٧١، ومسلم: ٤٠٦، عن كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ ﷺ).**

واتە: ئەی خوایە! صەڵات لەسەر موحەممەد بدەو لەسەر شوێنکەوتووانی موحەممەدو نیزیکانی موحەممەد (صەڵات) بدە، وەك چۆن صەڵاتت داوە لەسەر

شـوێنکەوتووانی ئیبراهیـم، بـە دڵنیایـی تـۆ ستایشـکراوی و شـکۆمەندی، ئـەی خوایـە! بەرەکـەت و پێـز بـۆ سـەر موحەممـەد بنێـرەو، بـۆ سـەر شـوێنکەوتووانی موحەممـەدو نیزیـکانی موحەممـەد، هـەروەك چـۆن بەرەکـەت و پێـزت بـۆ سـەر شـوێنکەوتووانی ئیبراهیـم نـاردوە، بـە دڵنیایـی تـۆ ستایشـکراوی شـکۆداری.

ب)- (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ) (أخرجه البخاري: ٦٣٦٠، ومسلم: ٣٠٦، عن أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ).

واتـە: ئـەی خوایـە! صـەڵات لـە موحەممـەد بدەو لـە هاوسـەرانی و، لـە وەچەکەی، وەك چـۆن صەڵاتـت داوە لەسـەر شـوێنکەوتووان و نیزیـکانی ئیبراهیـم، هەروەهـا بەرەکـەت و پێـز لەسـەر موحەممـەدو، هاوسـەرانی وەچەکـەی بـدە (واتـە: ڕۆڵـەکانی) وەك چـۆن بەرەکـەت و پێـزت بـۆ سـەر شـوێنکەوتووانی ئیبراهیـم نـاردوە، بـە دڵنیایـی تـۆ ستایشـکراوی شـکۆداری.

دوو: چۆنیەتیـی سـەلامیش لـە پێغەمبـەر ﷺ بەمجۆرەیـە: (السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَـةُ اللَّـهِ وَبَرَكَاتُـهُ) (أخرجـه عبـد الـرزاق: ٣٠٦٥، وأحمـد: ١٩٥٢٢، ومسـلم: ٤٠٤))، کـە لـە (التحيّـات)دا هەیە.

واتــە: ســەلام لەســەر تــۆ ئــەی پێغەمبــەر! هەروەهــا بەزەیــی و بەرەکــەت و پێــزەکانی خــوا بــۆ ســەر تــۆ.

## ٤)- حوکمی صەڵات و سەلام ناردن بۆ جگە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ):

(جـمال الديـن القاسـمي) خـاوەنی (محاسـن التأويـل) لـەو بـارەوە پوختەیـەکی بـاش دێنـێ لـە زانایانـەوە، دەڵـێ: (وَأَمَّـا الصَّـلَاةُ عَـلَى غَـيْرِ الْأَنْبِيَـاءِ، فَـإِنْ كَانَـتْ عَـلَى سَـبِيلِ التَّبَعِيَّـةِ كَـمَا تَقَـدَّمَ فِي الْحَدِيـثِ: «اللَّهُـمَّ، صَـلِّ عَـلَى مُحَمَّـدٍ وَآلِـهِ وَأَزْوَاجِـهِ وَذُرِّيَّتِـهِ»،

فَهَـذَا جَائِـزٌ بِالْإِجْـمَاعِ، وَإِنَّمَـا وَقَـعَ النِّـزَاعُ فِيـمَا إِذَا أُفْـرِدَ غَـيْرُ الْأَنْبِيَـاءِ بِالصَّـلَاةِ عَلَيْهِـمْ، فأجـازه بعضهـم واسـتدلّوا بهـذه النصـوص: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ ﴿٤٣﴾ ﴾الأحـزاب، ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾البقـرة، ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ ﴿١٠٣﴾ ﴾التوبـة، والحديـث: إِذَا أَتَـاهُ قَـوْمٌ بِصَدَقَتِهِـمْ قَـالَ: «أَللَّهُـمَّ صَـلِّ عَلَيْهِـمْ»، فأَتَـاهُ أَبِي أَوفى بِصَدَقَتِـهِ، فَقَـالَ: أَللَّهُـمَّ صَـلِّ عـلى أَبِي أَوفى[1]. وَكَرِهَـهُ قَـوْمٌ لِكَـوْنِ الصَّـلَاةِ هَذَا، صَـارَ شِـعَارًا للأنبيـاءِ إِذ ذُكِـرُوا، فَـلَا يُلْحَـقُ بِهِـمْ غَيْرُهُـمْ، فَـلَا يُقَـالُ: عُمَـر صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ، كَـمَا لَا يُقَـالُ: قَـالَ مُحَمَّـدٌ عَـزَّ وَجَـلَّ، وَإِنْ كَانَ عَزِيـزًا جَلِيـلًا، لِكَـوْنِ هَـذَا مِـنْ شِـعَارِ ذِكْـرِ اللـهِ عَـزَّ وَجَـلَّ، قَـالَ ابْـنُ الحَجَـر: إِنَّ ذَلِـكَ وَقَـعَ مِـنَ الشَّـارِعِ، وَلِصَاحِـبِ الحَـقِّ أَنْ يَتَفَضَّـلَ مِـنَ حَقِّـهِ بِمَـا شَـاءَ، وَلَيْـسَ لِغَـيْرِهِ أَنْ يَتَصَـرَّفَ إِلاَّ بِإِذْنِـهِ، وَلَـمْ يَثْبُـتْ عَنْـهُ إِذْنٌ فِي ذَلِـك[2].

(جـمال الديـن القاسـمي) پوختەيـەکی بـاشی ڕای زانايـانی لـەو بـارەوە دێنـێ، دەڵـێ: صـەڵات نـاردن بـۆ جگـە لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلَامِ) ئەگـەر لەگـەڵ پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلَامِ)و وێـڕای ئـەوان بـێ، وەك: (أَللَّهُـمَّ، صَـلِّ عَـلَى مُحَمَّـدٍ وَآلِـهِ وَأَزْوَاجِـهِ وَذُرِّيَّتِـهِ) خوايـە صـەڵات بنێـرە سـەر موحەممـەدو ﷺ شـوێنکەوتووانی و لـە هاوسـەرانی، ئـەوە بـە يەکدەنگیـی زانايـان دروسـتەو ڕەوايـە، بـەڵام ئەگـەر سـەربەخۆ بـێ، ڕا جيايـی تێدايـە، (وەك بڵـێ: (عَـلِي صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ، عُمَـر صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ))، ئـەوە کۆمەڵێـك بـە ڕەوايـان دانـاوەو ئـەم دەقانەيـان بـە بەڵگـە هێناونـەوە:

أ- ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ ﴾الأحزاب، خوا ئەو کەسەيە کە خۆی و فريشتەکانی صەڵاواتتان لێدەدەن.

ب- ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ﴿١٥٧﴾ ﴾البقرة، لە پەروەردگاريانەوە صەڵاوات و بەزەييان لەسەرە.

---

(١) أخرجه البُخَارِي: ١٤٢٦، ومسلم: ٢٥٤٤.

(٢) محاسن التأويل ج٨، ص : ٣٠٢.

ج- ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾التوبة، واتە: لە ماڵەکانیان زەکاتێك، صەدەقەیەك وەربگرە کە بەهۆیەوە پاکیان بکەیەوەو چاکیان بکەی و صەڵاتیان لێبدە...

هەروەها لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە دەڵێ: هەر کاتێ کۆمەڵێك صەدەقەی خۆیان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنابایە دەیفەرموو: (أَللّٰهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِ) واتە: خوایە! صەڵاتی لێبدە، جارێك ئەبوو ئەوفا صەدەقەکەی خۆی هێنا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: [أَللّٰهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى]، واتە: ئەی خوایە! صەڵات بدە لەسەر ئەبی ئەوفاو شوێنکەوتووان و نیزیکانی.

(کەواتە: هەندێك بە ڕەوایان داناوە کە بە سەربەخۆیی صەڵات و سەلام بۆ جگە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) بنێردرێن)، بەڵام کۆمەڵێکیان بە ناپەسندیان داناوەو گوتوویانە: چونکە سیغەی صەڵات بۆتە دروشمێك بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) هەر کاتێ باسکران، بۆیە جگە لە خۆیان بەوانەوە پەیوەست ناکرێ، بۆیە ناگوترێ: (عُمَرُ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ)، وەك چۆن ناگوترێ: (مُحَمَّدٌ عَزَّ وَجَلَّ)، لەگەڵ ئەوەشدا کە موحەممەد عەزیزو جەلیلیشە (واتە: هەم خاوەن باڵا دەستییە، هەم شکۆداریشە)، لەبەر ئەوەی (عز وجل) بۆتە دروشمێك بۆ یادی خوا.

(إبن الحجر العسقلاني) خاوەنی (فتح الباري) دەڵێ: ئەگەر شتێك لە شەرعدانەرەوە هات، خاوەن هەق بۆی هەیە ئەو هەقەی خۆی بدات بە هەر کەسێك، بەڵام جگە لە خۆی، بۆی نیە تەصەڕروف لەوەدا بکات، مەگەر بە مۆڵەتی خوا، ئەشچەسپاوە لە خاوەن شەرعەوە، (کە خوای پەروەردگار) مۆڵەتی دابێ صەڵات و سەلام بۆ جگە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) بە سەربەخۆیی بەکاربهێنرێ.

بەڵام بێگومان کەسێکیش بە سەربەخۆیی بۆ جگە لە پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ) بەکارهێنا، وەك شیعەی دوازدە ئیمامیی کە بۆ ئیمامەکانیان

دەیکـەن، هەڵەکـە هـەر لەوەدایـە، کـە تەنیـا بـۆ ئیمامەکانیـان دەیکـەن، چونکـە ئیمامەکانیشـیان بـەس زانـان، وەك زانایـانی دیکـەی ئیسـلام، وەك پێشـەوایانی دیکـەی ئیسـلام و هـەروەك وانـن، یـان شـتێك لـەوان سـەرتر، یاخـود شـتێك لـەوان خوارتـرن، ئەوانیـش زانابـوون وەك زانایـانی ئۆممـەت و، جیاکردنەوەکەیـان داهێـنراوو خراپـە، ئەگەرنـا ئـەوەی دیکـە تاکـو ڕاددەیـەك ڕێـی تێدەچـێ، هەرچەنـدە واباشـترە ئـەو شـتانەی تایبـەت کـراون، بـە پێغەمبەرانـەوە (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) هـەر بـۆ وان بەکاربهێنرێـن، هـەروەك ئـەو وشـانەی کـە تایبـەت دەکرێـن بـە خـواوە ﷻ دەبـێ هـەر بـۆ خـوا بەکاربهێنرێـن، هەروەهـا ئـەو وشـانەی تایبەتکـراون بـە هاوەڵانـەوە کـە دەگوتـرێ: (رَضِيَ اللـهُ عَنْهُـم)، یـان (رَضِيَ اللـهُ عَنْهُـنَّ)، یـان (رَضِيَ اللـهُ عَنْـهُ)، یـان (رَضِيَ اللـهُ عَنْهُا)، ئەگـەر بـۆ جگـە لـە هاوەڵانیـش بگوتـرێ: خـوا لێیـان ڕازیبـێ، هـەر دروسـتە، بـەڵام مـادام وەك دروشـمێکە بـۆ هـاوەڵان، واباشـە ئـەوە تەنیـا بـۆ ئـەوان بەکاربـێ و بـە زانایـانی دیکـە بگوتـرێ: (خـوا لێیـان خۆشـبێ)، خـوا پلەیـان بـەرز بکاتـەوە، یـان: خـوا ڕووحـی پـاك بـکات، یـان خـوا لێـی ببـوورێ ...هتـد.

## ٥)- وا باشە صەڵات و سەلام کۆبکرێنەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ:

(**النَّوَوِيُّ**) ڕەحمـەتی خـوای لێبـێ گوتوویـەتی: (**إِذَا صَـلَّى عَـلَى النَّبِـيِّ ﷺ فَلْيَجْمَـعْ بَـيْنَ الصَّـلاَةِ وَالتَّسْـلِيمِ، فَـلَا يَقْتَـصِرُ عَـلَى أَحَدِهِـمَا، فَـلَا يَقُـولُ: صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ فَقَـطْ. وَقَـالَ ابْـنُ كَثِـيرٍ: وَهَـذَا الَّـذِي قَالَـهُ، مُنْتَـزَعٌ مِـنْ هَـذِهِ الآيَـةِ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَـٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ ۚ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾**)[1].

واتـە: (کەسـێك) کاتێـك صـەڵاتی لـە پێغەمبـەردا ﷺ، بـا صـەڵات و سـەلام پێکـەوە کـۆ بکاتـەوەو، تەنیا یەکێکیـان بەکارنەهێنـێ، بـۆ وێنـە نەڵـێ: (صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ) خـوا صـەڵاتی لێبـدا بـە تەنیـا، هەروەهـا نەشـڵێ: (عَلَيْـهِ السَّـلاَم) بـە تەنیـا سـەلامی لێبـێ، بەڵکـو بڵـێ: (صَـلَّى اللـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ).

---

(١) محاسن التأويل ج٨، ص ٣٠٤.

(إبْنُ كَثير) گوتوویەتی: ئەوەی گوتوویەتی، لەم ئایەتە موبارەكە وەریگرتوە، كە خوا صەڵات و سەلامی بۆ پێغەمبەر ﷺ كۆكردوونەوە.

## ٦)- حیكمەتی صەڵات و سەلام ناردنی ئێمە بۆ پێغەمبەر ﷺ:

لەو بارەوە (فخرالدین الرازي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا، كە هەم بە (التفسیر الكبیر)[1] و هەم بە (مفاتیح الغیب)یش ناوداره، دەڵێ:

**(إذَا صَلَّى اللهُ وَمَلَائِكَتُهُ عَلَيْهِ، فَأيُّ حَاجَةٍ إلَى صَلَاتِنَا؟ نَقُولُ: الصَّلَاةُ عَلَيْهِ لَيْسَ لِحَاجَتِهِ إلَيْهَا، وَإلَّا فَلَا حَاجَةَ إلَى صَلَاةِ الْمَلَائِكَةِ مَعَ صَلَاةِ اللهِ عَلَيْهِ، وَإنَّمَا هُوَ لإظْهَارِ تَعْظِيمِهِ، كَمَا أنَّ اللهَ تَعَالَى أوْجَبَ عَلَيْنَا ذِكْرَ نَفْسِهِ، وَلَا حَاجَةَ لَهُ إلَيْهِ، وَإنَّمَا هُوَ لإظْهَارِ تَعْظِيمِهِ مِنَّا، شَفَقَةً عَلَيْنَا، لِيُثِيبَنَا عَلَيْهِ، وَلِهَذَا، قَالَ عَلَيْهِ السَّلَامُ: «مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا»[2]).**

(فخرالدین الرازي) ڕەحمەتی خوای لێبێ، لە تەفسیرەكەیدا جار جار هەندێ پرسیارو ئیشكال دەورووژێنێ، كە شتی بەجێن، دواییش بە خۆی وەڵامیان دەداتەوەو ئیشكالەكە لادەبات.

دەڵێ: ئەگەر پرسیار بكرێ: ئایا كاتێك كە خواو فریشتەكانی صەڵات دەنێرن بۆ پێغەمبەر ﷺ چ پێویستییەك هەیە بە صەڵاتی ئێمە بۆی؟ دەڵێ: ئێمەش دەڵێین: صەڵاتدانی ئێمە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوە نیە كە پێغەمبەری خوا پێویستیی پێیەتی! ئەگەرنا لە دوای صەڵاتی خوا لەسەر پێغەمبەر ﷺ پێویستیی بە صەڵاتی فریشتانیش ناكات، بەڵكو صەڵاتدانی ئێمە لەسەر پێغەمبەر ﷺ (واتە: صەڵات و سەلام ناردنمان بۆی)، بۆ دەرخستنی بە مەزنگرتنیەتی، هەروەك چۆن خوای بەرز لەسەری پێویست كردووین، یادی بكەین و باسی بكەین، لە حاڵێكدا كە خوا پێویستیی بە باسكردن و یادكردنی ئێمە نیە، بەڵام

---

(١) ج٢٥، ص١٩٨، ١٩٩.

(٢) أخرجه مسلم: ٨٧٥، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنهما.

بۆیە لەسەری پێویست کردووین، یادی بکەین، تاکو بە مەزنگرتنی ئێمە بۆ خوا، ئاشکرا بکرێ، ئەوەش بەزەیی خوایە بەرامبەر بە ئێمە، تاکو پاداشتمان بداتەوە، هەر بۆیەش لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: (مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا)، واتە: هەر کەسێك یەك صەلاتم بۆ بنێرێ، خوا بەهۆی ئەو صەلاتەوە، دە (١٠) جار صەلاتی لێدەدات.

شایانی باسیشە: کە هەر لەم سوورەتی (الأحزاب)دا، وەك پێشتر باسمان کرد، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلَائِكَتُهُ لِيُخْرِجَكُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾﴾الأحزاب.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە یادکردنێکی زۆر یادی خوا بکەن و، بەیانیان و ئێواران بە پاکی بگرن، خوا ئەو زاتەیە کە خۆی و فریشتەکانی صەلاتتان لێدەدەن، صەلاتتان بۆ دەنێرن، تاکو لە تاریکاییان دەرتان بێنێ بەرەو ڕووناکیی و، خوا بەرامبەر بە بڕواداران بە بەزەییە، بەخشندەیە.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هەر کەسێك صەلاتێك لە من بدات خوا بە هۆی ئەو صەلاتەوە، دە صەلاتی لێدەدا، هەر کەسێکیش خوا صەلاتی لێبدا بە پێی ئایەتەکەی سوورەتی (الأحزاب)، ئەوە خوا لە تاریکاییان بەهۆی صەلاتی خۆی و فریشتەکانەوە دەری دێنێ بەرەو ڕۆشنایی.

کەواتە: صەلاتدانی ئێمە لەسەر پێغەمبەر ﷺ، دەبێتە هۆی صەلاتدانی خوا لەسەر ئێمە، هەروەها هی فریشتەکانی و، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئێمە لە تاریکاییان بێینەدەر، بەرەو ڕۆشنایی: ﴿لِيُخْرِجَكُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾، کە بێگومان ئەو تاریکاییانەو لێ دەرچوونیان بەرەو ڕووناکیی، هەم بواری بوونناسیی دەگرنەوە، بوونناسیی کە مرۆڤ بزانێ کێیە؟ ئەم گەردوونە چییە؟ سەرەتایی و کۆتایی و حیکمەتی؟ خاوەنی ئەم گەردوونە کێیە؟ ئەرکی ئەو مرۆڤە چییە؟ بوونناسیی هەموو ئەوانە دەگرێتەوە.

کـە لـە ڕاسـتییدا نەبـوونی بووناسـییەکی ڕاسـت و دروسـت، تاریکاییـەو، هەبـوونی بووناسـییەکی ڕاسـت و دروسـت، ڕۆشـناییە.

پاشـان ئیـمان و عەقیـدە، نەبـوونی ئیـمان و عەقیدیـەکی ڕاسـت و دروسـت، بەرانبـەر بـە: خـواو فریشـتەکانی و کتێبـەکانی و پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) و ڕۆژی دوایـی، تاریکاییـە، بەپێچەوانـەوەش: هەبـوونی ئیـمان و عەقیدەیـەکی ڕاسـت و دروسـت و سـاغ، ڕووناکییـە.

پاشـان پەرستشـەکان، دوایـی ڕەوشـت و نـاکارەکان، دوایـی ڕێکخسـتنی بـاری کەسێتیی، دوایـی ئـەدەب و ڕەوشـتە کۆمەڵایەتییـەکان، دوایـی ئیدارەدانی کۆمەڵـگا، حوکـم و سیاسـەت، بازرگانیـی، ئابووریـی، کاتێـك شـەریعەتی خـوا حاکـم نابـێ، لـە هەمـوو ئـەو ڕووانـەوە، تاریکایـی پەیدادەبـن، سـتەم و لادان و چینایەتیـی و قڕیـی و پڕیـی، پەیدادەبـێ، کاتـێ شـەریعەتی خـواش وڵات ڕۆشـن دەکاتـەوە، دڵ و دەروونی مـرۆڤ ڕۆشـن دەکاتـەوە، هـەم مـرۆڤ لـە خـودی خۆیـدا ڕۆشـنایی بـۆ پەیدادەبـێ، عەقڵـی، دڵـی، جەسـتەی، لـە چوارچێـوەی مـاڵ و خێـزانی دا، هـەم لـە هەڵسـوکەوتەکانی لەگـەڵ دەوروبـەی و لەگـەڵ کۆمەڵگایـدا، ڕۆشـنایی بـۆ پەیدادەبێ، کەواتـە: صەڵاتـدانی ئێمـە لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ، خۆمـان زیاتـر لێـی بەهرەمەنـد دەبیـن بـە تەئکیـد.

بـەڵام مـن لەگـەڵ ئـەو قسـەیەی (فخرالدين الرازي)دا نیـم، کە پێغەمبـەر ﷺ صەڵاتی ئێمـە هیـچ سـوودی پێناگەیەنـێ، ئـەوە وا نیـە، بەڵکـو صەڵاتی ئێمـە لەسـەر پێغەمبەری خـوا ﷺ دەبێتـە هـۆی ئـەوە، کـە پلـەو پایـەی بەرزتربـێ، بەڵـێ بـە تەئکیـد ئـەو پلـەو پایـەی هـەر بـەرزە، ئـەوە ئێمەیـن بـە هـۆی صەڵاتـدان لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ زیاتـر بەهرەمەنـد دەبیـن، کـە ئـەوە هـەم ئەرکێـکی سەرشـانمانە بەرامبـەر بـەوی جێبەجـێ دەکەیـن، وەك وەفادارییـەك، هـەم بەندایەتییەکـە بـۆ خـوا جێبەجـێ دەکەیـن، هـەم خۆشـمان بەهرەمەنـد دەبیـن لـەو صـەڵات نـاردن و سـەلام ناردنـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ، کـە بـە هـۆی ئـەوەوە، خـوا لـە تاریکایـان دەرمـان دێنـێ بـەرەو ڕۆشـنایی.

**٧)- وەڵامی پرسیارێك:**

بۆچـی خـوا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾، بۆچـی سـەلامی تایبـەت کـردوە بـە بڕوادارانـەوەو، بـۆ خـۆی و فریشـتەکانی بـەس بـاسی صـەڵاتی کـردوە؟

(جمال الدين القاسمي)[1]، سێ وەڵامی هێناون بۆ ئەو پرسیارە، کە ئەوانەن:

١)- (مِنَ الإحتباك، فَحُذِفَ «عَلَيْهِ» من أحدهما، و«المصدر» من الآخر): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾، واتە: ئەمە (إحتباك)ە، کە بریتیە لەوەی: لە شوێنێك شتێك دەقرتێنرێ و، لە شوێنەکەی دیکەش شتێکی دیکە دەقرتێنرێ، لە شوێنێك شتێك هەیەو، لە شوێنەکەی دیکە نیەو، ئەوەی ئەوێ، قەرەبووی ئەولا دەکاتەوە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾، واتە: بە دڵنیایی خواو فریشتەکانی صەڵات لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەدەن: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾، (وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا) تەنیا لە هی دووەمیاندا هاتوە: ﴿ تَسۡلِيمًا ﴾، چاوگ(مصدر)ەو، بۆ زیاتر جەختکردنەوەیە، هەروەها (يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ) تەنیا لە ڕستەی یەکەمیان دا هاتوە.

کەواتـە: ئـەوەی لـە هـی دووەمـدا هاتـوە بـۆ یەکەمیشـەو، ئـەوەی لە یەکەمیشـدا هاتـوە بـۆ دووەمیشـە، هـەروەك ئـەو سـەلامەش کـە لـە هـی دووەمـدا هاتـوە، واتـە: خـواو فریشـتەکانیشی هـەر سـەلام بـۆ پێغەمبـەر ﷺ دەنێرن.

٢)- (السَّلَامُ لَهُ مَعْنَيَانِ: التحيَّة والإنقِيَادُ، فَأُمِرَ بِهِ المؤمنُونَ لصحتهما منهم، واللهُ وملائكتهُ لا يجوز منهم الإنقياد، فلم يضف إليهم، دَفْعَاً للإيهام).

واتـە: سـەلام دوو واتـای هەیـە: سـڵاوکردن لەگـەڵ بـۆ ملکـەچ بـوون، بۆیـە بـڕواداران فەرمانیـان پێکـراوە بـە سـەلام کـردن، چونکـە هەردووکیـان لـە بـڕواداران دەوەشـێنەوە، هـەم سـڵاو کـردن لـە پێغەمبـەر ﷺ هـەم ملکەچکـردنی نیمانـداران

---

[1] (١) محاسن التأويل: ج٨، ص٣٠٤ و ٣٠٥.

بـۆ پێغەمبـەر ﷺ بـۆ فەرمانـەکانی، بـەڵام خـواو فریشـتەکانی بەڵـێ سـڵاوکردنیان لـە پێغەمبـەر ﷺ لـێ دەوەشێـتەوە، بـەڵام ملکـەچ بوونیـان بـۆ پێغەمبـەر ﷺ لـێ ناوەشـێتەوە، بۆیـە پاڵنەدراوەتـە لایـان، تاکـو ئـەو وەهمـە بەرپـەرچ بدرێتـەوە.

**٣)- (أنَّ السَّلَام تسليمه عَمَّا يُؤْذِيهِ، فلمَّا جاءت هذهِ الآية عقيب ذكر ما يُؤْذِي النَّبيَّ ﷺ، والأذية إنَّما هِيَ مِنَ البَشَر وقد صَدَرت مِنهُم، فَنَاسَبَ التَّخْصيص بهم والتأكيد).**

واتـە: سـەلام بریتیـە: لـە سـەلامەتکردنی پێغەمبـەر ﷺ لـە شـتێك کـە ئـازاری پێگەیاندبـێ، ئنجـا لەبەرئـەوەی ئـەم ئایەتـە لـە دوای ئـەوە هاتـوە، کـە باسی ئـازاردانی پێغەمبـەرە ﷺ، ئازاریـش لـە بەشـەرانەوە دەبـێ بـۆ پێغەمبـەر ﷺ و ئازاردانەکەشیان لێـوە دەرچـووە، بۆیـە گونجـاو بـووە، کـە ئـەو سـەلام ناردنـە تایبـەت بکـرێ بـە بڕوادارانـەوەو، جەختیـشی لێبکرێتـەوە، کـە ئـەی ئیمانداریـنە! هەمیشـە ئێـوە، سـەلام و سـڵاو ڕێـزو حورمـەت و، بـێ ئازاریـی بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ بنێـرن، ئاگاشـتان لێبـی، بـە هیـچ شـێوەیەك لـە ئێـوەوە ئـازارو بێزارکـردن و ناڕەحەتییـەکی پـێ نـەگات.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**باسی ئەوە کە ئازاردەرانی خواو پێغەمبەرەکەی، خوا ﷺ لە دنیاو دوارۆژدا نەفرینیان لێدەکات و، ئازارێکی ڕیسواکەری بۆ داناون، ئازاردەرانی بە ناهەق و بێ پاساوی بڕوادارانیش، گوناهی بوختان و تاوانێکی ئاشکرا هەڵدەگرن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەدەن، ئازاردرانی خوا، بەو واتایە کە شتێك دەڵێن و دەکەن، خوا پێی ناخۆش بێ، ئنجا خوا ﷻ بەچی ئازاردەدرێ؟ بۆ وێنە لەم فەرموودەدا هاتوە: **{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أُرَاهُ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: يَشْتِمُنِي ابْنُ آدَمَ وَمَا يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَشْتِمَنِي، وَيُكَذِّبُنِي وَمَا يَنْبَغِي لَهُ، أَمَّا شَتْمُهُ، فَقَوْلُهُ: إِنْ لِي وَلَدًا، وَأَمَّا تَكْذِيبُهُ، فَقَوْلُهُ: لَيْسَ يُعِيدُنِي كَمَا بَدَأَنِي} (أخرجه أحمد: ٩١٠٣، والبخاري: ٣٠٢١، والنسائي: ٢٠٧٨)**، واتە: پێغەمبەر پێم وایە فەرمووی: خوای بەرز فەرمووی: ئادەمزاد قسەم پێ دەڵێ و بۆشی نیە قسەم پێ بڵێ و، بە درۆی دانام و بۆی نەبوو بە درۆم دابنێ، قسە پێگوتنەکەی ئەوەیە کە من ڕۆڵەم هەیەو، بە درۆ دانانەکەشی، ئەو قسەیەتی کە دەڵێ: خوا زیندووم ناکاتەوە وەك دروستی کردووم!

ئازاردرانی پێغەمبەریش ﷺ بەوە دەبێ کە تانەی لێبدرێ و، نکوولیی لێبکرێ، هەروەها لە بارەی کەس و کارو ماڵ و خێزانی، یان هاوەڵانی، یان میراتگرانی و شوێنکەوتووانی، بە گشتیی قسەی ناشایست بکرێ، پێغەمبەر ﷺ بەوە ئازار دەچێژێ و نارەحەت دەبێ، خوا دەفەرموێ: ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەدەن.

٢)- ﴿ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ ﴾، خوا لە دنیاو دوارۆژدا نەفرینی لێکردوون، وشەی (لَعْن) بریتیە لە دوورخستنەوە لە بەزەیی و، ڕیسواکردن و سووکایەتیی پێکردنی بابای نەفرین لێکراو، خوا لە دنیاو دوارۆژدا نەفرینی لێکردوون.

٣)- ﴿ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾، سزایەکی ڕیسواکەری بۆ داناون، هەم سزاو ئازارەو، هەم ڕیسواکەرو زەبوونکەریشە، سزاو ئازارە بۆ جەستە، ڕیسواکەرە بۆ ڕووح، ئنجا لەبەر ئەوەی ئەوانەی ئازاری خوا دەدەن و، ئازاری پێغەمبەر ﷺ دەدەن، بەو واتایە کە شتێك دەکەن خوا پێی ناخۆشە، یان شتێك دەڵێن، خوا پێی ناخۆشەو، شتێك بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ دەکەن، یان دەڵێن کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بێزاربێ و ناڕەحەت بێ، لەبەرئەوەی ئەوانە مەبەستیانە: شکۆو پلەوپایەی بەرزی بێ وێنەی خوا، یاخود شکۆو پایەی پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزێنن، خوا ﷻ ئازارێکی ڕیسواکەرو زەبوونکەری وایان بۆ دادەنێ، کە ئەوان زەبوون و بچووك و نابەرچاو بن.

٤)- ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴾، هەروەها کەسانێکیش کە پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار، ئازار دەدەن، بە هەرشێوەیەك لە شێوەکان، بە قسە، بە کردەوە.

٥)- ﴿ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ ﴾، بەبێ ئەوەی شتێکی خراپیان کردبێ، (بِغَيْرِ مَا عَمِلُوا) بەبێ ئەوەی شتێکیان ئەنجام دابێ، واتە: لە خۆڕا بوختانیان بۆ هەڵدەبەستن و شتێکیان پاڵدەدەنە لا، کە نەیانکردوە.

٦)- ﴿ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾، ئەوە بە دڵنیایی ئەوانە بوختانێکیان هەڵگرتوە، هەروەها گوناهێکی ئاشکراش.

(أي: كَلَّفُوا أَنْفُسَهُمْ حِمْلًا) واتە: بارێکیان خستۆتە سەرشانی خۆیان کە باری بوختانە.

﴿ وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾، هەروەها گوناهێکی ئاشکراشیان هەڵگرتوەو لە کۆڵیان ناوە، ئەمە وەك ئایەتەکەی سوورەتی (النساء) وایە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن

يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿١١٢﴾﴾، واتـە: هـەر کەسێك گوناهێك، یان تاوانێك وەدەست بێنێ، دوایی بابایەکی بێ گوناهی پێ تۆمەتبار بکات، ئـەوە بـە دڵنیایی بوختانێکی مـەزن و گوناهێکی ئاشکرای هەڵگرتوە.

بۆیە بوختان ناوی لێنراوە: (بهتان): (لِأَنَّهُ يُبْهِتُ سَامِعَهُ)، چونکە ئەوەی کە بیبیستێ، پێی سەرسام دەبێ، پێی سەراسیمە دەبێ و زۆر نارەحەت دەبێ، بوختان بریتیە: لەوە کە شتێك پاڵبدرێتە لای کەسێك، ئەو کەسە ئەو شتەی نەکردبێ.

دەربارەی (غیبة) پرسیار کراوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش پێناسەی تەویش و هی بوختانیشی کردوە: [قِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ مَا الْغِيبَةُ؟ قَالَ: «ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ»، قِيلَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: «إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ، فَقَدِ اغْتَبْتَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدْ بَهَتَّهُ»] (أخرجه أحمد: ٨٩٧٣، ومسلم: ٢٥٨٩، وأبو داود: ٤٨٧٤).

واتە: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا! غەیبەت چییە؟ فەرمووی: بە شێوەیەك باسی برایەکەت بکەی کە پێی ناخۆش بێ، (پاشملە بە خراپە باسکردن)، گوترا: ئەدی ئەگەر ئەو برایەی کە باسی دەکەم بە خراپە، ئەو سیفەتەی تێدابێ، (ئایا هەر غەیبەتە؟)، فەرمووی: ئەگەر ئەو سیفەتە (خراپەی کە تۆ باسی دەکەی، کە ئەگەر پێی بگاتەوە پێی ناخۆش بێ) سیفەتەکەی تێدابوو، ئەوە غەیبەتە، بەڵام ئەگەر سیفەتەکەی تێدا نەبێ، ئەوە بوختانت بۆ کردوە (واتە: شتێکت پێ هەڵبەستوە، کە ئەو سیفەتەی تێدانیە).

چونکە غەیبەت ئەوەیە، کەسەکە سیفەتە خراپەکەی تێدابێ، کە باسی دەکەی، بەڵام بوهتان ئەوەیە کە ئەو سیفەتە خراپەی هەر تێدا نەبێ و تۆ بۆی هەڵبەستی، کە ئەوە گوناهەکەی بە تەئکید زیاترە لە غەیبەتکردن.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتیـمان بـدات، وەك پێویسـت ڕێـزو حورمـەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بگریـن و، هەمیشـە صـەڵات و سـەلامی بـۆ بنێریـن و، شـتێك نەڵێیـن و نەکەیـن کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێـی نارەحـەت بـێ، پێـی بێزاربـێ، چ لـە بـارەی خۆیـەوە، چ لـە بـارەی هاوسـەرانی بەڕێزیـەوە، دایـکانی بـڕواداران، چ لـە بـارەی وەچـەو ڕۆڵەکانیـەوە، چ لـە بـارەی هـاوەڵانی بەڕێزیـەوە، چ لـە بـارەی زانایـانی جێنشـین و جێگرییـەوە، چ لـە بـارەی ئۆممەتەکەیـەوە، لەبـارەی شـوێنکەوتووانی دانسـتەو تایبەتییـەوە (آل محمـد)، واتـە: شـوێنکەوتووانی دانسـتەو تایبـەتی، بـەڵام (أهـل البیـت)، واتـە: هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ، چونکـە ژن زیاتـر لـە ماڵدایـە (أهـل البیـت)، بـە پلـەی یەکـەم ژن و هاوسـەر دەگرێتـەوە، بـەڵام جـاری واش هەیـە کـە خزمـان و ئەوانـەی کـە لـە چوارچێـوەی خێزانـدان، ئەوانیـش دەگرێتـەوە، لـە کـوڕان و کچـان و ئـەوانی دیکـە.

خـوا بـە بەزەیـی و کەرەمـی خـۆی، وامـان لێبـکات خۆمـان بپارێزیـن لـە ئـازاردانی پیـاوانی بـڕوادارو ئافرەتـانی بـڕوادار، بەڵکـو لـە ئـازاردانی هـەر کەسـێك بـە ناهـەق، کـە بێگومـان ئـەوە بارێـکی قورسـە، هـەر کەسـێك ئـازاری مسـوڵمانان بـدات، ئـازاری خەڵـك بـدات، بارێـکی قورسـە، کۆڵێـکی گـران لـە کۆڵـی خـۆی دەنـێ بـۆ قیامـەت، خـوا لـەو کۆڵـە گرانـە بمانپارێـزێ و، دڵ و سـینەمان بەرانبـەر بـە هەمـوو کـەس سـاغ و سـاف بـکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان چـوار (٤) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٥٩ - ٦٢)، لـە ئایـەتی یەکەمیانـدا خـوا فەرمـان بـە پێغەمبـەر ﷺ دەکات، کـە ئامۆژگاریی هاوسـەرانی و، کچـانی و، ئافرەتـانی بـڕوادار بـکات، کـە خۆیـان داپۆشـن و کۆڵوانـەو دەسـماڵ و چارشـێوەکانیان لـە خۆیانـەوە بپێچـن، تاکـو بناسرێـن کـە خـاوەنی حەیـاو حورمەتـن و، تەماعیـان تـێ نەکـرێ و، ئازارنەدرێـن لـە لایـەن کەسـانی دڵنەخۆشـەوە.

لـە سـێ ئایەتەکـەی دیکەشـدا، خـوا هەڕەشـەی تونـد لـە موونافیـق و دڵنەخـۆش و پڕوپاگەندەچییـەکانی نێـو شـاری مەدینـە دەکات، کـە ئەگـەر دەسـت لـە خراپەکاریـی هەڵنەگـرن، پێغەمبەریـان ﷺ لـێ هانـدەدات، خـوا بـۆ خـۆشی نەفرینیـان لـێ دەکات و، لـە هـەر جێیـەك بـەر پـەل بکەون لـە کاتی جەنگـدا، دەگیرێـن و دەکوژرێـن، بەپێی یاسـای چەسـپاوی خـواش لـە ژیـانی گـەلانی ڕابـردوودا، کۆمەڵـگا دەبـێ پاکسـازیی بکـرێ، لـەو کەسـانەی کـە وەك بـژارو گیاکەڵـەوان، دەردو ئـازارو ناڕەحەتیـی تێـدا بـڵاو دەکەنـەوە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ
أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ فَلَا يُؤۡذَيۡنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ٥٩ ۞ لَّئِن لَّمۡ يَنتَهِ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ
فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡمُرۡجِفُونَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ لَنُغۡرِيَنَّكَ بِهِمۡ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ
إِلَّا قَلِيلٗا ٦٠ مَّلۡعُونِينَۖ أَيۡنَمَا ثُقِفُوٓاْ أُخِذُواْ وَقُتِّلُواْ تَقۡتِيلٗا ٦١ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي
ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ٦٢ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئـەی پێغەمبـەر! بـە هاوسـەرەکانت و کچەکانـت و ئافرەتـانی بـڕواداران بڵـێ: بـا چارشـێوو (کۆڵوان)ەکانیـان لـە خۆیـان وەنیزیـك بخـەن (لـە خۆیانیانـەوە بپێچـن)، ئـەوە نیزیکـترە بناسرێـن، کـە (بـە حەیـاو حورمەتـن و) سـەرەنجام (تەماعیـان تێنەکـرێ و) بێزارنەکرێـن بـە قسـەو ڕەفتـاری ناشایسـت، خـواش هـەردەم لێبـوردەی بـە بەزەیـی بـووە ﴿٥٩﴾ بـە دڵنیایـی ئەگـەر مونافیقـەکان و ئەوانـەی نەخۆشـیی لـە دڵەکانیانـدا هەیـەو، بڵاوکـەرەوەکانی هەواڵـی درۆو خـراپ، دەسـت هەڵنەگـرن (لـە قسـەو ڕەفتارەکانیـان) تۆیـان لـێ هاندەدەیـن، دوایـی کەمێـك لـە (کات) نەبـێ لـەوێ (مەدینـە)دا، لـە نیزیکتـەوە نابـن (واتـە: هاوشـارییت نابـن) ﴿٦٠﴾ نەفریـن لێکراوانـە (بـە دوورخرانـەوە لـە بەزەیـی خـوا، شـار بەدەردەکرێـن)، ئنجـا (دوای سـەنگەرگرتنیان لـە دژی مسـوڵمانان) لـە هـەر کوێیـەك بەرپـەل بکـەون، دەگیرێـن و بـە خەسـتیی دەکوژرێـن ﴿٦١﴾ (ئـا ئـەوە) یاسـای خوایـە لەوانـەدا کـە پێشـتر ڕابردوون و، هەرگیزیـش گۆڕانکارییـت بـۆ یاسـای خـوا چنـگ ناکـەوێ ﴿٦٢﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێ لە وشەکان

(يُدْنِينَ): (الْإِدْنَـاءُ: التَّقْرِيـبُ، وَهُـوَ كِنَايَـةٌ عَـنِ اللُّبْـسِ وَالْوَضْـعِ، أَيْ: يَضَعْـنَ عَلَيْهِـنَّ جَلَابِيبَهُـنَّ)، (إِدْنَـاءُ) واتـە: نیزیکخسـتنەوە، کـە کینایەیـە بـۆ پۆشـین و دانـانی شـتێك، واتـە: ئەوانـەی کـە جیلبابەکانیـان دەپۆشـن.

(جَلَٰبِيبِهِنَّ): (الْجَلَابِيـبُ: جَمْـعُ جِلْبَـاب، وَجَلْبَـاب وَهُـوَ ثَـوْبٌ أَصْغَـرُ مِـنَ الـرِّدَاءِ وَأَكْبَرُ مِـنَ الخِـمَارِ وَالقِنَـاع)، (جِلْبَـاب) کـە بـە (جَلَابِيـبْ) کۆدەکرێتـەوە، (جِلْبَـاب وَجَلْبَـاب) پۆشـاکێکە گچکەتـرە لـە کـراس، واتـە: ئـەوەی کـە سـەرتاپا جەسـتە دادەپۆشـێ،

گەورەتریشە لە سەرپۆش و لەچك و، لە باڵاپۆشی سەرتاسەریش گچكەترە، لە كوردەواریی دا چارشێوی پێ دەڵێن، كۆڵوانەی پێ دەڵێن، دەسماڵی پێ دەڵێن، ئەوە كە ئافرەت بەسەری خۆیدا دەدات و ناوشان و پشتیشی دەگرێ.

(وَٱلۡمُرۡجِفُونَ ): (الإرْجَافُ: إشَاعَةُ الأخْبَارِ الكَاذِبَةِ وَالمُسِيْئَةِ لِأَصْحَابِهَا)، (إرْجَاف) بریتیە لە بڵاوكردنەوەی هەواڵی درۆو، زیانگەیێنن بە هاوەڵەكانی، (مُرْجِف) كەسێكە كە ئەوە دەكات واتە: پڕوپاگەندەچییانی خراپ.

(لَنُغۡرِيَنَّكَ بِهِمۡ ): واتە: تۆیان لێ هاندەدەین، (الإغْرَاءُ: الحَثُّ وَالتَّحْرِيْضُ عَلَى فِعْلٍ، أي: نُغْرِيَنَّكَ بِعُقُوبَتِهِم)، (إغْرَاءُ) بریتیە لە هاندان و تیژكردن لەسەر شتێك، واتە: تۆ هاندەدەین لەسەر سزادانیان.

(لَا يُجَاوِرُونَكَ ): (لَا يُسَاكِنُونَكَ، لَا يَكُونُونَ بِالْقُرْبِ مِنْكَ)، واتە: لەگەڵ تۆدا لە مەدینە نیشتەجێ نابن و، لە نیزیك تۆوە نابن، هاوشارییت نابن.

(ثُقِفُوٓاْ ): (الثَّقْفُ: الظَّفَرُ وَالعُثُورُ عَلَى العَدُوِّ بِدُونِ قَصْدٍ)، (ثَقْف) بریتیە لەوە كە مرۆڤ دوژمنی لێ هەڵبكەوێ، بێ ئەوەی مەبەستی بووبێ، لە شوێنێك لێی هەڵكەوێ و بەرپەلی بكەوێ.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

لە بێژەی ئایەتەكاندا، هەروەها لە سیاقیان دا، دیارە كە كەسانێكی خراپەكار لە شاری مەدینەدا بوون، كاتێ خۆی، خوای كارزان بۆ ئەو كاتەو بۆ تێكڕای مرۆڤایەتیی بە گشتیی پەرژینێكی داناوە، لەبەردەم خراپەكارییاندا، كە ئەو چوار ئایەتە موبارەكە باسی دكەن، سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، ئەی پێغەمبەر ﷺ! ئەمە جاری پێنجەم و كۆتاییە، لەم سوورەتەدا كە خوا بە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، موحەممەد پێغەمبەری كۆتایی ﷺ خۆی بدوێنێ، ﴿ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ

وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بە هاوسەرەكانت و كچەكانت و بە ئافرەتانی بڕوادار، بفەرموو: ﴿ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ﴾، با جیلبابەكانیان لە خۆیان وەنیزیك بخەن، واتە: كۆڵوانەو دەسماڵەكانیان لە خۆیانەوە بپێچن، ﴿ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ﴾، ئا ئەوە نیزیكترە بۆ ئەوەی بناسرێن و ئازارنەدرێن، واتە: بناسرێن كە بە حەیاو حورمەتن، تەماعیان تێنەكرێ لە لایەن كەسانی دڵنەخۆشەوەو قسەو توانج و پلاریان پێ نەگوترێ، یان بە شێوەیەك لە شێوەكان مامەڵەیان لەگەڵدا نەكرێ، كە ببێتە مایەی ئازارو بێزاربوونیان، چونكە ئافرەتێك كە پۆشتەو پەرداخە، بە حەیاو حورمەتە، پیاوان لێی دەسڵەمنەوەو، پیاوان تەماعی لێ ناكەن، بەڵام ئافرەتێك وەك گۆشتی قەساب خۆی بخاتە گۆڕێ، مێینایەتیی لە خۆیدا بەرجەستە بكات، لە جیاتی مرۆڤایەتیی، بە تەئكید تەماعی تێدەكرێ، بەڵكو مەبەستیشی هەر ئەوەیەو بە زمانی حاڵ بە خەڵك دەڵێ: تەماشام بكەن، داخۆ ئەندامەكانم چۆنن؟! ئەوەش حیكمەتی پۆشتەو پەرداخ بوونی ئافرەتەو، حیكمەتی ئەوەیە كە ئافرەت لە ئیسلامدا، جۆرێك لە بەرگ و پۆشاكی بۆ دیاریكراوە، كە وەك مرۆڤ بێتە بەرچاو، نەك وەك مێینە، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، خواش هەمیشە لێبوردەی بە بەزەیی بووە، لەگەڵ كەسانێكدا كە بە هەڵە مامەڵەیان كردوە، چ ئافرەتان كە چاك خۆیان دانەپۆشیبێ لە ڕابردوودا، چ پیاوانێك كە نەخۆشیی ئارەزوویان لە دڵدا بووبێت و، ئەوە وای لێكردبن، زیان بە ئافرەتان بگەیەنن و بێزاریان بكەن، بەڵام ئێستا كە دەگەڕێنەوە، خوا لێبوردەو بەزەییە لە بەرانبەریاندا.

دیارە لە نێو شاری مەدینەدا، كەسانێك هەبوون بە تایبەت ئافرەتانیان بێزارو ناڕەحەتكردوە، بۆیە بە گشتیی پڕوپاگەندەی خراپ و قسەی خراپیان بڵاوكردۆتەوە، بۆیەش خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ ﴾، ئەگەر موونافیقەكان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایەو پڕوپاگەندەچییەكان لە مەدینەدا وازنەهێنن، واتە: وازنەهێنن لەو كارو كردەوەو ڕەفتارە قێزەونانەی دەیانكەن و، لەو قسەو قاڵانەی بڵاویان

دەکەنـەوە، ﴿ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ﴾، تۆیـان لـێ هاندەدەیـن بـە دڵنیایـی، واتـە: تـۆ لـە سـزادانیان هاندەدەیـن، ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ، ﴿ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، دوایـی ماوەیـەکی کەمیـش نەبـێ لەوێـدا، لـە شـاری مەدینـەدا، نامێننـەوە، ماوەیـەکی کـەم نەبـێ دوای ئـەوەی تـۆ سـزایان دەدەی، نامێننـەوە، چونکـە ئابڕوویـان دەچـێ، تـۆ بـۆت هەیـە دەریـان بکـەی، مـادام کـە هێمنیـی و ئاسـاییشی شـار تێکبـدەن و، هەڕەشـەبن بـۆ سـەر ئابـڕوو و کەرامـەت و هێمنیـی و ئاسـاییشی خەڵـك، ﴿ مَّلْعُونِينَ أَيْنَمَا ثُقِفُوٓا۟ أُخِذُوا۟ ﴾، نەفریـن لێکـراون لـە هـەر شـوێنێك بـەر پـەل بکـەون و، زەفەریـان پـێ بـردرێ دەگیرێـن، ﴿ وَقُتِّلُوا۟ تَقْتِيلًا ﴾، هەروەهـا زۆر بـە خەسـتیی دەکوژرێـن، واتـە: دوای ئـەوە کـە دەربـەدەر دەکرێـن، نەفرینیـان لـێ دەکـرێ، دوای ئـەوە کـە دەچنـە سـەنگەری دژایەتیـی کـردن بەرانبـەر بـە ئیسـلامەوەو، بەرامبـەر بـە ئیسـلام چـەك هەڵدەگـرن، ئـەوە لـە هـەر شـوێنێك بەرپـەل بکـەون دەگیرێـن و، بـە خەسـتیی دەکوژرێـن.

﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ﴾، ئـا ئـەوە یاسـای خوایـە لـەو گەلانـەدا کـە پێشـتر ڕابـردوون، ﴿ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴾، تـۆش گـۆڕان و گۆڕانکارییـت بـۆ یاسـای خـوا چنـگ ناکـەوێ، یاسـای خـوا لـە ژیـانی بەشـەردا، گـۆڕانی بەسـەردا نایـەت، وەك چـۆن یاسـا گەردوونییـەکانی خـوا ناگۆڕێـن، هەندێـك لـە یاسـاکانی شـەریعەتیش کـە بریتیـن لـە هێڵـە گشـتییەکانی چۆنیەتیـی بەڕێوەبـردنی کۆمەڵـگا، ئەوانـەش گۆڕانیـان بەسـەردا نایـەت و چەسـپاون.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکـردنی خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرەکـەی (موحەممـەد ﷺ) کـە ئامۆژگاریـی هاوسـەرانی و کچـانی و ئافرەتـانی پیـاوانی بـڕوادار بـکات، کـە لـە کاتی لـە مـاڵ چوونـە دەردا پۆشـتەو پـەرداخ بـن و، هـەر کـەس بینینـی بزانـێ کـە بـە حەیـاو حورمەتـن و، دووچـاری ئـازاردران و بێزارکـران نەبـن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾، لەم سووڕەتە موبارەکەدا پێنج جاران ئەم وشەیە هاتوەو، ئەمە جاری پێنجەم و کۆتاییە، ئەی پێغەمبەر ﷺ! (ٱلنَّبِيُّ) کە بە کوردیی بە پێغەمبەر، یان بە پەیامبەر مانا کراوە، ئەو کەسەیە کە خوا ﷻ بە شێوەی تایبەت سروش (وحي)ی بۆ دەنێرێ، ئەویش بە ناوی خواوە، هەواڵ بە خەڵك دەدات، بۆیە (ٱلنَّبِيُّ) کە لەسەر کێشی (فعيل)ە، دەگونجێ بە مانای (فاعل) بێ، (مُنْبِئ) کەسێك کە هەواڵ دەدات، هەواڵدەر بە ناوی خواوە، دەشگونجێ (فعيل)ی بە مانای (مفعول) بێ، (مُنْبَأ) کەسێك کە هەواڵی پێدراوە کە لە خواوە، هەواڵی تایبەتی پێ دەدرێ، بە هەردوو واتایەکەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە ئادەمەوە تاکو خاتەم، هەم خوا هەواڵی تایبەتیی پێداون، لە ڕێی وەحیی و سروشێکەوە کە بۆی ناردوون، هەم ئەوانیش هەواڵی ئەو پەیام و وەحییەی خوا بۆی ناردوون، بە خەڵکیان داوە.

٢)- ﴿ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ ﴾، ئەی پێغەمبەر! ﷺ بە هاوسەرەکانت بڵێ، مەبەست لە (أزواجك) دیارە ئەو کاتەی کە ئەم ئایەتە موبارەکە هاتۆتە خوار، لە کۆتایی ساڵی پێنجەمی کۆچییدا، زانایان دەڵێن: نۆ هاوسەری هەبوون، کە پێشتر ناومان هێناون.

٣)- ﴿ وَبَنَاتِكَ ﴾، هەروەها کچەکانت، واتە: چوار کچەکەی: (زينب، رقية، فاطمة، أم كلثوم) خوا لێیان ڕازیبێ.

٤)- ﴿ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، هەروەها بە ئافرەتانی پیاوانی بڕواداریش بڵێ: (نِسَاء: إِسْمُ جَمْعُ النِسَاء، لَا مُفْرَدَ لَهُ مِنْ لَفْظِهِ)، (نساء) ناوی کۆی ئافرەتانەو لە بێژەکەی خۆی تاکی نیە، بەڵکو تاکی ئافرەتان پێی دەگوترێ: (إمْرأة)، بە ئافرەتانی پیاوانی بڕوادار بڵێ، واتە: چ هاوسەریان بن، چ دایکیان بن، چ کچیان بن، چ خوشکیان بن ... هتد، کە چی بکەن؟

٥)- ﴿ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ﴾، جیلبابەکانیان لە خۆیان نیزیك بخەنەوە، (جَلَابِيب) کۆی (جِلْبَاب)ە یان (جَلْبَاب)ە، بە هەردووکیان هاتوە، (جلباب: وَهُوَ ثَوْبٌ أَكْبَرُ مِنَ الخِمَار)، (جلباب) پۆشاکێکە گەورەترە لە سەرپۆش، سەرپۆش ئەوە دیارە، کە قژو گەردن و سەرو ملی ئافرەت دادەپۆشێ، بەڵام جیلباب لە سەرپۆش گەورەترە، لە کوردییدا دەگونجێ کۆڵوانەی پێ بگوترێ، دەسماڵی پێ بگوترێ، چار شێوی پێ بگوترێ، مەرج نیە بە مانای عەبا بێ، چونکە ئەگەر هەموو جەستە داپۆشێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (ثَوْبٌ)، بەڵام جیلباب ئەوەیە کە ئافرەت بە خۆیدا دەدات، لەسەر سەرپۆشەوە، شان و مل و تاکو خوار پشتی دادەپۆشێ.

با جیلبابەکانیان لە خۆیان نیزیك بخەنەوە، واتە: لە خۆیانەوەیان بپێچن و خۆیان داپۆشن، بە پۆشاکە فراوانەکەی کە گچکەترە لە کراس (ثَوب) کە هەموو جەستەی دادەپۆشێ، کەواتە: مەبەست پێی عەبا نیە، چونکە عەبا هەموو جەستە دادەپۆشێ و لە (ثَوْب)یش فراوانترە، (ثَوب) واتە: کراس، هەروەها (جلباب) گەورەتریشە لە سەرپۆش، واتە: پۆشاکێکە لەو نێوانەدا، نە عەبایە هێندەی عەبا گەورەنیەو، نە بە قەدەر سەرپۆشیش گچکەیە، بەڵکو لەو

نێوانەدایـە، کـە لـە نێـو هەمـوو گـەل و کۆمەڵگایەکانـدا ئـەو جـۆرە پۆشـاکە هەیـە، ئافرەتـان خۆیـانی پـێ دادەپۆشـن.

٦)- ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ﴾، ئا ئەوە (واتە: ئەو خۆداپۆشینەیان بە جیلبابەکانیان) نیزیکترە بۆ ئەوەی بناسرێن، واتە: بناسرێن کە ئەو ئافرەتانە، ئافرەتی پۆشتەو پەرداخن، بە حەیاو حورمەتن.

٧)- ﴿فَلَا يُؤْذَيْنَ﴾، ئنجا ئازار نەدرێن، لە ئەنجامی ئەوەدا کە دەناسرێن، چ جۆرە ئافرەتێکن، خاوەنی حورمەت و کەسایەتیی خۆیانن و خۆیان داپۆشیوە، تەماعیان تێناکرێ و، ئازار نادرێن بە توانج و پلارو، بە تەماع تێکران و بە شێوەی دیکە.

٨)- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾، بە دڵنیاییش خوا لێبوردەی بە بەزەییە، واتە: لێبوردەی بە بەزەییە لە بارەی ئەوەوە کە لەوەوپێش ڕابردوە، لەو ئافرەتانە، یاخود لە پیاوانێکەوە کە تەماعیان لە ئافرەتانێك کردبێ و، دوایان کەوتبن و بێزاریان کردبن.

لـە هەمـوو تەفسـیرەکاندا دەڵـێ: ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ﴾، (أي: يُعْرفْـنَ كَحَرائِـرَ فَـلَا يَخْتَلِطْـنَ بِإِمَـاءٍ) واتـە: بناسرێنـەوە وەك ئافرەتـانی ئـازادو، لەگـەڵ کەنیزەکانـدا تێکـەڵ نەبـن!

بـەڵام مـن ئـەو مانایـەم پـێ ڕاسـت نیـە، چونکـە وشـە قورئانییەکـە، هـەم بـۆ ئـەو کاتـە گونجـاوەو، بـۆ ئێسـتاش دەگونجـێ و، لـە ڕاسـتییدا چەمکەکـەی فراوانـترە بـۆ ئـەو کاتیـش، مەسـەلە هـەر ئـەوە نەبـووە بـە هـۆی ئـەو پۆشـاکە بـە حورمەتـەوە، بزانـرێ کـە ئـەو ئافرەتـە ئافرەتێـکی ئـازادەو کەنیـزەك نیـە، چونکـە ئافرەتـانی ئازادیش هەبـوون، کـە خەڵـك تەماعـی تێکـردوون و، دیسـان خۆشـیان ڕەنگـە تەماعیـان بووبـێ بـەرەو گوناهـو لادان، وەك سـەرجەم ئەوانـەی کـە دوایـی تـووشی زینابـوون، لـە پیـاوان و ئافرەتـان و ئازادیـش بـوون.

بەڵکـو مەبەسـت ئەوەیـە، کـە ئـەو ئافرەتـە بناسـرێ نـەك بـە کەسـیی (شـخصي)، بەڵکـو بـە جۆریـی (نوعـي) بنـاسرێ، واتـە: نـەك وەك کـەس، کـە فڵانکـەسی کچـی

فڵانکەسـە، یـان هاوسـەری فڵانکەسـە، یـان خوشـکی فڵانکەسـە! بەڵکـو وەك جـۆر (نـوع) بنـاسرێ، کـە ئـەوە جـۆرە ئافرەتێکـە، هـی ئـەوە نیـە خەڵـك تەماعـی تـێ بـکات.

ئنجـا ئایـا لـە چییـەوە ئـەوە هەڵدەهێنجـرێ؟ لـەوەوە کـە ئـەو ئافرەتـە تەماشـا بکـەن: چـۆن خـۆی داپۆشـیوەو جوانییـەکانی خـۆی دەرنەخسـتوون، دەیـەوێ وەك مرۆڤێـك بێتـە بەرچـاو، نـەك وەك مێیینەیـەك، بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە پۆشـاکێکی لەبـەر کـردوە مرۆڤایەتیـی وی تێـدا بەرجەسـتە دەکات، نـەك مێینایەتیـی، ئنجـا لـە ئەنجامـی ئـەوەدا: ﴿فَلَا يُؤْذَيْنَ﴾، ئـەو کاتـە ئـازار نادرێـن، واتـە: بێـزار ناکرێـن و تەماعیـان تێناکـرێ.

## کورتە باسێک لە بارەی خێزان (أسرة)ی پێغەمبەرەوە ﷺ

خوا یار بێ ئێمە لە چوار بڕگەدا، ئەم کورتە باسە دەخەینەڕوو:

### ١)- باب و دایکی و باپیری پێغەمبەری خوا ﷺ:

شتێکی ئاشکرایە کە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتتەلیبە، ئەویش بە ڕەچەڵەك دەگاتەوە ئیسماعیل پێغەمبەر، کوڕی ئیبراهیم (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لە ڕێی عەدنانەوە.

دایکی پێغەمبەر ﷺ ئامینەی کچی وەهەب، لە بەنی زوهرەیە، کە ئەویش دوایی لە باپیرەی چەندەمدا، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕەچەڵەکی یەك دەگرێتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ کە بابی ناوی عەبدوڵڵا بووە، نۆ (٩) مامی بوون، کە دووانیان مسوڵمان بوون، حەمزەو عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، ئەوانی دیکە مسوڵمان نەبوون، هەندێکیان هەر لە فریای هاتنی ئیسلام نەکەوتوون و، پێشتر وەفاتیان کردوە، ئەوانی دیکەش نەزانراوە، مسوڵمان بووبن.

بەڵام دایکی نەمزانیوە خوشکی بووبن، واتە: ئامینە دایکی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوە وەك ئەصڵ و ڕەچەڵەکی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دیارە چ لە لایەنی بابیەوە، چ لە لایەنی دایکیەوە، عەرەبیی عەدنانیین و دەچنەوە سەر ئیسماعیل پێغەمبەر کوڕی ئیبراهیم (خلیل الله) صەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ.

### ٢)- ناوو ژمارەی هاوسەرەکانی و، ساڵی هاوسەرگیریی کردنی لەگەڵیان:

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کاتە کە ئەم سوورەتە هاتۆتە خوار، نۆ هاوسەر لە ژێر نیکاحدا بوون، کە پێشتر ناوەکانیانمان هێنا، جگە لەوانە دیارە خەدیجەش

بووه (خوا لێی ڕازیبێ)، کە خەدیجە[1] پێش کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە، وەفاتی کردووەو، باسی کۆمەڵێکی دیکەش لە ئافرەتان دەکرێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ مارەی کردوون، بەڵام نەیگواستوونەوە بە هەر هۆیەك لە هۆیەکان، بەڵام ئەوانەی کە لەلای بوون، ئەوانەن:

١- عَائِشَةُ بِنْتُ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي قُحَافَةَ بْنِ عَامِرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ كَعْبِ بْنِ سَعْدِ بْنِ تَيْمِ بْنِ مُرَّةَ بْنِ كَعْبِ بْنِ لُؤَيِّ بْنِ غَالِبٍ.

٢- حَفْصَةُ بِنْتُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ بْنِ نُفَيْلِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قُرْطِ بْنِ رِيَاحِ بْنِ رِزَاحِ بْنِ عَدِيِّ بْنِ كَعْبِ بْنِ لُؤَيٍّ.

٣- أُمّ حَبِيبَةَ بِنْتُ أَبِي سُفْيَانَ بْنِ حَرْبِ بْنِ أُمَيَّةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسِ بْنِ عَبْدِ مَنَافِ بْنِ قُصَيِّ بْنِ كِلَابِ بْنِ مُرَّةَ بْنِ كَعْبِ بْنِ لُؤَيٍّ.

٤- أُمّ سَلَمَةَ بِنْتُ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ مَخْزُومِ بْنِ يَقَظَةَ بْنِ مُرَّةَ بْنِ كَعْبِ بْنِ لُؤَيٍّ.

٥- سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ بْنِ قَيْسِ بْنِ عَبْدِ شَمْسِ بْنِ عَبْدِ وُدِّ بْنِ نَصْرِ بْنِ مَالِكِ بْنِ حِسْلِ بْنِ عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ.

٦- زَيْنَبُ بِنْتُ جَحْشِ بْنِ رِئَابِ بْنِ يَعْمَرَ بْنِ صَبْرَةَ بْنِ مُرَّةَ بْنِ كَبِيرِ بْنِ غَنْمِ بْنِ دُودَانَ بْنِ أَسَدِ بْنِ خُزَيْمَةَ.

٧- مَيْمُونَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ بْنِ حَزْنِ بْنِ بَحِيرِ بْنِ هُزَمَ بْنِ رُوَيْبَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ هِلَالِ بْنِ عَامِرِ بْنِ صَعْصَعَةَ بْنِ مُعَاوِيَةَ بْنِ بَكْرِ بْنِ هَوَازِنَ بْنِ مَنْصُورِ بْنِ عِكْرِمَةَ بْنِ خَصَفَةَ بْنِ قَيْسِ بْنِ عَيْلَانَ.

٨- وَجُوَيْرِيَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ بْنِ أَبِي ضِرَارِ الْخُزَاعِيَّة، ثُمّ الْمُصْطَلِقِيَّة.

---

(١) خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى بْنِ قُصَيِّ بْنِ كِلَابِ بْنِ مُرَّةَ بْنِ كَعْبِ بْنِ لُؤَيٍّ.

**٩- صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيِّ بْنِ أَخْطَبَ، مِنْ بَنِي النَّضِيرِ**[١]

هەندێکی دیکەش وەك کەنیزەك مامەڵەی لەگەڵ کردوون، بۆ وێنە: **(ماریة القبطیة)** خوا لە هەموویان ڕازیبێ.

## ٣)- ناوو ژمارەی کچ و کوڕەکانی پێغەمبەر ﷺ:

کچ و کوڕەکانی پێغەمبەر ﷺ کە بە ڕای زۆربەی زانایان، چوار کچەکان ئەوە دیارن، دوو کوڕیشی بوون و، هەموویان لە خەدیجە بوون واتە: ئەو چوار کچ و دوو کوڕە هەموویان لە خەدیجە بوون (خوا لێی ڕازیبێ)، تەنیا ئیبراهیمی کوڕی لە **(ماریة القبطیة)** بووە، خوا لێیان ڕازیبێ.

**أ)- کچەکانی پێغەمبەر ﷺ:**

**١- (زینب)** کە لە هەموو کچەکانی گەورەتر بووەو، کوڕی خوشکی دایکی **(إبن خالتها)**، مارەی کردوە، بە ناوی **(أبو العاص بن الربیع)**، چونکە دایکی **(العاص)**: **(هالة بنت خویلد)** خوشکی خەدیجە بووەو، زەینەب کە کچی گەورەی پێغەمبەر ﷺ بووە، لە ساڵی هەشتەمی کۆچییدا واتە: پێش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردوە.

**٢- (رقیة)** کە **(عتبة بن أبي لهب)** واتە: ئامۆزای خۆی مارەی کردوە، پێش پێغەمبەرایەتیی، دوایی کە ئەم سووڕەتە هاتۆتە خوار: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِى جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ﴿٥﴾﴾المسد.

ئەبوو لەهەب بە عوتبەی کوڕی گوت: قسەت لەگەڵ ناکەم، ئەگەر دەستبەرداری ڕوقییە نەبی، ئەویش بەبێ ئەوەی بیگوازێتەوە، دەستی لێهەڵگرتووەو تەڵاقیداوەو، عوسمانی کوڕی عەففان خوا لێی ڕازیبێ **(رقیة)**ی هێناوە، لە نێو قوڕەیش دا باو بووە، گوتوویانە: **(أَحْسَنُ شَخْصَيْنِ رَأَى إِنْسَانٌ رُقَيَّةُ وَبَعْلُهَا عُثْمَانُ)** واتە: جوانترین

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٤، ص ١٣٢ - ١٣٦.

دوو مرۆڤێك كە ئینسان بیبینی، ڕوقییەو هاوسەرەكەی عوسمانە، ڕوقییە هەردوو كۆچەكەی كردوون بۆ حەبەشە، چونكە مسوڵمانان دوو جاران كۆچیان كردوە بۆ حەبەشە، پێش كۆچی مسوڵمانان بۆ (یثرب)و لە میانی جەنگی بەدردا، كە حەڤدە (١٧) مانگ لە دوای كۆچی پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانانەوە بوو لە مەككەوە بۆ مەدینە، كاتێ كە لە جەنگی بەدر دابوون، وەفاتی كردوە، بۆیە عوسمان (خوا لێی ڕازیبێ) بۆی نەكراوە لەو جەنگەدا بەشداربێ، لەبەر ئەوەی خێزانی لەسەر مردن بووە.

٣- **(أم كلثوم)** كە **(عُتَيبَةُ بن أبي لهب)** ئەویش هەر ئامۆزای خۆی بووە، هێناویەتی، پێش پێغەمبەرایەتیی **(محمد)** ﷺ دوایی لەسەر فەرمانی بابی دەستی لێ هەڵگرتوە، پێش ئەوەی بیگوازێتەوە، ئەویش عوسمان (خوا لێی ڕازیبێ)، دوای ئەوەی ڕوقییەی لە میانی جەنگی بەدردا واتە: ساڵی دوەمی كۆچیی دا، كۆچی دوایی كردوە، **(أم كلثوم)**ی هێناوە، بەو بۆنەیەشەوە، بە عوسمان گوتراوە: **(ذا النورين)** خاوەنی دوو ڕووناكییەكان، لەبەر ئەوەی دوو كچی پێغەمبەری ﷺ یەك لە دوای ئەوی دیكە، هاوسەری بوون، **(أم كلثوم)**یش لە ساڵی نۆیەمی كۆچییدا واتە: یەك دوو ساڵ پێش كۆچی دوایی بابی وەفاتی كردوە.

٤- **(فاطمة)** كە خەدیجە كاتێك فاتیمەی بووە، كە قوڕەیشییەكان بە پێنج ساڵ پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ وەحیی بۆ بێت، بەیت (كەعبە)یان دروست دەكردەوە، واتە: پێنج ساڵ پێش ئەوەی بابی ببێتە پێغەمبەر ﷺ، فاتیمە لە دایك بوو و، گچكەترین كچی پێغەمبەر بووە ﷺ، عەلی كوڕی ئەبوو تالیب لە ساڵی دووەمی كۆچییدا، هاوسەرگیریی لەگەڵدا كردوەو، لە دوای پێغەمبەر ﷺ بە ماوەیەكی كەم (بە شەش مانگ) كۆچی دوایی كردوە (خوا لێیان ڕازیبێ).

**ب)- كوڕەكانی پێغەمبەر ﷺ:**

١- **(القاسم)**: كە پێغەمبەر ﷺ بە (القاسم) كونیەی بۆ دانراوە **(كَانَ بِهِ يُكَنَّى)**و، یەكەمین منداڵیشی بووە، كە كۆچی دوایی كردوە، دوو ساڵ ژیاوەو بە گچكەیی مردووە.

٢- **(عَبْدالله)**: كە بە **(طاهر وطيب)**یش نازناوی هەبووە، واتە: هەندێك لە زانایان كە پێیان وایە پێغەمبەر ﷺ لە خەدیجە چوار كوڕی بوون **(القاسم و عبدالله و طاهر و**

**طيب)**، وا نیەو **(طاهر وطيب)** هەردووکیان نازناوی **(عَبْدُالله)**ن، کەواتە: تەنیا دوو کوڕی لە خەدیجە بوون و، ئەوە کە گوتراوە: **(طاهر وطيب)** دوو کوڕی دیکەن، بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە، عەبدوڵلاش دیسان پێش کۆچی پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە، کۆچی دوایی کردوە.

٣- **(إبراهيم)**: کە لە **(مارية القبطية)** لە دایك بووە، ئەویش لە مانگی **(ذي الحجة)**ی ساڵی هەشتەمی کۆچییدا لە دایك بووە، کاتێك تەمەنی گەیشتۆتە شازدە (١٦) مانگ، یان هەژدە (١٨) مانگ، کۆچی دوایی کردوە، کە هەم بۆ پێغەمبەرو ﷺ هەم بۆ کچەکانیشی مایەی خەفەت و پەژارەی زۆر بووە، هەروەها بۆ سەرجەم هاوەڵانیشی.

٤)- وەچە (نسل)ی پێغەمبەری خوا ﷺ:

تەنیا لە ڕێی **(فاطمە)**ەی کچی، حەسەن و حوسەینی نەوەیەوە (خوا لێیان ڕازیبێ) وەچەی ماوەتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ سێ کچەکانی دیکەی: **(زينب و رقية و أم كلثوم)** نەزانراوە وەچەیان لێ پاشەکەوتبێ، هەبووە منداڵی بووە دوایی وەفاتی کردوە بە گچکەیی، کوڕەکانیشی بە گچکەیی مردوون، مانای وایە تەنیا لە ڕێی فاتیمەوە، وەچەی ماوەتەوە، ئەویش هاوسەرەکەی ئامۆزای خۆی بووە کە عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیبە (خوا لێیان ڕازیبێ)، ئنجا لە ڕێی حەسەن و حوسەینەوە کە فاتیمەش ئەو دوو کوڕەی بوون، لە ڕێی ئەو دووانەوە وەچەی پێغەمبەر ﷺ درێژەی بووە، واتە: هەرچی کە ڕەچەڵەکی خۆیان دەبەنەوە سەر پێغەمبەر ﷺ، لە ڕێی فاتیمەی کچیەوەیەتی نەك لە ڕێی کوڕی، چونکە کوڕەکانی بە گچکەیی مردوون.

**مەسەلەی دووەم:**

**هەڕەشەکانی خوای دادگەر لە موونافیق و دڵنەخۆش و پڕوپاگەندە چییەکانی مەدینە، کە ئەگەر وازنەهێنن، خوا پێغەمبەریان ﷺ لێ مۆڵەت دەدات و شار بەدەر دەکرێن، دواییش لە کاتی جەنگدا سزای سەخت دەدرێن، ئەوەش یاسای لە مێژینەو نەگۆڕی خوایە ﷻ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ مَّلْعُونِينَ أَيْنَمَا ثُقِفُوٓا۟ أُخِذُوا۟ وَقُتِّلُوا۟ تَقْتِيلًا ﴿٦١﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٦٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ﴾، بە دڵنیایی ئەگەر موونافیقەکان واز نەهێنن و دەستهەڵنەگرن.

٢)- ﴿وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾، هەروەها ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە.

٣)- ﴿وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ﴾، هەروەها پڕوپاگەندە چییەکان و، بڵاوکەرەوەکانی هەواڵی ناخۆش لە نێو مەدینەدا، ئەگەر ئەو سێ تاقمە واز نەهێنن، واز لە چی نەهێنن؟ واز لە پیلان گێڕان و خراپەکاریی، هەموو ئەو شتانە نەهێنن کە بە زمان دەکرێن، یاخود بە دەست دەکرێن، واتە: واز لە قسەی خراپ و کرداریی خراپ و، بڵاوکردنەوەی ئاشووب و گوناهو تاوان لە نێو شاری مەدینەدا، نەهێنن و دەست لەوە هەڵنەگرن!.

٤)- ﴿لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا﴾، مسۆگەر تۆیان لێ هاندەدەین و بە گژدا دەکەین، دواییش کەمێك نەبێ لەوێدا، (لە نێو مەدینەدا، لە نێو شارەکەتدا) دراوسێی تۆ نابن، لە تۆ نیزیك نابن و هاوشاریی تۆ نابن، واتە: شار بەدەر دەکرێن.

زانایـان لـەو بـارەوە کـە ئایـا ئـەم سـێیە: ﴿لَّئِن لَّمۡ يَنتَهِ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡمُرۡجِفُونَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾، ئایـا سـێ وەصفـن بـۆ یـەك کۆمـەڵ؟ یاخـود سـێ جـۆرە تاقـم بـوون؟

لەو بارەوە هەردووك بۆچوون هەن.

بـەڵام پێموایـە سـێ جـۆرە کۆمـەڵ بـوون، هەرچەنـدە (محمـد الطاهـر بـن عاشـور) و هەندێـکی دیکـە دەڵێـن: ئەوانـە هـەر سـێکیان وەصفـن بـۆ یـەك کۆمـەڵ، کـە بـە مونافیقیـش ناوزەنـد کـراون، بـە دڵ نەخۆشـیش، بـە پڕوپاگەندەچییـش.

بەڵام پێموایە، ئەو ڕایە نەپێکاوە، چونکە:

یەکەم: هەر ئەوە کە بە (و) عەتفکراون: ﴿لَّئِن لَّمۡ يَنتَهِ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡمُرۡجِفُونَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾، ئەوە بۆ خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە سێ کۆمەڵی جیابوون، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (العَطْفُ يدلُّ على المغايرة) بادانەوەی جیایی دەگەیەنێ.

دووەم: لە قورئاندا کە باسی (منافقون) دەکرێ، واتە: ئەوانەی مونافیقی خەست و تەواو عیارن، پێناسەی مونافیقیان بە تەواویی بەسەردا دەچەسپێ و، ئەوەش لە قورئان دا زۆر ئاشکرایە، بۆ وێنە سەرەتای سوورەتی (المنافقون) تەماشا بکە!.

بەڵام دوو تاقمەکەی دیکە:

أ- ﴿وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ﴾، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، مەرج نیە، مونافیق بن، یان مونافیقی تەواوبن، ڕەنگە چەند سیفەتێك، یان چەند هەڵسوکەوتێکی مونافیقانیان هەبێ و تێدابێ.

ب- ﴿وَٱلۡمُرۡجِفُونَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾، پڕوپاگەندەچیی و بانگەشەکەرانی خراپەش لە مەدینەدا، ئەوانیش دیسان دەگونجێ هیچ پەیوەندییان بە نیفاقەوە نەبێ و، مسوڵمانانێکی ناحاڵیی و نا تێگەیشتوبن، یان زار پەل بن و قسەیان لێ بکەوێتە خوار،

یاخود هەندێ کەس پێی خۆشە کە هەواڵێکی بیست، یەکسەر بڵاوی بکاتەوە، یان بە دوای هەواڵدا دەگەڕێ.

بۆیە ڕاستتر وایە بڵێین: ئەوانە سێ کۆمەڵ بوون، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر موونافیقەکان و، دڵنەخۆشەکان، ئنجا ئەو دڵ نەخۆشییەش: ﴿وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، ئایا مەبەست پێی دوو دڵیی و گومانە، یاخود مەبەست پێی ئارەزووی زیناو خراپەیە؟ یاخود مەبەست پێی کینەو بوغزە بەرانبەر بە ئیسلام و مسوڵمانان؟ هەموویان و جگە لەوانیش دەگرێتەوە، دەشگونجێ هەر سێك جۆرە نەخۆشییەکەیان تێدابووبن و، دەشگونجێ نەخۆشیی دیکەیان تێدا بووبن.

﴿وَٱلْمُرْجِفُونَ فِي ٱلْمَدِينَةِ﴾، (إرجاف) بریتیە: لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی درۆ، کە زیان گەیێنەربێ بە خاوەنەکانی، واتە: ئەوانەی هەواڵەکەیان لەبارەوە بڵاودەکرێتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ﴾، (الإغْرَاءُ: الحَثُّ وَالتَّحْرِيْضُ عَلَى فِعْلٍ)، (إغْرَاءُ) بریتیە لە هاندان و تیژکردن لەسەر کارێك.

کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا﴾، (ثُمَّ) لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی پلەیی (الترتیب الرتبي)یە، چونکە دەرکران لە نیشتیمان، سەختترە، لە زیانگەیاندن بە جەستە، یان بە ماڵ و سامان.

٥)- ﴿مَّلْعُونِينَ﴾، لە حاڵێك دا نەفرینلێکراون، ئەمە پەیوەستە بە ڕستەی پێشترەوە کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا﴾، کەمێك نەبێ دراوسێی تۆ نابن، کەمێك نەبێ لە نیزیك تۆ نابن، لە شارەکەتدا نامێننەوە، دوای ئەوەی لەسەر خراپە بەردەوام دەبن و دەست هەڵناگرن، خوا ﷻ مۆڵەتی پێغەمبەر ﷺ دەدات کە سزایان بدات و دوای ئەوە کەمێك نەبێ نامێننەوە، بایی ئەوەندە کە نهێنییەکانیان ئاشکرا دەبن و، پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگیان دەدا شار بەجێ بهێڵن، مادام واز لە خراپە ناهێنن، ئنجا لەو حاڵەتەدا نەفرین لێکراو دەبن و، خواش ﷻ دووریان دەخاتەوە لە بەزەیی خۆی، کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا﴾، زۆربەیان وایان

لێکداوەتەوە کە: (لَا یَسَاکِنُونَكَ فِیها)، لەگەڵ تۆدا لە شارەکەدا نامێننەوە، واش پێدەچێ مەبەستی ئەو ڕستە موبارەکە هەر ئەوەبێ.

٦)- ﴿ أَيْنَمَا ثُقِفُوٓاْ أُخِذُواْ وَقُتِّلُواْ تَقْتِيلًا ﴾، لە هەر شوێنێك بەرپەل بکەون، زەفەریان پێ ببرێ، دەگیرێن و زۆر بە سەختیی دەکوژرێن، (أَيْنَمَا: إِسْمُ زَمَانٍ مُتَضَمِّن مَعْنَى الشَّرْط)، (أَيْنَمَا) ناوی کاتە، بەڵام مانای مەرجی گرتۆتە نێو خۆی، واتە: بە مەرجێك کە بەرپەل بکەون و، زەفەریان پێ ببردرێ، دەگیرێن، (تَقْتِيلًا ) چاوگ (مصدر)ێکە جەخت لەسەر کردارەکەی خۆی دەکاتەوە، (أَي: قُتِلوا قَتْلًا شَدِيْدًا)، زۆر بە خەستیی و، سەختیی دەکوژرێن.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوەیە، کە دوای ئەوەی ئەوانە شاری مەدینە بەجێدێڵن و، ئیعلانی دژایەتیی و سەنگەرگرتن بەرانبەر بە ئیسلام و مسوڵمانان دەکەن، لەو کاتەدا خوێنیان حەڵاڵ دەبێ و، لە هەر شوێنێ بەرپەل بکەون، سزا دەدرێن و دەکوژرێن، لەبەر ئەوەی دوژمنێکەو سەنگەری گرتوەو، هەر کەسێ سەنگەریش لە ئیسلام بگرێ و، بە چەك و هێز لە دژی مسوڵمانان و ئیسلام بوەستێ، مسوڵمانانیش لە بەرانبەریدا دەستەو ئەژنۆ نابن، هەرچەندە هەتا دوێنێ هاوشاریی بوو بێت و، خۆشی بە مسوڵمان لە قەڵەم دابێ.

٧)- ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلُ ﴾، ئەمە یاسای خوایە لە گەلانی ڕابردوو و تێپەڕیویش دا، بووە.

﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ ﴾، کە (منصوب)ە، (مَفْعُولٌ مُطْلَقٌ نَائِبٌ عَنْ فِعْلِه)، (أَي: سَنَّ اللهُ سُنَّةً)، خوا یاسایەکی داناوە، لەوانەی کە لە پێشدا ڕابردوون، کە بەو شێوەیە دەبێ مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، (أَي: سَنَّ اللهُ إِغْرَاءَكَ بِهِمْ سُنَّتَه فِي أَعْدَاءِ الدِّيْن) واتە: خوا ﷻ هاندانی تۆی لە دژیان کردوە بە یاسایەك، کە ئەو یاسایەی پێشتریش داناوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانێکدا کە دژی ئیسلامن، دژی ئایین و بەرنامەی خوان، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ ﴾، پسپۆڕانی زمان دەڵێن: (فِي لِلظَّرْفِيَةِ المَجَازِيَةِ، شُبِّهَتِ السُّنَّةُ الَّتِي عُومِلُوا بِهَا بِشَيْءٍ فِي وَسَطِهِمْ، كِنَايَةٌ عَنْ تَغَلْغُلِهِ فِيهِمْ وتناوله جَمِيعَهُمْ)، واتە: (فِى)، ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى

﴿ٱلَّذِينَ﴾، بـۆ زەرفیـەتی مەجازییـە، [(ظـرف) شـتێکە، شـتێکی تێبکـرێ]، یـانی: ئـەو یاسـایەی کـە ئـاوا مامەڵـەی لەگەڵیـان دا پـێ دەکـرێ، چوێـنراوە بـە شـتێکەوە کـە چۆتـە نێوانیانـەوە، ئەویـش کینایەیـە بـۆ ئـەوە کـە ئـەو یاسـایە تێیانـدا قووڵبۆتـەوەو، هەموویـانی گرتۆتـەوەو کـردوونی بـە توورەکـە (ظـرف)ی خـۆی!

﴿ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُ﴾، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی دوژمنـانی پێغەمبـەران بـێ (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم)، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی کۆمەڵـگا پێشـووەکان بـێ.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ:

٨)- ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُـنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلًا﴾، هەرگیزیش گۆڕانت بۆ یاسای خوا ﷻ چنگ ناکەوێ، واتە: یاسای خوا نابێ بگۆڕدرێ، هەر کەسێك ئیمانداربێ و پابەندبێ بە بەرنامەی خواوە، نابێ یاساکانی بگۆڕێ، کە لێرەدا مەبەست پێی یاسای مامەڵەکردنە لەگەڵ کەسانێکدا، کە بە ئاشکرا پیلانگێڕیی دەکەن و، دژایەتیی ئیسلام و مسوڵمانان دەکەن، یانی: مەبەست لە: (سنة الله) یاسای خوا، یاسای شەرعییەو، هەر ئەم ڕایەش لەگەڵ ئەم سیاقەدا گونجاوە.

بەشـێك لـە زانایانیـش وایـان لێکداوەتـەوە، کـە مەبەسـت لـە: (سـنة اللـه) یاسـای گەردوونیـی خوایـە، منیـش وای تێدەگـەم کـە ئـەم یاسـایەی مامەڵەکـردن لەگـەڵ ناحـەزانی نێـو خـۆدا، وێـڕای ئـەوە کـە یاسـایەکی شـەرعییەو لـە ڕێـی وەحییـەوە دەزانـرێ، هـاو کات یاسـایەکی گەردوونیـی (قانـون کـوني)ی خوایـە لـە ژیـانی بەشـەردا وەك گەلێـك یاسـای دیکـە، کـە شـەرعیی و گەردوونییشـن لـە یـەك کات دا.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان یـازدە (١١) ئایـەتی كۆتایـی سـوورەتی (الأحـزاب) دەگرێتـە خـۆی: (٦٣ - ٧٣)، كـە تـەوەری سـەرەكییان بـاسی ڕۆژی دوایـی و، سـەرەنجامی شـوومی بێبڕوایانـی شـوێنكەوتەو لاسـاییكەرەوەی سـەركردەو دەمڕاسـتە خـۆ بەزلگرەكانـە.

هەروەهـا چەنـد ڕێنماییـەكی گـەورەو گرنـگ بـۆ بـڕواداران، كراونـە نێواخنـی ئـەو بابەتـە.

لـە كۆتاییشـدا بـاسی هەڵگرتنـی مـرۆڤ بـۆ سـپاردەی خـوا ﷻ كـراوە، لـە حاڵێكـدا كـە ئاسـمانەكان و زەوی و چیایـەكان، لـە بەرانبەریـدا دەستەوسـانیی و بێتوانایـی خۆیـان دەربڕیـوەو، لێیترسـاون، سـەرەنجامیش حیكمـەت و ئامانجـی ئـەو سـپاردە پێ سـپێردرانەی مـرۆڤ، لـە لایـەن خـواوە خراوەتـە ڕوو، كـە پاداشـتدانەوەی بـڕواداران و، سـزادرانی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران و مونافیقەكانـە.

﴿يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ
قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا
وَلَا نَصِيرًا ﴿٦٥﴾ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾
وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ
ٱلْعَذَابِ وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴿٦٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ
مِمَّا قَالُوا۟ ۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾
يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾
إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا

ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ
وَٱلْمُشْرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًۢا ﴿٧٣﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

[خەڵك لە بارەی كاتی دیاریكراو(ی ڕۆژی دوایی)ەوە پرسیارت لێ دەكەن، بڵێ: زانیارییەكەی تەنیا لە لای خوایە، تۆش (ئەی موحەممەد) چ شتێك وات لێدەكات بزانی! ڕەنگە كاتی دیاریكراو نیزیك بێ ﴿٦٣﴾ بێگومان خوا نەفرینی لە بێبڕوایان كردووە، بڵێسەی ئاگری (دۆزەخ)ی بۆ ئامادە كردوون ﴿٦٤﴾ بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، هیچ سەرپەرشتیارو پشتیوانێكیان چنگ ناكەوێ ﴿٦٥﴾ ئەو ڕۆژە كە بێبڕوایان، ڕووەكانیان لە نێو ئاگردا هەڵگێڕو وەرگێڕ دەكرێن، دەڵێن: ئەی خۆزگە فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەرمان كردبایە! ﴿٦٦﴾ هەروەها بێبڕوایەكان لە دۆزەخدا گوتیان: پەروەردگارمان! ئێمە (بۆیە بەو مەرەدە چووین چونكە) بە قسەی سەرۆكەكانمان و گەورەكانمان كردو، ئەوانیش لە ڕاستە ڕێ ونیان كردین ﴿٦٧﴾ پەروەردگارمان! (ئەوان) دوو هێندە ئازاربدەو، بە نەفرینلێكرانێكی گەورە، نەفرینیان لێ بكە ﴿٦٨﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەك ئەوانە مەبن كە مووسایان ئازاردا (بە قسەو تۆمەتی ناڕاست) خواش لەوەی گوتیان: پاكیەتیی (وی) دەرخست و دووری خستەوە (و مووساش) لە لای خوا، گرانقەدرو بەڕێز بوو ﴿٦٩﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بكەن و، قسەی ڕێك و ڕاست بكەن ﴿٧٠﴾ (ئەگەر وا بكەن) كردەوەكانتان بۆ ڕێك و چاك دەكات و، گوناهەكانتان بۆ دەبوورێ و، هەر كەسیش فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەكەی بكات، بە بردنەوەیەكی مەزن بردوویەتەوە ﴿٧١﴾ ئێمە سپاردە (ی خۆمان)مان لەسەر ئاسمانەكان و زەوی و چیاكان ڕانواند (كە هەڵیگرن) بەڵام ئامادە نەبوون هەڵیگرن و ترس و بیمیان لێی (لە سەرەنجامی هەڵگرتنی) هەبوو، كەچی

مـرۆڤ هەڵیگـرت، بـە دڵنیایـی ئەویـش (ئەگـەر دەسـتی بـە هیدایـەتی خـواوە نەبـێ) زۆر سـتەمکارو زۆریـش نەفامـە ﴿٧٢﴾ (خـوا ئـەو سـپاردەیەی بـە مـرۆڤ سـپارد) تاکـو سـەرەنجام خـوا پیاوانی مونافیـق و ئافرەتـانی مونافیـق و، پیـاوانی هاوبەشـدانەرو ئافرەتـانی هاوبەشـدانەر، سـزا بـدات (لەسـەر خیانـەت کردنیـان بـە سـپاردەی خـوا)و، (بڕوادارانیـش بگەڕێنـەوەو) خـواش گەڕانـەوە لـە پیـاوانی بـڕوادارو ئافرەتـانی بـڕوادار وەربگـرێ، خـواش هەمیشـە لێبـوردەی بـە بەزەیـی بـووە ﴿٧٣﴾ }

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(سَعِيرًا ): (السَّعَرُ: إلتِهَابُ النَّارِ وَسَعِيْرٌ: فَعِيْلٌ بِمَعْنَى مَفْعُول)، (سَعر) بریتیـە لـە بڵێسـەدانی ئاگـرو، وشـەی (سَعِيْر) لەسـەر کێشی (فَعِيْل)ە، بـەڵام بـە مانـای (مَفْعُول)ە، واتـە: ئاگرێـك کـە بڵێسـەدار کرابـێ.

(سَادَتَنَا ): (السَّادَةُ جَمْع السَّيِّد، وَهُوَ المُتَوَلِّي للسَوَاد، أي: الجَمَاعَة الكَثِيْرَة، وَسَيِّد القَوْم، وَسَادَتَنَا أي: وُلَاتَنَا وَسَائِسِيْنا)، (سَادَة) کـۆی (سَيِّد)ە، واتـە: کەسـێك کـە سەرپەرشـتیی ئاپۆرایـی و حەشـەمات (سَوَاد) دەکات، خەڵـك و کۆمەڵێـکی زۆر، دەگوتـرێ: (سَيِّد القَوْم) واتـە: سـەرۆکی خەڵکەکـە، کەواتـە: (سَادَتَنَا ) واتـە: سەرپەرشـتیارانمان و سیاسـەتمەدارانمان و بەڕێوەبەرانمـان.

(وَكُبَرَآءَنَا): (كُبَرَاء) کـۆی (كَبِيْر)ە، بـە مانـای گـەورەی هـۆز (عَظِيْم العَشِيْرَة) دێ، (كَبِيْر) لـە خـوار (سَيِّد)ەوەیە، چونکـە (كَبِيْر) بـە سـەرۆکی خێـڵ و هـۆز دەگوتـرێ، بـەڵام (سَيِّد) کـە بـە (سَادَة) کـۆ دەکرێتـەوە، کەسـێکە سـەرۆکی هەمـوو لایەکـەو وڵات ئیـدارە دەدات.

(وَجِيهًا ): واتـە: خـاوەن ڕێـزو پێگـەی چـاك، (وجیـە) سـیفەتە، یـانی: (ذُو الوَجَاهَة) خـاوەن ڕوو و پێگـە، (الجَاهُ: حُسْنُ القُبُولِ عِنْدَ النَّاس، وَجُهَ الرَّجُل، فَهُوَ وَجِيْهٌ)، (وَجِيْه) کەسێکە خـاوەن وەجاهـەت بـێ، ئەویـش بریتیـە: لـە هەبـوونی ڕێـزو پەسـند

کـران لـە لایـەن خەڵـك، چـاك پەسـندکران لـە لای خەڵـك، دەگوتـرێ: (وَجِـهَ الرَّجُـلُ فَهُـوَ وَجِيـهٌ)، پیاوەکـە خـاوەن ڕێـزو حورمـەت و پێگـە، بـوو.

(سَدِيدًا): (السَّـدِيْدُ: الَّـذِي يُوَافِـقُ السَّـدَاد، وَالسَّـدَاد: الصَّـوَابُ وَالحَـقُّ، وَمِنْـهُ تَسْـدِيْدُ السَّـهْمِ عِنْـدَ الرَّمْـيِ)، (سَـدِيْد) ئەوەیـە کـە لەگـەڵ (سَـداد)دا یـەك بـێ، سـەدادیش واتـە: ڕاسـتیی و هـەق، لـەوەوە (تَسْـدِيْدُ السَّـهْمِ) هاتـوە، تیـر کـە لـە نیشـانە دەگیرێ، ئەگـەر نیشـانەی پـێ بپێکـرێ، دەگوتـرێ: (سَـدَّد سَـهْمَهُ)، تیرەکـەی ڕێـك لـە شـوێنی مەبەسـتیدا.

(فَازَ): (الفَـوْزُ: الظَّفَـرُ بالخَـيْرِ مَـعَ حُصُـولِ السَّـلَامَةِ)، (فـوز) بریتیـە لـە وەدەسـت هێنـانی خێـرو چاکـە، لەگـەڵ پەیدابـوونی سـەلامەتیی و بـێ مزەڕەتییشـدا.

(عَرَضْنَا): (عَرَضْـتُ الـشَّيء عَـلَى البَيْـعِ، وَعَرَضْـت الـشَّيءَ عَـلَى فُـلَانٍ، وَعَرَضْـتُ الجُنْـدَ، وَالعَـارِضُ: البَـادِي عُرْضَـهُ) واتـە: شـتەکەم ڕانوانـد پێشـانمدا بـۆ فرۆشـتن، یاخـود بـۆ فلاّنکەسـم ڕانوانـدو پێشـانمدا، سـەربازەکانم ڕانوانـدن، (العَـارِضُ) کەسێکە لاملی بـۆ کەسێك بخاتـەڕوو.

(ٱلْأَمَانَةَ): (الأَمَانَـةُ: مَـا يُؤْمَـنُ عَلَيْـه الإنْسَـان)، ئەمانـەت هـەر شـتێکە کـە مـرۆڤ لەسـەری ئەمینـدار بکـرێ، واتـە: پێـی بسـپێردرێ کـە بیپارێـزێ.

(وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا): (الإشْـفَاقُ: عِنَايَـةٌ مُخْتَلِطَـةٌ بخَـوْفٍ؛ لأنَّ المُشْـفِقَ يُحِـبُّ المُشْـفَقَ عَلَيْـهِ، وَيَخَـافُ مَـا يَلْحقُـهُ)، (إشْـفَاق) بریتیـە لـە خـەم لـێ خواردنێـکی تێکـەڵ لەگـەڵ تـرس دا، چونکـە بابـای بـە پـەرۆش (مُشـفق)، بابـای جێـی پـەرۆش (مُشـفَق)ی خۆشـدەوێ و تـرس و بیمیـشی هەیـە تـووشی زیـان و نـازار ببـێ.

کەواتــە: (وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا)، واتــە: ئــەو شــتەیان خۆشدەویســت، بــەڵام ترســیان بەرانبەریـشی هەبـوو کـە زایـە ببـێ، بۆیـە ئامـادە نەبـوون هەڵیگـرن، پێـم وایـە وشــەی (إشــفاق) لــە کوردیــی دا بــە پەرۆشــبوون، مانــا بکــرێ، باشــە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە کۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەدا، جارێـکی دیکـە ڕوو دەکاتـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ و پێـی دەفەرمـوێ: ﴿يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ﴾، خەڵـك لـە بـارەی (ٱلسَّاعَةِ)ەوە پرسـیارت لێدەکـەن، (ٱلسَّاعَةِ) یـانی: ئـەو کاتـە دیاریکـراوەی کـە ڕۆژی دوایـی تێـدا دێ، جـاری وایـە: (ٱلسَّاعَةِ) بـە مانـای ئاخیـر زەمـان دێ، کۆتایـی هاتنـی ئـەم گەردوونـە، دوای فـووی یەکـەم، کـە ئیسـڕافیل بـە کەڕانایـدا دەیـکات و شـەیبوور، لێـدەدات، جـاری واشـە: (ٱلسَّاعَةِ) بـە مانـای (قیامـة) دێ، واتـە: ئـەوەی کـە لـە دوای فـوی دووەم، کـە لەلایـەن ئیسـڕافیلەوە بـە کەڕەنـادا دەکـرێ، ڕوودەدات، کـە بریتیـە لـە زیندووبونـەوەو هەسـتانەوەی خەڵـك، جـاری واشـە: (ٱلسَّاعَةِ) بـە کۆی ڕۆژی دوایـی دەگوتـرێ بـە هـەردوو قۆناغەکەیـەوە: ئاخیـر زەمـان و زیندووبونـەوە، ئنجـا دەفەرمـوێ: پرسـیارت لێدەکـەن، لـەو کاتـەی ئـەو ڕووداوە مەزنـەی تێـدا دەقەومـێ، ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ﴾، بڵـێ: زانیارییەکـەی تەنیـا لـە لای خوایـە، ﴿وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا﴾، تـۆش چـووزانی (ئـەی موحەممـەد! ﷺ) ڕەنگـە (ٱلسَّاعَةِ) زۆر نیزیـك بـێ، لەوانەیـە نیزیـك بـێ ئـەو کاتـە دیاریکـراوە، بـێ.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا﴾، بـە دڵنیایـی خـوا ﷻ نەفرینـی لـە بێبڕوایـان کـردووەو، ئاگرێـکی بڵێسـەداری بـۆ ئامـادە کـردوون، ﴿خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾، بـە هەمیشـەیی تێیـدا دەمێننـەوەو لێـی دەربـاز نابـن، ﴿لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾، هیـچ سەرپەرشـتیارو هیـچ پشتیوانێکیشـیان چنـگ ناکـەوێ، لـە فریایـان بـێ لـەو ئاگـرە دەربازیـان بـکات، ﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ﴾، ئـەو ڕۆژە کـە ڕووەکانیـان لـە نێـو ئاگـردا هەڵگێـڕو وەرگێـڕ دەکرێـن، واتـە: ئـەم دیـو ئـەو دیویـان پێدەکـرێ، بـۆ ئـەوەی بـاش بسـووتێن، ﴿يَقُولُونَ يَـٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠﴾، دەڵێـن: ئـەی خۆزگـە! فەرمانبەریـی خـواو فەرمانبەریـی پێغەمبەرمـان کردبایـە ﷺ، بـە قسـەی خـواو ڕەوانەکراوەکەیـمان کردبایـە، بـەڵام داری خۆزگـە بـەر ناگـرێ، ﴿وَقَالُوا۟

رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا ﴾، هەروەها گوتیان: ئەی پەروەردگارمان! ئێمە بە قسەی سەرۆکەکان و گەورەکانی خۆمامان کرد، ﴿ فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا ﴾، ئەوانیش ئێمەیان لە ڕێ ونکرد، یاخود: ڕێیان لە ئێمە ونکردو لایاندایـن، سەرگەردانیان کردین، ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴾، پەروەردگارمان! دوو قات لە سزا بۆ ئەوان، بدە، ئەوان دوو بەرانبەر سزاو ئازاربدەو، بە نەفرینێکی گەورەش نەفرینیان لێ بکە.

(ضِعۡفَيۡنِ) دەگونجێ بە مانای دوو بەرانبەر بێ، دەشگونجێ بە مانای چەند بەرانبەر بێ.

ئنجا خوا ﷻ لەم سوورەتەدا، بۆ جاری شەشەم ڕوو دەکاتە بڕواداران و دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ﴿ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ ﴾، وەك ئەوانە مەبن کە ئازاری مووسایاندا، مووسایان بێزار کرد، بە قسەو تۆمەتی ناڕەوا، ﴿ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْ ﴾، خوا لەوەی گوتبوویان، بەریی کردو دووری خستەوە، پاکانەی بۆ کرد، ﴿ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا ﴾، مووساش لە لای خوا ﷻ زۆر خاوەن ڕێزو حورمەت و پێگەی تایبەت بوو.

ئنجا خوا بۆ جاری حەوتەم و کۆتایی لەم سوورەتەدا، ڕوو دەکاتە بڕواداران، ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن و قسەی ڕێك و ڕاست بکەن، ﴿ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَـٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾، [ئەگەر پارێز لە خوا بکەن و قسەی ڕێك و ڕاست بکەن] [خوا ﷻ] کردەوەکانتان بۆ چاك دەکات و لە گوناهەکانیشتان دەتانبووری، ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾، هەر کەسێکیش فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات، بە دڵنیایی بە بردنەوەیەکی مەزن بردوویەتەوە، واتە: چاك بە ئامانج و ئاکامی خۆی گەیشتوە.

لـه کۆتاییـدا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ ﴾، بـه دڵنیایـی ئێمـه سـپاردەمان ڕانوانـد لەسـەر ئاسـمانەکان و زەوی و چیایـەکان، ﴿ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا ﴾، کەچـی لاملییـان کـرد کـه هەڵیگـرن، یـان: ئامادەنەبـوون هەڵیگـرن، ﴿ وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا ﴾، پـەرۆش تـرس و بیمیـان بەرانبـەری هەبوو، بەرانبـەر بـەو سپاردەیە کـه ئەگـەر پێیـان بسـپێردرێ، لـه دەستیان زایـه بـێ و، نەتوانـن هەقـی خـۆی پێبـدەن، ﴿ وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ﴾، کەچـی مـرۆڤ هەڵیگـرت، ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾، بـه دڵنیایـی مرۆڤیـش گەلێـك سـتەمکارو زۆر نەفامـه، مەگـەر بەهـۆی هیدایـەتی خـواوە، سـتەمەکەی بگۆڕێ بـۆ دادگەریـی و، نەزانییەکەشی بگـۆڕێ بـۆ زانیاریـی و بەرچـاو ڕوونیـی.

ئنجـا ئایـا بۆچـی خـوا ﷻ ئـەو ئەمانەتـەی بـه مـرۆڤ سـپارد، ئـەو سـپاردەیەی که بـه ئاسـمانەکان و زەوی و چیایـەکان هەڵنەگیـرا؟ ﴿ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ ﴾، بـۆ ئـەوەی سـەرەنجام خـوا پیـاوانی مونافیـق و ئافرەتـانی مونافیـق و، پیـاوە هاوبـەش بـۆ خوادانـەرەکان و ئافرەتـە هاوبـەش بـۆ خوادانـەرەکان، سـزا بـدات، لـه ئەنجامـی خیانەتکردنیـان بـەو سـپاردەیەی خـوادا، ﴿ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴾، پیـاوانی بـڕوادارو ئافرەتـانی بڕواداریـش (دوای ئـەوەی بـۆ لای خـوا دەگەڕێنـەوە)، خـوا بگەڕێتـەوە بـۆ لایـان و تۆبەیـان لێوەربگـرێ و، لـه کـەم و کوڕییەکانیـان چاوپۆشـییان لێبـکات، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، بـه دڵنیایـی خـواش ﷻ لێبـوردەی بـه بەزەییـه.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**پرسیارکردنی خەڵك لە بارەی کاتی دیاریکراوی هاتنی ڕۆژی دوایيەوە، وەڵامدانەوەیان کە زانیارییەکەی تەنیا لەلای خوایەو، خستنە ڕووی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان و سووتێنرانی ڕووەکانیان لە دۆزەخداو، پەشیمان بوونەوەیان و، پاساو هێنانەوەیان بەوە کە گوێڕایەڵیی سەرۆك و دەم ڕاستەکانی خۆیانیان کردوە، بۆیە بەو دەردە چوون و داواکردنیان لە خوای پەروەردگار، کە سزای ئەوان دوو قات، یان چەند قات بێ و، نەفرینێکی گەورەشیان لێبکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٦٥﴾ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَـٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴿٦٨﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

**١)- ﴿يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ﴾، خەڵك لە بارەی (ٱلسَّاعَةِ)ەوە لێت دەپرسن، وشەی (ٱلنَّاسُ) (أل)ی ناساندنی لەسەرە، دەگونجێ (أل) بۆ (عهد) بێ، واتە: خەڵکە دیارییکراوەکە، ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە واتە: هاوبەش بۆ خوا دانەران و بێبڕوایەکان، دەشگونجێ (ٱلنَّاسُ)، (أل) بۆ (جنس) بێ، واتە: تێکڕای خەڵك، کە مەبەستیانە بزانن ڕۆژی دوایی کەی دێ و چۆن دەبێ؟ هەردووك واتاکەش گونجاون.**

٢)- ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ﴾، بڵێ: زانیاریی هاتنی (ٱلسَّاعَةِ) تەنیا لە لای خوایە، واتە: ڕۆژی دوایی، جا چ مەبەست پێی قۆناغی یەکەم بێ بە تایبەت، کە ئاخیر زەمانەو لە دوای فووی یەکەم، کە ئیسرافیل بە کەڕەنایدا دەکات، دێتە دی، چ مەبەست پێی قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایی بێ، کە قیامەت و هەڵسانەوەو زیندووکرانەوەیەو، لە دوای فوی دووەمی ئیسرافیل بە کەڕەنادا، دێتە دی، یاخود کۆی ئەو ڕووداوە مەزنە بێ، ڕۆژی دوایی بە هەردوو قۆناغەکەیەوە، بڵێ: زانیارییەکەی تەنیا لە لای خوایە.

لە سوورەتی (الأعراف)دا لەو بارەوە باسێکی تایبەتمان کردوە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتە موبارەکەدا، خوا دەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾﴾، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی (ٱلسَّاعَةِ) بڵێ: زانیارییەکەی لە لای پەروەردگارمە، تەنیا ئەو بۆ کاتی خۆی دەری دەخات و ئاشکرای دەکات، لەسەر ئاسمانەکان و زەوی قورسە، کت و پڕ نەبێ بۆتان نایەت، لێت دەپرسن، وەك تۆ زۆر پێی شارەزاو ئاشنابی، بڵێ: زانیارییەکەی تەنیا لە لای خوایە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

٣)- ﴿وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا﴾، ئایا چی بە تۆی زانیاندوە، ڕەنگە ڕۆژی دوایی نیزیك بێ.

لێرەدا ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ ڕەنگە (ساعة) نیزیك بێ! ئەو کاتە دیاریکراوە بۆ هاتنی ئاخیر زەمان، یان هاتنی قیامەت، یان هاتنی ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغەکەیەوە، ڕەنگە نیزیك بێ، ﴿وَمَا يُدْرِيكَ﴾، (ما) لێرەدا (ما الإستِفْهَامية)یە، بۆ پرسیارکردنە، (يُدْرِيكَ) ڕابردووەکەی: (أَدْرَاكَ)، (أَدْرَاهُ أي أَعْلَمَه) واتە: (أي شَيءٍ يَجْعَلُ لَكَ دِرَايَةً) واتە: چ شتێك وا لە تۆ دەکات بزانی؟ چ شتێك پێت دەزانێنێ؟! (لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا)، ڕەنگە (ٱلسَّاعَةِ) زۆر نیزیك بێ و لە کاتێکی نیزیکدا بقەومێ.

٤)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا نەفرینی لە بێبڕوایان کردوە.

(ٱلْكَٰفِرِينَ) کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، دەگونجێ مەبەست پێی (عهد) بێ، واتە: ئەو بێبڕوایانەی ناسراون و زاندراون و، دەشگونجێ مەبەست پێی جینسی کافران بێ، واتە: (أل) کە بۆ (إِسْتِغْرَاق) بێ، واتە: تێکڕای کافران، چ ئەوانەی کە زانراون و ناسراون بۆ تۆ، چ ئەوانەی دیکەش، هەموویان خوا نەفرینی لێکردوون.

٥)- ﴿ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴾، ئاگرێکی بڵێسەداریشی بۆ ئامادە کردوون، (السَّعِيْر: النَّارُ الشَّدِيْدَةُ الإِيْقَاد)، (سَعِير: فَعِيلٌ بِمَعْنَى المَفْعُول: مَسْعُورَة)، (سَعِيْر) ئاگرێکە کە زۆر بە سەختیی داگیرسێنرابێ، (سَعِيْر) لەسەر کێشی (فعيل)ە، بەڵام بە مانای (مَفْعُول)ە واتە: ئاگرێکی بڵێسەدارکراو، (أي: نارٍ مَسْعُورَة)، ئاگرێك کە هەڵگیرسێنرابێ و، کڵپەی بەرزبووبێتەوە.

لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین، کە وشەی (كَافِر، كَافِرِيْن، كَافِرُوْن) (كَافِر) لەسەر کێشی (فاعل)ە و لە ئەسڵدا (إسم فاعل)ە، واتە: کەسێك کە کوفر دەکات، کوفریش لە ئەسڵدا لە (كَفْر)ەوە، هاتوە بە مانای (سَتْر)، واتە: کافر کەسێکە بە ڕاست و دروستیی هەقی بۆبێ، داپۆشێ و ڕەتی بکاتەوەو نادیدەی بگرێ، کەواتە: کەسێك هەقی بۆ نەهاتبێ و پێینەگەیبێ و نەیناسیبێ، یاخود: بە شێوەیەکی شێوێنراوو ناڕاست، هەقی بۆ هاتبێ، ئەوانە پێناسەی کافر نایانگرێتەوە، مادام کەمتەرخەمییان نەبووبێ لەوەدا کە پەی بەو هەقە بەرن، کە خوا بە پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناردوویەتی، بۆ هەر کامیان لە کات و ڕۆژگاری خۆیدا.

بە نسبەت پێغەمبەری خاتەمەوە (موحەممەد ﷺ)یش، ئەوە هەقەی خوا پێیدا ناردوە، ئەگەر کەسانێك هەبن ئەو هەقەیان پێنەگەیبێ، دەنگوباسی ئیسلامیان هەر نەبیستبێ، یاخود بیستبیان، بەڵام بە پێچەوانەوەی حاڵەتی ئاسایی و سروشتیی خۆیەوە، بیستبیان، واتە: لینگەو قووچ و سەراوبن حاڵیی بووبن و، بە شێوێنراویی پێیان گەیشتبێ و، کەمتەرخەمیش نەبووبن لەوەدا کە ڕاستیی و چییەتیی ئەو ئایینە دەرك بکەن، سیفەتی کافر بەسەر ئەواندا ناچەسپێ، چونکە هەقێکیان پێنەگەیوە کە ڕەتی بکەنەوەو داپۆشن.

زۆربـەی خەڵـك ئـەو ڕاستییە نازانـن، وا دەزانـن هـەر کەسـێك مسـوڵمان نەبـوو، پێناسـەی کافـر دەیگرێتـەوە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا وانیـەو، کافـر کەسـێکە بـە ڕاسـت و دروسـتیی ئیسـلامی پـێ بـگات و ڕەتی بکاتـەوەو نادیـدەی بگرێ، یاخـود کەمتەرخەمیی هەبـێ، لـە ناسـین و پەیڕەوبردنی ئیسـلام داو هـەر لـە ڕێـوە پشـتگوێی بخـات.

٦)- ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ ﴾، بێبڕوایان بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا، لە ئاگری بڵێسەدارو کڵپەداردا دەمێننەوە.

٧)- ﴿ لَّا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴾، هیچ سەرپەرشتیارو هیچ پشتیوانیان چنگ ناکەون، وشەی (وَلِي) بە مانای سەرپەرشتیارو مشوورخۆر دێ، (نَصِيْر)یش بە مانای پشتیوان و هاوکار دێ، بۆیە هەمیشە (وَلِي) پێش دەخرێ، چونکە (ولي) سەرپەرشتیار، ئەوەیە مشوور دەخوات و سەرپەرشتیاریی دەکات و، ئاگای دەبێ لەوانەی سەرپەرشتیارکراونی، بەڵام (نَصِيْر) شتێکی کاتییە، لە تەنگانەو کاتی دیاریکراوداو، بۆ حاڵەتێکی تایبەت پشتیوانیی دەکات.

٨)- ﴿ يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە ڕووەکانیان لە ئاگردا، ئەم دیوەو دیو دەکرێن، هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکرێن، وشەی (تُقَلَّبُ) خوێنراویشتەوە: (نُقَلِّبُ)، کە ئەو کاتە (وُجُوهُهُمۡ)یش دەبێتە: (وُجُوهَهُم) واتە: ئەو ڕۆژە کە ڕووەکانیان لە ئاگردا ئەمدیوەو دیو دەکەین، هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکەین، (التَّقْلِيْبُ: شِدَّةُ القَلْبِ وَهُوَ تَغْيِيرُ وضْعِ الشَّيءِ عَلَى غَيْرِ الجِهَةِ الَّتِي كَانَ عَلَيْهَا)، (تقْلِيب) ئەوەیە شتێك بە توندیی هەڵگێردرێتەوە، بریتییە لەوەی شتێك لەسەر حاڵەتێك بێ بگۆڕدرێ بۆ حاڵەتێکی دیکە، بە کوردیی: ئەمدیوەو دیو کردنی پێ دەگوترێ، یان هەڵگێڕو وەرگێڕی پێ دەگوترێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ ﴾، دیسـان خوێندراویشـەتەوە: (تُقَلِّـبُ وُجُوهَهُـم فِي النَّـار)، (أَيْ تُقَلِّبُهَـا الْمَلَائِكَـةُ مِـنْ غَـيْرِ اخْتِيَـارٍ مِنْهُـم) واتـە: فریشـتەکان ڕووەکانیـان هەڵدەگێڕنـەوە بەبـێ ویسـتی خۆیـان، ئنجـا چ (تُقَلِّـب) بـێ چ (نُقَلِّـب) بـێ، چ (تُقَلَّـب) بـێ[1] واتـە:

---

(١) کەواتە: سێ جۆرە خوێندنەوە (قراءە)ن:

١-تُقَلِّبُ وجوهَهُم...

أ- دەم و چاویان هەڵگێڕو وەرگێڕ دەكرێن.

ب- دەم و چاویان هەڵگێڕو وەرگێڕ دەكەین.

ج- یان دەم و چاویان هەڵگێڕو وەرگێڕ دەكەن.

بە تەئكید هەمووی لە لایەن فریشتەكانەوەیە، واتە: بێ ئەوەی بۆ خۆیان ئازاد بن، لەوەدا كە دەم و چاویان لە چ حاڵەتێكدا ڕابگرن، بەبێ ویستی خۆیان، دەم و چاویان ئەمدیو ئەمدیو دەكرێن، بۆ ئەوەی لە هەموو لایەكەوە ئاگرەكەیان بەر بكەوێ و بسووتێن.

٩)- ﴿ يَقُولُونَ يَـٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴾، (بێبڕوایەكان) دەڵێن: ئەی خۆزگە! فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەرمان كردبایە، لێرەدا ئەم خۆزگە خواستنە (يَـٰلَيْتَنَآ) مەبەست پێی پەشێمانییە، واتە: زۆر پەشێمانین، بەڵام داری خۆزگەو بریا بۆ كەس بەری نەگرتوە، تاكو بۆ ئەوان بەربگرێ.

ئنجا دەیانەوێ پۆزش و پاساو بێننەوە، بۆچی خۆیان بەو دەردە بردوە؟

١٠)- ﴿ وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا ﴾، گوتیشیان: پەروەردگارمان! ئێمە بە قسەی سەرۆكەكان و گەورەكانی خۆمانمان كرد، فەرمانبەریی ئەوانمان كرد، وشەی (سَادَتَنَا)، (سَادَة) كۆی (سَيِّد)ە، خوێنراویشتەوە: (سَادَاتِنا) كە كۆی (سَادَة)یە، (سَادَات) دەبێتە كۆی كۆ (جمع الجمع)، (كُبَرَآء)یش كۆی (كَبِير)ە، (أي عَظِيمُ العَشِيْرَة) یانی: گەورەی هۆزێك، یان كۆمەڵێك.

كەواتە: (سَادَتَنَا) واتە: سەرۆكەكانمان سەرۆكی گشتیی، (كُبَرَآءَنا) گەورەكانمان، گەورەی تایبەت بە كۆمەڵێكی دیاریكراوەوە، هۆزێك، یاخود حیزبێك، یاخود خەڵكێك، كە گەورەیەك و مشوورخۆرێكیان هەیە.

---

٢-نُقَلِّبُ وجوهَهُم...
٣-تُقَلِّبُ وجوهَهُم...

١١)- ﴿ فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾، ئێمەیان لە ڕێ لادا، ﴿ فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾، دەڵێ: (بِنَزْعِ الخَافِض عَلَى السَّبِيْل)، (أضلُّونا عن السَّبيل) واتە: ئێمەیان لە ڕێیە ونکرد، (السَّبِيْل) (أل)ی ناساندن (تعريف)ی لەسەرەو بۆ (عهد)ە، واتە: لە ڕێیەکە، ڕێبازەکە، ئێمەیان لە ڕاستە شەقامەکەی تۆ، ونکرد.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا ﴾، دەگونجێ مەبەست لە (سَادَة)، بەرپرسانی سیاسیی بێ، (كُبَرَآء)یش بەرپرسانی ڕووحیی و فیکریی بن.

ئنجا جارێکی دیکە شوێنکەوتووە فریو خواردووەکان دووبارەی دەکەنەوە:

١٢)- ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴾، ئەی پەروەردگارمان! ئەو سەرۆك و گەورانەمان کە ئێمەیان لە ڕێ لادا، ئێمەیان ونکرد لە ڕاستە شەقامی تۆ، دوو قات سزایان بدە، یاخود: چەند قات چەند بەرانبەر سزایان بدەو، بە نەفرینێکی گەورەش نەفرینیان لێبکە.

وشەی (ضِعۡفَيۡنِ) هەندێك دەڵێن: مەبەست پێی دوو قاتە، دوو بەرانبەرە، هەندێکیش دەڵێن: (مُسْتَعْمَلٌ فِي مُطْلَقِ تَكْرِيرِ العَدَدِ، وَكِنايَةٌ عَنْ شِدَّةِ العَذابِ)، واتە: بەکارهێنراوە لە دووبارە کردنەوەی ژمارەدا بە ڕەهایی، (مەرج نیە جارێك، یان دوو، یان سێ، بەڵکو چەند بەرانبەر)، ئەوەش کینایەیە بۆ ئەوە کە زۆر بە سەختیی سزایان بدات.

**مەسەلەی دووەم:**

**هۆشداریدانی خوای پەروەردگار بە مسوڵمانان، کە وەك گەلی جوولەکە (بنو إسرائیل) نەبن، کە بە تۆمەتبارکردنی ناڕاست، دڵی مووسایان ئازارداو، خواش پاکیی مووسای عليه السلام لەو تۆمەتە خستەڕوو، مووساش عليه السلام لە لای خوا بەڕێزو خاوەن پایەی بەرزبوو:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ ۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئەمە جاری شەشەمە لەم سوورەتەدا، خوا بانگی بڕواداران دەکات، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.

٢)- ﴿ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ ﴾، وەك ئەوانە مەبن کە مووسایان عليه السلام ئازاردا، لێرەدا خوا ﷻ لە مسوڵمانانی قەدەغە دەکات کە خۆیان وەك (بنو إسرائیل) لێبکەن لە ئازاردانی پێغەمبەری خۆیان مووسادا عليه السلام واتە: ئەوان ئازاری پێغەمبەری خۆیاندا، بەڵام ئێوە ئازاری دڵی پێغەمبەرەکەتان مەدەن، کە موحەممەدە ﷺ، بە گومانی خراپ و، بە عەقڵ و دڵی گچکەتانەوە، تەماشای شتە گەورەکانی پێغەمبەر بکەن، کە لە هەمبانەی خۆتان دا گوێز بژمێرن و، لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای بکەن، بە تایبەتیی لە بواری خێزانیی و هاوسەرگیرییدا، کە دیارە لەو بارەوە هەندێ شت هەبووە، بۆیە خوا ﷻ لەم سوورەتەدا لەو بارە زۆر ڕاستیی ڕوونکردوونەوەو، ئێستاش بۆ کەسانێکی دڵنەخۆش و ئیمان لەرزۆك، لەو بارەوە شت هەیە، بەڵام ئیمانی تێرو تەواوو، زانیاریی و شارەزایی قووڵ و فراوان، دڵی مرۆڤ دامەزراو دەکات.

٣)- ﴿ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ ﴾، بەڵام خوا مووسای ﷺ بەرییکردو دوورخستەوە لەوەی کە ئەوان گوتبوویان، ﴿ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ ﴾، (أي: أظْهَرَ بَرَاءتَهُ) واتە: خوا پاکیی مووسای ﷺ دەرخست، مووسای ئەستۆ پاککرد، لەوەی ئەوان گوتبوویان، ﴿ مِمَّا قَالُوا۟ ﴾، (ما) دوو ئەگەری هەن:

أ- (المَصْدَرِيَّةُ)، (أي مِنْ قَوْلِهِم)، واتە: لە قسەکەیان، ئەو قسەیەی کردبوویان.

ب- (ما) ئەگەر (موصولة) بێ، واتە: (مِنَ الَّذِي قَالُوه)، لەو قسەیەی کردبوویان.

٤)- ﴿ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴾، مووساش لە لای خوا، خاوەن ڕوو، پێگەدارو بەڕێز بوو.

(وَجِيْهاً: ذا وَجَاهَـة)، خـاوەن پایـەو پێگـەی بـەرز، (الوَجِيْـه عِنْـدَ اللـهِ: العَظِيْـم القَـدْرِ، وَالرَفِيْـعُ المَنْزِلَـة)، پێگـەی مـەزن و پلـەی بـەرز بـوو.

زانایـان لـەو بـارەوە کـە ئایا ئـەوە چـی بـووە، مووسـای ﷺ پـێ ئـازارداوە، لـە لایـەن (بنـو إسرائیـل)ەوە؟ سـێ ڕایـان هـەن:

ڕای یەکەم: ناتەواوییەکی جەستەییان پاڵداوەتە لا:

١- هەندێکیان دەڵێن: تۆمەتباریان کردوە بەوە کە قۆڕ (آدَر)ە، (أُدْرَة) یانی: قۆڕیی.

٢- هەندێکی دیکە دەڵێن: بەڵکو گوتوویانە: مووسا ﷺ بەڵەکە.

٣- هەندێکی دیکە دەڵێن: گوتوویانە: عەیبێکی دیکە لە جەستەیدا هەیە.

ڕای دووەم: کوشتنی هاڕوونی برایان پاڵداوە لا:

گوتوویانـە: مووسـا هـاڕوونی بـرای (عَلَيْهِـما الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) کوشـتوە، جارێکیـان پێکـەوە ڕۆیشـتوون، دوایـی مووسـا ﷺ هاتۆتـەوەو فەرموویـەتی: هـاڕوونی بـرام ﷺ وەفـاتی کـرد، ئەوانیـش تۆمەتباریـان کـردوە کـە تـۆ کوشـتووتە، لەبـەر ئـەوەی زۆر پیاوێـکی نـەرم و نیـان و میهرەبـان بـوو، بـەڵام تـۆ تونـدو سـەختی لەگەڵمانـدا!

لە حاڵێکدا کە لە ڕاستییدا توندیی و سەختییەکەی مووسا ﷺ دەرمانی دەردی کەللە ڕەقیی و عینادیی (بنو إسرائيل) بووە، هەڵبەتە هاڕوونیش کە نەرم و نیان و میهرەبان بووە، جۆرێك لە هاوسەنگیی پێدانی سەختیی و توندییەکەی مووسا بووە، کە دیارە پێغەمبەرێکی وەك مووسا ﷺ بۆ گەلێکی کەللە ڕەق و لاری وەك (بنو إسرائيل) پێویست بوو، هەروەها بۆ فیرعەون و دارو دەستەیەکی ئاوا سەرسەخت، کە لە میصرِدا حکومڕان بوون، دەبوو پێغەمبەرێکی ئاوا توندو سەخت و زبر بێ، هەڵبەتە لە سنووری ڕەواو هەقدا، مووسا ﷺ سەختیی و زبرییەکەی بووە و، بە گشتیی مووسا ﷺ هەڵوێستەکانی توندیی و زبرییان پێوە دیارە.

**ڕای سێیەم: تۆمەتبارکردنی بە جادووگەریی، یان شێتیی:**

**گوتوویانە: مووسا ﷺ جادووگەرە، یاخود شێتە.**

لەو بارەوەش کە مووسا لەلایەن خەڵکەکەیەوە زۆر ئازار دراوە، بەگشتیی ئەو فەرموودەیە هەیە:

**{عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قِسْمَةً، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ: وَاللَّهِ مَا أَرَادَ مُحَمَّدٌ بِهَذَا وَجْهَ اللَّهِ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ، فَتَمَعَّرَ وَجْهُهُ، وَقَالَ رَحِمَ اللَّهُ مُوسَى، لَقَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا، فَصَبَرَ} (أخرجه البخاري: ٣١٥٠، ومسلم: ٧٩٣).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی دابەشکرد، پیاوێك لە پشتیوانەکان گوتی: سوێند بە خوا موحەممەد لەم دابەشکردنەدا، ڕەزامەندیی خوای تێدا ڕەچاو نەکردوە! منیش چووم هەواڵم بە پێغەمبەردا، ڕووی موبارەکی سوور بۆوە (زۆر تووڕەو ناڕەحەت بوو، دوایی) فەرمووی: خوا بەزەیی بە مووسا دابێ، بە زۆر زیاتر لەمە ئازاردراوە، بەڵام خۆڕاگربوو.

هەروەها لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەش هاتوە، لە بارەی تۆمەتبارکردنی مووساوەو، ئەم فەرموودەیە دیاریی دەکات، شێوەی تۆمەتبارکردنەکەیان بۆ مووسا ﷺ چی بووەو، چۆن بووە؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ يَغْتَسِلُونَ عُرَاةً، يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، وَكَانَ مُوسى يَغْتَسِلُ وَحْدَه، فَقَالُوا: وَاللهِ مَا يَمْنَعُ مُوسى أَنْ يَغْتَسِلَ مَعَنَا إلاَّ أَنَّهُ آدَرُ، فَذَهَبَ مَرَّةً يَغْتَسِلُ، فوضع ثَوْبه على حَجَرٍ، فَفَرَّ الْحَجَرُ بِثَوْبِهِ، فَخَرَجَ مُوسى فِي إِثْرِهِ يَقُولُ: ثَوْبِي يا حَجَر! ثَوْبِي يَا حَجَرُ! حَتَّى نَظَرَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ إِلَى مُوسى، فَقَالُوا: وَاللهِ مَا بِمُوسى مِنْ بأسٍ، وَأَخَذَ ثَوْبَهُ، فَطَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْبًا) (أخرجه أحمد: ٨١٥٨، والبخاري: ٢٧٤، ومسلم: ٣٣٩).

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺفەرمووی: بەنوو ئیسرائیل بە ڕووتیی خۆیان دەشۆرد، هەندێکیان تەماشای عەورەتی هەندێکیان دەکرد، بەڵام مووسا ﷺ بە تەنیا خۆی دەشۆرد، (بنو إسرائیل) گوتیان: بە خوا هیچ شتێ ڕێ لە موسا ناگرێ کە لەگەڵ ئێمەدا خۆی بشوات، مەگەر ئەوە کە قۆڕە، ئنجا ڕۆژێك مووسا ﷺ بە تەنێ خۆی دەشۆرد، پۆشاکەکەی لەسەر بەردێك دانابوو، بەردەکە پۆشاکەکەی مووسای ڕفاند، مووسا ﷺ بە دوای بەردەکە کەوت، کە پۆشاکەکەی لەبەر بکاتەوە، هەر دەیفەرموو: ئەی بەردەکە! پۆشاکەکەم، ئەی بەردەکە! پۆشاکەکەم، هەتا (بنو إسرائیل) تەماشای جەستەی مووسایان کردو، گوتیان: بە خوا مووسا هیچ عەیبێك لە جەستەیدا نیە، ئنجا بەردەکە ڕاوەستا، ئیدی مووساش پۆشاکەکەی لەسەر بەردەکە داگرت (و لەبەری کردەوە)، ئنجا دەستی کرد بە لێدانی بەردەکە، هەتا (أبو هریرة) دەڵێ: شوێنی لێدانی مووسا بە بەردەکەوە مابوو.

(أُدرَة) دەڵێ: (مَرَضٌ تَنْتَفِخُ مِنْهُ الخِصْيَتَانِ وَتَكْبُرَانِ جِدّاً لانْصَبَابِ مَادَّةٍ أو رِيحٍ غَلِيظٍ فِيهِمَا، وَرَجُل «آدَرُ» بِالْمَدِّ كَآدَم بِه (أُدْرَةٌ))[1].

---

(١) إعراب القرآن الكريم وبيانه: ج٨، ص٥٩، تألیف: محي الدين الدرويش.

(أُدْرَةٌ) نەخۆشـییەکە لـە ئەنجامیـدا دوو گونـەکانی مـرۆڤ دە ئاوسـێن و، گـەورە دەبـن، لەبەرئـەوە کـە ماددەیـەك دەچێتـە نێویـان، یاخـود بایـەك دەچێتـە نێویـان و فـوو دەدرێـن، کـە بـە کوردیـی قـۆڕ بـوونی پـێ دەڵێـن، دەگوتـرێ: (رَجُلٌ آدَرُ) وەك ئـادەم واتـە: نەخۆشـیی قۆڕیـی (أُدْرَة)ی هەیـە.

کەواتـە: دیـارە تۆمەتبـار کردنەکـەی (بنـو إسرائیـل) بـۆ مووسـا ﷺ و دڵ ئازاردرانەکـەی ئـەوە بـووە، کـە بـە ناهـەق ئـەو عەیبەیـان لێگرتـووە، دوایـیش خـوای کارزان وەزعێـکی هێناوەتـە پێـش، تاکـو تەماشـای جەسـتەی مووسـا بکـەن، کـە هیـچ عەیبـی نیـەو، بۆیـان دەرکـەوێ کـە تاکـو ئێسـتا بـە درۆو بـە ناهـەق مووسـایان تۆمەتبـار کـردوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە بڕواداران کە پارێز لە خوا بکەن و، قسەی ڕێك و ڕاست بکەن، تاکو سەرەنجام کردەوەکانیان چاك بکات و لێیان ببووریٚ و، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەش، کە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، مایەی بە مراد گەیشتن و سەرکەوتن و بردنەوەیە:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾.

شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەمە جاری حەوتەم و کۆتاییە لە سووڕەتی (الأحزاب)دا کە خوا بانگی مسوڵمانان دەکات و بە نازناوی ئیمان دەیاندوێنیٚ، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێبهێنریٚ.

٢)- ﴿ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا﴾، پارێز لە خوا بکەن، (خۆتان بپارێزن لە هەر شتێك کە خوا پێی ناخۆشە) و قسەی ڕێك و ڕاست بکەن، (السَّدِيْدُ: الْمُوَافِقُ لِلسَّدَادِ وَالسَّدَادُ: الصَّوَابُ وَالحَقُّ) قسەی ڕێك و ڕاست بکەن، (سَدِيْد) ئەوەیە کە بە پێی (سَدَاد)بیٚ، (سَدَاد)یش واتە: ڕاستیی و هەق.

واتاو چەمکی ئەم ڕستە قوڕئانییە، زۆر زۆر فراوانە، کە دەفەرمویٚ: ﴿وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا﴾، واتە: قسەی ڕێك و ڕاست بکەن، واتە: چ لە ڕووی بووناسییەوە، چ لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، چ لە ڕووی پەرستشەکانەوە، چ لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارەکانەوە، چ لە ڕووی باری کەسێتییەوە، چ لە ڕووی هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکانەوە، چ لە ڕووی حوکم و سیاسەتەوە، چ لە ڕووی جەنگ و ئاشتییەوە، لە هەموو ڕووەکانەوە، مرۆڤ کە قسە دەکات، دەبیٚ قسەی ڕێك و ڕاست و ئامانجدار بکات.

هەروەها مرۆڤ پێویستە لەگەڵ ماڵ و خێزانی، لەگەڵ دەرو دراوسێکانی، لەگەڵ خزمانی، لەگەڵ کۆمەڵگا، لەگەڵ دۆست و دوژمنانی دا، مرۆڤی مسوڵمان دەبێ قسەی ڕێك و ڕاست بکات.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴾، دوای ئەوەی دەفەرموێ: ﴿ اتَّقُواْ اللَّهَ ﴾، کەواتە: قسەی ڕاستکردن، بەرهەمی پارێزکار بوونەو، زمان ڕاست بوونی مرۆڤ، بەرهەمی دڵ ڕاست بوونیەتی و، لەگەڵ خەڵکدا باش بوونی مرۆڤ، بەرهەمی لەگەڵ خوادا ڕاست بوونیەتی، بۆیە لە سوورەتی (الأنفال)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَاتَّقُواْ اللَّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ﴿١﴾ ﴾الأنفال، پارێز لە خوا بکەن و پەیوەندییەکانی نێوانتان چاك بکەن، ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ خوادا ڕاست بوو، لەگەڵ خەڵکیدا چاك دەبێ، بۆیە من هەمیشە دەڵێم:

ئیسلام لە دوو وشەدا پوخت دەبێتەوە: خواپەرستیی و مرۆڤ دۆستیی، چاك بەندایەتیی بۆ خوا کردن و، باش مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا کردن، کە بێگومان دووەمیان لە یەکەمیانەوە پەیدادەبێ، خوای پەروەردگاریش لە قورئاندا، زۆرجار وشەی تەقواو ئیحسانی پێکەوە هێناون: ﴿ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾النحل، واتە: بە دڵنیایی خوا لەگەڵ ئەوانەدایە کە پارێزیان کردووەو، ئەوانە کە چاکەکارن، ئەگەر پارێز لە خوا بکەی، لەگەڵ خەڵکیدا چاکەکار دەبی.

خوا دەفەرموێ: ئەگەر پارێز لە خوا بکەن و قسەی ڕێك و ڕاست بکەن:

٣)- ﴿ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ ﴾، (خوا) کردەوەکانتان چاك دەکات.

زانایان ئەو تەعبیرەیان هێناوە، دەڵێن:

(بِالتَّقْوَى وَالقَوْلِ السَّدِيد، تَشِيعُ الْفَضَائِلُ وَالْحَقَائِقُ بَيْنَ النَّاسِ، فَيَرْغَبُونَ فِي التَّخَلُّقِ بِهِمَا، جَرَّاء التَّقْوَى وَصَلَاحَ الأَعْمَال) واتە: بە هۆی پارێزکاریی و، قسەی ڕێك و ڕاستەوە، سیفەتە بەرزەکان و ڕاستییەکان لە نێو خەڵکدا بڵاو دەبنەوەو، خەڵك

ئارەزوومەنـدی ئـەوە دەبـن، خۆیانیـان پـێ برازێننـەوەو لـە خۆیانـدا بیانکـەن بـە ئـاکارو ڕەوشـت، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە پارێـزکارن و، کـردەوەی باشـیان هـەن.

٤)- ﴿ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ﴾، هەروەها (خوا) لە گوناهەکانیشتان دەتانبووریّ.

٥)- ﴿ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﴾، بە دڵنیایی هەر کەسێکیش گوێڕایەڵیی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، فەرمانبەرییان بکات، بە قسەیان بکات.

٦)- ﴿ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ ئەوە بە دڵنیایی بە سەرکەوتنێکی مەزن، سەرکەوتوە، مانایەکەی ئاوای لێدێتەوە: بە بردنەوەیەکی مەزن دەیبەنەوەو، بە سەرکەوتنێکی مەزن سەردەکەون و، بە ئامانج دەگەن، ئەگەر ئێوە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن.

**مەسەلەی چوارەم:**

**باسی خستنەڕووی خوا ﷻ بۆ سپاردەکەی بۆ ئاسمانەکان و، زەوی و، چیایەکان و، ئامادەیی نەبوونیان بۆ هەڵگرتنی و، هەڵگیرانی ئەو سپاردەیە لە لایەن مرۆڤی ستەمکارو نەفامەوە، کە سەرەنجام مونافیق و موشریکەکان بە نێر و مێوە، دووچاری سزا ببن و، بڕوادارانیش بە پیاو ئافرەتەوە، لێیان ببوردرێ و، خوا ﷻ بە کەرەم و لوتف و بەزەیی خۆی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت (٨) بڕگەدا:

**١)- ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە سپاردەمان لەسەر ئاسمانەکان و زەویی و چیایەکان ڕانواند، پێشانمان دان.**

**واتە: سپاردەی خۆمامان ڕانواندو هەڵگرتنیمان پێشنیار کرد بۆ کۆی دروستکراوانمان لە نێویان دا، گەردوون بەو فراوانییەی و، لە نێویدا زەوی و، لە نێو زەویشدا چیایەکان، کە زەوی لە نێو گەردووندا، خڕۆکەیەکە ئەو تایبەتمەندییانەی زەوی هەیەتی، هیچ کام لە خڕۆکەکانی دیکە نیانن، هەروەها چیایەکانیش لە زەوییدا سەختترین و ڕەقترین و پتەوترین شتن، ئنجا ئاسمانەکان بەو فراوانییە، کە هەموو گەردوون دەگرنەوەو زیاتریش، هەروەها زەویی بەو حاڵەتە سەرسوڕهێنەرەی و، چیایەکان بەو سەختییەیان، نەیانتوانی ئەو سپاردەیەی خوا وەربگرن و هەڵیبگرن!**

٢)- ﴿فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا﴾، واتە: لامليان كرد كە هەڵيگرن، (الإبَاء: شِدَّةُ الإمْتِنَاع)، ئەگەر زۆر بە سەختيى و بە توندیی شتێك پەسند نەكەی و وەرينەگری، پێی دەگوترێ: (إبَاء)، واتە: زۆر بە سەختی لامليان كردو ئامادەييان نەبوو، هەڵيگرن.

٣)- ﴿وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا﴾، پەرۆشيی و ترسيشيان لێی هەبوو، ترس و بيميان لێی هەبوو، (الإشْفَاقُ: عِنَايَةٌ مُخْتَلِطَةٌ بِخَوْفٍ)، (إشْفَاق) بريتيە لە پەرۆش و ئاگابوون لە شتێك، ياخود بە تەنگەوە بوون بۆ شتێك، بەڵام تێكەڵ لەگەڵ ترسدا.

٤)- ﴿وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَـٰنُ﴾، بەڵام مرۆڤ ئەو سپاردەيەی هەڵگرت، وشەی: (ٱلْإِنسَـٰنُ) (أل) ەكەی بۆ ناساندن (تعريف)ە، بەڵام مەبەست لە ناساندنەكە، بۆ جينسە، واتە: تێكڕای مرۆڤان ئەو سپاردەيان هەڵگرت.

٥)- ﴿إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾، بە دڵنيايی ئەو مرۆڤەش (واتە: جينسی مرۆڤ) زۆر ستەمكارو زۆريش نەفامە.

(الظُّلْـمُ: الإعْتِـدَاءُ عَـلَى حَـقِّ الْغَـيْرِ، وَهُنَـا الإعْتِـدَاءُ، عَـلَى حَـقِّ اللـهِ الْمُلْتَـزَم لَـهُ بِتَحَمّـلِ الْأَمَانَـةِ، وَهُـوَ حَـقُّ الْوَفَـاءِ)، (ظُلـم) بـە مانـای پێشـێلكردنی مـافی بەرانبـەرە، بـەڵام لێرەدا مەبەسـت پێـی سـنوور بەزاندنـە بەرانبـەر بـە مـافی خـوا، لـە حاڵێكـدا ئـەو مرۆڤـە پابەنديـی خـۆی دەربڕيـوە كـە ئـەو سـپاردەيە هەڵبگـرێ و، دەبووايـە وەفاداربـێ بـەو بەڵێنـەی خـۆی (و ئـەو سـپاردەيەی خـوا بپارێـزێ، بـەڵام سـنوور شـكێنيی و سـنوور بەزێنيـی تێـدا دەكات).

(ظَلُومًا) و (جَهُولًا ) لەسـەر كێـشی (فَعُـوْل)ن، واتـە: زۆر سـتەمكارو زۆر نەفـام، (الجَهْـلُ: انتِفَـاءُ العِلْـمِ مِمّـا يَتَعَـيَّنُ عِلْمُـه)، (جَهْـل) بريتيـە لـە نەبـوونی زانياريـی بـە شـتێك، كـە پێويسـتە بزانـرێ، (جَهُوْل)يـش واتـە: زۆر نەفـام و نـەزان.

لێـرەدا بـە تەئكيـد مەبەسـت ئەوەيـە: كـە مـرۆڤ، ئەگەر دەسـتی هيدايـەتی خوای نەگاتـێ و، بەهرەمەنـد نەبـێ لـە ڕێنمايـی خـوا، كـە بـە پێغەمبەرانـدا دەينێـرێ، ئـەوە لـە ڕووی كردەييـەوە، زۆر تـووشی سـتەم و لادان دەبـێ و، لـە ڕووی تيۆرييـەوەش،

زۆر تووشی نەفامیی و نەزانیی و بێ ئاگایی دەبێ، بەڵام بەهۆی دەستگرتنی بە هیدایەتی خواو، بە وەحیی خواوە، نەزانیی و نەفامییەکەی دەگۆڕێ بۆ زانین و مەعریفەت و، ستەمەکەشی دەگۆڕێ بۆ دادگەریی و هاوسەنگیی و ڕێکیی.

٦)- ﴿ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ ﴾، بۆ ئەوەی خوا پیاوانی مونافیق و ئافرەتانی مونافیق و، پیاوانی هاوبەشدانەرو ئافرەتانی هاوبەشدانەر، سزا بدات.

ئەم (ل)ە (لامُ العَاقِبَة)یە، تاکو سەرەنجام وای لێبێ، دەشگونجێ (لامُ العِلَّة) بێ، واتە: خوا بۆیە ئەو سپاردەیەی کە بە ئاسمانەکان و زەویی و چیایەکان هەڵنەگیراو، ئامادە نەبوون هەڵیبگرن و، ترس و بیمیان لێی هەبوو، بۆیە بە مرۆڤی سپاردو، مرۆڤی والێکردبوو، بتوانێ ئەو سپاردەیە هەڵبگرێ، لە حاڵێکدا کە ئەگەر لە خۆی وریا نەبێ، زۆر ستەمکارو زۆریش نەفامە، تاکو سەرەنجام خوا سزای پیاوانی مونافیق و ئافرەتانی مونافیق و، پیاوانی هاوبەشدانەرو ئافرەتانی هاوبەشدانەر بدات.

(پیاوانی هاوبەش بۆ خوا دانەرو، ئافرەتانی هاوبەش بۆ خوا دانەر)، لەسەر ئەوەی ئەو سپاردەیەی خوا چاك پێی وەفادار نابن و باش نایپارێزن، خیانەتی پێدەکەن.

٧)- ﴿ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴾، هەروەها سەرەنجام خوا بگەڕێتەوە بۆ لای پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار واتە: تۆبەیانی لێ قبووڵ بکات و بەزەیی پێیاندا بێ، لە ئەنجامی ئەوەدا کە وەفاداربوون بە پەیمانی خواوەو، وەفاداربوون بەو بەڵێنەی داویانە بە خوا، کە سپاردەکەی بپارێزن و، خیانەتی پێ نەکەن.

٨)- ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، بە دڵنیایی خواش لێبوردەی بە بەزەییە، واتە: لێبوردەیە بۆ ستەمەکەیان و، بە بەزەییشە لە بەرانبەر نەفامیی و نەزانییەکەیاندا.

کەواتە: سەرەنجام خوا ﷻ بێبڕوایەکان بە هەردوو بەشە سەرەکییەکەیانەوە، کە ئەهلی نیفاق و ئەهلی شیرکن، سزا دەدات، بە هۆی بێوەفاییانەوە بەرانبەر

بــە ســپاردەی خــواو، خیانەتکردنیانــەوە بــەو ســپاردەیەی خــوا، کــە هەڵیانگرتــوە، هەروەهـا پاداشـتی پیـاوان ئافرەتـانی بڕواداریـش دەداتـەوە، لـە بەرانبـەر ئـەوەدا کـە وەفـادار بـوون بـە بەڵێـن و پەیـمانی خـواو، پارێـزەر بـوون بـۆ سـپاردەی خـوا ﷻ.

**مانای وشەی (أمــانـــة) لە ئایەتی (٧٢)دا:**

**بۆ تەفسیری وشەی (ٱلْأَمَانَةَ) زانایان چەند واتایەکیان هێناون:**

١- هەندێکیان گوتوویانە: واتە: فەرمانبەریی کردن بۆ خوا.

٢- هەندێکیان گوتوویانە: فەرزەکان.

٣- هەندێکیان گوتوویانە: ملکەچیی بۆ خوا.

٤- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی هەر شتێکە، کە مرۆڤ لەسەری بە ئەمیندار دەدانرێ.

٥- هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست لە ئەمانەت لێرەدا، عەقڵە.

٦- هەندێکیان گوتوویانە: ئەمانەت جێنشینایەتیی خوایە ﷻ.

بـەڵام پوختـەو گـوشراوی ڕای خـۆم لـە بـارەی مانـای ئـەم دوو ئایەتـە موبارەکـەوە لـە حـەوت بڕگـەدا دەخەمـە ڕوو، دیـارە ئەوەشـم لە کـۆی ئـەو تەفسـیرانە وەرگرتوەو، هەندێکیشــی بــە تەئکیــد ڕەنگــە بەوشــێوەیە کــە مــن دەیڵێمــەوە دایدەڕێــژم، لــە هیـچ کام لـە تەفسـیرەکاندا نەبێ.

**پوختــەی ڕای بەنــدە لــە بــارەی مانــای وشــەی (أمانــة) و تەفســیری ئــەم دوو ئایەتــەوە:**

١)- خوا ﷻ ویستوویەتی کارێکی گرنگ بە یەکێك لە دروستکراوەکانی بسپێرێ، کە هیچ کام لە دروستکراوەکانی ئەوەیان لە تواناندا نەبووە، ئەو ئەرکە گرنگەیان پێ بسپێردرێ:

أ- ئاسمانەکان بەو فراوانییە، چونکە ئاسمانەکان واتە: هەموو گەردوون، بەڵکو زۆر زیاتریش لە گەردوون (کون).

ب- زەویی بەو سەرسوڕهێنەریە، کە تاکە خڕۆکەیە لە گەردووندا بەو شێوەیە بێت، کە ژیانی تێدابێ و ئەو هەل و مەرجانەی تێدا ڕەخسێنرابن و، مرۆڤ بتوانێ لەسەری بژی و جێنشینایەتیی خوای لەسەر بکات.

ج- چیایەکان بەو بەرزیی و سەختیی ڕەقییە، ئەوانە هەموویان نەیانتوانی ئەو سپاردەیە هەڵبگرن و، ئەو ئەرکە وەئەستۆ بگرن.

٢)- بەڵام مرۆڤ ئەو تاکە دروستکراوەی خوا بوو، کە ئامادە بوو بۆ هەڵگرتنی ئەو بەرپرسیاریەتییە ترسناکە، ئەو ئەرکەی خوا ﷻ کە بە هەموو گەردوون جێبەجێ نەکرا، ئەو سپاردەیەی خوا، کە هیچ کام لە پێکهاتەکانی گەردوون، نەیانتوانی هەڵیبگرن، بەڵام مرۆڤ هەڵیگرت و وەئەستۆی گرت.

٣)- ئاشکراشە کە هەڵگرتنی ئەو بەرپرسیاریەتییەو، وەئەستۆگرتنی ئەو سپاردەیە، دەبێ پەکی لەسەر تایبەتمەندییەك بکەوێ، کە ئەو تایبەتمەندییە تەنیا لە مرۆڤدا هەیە، لە نێو هەموو دروستکراوەکانی خوای پەروەردگاردا، کەواتە: ئەوە ڕێمان بۆ خۆش دەکات، پەی بەوە ببەین: ئەو سپاردەیە چییە؟

٤)- کاتێك ئێمە بە وردیی دروستکراوەکانی دەپشکنین و تێیان ڕادەمێنین و سەرنجیان دەدەین، دەبینین: ئەو تایبەتمەندیی و ئەو جیاکەرەوەیەی تەنیا لە مرۆڤدا هەیە، بریتیە: لە ویستی ئازاد، خواستی سەربەخۆ، کە بۆ ئەنجامدانی چاکەو، ئەنجامدانی خراپە، دەگونجێ، یاخود گونجاوە بۆ ئەوە پێی بەرز بێتەوە بەرەو خوا، یاخود نزم بێتەوەو لە خوا دوور بکەوێتەوە، یاخود گونجاوە بۆ ئەوەی مرۆڤ فەرمانبەریی خوای پێبکات، یاخود سەرپێچیی خوای پێبکات، هەروەها گونجاوە بۆ ئەوەی مرۆڤ، ئیمان و خوا بەیەککرتنی، پێ هەڵبژێرێ، یاخود بێبڕوایی و هاوبەشدانان.

کەواتە: لێرەدا گەیشتینە ئەوەی، ئەو سپاردەیە چییە؟ ئەو سپاردەیە بریتیە: لەو ویستە ئازادەی کە خوا بە مرۆڤی داوەو، دەتوانێ پێی بەرز بێتەوەو نزم بێتەوە، ڕاست بڕواو چەوت بڕوا، چاکە بکات و خراپە بکات، ڕوو لە ئیمان بکات و ڕوو لە کوفر بکات.

٥)- ئاشکراشە کە هەر کام لە: فەرمانبەریی، فەڕزەکان، ملکەچیی بۆ خوا، پاراستنی سپاردەکان، عەقڵ، جێنشینایەتیی خوا (**الطَّاعَةَ، وَالفَرَائض، وَالإنْقِيَاد، وَالأَمَانَات، وَالعَقْل،**

وَالخِلَافَة) کە ڕای تەفسیرەکانە، هەموویان، دەرەنجامی ئەو تایبەتمەندییە تاکەن، کە تەنیا مرۆڤ هەیەتی، هەروەها جنۆکیش لەگەڵ مرۆڤدا، کەواتە: ئەو ڕایەی ئێمە هەڵمانبژارد، کۆکەرەوەی هەموو ڕایەکانی دیکەشە.

٦)- ستەم و نەفامیی بریتین: لە دوو خاڵە بێهێزەکەی مرۆڤ، کە ئەگەر لێیان وریا نەبێ لە تاقیکردنەوەدا دەکەوێ، چونکە (ظُلْم) بریتیە لە لادانی مرۆڤ و سنوور بەزێنیی و سنوور شکاندنی لە ڕووی کردەییەوە، (جَهْل)یش بریتیە لە دەرکنەکردنی مرۆڤ بۆ ڕاستییەکان، پێش هەموو شتێك، ئەو ڕاستییە کە ئەم گەردوونە شاری بێ خاوەن نیە، خوایەکی پەروەردگار سەرپەرشتیی دەکات و بەسەری ڕادەگا، مرۆڤ بێ خاوەن نیەو لە خۆوە نەهێنراوە، بەڵکو هێنراوە بۆ تاقیکردنەوە، بۆ جێنشینایەتیی کردنی خوا، ئنجا ئەگەر مرۆڤ ئاگاداری ئەو دوو خاڵە بێهێزەی خۆی نەبێ، ئاگاداری ستەم (ظُلْم) نەبێ، ئاگاداری نەزانیی (جَهْل) نەبێ، بە تەئکید لە تاقیکردنەوەی خوادا دەکەوێ.

٧)- پێچەوانەی ستەم و نەفامیی (ظُلْم، جَهْل)، بریتیە: لە دادگەریی و زانیاریی، کە دادگەریی و زانیارییش، میوەو بەرهەمی ئیمان بە خوای بەرزن، میوەو بەرهەمی دەستگرتنن بە وەحیی و پەیامی خوای پەروەردگارەوە، کە بە هۆی ئیمان بە خوا ﷻ و ئیمان بە هەموو ئەو شتانەی خوا فەرمووني، ئیمان بە فریشتەکانی خوا، بە کتێبەکانی خوا، بە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بە ڕۆژی دوایی، بە نەخشەو ئەندازەگیریی (قدر)ی خوا، لە ئەنجامی ئەو ئیمانەدا، مرۆڤ عیلمی بۆ پەیدا دەبێ، زانیارییەکی بۆ پەیدادەبێ و بەرچاو ڕوون دەبێ، کە ئەم گەردوونە چییە؟ ئەو مرۆڤە بۆچی هاتوە بۆ ئێرە؟ چ ئەرکێکی پێ سپێردراوە؟ دەبێ چی بکات و چۆن بکات؟ بەرچاو ڕوون دەبێ و، هەروەها لە ئەنجامی ئیمان دا، مرۆڤ حاڵەتی هاوسەنگیی و، حاڵەتی دادگەریی بۆ دروست دەبێت، لە لادان و سنوور شکێنیی و سنوور بەزاندن، کە ستەمە، دەپارێزرێ.

بەڵگەشمان لەسەر ئەو واتایە، کە هەڵمانبژارد، وێڕای مانای ئاشکرای ئایەتەکان، قسەی خوای بەرزە کە دەفەرموێ:

﴿ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٣﴾ ﴾.

چونکە ئەم (ل)ە، ئەگەر لامی سەرەنجام (لام العَاقِبة)بێ، یاخود لامی هۆکار (لام العِلّة)بێ، یانی: ئەو هۆکارەی وایکردوە، خوا ﷻ ئەو سپاردەیە بە مرۆڤ بسپێرێ، یاخود ئەو دەرەنجامەی کە لەوە پەیدا دەبێ، کە خوا ئەو سپاردەیەی بە مرۆڤ سپاردوە، بریتیە: لە سەپێنرانی سزا بەسەر کافراندا، بە هەردوو بەشە سەرەکییەکەیانەوە، واتە: مونافیقەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بە پێچەوانەوەش قبوولکردنی خوا ﷻبۆ گەڕانەوەی ئەهلی ئیمان، کە بە تەئکید هەرچۆن بێت، کەم و زۆر تووشی گوناهو هەڵە دەبن، بە هۆی ستەم و نەفامییەکەیانەوە، بەڵام خوا تۆبەیان لێوەردەگرێ، مادام لەسەر ڕاستە شەقامی خوان، با جار جار هەڵبنگوون و سامە بەرن و بەملاولا بچن، بەڵام مادام لەسەر ڕاستە شەقامی خوان، خوا ﷻ لە بەرەکەتی بەندایەتییان بۆ خواو، بڕوایان بە خوا ﷻ و بە کتێبەکانی خواو بە فریشتەکانی خواو بە پێغەمبەران و (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە ڕۆژی دوایی، لە بەرەکەتی ئەوەدا، خوا ﷻ چاوپۆشیی لەو هەڵەو کەم و کوڕیی و سامەبردن و خلیسکان و لادانانەیان دەکات، مادام بە گشتیی لەسەر ڕاستە شەقامی خوای پەروەردگارن.

ئەمە ئەو پوختەیە بوو، کە پێموایە باشترین مانا لێکدانەوەیە، بۆ ئەو دوو ئایەتە موبارەکەو، بەو شێوەیەش کە هێنام، لە هیچ کام لە تەفسیرەکاندا بەو شێوەیە نەمبینیوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، یارمەتییمان بدات، زیاتر لە کتێبەکەی تێبگەین و، زیاتر بە ڕاستییە مەزنەکانی ئەو کتێبە ڕاست و تەواوەی خوای پەروەردگار ئاشنا بین و، یارمەتییشمان بدات کە ئەو ڕاستییانە لە عەقڵ و دڵی خۆماندا و، لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی، خۆماندا ڕەنگیان پێ بدەینەوەو، بەرجەستەیان بکەین.

لێرەشدا دێینە کۆتایی تەفسیر کردنی سوورەتی (الأحزاب).

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمڕۆ کـە ٤/ی ذي الحجـة/ی ١٤٤٠ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠١٩/٨/٥)ی زایینیـی، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیر کردنـی سـوورەتی (سـبأ).

## پێناسەی سوورەتی (سبأ) و بابەتەکانی

لە حەوت بڕگەدا، پێناسەو نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە دەخەینە ڕوو:

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە هـەر بـە نـاوی (سـبأ) نـاسراوە، هۆیەکەشـی ئەوەیـە کـە باسـی گەلـی (سـبأ)، یـان هـۆزی (سـبأ)ی تێـدا هاتـوە، باسـی گەلـی سـەبەئیش، جگـە لـە سـوورەتی (النَّمـل)، کـە لـە ئایـەتی ژمـارە (٢٢)دا، کـە تەنیـا ئاماژەیـەك کـراوە: ﴿ وَجِئۡتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٖ يَقِينٍ ﴾، تەنیـا لێـرە لـەم سـوورەتەدا، باسـی گەلـی (سـبأ)، یـان هـۆزی (سـبأ) کـراوەو، بەسەرهاتەکەشـیان تایبەتـە بـەم سـوورەتەوە، بۆیـە ئـەو نـاوەی لێـنراوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە مەککەییـەو، ئـەو ڕایـەی کـە دەڵێ: ئـەم ئایەتـە: ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلۡحَقَّ وَيَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ٦ ﴾، مەدینەییـە، ڕایەکـی بێهێـزە، چونکـە ئـەم ڕایـە پشـتی بـەوە بەسـتوە، کـە مەبەسـت

لـە (أُوتـوا الْعِلـم) خـاوەن کتێـبن، کـە ئەوانیـش لـە مەدینـە بـوون! بـەڵام مـەرج نیـە مەبەسـت تەنیـا خـاوەن کتێبـەکان بێ، پاشـان مـەرج نیـە ئەوانیـش تەنیـا لـە مەدینـە بووبـن! وەك پێشـتریش لـە سـەرەتای چەنـد سـوورەتێکدا لـەو بـارەوە باسـمان کـرد.

بەڵکـو دەگونجـێ مەبەسـت لـە (أُوتـوا الْعِلـم) زایانایـان بـێ، بـە گشـتیی، چ زانایانـی ئیسـلام و شـارەزا بـە قورئـان و فەرمایشـتی خـوا، واتـە: هاوەڵانـی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ، چ زانایـان بـە گشـتییتر، واتـە: ئەهلـی ئیسـلام بـن، یـان ئەهلـی ئیسـلام نەبـن، خـاوەن کتێـب بـن، یـان خـاوەن کتێـب نەبـن، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی خـاوەن کتێبـەکان بـێ، بـەڵام کـە مەبەسـتیش خـاوەن کتێبـەکان بـێ، واتـە: جوولەکـەو نەصرانییـەکان، کـە ئـەو دوو کۆمەڵـە زیاتـر هەبـوون، لـە نیـوە دورگـەی عەرەبییـدا، ئەوانیـش مـەرج نیـە تەنیـا لـە مەدینـە بووبـن، بەڵـێ زیاتـر لـەوێ بـوون، بـەڵام کـەم و زۆر هاموشـۆو، تێکەڵییشـیان بـووە لەگـەڵ خەڵکـی مەککـەدا، وەك لـە زۆر لـە سـوورەتە مەککەییەکانـدا، خـوا ﷻ ئامـاژەی بـۆ ئـەوە کـردوە، کەواتـە: ئـەم سـوورەتە هەمـووی مەککەییـە بەبـێ هـەڵاواردن.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنە خواردا:

ئـەم سـوورەتە لـە ڕیزبەندیـی دابەزینـدا، ژمـارە (٥٧)، یـان ژمـارە (٥٨)، واتـە: (٥٧)میـن، یـان (٥٨)میـن سـوورەتە، کـە لـە قورئـان دابەزیـێ و، لـە دوای سـوورەتی (لقـمان)و، پێـش سـوورەتی (الزمـر) دابەزیـوە، بـەڵام لـە ڕیزبەندیـی موصحەفـدا، ژمـارە: (٣٤)ە، واتـە: کـە لـە سـوورەتی (الفاتحـة)ەوە پێـدا دێیـن، لـە ژمـارە (٣٤)دا، دەیگەینـێ.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکان:

ژمـارەی ئایەتـەکانی سـوورەتی (سـبأ) لـە لای زۆربـەی زانایـان (٥٤)ە، بـەڵام لـە لای خەڵکـی شـام (٥٥)ە، پێشـتریش باسـمانکردوە، کـە کەمیـی و زۆریـی ژمـارەی

ئایەتەکان، دەگەڕێتەوە بۆ کورتیی و درێژیی ڕستەکان، نەك هەندێکیان بڵێن: فڵان ڕستەیەش ئایەتێك بووە، ئەوانەی دیکە بڵێن: نەخێر ئایەت نەبووە، شتی وا نیە، زانایان لەسەر وشەیەکی قورئانیش ناکۆکییان نیە، نەك لەسەر ئایەتێك، یان ڕستەیەك.

## پێنجەم نێوەڕۆکی:

هەرچەندە وەك زۆربەی هەرە زۆری سوورەتە مەککەییەکان، باسی: بووناسیی و، ئیمان بە خواو، یەکتایی خوا لە بەدیهێنان و خاوەنداریی و مشوورخۆریی و پەرستراوێتیی داو، پاشان ئیمان بە فریشتان و، باسی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە گشتیی و، بە تایبەتیی موحەممەد ﷺو، باسی وەحیی و قورئان و ... هتد، کراوە، بەڵام باسی ڕۆژی دوایی و بە بەهەشت و دۆزەخ لەم سوورەتەدا، پشکی شێری پێبڕاوەو، نیوەی زیاتری ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە، بۆ باسی (ساعة) و (قيامة)و، سزاو پاداشتی خوا ﷻ تەرخان کراون.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

هەر کام لە سوورەتەکان کۆمەڵێك تایبەتمەندییان هەن، ئنجا حەوت (٧) تایبەتمەندییم بۆ ئەم سوورەتە، کەوتوونە بەرچاو، کە تایبەتن بە خۆیەوە:

**تایبەتمەندیی یەکەم:** باسی مردنی سولەیمان عليه السلام و، پێزانرانی بە هۆی مۆرانە لێدانی گۆچانەکەی و، کەوتنیەوە، کە ئەمەش لە ئایەتی ژمارە (١٤) هاتوە، واتە: سولەیمان عليه السلام ماوەیەك بەسەر مردنیدا تێپەڕیوە، خۆی داوەتە سەر گۆچانەکەی، کەس بە مردنەکەی نەزانیوە، تاکو گۆچانەکەی مۆرانە لێیداوەو کۆڵیویەتی و، ڕزیوەو سولەیمان کەوتوە، ئنجا زانیویانە کە وەفاتی کردوە!

**تایبەتمەندیی دووەم:** باسی گەلی (سبأ)ە، لە ئایەتەکانی: (١٥ - ١٩)، وەك پێشتر باسمان کرد، تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی گەلی یان هۆزی (سبأ) کراوە.

**تایبەتمەندیی سێیەم:** پشتڕاستکردنەوەی خوا ﷻ بۆ گومانی ئیبلیس، لە بارەی مرۆڤانەوە، لە ئایەتی ژمارە (٢٠)دا، کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ ﴾، واتە: بە دڵنیاییی ئیبلیس گومانەکەی لە بارەی مرۆڤەکانەوە ڕاست دەرچوو، گومانەکەی ڕاست بردە سەر، تەنیا لەم سووڕەتەدا ئەم تەعبیرە هاتوە.

**تایبەتمەندیی چوارەم:** خستنە ڕووی نەرمترین شێوازی وتوێژ لەگەڵ بێبڕوایاندا، لە ئایەتەکانی: (٢٤ - ٢٦)دا، یانی: پێم شك نایەت، لە هەموو قورئاندا لەوە شێواز نەرمتر هەبێت بۆ چۆنیەتیی وتوێژو گفتوگۆ کردن، لە لایەن ئەهلی ئیمانەوە لەگەڵ بێبڕوایاندا.

**تایبەتمەندیی پێنجەم:** فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ کە ئامۆژگاریی بێبڕوایان بکات، یەك یەك و دوو دوو، بیربکەنەوە لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺ، لە بارەی پەیامەکەیەوە، ئەمیش لە ئایەتی ژمارە (٤٦)دا هاتوە: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ ﴾، واتە: ئامۆژگارییتان دەکەم، کە یەك یەك و دوو دوو، بۆ خوا ﷻ هەڵسن و بیربکەنەوە، تەنیا لەم سووڕەتەدا ئەم تەعبیرە هاتوە.

**تایبەتمەندیی شەشەم:** دووبارە بوونەوەی ﴿ قُلْ ﴾، لە شوێنێکدا، پێنج جاران، لە چوار ئایەتدا، لە ئایەتەکانی: (٢٤ - ٢٧)و، لە شوێنیکی دیکەدا، دیسان پێنج جاران لە سەرەتای پێنج ئایەتدا، کە دوای هەر کام لەو وشانە، واتە: دوای ﴿ قُلْ ﴾، کە سەرجەم دەبن بە دە (١٠)، لەم سووڕەتەدا بە دوای یەکدا، ڕاستییەکی مەزن خراوەتە ڕوو، واتە: خوا ﷻ بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە: ئەوە بفەرموو، ئەوە بفەرموو، ئەوە بفەرموو، هەڵبەتە ئەوەش بۆ وتوێژ لەگەڵ بێبڕوایاندا، شوێنی یەکەمیان، وەك گوتم: پێنج جاران لە چوار ئایەتدا، ئایەتەکانی: (٢٤ - ٢٧)ن و، شوێنی دووەمیان، پێنج جاران لە سەرەتای پێنج ئایەتدا، کە ئایەتەکانی: (٤٦ - ٥٠)ن.

**تایبەتمەندیی حەوتەم:** هاتنی چەند وشەیەك کە تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون، بۆ نموونە:

١- ﴿مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾، کە لە ئایەتی ژمارە (٧)دا هاتوە.

٢- ﴿مِنسَأَتَهُۥ﴾، (مِنْسأة: عَصا)، گۆچان یان گۆچانێکی پتەو، لە ئایەتی ژمارە (١٤)دا هاتوە.

٣- ﴿سَيْلَ ٱلْعَرِمِ﴾، واتە: لافاوێکی بێڕەزا، تۆفانێکی بێڕەزا، زۆر سەخت و توند، لە ئایەتی ژمارە (١٦)دا هاتوە.

٤- ﴿ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ﴾، واتە: دوو باخی خاوەن خواردنی تاڵ (أثل)یش واتە: دار گەز، یان دار سیواك، درەختی نەڕاك، لە ئایەتی ژمارە (١٦)دا هاتوە.

٥- ﴿فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ﴾، (أي: أُزيلَ عَنْهَا الفَزَع)، واتە: ترس لە دڵیان لابرا، لە ئایەتی ژمارە (٢٣)دا هاتوە.

٦- ﴿مِعْشَارَ﴾، (مِعشَار) بە مانای (عُشر) دێ، واتە: یەك لەسەر دە، کە لە ئایەتی ژمارە (٤٥)دا، هاتوە.

٧- ﴿ٱلتَّنَاوُشُ﴾، (التَّنَاوُش) واتە: دەست گەیاندنە شتێك بە نەسپایی، کە لە ئایەتی ژمارە (٥٢)دا هاتوە.

٨- ﴿وَحِيلَ﴾، واتە: پەردە خرایە، نێوان خرایە بەینی ئەوان و ئەوەی ئارەزووی دەکەن، لە ئایەتی ژمارە (٥٤)دا هاتوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکانی بۆ چەند دەرسێك:

وەك زۆر جاری دیکە گوتوومانە، دابەشکردنی ئێمە بۆ ئایەتەکانی هەر سوورەتێك، دوای سەرنجدان و تێرامانی زۆرە، کە کام کۆمەڵە ئایەتە پێکەوە پەیوەستن، کە ئەوە ئێمە بە کۆشش و ئیجتیهادی خۆمان وامانکردوەو لەوەدا، لاسایی کەسم نەکردۆتەوە، بەڵێ، سەرنج دەدەمە تەفسیرەکانیش، بەڵام تەفسیرەکان بە زۆریی وایە، هەموو ئایەتەکان بڕ بڕ دەکەن، ئایەت ئایەت،

دوو ئایـەت دوو ئایـەت، یـان چەنـد ئایەتێکـی کـەم پێکـەوە دێنـن، بـەڵام من تەماشا دەکـەم کام کۆمەڵـە ئایەتـە، باسـی بابەتێکـی دیارییکـراو دەکـەن، ئەوانـە دەکـەم بـە دەرسـێك، ئنجـا ئەگـەر کـەم بـن، ئەگـەر زۆربـن:

**دەرسـی یەکـەم:** ئایەتەکانـی: (١ - ٩)یـە، نـۆ (٩) ئایەتـی سـەرەتا دەگرێتـە خـۆی، کـە وەك پێشـەکیی بـۆ کـۆی ئایەتەکانـی سـوورەتەکەیە.

**دەرسـی دووەم:** ئایەتەکانـی: (١٠ - ١٤)یـە، پێنـج (٥) ئایـەت و، تەرخانکـراوە بـۆ باسـی داوودو سـولەیمان (عَلَيهِـما الصَّـلاةُ والسَّـلام)، کـە دوو پێغەمبـەری بـاب و کـوڕ بـوون، ئـەو نیعمەتانـەی کـە خـوا ﷻ پێـداون، ژمارەیـەك لـە نیعمەتـەکان باسـکراون.

**دەرسـی سـێیەم:** ئایەتەکانـی: (١٥ - ١٩)یـە، پێنـج (٥) ئایـەت، کـە تەرخـان کـراون بـۆ باسـی هـۆزی (سـبأ)، یاخـود گەلـی (سـبأ)، کـە چـۆن خـوا ﷻ نـازو نیعمـەتی زۆری پێـدا بـوون، بـەڵام ئـەوان سـپڵەیی و بێبڕواییـان کـردە پیشـە، سـەرەنجام حاڵەکەیان لە خۆشـگوزەرانیی و نـازو نیعمەتـەوە، گـۆڕا بـۆ ژیانێکـی تەنـگ و تـاڵ و، باخەکانـی کـە هەیانبـوون، دوو بـاخ لـە مـلاولای ڕێ، گـۆڕان بـۆ هەندێـك درەخـت و گیـای بیابانیـی، یـان بـێ بـەر، یاخـود بەرتـاڵ و ناخـۆش، هەروەهـا حاڵەتـی تۆکمەیـی کۆمەڵگاکەیـان گـۆڕا بـۆ پەڕاگەندەیـی و، هـەر کۆمـەڵ و، تیرەیـەك بـە لایەکـدا ڕۆیشـتن.

**دەرسـی چـوارەم:** ئایەتەکانـی: (٢٠ - ٣٠)یـە، یـازدە (١١) ئایـەت، ئەوانیـش خـوا ﷻ زیاتـر تێیـان دا باسـی یەکتایـی خـواو، وتوێـژ لەگـەڵ بێبڕوایـەکان لـەو بـارەوە کـراوە، لـە کۆتاییشـدا باسـی ڕۆژی دوایـی، کـە ئـەو بەڵێنـەی خـوا ﷻ دایـناوە، بـە مسـۆگەریی لـە کاتـی خۆیـدا دێ.

**دەرسـی پێنجـەم:** ئایەتەکانـی: (٣١ - ٣٩)یـە، نـۆ (٩) ئایـەت، کە باسـی هەڵوێسـتی بێبڕوایانـە لـە بـارەی قورئانـەوە، کـە گوتوویانـە نـە بـڕوا بـە قورئـان و، نـە بـڕوا بـە کتێبەکانـی پێـش قورئانیـش دێنیـن، خـوا ﷻ یەکسـەر لـەوەوە دەیگوازێتـەوە بـۆ دیالـۆگ و وتوێـژو مشـتومڕێك لـە نێـوان چەوسـێنراوانی هەڵخەڵەتـاوو، خۆبەزلزانانـی خۆسـەپێندا، لـە بێبڕوایـان، کـە چـۆن هەموویـان پەشـێمان دەبنـەوەو پەنجـەی

پەشێمانیی دەگەزن، دوایی خوا ﷻ باسی ئەوە دەكات كە مەرج نیە هەر كەسێك ماڵ و سامان و نازو نیعمەتی پێدرابێ، نیشانەی ئەوە بێ، كە خوا ﷻ خۆشی دەوێ، بەڵكو خۆشویستنی خوا بە هۆی ئیمان و كردەوەی چاكەوەیەو ئەوە سەنگی مەحەكە، دوایی خوا ﷻ باسی سەرەنجامی كردەوەی، هەر كام لە بڕواداران و بێبڕوایان دەكات.

**دەرسی شەشەم:** ئایەتەكانی: (٤٠ - ٤٥)یە، شەش (٦) ئایەت، ئەوانیش هەموویان باسی رۆژی دوایی و، باسی هەڵوێستی بێبڕوایانن، لە بەرانبەر ئایەتەكانی خوا دا، كە بەسەریاندا دەخوێنرێنەوە، كە بە هەڵبەستراوو جادوو، پێغەمبەریش ﷺ بە كەسێك كە دەیەوێ ئەو خەڵكە لە رێ و رەسمی باب و باپیرانی لابدا، وا پێناسە دەكرێ.

**دەرسی حەوتەم:** ئایەتەكانی: (٤٦ - ٥٤)یە، نۆ (٩) ئایەت، كە خوا لە سەرەتای پێنج ئایەتیاندا، فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەكات بە: ﴿ قُلْ ﴾، واتە: وشەی ﴿ قُلْ ﴾ پێنج جاران لە سەرەتای پێنج ئایەتەكاندا دێ، كە لە دوای هەر كام لەو وشانەدا: ﴿ قُلْ ﴾، خوا ﷻ ڕاستییەكی مەزن دەخاتە ڕوو، دیسان كۆتایی ئەو ئایەتانەش بە باسی ڕۆژی دوایی دێ، كە چۆن بێبڕوایان دەستیان لە هەموو پچكان دەبڕێ و، هیچ چارەو دەرەتانێكیان نابێ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە نۆ (٩) ئایەتی سەرەتای سوورەتی (سبأ) پێك دێ، ئایەتەکانی: (١ - ٩)، کە ئەم نۆ ئایەتە، وەك پێشەکی وان، بۆ کۆی سوورەتەکەو، بۆ کۆی بابەتەکانی، لەو نۆ ئایەتەش دا هەر سێك پایەو بنەڕەتەکەی ئیمان، خراونە ڕوو:

١- بڕوا بە خواو سیفەت و کردەوە بێ وێنەکانی.

٢- بڕوا بە ڕۆژی دوایی و، سزاو پاداشتی خوا.

٣- بڕوا بە وەحیی و، پێغەمبەرایەتیی و، ئەو ئایەتانەی کە خوا ﷻ بە پێغەمبەردا ﷺ ڕەوانی کردوون.

هەروەها هەر لەم نۆ ئایەتەدا، باسی هەڵوێستی نەرێنییانەی، بێبڕوایان لە بەرانبەر ڕۆژی دوایی و، پێغەمبەرایەتیی و، وەحیی داو، هەڵوێستی ئەرێنییانەی بڕوادارانی زاناو، هەڕەشە لێکردنی خوا، لە بێبڕوایان کراوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ
ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۚ
وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ
عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ
وَلَآ أَكْبَرُ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۚ
أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ

﴿ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ
هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴿٦﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَىٰ
رَجُلٍ يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿٧﴾ أَفْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَم
بِهِ جِنَّةٌ ۗ بَلِ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ فِي الْعَذَابِ وَالضَّلَالِ الْبَعِيدِ ﴿٨﴾ أَفَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا بَيْنَ
أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ۚ إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ الْأَرْضَ أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ
كِسَفًا مِّنَ السَّمَاءِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٩﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ستایش (هەمووی) بۆ خوا، ئەو کەسەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هی ویەو، لە دوارۆژیش دا، ستایش تەنیا بۆ ویەو، ئەو کارزانی شارەزایە ﴿١﴾ هەرچی دەچێتە نێو زەوی و هەرچی لێی دەردەچێ، دەیزانێ، هەروەها هەرچی لە ئاسمانێ دادەبەزێ و، هەرچی پێیدا بەرز دەبێتەوە (هەڵدەکشێ) دەیزانێ و، تەنیا ئەو بەبەزەیی لێبوردەیە ﴿٢﴾ (خوا بەو شێوەیە زاناو باڵادەستە) کەچی ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: کاتی دیاریکراو (ی ڕۆژی دوایی)مان بۆ نایەت، بڵێ: با، سوێند بە پەروەردگارم بۆتان دێ، (خواش) زانای پەنهانە، گرانایی گەردێکی لێ پەنهان و ون نابێ، نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەمین داو، نە لەوە گچکەترو نە گەورەتریش، هیچ شتێك نیە کە لە نووسراوێکی ڕووندا نەبێ ﴿٣﴾ (هاتنی ڕۆژی دوایی مسۆگەرە) تاکو (خوا) پاداشتی ئەوانە بداتەوە، کە بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکان دەکەن، ئەوانە لێبوردن (ێکی تایبەت)و بژیوێکی پەسندو پڕ ڕێزیان هەیە ﴿٤﴾ ئەوانەش کە تێکۆشان لە دژی ئایەتەکانمان (بە خەیاڵی خۆیان)، خۆ دەربازکەرانە (لە سزای ئێمە)، ئەوانە ئازارێکیان هەیە (لە ڕۆژی دوایی دا) لە پیسییەکی بە ئێش و ژان

(٥) ئەوانەش کە زانیارییان پێدراوە، دەزانن کە ئەوەی بۆ لای تۆ دابەزێنراوە، هەر ئەوە هەقەو بەرەو ڕاستە ڕێی (خوای) زاڵی ستاییشکراو، ڕێنمایی (خەڵك) دەکات (٦) ئەوانەش کە بێبڕوابوون گوتیان: ئایا پیاوێکتان پێشان بدەین، هەواڵتان پێدەدات کە کاتێك (مردن و) بە تەواویی پارچە پارچە بوون [بە نێو گڵی زەویدا بڵاوبوونەوە] ئێوە لە نوێ دروست دەکرێنەوە؟ (٧) ئایا درۆی بە (ناوی) خواوە هەڵبەستوە، یان (جۆرێك لە) شێتیی تێدایە؟ (نە درۆی هەڵبەستوەو نە شێتیشە)، بەڵکو ئەوانەی بڕوا بە ڕۆژی دوایی ناهێنن، لە نێو ئازارو گومڕاییەکی دووردان (٨) ئایا سەرنجی ئاسمان و زەوییان نەداوە، لە پێش دەستەکانیانەوەو لە دوایانەوە، ئەگەر بمانەوێ بە زەوییاندا ڕۆ دەبەینە خوار، یان چەند پارچەیەکیان لە ئاسمانێوە بەسەردا دەخەینە خوارێ، بێگومان لەوەدا (کە بە زەوییدا ڕۆناچن و پارچەکانی ئاسمانیان بەسەردا ناکەون)، نیشانەیەك (ی گەورەو گرنگ) هەیە، (لەسەر بەزەیی و بەخششی خوا) بۆ هەموو بەندەیەکی لە ناخەوە گەڕاوە (بۆ لای خوا ﷻ) (٩)].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لَا يَعْزُبُ عَنْهُ): واتە لێی ون نابێ، لێی پەنهان نابێ، (عَزَبَ الشَّيءُ: غَابَ وَخَفِيَ، عَزَبَ الشَّيءُ يَعْزُبُ)، واتە: ئەو شتە ون بوو، ون دەبێ، پەنهان بوو، پەنهان دەبێ.

(مِثْقَالُ): (المِثْقَالُ: مَا يُوزَنُ بِهِ، وَهُوَ مِنَ الثِّقْلِ، وَذَلِكَ اسْمٌ لِكُلِّ سِنْجٍ)، (مِثْقَالُ: زِنَةُ)، (مِثْقَال)، واتە: هەر شتێك کە شتێکی پێ بکێشرێ، کە لە وشەی (ثِقْل) ەوە هاتوە، ئەویش ناوە بۆ هەر شتێك کە شتی پێ هەڵبسەنگێنرێ، (مِثْقَال) واتە: کێش، (زِنَة) واتە: کێشی ئەو شتە، گرانایی.

(ذَرَّةٍ): (أي: الهَبَاءَة)، ئەو تۆزو گەردەی بە پەنجەرەدا دێتە ژوورێك، لەبەر تیشكی خۆردا دەبینرێ، بە ئاستەم بە چاو دەبینرێ، بەوە دەگوترێ، هەروەها بە مێرووڵەی گچكە دەگوترێ، هەروەها بە هێلكەی مێرووڵەش دەگوترێ، كە سپیەو زۆر بچووكە، واتە: گەرای مێرووڵە.

(سَعَوْا): تێكۆشاون، هەوڵیانداوە، (السَّعيُ: المَشيُ السَّرِيعُ، وَهُوَ دُونَ العَدْوِ، ويُسْتَعَارُ للجَدِّ فِي الأَمْرِ، خَيْراً كَانَ أَو شَرّاً)، (سَعي) بە ڕۆیشتنێكی خێرا دەگوترێ، كە كەمتر بێ لە ڕاكردن و دەشخوازرێتەوە بۆ جدیی بوون و، تێكۆشانی چاك لە كارێكدا، ئنجا چاك بێ، یان خراپ بێ.

(مُعَاجِزِينَ): (أَعْجَزْتُ فُلَاناً وَعَجَّزْتُهُ وَعَاجَزْتُهُ: جَعَلْتُهُ عَاجِزاً)، (أَعْجَزْتُ فُلَاناً) یان (عَجَّزْتُهُ فلاناً)، یان (عَاجَزْتُهُ فُلَاناً)، هەر سێكیان، واتە: فڵانكەسم دەستەپاچەكرد، دەستەوسان كرد، كەواتە (مُعَاجِزِين) واتە: دەستە پاچەكەرانەو، دەستەوسانكەرانە.

(رِجْزٍ): (أَصْلُ الرِّجْزِ: الإِضْطِرَابُ)، (رِجْز)، بە واتای جووڵە دێ، (رَجَزَ البَعِيرُ رَجْزاً)، حوشترەكە هات و چوو، لە نەنجامی برسێتیی، یان نەخۆش بوونێكداو، (الرِّجْزُ: أَسْوَءُ العَذَابِ)، (رِجْز): بە خراپترین سزا دەگوترێ، (رِجْز) بە مانای پیسییش دێ، وەك چۆن (رِجْس) بە مانای پیسیی دێ، (رِجْز)یش هەر هەمان واتا دەگەیەنێ.

(مُمَزَّقٍ): واتە: لێك هەڵوەشێندراو، لێك پچڕێندراو، (المُمَزَّقُ: مَصْدَرٌ مِيمِيٌّ لـه (مَزَّقَهُ) مِثْلُ مُسَرَّحٌ للتَسْرِيح)، (مُمَزَّق) چاوگێكی میمییە لە وشەی (مَزَّقَهُ، يُمَزِّقُهُ، فَهُوَ مُمَزَّقٌ)، وەك (مُسَرَّح) لە (تَسْرِيح)ەوە هاتوە، (تَسْرِيح) واتە: بەرهەڵداكردن، ئنجا (مُسَرَّح) واتە: بەرهەڵداكراو.

(جِنَّةٌ): (الجِنَّةُ: الجنُونُ، جُنَّ فُلَانٌ: أَصَابَهُ الجِنُّ)، دەگوترێ: (جُنَّ فُلَانٌ)، واتە: جینن دەستی لێوەشاندوە، (جِنَّة) بە مانای شێتیی دێ.

(نَخْسِفْ بِهِمُ): واتە: بە زەوییاندا ببەینە خوار، (خَسَفَ بِهِ: أَذْهَبَهُ)، واتە: ڕۆیبردەخوار بە زەوییدا.

(مُنِيبٍ ): (رَاجِعٌ مِنَ القَلْبِ إلى اللهِ)، (مُنِيب): بـە کەسێك دەڵێن کـە لـە ناخەوە، لـە دەروونـەوە بـۆ لای خـوا ﷻ گەڕابێتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

پێشـتر لـە خسـتنە رووی پێناسـەو نێوەڕۆکـی سـوورەتی سـەبەئدا، باسـمان کـرد، کـە تـەوەری سـەرەکیی سـوورەتەکە، باسـی ڕۆژی دواییـە، بـەڵام باسـی یەکتایـی خـوا ﷻو، سـیفەتەکانی و، کـردەوە نـاوازەو بـێ وێنەکانـی، هەروەهـا باسـی وەحیـی و پێغەمبەرایەتییـش کـراوەو، چەنـد بابەتێکـی دیکـەش نێواخنـی ئـەو بابەتانـە کـراون.

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، کە ئەوەش مەبەستی ئەوەیە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خواو بە ناوی خواوە دەکەم.

٢- بە پێی شەرعی خوا دەیکەم.

٣- بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەیکەم.

٤- بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجامی دەدەم.

دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، سـتاییش بـۆ ئـەو خوایـەی کـە هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و هەرچـی لـە زەویـی دایـە، هـی ویـە، ئـەو خاوەنیەتـی، ئێمـە دوایـی لـە مەسـەلە گرنگـەکان دا زیاتـر قسـە دەکەیـن، لەسـەر چەمـك و واتـای وشـەی (حَمـد)و، جیاوازییـان لەگـەل (مـدح)، هەروەهـا لەگـەڵ (شُـکر)دا، بـەڵام لێـرەدا ئـەوە دەڵێیـن: کـە خـوا ﷻ (أل)ی خسـتۆتە سـەر وشـەی (حَمـد)، ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ﴾، واتـە: هەرچـی سـتاییش هەیـەو هەرچـی مـەدح و سـەناو پەسـندیی بـۆ دەربڕیـن هەیـە، هەمـووی هـی خوایـە، ئەویـش ئـەو زاتەیـە

کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هی ویە، ﴿ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ ﴾، هەروەها هەرچی ستایش هەیە لە ڕۆژی دواییدا، لە مەنزڵگای کۆتاییشدا، هەر هی ئەوە، ﴿ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾، هەر ئەو کارزانی شارەزایە، هەم کارەکانی کە ئەنجامیان دەدات، زۆر بە کارامەیی و لێزانیی ئەنجامیان دەدات، هەم زۆریش شارەزایە بە هەڵسوکەوت و حاڵ و باڵی دروستکراوەکانی.

شایانی باسە: لە سەرەتای پێنج لە سوورەتەکانی قورئاندا، ئەم: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ﴾، دووبارە بۆتەوە، کە بە پێی ڕیزبەندیی (مصحف)، بەمجۆرەن:

١- ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢ ﴾الفاتحة.

٢- ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ١ ﴾الأنعام.

٣- ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١ ﴾الكهف.

٤- ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ١ ﴾سبأ.

٥- ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ جَاعِلِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُوْلِيٓ أَجۡنِحَةٖ مَّثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ يَزِيدُ فِي ٱلۡخَلۡقِ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١ ﴾فاطر.

کە دواتر قسەی وردتر لەو بارەوە دەکەین، کە بۆچی کە لە پێش ئەو پێنج سوورەتە موبارەکەوە، خوا ﷻ ستایشی بۆ خۆی ڕاگەیاندوە؟

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا ﴾، خوا ﷻ دەزانێ هەرچی دەچێتە زەوییەوەو، هەرچی بە نێو زەویدا دەچێ و، هەرچی لێشی دەردەچێ، ﴿ وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَا ﴾، هەروەها دەزانێ هەرچی لە ئاسمانێوە دێتە خوارو، هەرچی بە ئاسمانێ دا بەرز دەبێـەوەو هەڵدەکشێ، کە دەفەرموێ: ﴿ يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَا ﴾، ئەم چوار (ما)یە، هەموویان (ما)ی (موصولە)ن، واتە: هەرچی کە

دێتە نێو زەوییەوە، خوا دەیزانێ، ئنجا شتی ماددیی بن، یان مەعنەویی و، بەرهەست بن، یان نا بەرهەرست، هەرچییش لە زەوی دەردەچێ بە هەمان شێوە، هەروەها هەرچی لە ئاسمان دادەبەزێ، بە هەمان شێوە، لە شتی ماددیی و مەعنەویی و، لە دروستکراوە بەرهەست و نا بەرهەستەکان، هەرچی بەرەو ئاسمانیش بەرز دەبێتەوە، لە شتە ماددیی و مەعنەوییەکان و، لەو شتانەی کە بەرهەست و نا بەرهەرستن، خوا هەموویان دەزانێ ﴿وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلۡغَفُورُ﴾، هەر ئەویش بە بەزەیی لێبوردەیە، لە هەموو قورئاندا خوا ﷻ هەر لێخۆشبوونی خۆی، پێش بەزەیی خستوە، بەلام لێرەدا (ٱلرَّحِيمُ) پێش (ٱلۡغَفُورُ) خراوە، لەبەر ئەوەی مەقامەکە وا دەخوازێ، کە دروستکراوەکان پێش هەموو شتێ، پێویستییان بە بەزەیی خوا هەیە، بۆ بەڕێوەچوون و بەردەوام بوونیان، ئنجا ئەگەر هەڵەو کەم و کوڕییشیان کرد، ئەوانەی خاوەن ئیرادەو هەستن و ئەرکدار (مُكلَّف)ن کە مرۆڤ و جندن، پێویستییان بە لێبوردنی خوا هەیە.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَأۡتِينَا ٱلسَّاعَةُ﴾، ئەم (و)ە (حالية)یە، واتە: لە حاڵێکدا کە خوا ﷻ بەو شێوەیە، کەچی ئەوانەی بێبڕوا بوون، گوتیان: (ساعة)مان بۆ نایەت، (ساعة) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای کاتێکی کەم دێ، کاتێکی دیارییکراو، بەلام لێرەدا مەبەست پێی، ڕۆژی دوایییەو وشەی (ساعة) کراوە بە ناو، بۆ ڕۆژی دوایی، بە گشتیی، یاخود بۆ قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی، کە ئاخیر زەمانە، کە لە دوای فوو پێداکردنی کەڕەنا، لە لایەن ئیسرافیلەوە، بۆ جاری یەکەم ڕوو دەدات، کە (ساعة)ی پێ دەگوترێ، ئاخیر زەمان، یاخود مەبەست پێی قیامەتە، واتە: هەڵسانەوەو زیندوو بوونەوە، کە لە دوای بۆ جاری دووەم فوو پێداکرانی کەڕەننا، لە لایەن ئیسرافیلەوە، ڕوو دەدات، واتە: وشەی (ساعة) دەگونجێ مەبەست پێی ئاخیر زەمان بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوە بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی کۆی ڕۆژی دوایی بێ، بە هەردوو قۆناغەکەیەوە.

ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون، گوتیـان: (سـاعة)مان بـۆ نایـەت، کـە مەبەسـتیان ڕۆژی دوایـیـە، زیاتـر مەبەسـتیان زینـدوو بوونـەوەو لێپرسـینەوەیە، چونکـە مردنەکـە دەزانن کـە هەموویـان دەمـرن و، ڕەنگـە مەبەستیشـیان ئەوەبـێ کـە ئاخیـر زەمـان نایـەت و، ژیانـی ئێمـە لەسـەر زەوی کۆتایـی نایـەت.

﴿ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ ﴾، بڵـێ: بـا، سـوێند بـە پـەروەردگارم، بـە دڵنیاییـەوە بۆتـان دێ، واتـە: ئـەو کاتـە دیاریکراوەتـان بـۆ دێ، کـە ئـەم ژیانـی دنیایـەی تێـدا کۆتـا دێ، یاخـود ئێـوەی تێـدا زینـدوو دەکرێنـەوە، یاخـود ڕۆژی دوایـی تێـدا دێ، بـە هـەردووك قۆناغـە سـەرەکییەکەیەوە، ﴿ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ﴾، (خـوا) زانـای پەنهانـە، هەرچـی پەنهـان و شـێردراوە بـێ، خـوا ﷻ دەیزانـێ، ﴿ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، بـە ئەنـدازەی گرانایـی گەردیلەیەکـی لـێ ون نابـێ، نـە لـە ئاسـمانەکان و نـە لـە زەویـدا، ﴿ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ ﴾، نـە لـە گەردیلەیـەك گچکەتـرو نـە لـەوەش گەورەتـر (ی لـێ ون نابـێ) ﴿ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴾، چونکـە لـە هـەرکام لەوانـە نووسراوێکـی ڕووونـدا تۆمـار کـراو، بۆچـی خـوا ﷻ ڕۆژی قیامـەت دێنێتـە پێـش ڕۆژی دوایـی؟

﴿ لِّيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، تاکـو پاداشـتی ئەوانـە بداتـەوە کـە بڕوایـان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکانیان ئەنجـام داون، کـە دیـارە پاداشـتی ئـەوان بەهەشـت و ڕەزامەندیـی خوایـە، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾، ئـا ئەوانـە لێبوردنێکـی تایبـەت و بژیوێکـی پـڕ ڕێـزو حورمەتیـان بـۆ هەیـە.

﴿ وَٱلَّذِينَ سَعَوْ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ ﴾، ئەوانـەش کـە بـە خەیاڵـی خۆیـان، دەستەوەسـتانکەرانە تێکۆشـاون لـە دژی نیشـانەکانی ئێمـەو، ئایەتەکانـی ئێمـە، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾، ئـا ئەوانـە ئازاریـان بـۆ هەیـە، لـە پیسـییەکی بـە ئێـش و ژان، یاخـود ئەوانـە سـزایەکی زۆر سـەخت و بـە ئێـش و ژانیـان بـۆ هەیـە، چونکـە، (رِجز)یـش هـەر بـە مانـای ئـازار (عَـذاب)ە، بـەڵام سـەختترین ئـازار (أَشَـدُّ العَـذاب) یـان (أَسْـوَءُ العَـذاب)، خراپتریـن سـزا.

یەکسەر خوای پەروەردگار دوای خستنە ڕووی هەڵوێستی نەفامانەی نەزانان، دێتە سەر خستنە ڕووی هەڵوێستی ئاقڵانەی زانایان، ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە، دەفەرموێ: ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ﴾، ئەوانەش کە زانیارییان پێدراوە دەزانن، هەڵبەتە لێرەدا، بینین، زانستییە نەك چاویی (الرُّؤيَـةُ عِلْمِيَـةٌ وَلَيْست بَصَرِيَةٌ)، واتە: بە چاوی عەقڵ و دڵ دەبینن، بەڵام بۆچی وشەی (يَرَى) ی بەکارهێناوە؟ تاکو بزانرێ، وەك بە چاوی سەر ببینن، بەو شێوەیە یەقینیان هەیەو بروایان دامەزراوە، بە چی؟ ﴿ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلۡحَقَّ ﴾، دەزانن کە ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ تۆ دابەزێنراوە، هەر ئەوە هەقە، هەر ئەوە چەسپاوەو ڕاستە، ﴿ وَيَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴾، خەڵکیش ڕێنمایی دەکات بەرەو ڕاستە شەقامی خوای زاڵی ستاییشکراو.

ئایا مەبەست لە: ﴿ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ﴾ کێیە؟ وەك پێشتریش باسمانکرد، لە پێناسەی ئەم سوورەتەدا ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە، دەگونجێ مەبەست پێی خاوەن کتێبەکان بێ، واتە: زانیاریی خواییان پێ دراوە، لە پێش قورئاندا، ئەوانەیان کە ئەهلی ئینصاف و ویژدان بوون، دانیان بە هەقێتیی قورئان و پێغەمبەر ﷺو ئیسلام دا هێناوە، دەگونجێ مەبەست پێی ئەوانە بێ لە هاوەڵان، لە بڕواداران کە شارەزایی و زانیارییان لە بارەی کتێبی خواوە پێ دەدرێ، چونکە ئینسان تاکو لە کتێبی خوا، زیاتر ورد بێتەوەو تێیدا شارەزاتر بێ، هەق و هیدایەتێك کە ئەم کتێبە گرتوویەتە خۆی، زیاتری بۆ دەردەکەوێ.

دەشگونجێ: ﴿ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ﴾ - کە ئەوەم لە تەفسیرەکاندا نەدیوە - مەبەست پێی ئەوانە بێ، کە زانیارییان پێ دەدرێ بە گشتیی، وەك گوتراوە: [قەدری زێڕ لەلای زێڕینگەرە] لە ڕاستییدا مرۆڤ تاکو زاناتر بێ، قەدری ئەم فەرمایشتەی خوا زیاتر دەزانێ و، هەقێتیی و ڕاستییەتیی ئەم کتێبەی زیاتر لەلا درەوشاوە دەبێ، هەروەها ئەوە کە ئەم کتێبە، خەڵك ڕێنمایی دەکات بەرەو ڕاستە شەقامی خوای باڵادەستی ستاییشکراو.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان، گوتیان: ئایا پیاوێکتان پێشان بدەین و، هەواڵتان پێدەدات، لە کاتێکدا کە ئێوە زۆر بە تەواویی پارچە پارچە دەبن، (تمزيق) واتە: لێك پچڕاندنی شتێك، پارچە پارچە کردنی، کە مەبەستیان ئەوە بووە، کە مرۆڤ جەستەکەی دەچێتە نێو خاکەوەو دەنێژرێ، دوایی هەڵدەوەشێتەوەو پارچەکانی بە نێو زەویدا بڵاودەبنەوە، ئایا پیاوێکتان پێشان بدەین هەواڵتان پێدەدا، کە هەر کاتێك ئێوە خرانە زەوییەوەو، جەستەکەتان پارچە پارچە بوو، ﴿ إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە لە نوێ دروست دەکرێنەوە، پیاوێکی واتان پێشانتان بدەین؟ وەك شارەزایانی قورئان گوتوویانە: کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ ﴾، (رَجُل) نەناسراو (نكرة)ە، بەڵام بێگومان موحەممەد ﷺ بەر لە ئیسلامیش، بەر لەوەی خواش ﷻ بیکاتە پێغەمبەر ﷺ، هەم بۆ خۆی پیاوێکی ناسراو بووەو، کۆمەڵگاکە خۆی نازناوی ڕاستگۆی ئەمیندار (الصادق الأمين)یان پێداوە، هەم وەك بنەماڵەو کەس و کاریشی، باپیری وی (عبدالمطلب) بووە، کە سەرۆکی هۆزی قورەیش بووە، هەروەها باب و باپیرانی هەموویان ناسراو بوون، بەڵام لێرەدا کافرەکان بۆ نادیدەگرتن و، بۆ بە کەم تەماشاکردنی پێغەمبەر ﷺ، ئەو تەعبیرەیان بەکارهێناوە.

ئنجا دەڵێن: ﴿ أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢ ﴾، ئایا درۆی بە ناوی خواوە هەڵبەستوە، کە دەڵێ زیندوو دەکرێنەوە، دوای ئەوەی پارچە پارچە دەبن لە زەویدا، یاخود جۆرێك لە شێتیی هەیە، واتە: لە دوو حاڵ بەدەر نیە، یان ئەوەتا درۆ هەڵدەبەستێ بە ناوی خواوە، گوایە خوا ﷻ هەواڵی پێداوە کە مرۆڤەکان زیندوو دەکرێنەوە، یاخود عەقڵی تێکچووەو باری دەروونیی تەواو نیە، جۆرێك لە شێتیی تووش بووە، وشەی (أَفۡتَرَىٰ) لە ئەسڵدا: (ءَإِفۡتَرَىٰ عَلَى اللهِ كَذِبًا)، بەڵام هەمزەی ئیستیفهامەکە ماوەتەوەو، هەمزەکەی دیکە: (تَذۡهَبُ فِي الدَّرۡجِ)، ئەگەر لە سەرەتاوە بێ دەگوترێ: (إِفترى)، بەڵام لە کاتێکدا شتێکی دیکەی لە پێشەوە بێ، ئەو هەمزەیە دەڕوات، ﴿ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي

ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ﴾، واتە: هیچ کام لەم دوو حاڵەتە نیە، نە درۆی بە دەمی خواوە هەڵبەستوەو، نە شێتییشی هەیە، بەڵکو ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی و مەنزڵگای کۆتایی نیە، لە سزاو لە گومڕاییەکی دوور دان، ئنجا جارێ ئێستا سزایەکە نەهاتۆتە پێش، ئەگەر مەبەست پێی سزای ڕۆژی دوایی بێ، بۆیە پێم وایە، مەبەست لە ئازار (عَذَاب) لێرەدا، ئەو ئێش و ئازارە دەروونییەیە، کە لە ئەنجامی کوفردا بۆ مرۆڤ دێتە دی، ئەوەش نەمبینیوە، لە تەفسیرەکان دا ئاماژەی پێ بکەن.

لە ڕاستییدا ژیانی بێبڕوایان لە خودی خۆیدا، سزایەو ئازارەو دەردو ناڕەحەتییە، کە مرۆڤ نەزانێ خاوەنێکی هەیە، یان پێی وابێ: ئەم گەردوونە خاوەنی هەیە، وەك هاوبەشدانەرەکان پێیان وابووە، بەڵام پێی وابێ: ئەو خاوەنەی دوای ئەوەی مرۆڤ دەمرێ، زیندووی ناکاتەوەو، لێی ناپرسێتەوەو، سزاو پاداشت لە گۆڕێ دا نیە، بابایەکی وا هەر ژیانە دنیاییەکەی دەبێتە ئازارو مەینەتیی و ناڕەحەتیی، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوانەی بڕوایان بە مەنزڵگای کۆتایی نیە، کە ڕۆژی دوایە، (فِي العذاب) لە ئازاردان، ﴿ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ﴾، لە گومڕاییەکی دووردان، دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ کە لە ئەنجامی ئەو گومڕاییە دوورەی کە لە دنیادا پێی گیرۆدە بوون و، خۆیان پێوە گرفتار کردوە، لە ڕۆژی دواییدا دەچنە نێو سزاو ئازارەوە، بەڵام خوا ﷻ چوونە نێو سزاو ئازارەکەی پێشخستوە، لە گومڕاییە دوورەکە، هەرچەندە سزاو ئازارەکە لە ڕۆژی دواییدا دێ و، گومڕاییەکە لە دنیادایە، بەڵام لەبەر ئەوەی چوونە نێو سزاو ئازارەکە، گرنگترە، بۆیە خوا ﷻ ئەوەی پێشخستوە، هەرچەندە لە ڕووی کاتەوە، ئەو لە دواترە.

ئنجا خوا ﷻ لە کۆتاییدا نقورچکەیەکیان لێدەدات، هۆشدارییەکیان پێدەدات و دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ ﴾، ئایا سەرنجیان نەداوەتە ئەوەی لە پێش دەستیانەو، ئەوەی لە دوایانەوە هەیە، لە ئاسمان و لە زەوی، ئایا نەیانڕوانیوەتە ئەو ئاسمان و زەوییەی، کە هەم لە پێشیانەوە هەیەو، هەم لە دوایانەوە هەیە، یاخود: ئابلووقەیان داون و لە

هەر چواردەوریان، یان ئاسمانە، وەك گومەزێك بەسەریانەوە، یان زەوییە، كە وەك بەڕەو فەرشێك بۆیان ڕاخراوە؟ واتە: (مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ)، ئەوەی كە لە پێش دەستەكانیانەوە، هەیە، (وَمَا خَلْفَهُم )، ئەوەی كە لە دوایانەوە، هەیە، مەبەست پێی ئەوەیە كە مرۆڤ ئەگەر سەرنج بدات، هەموو شتێك یان لە پێشیەوەیە، یان لە دوایەوەیە، مەبەست ئەوەیە، ئایا تەماشای ئەو ئاسمانەیان نەكردوە، كە لە هەر چواردەوریان هەیەو، ئەو زەوییەیان تەماشا نەكردوە كە دیسان لە هەر چواردەوریان هەیە؟ ﴿إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ﴾، ئەگەر ئێمە بمانەوێ بە زەویدا ڕۆیان دەبەینە خوار، واتە: بە زەویدا ڕۆیان دەچوێنین، ﴿أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾، یان ئەو ئاسمانە كە تەماشای دەكەن، چەند شین و جوانەو، چەند ساف و هێمن و ئارامە، ئەگەر بمانەوێ چەند پارچەیەكیان لە ئاسمانەوە بەسەردا دەخەینە خوار، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾، لەوەدا نیشانەیەكی مەزن و جێی سەرنج هەیە، بۆ هەر بەندەیەكی بۆ لای خوا گەڕاوە، واتە: لەوەدا كە نە زەوییان لە بندا ڕۆدەچێ و، نە لە ئاسمانەوە پارچەیان بەسەردا دەكەونە خوار، دەبێ بزانن كە نیشانەیەكی گەورە هەیە، لەوەدا لەسەر میهرەبانیی خوا، لەسەر هێدیی و مەندیی خوا، لەسەر پەلە نەكردنی خوا، لە سزادانیاندا.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**ڕاگەیاندنی ستایشکردنی خواو خاوەندارێتیی بۆ گەردوون، بەسەرو خواریەوەو، زانابوونی خوا ﷻ بە هەرچی شتێك کە دەچێتە نێو زەوی و، لێوەی دەردەچێ و، لە ئاسمان دادەبەزێ و بۆ لای بەرز دەبێتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۚ وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە: لە هەشت بڕگەدا:**

**١)- ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، ستاییش بۆ خوا، ئەو کەسەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوییەدا هەیە، هی ئەوە، واتە: خاوەنی هەموو شتێکە لە ئاسمانەکان و زەویی دا.**

**٢)- ﴿وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ﴾، ستاییش لە مەنزڵگای کۆتاییش دا تایبەتە بەوەوە، مەدح و ستاییش لەوێش بەس هی ئەوە.**

**٣)- ﴿وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ﴾، ئەو کاربەجێی شارەزایە.**

**پێناسەی: حَمْد وشکر ومَدْح و جیاوازییان:**

**وشەی (حَمْد) وەك خاوەنی (إعراب القرآن)[1] دەڵێ: (الحَمْدُ: الوَصْفُ بِالْجَمِيلِ الإِخْتِيَارِيِّ عَلَى قَصْدِ التَّعْظِيمِ، وَالشُّكْرُ: فِعْلٌ يُنْبِيءُ عَنْ تَعْظِيمِ الْمُنْعِمِ مِنْ حَيْثُ أَنَّهُ مُنْعِمٌ عَلَى الشَّاكِرِ،**

---

(١) ج٨، ص٦٦.

فَيَكُوْنُ مَوْرِدُهُ اللِّسَانِ وَالجَنَانُ وَالأَرْكَان) واتە: وشەی (حَمْد): بریتیە لە وەسفکردنی کەسێك کە چاکییەك لەودا هەیە، کە بە ویستی خۆی ئەو چاکەیە لەودا هەیە، بە مەبەستی بە مەزنگرتن.

بۆیـە دەڵـی: (الوَصْـفُ بِالْجَمِيْـلِ الإختيـاريّ...) وەسـفکردنە بـە سیفەتێکی چـاك کـە بـە ویسـتی ئازادانـە هاتۆتـە دی، بـە مەبەسـتی بەمەزنگرتـن، تاکـو (حَمْـد) لەگـەڵ (مَـدْح) لێـك جیابێتـەوە، کەواتـە: (حَمْـد) بریتیـە لـە ستایشـکردن و پەسـندیی دەربڕیـن بـۆ کەسـێك کـە سـیفەتی باشـی تێدایـە، ئـەو سـیفەتە باشـە کـە لـەودا هەیـە، بـە ویسـتی خـۆی ئـەو سـیفەتەی لـە خۆیـدا هێناوەتـە دی، مەبەسـتیش لـەو ستاییشـکردنە بـە مەزنگرتـن و بـە بەرزگرتنـی ئـەو کەسـەیە، ئنجـا ئەمـە جیایـە لـە (مَـدْح)، (مَـدْح): بریتیـە لـە پێهەڵاگوتـن و پەسـەندیی دەربڕینـی کەسـێك یـان شـتێك، بـا ئـەو سیفەتەشـی بـە ویسـتی خـۆی، لـە خۆیـدا نەهێنـا بێتـە دی، بـۆ وێنـە: مەدحـی پیاوێـك دەکـرێ کـە بـە شـان و شـەوکەتە، مەدحـی ئافرەتێـك دەکـرێ کـە جـوان و بەرچـاوە، لـە ڕووی جەسـتەو قـەدو قیافـەوە، بـەڵام ئەگـەر بویسـترێ باسـی سـیفەتە باشـەکانی پیاوەکـە یـان ئافرەتەکـە بکـرێ، ئـەوە وشـەی (حَمْـد)ی بـۆ بـەکاردێ، چونکـە سـیفەتەکان مـرۆڤ بـە ویسـتی خـۆی دەیانهێنێتـە دی، لەسـەر ئـەوە (حَمْـد) دەکـرێ، سـتایش دەکـرێ، بـەڵام شـتێك مـرۆڤ ویسـتی خـۆی تێـدا نەبووبـێ، پێـی (مَـدْح) دەکـرێ، دەگوتـرێ: فڵانکـەس جوانـە، ئـەو جوانییـە بـە ویسـتی خـۆی نەیهێناوەتـە دی.

جیاوازیـی نێـوان (حَمْـد)و (شُـکر)یش، ئەوەیـە کـە (شُـکر) بریتیـە لـە کردەوەیـەك کـە هـەواڵ دەدات، لـە بـە مەزنگرتنـی کەسـێك کـە خـاوەن چاکەیـە، لـەو ڕووەوە کـە چاکەیەکـی کـردوە، لەگـەڵ ئـەو کەسـەدا کـە سوپاسـی دەکات، بۆیـە (شُـکر)، واتـە: سـوپاس، هـەم پەیوەندیـی بـە زمانـەوە هەیـە، هـەم پەیوەندیـی بـە دڵـەوە هەیـە، هـەم پەیوەندیـی بـە ئەندامەکانـەوە هەیـە، بـەڵام (حَمْـد) بـەس پەیوەندیـی بـە عەقـڵ و دڵ و، پاشـان بـە زمانـەوە هەیـە، (حَمْـد): وەك گوتمـان بریتیـە لـەوەی ستایشـی کەسـێ بکـرێ، بـا لەویشـەوە چاکـە بـۆ وی نەهاتبـێ.

(شُكر): تەنیا كاتێك دەبێ لەو كەسەوە، لەو زاتەوە، چاكەیەك بۆ تۆ هاتبێ، تۆ لە بەرانبەر چاكەكەدا سوپاس (شُكر)ی دەكەی، بۆیە هەم دەبێ ئەوپەڕی ستایش (حَمْد) بۆ خوا دەربېڕدرێ، هەم ئەوپەڕی سوپاس (شُكر) چونكە خوا ﷻ هەم لە زاتی خۆیدا، خاوەنی ئەوپەڕی سیفەتی بەرزو پەسندو چاكە، هەم خوا ﷻ خاوەنی ئەوپەڕی چاكەكاریی و هەموو نیعمەتەكانە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ﴾النحل، هەر چاكەیەك لە ئێوەدا هەیە، لە خواوەیە، كەواتە: لە ڕاستییدا، ستایشی تێرو تەواوو سوپاسگوزاریی تێرو تەواو، تەنیا شایستەی خوایە، من وشەی (حَمْد) بە ستاییش، لێكدەدەمەوەو، وشەی (شُكر)یش بە سوپاس.

كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴾، ستاییش هەر هی ئەوە، لە ڕۆژی دواییدا، واتە: لە ڕۆژی دواییدا هەرچی ستاییش هەیە، تەنیا شایستەی خوایە ﷻ، دیارە لە دنیاشدا هەر وایە، بەڵام لە دنیادا جاری وا هەیە، مرۆڤەكان ستایشی كەسێك، یان شتێك دەكەن، كە شایستەی نیە، بەڵام لە دوارۆژدا، خەڵك هەموو ڕاستییەكانی بۆ ئاشكرا دەبن.

﴿ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴾، خوا كارزانی شارەزایە، كارەكانی بەو پەڕی حیكمەت و وەستایی و دانایییەوە دەكات، شارەزایە بە مرۆڤەكان، بە حاڵ و باڵیان و بە هەڵسوكەوتیان.

٤)- ﴿ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، دەزانێ چی بە زەویدا دەچێ، پێیدا دەچێتە خوار، (الوُلُوجُ: الدُّخُولُ فِي مَضِيْقٍ)، (وُلُوجُ): بریتیە لە چوونە نێو شتێكی تەنگەبەر، ئەوەی كە دەچێتە نێو زەوییەوە چییە؟ ئاوە، كە لە ئاسمانەوە دادەبەزێ بە شێوەی بەفرو باران و تەرزە، یان ئاونگ و شەونم، هەروەها جۆرەكانی تیشكەكانە، كە لە خۆرەوەو لە مانگەوەو، لە ئەستێرەو كەهكەشانەكانەوە، دێن، هەروەها دەنكەكانن (النُّوى)، دەنكی خورما، دەنكی خۆخ و قەیسی و هەموو ئەو درەختانە، هەروەها دانەوێڵەكانن، تۆوەكانن، ئنجا چ تۆوی دانەوێڵە، وەك: گەنم و نیسك و نۆك و جۆو هەرزن و ماش

بە هەردوو جۆری ماشی سپیی و ڕەش، هەروەها تۆوی باقی ڕووەکەکان کە دەڕوێن، هەروەها هەر شتێکی دیکەی، کە بەس خوا ﷻ دەزانێ چی دێتە نێو زەوییەوە.

٥)- ﴿ وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا ﴾، ئەوەی لە زەوی دەردەچێ، ئەوەی کە لە زەوی دەردەچێ لە دانەوێڵەکان کە دەڕوێن، درەختەکان کە دەڕوێن، ڕووەکەکان کە دەڕوێن، کانزایەکان کە دەردەهێنرێن، چی دیکە لە زەوی دێتە دەرێ، ئاگرپژێنەکان، کە ئاگرو ئاسن دەرداوێن، خوا ﷻ هەمووی دەزانێ.

٦)- ﴿ وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، هەروەها (خوا) دەزانێ چی لە سەرێیە، ئاسمان واتە: چی لە سەرێوە دێتە خوارو، دادەبەزێ، لە شتە ماددیی و مەعنەوییەکان.

٧)- ﴿ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَا ﴾، هەروەها چ شتێکیش کە بە ئاسماندا هەڵدەکشێ، بەرزدەبێتەوە، دیسان لە شتی ماددیی و مەعنەویی.

٨)- ﴿ وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلۡغَفُورُ ﴾، بەس ئەو بە بەزەیی لێبوردەیە، لێرەدا لەبەر ئەوەی قسە لە بارەی خواوەیە ﷻ وەك خاوەنی بوون و گەردوون، بۆیە خوا ﷻ وشەی (ٱلرَّحِيمُ) ی پێش خستوە، سەرەتا دروستکراوەکان، پێویستییان بە بەزەیی خوا هەیە، بۆ ئەوەی پەیدابێن و بەڕێوەبچن، دوایی ئەگەر کەم و کوڕییەکیان هەبوو، ئەوانەی کە خاوەنی شعوورو ئیرادەن، کە مرۆڤ و جندن، پێویستییان بە لێبوردەیی هەیە، بۆیە لێرەدا وشەی: (ٱلرَّحِيمُ)، پێش (ٱلۡغَفُورُ)خراوە.

وشەی: (ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ) لە هەموو قورئاندا، (٣٨) جار هاتوە، لە سەرەتای پێنج سوورەتدا هاتوە، واتە: پێنج سوورەتی موبارەك، بە: (ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ) دەستیان پێکردوە، وەك پێشتریش گوتمان:

١- سوورەتی (الفاتحة): ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢ ﴾.

٢- سوورەتی (الأنعام): ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ ۝١ ﴾.

٣- سووڕەتی (الكهف): ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾﴾.

٤- سووڕەتی (سبأ): ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾﴾.

٥- سووڕەتی (فاطر): ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾﴾.

ئەگەر تەماشای ئەم پێنج سووڕەتە موبارەکە بکەین، کە هەم لە سەرەتای قورئان کە (الفاتحة)یەو، هەم لە چارەگی یەکەمی قورئان، کە سووڕەتی (الأنعام)ەو، هەم لە نێوەڕاستی قورئان دا، کە سووڕەتی (الكهف)ەو، هەم لە نیوەی دووەمی قورئان دا، کە سووڕەتەکانی (سبأ) و (فاطر)ن، خوا ﷻ ئەم ڕستە موبارەکەی هێناوە، ئەگەر سەرنجی ئەم پێنج تەعبیرە بدەین، واتە: هەر پێنجیان لەیەکدی جیان:

١- سووڕەتی (الفاتحة): ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، ستاییش هەمووی بۆ خوایە، کە پەروەردگارو خاوەن و مشوورخۆری جیهانییەکانە.

٢- سووڕەتی (الأنعام): ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ﴾، ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی و، تاریکییەکان و ڕووناکیی داناون.

٣- سووڕەتی (الكهف): ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ﴾، ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە کتێبی دابەزاندۆتە سەر بەندەکەی خۆی، کتێبێکی ڕاست و ڕێك، یاخود: سەرپەرشتیار، کە هیچ لاریی و ناڕێکیی تێدا نابینی، نە لە ڕووی بێژەکەیەوەو، نە لە ڕووی واتاکانیەوە.

٤- سووڕەتی (سبأ): ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ﴾، ستاییش بۆ ئەو خوایەی، کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویی دایە، هی ئەوەو، ستاییش لە مەنزڵگای کۆتاییدا، هەر شایستەی ئەوە، ئەو کارزانی شارەزایە.

ئەمیش بابەتێكی دیكەیەو لێرەدا خاوەندارێتیی خوا ﷻ بۆ هەموو شتێك ڕاگەیەنراوە.

٥- سوورەتی (فاطر): ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ﴾، ستاییش بۆ ئەو خوایەی كە پەیداكەری ئاسمانەكان و زەوییە، گێڕەری فریشتەكانە بە خاوەن باڵ، دوو دوو، سێ سێ و، چوار چوارو، ئەوەندەی بیشیەوێ لە دروستكراوەكانی خۆی زیاد دەكات.

ئەگەر تەماشای ئەم پێنج تەعبیرە بكەین، هیچ شتێك نامێنێتەوە كە خوا ﷻ ستاییشی خۆی لەسەر نەكردبێ:

أ- چ بە دیهێنانی بۆ ئاسمانەكان و زەوی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ الأنعام.

ب- چ خاوەندارێتیی بۆ گەردوون، بە سەرو خواریەوە، ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾.

ج- چ ستاییش بڕیاردان بۆی، بە هۆی ئەوەوە كە لە نوێ پەیداكەری ئاسمانەكان و زەوییە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾فاطر، چونكە (فَاطِرِ) زاتێكە شتێكی هێنابێتە دی، كە لە پێش ئەودا نەبووبی، وەك (بدیع).

د- چ بە هۆی ئەوەوە كە كتێبی دابەزاندۆتە سەر بەندەكەی خۆی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا﴾الكهف.

هـ- چ لەو ڕووەوە كە پەروەردگارو خاوەن و مشووخۆری جیهانییانە، ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾الفاتحة، واتە: لەم پێنج سوورەتەدا، خوا ﷻ ئێمەی فێركردوە، ستاییشی بكەین، هەموو ستاییش بۆ خوا بڕیار بدەین، لەبەر ئەوەی هەرچی شت هەیە، كە عەقڵی ئێمە دەركی بكات، لە مشوورخۆریی و، بەسەر ڕاگەیشتن و، بەزەیی نواندن و، چاكەكاریی خوا، لەگەڵ ئێمەومانان و دروستكراوەكاندا، خوا ﷻ خستوویەتە نێو سەرەتای ئەو پێنج سوورەتە موبارەكە.

**مەسەلەی دووەم:**

**نکووڵییکردنی بێبڕوایان لە ڕۆژی دوایی و، بەرپەرچدانەوەیان و، سەلماندنی ڕۆژی دوایی، ئنجا پێویستیی هەبوونی پاداشت دانەوەی بڕواداران و، سزادانی بێبڕوایانی هەوڵدەر لە دژی ئایەتەکانی خوا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿٥﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:**

١)- ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون، گوتیان: (سَاعَة)مان بۆ نایەت، (كَفَرُوا۟): لێرەدا بە کردار (فِعْل) هێناویەتی، واتە: ئەوانەی هەقیان داپۆشیی، هەقیان ڕەفز کردو قبووڵیان نەکرد، لەگەڵ ئەوەش دا کە پێی ئاشنابوون و دەیانناسی، ئەوانەی هەقیان داپۆشیی و، هەقیان ڕەتکردەوە، گوتیان: (ٱلسَّاعَةُ)مان بۆ نایەت، زانایان دەڵێن: (عُبِّرَ عَنِ انْتِفَاءِ وُقُوعِهَا بِانْتِفَاءِ إِتْيَانِهَا)، تەعبیرکراوە بەوەی کە ڕوونادات، بەوە کە نایەت، چونکە شتێك کە هەبێت، دێ، کە نەهات، مانای ئەوەیە، نیە، کە گوتوویانە: (لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ)، (ساعة)مان بۆ نایەت، یانی: بوونی نیە، (ٱلسَّاعَةُ) واتە: کاتێکی دیاریکراو بۆ شتێك، کە لێرەدا خوا ﷻ ئەو وشەیەی خواستۆتەوە بۆ تەعبیرکردن، لە هاتنی کۆتایی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی، ئاخیر زەمان، یاخود: زیندوو کرانەوەی مرۆڤ، لە ڕۆژیی دواییدا، واتە: قیامەت، یاخود: بۆ کۆی ڕۆژیی دوایی، بە هەردوو قۆناغی سەرەکیی ئاخیر زەمان و زیندوو کرانەوەو، هەڵسێنرانەوەو سزاو پاداشت درانەوەوە.

٢)- ﴿قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ﴾، خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرمویَ: بڵێ: با، سوێند بە پەروەردگارم، بە دڵنیایی بۆتان دێ، (اَلسَّاعَةُ)، ئەو کاتەی دیارییکراوە بۆ تێکچوونی ئەم گەردوونە، کۆتایی پێهاتنی ئەم ژیانی دنیایە، یاخود: دیارییکراوە بۆ هاتنی ڕۆژی زیندووکرانەوەو سزاو پاداشت درانەوە، دێ.

(بَلَى: حَرْفُ جَوَابٍ مُخْتَصٌ بِإِبْطَالِ النَّفْيِ، فَهُوَ حَرْفُ إِيجَابٍ لِمَا نَفَاهُ كَلَامٌ سَابِقٌ)، (بَلَى) پیتی وەڵاندانەوەیە بۆ شتێك، کە قسەیەکی پێشتر لایبردوەو نکووڵییلێکردوەو، پیتی چەسپاندنی قسەیەکی پێشتر لابراوە.

٣)- ﴿عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ﴾ (خوا) زانای پەنهانە، پێشتر باسی خوا ﷻ کراوە، واتە: خوا زانای پەنهانە، چونکە کێ (اَلسَّاعَةُ) دێنێ؟ بە دڵنیایی خوا دەیهێنێ، ئنجا لەبەر ئەوەی خوا زانای پەنهان و شێردراوەکانە (ساعة)ش دێنێ، ئەمە هەم بەڵگەیە، هەم هەڕەشەیە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوایەك ﷻ ە، شارەزای پەنهانەو، هێندەی گرانایی گەردێکی لێ ون نابێ، نە لە زەوی و، نە لە ئاسمانداو، نە لەوە گچکەترو، نە لەوە گەورەتر، مەگەر هەمووی سەرژمێر کردوە، لە نووسراوێکی ڕۆشندا، خوایەك کە هەموو کردەوەکان و هەموو هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤەکانی تۆمار کردوون، لە هەمووی شارەزایەو، دەزانێ خەڵك چەند کردەوەی خراپیان هەیەو، چەند کردەوەی چاکیان هەیە، مەعقووڵ نیە، ئەو هەموو کردەوە چاکانە بێ پاداشت بڕۆن و، ئەو هەموو کردەوە خراپانە، بێ سزا بڕۆن، واتە: ئەوەی ڕابرد: بەڵگە بوو بۆ ئەوەی پێشێ، خوایەك ئەوەندە گەورەو شارەزا بێ، بزانێ ئەو خەڵکە چی کردوەو چۆنی کردوە؟ لە حیکمەتی خوا، لە دانایی خوا، لە دادگەریی خوا ﷻ ناوەشێتەوە، لێیان بگەڕێ، وەك بەرزەکی بانان بۆی دەربچن، نە کەس بە چاکەکارەکان بڵێ: چاکتان کردو، نە کەس بە خراپەکارەکان بڵێ: خراپتان کرد، ئەوە لە دادگەریی خواو کاربەجێیی خوا ﷻ ناوەشێتەوە.

هەروەها هەڕەشەشە، واتە: خوا زانای پەنهانە، نەك هەر زانای ئاشکرا، دەزانێ چیتان کردوەو چۆنتان کردوە، ئەی بێبڕوایەکان! کەواتە: خۆتان هەڵگرن بۆ سزایەك لە لایەن خوایەکەوە، کە نەك بەس کردەوە، ڕواڵەت و ئاشکرایەکانتان،

بەڵكو نیازو مەبەستە گڵاوەكانی نێو دڵ و دەروونیشتان دەزانێ، ئەو كردەوانەی كە بە پەنهانییش كردووتانن، كە خەڵك ئاگای لێیان نیە، ئەوانیش دەزانێ و لەسەر ئەوانەش سزاتان دەدا.

وشەی ﴿ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ﴾، وەك چۆن بە ژێر خوێندراوەتەوە: (عالِمِ الغَيْب)، كە ئەمە دەچێتەوە سەر ﴿ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى ﴾، (رَبِّيْ: عالِمِ الغَيْب)، واتە: زانای پەنهانە، هەروەها خوێندراوەتەوەش: (عَالِمُ الغَيْب) كە ئەو كاتە دەبێتە نیهاد (مبتدأ) و، ڕستەیەكە لە نوێ دەستی پێكردوە، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (عَلَّامِ الغَيْب) واتە: زۆر زاناو، زۆر شارەزا بە پەنهان.

٤)- ﴿ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ ﴾ هێندەی گرانایی گەردێكی لێ پەنهان و ون نابێ، (لَا يَعْزُبُ عَنْهُ: لَا يَغِيبُ وَلَا يَخْفَى عَنْهُ) لێی نادیار نابێ و لێی داپۆشراوو پەنهان نابێ، (مِثْقَالُ ذَرَّةٍ ): هێندەی گرانایی گەردیلەیەك، (مِثْقَال: زِنَة)، واتە: كێش، گرانایی، (لَا يَعْزُبُ عَنْهُ: لَا يَستَتِرُ، لَا يَخْفَى وَلَا يَغِيْب عَنْهُ)، لێی پۆشراوو نادیارو پەنهان نابێ، بە ئەندازەی گرانایی گەردێك، باسمان كرد گەرد (ذرة)یش دەگونجێ مەبەست پێی ئەو شتە وردیلانە بێ، كە كاتێ تیشكی خۆر لە پەنجەرەیەك دێتە ژوورێ، شتی بچووك دێتە بەرچاو، كە بە عەرەبیی پێی دەگوترێ: (هَبَاءَة) و كۆیەكەی (هَبَاء)و، تاكەكەی (هَبَاءة)، یاخود مەبەست پێی مێروولەی گچكەیە، یاخود مەبەست پێی هێلكەی مێروولەیە، كە زۆر بچووكە.

٥)- ﴿ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئنجا گرانایی ئەو گەردیلە لە ئاسماندا بێ، یان لە زەوی دا.

٦)- ﴿ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ ﴾، نە لەوە گچكەترو، نە لەوەش گەورەتر.

یەكێ بۆی هەیە، بڵێ: باشە گچكەتر ئەوە دیارە، خوا ﷻ دەفەرموێ: هی گچكەتر لە گەردیلەشم لێ ون نابێ، بەڵام هی گەورەتر هەر دیارەو، ون نابێ، بۆچی فەرموویەتی؟

أ- وەڵامێكی ئەوەیە كە (الشعراوي) لە (خواطر)ەكەی خۆی دا هێناویەتی، دەڵێ:

(لأنَّ الكِبَرَ كَالصِّغَرِ، قَدْ يَكُونُ مَانِعاً مِنَ الإِدْرَاك)، لەبەر ئەوەی گەورەییش وەك گچكەیی، جاری وا هەیە بە هۆی گەورەییەوە، شتێك نابینی.

ب- وەڵامێكی دیكەشی ئەوەیە كە مەبەست لێرەدا خستنە ڕووی گشتیی بوونی دیتن و زانینی خوایە بۆ ورد و درشت، بە هەموو جۆرو پلەكانیانەوە.

٧)- ﴿إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾، هیچ كامێك لەوانە نیە، مەگەر لە كتێبێكی ڕووندا تۆماركراوە، كە (كِتَٰبٖ مُّبِينٖ) یان مەبەست پێی (لَوْح مَحْفُوظ)ە، ئەو تەختە پارێزراوەی كە خوای گەورە هەموو زانیارییەكانی خۆی تێدا پاراستوون و، یان مەبەست پێی زانیاریی دەورە دەرو بێ سنووری خوایە، كە من پێم وایە ئەوەی دووەمیان زیاتر پێدەچێ، هەرچەندە هیچ ڕێگرییەكیش نیە، ئەگەر خوای زانا هەرچی زانیاریی خۆیەتی لە جیسمێكدا تۆماری كردبێ، كە پێی دەگوترێ: (لَوْح مَحْفُوظ)، یان (إمام مُبِيْن) یان (كتاب مُبِيْن)، دەشگونجی ئەمانە هەموویان تەعبیر بن، بۆ زانیاریی بێ سنووری خوا، چونكە خوا ﷻ لە قەدەر عەقڵی ئێمە فەرمایشت دەكات، ئێمە وەختێ زانیارییەكمان هەبێ و بمانەوێ لە بیرمان نەچێ، تۆماری دەكەین، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {قَيِّدُوا الْعِلْمَ بِالْكِتَابِ} (أخرجه القضاعي في مسند الشهاب» ٦٣٧، قال الألباني: إسناده حسن)، زانیاریی بە هۆی نووسینەوە، ببەستنەوە، ئنجا ئێمە لەبەر ئەوەی، پێمان وایە، ئەگەر شتێكمان نووسی، لە بیرمان ناچێ، خواش ﷻ بە پێی عەقڵی ئێمە ئێمەی دواندوە، واتە: زانیاریی خواش، وەك لە كتێبێكدا تۆماری كردبێ، لە لەوحێكدا، بەو شێوەیە هیچی لێ ون نابێ و، لێ پەنهان نابێ.

ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ (ساعة) دێنێ، ڕۆژی دوایی دێنێ، ئاخیر زەمان و، هەڵسانەوەو قیامەت و سزاو پاداشت دێنێ؟

٨)- ﴿لِّيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۚ﴾، تاكو پاداشتی ئەوانە بداتەوە، كە بڕوایان هێناوەو كردەوە باشەكانیان ئەنجام داون، واتە: پاداشتی شایستەیان بداتەوە.

٩)- ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ﴾، ئا ئەوانە لێبوردنێكی تایبەت و، بژیوێكی پڕ ڕێزو حورمەت، یاخود باشترین و پەسندترین بژیویان بۆ دانراوە، ئەوە بە

نسبەت ئەهلی ئیمانەوە، کەواتە: یەکێك لە حیکمەتەکانی هاتنی (ساعة)، چ ئاخیر زەمان بێ، چ قیامەت بێ، چ ڕۆژی دوایی بێ، بە گشتیی، ئەوەیە خوا ﷻ پاداشتی بڕواداڕانی کردار باش بداتەوە، بە لێبوردنێکی تایبەت و بژێوێکی پڕ ڕێزو حورمەت.

هاندەرێکی دیکە، پاڵنەرێکی دیکەو حیکمەتێکی دیکە لە هاتنی ئاخیر زەمان، یاخود قیامەت، یان ڕۆژی دوایی، ئەوەیە سزای خراپەکاران بداتەوە.

١٠)- ﴿ وَٱلَّذِينَ سَعَوْ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ ﴾، ئەوانەش کە تێکۆشاون لە دژی ئایەتەکانمان، دەستەوسانکەرانە، واتە: کە پێیان وابووە ئێمە دەستەوسان دەکەن، یاخود: ئایەتەکانی ئێمە پەك دەخەن، دەستەپاچەیان دەکەن، (مُعاجِزين) خوێندراوەتەوەش: (مُعَجِّزين)، کە هەر یەك واتایان هەیە، واتە: بە خەیاڵی خۆیان، پێیان وایە خوا ﷻ دەستەوسان دەکەن و، ئایەتەکانی خوا ﷻ پەك دەخەن، یاخود: پێیان وایە: دەرباز دەبن.

١١)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾، ئەوانەش سزایان بۆ هەیە، لە سەختترین و تۆخترین سزای بە ئێش.

﴿ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾، (الرِّجزُ: العَذاب، أو أسْوء العَذاب و أشَدُّهُ)، هەروەها (الرُّجْز) و (الرُّجْز) بە مانای (الحِملُ الثَقِيل)، باری قورسیش هاتوە، کەواتە: (عَذاب) یانی: سزا، (رِجز)یش یانی: سزای خراپ، یان سزای سەخت، (ألیم) یانی: بە ئێش، ﴿ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾، ئەو (مَن)ە، بۆ ڕوونکردنەوەیە، (مِن)ی (بیانیة) یە، واتە: ئازارەکەیان لە پیسترین و سەختترین ئازارەو زۆریش بە ئێش و ژانە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ سَعَوْ ﴾، (السَّعيِ: الإجْتِهَادُ، وَهُنَا مُسْتَعَارٌ للْجِدِّ فِي فِعْلِ مَا)، وەك پێشتریش گوتمان (سَعي): بە مانای تێکۆشان و هەوڵدان و خۆماندوو کردنە، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ جیددیی بوونی کەسێك و مکووڕ بوونی لەسەر شتێك و، سەرفکردنی ئەوپەڕی توانای خۆی لە شتێکدا.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ئەوانەی خاوەن زانیاریین، قەدری کتێبی خوا دەزانن و، دڵنیان لە ڕاست و هەقبوونی و، بەرەو ڕاستە ڕێ، ڕێنمایی کردنی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ۝٦ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ﴾، ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە دەبینن، دەزانن.

٢)- ﴿ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ ﴾، کە ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆ تۆ دابەزێنراوە، هەر ئەوە هەق و ڕاستە.

٣)- ﴿ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴾، ڕێنمایی دەکات بەرەو ڕاستە، شەقامی (خوای) زاڵی ستاییشکراو.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ﴾، ( وَيَرَى): لێرەدا مەبەست لە بینین، بینینی زانیارییە، بینینی عەقڵ و دڵە، بەڵام بۆیە ئەمە هەڵبژێردراوە بەسەر (يَعْلَم)دا، لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (وَيَعلَمُ الَّذِيْنَ أُوتُوا العِلمَ)، تاکو ئێمە ئاگادار بکاتەوە، کە ئەو زانیارییە پێدراوەی هەیانە، بە هەقانیەتی کتێبی خوا، وەك زانیاریانە بە شتە بینراوەکان، کە بەرهەستن و لەبەر چاویانن، واتە: وەك بە چاوی سەر ببینن، ئاوا بە چاوی عەقڵ و دڵ دەزانن، دەبینن کە ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆ تۆ دابەزێندراوە، هەر ئەوە هەقەو ڕاستە، ﴿ هُوَ ٱلْحَقَّ ﴾، کە ئەم (هُوَ) پێی دەگوترێ: ڕاناوی جیاکردنەوە (ضَمِيْرُ الفَصْل)، مانای کورت هەڵهێنانی هەق لە قورئاندا، دەگەیەنێ، بەس ئەوە هەقە، هەقی ڕەها تەنیا لە قورئاندایە.

مەبەست لە: (أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ): وەك پێشتریش باسمکرد:

١- دەگونجێ خاوەن کتێبەکان بن، واتە: ئەوانەی ئەو کاتە باو بوون، جوولەکەو نەصرانییەکان، ئەگەرنا صابیئەو مەجووسەکانیش، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: وەك خاوەن کتێبەکان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، لەبەر ئەوەی ئەوانیش شوبهە کتێبێکیان هەیە.

٢- دەشگونجێ مەبەست پێی زانایانی ئیسلام بێ، چ هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، چ ئەوانەی دیکە کە لە قورئان شارەزابن و زانیارییان لە بارەی قورئانەوە پێ درابێ، دەزانن ئەوەی بۆ تۆ دابەزێنراوە، کە قورئانە لە پەروەردگارتەوە، هەر ئەوە هەقەو، هەر ئەوە خەڵك ڕێنمایی دەکات، بۆ ڕاستە شەقامی خوای باڵادەستی ستاییشکراو.

٣- دەشگونجێ مەبەست پێی زانایان بێ، بە ڕەهایی، ئەم مانایەش ڕەنگە هەبێ، بەڵام لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، کە مەرج نیە مەبەست خاوەن کتێبەکان بن و، مەرج نیە تەنیا مسوڵمانانی زاناو شارەزابن، بە قورئان، بەڵکو مرۆڤە زانایەکان، دەزانن کە ئەم قورئانەی بۆ تۆ دابەزێندراوە لە پەروەردگارتەوە، هەقەو ڕاستەو، چەسپاوە، هەقی گرتۆتە نێو خۆی، ڕاستی گرتۆتە نێو خۆی، چاکیی و پاکیی گرتۆتە نێو خۆی، خەڵکیش ڕێنمایی دەکات، بەرەو ڕاستە شەقامی خوای زاڵی ستاییشکراو، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (قەدری زێڕ لەلای زێڕنگرە)، ئێستاش لە گۆشەو کەنارەکانی دنیادا، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دنیادا، لە باکوورو باشووری، هەموو ئەو مرۆڤانەی لێ دەکۆڵنەوە، بە مەرجێك ویژدانێکی زیندوویان هەبێ، زانیارییەکی باشیان هەبێ، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە لە قورئان و، لە ئەنجامی ڕۆچوون بە زانیارییەکەی خۆیاندا، بە مەرجێك قورئانیان لێ هەڵکەوێ و، بە بەشێك لە قورئان یان بە هەمووی ئاشناو شارەزا بن، دەیانبینی بڕوا دەهێنن و دەبنە مسوڵمانی زۆر چاك و جیددیی، چونکە لە ڕاستییدا مرۆڤ تاکو زاناتر بێ، زیاتر قەدری کتێبی خوا ﷻ دەزانێ.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**سەرسوڕمانی بێبڕوایان لە مەسەلەی زیندوو کرانەوەو، تۆمەتبار کردنیان بۆ پێغەمبەری خوا (محمد ﷺ)، بە درۆ هەڵبەستن یان شێتیی و، وەڵامدرانەوەیان بە ڕێك و پێکیی لە گەردووندا و، پارێزرانی ئەوان، لە بە زەویدا ڕۆبران و، ئاسمان بەسەردا کەوێندران، کە ئەوە نیشانەیەکی گەورەو مەزنە، بۆ هەر بەندەیەك کە لە ناخەوە بەرەو خوا بگەڕێتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ ﴿٧﴾ أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ﴿٨﴾ أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِن نَّشَأۡ نَخۡسِفۡ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ نُسۡقِطۡ عَلَيۡهِمۡ كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴿٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون، گوتیان، واتە: ئەوانەی کە هەقیان کەوتە بەرچاو، بەڵام دایانپۆشی و ڕەفزیان کردو قبووڵیان نەکرد، ئەگەرنا کەسێك هەق نەزانێ و بە هەق ئاشنا نەبووبێ، بە مەرجێك تێیدا کەمتەرخەم نەبووبێ، بە کافر لە قەڵەم نادرێ، چونکە هەقێکی بۆ نەهاتوە، تاکو دایپۆشێ و، ئەو کاتەش ئەو حوکمانەی بۆ کافران دیارییکراون، لە دنیاو دوارۆژدا، ئەو جۆرە کەسانە ناگرنەوە، وەك زۆر جاری دیکە گوتوومانەو لە کتێبی دوازدەیەمی مەوسووعەی: (الإِسْلَام كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَابِ الله) دا، بە درێژیی لەو بارەوە دواوم، هەروەها لە مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا)، دیسان لەو بارەوە لە چەند شوێنێك دا قسەم کردوە، بەتایبەت لە کتێبی دووەم دا.**

ئەوانەی کە بێبڕوان و هەقیان دا پۆشیوەو ڕەفز کردوە، گوتیان:

٣)- ﴿هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ﴾: ئایا پیاوێکتان پێشان بدەین؟ ئەم پرسیارە (هَلْ)، (الإِسْتِفْهَامُ يُسْتَعْمَلُ فِي العَرْضِ وَيُقْصَدُ بِهِ التَّعْجِيبُ)، ئەم پرسیارکردنە بە کارهێنراوە لە ڕانواندن و پێشاندانداا، بەڵام مەبەست پێی سەرسوڕماندنە، واتە: سەرتان سوڕمێنێ، لە پیاوێك، (نَدُلُّكُمۡ) پێشانتان بدەین، (نُعَرِّفُكُم)، پیاوێکتان پێ بناسێنین.

ئنجا کە گوتوویانە: (هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ)، ئایا پیاوێکتان پێشان بدەین؟ وشەی: (رَجُلٖ) بە نەناسراو (نکرة) هاتوە، وەك پێغەمبەر موحەممەد ﷺ پیاوێکی نەناسراوبێ و کەس پێی ئاشنا نەبێ، یاخود پیاوێکی نادیدەگیراو بێ! کە لە ڕاستییدا ئەوە بێ ئەدەبیی و بێ ئینسافییەکی گەورە بووە لە لایەن کافرەکانەوە، چونکە موحەممەد ﷺ پێش پێغەمبەرایەتییشی، زۆر ناسراو بووە، بە بەڵگەی ئەوە کە کاتێك لە دەمی دروستکردنەوەی کابەدا دەبێتە کێشەو مشتومڕیان، لەسەر ئەوەی کێ بەردە ڕەشە (الحجر الأسود) دابنێتەوە، لە ساڵی (٣٥)ی پێش پێغەمبەرایەتییدا، دەڵێن: هەر کەسێك یەکەمجار هات، ئەو دەکەینە دادوەر، داخۆ ئەو بەردە ڕەشە چۆن دابنێینەوە؟ کێشەیەکی جیدیی دەبێ لە نێو تیرەکانی قورەیش دا، هەر کامێکیان، دەڵێ: دەبێ من دایبنێمەوە، لەبەر ئەوەی بەردە ڕەشەیان پێ پیرۆز (مقدّس) بووە، ئنجا یەکەمین کەس لەوکاتەدا کە دێ موحەممەد ﷺ دەبێ، دەڵێن: (جَاءَ الأَمِيْن، جَاءَ الأَمِيْن)، ئەوە ئەمین هات، پیاوی ئەمیندارو ئەمانەت پێ سپێردراوو پاك و، دەستپاك هات، هەروەها موحەممەد بە: (الصَّادِقُ الأَمِيْن)، ڕاستگۆو دەستپاك ناوی دەرکرد بوو، موحەممەد ﷺ پیاوێکی نەناسراو نەبووە، پیاوێکی نامۆ نەبووە، بەڵام ئەوە بێ نەزاکەتیی و بێ ئینسافیی بێبڕوایەکان دەردەخات.

ئنجا ئایا ئەو پیاوە چی دەڵێ؟:

٣)- ﴿يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ﴾، هەواڵتان پێ دەدا، کاتێك ئێوە پارچە پارچە بوون، بە تەواویی بەش بەش بوون و لێك هەڵوەشان لە زەویدا،

ئێوە لە نوێ دروستدەکرێنەوە؟ ﴿إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾، (التَّمْزِيْقُ: تَفْكِيْكُ الأجزَاءِ المُتَلَاصِقَة)، (تَمْزِيْق): بریتیە لە یەکهەڵوەشاندنی بەشەکانی شتێك کە پێکەوە لکێندراون و جۆشدراون، (مُمَزَّق: مَصْدَرٌ مِيْمِيٌّ، لِمَزَّقَهُ مِثْلُ: المُسَرَّح للتَّسْرِيْح)، وشەی: (مُمَزَّق) چاوگێکی میمییە، بۆ کرداری (مَزَّق)، (مَزَّقَ، يُمَزِّقُ، تَمْزِيْقاً فَهُوَ مُمَزِّق)، (مُمَزَّق)یش هەم دەبێتە ناو (هەڵوەشاو) هەم دەبێتە چاوگ (هەڵوەشاندن)، وەك (مُسَرَّح) کە لە وشەی (سَرَّحَ، يُسَرِّحُ، تَسْرِيْحَاً)وە، دێ، واتە: بەردراو، بەرهەڵداکراو، بەردان، بەرهەڵداکردن.

﴿كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾، بە تەواویی لێك هەڵوەشاوەو پارچە پارچە بووەو، هەر بەشەی بە لایەکدا چووە، مەبەستیان ئەوە بووە، مرۆڤ کاتێ دەمرێ و جەستەکەی دەخرێتە بن خاکەوە، پارچە پارچە دەبێ و پرژو بڵاو دەبێ.

﴿إِنَّكُمْ لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾، ئنجا ئێوە لە نوێ دروست دەکرێنەوە، (الخَلْقُ الجَدِيْد: الحَدِيْثُ العَهْدِ بِالوُجُود)، دروستکراوی تازە، واتە: دروستکراوێك کە تازە هاتۆتە بوون، (أي: فِي خَلْقٍ غَيْرِ الخَلْقِ الأوَّلِ الَّذِي أَبْلَاهُ الزَّمَان)، واتە: دروستکرانێك جگە لە دروستکرانی یەکەم، کە ڕۆژگار ڕزاندوویەتی و لێکیهەڵوەشاندوە، لە نوێ دروست بکرێنەوە، کە مەبەست پێی زیندوو کردنەوەی ڕۆژی دواییە، بە سەرسوڕمانەوە دەڵێن: پیاوێکتان پێ نیشان بدەین، شتێکی واتان پێ دەڵێ؟

ئنجا وشەی (جَدِيدٍ) لە: ﴿إِنَّكُمْ لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾دا، یان (فعیل)ی بە مانای (فاعل)ە، واتە: لە نوێ هاتوە، یاخود (فعیل)ی بە مانای (مفعول)ە، واتە: لە نوێ هێندراوە، هەردوو حاڵەتەکەی لەگەڵدا دەگونجێن، واتە: یان ئەو دروستکراوە لە نوێ هاتوە، یان لە نوێ هێنراوە.

٣)- ﴿أَفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةٌۢ﴾، ئایا ئەو پیاوە کە ئەو قسەیە دەکات، درۆی بەناوی خواوە هەڵبەستوە، یان شێتییەکی تێدایە؟! یانی: حاڵی لە دوو ئەگەر بەدەر نیە:

أ- یان درۆ بە ناوی خواوە دەکات.

ب- یان جۆرێك لە شێتیی تووشبووە.

لە ئەصڵدا، (أَفۡتَرَىٰ)، (أَإفترى)یە، بەڵام (تَذْهَبُ الهَمْزَةُ فِي الدَّرْجِ)، لە کاتێکدا کە لە پێش ئەو هەمزەیەوە شتێکی دیکە هەبێ، ئەو هەمزەیە نامێنێ و دەڕوا، واتە: ئەگەر خۆی لە سەرەتاوە دەستی پێکرابایە دەگوترا: (إفترى)، بەڵام کە شتێکی دیکەی دەخرێتە پێش، لە کاتی وەسڵدا دەڕوا:

ئایا بە ناوی خواوە درۆی هەڵبەستوە، کە دەڵێ: خوا ﷻ پێی فەرمووم: زیندوو دەکرێنەوە، ئایا ئەوە درۆیەکە بە ناوی خواوە هەڵیدەبەستێ؟ یاخود جۆرێ لە شێتیی تووشبووە، (جِنَّةٌ) بە نەناسراو (نكرة) هاتوە، ئەمەش دەلالەت لەسەر جۆر (نوع) دەکات، واتە: جۆرێك لە شێتیی هەیە، نەك شێتیی تەواو بێ، بەڵام جۆرێك لە شێتییە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە!

خواش ﷻ لە وەڵامیاندا دەفەرموێ:

٤)- ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ﴾، بەڵکو ئەوانەی بڕوایان بەمەنزڵگای کۆتایی نیە لە ئازارو گومڕاییەکی دووردان. ئەوان بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ تۆمەتبار دەکەن، بەوە کە: یان درۆی بە ناوی خواوە هەڵبەستوە، یان جۆرێك لە شێتیی هەیە، لەبەر ئەوەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، بۆیە خوا ﷻ دەیانباتە سەر ئەصڵی مەبەست و دەفەرموێ: بەڵکو ئەوانەی بڕوایی بە ڕۆژی دوایی و مەنزڵگای کۆتایی نیە، لە سزادان و لە گومڕاییەکی دووردان و، هۆکاری نکووڵیکردنیان لە زیندووکرانەوەو سزاو پاداشت، ئەوەیە.

(الضَّلَالُ: خَطَأُ الطَّرِيقِ المُوْصِلِ إلى المَقْصُود)، (ضلال) ئەوەیە مروڤ ئەو ڕێیەی دەیگەیەنێ بە ئامانج لێی ون ببێ، یان تێیدا بە هەڵەدا بچێ، ئنجا چ ئەو لە ڕێگەکە ون بێ، چ ڕێگەکە لەو ون بێ، (ضَلَّ الطَّرِيق) ڕێیەکەی ون کرد، (ضَلَّ عَنِ الطَّرِيق) خۆی لە ڕێیەکە ون بوو، چونکە دەگونجێ مرۆڤ ڕێی لێ ون بێ، دەشگونجێ بۆ خۆی لە ڕێیە لابدات و ون بێ.

کە دەفەرموێ: ﴿فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ﴾، لە سزاو ئازاردان و، لە گومڕایی دووردان، هەموو توێژەرانی قورئان گوتوویانە: لە سزاو ئازاردان، واتە: لە ڕۆژیی

دواییدا لە سزاو ئازاردان، بەڵام بۆچی پێشخراوە؟ هەرچەند گومراییە دوورەکە، لە رووی ڕیزبەندیی کاتییەوە، لە پێشەوەیە، لە دنیایەدایەو، لە ڕاستییدا کەوتنە نێو سزاو ئازارەکە، بەرهەمی گیرۆدە بوونە بە گومراییە دوورەکەوە، کەواتە: دەبووایە بفەرموێ: (فِي الضَّلَالِ الْبَعِيدِ وَالعَذَابِ). بەڵام بۆچی پێشخراوە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: لەبەر ئەوەی لە سزاو ئازاردا بوونەکە، گرنگترو گەورەترە، بۆیە پێشخراوە، ئەمە ڕای زۆربەی ڕوونکەرەوانی قورئانە.

بەڵام من وێڕای ئەوە، بۆچوونێکی دیکەشم هەیە، ئەویش ئەوەیە کە: (ٱلْعَذَابِ)، دەگونجێ هەر مەبەست پێی ئازارو سزای دنیا بێ، یانی: هەر لە دنیادا ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی و بە مەنزڵگای کۆتایی نیە، لە سزاو ئازاردان، لە ئەشکەنجەی دەروونییدان و، لە ناڕەحەتیی و دڵە ڕاوکەدان، کە پێیان وایە خوایەك و خاوەنێك، لێیان ناپرسێتەوەو، زیندوویان ناکاتەوە، سزاو پاداشتێك لە ئارادا نیە، ئەوە هەر بۆ خۆی ئەشکەنجەو ئازارێکی دەروونیی گەورە بۆ مرۆڤ دروست دەکات.

٥)- ﴿ أَفَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئایا نەیانڕوانیوە بۆ ئەوەی لە پێش دەستیانەوەو، ئەوەی لە دوایانەوەیە، لە ئاسمان و زەوی.

هەمزە (أ)ی ( أَفَلَمْ يَرَوْا )، هەمزەی پرسیارکردنە، کە لێرەدا بۆ سەرسوڕمانێکە، نکووڵییلێکردنی تێکەڵ و ئاوێتە بووە، ﴿ أَفَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ ﴾، جێی سەرسوڕمانە، ئایا سەرنجیان نەداوەتە، ئەوەی لە پێش دەستیانەوەیە، لە پێشیانەوەیەو، ئەوەی لە پشتیانەوەیە، لە ئاسمان و لە زەوی، واتە: ئایا تەماشای ئەو ئاسمان و زەوییەیان نەکردوە، کە هەم لە پێشیانەوەیە، هەم لە دوایانەوە، بە واتەیەکی دیکە: هەر چواردەوریان ئاسمان و زەوییە.

لێرەدا: ( أَفَلَمْ يَرَوْا )، دەگونجێ دیتن (رؤیة) دیتنی چاویی بێ، ئنجا ئەوەی ئەو مانایەش، بەهێزتر دەکات، ئەوەیە کە (يَرَوْا) بە پیتی (إِلَىٰ) بەرکاری خواستوە، ( أَفَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ )، چونکە بە چاو سەرنجی ئەوە دەدرێ، ئەگەرنا (رؤیة) ئەگەر

مەبەست پێی: دیتنی عەقڵیی بێ، پێویستیی بە (إِلَیٰ) ناکات، بەرکاری پێ بخوازێ هەروەها دەشگونجێ مەبەست لە دیتن دیتنی عەقڵیی بێ و، بەکارهێنانی (إِلَیٰ) ش بۆ تۆخکردنەوەی مانای سەرنجدان و ڕامانەکەیە.

٦)- ﴿إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ الْأَرْضَ﴾، ئەگەر بمانەوێ بە زەوییاندا ڕۆ دەبەینە خوار، ڕۆیان دەچوێنین، ﴿إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ الْأَرْضَ﴾، خوێندراویشەتەوە: (إِنْ يَشَأْ يَخْسِفْ بِهِمُ الأَرْضَ)، واتە: ئەگەر خوا ﷻ بیەوێ بە زەوییاندا، ڕۆدەباتە خوار، بە زەوییدا ڕۆیاندەچوێنێ.

٧)- ﴿أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ السَّمَاءِ﴾، یاخود چەند پارچەیەکیان لە ئاسمانێوە بەسەردا دەخەینە خوار، دیسان ئەویش خوێندراوەتەوە: (أَوْ يُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفاً مِنَ السَّمَاء)، یاخود (خوا) چەند پارچەیەکیان لە ئاسمان بەسەردا دەخاتە خوار، وشەی: (كِسَفاً)یش، هەم بە (كِسَفاً) خوێندراوەتەوە، هەم بە (كِسْفاً)یش، ئەگەر (كِسَفاً) بێ، واتە: (قِطَعاً) چەند پارچەیەك، بەڵام (كِسْفاً) یانی: پارچەیەك.

لێرەدا ئەوەی خوا ﷻ سەرنجی ئەوانی بۆ ڕادەکێشێ ئەوەیە کە: ئەو ئاسمانەی لە پێشیانەوەیەو لە دوایانەوەیەو، ئەو زەوییەی لە پێشیانەوەو لە دوایانەوەیە، واتە: ئەو ئاسمان و زەوییەی کە لە هەموو لایەکیانەوە هەیەو، ئابڵووقەیان داون، دەبینن: ئاسمان بەو ڕوون و ڕێك و صافییەی و، بەو بێ هەست و خوست و بێ ژاوە ژاوییەی، وەك گومبەزێك بە سەریاندا دراوە، هەروەها زەوییش وەك بەڕەیەك بۆیان ڕاخراوە، ئنجا کە ئاوا دەیبینن، نە لە ئاسمانەوە هیچیان بەسەردا دەکەوێ و، نە زەویشیان لە بن دا ڕۆدەچێ و، دەبوو بزانن، پەروەردگارێك و خاوەنێکیان هەیە، مشووریان لێ دەخوات و ئاگای لێیانە، بۆیە دەفەرموێ:

٨)- ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾، بەڕاستیی لەوەدا نیشانەیەکی مەزن هەیە، بۆ هەر بەندەیەکی لە ناخەوە گەڕاوە بۆ لای خوا، (آيَة) واتە: نیشانەو بەڵگە، لێرەدا مەبەست لە (آيَةً) واتە: نیشانەیەکی زۆر گەورەو گرنگ، چونکە بە نەزانراو (نكرة) هاتوە،

یانی: نیشانەیەکە وەسف ناکرێ و زۆر گەورەیەو، جێی سەرنج لێدان و تێرامانە، کە خوا ﷻ نە زەوییان لە بن پێدا ڕۆدەباتە خوار، کە بە زەوییدا بچنە خوار، نە ئاسمانیشیان بەسەردا دەکەوێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە ئەهلی کوفرو گومراییـن و، پێغەمەبەری خواش ﷺ تۆمەتبار دەکەن، بە ناهەق و، ئایەتەکانی خواش بە درۆ دادەنێن و، دان بە چاکەکانی خوا دانانێن و، بەندایەتیی بۆ خوا ناکەن، ئنجا ئەوە کە خوا ﷻ لێیان دەگەڕێ، ژیانی دنیا ببەنە سەر، بگوزەرێنن، بێ ئەوەی پارچەیەکیان لە ئاسمانەوە بکەوێتە سەرو، بێ ئەوەی بە زەوییدا ڕۆببرێنە خوار، لەوەدا نیشانەیەکی مەزن هەیە، بۆ هەر بەندەیەك کە لە ئاخەوە بۆ لای خوا بگەڕێتەوە، چونکە (مُنِيب: من رَجَع بِقَلْبِهِ إلى الله تَعَالَى)، (مُنِيب): کەسێکە لە دڵەوە بەرەو لای خوای بەرز دەگەڕێتەوە، لە ڕاستییدا کاتێك مرۆڤ بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە، ئنجا چاوی بەصیرەت و دڵ و دەروونی دەکرێتەوەو، گوێی بەصیرەتی دەکرێتەوەو هەق دەبیستێ، هەق دەبینێ و هەق دەرك دەکات، بەڵام کاتێ کە مرۆڤ لە خوا دوور دەبێ، عەقڵ و هەستەوەرەکانی، باش کار ناکەن، پەردەیان بەسەر هەڵدەکشێ و، شتەکان وەك خۆیان نابینن، یان نیشانەکانی خوا دەبینن، بەڵام وەك نیشانەی خوا نایانبینن، بەڵکو وەك دیاردەی سروشتیی بێ خاوەن، تەماشایان دەکەن.

ئنجا وەك لە مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)دا، باسمان کردوە، هەر ئەوەشە هۆکاری ئەوە، کە هەندێ لە زانایانی سروشتناس، هەرچەندە شارەزان لە بواری فیزیاو کیمیاو گەردووونناسیی و پزیشکیی و زەویناسیی و، ڕووەکناسیی و زیندەوەرزانیی و ئاژەڵناسییدا، بەڵام زانیارییەکەیان نابێتە هۆی هیدایەتدانیان، چونکە ئینسان کە ئیمانی نەبوو، وەك کەسێك وایە بەبێ میکرۆسکۆب تەماشای دڵۆپەیەك ئاو بکات، ئنجا کە بە چاوی ڕووت، تەماشای دڵۆپەیەك ئاو بکات، بەس دڵۆپەیەك ئاو دەبینێ، بەڵام ئەگەر بە میکرۆسکۆب تەماشای بکات، دنیایەك زیندەوەرو دروستکراوانی تێدا دەبینێ، لە ڕاستییدا ئیمانیش میکرۆسکۆبێکە، ئینسان دەیکاتە سەر عەقڵ و چاوو دڵ و گوێی، شتی دیکەی پێ دەبینێ، واتە: شتەکان کە دەبینێ، وەك دیاردەیەکی سروشتیی، وەك ماددەیەکی کەرو لاڵ، وەك شتێکی بێ خاوەن، نایانبینێ، بەڵکو وەك ئەوە دەیانبینێ، کە نیعمەت

و چاکەی خوان و لە حەقیقەتیشدا هەر وایە، چونکە تۆ تەماشا بکە! مرۆڤێك گوڵێکی پلاستیك لە شوێنێك کەوتوە، دەیبینێ، سەری لێ سوڕدەمێنێ، چەندە جوان دروستکراوە! ئەدی گوڵێك کە خوا دروستیکردوە، بۆنی هەیەو گەشەی هەیە، بۆچی دەبێ سەری لەوە سوڕنەمێنێ؟! یان مرۆڤ بووکە شووشەیەك دەبینێ، پێی سەیرە، یان تابلۆو دیمەنی مرۆڤێك دەبینێ دەڵێ: زۆر جوانیان دروستکردوە! ئەدی بۆچی بە خودی مرۆڤەکە، زۆر سەرسام نابێ؟ هۆکارەکە هەر ئەوەیە کە مرۆڤ بە ئیمانەوە تەماشا ناکات و، عەقڵ و دڵەکەی ئیمانیان تێدانیە، وەك کەسێك کە میکرۆسکۆبێکی بە دەستەوە نیەو، تەماشای شتەکان دەکات، تەنیا ڕواڵەتەکەیان دەبینێ، یان کەسێ بە چاوی ڕووت تەماشای ئاسمان بکات، ئەوە لە کوێ و ئەوە لە کوێ کە بە تەلەسکۆب تەماشا بکات، ئەو هەموو کاکێشان و ئەستێرانە ببینێ! بەڵام کە بە چاوی سەر تەماشابکات، تەنیا ئاسمانێکی شین دەبینێ!

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، کە چاوی عەقڵ و دڵمان زیاتر بکرێتەوە، بە هۆی ئیمانەوە، تاکو دروستکراوەکانی خوا، وەك نیشانەکانی خوا ببینین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە پێنج ئایەت پێکهاتوەو، لە بارەی هەردووک پێغەمبەری خواوە، داوودو سولەیمان، کە باب و کوڕن (عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)و، ئەو چاکەو نیعمەتانەی خوا پێی بەخشیون، دەدوێن، هەرچی داوودە ﷺ، خوا ﷻ باسی چیایەکان و باڵندەکانی کردوە، کە لەگەڵیدا یادی خوایان کردوەو، ئاسنیشی بۆ نەرمکردوە بۆ دروستکردنی زرێیان، هی سولەیمانش ﷺ، خوا ﷻ باسی باو کانیی مس و، ڕامکرانی جندەکان، کە میحراب و پەیکەرو مەنجەڵی گەورەی حەوزی ناو ئاساو، مەنجەڵی چەسپاویان، بۆ دروستکردوون و، هەتا مۆرانەش لە گۆچانەکەی نەداوەو نەکەوتوە، جند نەیانزانیوە، مردوە، بەڵکو هەر سەرگەرمی کارو بێگار بوون.

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ يَـٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ
ٱعْمَلْ سَـٰبِغَـٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١﴾ وَلِسُلَيْمَـٰنَ
ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ
بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ
مِن مَّحَـٰرِيبَ وَتَمَـٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَـٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ
مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ
تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ
ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾﴾.

## ماناى دەقا و دەقى ئايەتەكان

{هەروەها (وەك چۆن پێغەمبەرایەتییمان بە موحەممەد ﷺ داوە) بە دڵنیاییەوە لە لایەن خۆمانەوە بەخششێك (ی مەزن)مان بە داوود دابوو (یەكێك لە نیشانەكانی ئەو بەخششەش زیكری خوا لەگەڵ گوتنەوەی چیایەكان و باڵندەكان بوو، گوتمان:) ئەی چیایەكان و باڵندەكان! وێڕای (داوود) بیڵێنەوە، هەروەها ئاسنیشمان بۆی نەرمكردبوو، تاكو زرێیانی لێ دروست بكات ﴿١٠﴾ پێمان گوت: ئەی داوود!، (زرێیە) تێرو تەواوەكان (سەرتاپا داپۆشەرەكان) دروست بكەو، لە چنینـدا ئەندازەگیریی (وردەكاریی) بكە، (با بزمارەكان لە قەدەر كونەكان بن، نە باریكترو نە درشتتر)، هەروەها كردەوەی چاكیش بكەن، بێگومان من بینەری ئەوەم كە دەیكەن ﴿١١﴾ هەروەها بۆ سولەیمانیش (با) مان دەستەمۆ كرد بوو، ڕێ بڕینی بەیانیانی، مانگە ڕێیەك و، هی ئێوارانیشی، مانگە ڕێیەك بوو و، كانیی مسیشمان بۆ ڕەوان كرد بوو و، لە جندانیش هی وایان هەبوون بە مۆڵەتی پەروەردگاری لەبەر دەستیدا، كاریان دەكردو، هەر كەسێكیش لەوان لە فەرمانی ئێمەی لادابایە (خۆی بواردبایە) لە ئازاری كڵپەی ئاگرمان پێ دەچێژت ﴿١٢﴾ هەرچی ویستبای بۆیان دروستدەكرد، لە كۆشكان (یان پەرستگایان)و، پەیكەران و، دەفران (قاپی گەورەی خۆراك تێدا خواردن) ی وەك حەوزان و، مەنجەڵە چەسپاوەكان، (پێمان گوتن:) ئەی نیزیكانی داوود! سوپاسگوزاریی ئەنجام بدەن و، كەمێكیش لە بەندەكانم سوپاسگوزارن ﴿١٣﴾ ئنجا كاتێك مردنمان بەسەر (سولەیمان)دا هێنا، تەنیا زیندەوەری زەویی (مۆرانە) كە گۆچانەكەی خوارد، لە مردنیی ئاگاداری كردنەوە، كاتێك (لاشەكەی) كەوت، جندەكان بۆیان ڕوونبۆوە، كە ئەگەر (وەك لاف لێدەدەن) پەنهانیان زانیبایە (ئەو هەموو ماوەیە كە بەسەر مردنی سولەیماندا گورەزا بوو) لە ئازار (ی بێگار)ی ڕیسواكەردا نەدەمانەوە ﴿١٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَضْلًا): (الفَضْلُ: الزِّيَادَةُ مِنَ الإِقْتِصَادِ، وَكُلُّ عَطِيَّةٍ لَا تَلْزَمُ مَنْ يُعْطِي هِيَ فَضْل)، (فَضْل): بریتییە لە زیادە لە حاڵەتی میانجیی، هەر بەخششێکیش کە بابای بەخشەر پابەند نەبێ بیبەخشێ، پێی دەگوترێ: (فَضْلُ)، فەزڵی لەگەڵ نواند، واتە: شتێکی پێدا کە لەسەر پێویست نەبێ بیدات.

(أَوِّبِى مَعَهُۥ): لەگەڵیدا بیلێنەوە (الأَوْبُ: الرُّجُوعُ، أَوِّبِي: فِعْلُ أَمْرٍ مِنَ التَّأْوِيبِ، وَالأَوْبُ، رَجِّعِي مَعَهُ التَّسْبِيحَ، أو رَاجِعِي مَعَهُ فِي التَّسْبِيحِ)، وشەی (أَوِّبِي) کرداری فەرمانە لە (تَأْوِيب) یاخود لە (أَوْب)ەوە، یانی: خوا بە پاككرتنی لەگەڵ بلێوە، یاخود کە ئەو خوا بە پاك دەگرێ، یادی خوا دەکات، تۆش لەگەڵی پێدا بچۆوە.

(سَٰبِغَٰتٍ): کۆی (سَابِغَة)یە، (سَابِغَة) واتە: تەواو داپۆشەر، (سابغات: دُرُوعًا وَاسِعَةً ضَافِيَةً)، ئەو زرێیانەی هەموو جەستە دادەپۆشن، کاتێ خۆی زرێ هەبووە، لە کاتی جەنگدا جەنگاوەران پۆشیویانە، کە تیرو شیرو زەبر، نەیانتوانیوە بگەنە جەستەی ئەو مرۆڤەو برینداریی بکەن.

(وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ): (السَّرْدُ: نَسْجُ الدِّرْعِ)، (سَرْد): واتە: چنینی زرێ، (قَدِّر فِي السَّرْدِ: بَيِّنْ كَمِّيَّتَهُ وَاجْعَلِ المَسَامِيرَ وَالثُّقُوبَ بِمِقْدَار وَانْسِجَامٍ مَعَ بَعْض)، واتە: ئەندازەکەی دیاریی بکەو، ئەو کونانەی بزمارەکانیان تێدەخرێن، با بە ئەندازەو پێکەوە گونجاو بن.

(غُدُوُّهَا): واتە ڕۆیشتنی بەیانیانی، (الغَدْوَةُ وَالغَدَاةُ: أَوَّلُ النَّهَارِ)، سەرەتای ڕۆژ، لە بەیانییەوە تاکو نیوەڕۆ، پێی دەگوترێ: (غَدْوَة)، یان (غَدَاة)، (غُدُوّ) واتە: ڕۆیشتنی بەیانییان، (وَهِيَ مَا بَيْنَ الفَجْرِ وَطُلُوعُ الشَّمْسِ) کە دەکەوێتە نێوان سپێدەی بەیانیی، تاکو خۆرهەڵاتن و، هەندێکیش گوتوویانە: تاکو نیوەڕۆش هەر پێی دەگوترێ: (غَدَاة)، لەوە بەولاش، پێی دەگوترێ: (عَشِيٌّ)، دوای نیوەڕۆ.

(وَرَوَاحُهَا): (الـرَّوَاحُ: السَّـيْرُ لَيْـلًا)، (رَواح) ڕۆیشـتنی شـەوە، کـە مەبەستیشـیان ئـەوە بـووە لـە دوای نوێـژی نیـوەڕۆ، پێیـان گوتـوە: (عَـشِي) یاخـود: ئێـوارە، ئنجـا (رَوَاح) بریتیـە لـە ڕۆیشـتنی دوای نیـوەڕۆ، بـە کورتیـی: خـوا دەفەرمـوێ: ئـەو بایـەی بـۆ سـولەیمانمان دەسـتەمۆ کـرد بـوو، مـاوەی مانگـە ڕێیەکـی دەبـڕی، لـە بەیانییـەوە تاکـو نیـوەڕۆو، مـاوەی مانگـە ڕێیەکـی دیکەشـی دەبـڕی، لـە نیـوەڕۆوە تاکـو شـەو.

(وَأَسَلْنَا): (جَعَلْنَاهُ يَسِيلُ سَيَلَاناً) وامانلێکرد بڕوا، بڕژێ.

(عَيْنَ ٱلْقِطْرِ): واتە: کانیی مس، (القِطْرُ: النُّحَاسُ المُذَاب) (قطر) مسی تواوەیە.

(يَزِغْ): (يَزِغْ: يَمِلْ، وَيَحِدْ)، واتە: لابدا، مەبەست پێی سەرپێچییکردنە.

(مَّحَـٰرِيبَ): (المَسَـاكِنُ وَالأَبْنِيَّـةُ الشَّرِيْفَـةُ المَصُونَـةُ عَـنِ الإِبْتِـذَالِ، أَو القُصُورِ، أَو المَعَابِدِ)، (مَحَارِيـب) کـۆی (مِحْـراب)ە، یـان بـە خانووبـەرەو بینـا خـاوەن ڕێـزو پارێزراوەکانـن، لـەوە کـە هەمـوو کـەس دەسـتی بیانگاتـێ، یاخـود: بـە کۆشـکی بـەرز دەگوتـرێ، یاخـود: بـە پەرسـتگاکان دەگوتـرێ.

(وَتَمَـٰثِيلَ): (تَمَاثِيْـل: جِمْـعُ تِمْثَـال وَهُـوَ الصُّـورَةُ المُصَـوَّرَة)، (تَمَاثِيْـل) کـۆی (تِمْثَـال)ە، ئەویـش بریتیـە لـە وێنەیـەك کـە کێشرابـێ، وێنەیـەك کـە وەك پەیکـەر داتاشرابـێ.

(وَجِفَانٍ): (جَمْـعُ جَفْنَـة، وَهِـيَ القِصْعَـةُ الكَبِـيْرَة)، (جَفْنَـة) دەفرێکـی گـەورەو قاپێکـی گەورەیـە، خواردنـی تێـدا بخـورێ.

(كَٱلْجَوَابِ): (جَـوَاب: جَمْـعُ جَابِيَـة، وَهِـيَ الحَـوْضُ الكَبِـيْر، سُـمِّيَ جَابِيَـة لأَنَّهَـا تَجْمَـعُ المَـاء)، (جَـوابِ) کـۆی (جَابِيَـة)ە، (جَابِيَـة)ش بریتیـە لـە حـەوزی گـەورە، ئنجـا ئـەو دەفـرو قاپـە گەورانـە کـە خۆراکیـان تێـدا خـوراوە، بۆیـە بـە یەکێکیـان گوتـراوە: (جَابِيَـة)، چونکـە وەك چـۆن حـەوزی ئـاو، ئـاو کـۆ دەکاتـەوە، ئەویـش خواردنـی تێـدا کۆکراوەتـەوە.

(وَقُدُورٍ): (قُـدُور: جَمْـعُ قِـدْر: إِنَـاءٌ يُطْبَـخُ فِيـهِ) (قِـدْر) بریتیـە لـە دەفرێـك خواردنی تێـدا دەکوڵێـنرێ، قابلەمـە، مەنجـەڵ، قازان.

(رَٰسِيَٰتٍ): (**جَمعُ رَاسِيَة: ثَابِتَاتٍ لَا تَتَحَرَّك**)، واتە: چەسپاون، ناگوازرێنەوەو لە شوێنی خۆیان چەسپاون.

(دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ): زیندەوەری زەوی، ژیانداری زەوی، (**الأَرَضَة: السُّرْفَة: سُوسٌ يَنْقِرُ الخَشَب**)، هەم (**أَرَضَة**)ی پێ دەگوترێ، هەم (**سُرفَة**)ی پێ دەگوترێ، بە کوردیی دەڵێین: مۆرانە، جۆرە زیندەوەرێکی وردە، دارو تەختە دەکۆڵێ و کرمۆڵی دەکات.

(مِنسَأَتَهُۥ): (**مَنْسَأَة**)ش خوێنراوەتەوە، (**العَصَى الغَلِيْظَة**) گۆچانێکی پتەو، یاخود: گۆچانی ئاسایی.

(خَرَّ): (**أي: سَقَطَ**) کەوت.

(تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ): جندەکان بۆیان دەرکەوت، بۆیان ڕوونبووەوە.

(مَا لَبِثُواْ): (**مَا مَكَثُوا، وَمَا بَقُوا**)، واتە: نەدەمانەوەو پێیان نەدەچوو.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەك پێشتر گرتمان، لەم پێنج ئایەتە موبارەکەدا، خوا ﷻ گۆشەیەك لە ژیان و بەسەرهاتی داوودو سولەیمان (عَلَيْهِمَا السَّلَام)، باب و کوڕی بەڕێز، کە هەم پێغەمبەر بوون و هەم پادشاو حوکمڕان بوون، بۆمان باس دەکات، هەڵبەتە ئێمە لە سوورەتی (الأنبياء)دا، لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتەکانی: (٧٨ - ٨٥)دا، بە درێژیی لە بارەی داوودو سولەیمانەوە (عَلَيْهِمَا السَّلَام)، دواوین و بەسەرهاتەکەیانمان هێناوەو، شیکردنەوەی وردمان لە بارەی موعجیزەکانیانەوە، کە خوا ﷻ پێی داون و، نیشانەکانیان و ئەو نیعمەتانەی خوا بۆی دەستەبەر کردوون، لەو بارەوە بە وردیی قسەمان کردوە، بۆیە لێرەدا بەس بە ئەندازەی ئەوە کە چەمك و واتای ئایەتەکان، ڕوون دەبێتەوە، قسە دەکەین:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە بەخششمان لە لایەن خۆمانەوە بە داوود ﷺ دابوو، واتە: شتێکمان پێدابوو کە پێویست نەبوو پێی بدەین، وەك بەخشش و خەڵات و دیاریی پێمان دابوو، ئنجا یەکسەر خوا ﷻ دێتە سەر باسی هەندێك لە بەخششەکان: ﴿ يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ ﴾، (گوتمان:) ئەی چیایەکان! لەگەڵی بڵێنەوە، (رَجِّعِي مَعَه)، ﴿ وَٱلطَّيْرَ ﴾، هەروەها ئەی باڵندەکان! ئێوەش لەگەڵی بڵێنەوە، یاخود: ﴿ وَٱلطَّيْرَ ﴾، یانی: (وَسَخَّرْنَا لَهُ الطَّيْر)، باڵندەشمان بۆ دەستەمۆ کردبوو، کە وەك چۆن چیایەکان، کاتێك داوود ﷺ ڕازو نیازی لە خزمەت پەروەدگاری دا دەکرد، بەو دەنگە بە سۆزو خۆشەی، یادی خوای دەکرد، چیایەکان لەگەڵیان دەگوتەوە، بە هەمان شێوە، باڵندەکانیش لەگەڵیان دەگوتەوە، دەیانگێڕایەوە، ﴿ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴾، ئاسنیشمان بۆ نەرمکرد بوو، ئایا ئەو ئاسن نەرمکردنە چۆن بووە؟ دوایی باسی دەکەین لە مەسەلە گرنگەکاندا، کە دیارە نەرمکردنێکی نائاسایی بووە، ئەگەرنا هەموو کەس دەزانێ، ئاگر بداتە بەر ئاسن، ئاسن نەرم دەبێ و، ئەوە شتێکی تایبەت

نیە بە پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بەڵام ئاسن بۆ نەرمکرانەکەی داوود، خوا ﷻ وەك بەخششی خۆی باسی بکات، بۆیە ئەوە شتێکی تایبەت بووە، ئەگەرنا هەموو کەس دەزانێ و شتێکی زانستییە، کە ئاسن بە هۆی ئاگر درانە بەرەوە، نەرم دەبێ، کەواتە: دیارە ئەو ئاسن بۆ نەرمکرانەی داوود ﷺ نەرمکرانێکی تایبەت بووە، ﴿ أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ﴾، پێمان گوت: زرێیە داپۆشەرەکان دروست بکەو، ئەندازەگیریی و وردەکاریی بکە، لە چنیندا، واتە: بزمارەکان لە قەدەر کونەکان بن و، چنینەکە بە ئەندازە بێ، ﴿ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ﴾، پێشمان گوتن: کردەوەی باش ئەنجام بدەن، کە لە ڕاستییدا دروستکردنی زرێیەکان، بۆ ئەوەی لە جەنگدا، جەنگاوەرەکان پارێزراوبن، ئەوە بەشێك بووە لەو کردەوە باشە، یاخود وێڕای ئەوەی خوای پەروەردگار ئەو نیعمەتانەی بۆ تۆ ڕەخساندوون، تۆش کردەوەی باش بکە، وەك سوپاسگوزاریی بۆ خوا ﷻ کە ئەو چاکەو نیعمەتانەی پێداوی، ﴿ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی من بینەری ئەوەم دەیکەن، هەرچی دەیکەن، من ئاگادارم و بینەرم و بە سەریەوە چاودێرم.

ئنجا دێتە سەر باسی سولەیمان ﷺ: ﴿ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ ﴾، هەروەها بۆ سولەیمانیش (با)مان دەستەمۆ و ملکەچ کرد بوو، ﴿ غُدُوُّهَا شَهْرٌ ﴾، ڕۆیشتنی بەیانیانی، مانگە ڕێیەك بوو، لە بەیانیی ڕا، تاکو لای نیوەڕۆ، ئەو بایە ماوەی مانگە ڕێیەکی دەبڕی، ﴿ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ﴾، ڕۆیشتنی ئێوارانیشی، مانگەڕێیەك بوو، واتە: دوای نیوەڕۆیانیش، دیسان مانگە ڕێیەکی دەبڕی، ﴿ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ﴾، کانیی مسیشمان بۆ ڕژاند بوو، بۆمان هەڵقوڵاند بوو، لێی دەڕژا، ﴿ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ﴾، لە جندانیش هەبوو، هەندێکیان لەبەر دەستیدا کاریان دەکرد، بە مۆڵەتی پەروەردگاری، واتە: لەبەر دەستیدابوون، کاریان بۆ دەکرد، دوایی هەندێك لە کارەکانی کە جند بۆ سولەیمانیان ئەنجام داون، باسیان دەکات، بەڵام جارێ باسی پابەندییان دەکات: ﴿ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا ﴾، هەر کەسێکیش لەوان لایدابایە لە فەرمانی ئێمە، کە فەرمانی خوا ﷻ، ئەوە

بووە، ئەو کارانەی سولەیمان پێیان دەسپێرێ، ئەنجامیان بدەن و، خۆ بواردن و کەمتەرخەمییان تێدا نەکەن، ئنجا هەر کەسێك لایدابایە، لەوان، لە فەرمانی ئێمە، ﴿نُذِقۡهُ مِنۡ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾، ئەوە لە ئازاری کڵپەی ئاگرمان پێ دەچێژت.

وا پێدەچێ سولەیمان ، خوا ئەو توانایەی دابێتێ، هەر کام لە جندەکان، ئەگەر سەرپێچییان کردبایە، بە ئاگر سزای دابووایە، بەڵام هەندێك لە زانایان دەڵێن: ﴿نُذِقۡهُ مِنۡ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾، یانی: لە ڕۆژی دوایيدا بە کڵپەی ئاگری دۆزەخ سزای دەدەین، لەسەر ئەوەی لە دنیادا خۆیان بواردوە، لەو کارانەی سولەیمان پێی سپاردوون.

ئنجا باسی هەندێك لەکارەکانیان دەکات: ﴿يَعۡمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ﴾، هەرچی ئەو ویستبای بۆیان ئەنجام دەدا، بۆیان دەکرد، ﴿مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٖ كَٱلۡجَوَابِ وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍ﴾، چوار شتان باس دەکات: لە میحرابەکان و لە تیمسالەکان و لە جەفنەکان و لە قیدرەکان، (مَحَارِیب) کۆی (مِحْرَاب)ە، پێشتریش باسمان کرد:

١- (مِحْرَاب) یان بە پەرستگا دەگوترێ، یان بە کۆشکی بەرز دەگوترێ، یان بە شوێنێکی تایبەت و پڕ ڕێز دەگوترێ، کە خەڵکی ئاسایی دەستی نەیگاتێ.

٢- (تَمَاثِیل) کۆی (تِمْثَال)ە، کە بریتیە لە پەیکەری شتەکان، کە بە وێنەی ژیاندارێك، وەك: شێر، یان پڵنگ، یاخود مرۆڤ دابتاشرێ.

٣- (جِفَان) کۆی (جَفْنَة)یە، (الجَفْنَة: وَهِيَ القِصْعَةُ الكَبِيْرَة، يُؤْكَلُ فِيْهَا الطَّعَام)، قاپێکی گەورە یان دەفرێکی گەورە، کە خواردنی تێدا دەخورێ، کە هێندە گەورە بوون وەك حەوزان بوون، (كَالْجَوَاب)، (جَوَاب) کۆی (جَابِیَة)یەو، (جَابِیَة) بە حەوزی ئاو دەگوترێ، گۆمی ئاو چەند گەورەیە، ئەو دەفرانە کە جند بۆ سولەیمانیان دروست دەکردن، تاکو خەڵکەکە، یان سەربازەکانی خواردنیان تێدا بخۆن، هێندەی حەوزی ئاو گەورە بوون.

٤- ﴿وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍ﴾، (قُدُور)یش کۆی (قِدْر)ە، واتە: مەنجەڵ و، قاپلەمەو، ئەو قاپلەمەو مەنجەڵانەش چەسپاو بوون و نەدەگوازرانەوە، زۆر قورس و گەورە بوون، ئەوانەیان هەموو بۆ دروستدەکردن، لە شوێنی دیکەش خوا باس دەکات، بۆ وێنە:

دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا دُونَ ذَٰلِكَۖ وَكُنَّا لَهُمۡ حَٰفِظِينَ﴾، لە شەیتانەکان هەبوون کە بۆی دەچوونە بن دەریاو، گەوهەرو مرواریـیان بۆ دەردەهێنان و، جگە لەوە کاری دیکەشیان دەکردو ئێمەش پارێزەریان بووین.

لە شوێنی دیکەش دەفەرموێ: ﴿وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ ٣٨﴾ص، هەندێکیش لە جندەکان جووت کرابوون لە زنجیراندا، لە کۆت و زنجیردا، واتە: سولەیمان عليه السلام هەندێك لە جندان کە سەرپێچییان کردوە، زنجیرپێچی کردوون، کەلەپچەی کردوون.

وەك لە سووڕەتی (ص)دا، دەفەرموێ: ﴿وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٖ وَغَوَّاصٖ ٣٧ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ ٣٨﴾، شەیتانەکانیش، هەر بینا دروستکەرێك [(بَنَّاء) ئەوەی بینا دروست دەکات]و (غَوَّاص): [ئەوەی دەچێتە بن دەریا]و هەندێکی دیکەشیان کە پێکەوە جووتکرابوون، لە زنجیراندا کەلەپچە کرابوون.

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ﴾، ئەی نیزیکانی داوود عليه السلام! واتە: داوودو نیزیکانی و بنەماڵەکەی، نیزیکانی و شوێن کەوتووانی! سوپاسگوزاریی ئەنجام بدەن، ﴿وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ﴾، کەمێکیش لە بەندەکانم سوپاسگوزارن، دوایی باسی سوپاسگوزاریی دەکەین، کە سوپاسگوزاریی کردەوەیەکە ئەنجام دەدرێ، نەك قسە بێ بگوترێ، پێشتریش پێناسەی شوکرو مەدح و حەمدمان کرد، کە شوکر جیایە لە حەمدو مەدح، زیاتر لایەنی کردەوەیی و جێبەجێکردنی هەیە.

﴿فَلَمَّا قَضَيۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَوۡتَ﴾، ئنجا کاتێ مردنمان بۆ بڕیاردا، مردنمان بەسەر سولەیمان هێنا، ﴿مَا دَلَّهُمۡ عَلَىٰ مَوۡتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلۡأَرۡضِ﴾، هیچ شتێك مردنەکەی سولەیمانی پێشان نەدان و حاڵیی نەکردن، کە سولەیمان مردوەو کۆچی دوایی کردوە، جگە لە زیندەوەری زەویی، مۆرانە، ﴿تَأۡكُلُ مِنسَأَتَهُۥۖ﴾، کۆچانەکەی دەخوارد، لە نێویدا گۆچانەکەی گەندەڵ و کرمۆڵ کرد بوو، مۆرانە

خوارد بووی، ﴿ فَلَمَّا خَرَّ ﴾، ئنجا گۆچانێك كە لە نێویدا بخورێ، تونێكڵەكەی دەرێ خۆی ڕاناگرێ، سولەیمانیش خۆی داوەتە سەرو لەو كاتەش دا، گیانی سپاردوە، ئنجا كاتێك گۆچانەكە كەوت، سولەیمانیش كە لە سەری بوو، كەوت، ﴿ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ ﴾، جندیش بۆیان ڕوونبۆوە ﴿ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴾، كە ئەگەر پەنهانیان زانیبایە، لەو ئازارو بێگارە ڕیسواكەرو، زەبوونكەرەدا، نەدەمانەوە، بێگومان جند ئەو كارانەی سولەیمان پێی كردوون، كارو بێگارێك بووەو پێیان وابووە ئەوە مایەی ڕیسوایی ئەوانە، چونكە بە ویستی خۆیان نەبووەو لەسەریان پێویستكراوە، یان ئەو جندانە كافر بوون و بە دیل گیراون و، وەك سزادانێك سولەیمان كارو بێگاری پێ كردوون، بۆیە ئەوان، ئەو كارو بێگارەیان بە سزایەكی ڕیسواكەرو زەبوونكەر داناوە، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: جند بۆیان دەركەوت، كە ئەگەر پەنهانیان زانیبایە، ئەو ماوەیە كە بەسەر مردنی سولەیماندا تێپەڕیوە، لەو كارو بێگارە، كە ئازارێكی ڕیسواكەر بووە، لەوەدا نەدەمانەوە، ئایا چەندی پێچوە؟ دوایی باسی دەكەین كە لەو بارەوە ڕای زانایان جیاوازو جۆراو جۆرە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**باسی ژمارەیەك لەو چاکەو نیعمەتانەی خوای بەخشەر، بە داوود پێغەمبەر ﷺ ی داون، وەك بەخششێکی تایبەتیی خۆی، وەك: زیکری خوا لەگەڵدا گوتنەوەی چیایەکان و، باڵندان و، نەرمکرانی ئاسن و، دروستکردنی زرێیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە: لە حەوت بڕگەدا:

**١)- ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا﴾، بە دڵنیایی ئێمە لە لایەن خۆمانەوە، بەخششێکمان بە داوود ﷺ دابوو، بەخششێکی تایبەت و ناوازە، کە دەفەرموێ: ﴿مِنَّا﴾، ئەمە: (تَشْرِيفٌ للفَضْلِ) بەڕێزکردنی ئەو بەخششەیە، کە خوا ﷻ بە داوودی داوەو، پێشتر گوتیشمان: (فَضْل): بریتیە لە هەر بەخششێك، کە بابای بەخشەر پابەند نەبێ بیبەخشێ.**

**ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی ڕوونکردنەوەی ئەو بەخششەی بە داوودی ﷺ داوە:**

**٢)- ﴿يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ﴾، (گوتمان) ئەی چیایەکان، لەگەڵیدا بڵێنەوەو باڵندەکانیش، ئەمە (مَقُولُ قَوْلٍ مَحْذُوفٍ)، گوتراوی قسەیەکی قرتێنراوە، یانی: (قُلْنَا)، گوتمان: ئەی چیایەکان! لەگەڵی بڵێنەوە، چی لەگەڵ بڵێنەوە؟ ئەو زیکرە، ئەو خوا بە پاکگرتن و ستایشکردنەی خوا کە داوود دەیڵێ، ئێوەش لەگەڵیدا بڵێنەوە، ﴿وَٱلطَّيْرَ﴾، هەندێك قورئانخوێن خوێندوویانەتەوە: (وَالطَّيْرُ)، (يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرُ)، واتە:**

با دراوەتەوە سەر بانگکراو (مُنادی) یانی: (يَا طَيْرُ أَوِّبِي مَعَهُ)، ئەی باڵندەکان! ئێوەش لەگەڵی بڵێنەوە، زۆربەش خوێندوویانەتەوە: (والطيرَ) ﴿ يَٰجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ﴾، یانی: (وَسَخَّرْنَا لَهُ الطَّيْرَ)، واتە: باڵندەکانیشمان بۆ دەستەمۆ کرد بوون، لێرەدا کە دەفەرمویّ: ﴿ أَوِّبِي مَعَهُۥ ﴾، لەگەڵیدا بڵێنەوە، ئەم فەرمانە، بۆ دروستکردن (تکوین) ە، نە بۆ یاسادانان (تشریع)، واتە: چیایەکان فەرمانێکی تەکوینییمان پێکردبوون، چونکە فەرمانی تەشریعیی ئاڕاستەی خاوەن عەقڵ و شعوورو ئیرادەکان دەکریّ، هەروەها هی باڵندەکانیش هەر فەرمانێکی (تكويني) یان پێکراوە، کە لەگەڵ داوود دا ئەو یادی خوایە، کە دەیکات، دووبارەی بکەنەوەو بیڵێنەوە، (التَّأْوِيْب: تَرْجِيْعُ الصَّوْتِ، وَقِيْلَ التَّأْوِيْبُ: التَّسْبِيْحُ بِلُغَةِ الحَبَشَةِ)، (تَأْوِيْب) بە مانای گێڕانەوەی دەنگە، یانی: داوود ﷺ شتێکی دەگوت، چیایەکانیش لە لەگەڵیدا دەیانگوتەوە، هەروەها داوود ﷺ شتێکی دەگوت، لە یادو زیکری خوا، باڵندەکانیش لەگەڵیان دەگوتەوە، هەندێکی دیکەش گوتوویانە: وشەی (تَأْوِيْب) بە مانای خوا بەپاکگرتنە، بەڵام بە زمانی حەبەشەیی.

٣)- ﴿ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴾، ئاسنیشمان بۆ نەرمکرد بوو، بەدڵنیایی لێرەدا مەبەست لە نەرمکردنی ئاسن، وەك دواییش باسی دەکەین، نەرمکرانێکی نائاساییە، چونکە نەرمکردنی ئاسایی، هەموو کەس ئێستا دەزانێ کە ئاسن لە کوورەدا نەرم دەکریّ، تەنانەت ئاسنگەرێکی ئاساییش دەزانێ، چ جای لەو کارگە گەورانەدا، کە ئاسنیان تێدا دەتوێنرێتەوەو، کەل و پەلی لە ئاسن و پۆڵایان تێدا دروست دەکریّ، مادام مرۆڤ بەوە گەیشتوە، ئەوە لە چوارچێوەی موعجیزەدا نیە، ئەو شتانە لە چوارچێوەی موعجیزەدان، کە مرۆڤ بە یاسا گەردوونییەکان پێیان نەگات.

٤)- ﴿ أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ ﴾، [هەروەها بە داوودمان گوت:] زرێیە داپۆشەرەکان، دروست بکە، (سَابِغَات: صِفَةٌ لِمَوْصُوفٍ مَحْذُوفٍ، لِظُهُوْرِه، إِذْ شَاعَ وَصْفُ الدُّرُوعِ بِالسَّابِغَاتِ وَالسَّوَابِغ: وَهِيَ الكَوَامِل).

(سَابِغَات): سیفەتە بۆ وەسفکراوێك کە فڕێندراوە، لەبەر ئەوەی ئاشکرایە، چونکە شتێکی باوە کە زرێیەکان بە (السَّابِغَات وَالسَّوَابِغ) وەسف دەکرێن،

(دِرْعٌ سَابِغَة) واتـە: زرێیـەك كـە هەمـوو جەسـتەی مـرۆڤ دادەپۆشـێ، یـان (الدُّرُوعُ السَّابِغَات)، واتـە: ئـەو زرێیانـەی هەمـوو جەسـتە جەنـگاوەرەكان دادەپۆشـن، یـانی: تێـرو تـەواو، پێشـتر زرێ بـەو جـۆرە نەبـووە، كـە بچـنرێ، ئـەوە لـە سـەردەمی داوود دا ﷺ و بـە دەسـتی داوود ئـەو جـۆرە زرێ دروسـتكردنە، داهێـنراوە، ئەویـش بـە وەحیـی خـوای پـەروەردگارو بـە ئیلهامـی خـوا.

٥)- ﴿وَقَدِّرۡ فِي ٱلسَّرۡدِ﴾، (پێـمان گـوت كـە) لـە چنینـدا ئەندازەگیریـی ڕەچـاو بكـە، ﴿وَقَدِّرۡ﴾: (قَدِّر: إجْعَلْهُ عَلَى تَقْدِيْرٍ، وَهُوَ جَعَلَ الشَّيْء عَلَى مِقْدَارٍ مَخْصُوص)، ئەندازەگیریـی و وردەكاریـی بكـە، واتـە: بـا بزمـارەكان و ئاڵقـەو قوڵفـەكان بـە ئەنـدازەی یەكـدی بـن، بزمارەكـە گەورەتـر نەبـێ، قوڵفەكـە بقڵیشـێنێ و، گچكەتریش نەبـێ، كـە تێیـدا شـل بێـت و بجووڵـێ.

وشـەی: ﴿ٱلسَّرۡدِ﴾، پێشـتریش باسـمان كـرد، یانـی: (صُنْعُ دِرْعِ الحَدِيْـد)، (ٱلسَّرۡدِ) یانـی: چنیـن، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی چنینی زرێیـە، كـە ئاڵقەكانـی و بزمارەكانی ناسـنن، (أي: تَرْكِيْـبُ حِلَقِهـا ومَسَـامِيرِهَا) واتـە: بزمـارەكان و ئەڵقەكانـی بخرێنـە نێـو یەك.

٦)- ﴿وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًا﴾، كردەوەی باشیش بكەن (ئەی داوودو نیزیكانی داوود!) كە دەفەرموێ: ﴿وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًا﴾، كەواتە: سوپاسگوزاریی خوا، بە ئەنجامدانی كردەوەی باش دەكرێ، شوكر شتێك نیە بە قسە بگوترێ، بەڵكو شتێكە بە كردەوە ئەنجام دەدرێ، چونكە شوكر، واتە: بەكارهێنانی چاكەكانی خوا، لە ڕەزامەندیی خوادا، بەكارهێنانیش حاڵەتێكی كردەیی و جەستەییە.

٧)- ﴿إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾، بێگومان من بینەری ئەوەم ئێوە دەیكەن، دەزانم چی دەكەن و چۆن دەكەن؟ ئەمە هەم هۆشداریی پێدانەو، وریا كردنەوەو ترساندنە، بزانن چی دەكەن! چونكە من بینەرتانم، هاوكاتیش هاندان و تیژكردنە، واتە: خوا كردەوەكەتان دەبینێ، كەواتە: ئازابن لە كردەوەی باش، چونكە خوا بینەری كردەوەكەتانە.

لە بارەی چۆنیەتیی پێکەوە پەیوەستبوونی ئەم ئایەتانەوە، کە خوای تێیاندا باسی نیعمەتەکانی دەکات، کە بە داوودو سولەیمانی کوڕی داون، زانایان چەند شتێکیان گوتوە، دووانیانم بەدڵترن:

**یەکەم:** (ابْنُ عَطِيَّة)، دەڵێ: خوا ﷻ چاکەی خۆی لەسەر داوودو سولەیمان باس دەکات، بۆ بەڵگەهێنانەوە بۆ ئەوەی بە موحەممەد ﷺ بەخشراوە، واتە: ئەوە بە دوور مەزانن، کە موحەممەد ﷺ، خوا ﷻ بیکاتە پێغەمبەری خۆی و وەحیی بۆ بنێرێ و، قورئانی بۆ بنێرێ و، ئەو پلەو پایە بەرزەی پێ ببەخشێ و، بیکاتە کۆتایی و سەروەری پێغەمبەران، ئەوە بە دوور مەزانن، چونکە بەخشینی ئێمە بە بەندەکانمان و، چاکەکاریی ئێمە لەگەڵ بەندەکانمان دا، عادەتێکی لە مێژینەی ئێمەیە، ئەوەتا بۆ وێنە: داوودو سولەیمانیش (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کە هەم پێغەمبەر بوون و، هەم حوکمڕانیش بوون، چاکەو نیعمەتی زۆرو جۆراوجۆری خوایان بەسەرەوە بوون.

**دووەم:** (الزَّمَخْشَري) بە جۆرێکی دیکە ئەم ئایەتانە پەیوەست دەکات، بە ئایەتەکانی پێشەوە، ئەو دەڵێ: لە کۆتایی ئایەتەکانی پێشێ دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾، لەوەدا نیشانەیەکی مەزن و تایبەت هەیە، بۆ هەر بەندەیەکی گەڕاوە بۆ لای خوا.

دەڵێ: بابای گەڕاوە بۆ لای خوا، بێگومان هەرگیز خاڵیی نابێ لە سەرنجدانی نیشانەکانی خواو، ئەوە کە خوا ﷻ لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، وەك: زیندووکردنەوەو، سزادانی ئەوانەی بێبڕوان، بۆیە خوا ﷻ بەو بۆنەوە باسی داوودو سولیمانی کردوە، کە ئەوەتا خوا ﷻ ئەها چەند نیشانەو بەڵگەی بە داوودو سولەیمانی کوڕیشی داون، هەروەها دواتریش باسی مردنی سولەیمان دەکات، کە جند هیچیان لێ نەزانیوە، کەواتە: ئادیارو پەنهانیش تەنیا لە لای خوایە ﷻ.

ئنجا لەو ڕووەوە کە داوودو سولەیمان ناودارترین کەس بوون، کە لە ناخەوە بۆ لای خوا گەڕاونەوە، کە خوا ﷻ بەوجۆرە باسی داوود دەکات: ﴿فَٱسۡتَغۡفَرَ

رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ﴿٢٤﴾ ﴾ص، هەروەها باسی سولەیمانیش دەكات: ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ ﴾ص، (أَوَّابٌ) یانی: (رجّاع) زۆر گەڕاوە، كەواتە: هەم داوودو هەم سولیمانیش (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، ئەو باب و كوڕە بەڕێزە، كە هەم پێغەمبەریش بوون و هەم حوكمڕانیش بوون، ئەوانیش زۆر بۆ لای خوای بە بەزەیی گەڕاونەوە، ئنجا دوای ئەوەی خوای میهرەبان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴾، دوو لە بەندە زۆر گەڕاوەكانی خۆی وەك نموونە دێنێتەوە، بۆ بەڵگە لەسەر ئەوە كە دوو لە بەندەكانی لەگەڵ ئەوەدا كە حوكمڕانیش بوون، بەڵام ئەو سیفەتی گەڕانەوە بۆ لای خوایان، لە خۆیان دا بەجەستە كردوە.

**مەسەلەی دووەم:**

**باسی ژمارەیەك لەو چاكەو نیعمەتانەی خوای بەخشەر بە سولەیمانی ﷺ بەخشیبوون، وەك: ڕامكرانی باو، هەڵقوڵینی كانیی مس و، دەستەمۆ بوونی جندو، دروستكردنی پێداویستییە جۆراو جۆرەكان بۆ سولەیمان و، دەرك نەكردنی جند بە مردنی سولەیمان، تاكو مۆرانە گۆچانەكەی خواردووەو سولەیمان ﷺ كەوتووە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە: لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ ﴾، هەروەها (با)مان بۆ سولەیمان دەستەمۆ كردبوو، (و) بۆ بادانەوەیەو، ئەم ڕستەیە دەگێڕێتەوە بۆ ڕستەی: ﴿ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴾، ئاسنمان بۆ داوود ﷺ نەرمكرد بوو، ﴿ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ ﴾، یانی: بۆ سولەیمانیش ﷺ (با)مان دەستەمۆو ملكەچ كرد بوو، (أي: وَسَخَّرْنَا لِسُلَيْمَانَ الرِّيْحَ)، (الرِّيْحَ) خوێندراویشەتەوە: (الرِّيَاح) بایەكان، (رِيح) با، (رِيَاح) بایەكان.

٢)- ﴿ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ﴾، ڕۆیشتنی دەمەو بەیانیانی، مانگە ڕێیەك بوو و، ڕۆیشتنی دوانیوەڕۆیانیشی، مانگە ڕێیەك، وشەی (غُدُوّ) لە (غَدَاة)ەوە، هاتوە، دەڵێ: (غَدَا: أَي ذَهَبَ، رَاحَ: رَجَعَ)، (غدا) ڕۆیی، (راح) گەڕایەوە.

یاخود مەبەست ئەوەیە: (تُوصِلُهُ الرِّيحُ فِي الغَدَاةِ مَسَافَةَ شَهْرٍ، وَتُرْجِعُهُ فِي العَشِيِّ مَسَافَةَ شَهْرٍ)، با، دەمەو بەیان، مانگە ڕێیەکی بۆ دەبڕی و، ئێوارەش ماوەی مانگە ڕێیەك دەیگەڕاندەوە، ئێمە دوایی چەند سەرنجێك لە بارەوە دەخەینە ڕوو.

٣)- ﴿ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ﴾، سەرچاوەی کانیی مسیشمان بۆ دەرقوڵاند بوو، بۆمان ڕژاند بوو، (الإِسَالَةُ: جَعَلُ الشَّيءِ سَائِلاً، أَي: مُنْبَطِحَاً فِي الأَرْضِ)، (إِسَالَة) بریتیە لەوە شتێك بڕژێنرێ، یانی: بە زەویدا بڵاوبێتەوە.

٤)- ﴿ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ﴾، لە جندەکانیش هی وا هەبوون کە لەبەر دەستیدا کاریان دەکرد، بەمۆڵەتی پەروەردگاری (يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ: يَخْدِمُهُ وَيُطِيعُهُ، يُقَالُ: أَنَا بَيْنَ يَدَيْكَ: مُطِيعٌ)، واتە: لەبەر دەستی بوون و خزمەتیان دەکردو، ئەو کارانەی دەیویست ئەنجامیان دەدان، وەك عەرەب دەڵێن: (أَنَا بَيْنَ يَدَيْكَ: مُطِيعٌ) واتە: من لە بەردەستت دام، بۆت ملکەچم.

﴿ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ﴾، ئەوە کە هەندێ لە جند، کاریان لە بەر دەستی سولەیمان دەکرد، بە مۆڵەتی پەروەردگاری، بوو، خوا وایکرد بوو جندەکان بە قسەی سولەیمان بکەن و فەرمانبەریی بکەن.

٥)- ﴿ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴾، هەر کامێك لەو جندانە لە فەرمانی ئێمە لایدابایە، لە سزای ئاگری بڵێسەدارمان پێ دەچێژت، (يَزِغ: يَزِلُّ وَيَعْدِلُ)، لایدابایەو، سەرپێچیی کردبایە، لە فەرمانی ئێمە، یانی: فەرمانمان کرد بوو کە بە قسەی سولەیمان بکەن، ئنجا هەر کامێك لەوانە خۆی بواردبووایەو فەرمانەکەی جێبەجێ نەکردبایە، لە سزای ئاگری بڵێسەدارمان پێ دەچێژت، ئەمە وەك پێشتریش گوتمان: دەکرێ مەبەست پێی دنیا بێ، واتە: لە دنیادا بە ئاگرێ، بە کڵپەیەك سزامان دەدا، کە وەك کڵپەی ئاگری دۆزەخە، یاخود مەبەست پێی سزای دواڕۆژە، واتە: لە دواڕۆژدا سزامان بۆ داناوە، هەر کەسێك کە لە فەرمانی سولەیمان لابدات، سزای ئاگری بڵێسەدارمان بۆ داناوە.

ئنجا باسی کارەکانی کە جند بۆ سولەیمانیان ئەنجام دەدا، دەکات:

٦)- ﴿ يَعۡمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ ﴾، هەرچی ویستبای بۆیان دەکرد، یانی: هەرچی ویستبای لە دروستکراوەکان، بۆیان دروست دەکرد، ئنجا هەندێکیان بە نموونە دێنێتەوە:

٧)- ﴿مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٖ كَٱلۡجَوَابِ وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍ ﴾، لە میحرابەکان و، پەیکەرەکان و، دەفرەکانی وێنەی حەوزان و، مەنجەڵە چەسپاوەکان.

١- ﴿ مَّحَٰرِيبَ ﴾، کۆی (مِحراب)ە، ئەمە ڕوونکردنەوەی ڕستەی پێشێیە، کە دەفەرموێ: ﴿ يَعۡمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ ﴾، ئەوەی دەیویست، بۆیان دەکرد، چی بوو؟ ﴿مِن مَّحَٰرِيبَ ﴾، لە میحرابەکان، (مِحْرَاب): هەم بە مانای قەڵا دێ، هەم بە مانای کۆشك دێ، هەم بە مانای پەرستگا دێ، هەم بە مانای ژوورێکی گچکە دێ، بۆ خواپەرستیی، واتە: میحراب، چوار واتای هەن، بەڵام ئەوەی ئێستا لە مزگەوتان دا پێدەگوترێ: میحراب، بە تەئکید مەبەست ئەوە نیە، بەڵکو ئەوە دوایی داهێنراوەو، وا پێدەچێ لە سەدەی دووەمی کۆچییەوە، ئەو شوێنەی کە ئیمام لێی دەوەستێ، چالاییەکیان تێدا دروستکردوە، بۆ ئەوەی ڕیزێك بۆ نوێژکارەکان بگەڕێتەوە، ئەوە شتێکی تازەیە، بەڵام لە ئەصڵی زماندا، میحراب بە یەکێك لەو چوار شتانە گوتراوە: ١- قەڵا، ٢- کۆشك، ٣- پەرستگا، ٤- ژوورێکی گچکە بۆ خوا پەرستیی.

٢- ﴿ وَتَمَٰثِيلَ ﴾، کۆی (تِمْثَال)ە، ئەویش دوو واتایان بۆ داناون:

یەکەم: (صُوَرٌ غَيْرُ مُجَسَّمَةٍ)، وێنەکان کە پەیکەردار نەبن، واتە: نەخش و نیگارو وێنە، لەسەر دیوار، یان لەسەر لەوحێك.

دووەم: (تِمثال، أي: هَيْكَلٍ مُجَسَّم)، مەبەست پێی پەیکەرێکی بەرجەستەیە.

٣- ﴿ وَجِفَانٖ كَٱلۡجَوَابِ ﴾، ﴿ وَجِفَانٖ ﴾، کۆی (جَفْنَة)یە، (الجَفْنَة: القَصْعَةُ الكَبِيْرَة يُؤْكَلُ فِيْهَا الطَّعَامُ)، (جَفنة) دەفری گەورە، قاپی گەورە کە خواردنی تێدا خوراوە، (جَوابٌ)یش کۆی (جَابِيَة)یە، کە ئەویش حەوزو گۆلێکی گەورەیە، ئاوی تێدا کۆ دەکرێتەوە، ئەو قاپ و دەفرانە، کە خواردنیان تێدا خوراوە، هێندەی حەوزان بوون.

٤- ﴿ وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍ ﴾، ئەمە شتی چوارەمە کە جندەکان بۆ سولەیمانیان دروستکردوون، (قدور) کۆی (قِدرْ)ە، واتە: مەنجەڵ و، قابلەمەی گەورە، ﴿ رَّاسِيَٰتٍ ﴾، یانی: (ثَابِتَات)، چونکە نەجووڵێنراون و، زۆر گەورە بوون.

٨)- ﴿ ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ ﴾، (گوتمان:) ئەی نیزیکانی داوود! سوپاسگوزاریی بکەن. ئەمە: (مَقُولُ قَوْلٍ مَحْذُوفٍ)، گوتراوی قسەیەکی فڕتێنراوە، یانی: (قُلْنَا) گوتمان: ئەی نیزیکانی داوود! شوێنکەوتوانی داوود! کە سولەیمان لە ئالی داوود بووەو، ئەوانی دیکەش، سوپاسگوزاریی ئەنجام بدەن، ئەمەش دوو واتایان بۆ داناون:

أ- (أَي: اعْمَلُوا صَالِحَاً لأَجْلِ الشُّكْرِ)، کردەوەی باش بکەن، وەك سوپاسگوزاریی ئەنجام دان بۆ خوا.

ب- واتایەکی دیکەی: (اعْمَلُوا شُكْرَاً)، واتە: سوپاسگوزاریی بکەن، ئەنجام بدەن.

٩)- ﴿ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴾، کەمێکیش لە بەندەکانم شوکرانە بژێرن.

١٠)- ﴿ فَلَمَّا قَضَيۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَوۡتَ ﴾، کاتێ مردنمان بەسەردا بڕیاردا، (الطَّبَرِي) دەڵێ: (فَلَمَّا أَمْضَيْنَا قَضَاءَنَا عَلَى سُلَيْمَان بِالمَوْتِ، فَمَاتَ)، کاتێ بڕیاری خۆمان بەسەر سولەیماندا چەسپاند، کە بمرێ و، مردیش.

١١)- ﴿ مَا دَلَّهُمۡ عَلَىٰ مَوۡتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلۡأَرۡضِ ﴾، هیچ شتێك مردنەکەی پێشان نەدان، جگە لە زیندەوەری زەویی، (الدَّلَالَةُ: الإِشْعَارُ بِأَمْرٍ خَفِي)، (دلالة) ئەوەیە کە شتێکی پەنهان، کەسێکی لێ ئاگادار بکرێتەوە، یانی: هیچ شتێك مردنی سولەیمانی پێشان نەدان.

﴿ دَآبَّةُ ٱلۡأَرۡضِ ﴾، (أَرَضَة) و (سُرْفَة)ی پێ دەڵێن، بە کوردیی دەڵێن: (مۆرانە) شتێکە دارو تەختە بنکۆڵ دەکات و، کرمۆڵی دەکات، شیی دەکاتەوە لە نێوێدا.

١٢)- ﴿ تَأۡكُلُ مِنسَأَتَهُۥۖ ﴾، گۆچانەکەی دەخوارد، (مِنْسَأَة)، یان (مَنْسَأَة) هەردووکیان هاتوون، واتە: گۆچان، هەندێکیش دەڵێن: گۆچانی گەورە (العَصَا الغَلِيْظَة) گۆچانی پتەوو قایم.

١٣)- ﴿فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلۡجِنُّ﴾، کاتێك (سولەیمان) کەوت جند زانییان و بۆیان دەرکەوت، واتە: گۆچانەکە کە لە نێویدا شیی ببووەوەو پووچەڵ بوو بوو، شکا، سولەیمانیش کە خۆی دابووە سەری، کەوت.

﴿تَبَيَّنَتِ ٱلۡجِنُّ﴾، خوێنراویشەتەوە: (تُبُيِّنَتِ الجِنُّ)، بۆ جند ڕوون بووەوە، جند بۆیان دەرکەوت.

١٤)- ﴿أَن لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٱلۡغَيۡبَ مَا لَبِثُواْ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلۡمُهِينِ﴾، کە ئەگەر پەنهانیان زانیبایە، لە ئازاری ڕیسواکەردا نەدەمانەوە، ئازاری ڕیسواکەر، ئەوە بوو کە داوود ئەوانەی بێبڕوا بوون لە جند، سۆخرەو بێگاری پێ کردوون، بۆیە بۆ ئەوان ئازارێکی ڕیسواکەر بووە.

## کورتە باسێک:

## دە (١٠) کورتە سەرنج لە بارەی چاکەکانی خواوە لە سەر داوود و سولەیمان (علیهما السلام)

### أ- سێ کورتە سەرنج لە بارەی داوود ﷺ و نیعمەتەکانی خواوە لە سەری:

١- مەبەست لە گێڕانەوەی چیایەکان و باڵندەکان بۆ داوود ﷺ ﴿يَٰجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ﴾ بە دڵنیاییی دەنگدانەوەی سرووشتیی نیە، کە هەندێ لە زانایان وایان گوتوە، وەک کاتی خۆی لە تەفسیری سووڕەتی (الأنبیاء)دا، باسمان کرد، چونکە ئەوە (دەنگدانەوەی ئاسایی و سرووشتیی) موعجیزەو نیشانەیەکی تایبەت نیەو، هیچ بەخششێك نیە، چونکە خوا ﷻ ئەوەی بە هەمووان داوە، شوانێکیش لە چیایەکان هاوار بکات، یان لە ئەشکەوتێکدا، دەنگ دەداتەوە، کەواتە: نا، بە تەئکید مەبەست پێی دەنگانەوە نیە، بەڵکو مەبەست پێی دووبارە کردنەوەی ئەو یادو زیکرو ستایشەیە، کە داوود ﷺ گوتوویەتی، چیایەکانیش گوتوویانەتەوە، نەك هەر دەنگ بدەنەوە، هەروەها باڵندەکانیش لەگەڵیاندا گوتۆتەوە.

٢- ئەرمکرانی ئاسن بۆ داوود ﷺ کە دەفەرموێ: ﴿وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ﴾، ئەویش هەندێ لە زانایان، بۆ وێنە: (محمد الطاهر بن عاشور) و هەندێکی دیکەش گوتوویانە: مەبەست ئەوە بووە کە خوا ﷻ داوودی فێرکردوە بە هۆی ئاگرەوە، بە هۆی کوورەوە، ئاسن ئەرم بکات و شتی لێ دروست بکات! بەڵام وەك پێشتریش گوتمان، ئەوە حاڵەتێکی تایبەت نیە بە پێغەمبەر داوودەوە ﷺ، مرۆڤەکان بە عەقڵ و زانستیی خۆیان بەگشتیی بەو شتانە دەگەن و، ئەوە یاسایەکی گەردوونییەو هەر کەسێ بیدۆزێتەوە،

لێی بەهرەمەند دەبێ، بەڵام ئەو شتانەی بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دراون، لە سەرووی ئەو یاسا گەردوونییانەوە بوون، ئەوانیش بێگومان خوا ﷻ بە پێی چەند یاسایەك ئەو شتانەی بۆ کردوون، بۆ وێنە: کە دەریای سوور بۆ مووسا ﷺو بەنوو ئیسرائیل شەق دەبێ و پێیدا تێپەڕ دەبن، هەروەها: ئاگر بۆ ئیبراهیم ﷺ سارد دەبێتەوە، هەروەها کە لێرەدا ئاسن بۆ داوود ﷺ نەرم بووە، ئەمە شتێکی نائاسایی بووە، نەك بە پێی یاسا گەردوونییەکان بێ و زانست پێی بگات، کە ئێستا پێی گەیشتوەو، ڕەنگە هەر ئەو کاتەش بە پێی زانست، خەڵك هەر زانیبێتی لە کوورەدا ئاسن نەرم و گەرم بکات و، دوایی ئەوەی دەیەوێ، لێی دروست بکات.

٣- وا پێدەچێ داوود ﷺ داهێنەری زرێی ئاڵقەیی بووبێ و، پێشتر زرێیەکان زرێی پارچە ئاسن و یەك تەختە بوون، کە بەدڵنیایی جووڵەی بابای جەنگاوەر لە زرێیەکدا، کە تەختە ئاسن بێ، بە زەحمەتترە، وەك لە هی ئاڵقەیی دا، کە لەبەر دەکرێ و دەپۆشرێ، بەڵام خوا ﷻ بە وەحیی و ئیلهام داوود ﷺی فێری دروستکردنی ئەو جۆرە زرێیانە کردوە.

## ب- حەوت کورتە سەرنج لە بارەی سولەیمان ﷺو، ئەو موعجیزەو چاکەو نیعمەتانەوە، کە خوا ﷻ پێیدابوون:

١- کاتێك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ ﴾، یان (وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيَاحَ)، بە هەردوو خوێندنەوەکە هاتون، ﴿ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ﴾، واتە: بەیانیان مانگە ڕێیەك دەڕۆیی و، ئێوارانیش مانگە ڕێیەك، یاخود بۆ دەرچوون بۆ شوێنێك بەیانییەکەی، مانگە ڕێیەکی دەبڕی و، بۆ گەڕانەوەش لەو شوێنە، ئێوارەکەی مانگە ڕێیەکی دەبڕی، واتە: لە ماوەی نیوەڕۆ تاکو ئێوارە، لەو بارەوە زانایان زۆریان قسە کردوە، هەڵبەتە ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (الأنبياء)دا، لەو بارەوە درێژتر دواوین، بەڵام لێرەدا ویستم قسەی دوو لە زانایان بێنم:

أ- (محمد الطاهر بن عاشور)، لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] دەڵێ: (رِيَاحٌ مَوْسِمِيَّةٌ تَهُبُّ شَهْرًا مُشَرِّقَةً لِتَذْهَبَ فِي ذَلِكَ الْمَوْسِمِ سُفُنُهُ، وَتَهُبُّ شَهْرًا مُغَرِّبَةً، لِتَرْجِعَ سُفُنُهُ إِلَى شَوَاطِيءِ فِلَسْطِينَ)،

دەڵـێ: کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: بایەکانمـان بـۆ سـولەیمان دەسـتەمۆ کـرد بـوون، ئەوانـە بـای کەشـیی بـوون، (واتـە: ئـەو بایانـەی کـە هاوینـان هەڵدەکـەن، یـان زسـتانان و، یـان بەهـاران، یـان پایـزان، لـە کاتـی دیاریکـراودا)، بـۆ مـاوەی مانگێـك ئـەو بایـە هەڵیدەکـرد، بـەرەو ڕۆژهـەڵات، تاکـو کەشـتییەکانی بـڕۆن، (واتـە: ئـەو بایـە، کـە ئـەو کات کەشتیی چارۆکـەدار هەبـوون، یارمەتیـی ڕۆیشتنی کەشـتییەکانی داوە، کـە بـەرەو ڕۆژهـەڵات ڕۆیشـتوون)، لـەو سەریشـەوە مانگێکـی دیکـە، ئـەو بایـە هەڵیدەکـرد بـۆ مـاوەی مانگێـك، بـۆ ئـەوەی بـەرەو ڕۆژئـاوە کەشـتییەکان بگەڕێنەوە، بـۆ کەنارەکانـی فەڵەسـتین، واتـە: دەریـای سـپیی نێوەڕاسـت.

ئـەو ئـاوای هێنـاوە، بـەڵام ئـەم قسـەیە، تێبینییەکـی زۆر گـەورە هەڵدەگـرێ، چونکـە ئەگـەر خـوای کاربەجـێ بـای ڕەخسـاندبێ بـۆ ڕۆیاندنـی کەشـتییەکان، ئـەو بایـە تایبـەت نەبـووە بـە کەشـتییەکانی سـولەیمانەوە، ئـەو بایـە خەڵکـی دیکـەش لێـی بەهرەمەنـد بـووە، بـەڵام لێـرەدا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ ﴾، بـۆ سـولەیمان بـە تایبـەت، بامـان بـۆ ڕەخسـاند بـوو!

پێـم وایـە جـار جـار (محمـد الطاهـر بـن عاشـور)، هەروەهـا هەنـدێ لـە توێژەرەوانـی دیکـەش، دەیانـەوێ جـۆرێ لـە خـۆ دوورگرتـن، خـۆ دوور بگـرن لـەوە، کـە موعجیـزەکانی پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، وەك یاسـا دڕ، کـە لـە یاسـا گەردوونییـەکان بـە دەر بـن، تەفسـیر بکـەن، بـەڵام ئـەوە - کـە (شـیخ محمـد عبـدە) ش کاتـی خـۆی ئـەو ڕێـڕەوەی هەبـووە - بـە تەئکیـد ئـەوە هەڵەیەکـی کوشـندەو گەورەیـە، چونکـە موعجیـزەی پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، ناکـرێ بـە یاسـا گەردوونییـە بـاوەکان، کـە ئێمـە دەیانزانیـن و خەڵکـی دیکـەش دەتوانـن لێیـان بەهرەمەنـد بـن، ناگونجـێ بـەوان تەفسـیر بکرێـن.

---

(١ ) التحرير والتنوير، ج٢٢، ص١٥٨.

ب- (الطبري)، بەمجۆرە ئەو ئایەتە موبارەکە، تەفسیر دەكات: ﴿ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ﴾، دەڵێ: (غُدُوُّهَا إِلَى انْتِصَافِ النَّهَارِ مَسِيرَةُ شَهْرٍ، وَرَوَاحُهَا مِنَ انْتِصَافِ النَّهَارِ إِلَى اللَّيْلِ مَسِيرَةُ شَهْرٍ)، ﴿ غُدُوُّهَا ﴾، واتە: لە بەیانییەوە تاکو ڕۆژ بە نیوە دەبێ، ماوەی مانگە ڕێیەك، ئەو بایە ئەو ڕێیەی دەبڕی و، گەڕانەوەشی دیسان لە نیوەڕۆوە تاکو ئێوارە مانگە ڕێیەکی دەبڕی.

(القرطبي) دەڵێ: حەسەنی بەصرایی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، گوتوویەتی: (قَالَ الْحَسَنُ: كَانَ يَغْدُو مِنْ دِمَشْقَ فَيَقِيلُ بِإِصْطَخْرَ، ثُمَّ يَرُوحُ مِنْ اصْطَخْرَ فَيَبِيتُ بِكَابُلَ، وَبَيْنَهُمَا مَسِيرَةُ شَهْرٍ لِلْمُسْرِعِ).

حەسەنی بەصرایی گوتوویەتی: بەیانییان زوو لە دیمەشقەوە دەردەچوو، لە (اصْطَخْرَ) - کە شارێکە لە ئێران - لەوێ سەرخەوێکیان دەشکاند [ئیسراحەتی نیوەڕۆیان دەکرد] و، دوایی لە (اصْطَخْرَ)ەوە، دەڕۆیشت، [واتە: دەمەو دوای نیوەڕۆ،]و شەو لە کابوڵ دەمایەوەو، لە نێوان (اصْطَخْرَ)و کابوڵیشدا، مانگە ڕێیەکە بۆ کەسێك کە زۆر بە خێرایی بڕوات.

لە ڕاستییدا ئەمە زیاتر لەگەڵ ڕواڵەتی ئایەتەکەدا دەگونجێ و، ئەوەش موعجیزەیەك بووە بۆ سولەیمان ﷺ، بەڵام ئەوە کە با هەڵبکات کەشتیی چارۆگەدار بەرێ و بێنێتەوە، ئەوە تایبەت نەبووە بە سولەیمانەوەو، خەڵکی دیکەش لەوە بەهرەمەند بووەو دەبێ و، ئەو بایانەش هەر هەبوون، پێش سولەیمان و دوای سولەیمانیش ﷺ.

هەڵبەتە ئێمە لە کاتی تەفسیری سوورەتی (الأنبیاء)دا باسی بەسەرهاتی داوودو سولەیمانمان کرد، زانایان دەڵێن: سولەیمان ﷺ، تەختێکی زۆر گەورەی هەبووە، خۆی و هەموو سوپاو هاوکارانی لەسەر ئەو تەختە دانیشتوون و با هاتوە، ئەو تەختەی هەڵگرتوەو، بردوویەتی بۆ ئەو شوێنەی مەبەستی بووە، کە وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: بە پێش نیوەڕۆیەك مانگە ڕێیەکی بڕیوەو، دوای نیوەڕۆیەکیش مانگە ڕێیەکی بڕیوە، ئەوەش مانای ڕواڵەتیی و گونجاوی ئایەتەکانە،

ئنجا ئایا ئەوە چۆن بووە؟ لە ڕاستیدا بەس خوا دەزانێ چۆنییەتەکەی چۆن بووەو، لە کتێبەکاندا بە وردیی باس نەکراوە، بەڵێ باسکراوە کە سولەیمان ﷺ تەختێکی زۆر گەورەی هەبووە، خۆی و سەربازەکانی هەموویان لە سەری ڕیز بوون، بەڵام ئێمە وردەکارییەکەی نازانین.

٢- دەربارەی ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ ﴾، ئەوەی کە ویستبای بۆیان دروست دەکرد، لە میحرابەکان و لە پەیکەرەکان، (القرطبي) گوتوویەتی: (وَذُكِرَ أَنَّهَا صُوَرُ الأَنْبِيَاءِ وَالْعُلَمَاءِ، وَكَانَتْ تُصَوَّرُ فِي الْمَسَاجِدِ لِيَرَاهَا النَّاسُ، فَيَزْدَادُوا عِبَادَةً وَاجْتِهَادًا)[1].

واتە: باسکراوە کە ئەو پەیکەرانەی جند بۆ سولەیمان ﷺ دروستیان کردوون، پەیکەرانی پێغەمبەران و زانایان بوون و لە مزگەوتەکاندا پەیکەرەکان دانراون، [یاخود: ئەگەر مەبەست پێی شتی بەرجەستە نەبێ، واتە: وێنەی پێغەمبەران و زانایان لە دیواری مزگەوتەکاندا کێشراوە] تاکو خەڵك بیانبینێ و، بە هۆی دیتنی وێنەی ئەوانەوە، خوا پەرستییان زیاد بێ و زیاتر خۆیان ماندوو بکەن [وەك ئەو پێغەمبەرو زانایانە بکەن، چۆن خوا پەرستییان کردوە].

ئنجا با چەند فەرموودەیەك بێنین، لە بارەی وێنە کێشان و پەیکەرتاشینەوە:

فەرموودەی یەکەم: [عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَ: لَمَّا اشْتَكَى النَّبِيُّ ﷺ، ذَكَرَ بَعْضُ نِسَائِهِ كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِأَرْضِ الْحَبَشَةِ، يُقَالُ لَهَا: مَارِيَةُ «وَكَانَتْ أُمُّ سَلَمَةَ وَأُمُّ حَبِيبَةَ أَتَتَا أَرْضَ الْحَبَشَةِ» فَذَكَرَتَا مِنْ حُسْنِهَا وَتَصَاوِيرَ فِيهَا، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، وَقَالَ: أُولَئِكَ إِذَا مَاتَ فِيهِمْ الرَّجُلُ الصَّالِحُ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِداً، ثُمَّ صَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، أُولَئِكَ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللهِ] (أخرجه البخاري ٤٢٧، ومسلم: ٥٢٨).

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر ﷺ نەخۆشکەوت، هەندێك لە هاوسەرەکانی باسی کەنیسەیەکیان کرد کە بینیبوویان

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن، ج١٤، ص٢١٩.

لـە حەبەشـە، پێـی دەگوتـرا: ماریـە، ئنجـا ئوممـو سـەلەمەو ئوممـو حەبیبـە کـە چووبوونـە خـاکی حەبەشـە، هاتـن بـاسی جوانیـی وێنەکانـی نێـو ئـەو کەنیسـەیان بـۆ کـرد، ئەویـش سـەری بـەرز کـردەوەو فەرمـووی: ئەوانـە عادەتیـان وابـوو، ئەگـەر پیاوێکـی چـاك لـە نێویانـدا وەفاتـی بکردایـە، لەسـەر گۆڕەکـەی مزگەوتێکیـان دروسـت دەکـردو، ئـەو وێنانەیـان لەسـەر دەکێشـان، یـان پەیکەریان لەسـەر دروسـت دەکـردن، ئەوانـە خراپتریـن کەسـن لـەلای خـوا.

**فەرمـوودەی دووەم:** پێغەمبـەر ﷺ لـە فەرمایشـتێکدا دەفەرمـوێ: **{إِنَّ مِـنْ أَشَـدِّ النَّـاسِ عَذَابًا يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ، الَّذِيـنَ يُشَـبِّهُونَ بِخَلْـقِ اللَّـهِ عَـزَّ وَجَـلَّ} (أخرجـه البخـاري: ٥٢٢٤، مسـلم: ٢١٠٧).**

واتـە: ئـەو کەسـانە کـە لـە ڕۆژی قیامەتـدا سـزایان لـە هەمـوو کـەس سـەختترە، ئەوانـەن کـە وەك دروسـتکراوی خـوا ﷻ شـت دروسـت دەکـەن، واتـە: دروسـتکراوی وا دروسـت دەکـەن، کـە وەك دروسـتکراوی خـوا بچـێ.

**فەرمـوودەی سـێیەم:** پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: **{إِنَّ أَصْحَابَ هَـٰذِهِ الصُّوَرِ، يُعَذَّبُونَ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ، وَيُقَـالُ لَهُـمْ: أَحْيُـوا مَـا خَلَقْتُـمْ}، (أخرجـه البخـاري: ٩٦١، مسـلم: ٢١٠٧).**

واتـە: بێگومـان خاوەنانـی ئـەم وێنانـە [ئنجـا پەیکـەرن، یـان وێنـەن] لـە ڕۆژی قیامەتـدا ئـازار دەدرێـن و پێیـان دەگوتـرێ: ئـەوەی دروسـتتان کـردوە، زینـدووی بکـەن.

واتە: ئەوەی دروستتان کردوە، ژیانی وەبەر بنێن، ڕووحی بخەنە بەر.

ئـەوە لـە بـارەی پەیکـەر دروسـت کـردن و وێنـە کێشـانەوە، بـەڵام زانایـان هـەر بەوەنـد لـێ نەگـەڕاون، کـە فەرمایشـتەکان ئـاوا بێنـن، بەڵکـو هەڵسـاون هەنـدێ فەرمایشـتی دیکـەش کـە لـەو بـارەوە هـەن و زانایـان قسـەیان لـێ کـردوون، هێناویانـن، بـۆ وێنـە: پێغەمبـەر ﷺ لـە درێـژەی فەرموودەیەکـدا کـە دەفەرمـوێ: وێنـە کێشـان و پەیکـەر تاشـین حەڕامـە، دوایـی دەفەرمـوێ: **{إِلَّا مَـا كَانَ رَقْـمًا فِي**

ثَوْبٍ} (أخرجه البخاري: ٥٩٥٨، مسلم: ٢١٠٦)، واتە: مەگەر وێنەیەك بێ، نەخش و نیگارێك بێ، لە پۆشاكێكدا.

کەواتە: ئەگەر وێنەیەك بێ، لە پۆشاكێكدا، لە کەل و پەلێكدا، ئەوە قەیدێ ناکات.

هەروەها دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: من پەردەیەکم لە ماڵێ گرتبۆوە ، پێغەمبەر ﷺ کە بەرەو ئەو پەردەیە نوێژی دەکرد، فەرمووی: {أَخِّرِيهِ عَنِّي، فَإِنِّي كُلَّمَا رَأَيْتُهُ ذَكَرْتُ الدُّنْيَا} (أخرجه البخاري: ٥٩٥٤، مسلم: ٢١٠٧)، واتە: ئەو پەردەیە کە وێنەی تێدا هەن، لێمی دووربخەوەو لایبدە، چونکە هەر کاتێك بینیم، دنیام دەکەوێتەوە یاد.

هەڵبەتە زانایان باسیان کردوە، دەڵێن: لە پەیکەرەکانیش ئەوە هەڵاوێردراوە، کە کچۆڵە یاریی پێ دەکەن واتە: بووکە شووشە.

هەروەها دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لە فەرمایشتێکدا هێناویەتی دەڵێ: پەردەیەکم هەڵواسیبوو وێنەی تێدا بوون (كَانَ فِيهِ تَصَاوِيرُ)، پێغەمبەریش ﷺ پێناخۆشبوو فەرمووی: لایبدە، بەڵام دوایی کردمە بەرگی پشتیی و سەرین ئنجا لێی بە ڕەخنە نەگرتم (فَمَا عَابَ عَلَيَّ).

کەواتە: وەك من لە کتێبی: {چەند بابەتێك هونەریی و گۆرانیی و مۆسیقا، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا} بە تەفصیل لەو بارەوە قسەم کردوە، لە کۆی ئەو فەرمایشت و دەقانە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە حیکمەتی قەدەغەکردنی وێنە کێشان و پەیکەر تاشین، ئەوەیە بە مەزن بگیرێن، بۆیە دایکمان عائیشە دەڵێ: دوای ئەوەی کردمە بەرگە پشتیی و دۆشەك، لێی بە عەیب نەگرتم، حیکمەتێکی دیکەی قەدەغەکردنیان ئەوەیە کە مرۆڤ سەرقاڵ بکەن و داڵغەی بەملاو بەولادا بەرن، کەواتە: ئەگەر قوماش و پەردە وێنەدارەکە لە شوێنێك بێ، مرۆڤ سەرنجی ڕانەکێشرێ، قەیدێ ناکات، چونکە پێغەمبەر فەرمووی: (أَخِّرِيهِ عَنِّي)، نەیفەرموو: لایبەرە بە یەکجاریی، هەروەها پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: {إِلَّا مَا كَانَ رَقْماً فِي ثَوْبٍ}، (أخرجه البخاري: ٥٩٥٨، ومسلم: ٢١٠٦).

واتـە: مـادام لـە پۆشـاك بـێ، قەیـدیٚ نـاكات، چونكـە پۆشـاكەكە لەبـەر دەكـریٚ و دوور دەخرێتـەوە لـەوەی بـە پیـرۆزو مـەزن بگیـریٚ.

ئنجـا ئـەوە كـە لـە سـەردەمی سولەیمانیشـدا هەبـووە، كەواتـە: مەسـەلەی مامەڵە كـردن لەگـەڵ وێنـەو پەیكەرەكانـدا، شـتێك نیـەو بەشـێك نیـە لـە ئیـمان و عەقیـدە، ئەگەرنـا پێغەمبـەران (عَلَيْهِـم الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم)، لـە كاروبـاری ئیـمان و عەقیـدەو لـە بنەڕەتەكانـی دینداریيـدا، هەموويـان يەكـن، مـادام ئـەو كات ڕەوا بـووە، بـۆ هەنـدیٚ بەرژەوەندیـی، دەگونجـیٚ ئەوانـە لـە ڕۆژگاری ئێمەشـدا، بـۆ هەنـدیٚ بەرژەوەندیـی ڕەوابـن، لـە ڕووی تەندروسـتیی و جوگرافیـی و كۆمەڵناسـیی و، لـە ڕووی ناسـینەوەی تاوانبارانـەوەو، لـە ڕووی موخابەراتییـەوە، بـەڵام گرنـگ ئەوەيـە ئـەو وێنانـە، نەكرێنـە بەهانـەی بـە پیـرۆز گرتـن و بـە مەزنگرتـن و سـەر بكێشـن بۆ بتپەرسـتیی و، پەرسـتنی جگـە لـە خـوا ﷻ.

٣- لە بارەی چۆنيەتيی بايەكەی سولەيمانەوە ﷺ، كە خوا ﷻ دەفەرمویٚ: پێش نيوەڕۆيان، مانگە ڕێيەك دەيبردو، دوای نيوەڕۆيان مانگە ڕێيەك دەيهێنايەوە، دەتوانين بڵێين: وەك باڵۆنی ئێستا وابووە، وەك چۆن ئێستا باڵۆن هەيە، جۆرێك هەوای تیٚ دەكریٚ، سووكەو بەرز دەبێتەوە، دوايی كۆنترۆڵيش دەكریٚ بە لای ڕاست و چەپ دا و، بۆ بەرز كردنەوەو نزم كردنەوە، بەڵكو زياتر وەك فڕۆكە بووە، مرۆڤ كە ئێستا گەيشتۆتە ئەوەی فڕۆكە دروست بكات، خواش ﷻ شتێكی ئاوای وەك ئامرازێك بۆ سولەيمان ڕەخساندوە، ئەو شتەی سولەيمان و سوپايەكەی لە سەری بوون، ئنجا تەختە بووە، هەر چی بووە، (با) هەڵيگرتوە، هەروەك چۆن فڕۆكە با هەڵيدەگریٚ، تەيارەی بۆينگ حەوتسەد كەس، بەڵكو هەزار كەس هەڵدەگریٚ و دوو قاتە، خوای پەروەردگار وەك موعجيزەيەك شتێكی وای بۆ پێغەمبەر سولەيمان ﷺ ڕەخساندوە، بەڵیٚ، مرۆڤ دوايی لە ڕێی زانستەوە گەيشتوە بە دروستكردنی فڕۆكەو باڵۆن، بەڵام ئەوەی سولەيمان هەر بۆ نيزيك خستنەوە لە عەقڵ وا دەڵێين، ئەگەرنا بە تەئكيد شتێكی تايبەت بووەو لەو جۆرە نيە، كە مرۆڤ لە ڕێی عەقڵ و زانست و لێكۆڵينەوەوە پێی بگات.

٤- لە بارەی: ﴿ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ﴾ەوە: ﴿ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ﴾، ئەویش دیسان (**محمد الطاهر بن عاشور**)و هەندێك لە توێژەران گوتوویانە: (**لیست عَيْناً حقيقيةً ولكنّها مُسْتَعَارَةٌ لِمُصَبِّ مَا يُصْهَرُ بِهِ فِي مَصَانِعِه مِنَ النُّحَاسِ**)[1]، واتە: مەبەست پێی سەرچاوەی ڕاستەقینە نیە، بەڵکو ئەوە وشەیەکە خوازراوەتەوە بۆ ئەو کانزایانە کە لە کارگەکانی سولەیمان ﷺدا توێندراونەوە، دوایی ڕژاوەو لەبەری ڕۆیشتوە، وەك کانیی و سەرچاوە هاتۆتە بەرچاو.

پێم وایە ئەوەش دیسان جۆرێکە لە مل پێ بادانی ئایەتەکان، بۆ ئەوەی زیاتر لەگەڵ عەقڵ و هۆشی خەڵکدا بگونجێ، بەڵام ئەو کاتە ئەوە لە موعجیزە دەشۆرێ و، لەوە دەشۆرێ کە تایبەت بوو بێ بە سولەیمانەوە ﷺ، ئێستاش لە هەموو دنیادا کارگەی ئاسن و، توانەوەی ئاسن و پۆڵاو مس و، هەموو جۆرە کانزایەکان هەن، مرۆڤ پێیان گەیشتوە!! کەواتە: ئەوەی سولەیمان ﷺ، دەبێ کانیی و سەرچاوەیەك بێ کە مسی لێ هەڵقوڵیبێ و توابێتەوەو لە بەری ڕۆیشتبێ و، تایبەت بووە بە سولەیمانەوە ﷺ وەك موعجیزەیەك، خوا ﷻ باسیکردوە.

٥- کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ﴾، زانایان لەو بارەوە پرسیاریان کردوە: ئایا سولەیمان ﷺ چەند بە مردوویی لەسەر گۆچانەکەی ماوەتەوە؟ ڕۆژێك بووە؟ دوو ڕۆژ بووە؟ هەفتەیەك بووە؟ مانگێك بووە؟ دوو مانگ بووە؟ ساڵێك بووە، کەمتر بووە، زیاتر بووە؟ لەو بارەوە زانایان زۆر قسەیان کردوە، بۆ وێنە: (**الطبري**)، لە تەفسیرەکەی خۆیدا[2]، ڕیوایەتێك دێنێ، ئەمە سەرەتاکەیەتی:

{**عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَعَنْ أُنَاسٍ، مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: كَانَ سُلَيْمَانُ يَتَجَرَّدُ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ السَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ، وَالشَّهْرَ وَالشَّهْرَيْنِ، وَأَقَلَّ مِنْ ذَلِكَ وَأَكْثَرَ، يُدْخِلُ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ**}، دوایی لە کۆتاییدا دەڵێ: (**وَبقُوا سَنَةً يَعْمَلُونَ لَهُ**)[3].

---

(١) التحرير والتنوير، ج٢٢ ص١٥٩.

(٢ ) جامع البيان برقم: ٢٨٨٠٨.

(٣) قال محقق تفسير الطبري: إسناده حسن، وانظر: تفسير القرآن العظيم، لابن كثير، ج١١، ص٢٦٨.

(طبري) دەڵێ: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە لە کەسانێك و، لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە سولەیمان خۆی یەکلا دەکردەوە لە (بیت المقدس)دا ساڵێك و دوو ساڵ، مانگێك و دوو مانگ و، لەوە کەمترو لەوە زیاترو، خواردن و خواردنەوەشی لەگەڵ خۆی دەبردە ژوورێ.

دیارە شوێنێکی تایبەتیی بووە، لەوێدا خۆی یەکلا کردۆتەوە بۆ خواپەرستیی، بە پێی ئەو ڕیوایەتەی (الطبري)، دەڵێ: دوای ئەوەی خواردنی بردۆتە ژوورێ، کە چۆتە حاڵەتی ئیعتیکافەوە، دوایی خۆی داوەتە سەر گۆچانەکەی و ماوەی ساڵێك بووە، کۆچی دوایی کردوە، ساڵێك بەسەر مردنەکەیدا تێپەڕیوە، تاکو گۆچانەکەی مۆرانە لێی داوە، لە نێوێدا شیکراتەوەو قرپۆك بووەو، گۆچانەکە شکاوەو، سولەیمان کەوتوە، ئەوە ساڵێکی بەسەردا چووە.

کە بە ڕاستیی من ئەوە بە دوور دەزانم، سولەیمانێك حوکمڕان بێ و، مەملەکەتێکی لەبەر دەستدا بێ، ئەو هەموو وەزیرو کاربەدەستانەی هەبن و ئەو سوپای مرۆڤ و جندو باڵندەو با، ساڵێك بەسەر مردنیدا تێپەڕبێ و کەس پێی نەزانێ! من ئەوە بە دوور دەزانم، بێگومان دەبێ ماوەیەکیش بووبێ، دەنگونجێ مانگێ بووبێ، هەفتەیەك بووبێ، وەك پێغەمبەر (محمد) ﷺ دە (١٠) شەوی کۆتایی ڕەمەزان چووبێتە ئیعتیکافەوە، بە تەئکید دەبێ ماوەیەك بووبێ، بایی ئەوە بکات مۆرانە گۆچانەکەی بخۆن و لە نێوێدا، شیی بکەنەوە، گۆچانەکەی قرپۆك بێ و، گۆچانەکەی بشکێ و سولەیمانیش بکەوێ، ئنجا بزانرێ کە کۆچی دوایی کردوە.

هەڵبەتە حیکمەتی ئەوەش، ئەوە بووە جند بە درۆ بخرێنەوە، کە گوتوویانە: ئێمە پەنهان دەزانین، بێگومان جند دەتوانن شتێك کە ئێستا هەیە، بەڵام لە شوێنێکی دوور دەست، پەی پێ ببەن، بەڵام شتێك کە لە داهاتوودا دەبێ، کە ئەوە (غیب)ی پێ دەگوترێ، بە تەئکید ئەوە لە توانای جنددا نیەو نادیار و پەنهان تەنیا لە لای خوایە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ

وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾النمل، واتـه: بڵـێ: ئـەو نهێنیـی و پەنهانـەی لـە ئاسـمانەکان و زەوی دان، جگـە لـە خـوا کـەس نایزانـێ و، هەسـتیش ناکـەن، نایزانـن کـەی زینـدوو دەکرێنـەوە، ئـەوەش تەنیا لـە لای خـوای پـەروەردگارە، واتـە: ئـەو جـۆرە مردنـەی سـولەیمان حیکمەتەکـەی ئـەوە بـووە کـە بـە جۆرێـك بمـرێ، لەبـەر ئـەوەی جند بـۆ سـولەیمان دەسـتەمۆ و، ڕام و، ملکـەچ کـراون و، بـە جۆرێـك بمـرێ کـە جند بـە درۆ بکەنـەوە، کـە لافیـی ئەوەیـان لێداوە پەنهـان (غیـب) دەزانـن، پەنهانێـك کـە تەنیـا خـوا دەیزانـێ، ئەگەرنـا کەسـێك شـتێکی لـە شـوێنێك شـاردبێتەوە، بـەڵام کەسـێکی دیکـە ئـاگای لێیـە، شـتێك کـە بـە نسـبەت خەڵکـی ئێـرە پەنهانـە، بـەڵام لـەولا دەیزانـن، ئـەوە دەگونجـێ جنـدو مرۆڤیـش بیزانـن و، بـە هـۆی پێشـکەوتنی زانسـتەوە بیزانـن، بـەڵام شـتێك کـە تەنیا خـوا ﷻ دەیزانـێ و، تەنیـا لـە هەگبـەی نادیـار (غَیب)ی خـوای پـەروەردگاردا هەیـە، جنـدو مـرۆڤ پـەی پـێ نابـەن.

٦- کە دەفەرموێ: ﴿ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا﴾، ئەی ئالی داوود شوکر ئەنجام بدەن، کەواتە: شوکر دەکرێ و ناگوترێ، شوکر شتێکە بە کردەوە ئەنجام دەدرێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا﴾، هەرچەندە هەندێك لە زانایان وەك پێشتر هێنامان، ویستوویانە ئەوە تەئویل بکەن، (أي: اعْمَلُوا صَالِحَاً لأَجْلِ الشُكْرِ)، کردەوەی باش بکەن لە پێناوی سوپاسگوزاریی دا، بەڵام لە ڕاستیدا پێویست بەو تەقدیرو تەئویلە ناکات، ﴿ٱعْمَلُوٓا۟ شُكْرًا﴾، یانی: شوکر ئەنجام بدەن، (شُکْر) سوپاسگوزاریی دەکرێ و ئەنجام دەدرێ، بە کردەوە، نەك قسەیەك بێ تەنیا بە دەم بگوترێ، چونکە شوکر پەیوەندیی بە سێ لایەنی مرۆڤەوە هەیە:

أ- پەیوەندیی بە عەقڵ و دڵییەوە هەیە، ئەویش ئەوەیە ئینسان چاکەکانی خوا، لە خواوە بزانێ.

ب- پەیوەندیی بە زمانیەوە هەیە، بە زمان دان بە چاکەکانی خوادا بنێ.

ج- پەیوەندیی بە ئەندامەکانیەوە هەیە، بە کردەوە هەقی ئەو نیعمەتانە بدات، ئەویش ئەوەیە ئەو نیعمەتانە لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنێ بە کردەوە، ئەگەر زانستە بڵاوی

کاتەوە، ئەگەر دەسەڵاتە بەکاری بێنێ بۆ لابردنی زوڵم و، چەسپاندنی دادگەریی و چاکە، ئەگەر ماڵیشە بیبەخشێ، واتە: بە کردەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو چاکەیەی خوادا بکات، بۆ سوود پێگەیاندنی بەندەکانی.

٧)- زۆر کەس لەوەدا بە هەڵە داچوون، کە پێیان وایە، جند پەنهان دەزانن، واتە: پەنهانێك کە بە هۆی ئامرازە ئاساییەکانەوە مرۆڤ پێی ناگات، بۆ وێنە: ئێستا بە هۆی کەشناسییەوە، مرۆڤ دەزانێ کەی باران دەبارێ، بارانەکە چەند دەبێ، کەی خۆر دەگیرێ، کەی مانگ دەگیرێ، هەروەها بوومە لەرزە، هەرچەندە بومەلەرزە تاکو ئێستاش بە ماوەیەکی زۆر کەم لە پێش ڕوودانی توانیویانە دەرکی پێ بکەن، لە حاڵێکدا کە زۆر لە ژیاندارەکان، پێش ماوەیەکی زۆر دەزانن بوومەلەرزە دێ، زانایان لێیان کۆڵیوەتەوە کە هەندێ لە ژیانداران هێلانەو بەچکەکانی خۆیان دەگوازنەوەو کۆچ دەکەن، لە کاتێکدا دەزانن لەو شوێنەدا بوومەلەرزە دێ، یان تسۆنامیی دێ، پێش ڕۆژێ دوو ڕۆژ، ئەوان دەکەونە خۆیان، زۆر جار مرۆڤ بەهۆی وانەوە دەزانێ، کە ڕەنگە شتێك لە ڕێ بێ، ئەوەش هەستێکە خوا ﷻ بەوانی داوە، ئنجا بەهۆی ئامرازە باوەکانەوە، هەرشتێ پەی پێ ببردرێ، بەو غەیبە دانانرێ کە بەس لەلای خوایە ﷻ، بەڵکو بە غەیبێکی ڕێژەیی (غیب نسبي) دادەنرێ، بەڵام غەیبی موتڵەق، وەك هاتنی قیامەت، یان ڕوودانی هەندێ شتی دیکەی داهاتوو یان فڵانکەس کەی دەمرێ، یان چی وچی لێ دێ؟ وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿٣٤﴾﴾لقمان، ئەوە تەنیا لە هەگبەی غەیبی خوای پەروەردگاردایە، زۆر گرنگە مرۆڤ دڵی لەسەر ئەوە چەسپاو بێ و، پێی وانەبێ جگە لە خوا هیچ کەسی دیکە، ئەو نادیارو پەنهانانە دەزانێ، کە بە ئامرازە ئاسایی و باوەکان و لە ڕێی دۆزینەوەی یاسا گەردوونییەکانەوە دەرکیان پێ ناکرێ و، پەییان پێ نابردرێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە پێنج ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (١٥ - ١٩)، تێیان دا باسی گەلی (سبأ) کراوە، کە خوا نازو نیعمەتێکی فراوانی لە هەموو ڕوویێکەوە پێدا بوون: جێگاو شوێنی باش و پەسەندو، باغ و بێستانی زۆرو، بژیوی فراوان و، هێمنیی و ئاسایشێکی باش، کەچی بە هۆی سپڵەیی و پشت لە خوا کردنیانەوە، خوای دادگەر حاڵەکەی گۆڕیون بە حاڵێکی ناخۆش و لافاوێکی بێڕەزا، بەنداوەکەی لێ ڕووخاندوون (بەنداوی شاری مەئریب)، سەرەنجام لە جێی باغ و بیستانەکانیان، هەندێ ڕووەکی خراپ و بێ بەر، یاخود بەرتاڵ و ناخۆش، پەیدا بوون، لە جێی هێمنیی و ئاسایشەکەشیان، ترس و دڵە ڕاوکێیان بە ملدا هاتوەو، لە جێی تۆکمەیی و پێکەوە بوونیان، پرژو بڵاویی پارچە پارچە بوون، یەخەی پێگرتوون.

﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا۟ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ
وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا۟ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ وَبَدَّلْنَٰهُم
بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم
بِمَا كَفَرُوا۟ وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ ﴿١٧﴾ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ ٱلْقُرَى ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا قُرًى
ظَٰهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا ٱلسَّيْرَ سِيرُوا۟ فِيهَا لَيَالِىَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُوا۟ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ
أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ
صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

[بـە دڵنیایـی نیشـانەیەك(ی گـەورە) بـۆ (گەلـی) سـەبەء (لەسـەر میهرەبانیـی و چاکەکاریـی خـوا) لـە وڵاتەکەیانـدا هەبـوو: دوو بـاغ لـەلای ڕاسـت و چـەپ(ی شـوێنی نیشـتەجێ بوونیـان)دا هەبـوون، {بـە زمانـی حـاڵ پێـمان گوتـن:} لـە بژێـوی پەروەردگارتـان بخـۆن و سوپاسـگوزاریی بـۆ بکـەن، (وڵاتەکەتـان) وڵاتێکـی خـۆش و دڵگیـرەو پەروەردگارێکـی لێبوردەتـان هەیـە، (بەندایەتییەکـی سـاغی بـۆ بکـەن) ﴿١٥﴾ کەچـی (وێـڕای ئـەو هەمـوو نیعمـەت و چاکانـەی خـوا) ڕوویـان لـە پەیـام و بەرنامـەی خـوا وەرگێـڕا، ئێمـەش (لـە سـزای ئـەوەدا) لافاوێکـی بێڕەزامـان نـاردە سـەریان (بەنداوەکـەی ڕووخانـدن)و، دوو باغەکەشـیانمان بـۆ گۆڕیـن بـە دوو باخچـەی خـاوەن میـوەی تـاڵ و ناخـۆش و (درەختـی) گـەزو شـتێك لـە (درەختـی) سـیدرێکی کـەم ﴿١٦﴾ ئـەو (سـزای)ەش سـزادانمان بـوو بۆیـان بـە هـۆی بێبڕواییانـەوە، ئایـا جگـە لـە بابـای زۆر بێبـڕواو سـپڵە، هیچکـەس (بـەو سـزا سـەختە) سـزا دەدەیـن؟ ﴿١٧﴾ هەروەهـا لـە نێـوان (وڵاتـی) ئـەوان و نێـوان ئـەو شـارانەدا کـە پیـت و پێزمـان تێخسـتوون، چەنـدان ئاوەدانیـی دیـارو بەرچاومـان ڕەخسـاند بـوون و، سـەفەرکردن و ڕۆیشـتنمان لـە نێوانیانـدا ئەندازەگیریـی کـرد بـوو (بـە زمانـی حـاڵ پێـمان گوتـن:) لـە مـاوەی نێـوان چەنـدان شـەوو ڕۆژان دا، لـە نێوانیانـدا سـەفەرو هاموشـۆ بکـەن، لـە حاڵێکـدا کـە هێمـن و بـێ ترسـن (لـە دزو جـەردەو ڕێگـران) ﴿١٨﴾ کەچـی (بـە زمانـی حـاڵ) گوتیـان: پەروەردگارمـان! سـەفەرەکانمان بـۆ لەیەکـدی وە دووربخـەو ستەمیشـیان لـە خۆیـان کـرد، (سـەرەنجام) ئێمـەش کردماننـە قسـەو بەسـەرهات(ی کـۆڕو مەجلیسـان)و زۆرمـان پەرتـەوازەو پچڕپچـڕ کـردن، بێگومـان لـەو سـەرەنجامە شـووم و خراپـەی گەلـی سـەبەئدا، نیشـانە گـەل هـەن (لەسـەر کارزانیـی و زاڵیـی خـوا) بـۆ هـەر زۆر خۆڕاگرێکـی زۆر سوپاسـگوزار ﴿١٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێ لە وشەکان

(سَبَأ): (اسْـمُ بَلَـدٍ تَفَـرَّقَ أَهْلُـهُ، يُقَـالُ: ذَهَبُـوا أَيَـادِيَ سَـبَأ، أَيْ تَفَرَّقُـوا تَفَـرُّقَ أَهْـلِ هَـذَا المَكَانِ مِنْ كُلِّ جانِـبٍ)، (سبأ): نـاوی وڵاتێکـە کـە خەڵکەکـەی لـەوێ بڵاوەیـان لێکـردوە، لـە زمانـی عەرەبییـدا دەڵـێ: (ذَهَبُوا أَيَادِيَ سَبَأ)، واتـە: بـە مەرەدی سـەبەء چـوون، واتـە: وەك خەڵکـی ئـەو شـوێنە، بـە هەمـوو لایانـدا پـرژو بـڵاو بـوون و پـرژاون.

(مَسْكَنِهِمْ): (مَسْـكِنِهِمْ، أو مَسَـاكِنِهِمْ)، هەردووکیـان هاتـوون، (مَسْـكَنْ: اسْـمُ مَكَان، وَالجَمْـعُ: مَسَـاكِنْ)، (مَسْـكَن): نـاوی شـوێنە، واتـە: شـوێنی نیشـتەجێ بـوون و بـە (مَسَـاكِنْ)، کۆدەکرێتـەوە.

(طَيِّبَةٌ): (أَصْـلُ الطَّيِّـبِ: مَـا تَسْـتَلِذُّهُ الحَـوَاسُ ومَـا تَسْـتَلِذُّهُ النَّفْـسُ) لـە بنچینـەدا (طَيِّـب): هـەر شـتێکە کـە هەسـتەکان تامـی لێوەربگـرن [بۆنێـکی خـۆش، تامێـکی خۆش، ڕەنگێـکی جـوان، دەنگێـکی خـۆش، هەمـوو پێیـان دەگوتـرێ: (طَيِّـب)، هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە خۆشـن]و هەرشـتێك کـە نەفـس لـەزەتی لێبـکات، (طَيِّـب)ی بـۆ بـەکاردێ.

(سَيْلَ ٱلْعَرِمِ): واتـە: لافاوێکـی بێـڕەزا، (السَّيْلُ: أَصْلُـهُ مَصْـدَرٌ، المَاءُ الَّـذِي يَأْتِيْـكَ، وَلَـمْ يُصِبْـكَ مَطَـرُه)، (سَـيْل): ئـەو ئاوەیـە کـە پێـت دەگات، بـێ ئـەوەی بارانەکـەی لـە تـۆی دابـێ، واتـە: بـاران لـە شـوێنێکی دیکـە باریـوەو بۆتـە لافـاو، لافاوەکـەی دەگاتـە تـۆ، (العَـرِم): (أَي: الشَّـدِيْد)، واتـە، زۆر سـەخت و تونـدو بێـڕەزا.

(ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ): (ذَوَاتَىْ أُكُلٍ): (أي: صَاحِبَتَـي أُكُلٍ)، ئـەو دوو باغە خاوەنی جـۆرە میوەیـەك بـوون، (أُكُلٍ): بـەر، میـوە، شـتێك کـە بخـورێ، ﴿خَمْطٍ﴾، واتـە: تـاڵ، هەندێکیـش گوتوویانـە: (الخَمْـطُ: شَـجَرُ الأَرَاك)، درەختـی (أَرَاك) کـە سـیواکی لێ دروسـت دەکـرێ، تەنیـا بـۆ سـیواك بـەکار دەهێنـرێ و بەرێکـی وای نیـە، هەندێکیـش گوتوویانـە: (خَمْـط)، درەختێکـە دڕکـی تێـدا نیـە، بـەڵام بەرەکـەی تاڵە.

(وَأَثْلٍ ): (أثل: شجرٌ ثابتُ الأصل)، بە درەختێك دەگوترێ: كە بنكەكەی چەسپا بێ، هەندێكیش گوتوویانە: (أثل)، واتە: درەختی (أرَاك)، بەڵام (خَمْط)، بە مانای تاڵ و ناخۆش دێ.

(سِدْرٍ ): درەختی سیدر، ئەوەیە كە بۆنی خۆشەو دەچێنرێ، بەڵام بەرەكەی ئەگەر هەبێ، یاخود گەڵاكەی ئەگەر بخورێ، سوودێكی وای نیە، (شَجَرٌ قَلِيلُ غَنَاءٍ عِنْدَ الأَكْلِ)، سوودێكی كەم دەگەیەنێ لە كاتێكدا كە دەخورێ، ئنجا چ گەڵایەكەی، چ ئەگەر بەرو میوەیەكی هەبێ بخورێ.

(ظَٰهِرَةً ): (مَرْئِيَةٌ) واتە: بینراو، یاخود (مُتَقَارِبَةٌ يَظْهَرُ بَعْضُهَا لِبَعْض)، ئاوەدانییەكان لێك نزیكن، هەندێكیان لە هەندێكیانەوە نیزیك دیارن.

(ٱلسَّيْرَ): (السَّيْر: المُضِيُّ فِي الأَرْض)، (سَيْر) بریتیە لە: ڕۆیشتن بە زەوییدا.

(أَحَادِيثَ ): (أحَادِيث) كۆی (حَدِيث)ە، واتە: هەواڵ، واتە: كردمانن بە بەسەرهاتی مەجلیسان، تەنیا لە مەجلیسان بەسەرهاتیان بگێڕدرێتەوە چۆن فەوتاون؟

(كُلَّ مُمَزَّقٍ ): (التَّمْزِيق: تَقْطِيعُ الثَّوْبِ قِطَعَاً، اسْتُعِيْرَ هُنَا للتَفْرِيق)، (تَمْزِيق): بریتیە لەوەی پۆشاكێك بدڕێنرێ، پارچە پارچە بكرێ، لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ پرژو بڵاوە پێكردنی ئەو خەڵك و گەلە، كە گەلی سەبەئن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ دوای ئـەوەی باسـی داوودو سـولەیمانی کـرد (عَلَيْهِـما الصَّـلاةُ وَالسَّـلاَم)، کـە خـوا چاکـەو نیعمەتـی خـۆی پێـداون، بـۆ ئـەوەی بیکاتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوە: موحەممەدیـش ﷺ کـە خـوا کردوویەتـی بـە پێغەمبـەرو نیعمەتـی پێغەمبەرایەتیـی پێـداوە، ئـەوە شـتێکی غەریـب و نامـۆ نیـە، لـە پێـش موحەممەدیشـدا ﷺ، خـوا ﷻ پێغەمبەرانـی دیکـەی هەڵبـژاردوون، بـە تایبەتـی داوودو سـولەیمان، کـە ئـەو بـاب و کـوڕە بەڕێـزە، وێـڕای ئـەوەی پێغەمبـەر بـوون، حوکمـڕان و پادشـاش بـوون، دوای ئـەوە خـوا ﷻ جۆرێکـی دیکـە لـە بەسـەرهات بـاس دەکات، باسـی ئەزموونێکـی دیکـەی پێچەوانـەی ئەزموونـی داوودو سـولەیمان دەکات، کـە داوودو سـولەیمان هەرچـی ئیمکانیەتـی خـوا پێیـداون، لـە ڕەزامەندیـی خـواو خزمەتکردنـی خەڵـك و وڵاتـدا، بەکاریـان هێنـاوە، لەبـەر ئـەوەی پێغەمبـەر بـوون (عَلَيْهِـما الصَّـلاةُ وَالسَّـلاَم)، پابەنـد بـوون بـە بەرنامـەی خـواوە، ئنجـا خـوا ﷻ نموونـەی گەلـی سـەبەء بـاس دەکات، کـە لەگـەڵ ئەوەشـدا، خـوا ﷻ نیعمەتـی زۆری بـەوان دابـوو، هەمـوو جۆرەکانـی نیعمـەت، جێگـەو ڕێگـەی بـاش و، بـاغ و بێسـتان، هێمنیـی و ئاسـاییش و، ڕزق و ڕۆزییەکـی زۆر، بـەڵام وەفـا دارانـەو بـە ئەمەگانـە، لەگـەڵ چاکەکانـی خـوادا مامەڵەیـان نەکـرد، بەڵکـو سـپڵەو ناسـوپاس بـوون، سـەرەنجام خـوا ﷻ سـزای دان.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ﴾، بـە دڵنیایـی بـۆ گەلـی سـەبەء، لـە جێگـەو ڕێگایانـدا، نیشـانەو بەڵگەیەکـی گـەورە هەبـوو، لەسـەر ئـەوە کـە خـوا ﷻ خـاوەن کـەڕەم و لوتفـە بەرانبـەر بـە بەندەکانـی، یاخـود لەسـەر ئـەوە کـە خـوا چاکـە لەگـەڵ بەنـدەکانی دا دەکات، بـەڵام ئەگـەر سوپاسـگوزار نەبـن، دوایـی سـزایان دەدا، لەسـەر ئـەوەی بـێ وەفـاو سـپڵە بـوون بەرانبـەر بـە چاکەکانـی.

ئنجـا بـاس دەکات دەفەرمـوێ: ﴿جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ﴾، دوو باخـی گـەورە بـوون بـۆ خەڵکـی سـەبەء، لـە لای ڕاسـت و لای چـەپ، بۆیـە دەفەمـوێ: لای ڕاسـت

و لای چەپ، دەگونجێ ناوچەیەك كە گەلی سەبەئی لێ بووە، كە لە یەمەن بووەو، بەنداوی مەئریب زۆر ناودارە، دەگونجێ مەبەست لەوە بێ كە كەسێ ڕۆیشتوە، ئەملاو لای هەمووی باخ بووە، واتە: لای ڕاست و چەپی هەمووی باخ بووەو، كە دەفەرموێ: ﴿ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ ﴾، واتە: (عَنْ يَمِيْن وَشِمَال المُسَافِر)، لەلای ڕاست و چەپی ڕێبوار، وادیارە شوێنەكەیان شوێنێكی گەورەو فراوان بووبێ، ڕووبارێكی بە نێودا ڕۆیشتبێ و، لای ڕاست و چەپی، دوو باغی گەورە بووبن، ﴿ كُلُوا۟ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥ ﴾، واتە: پێمان گوتن: لە بژێوی پەروەردگارتان بخۆن و سوپاسگوزاریی پەروەردگارتان ئەنجام بدەن، ﴿ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴾، ولاتێكی خۆشتان هەیە، ولاتێكی پڕ نازو نیعمەتتان هەیەو، پەروەردگارێكی لێبوردەشتان هەیە.

﴿ فَأَعْرَضُوا۟ ﴾، كەچی ئەوان پشتیان هەڵكرد، واتە: پشتیان كردە پەیامی خواو پشتیان لە ئایین و بەرنامەی خوا كرد، ڕوویان لێ وەرگێڕا، ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ ﴾، ئێمەش لافاوێكی سەخت و بێڕەزامان نارده سەریان، كە سەرەنجام بەنداوەكەیان ڕووخاوەو، مەشهورە لە مێژوودا كە بەنداوی مەئریب لافاوێكی گەورە لێیداوەو ڕووخاوەو، لە ئەنجامی ڕووخانەكەشیدا، باغەكان نەماون و وشك بوون، چونكە ئەو شاجۆگەو جۆگەلانەی هەڵیانبەستوون، بە هۆی ناوی داوەستاوی بەنداوەكەوە كە كۆیان كردۆتەوە، دیارە ئەو شاجۆگەو جۆگەلانە هەموویان وشك بوون، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴾، دوو باخەكەیانمان گۆڕین بە دوو باخی خاوەن میوەی تاڵ و، دار گەز، [دار گەز جۆرە درەختێكە هیچ سوودی نیە، مەگەر بۆ داره ڕێی خانوو بەكاربهێنرێ و، بۆ سووتان، ئەگەرنا هیچ سوودێكی نیە] ﴿ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴾، شتێكی كەمیش لە درەختی سیدر، سیدریش ئەوەیە كە لە نێو جادەو شەقامەكان دا دەچێنرێ و، ئەندازەیەك بەرز دەبێتەوەو گەڵایەكەی بۆنێكی خۆشی هەیە، جۆرێ لە سابوونیشی لێ دروست دەكرێ، ﴿ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِمَا كَفَرُوا۟ ﴾، ئەو سزایەشمان دان، بە هۆی بێبڕواییانەوە بوو،

یاخـود بـە هـۆی سـپڵەییانەوە بـوو، ﴿ كَفَرُواْ ﴾، هـەم بـە مانـای بێبڕواییـان کـرد، هـەم بـە مانـای سپڵەییان کـرد، دێ، ﴿ وَهَلْ نُجَٰزِيٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ ﴾، ئایا ئێمـە جگـە لـە بابـای زۆر بێبـڕوا، یـان ناسپاس و سـپڵە، هیچکـەس بـەو سـزا سـەختە، سـزا دەدەیـن؟

﴿ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ ٱلْقُرَى ٱلَّتِي بَٰرَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَٰهِرَةً ﴾، هەروەهـا لـە نێـوان ئـەوان (گـەلی سـەبەء لـە یەمـەن)و ئـەو ئاوەدانییانـەدا کـە پیـت و پێزمـان تێخسـتبوون، {کـە مەبەسـت پێیـان شـامە} چەنـد ئاوەدانییەکـی ئاشـکرامان دانابـوون، چەنـد ئاوەدانییـەك کـە بەسـەر یەکـەوە بـوون، یاخـود چەنـد ئاوەدانییـەك کـە لـە دوورەوە دیـار بـوون، ﴿ وَقَدَّرْنَا فِيهَا ٱلسَّيْرَ ﴾، مـاوەی ڕۆیشتنیشـمان تێـدا ئەندازەگیریـی کردبـوون، یـانی: وابـوو کـە لـەم شـارە تاکـو دەگەنـە ئـەو شـارە، یـەك جـار پێویسـتییان بـە پشـوودان بـێ، تاکـو لـە یەمەنـەوە دەچونـە شـام، هەمـووی قۆنـاغ بـە قۆنـاغ ئاوەدانیـی لـێ هەبـوون.

﴿ سِيرُواْ فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴾، بـە زمانـی حـاڵ پێـمان فەرمـوون: شـەوان و ڕۆژانێکـی زۆر، بـە هێمنانـەو ئاساییشـانە بـڕۆن، واتـە: هیـچ ترسـی دزو جـەردەو ڕێگرتـان نەبـێ، ﴿ فَقَالُواْ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا ﴾، بـەڵام گوتیـان: پەروەردگارمـان! سـەفەرەکانمان لێـك وەدووربخـە، ئەمـە دەگونجـێ لـە ئەنجامـی ملهوڕیـی و خـۆ پـێ زۆریـی و بـێ منەتییـەوە، وایانگوتبـێ، گوتبیان:با پشـوو لـەو ڕێیـە لـێ نەدەیـن و، ئێمـە لـە هیـچ شـتێك ناترسـین، دەشـگونجێ بـە زمانـی حـاڵ وایانگوتبـێ، بـە زمانـی حـاڵ گوتبیـان: پەروەردگارمـان! بـا سـەفەرەکانمان لێـك دوور بـن، ﴿ وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ﴾، ستەمیشـیان لـە خۆیـان کـرد، ﴿ فَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ ﴾، ئنجـا ئێمـەش کردمانـن بـە قسـەکان، واتـە: هەمـوو ئـەوەی لێیـان مایـەوە، ئـەو بەسـەرهاتانە بـوون کـە لـە بارەیانـەوە دەگێڕدرانـەوە، ﴿ وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ ﴾، بـە هەمـوو شـێوەیەکی پرژوبڵاوکـردن و لێـك پارچـە پارچـە کـردن، لێکـمان دابڕیـن و پەرتەوازەمـان کـردن، ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾، بێگومـان لـەوەدا نیشـانەی زۆر هـەن، بـۆ هـەر زۆر خۆڕاگرێکـی زۆر سوپاسـگوزار، دوایـی لـە مەسـەلە گرنگـەکان دا بـاس دەکەیـن، ئـەو نیشـانانە چیـن؟

گرنگ ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ ﴾، وشەی: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، دەگونجێ بگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتیی فەوتاندنیان، دەشگونجی بگەڕێتەوە بۆ کۆی بەسەرهاتی سەبەء، چ ئەو نازو نیعمەتانە کە پێیان دراون، چ هەڵوێستی بێبڕوایانەو ناسوپاسانەی ئەوان، چ سزا دارانیان لە لایەن خوای دادگەرو کاربەجێیەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**لە وڵاتی گەلی سەبەئدا باخ و بێستانی پڕ بژیو هەبوو، لەوەش دا بۆ گەلی سەبەء نیشانەیەکی گەورە هەبوو، لەسەر میهرەبانیی خوا، کە دەبووایە سوپاسی خوای لەسەر بکەن و، بیپەرستن، کەچی ڕوویان لە خوا وەرگێڕاو، خوای کاربەجێش وەك سزادان، لافاوێکی بێڕەزای ناردە سەریان و، سەرەنجام لە جێی هەردوو باخەکەیان، کە پڕ بوون لە میوەی جۆراو جۆر، تەنها هەندێك جۆرە درەختی بێ میوەو بەر، یاخود بەرتاڵ و بێ تامیان بۆ مانەوەو، ئەوەش سزای بێبڕوایی و سپڵەییان بوو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا۟ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا۟ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِمَا كَفَرُوا۟ وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ ﴿١٧﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە (١٠) بڕگەدا:**

١)- ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ﴾، بە دڵنیایی بۆ هۆزی سەبەء، یان گەلی سەبەء لە شوێنی نیشتەجێ بوونیان دا، نیشانەیەکی مەزن و تایبەت و گەورە هەبوو، یاخود عیبرەت و پەندێکی گەورە هەبوو.

وشەی: (مَسْكَنْ)، خوێندراویشەتەوە: (مَسَاكِنُ)، ئەگەر بڵێین: (مَسْكَنْ)، واتە: شوێنی نیشتەجێ بوون، (مَسَاكِنُ)، شوێنەکانی نیشتەجێ بوونیان، نیشانەیەکی گەورەیان تێدا هەبوو، هەندێك لە زانایان ئاوایان لێکداوەتەوە، (أي: لَقَدْ كَانَ

لِسَبَإٍ فِي حَالِ مَسَاكِنِهِمْ وَنِظَامِ بِلَادِهِمْ آيَةٌ، أي: الْأَمَارَةُ وَالدَّلَالَةُ عَلَى تَصَرُّفِ اللهِ وَنِعْمَتِهِ عَلَيْهِمْ)، بۆ گەلی سەبەء لە شوێنی نیشتەجێ بوونیان و بۆ سیستمی بەڕێوەبردنی وڵاتیان، نیشانەیەکی گەورەو بەڵگەیەك هەبوو، لەسەر ئەوە کە خوا ﷻ چاکەی لەگەڵدا کردوون و، نیعمەتی خۆی بەسەردا ڕشتوون.

٢)- ﴿ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ ﴾، دوو باخ لەلای ڕاست و لای چەپ، وشەی: ﴿ جَنَّتَانِ ﴾، دەبێتە جێگرەوە (بَدَل) بۆ (ءَايَةٌ)، ئەو نیشانەیە چی بوو؟ ئەو پەندو عیبرەتە چی بوو؟ دوو باخ لەلای ڕاست و لای چەپ، لای ڕاست و لای چەپیش، وەك گومان: دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ کەسێ کە ڕۆیشتوە، ئەو لاو لای باخ بووە، یاخود شوێنەکە وا بووە دوو قەدپاڵی هەبوون، هەردووکیان باخ بوونە، لای ڕاست و لای چەپ.

٣)- ﴿كُلُوا۟ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥ ﴾، لە بژیوی پەروەردگارتان بخۆن و سوپاسگوزاریی بۆ بکەن، ئەم ڕستەیە: (مَقُولُ قَوْلٍ مَحْذوفٍ) گوتراوی قسەیەکی قرتێنراوە، واتە: پێیان گوترا: لە بژیوی پەروەردگارتان بخۆن و سوپاسگوزاریی بۆ ئەنجام بدەن، یاخود: ئەوە بە زمانی حاڵ پێیان گوتراوە، یاخود: ئەوە لەسەر زمانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) کە بۆیان نێردراون، پێیان گوتراوە.

٤)- ﴿ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴾، وڵاتێکی خۆش و پەروەردگارێکی لێبوردە، ﴿ طَيِّبَةٌ ﴾، (الطَّيِّبَةُ: الحَسَنَةُ فِي جِنْسِهَا، المُلَائِمَةُ لِمُزَاوِلِهَا وَمُسْتَثْمِرِهَا)، ﴿ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ ﴾، وڵاتێکی گونجاو بۆ کەسێك کە بیەوێ کاری تێیدا بکات و، تێیدا بژی، چونکە (طَيِّبٌ)، هەر شتێکە کە هەستەوەرەکان و دەروون چێژی لێ ببینن.

٥)- ﴿ فَأَعْرَضُوا۟ ﴾، کە چی پشتیان تێکردو، ڕوویان وەرگێڕا، ئەمەش ئەوە دەخوازێ کە پێشتر پێغەمبەریان بۆ هاتبێ، یاخود هۆشیار کەرەوەیەکیان بووبێ و، ئەوانیش پشتیان لەو پەیام و بەرنامەیە کردوە، کە ئەو پێغەمبەرە ﷺ، یاخود ئەو هۆشیار کەرەوەیە کە شوێنکەوتووی پێغەمبەران بووە، پێیڕاگەیاندوون.

٦)- ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ ﴾، ئێمەش لافاوێکی سەخت و بێڕەزامان نارده سەریان، (الْإِرْسَالُ: الطَّلَاقُ ضِدُّ الْحَبْسِ، وَتَعْدِيَتُهُ بِحَرْفِ «عَلَى» مُؤْذِنَةٌ بِأَنَّهُ إِرْسَالُ نِقْمَةٍ)، (إرسال)

بەرهەڵدانە دژی گرتن و نەهێشتن، ئنجا کە (أرسل) بە پیتی (عَلَى) بەرکاری خواستوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنی کە خوا ﷻ وەك بەڵاو سزا بۆی ناردوون، وشەی: ﴿ ٱلْعَرِمِ ﴾، (العَرِمِ وَصْفُ العَرَامَةِ، وَهِيَ الشِّدَّةُ وَالكَثْرَةُ)، (عَرِم) وەسفی (عَرامة)یە، کە بریتیە لە: سەختیی و زۆریی، یاخود وشەی: ﴿ ٱلْعَرِمِ ﴾، (الْعَرِم: اسْمُ جَمْعِ العَرَمَة)، (الْعَرِم) ناوی کۆی (عَرَمَة)یە، یانی: سەختیی و نارەحەتیی، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: لافاوێکی سەخت و بێڕەزامان نارده سەریان.

٧)- ﴿ وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ ﴾، دوو باخەکەیانمان بۆ گۆڕین، بە دوو باخچەی خاوەن میوەی تاڵ و دارگەز، ﴿ أُكُلٍ خَمْطٍ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (أُكُلِ خَمْطٍ)، ﴿ أُكُلٍ خَمْطٍ ﴾، یانی: میوەی تاڵ و تفت، یان (أُكُلِ خَمْطٍ)، یانی: میوەیەك کە تاڵیی و تفتیی بوو.

٨)- ﴿ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴾، شتێکیش لە (درەختی) سیدرێکی کەم، ئەوەشمان لە شوێنی دوو باخەکان دا بۆ ڕواندن، کە ئەوانە هەموویان درەختی بیابانن، یان میوەیان نیە، یاخود میوەکەیان تفت و تاڵ و ناخۆشە.

لە کۆتایی ئەم دەرسەماندا، چۆنیەتیی پەیوەستبوونی ئەم بەسەرهاتی سەبەء، بە ئایەتەکانی پێشەوە لە زمانی (إبن عَطِيَّة)ەوە، دێنین، دەڵێ:

(لَمَّا فَرَغَ التَّمْثِيلُ لِمُحَمَّدٍ ﷺ، رَجَعَ التَّمْثِيلُ لَهُم «أي: للْمُشْرِكِين» بِسَبَإٍ، وَمَا كَانَ مِنْ هَلَاكِهِمْ بِالْكُفْرِ وَالْعُتُوّ، فَهَذِهِ القِصَّةُ تَمْثِيلُ أُمَّةٍ بِأُمَّةٍ، وَبِلَادٍ بِأُخْرَى).

واتە: دوای ئەوەی خوا ﷻ نموونەی بۆ موحەممەد ﷺ هێنایەوە، (بە داوودو سولەیمان کە خوا ﷻ بەس چاکەی بە موحەممەد نەداوەو داوودو سولەیمانیش خوا ﷻ کردوونی بە پێغەمبەرو کردووشنی بە حوکمڕان پادشاو، ئەو هەموو نیعمەتانەی پێداون)، خوا دەگەڕێتەوە بۆ نموونە هێنانەوە بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بە گەلی سەبەء، کە چۆن بە هۆی کوفرو مل هوڕییانەوە، خوا فەوتاندوونی، ئەو هەموو نیعمەتانەی پێداون، کەچی لە بەرانبەر نیعمەتەکانی خوادا، ملهوڕ و پێ نەزان و سپڵە بوون و، خواش فەوتاندوونی، کەواتە: ئەم

بەسەرهاتە، چواندنی گەلێکە بە گەلێك و، وڵاتێك بە وڵاتێك، [کە ئێوە دەبێ دەرس لەوان وەربگرن].

کە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ﴾، [(ل) (قد)، (اللام للقَسَمِ (قد) للتحقيق)] (لام) بۆ سوێندەو (قد)یش بۆ ساغکردنەوەیە، (وَالتَّأْكِيدُ بِلَامِ الْقَسَمِ وَحَرْفِ التَّحْقِيقِ لِتَنْزِيلِ حَالِهِمْ حَالَةَ الْمُنْكِرِ)، ئایا بۆچی بە جەختکردنەوەوە دەفەرموێ؟

چونکە حاڵی بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ وەك حاڵی کەسێ بووە، کە نکووڵیی بکات، لەوە کە گەلی سەبەء، لە ڕێگەو جێگەکەیاندا، نیشانەیەك و پەندو عیبرەتێك بووبێ.

دیارە کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەریش ﷺ بە تایبەتیی لە مەککەو دەوروبەریدا، زۆر نزیك بوون لە یەمەنەوەو، بەسەرهاتی بەنداوی مەئریب و گەلی سەبەء، لە نێویاندا زۆر باو بووە.

٩)- ﴿ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِمَا كَفَرُواْ﴾، بەوجۆرەش سزاماندان بە هۆی بێبڕواییانەوە، بە هۆی سپڵەییانەوە. (ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُمْ: جَزَيْنَاهُمُ الجَزَاءَ الْمُشَارَ إِلَيْهِ) یانی: ئەو سزایەمان دان، کە ئاماژەی پێدرا.

١٠)- ﴿وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ﴾، ئایا ئەو سزا سەختەی کە دامانن، جگە لە بابای بێبڕواو سپڵە، کەسی دیکەی پێ سزا دەدەین؟ ئایا جگە لە بابای بێبڕواو سپڵەو ناسوپاس کەسی دیکە، بەو جۆرە سزا سەختە، سزا دەدەین؟ ئەوە دیارە پرسیارلێکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: هیچ کەس سزا نادەین، مەگەر وەك وان بێبڕوا بێ و، وەك وان بێ سپڵەو نا سوپاس بێ، کەواتە: ئەی کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺو، ئەی کافرەکانی هەموو ڕۆژگارەکان! وریا بن، ئێوەش وەك گەلی سەبەء بێبڕواو سپڵەو نا سوپاس مەبن، بۆ ئەوەی بە مەرەدی ئەوان نەچن و، بەو جۆرە سزا سەختە سزا نەدرێن.

**مەسەلەی دووەم:**

**باسی ئاسانکاریی خوا بۆ سەفەرو هاتن و چوونی گەلی (سبأ) بە هۆی هەبوونی ئاوەدانییانی زۆرەوە، لە نێوان وڵاتی (سبأ)و شام دا، کە بە هێمنیی سەفەریان دەکرد بە شەوو ڕۆژ، بەڵام بەهۆی ستەم و ناشکورییانەوە، خۆیان دووچاری لێکهەڵوەشان و پەرتەوازە بوون کرد:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا آمِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

**١)- ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً﴾، [خوا ﷻ دووبارە دێتەوە سەر باسی ئەو نیعمەتانەی کە بە گەلی سەبەئی دابوون، دەفەرموێ:] لە نێوان ئەوان و لە نێوان ئەو ئاوەدانییانەدا، کە پیت و پێزمان تێخستوون، ئاوەدانییانێکی ئاشکرامان دانابوون. مەبەست لەم ئایەتە موبارەکە، باسی نیعمەتی هێمنیی و ئاساییش و، ئاسانکاریی بۆ سەفەرو هاتن و چوون و، ئاوەدانیی وڵاتە.**

**٢)- ﴿قُرًى ظَاهِرَةً﴾، أ- ئاوەدانییانێکی وا کە بۆ ڕێبواران دیار بن، لە دوورەوە.**

**ب- یاخود: ئەو ئاوەدانییانەی، لە یەکدی دیار بوون، هەندێکیان هەندێکیان دەبینی، واتە: لەو شارەوە ئەوی دیکە دیار بوو، لەوی دیکەوەش، ئەوی دیکەو ...هتد.**

**ج- واتایەکی دیکە بۆ وشەی: ﴿ظَاهِرَةً﴾، کراوە، کە بریتیە لە: (خَارِجَةٌ عَنِ الْمُدُنْ)، ئەو ئاوەدانییانەی لە دەرەوەی شارن، یانی: شارە گەورەکان هەبوون و، لە دەرەوەی ئەوانیش ئاوەدانیی دیکە هەبوون، بۆ ئەوەی ئەو شارانە پێکەوە پەیوەست بکەنەوە.**

وشـەی: (قُرَى ) تاکەکـەی (قَرْيَـة)ە، واتـە: ئاوەدانیـی گـەورە، واتـە: ئـەو چەمـك و واتایـە بـاوەی نیـە، کـە لـەم ڕۆژگارەی ئێسـتادا هەیـەتی، کـە (قَرْيَـة)، بـە واتـای: لادێ، گونـد، کـە بەرانبـەری شـارە، دێ، بەڵکـو (قَرْيَـة) بـە مانـای ئاوەدانیـی گـەورە دێ، بـۆ وێنـە: بـە مەککـە گوتـراوە: (أُمُّ القُـرَى)، واتـە: دایکـی ئاوەدانییـەکان، (القُـرَى الَّتِـي بَارَكْنَـا فِيهَـا)، ئـەو ئاوەدانییانـەی پیـت و پێزمـان تێخسـتبوون، مەبەسـت پێـی شـامە، بـە تایبەتـی فەڵەسـتین، بـە بەڵگـەی ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی (الأنبيـاء)، کـە خـوا ﷻ لـە بـارەی ئیبراهیمـەوە ﷺەوە دەفەرمـوێ: ﴿ وَنَجَّيْنَـٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِي بَـٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَـٰلَمِينَ ۝٧١ ﴾، واتـە: خـۆی و (لوط)مـان دەربـاز کـردن، بـەرەو ئـەو سـەر زەمینـەی، پیـت و پێزمـان بـۆ جیهانییـان تێخسـتوە.

کـە دیـارە ئیبراهیـم ﷺو لووطـی ﷺ بـرازای لـە ئـووری کلدانییەکانـەوە، کاتێـك کـە لـە عێـراق دەر بـەدەر دەبـێ و، بابـی دەری دەکات، دەچـێ بـۆ شـام، پێشـێ دەچـێ بـۆ ناوچـەی حـەڕڕان، دواتـر دەچـێ بـۆ فەلەسـتین، گرنـگ ئەوەیـە کـە بـە هەمـووی گوتـراوە شـام، بۆیـەش خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِي بَـٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَـٰلَمِينَ ﴾، چونکـە ئـەو سـەر زەمینـە، سـەر زەمینێکـی بـە پیـت و پێـزە، چەنـدان جـۆرە درەخـت و میـوەو کشـتوکاڵ و دانەوێڵـەی لـێ بەرهـەم دێ.

٢)- ﴿ وَقَدَّرْنَا فِيهَا ٱلسَّيْرَ ﴾، لە نێوان ئەو ئاوەدانییانەدا، ڕۆیشتن و هات و چووڵمان ئەندازە گیریی کرد بوو، (أي: قَدَّرْنَا مَسَافَاتِ السَّيْرِ فِي القُرَى)، ماوەی ڕۆیشتنمان لە نێوان ئاوەدانییەکاندا ئەندازەگیریی کرد بوو، واتە: قۆناغ بە قۆناغ، وەك ئێستا نەبووە سەفەر بە فڕۆکەو شەمەندەفەرو سەیارە بێ! بە بارو وڵاخ بووە، بە گوێدرێژو ئەسپ و ماین و ئێسترو حوشتر بووەو، ئەوانیش پێویستییان بە پشوودان و ئیسراحەت هەبووە، دەبووایە چەند سەعاتێك بڕۆن و پشووبدەن، هەم وڵاخەکان و، هەم نەفەرەکان پشوو بدەن، بۆیە پێویست بووە، قۆناغ قۆناغ بێ.

٣)- ﴿ سِيرُوا۟ فِيهَا لَيَالِىَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴾، تێیدا بڕۆن شەوان و ڕۆژانێك بە دڵنیایی بە هێمنیی، ئەم ڕستەیە: (مَقُولُ قَوْلٍ مَحْذُف)، گوتراوی قسەیەکی قرتێنراوە، یانی: (قُلْنَا

سِيْرُوا فِيْهَا)، گوتمان: پێیدا بڕۆن، ئنجا ئەم (قُلْنَا)یە، لێرەدا فەرمانێکی تەکوینیی بووە، نەك تەشریعیی، واتە: وامان بۆ دانابوون، بە پێی یاسا گەردوونییەکانی خۆمان، وەك بە زمانی حاڵ، پێمانگوتبێ: بە شەوان و بە ڕۆژان بڕۆن، بە دڵنیایی، بۆچی شەوی پێشخستوە؟ ﴿لَيَالِيَ وَأَيَّامًا﴾، لەبەر ئەوەی ڕۆیشتنی شەوێ، خۆشترەو، گەرم نیە، ئنجا شەویش زیاتر پێویستیی بە هێمنیی و ئاساییش هەیە، ئنجا ئەگەر لە شەوێدا هێمنیی و ئاساییشیان بۆ ڕەخسابێ، بە ڕۆژی باشترو زیاتر.

کە دەفەرموێ: ﴿ءَامِنِينَ﴾، واتە: لە ڕۆژێ و شەوێشدا ئەمین و دڵنیا بوون، بێ ترس بوون و، ڕێگاوبان ئەمین بوون و، جەردەو دزو ڕێگری لێ نەبوون، ئەوەش نیعمەتێکی گەورەیە بۆ هەر وڵاتێك کە هێمنیی و ئاساییشی تێدا سەقامگیر بێ، واتە: بە شەو یان بە ڕۆژ، بڕۆن، یان بە شەوو ڕۆژ بڕۆن، چۆنی دەتانەوێ.

٣)- ﴿فَقَالُوا۟ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا﴾، بەڵام گوتیان: پەروەردگارمان! سەفەرەکانمان لێك وەدووربخە، وشەی: ﴿بَٰعِدْ﴾، خوێندراوەیشەتەوە: (بَعِّدْ)، کە واتاکانیان زۆر لە یەك نیزیکن، واتە: سەفەرەکانمان لێك وە دووربخە، ئنجا ئەمە دوو ئەگەری هەن، ئەو قسەیە چۆن کراوە؟:

أ- یان بە زمانی حاڵ وایانگوتوە، یانی: (دَلَّ حَالُهُمْ عَلَى هَذَا القَوْل)، وەك بە زمانی حاڵ گوتبێتیان: خوایە! با سەفەرەکانمان ماوەیان لێك دوور بێ و، ئاوەدانیی زۆر لەسەر ڕێگامان نەبن، بتوانین زوو زوو پشوو بدەین، بەڵکو با ئاوەدانییەکان لێك دوور بن، دەشت و بیابان بێ، واتە: وەك وایانگوتبێ، وا دەهاتنە بەرچاو، لە ئەنجامی ئەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارە بێنمەکیی و سپڵەییە، کە لەگەڵ چاکەکانی خوادا کردیان، بە تایبەتیی نیعمەتەکانی هێمنیی و ئاساییش، وەك بە زمانی وتار گوتبێتیان: خوایە! با ماوەی هاتن و چوونمان لێك دووربێ، قۆناغەکان لێك دوور بن، وەك وایانگوتبێ، وابوون.

ب- واتایەکی دیکە: ئەگەری هەیە کە ئەمەیان بە زمانی گوتار گوتبێ: بەڵام (جَوابَاً عَنْ مَواعِظِ أنْبِيَائِهِم أو مُنذرِيهِم)، واتە: لە وەڵامی ئامۆژگاریی پێغەمبەرانیان (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ

وَالسَّلَام) یان ئامۆژگاریی ترسێنەران و هۆشیارکەرەوانیان دا، گوتبیان: پەروەردگارمان! بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەی ئەوان [پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) یان: وریاکەرەوەو ترسێنەران] با سەفەرەکانمان لە یەك دوور بن و، ئەو چاکەو نیعمەتەی خۆمان لێبستێنەوە!

٤)- ﴿ وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ﴾، ستەمیشیان لە خۆیان کرد، (و)ی سەر (وظلموا) {وَاو الحَالِيَة، أي: قَالُوا ذَلِكَ وَقَدْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ بِالشِّرْكِ}، وایانگوت: لە حاڵێکدا کە ستەمیان لە خۆیان کرد بوو، بە هاوبەش بۆ خوا دانان.

یان بە سپڵەیی کردن لە بەرانبەر چاکەکانی خوادا، کە ئەوەیان زیاتر لەگەڵ سیاقەکەدا دەگونجێ.

٥)- ﴿ فَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَحَادِيثَ ﴾، ئێمەش کردمانن بە قسە، واتە: (فَصَارَ وُجُودُهُمْ فِي الأَخْبَارِ وَالقَصَصْ)، بوونیان چووە نێو باس و قسەی گێڕدراوەو بەسەرهاتەکانەوە، واتە: تەنیا لە قسەو باس و خواس و بەسەرهاتەکان دا، بوونیان ماوەو، ئەگەرنا لەسەر ئەرزی واقیع بوونیان نەماوە، واتە: کردمانن بە قسەی نێو کۆڕ و دیوەخانان، قسەی نێو حیکایەت و بەسەرهاتان، کە گەلی سەبەء ئاوابوون و، ئاوا چوون!

٦)- ﴿ وَمَزَّقۡنَٰهُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ ﴾، هەروەها بە هەموو شێوە لێك پچڕاندنێك، لێکمان پچڕاندن، وشەی: ﴿ كُلَّ ﴾ لە: (كُلَّ ممزق)دا (مَنْصُوبٌ عَلَى المَفْعُولِيَّة المُطْلَقَةِ)، مەنصووبە بەهۆی بەرکاری ڕەهابوونیەوە، یانی: هەموو پەیوەندییەکانیانمان پچڕاندن، لێرەدا ﴿ كُلَّ ﴾، بە مانای زۆر (كثير) دێ، یانی: (كَثِيرَ التَّمْزِيق)، ﴿ كُلَّ ﴾، زۆر جاران بە مانای (زۆر) دێ، نەك بە مانای (هەموو)، واتە: زۆرمان لێك دابڕین، زۆرمان پچڕاندن، لە ئەنجامی ئەوەدا، کە ئەوان بە زمانی حاڵ، یان بە زمانی وتار، داوایان کرد بوو بەو شێوەیان لێ بێ، کە سەفەرەکانیان لێك دوور بن و، قۆناغەکانی سەفەریان لێك نیزیك نەبن.

٧)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ﴾، بە ڕاستیی لەوەدا، {لە حاڵو بەسەرهاتی سەبەندا} نیشانەی زۆر هەن، بۆ هەر زۆر خۆڕاگرێکی زۆر سوپاسگوزارو شوکرانە بژێر.

لە بارەی گەلی سەبەئەوە، ئەم فەرموودەیە هەیە:

{عَنْ فَرْوَةَ بْنِ مُسَيْكٍ الْمُرَادِيِّ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا أُقَاتِلُ مَنْ أَدْبَرَ مِنْ قَوْمِي بِمَنْ أَقْبَلَ مِنْهُمْ؟ فَأَذِنَ لِي فِي قِتَالِهِمْ وَأَمَّرَنِي، فَلَمَّا خَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهِ سَأَلَ عَنِّي: مَا فَعَلَ الْغُطَيْفِيُّ؟ فَأُخْبِرَ أَنِّي قَدْ سِرْتُ، قَالَ: فَأَرْسَلَ فِي أَثَرِي، فَرَدَّنِي فَأَتَيْتُهُ، وَهُوَ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: «ادْعُ الْقَوْمَ، فَمَنْ أَسْلَمَ مِنْهُمْ، فَاقْبَلْ مِنْهُ، وَمَنْ لَمْ يُسْلِمْ فَلَا تَعْجَلْ حَتَّى أُحْدِثَ إِلَيْكَ»، قَالَ: وَأُنْزِلَ فِي سَبَإٍ مَا أُنْزِلَ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا سَبَأٌ؟ أَرْضٌ أَوِ امْرَأَةٌ؟ قَالَ: لَيْسَ بِأَرْضٍ وَلَا بِامْرَأَةٍ، وَلَكِنَّهُ رَجُلٌ وَلَدَ عَشَرَةً مِنَ الْعَرَبِ، فَتَيَامَنَ مِنْهُمْ سِتَّةٌ، وَتَشَاءَمَ مِنْهُمْ أَرْبَعَةٌ، فَأَمَّا الَّذِينَ تَشَاءَمُوا، فَلَخْمٌ وَجُذَامٌ وَغَسَّانُ وَعَامِلَةُ، وَأَمَّا الَّذِينَ تَيَامَنُوا، فَالْأَزْدُ، وَالْأَشْعَرِيُّونَ، وَحِمْيَرٌ، وَكِنْدَةُ، وَمَذْحِجٌ، وَأَنْمَارٌ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا أَنْمَارُ؟ قَالَ: الَّذِينَ مِنْهُمْ خَثْعَمُ وَبَجِيلَةُ} (أخرجه الترمذي: ٣٢٢٢، قال: هذا حديث حسن، وأبو يعلى: ٦٨٥٢، وابن أبي شيبة: ٧١٣، قَالَ الألباني: حسن صحيح).

واتە: فەڕوەی کوڕی موسەیکی موڕادیی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ خەڵکەکەم ئەوانەی کە ڕوو بە ئیسلام هاتوون، بەوانە بجەنگم لە دژی ئەوانەی کە پشتیان لە ئیسلام کردووە، مسوڵمان نەبوون؟ ئەویش مۆڵەتی دام لە جەنگ کردنیانداو، کردمیە بەرپرسیان، بەڵام کاتێک لەلای وی چوومە دەرێ، پرسیاری کرد بوو، (مَا فَعَلَ الْغُطَيْفِيُّ؟)، [ئەو نازناوە، هی شوێنەکەی بووە، یاخود تیرەکەی بووە] ئایا (غُطَيْفِي)، چی کرد، بۆ کوێ چوو؟ ئیدی هەواڵی پێدرابوو کە ڕۆیشتووم، بە دوایدا ناردم، گێڕامیەوە، منیش چوومە خزمەتی، چەند کەسێ لە هاوەڵانی لە دەوری بوون، فەرمووی: ئەو خەڵکە بانگ بکە، (واتە: بانگیان بکە بۆ ئیسلام)، هەر کەسێک مسوڵمان بوو، لێی وەربگرە، بەڵام ئەوەی مسوڵمان نەبوو، پەلە مەکە، تاکو دوایی فەرمانت بۆ دەنێرم.

(فەڕوە) دەڵێ: لە بارەی سەبەئیشەوە ئەوە دابەزی کە دابەزی، پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ سەبەء چی بووە؟ ئایا سەر زەمینێکە؟ یاخود ناوی ئافرەتێکە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نە ناوی سەر زەمین و وڵاتێکە،

نـە نـاوی ئافرەتێکیشــە، بەڵکـو ســەبەء نـاوی پیاوێکـە، دە (١٠) کـوڕی بـوون لـە عەڕەبـەکان، هــەر کوڕێکیـان تیرەیەکـی لـێ پەیدابـووە، شەشـیان بــە لای ڕاسـتدا چـوون و، چواریشـیان بـە لای چـەپ دا، (واتـە: ئـەو شـوێنەی لێـی بـوون، شەشـیان بـە لای ڕاسـتی ئـەو شـوێنەدا ڕۆیشـتوون، چواریشـیان بـە لای چەپـدا)، ئەوانـەی بـە لای چەپـدا ڕۆیشـتوون، ئـەم چـوار هـۆزەن: (لَخْـمُ وَجُـذَامُ وَغَسَّـانُ وَعَامِلَـةُ)، ئەوانـەش کـە بـە لای ڕاسـتدا ڕۆیشـتوون، ئـەم شـەش هـۆزەن: (الْأَزْدُ وَالْأَشْـعَرِيُّونَ وَحِمْـيَرُ وَكِنْـدَةُ وَمَذْحِجُ وَأَنْمَـارُ)، پیاوێـک لـەوێ بـوو گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ (أَنْمَـارُ) چییـە؟ فەرمـووی: (أَنْمَـارُ) ئـەو هۆزەیـە، کـە (خَثْعَـمُ وَبَجِيلَـةُ)، لەوانـەوە وەپـاش کەوتـوون.

## حەوت هەڵوەستە لە بەرانبەر بەسەرهاتی گەلی سەبەئدا

### ١)- گەلی سەبەء، یان هۆزی سەبەء:

دەگونجێ وەك گەلێك تەماشا كرابن و لە چەند هۆزێك پێك هاتبن، دەشگونجێ هۆزێك بووبن و، لە چەند تیرەیەك پێك هاتبن، گرنگ ئەوەیە، ئەو خەڵكە دە (١٠) هۆز بوون، یاخود دە تیرە بوون، هەر هۆزێك دەبێتە چەند تیرەیەك، یانی: (قبیلة) دەبێتەوە عەشیرەت، عەشیرەت و دەبێتە (فَخذ) لە زمانی عەرەبییدا، لە كوردییشدا دەڵێین: هۆزو تیرەو تایەفە، ئەو دە (١٠) تیرەیە، هۆزی سەبەنیان پێكهێناوە: (الْأَزْدُ وَالْأَشْعَرِيُّونَ وَحِمْيَرُ وَكِنْدَةُ وَمَذْحِجُ وَأَنْمَارُ ولَخْمُ وَجُذَامُ وَغَسَّانُ وَعَامِلَةُ)، شەشی یەكەمیان، واتە: (الْأَزْدُ وَالْأَشْعَرِيُّونَ وَحِمْيَرُ وَكِنْدَةُ وَمَذْحِجُ وَأَنْمَارُ)، هەر بە وڵاتی یەمەندا بڵاو بوونەوەو، چوارەكەی دیكەیان، واتە: (لَخْمُ وَجُذَامُ وَغَسَّانُ وَعَامِلَةُ)، (عَامِلَةُ) كە (خزاعة)ن، ڕوویان كردۆتە ئەملاو ئەملا، هۆزی (أَزْد) چۆتە عەممان، عەممانی پایتەختی وڵاتی ئوردنی ئێستا، (خُزاعة) چۆتە تیهامە، كە ناوچەیەكە لە نیزیك مەككە، ئەوس و خەزرەج كە لە (لَخْم)ن، چوونە یەثریب، كە دوایی بۆتە مەدینەی پێغەمبەر ﷺ، هۆزی یان تیرەی (غَسَّان) چۆتە بوصرا، كە پێشیگوتراوە: (غەدیر) كە لەلای شامە، هەروەها بەشێك لە ئەوس و خەزرەج كە لە (لخم)ن، چوونە عێراق.

### ٢)- هۆكاری پرژانیان:

هۆكاری لێك بڵاوبوونی گەلی سەبەء، یان هۆزی سەبەء، ئەوەی كە مێژوو بۆمان باس دەكات، هۆكاری سەرەكیی بریتی بووە لە: ڕووخانی بەنداوی

مەئریب، یان مەئرەب، کە گوایە وەك مێژوونووسان گوتوویانە، هەشتسەد (٨٠٠) باسك (ذراع) درێژ بووەو، دە تاکو نۆزدە (١٠-١٩) باسکیش بەرز بووەو، پانییەکەشی سەدو پەنجا (١٥٠) باسك بووە، وەك (الحسن الهمداني)، لە کتێبێکی خۆی دا بە ناوی: (الإكليل)، گوتوویەتی و، ئەو لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچییدا، شوێنەواری ئەو بەنداوە رووخاوەی بینیوە.

## ٣)- هۆکاری رووخانی بەنداوەکە:

لە تەفسیری (الطبري)و تەفسیرەکانی دیکەشدا، کۆمەڵێك بەسەرهات باس دەکەن، کە گوایە مشکێك پشیلە بە دوای کەوتووەو، چۆتە بن دیواری بەنداوەکەوەو کۆڵیویەتی و رووخاوە! کۆمەڵێ حیکایەت هەن، بەڵام لە راستییدا هیچیان جێی دڵنیایی نین و، وا پێ دەچێ کەمتەرخەمیی خۆیان بەرانبەر بەو بەنداوە، هۆکار بووبێ، ئەویش بە هۆی سەرقاڵ بوونیان بە شەڕو شۆڵ و مشت و مڕی نێوخۆیانەوە، زۆر نەیانپەرژابێتە سەر چاککردن و ئاگا لێبوونی بەنداوەکە، کە کتێبەکانی مێژوو دەڵێن: ساڵانە، یان هەر بەیناو بەین، تەعمیریان کردۆتەوەو دەستیان پێداهێناوەتەوە، ئەگەر لە شوێنێکەوە باریك بووبێ، تەنك بوو بێ و ئاو دزیبێتی، چاکیان کردۆتەوە، بەڵام دیارە ماوەیەك لێی بێ خەم بوون، لە ئەنجامی ئەوەدا بەنداوەکە، لافاوێکی گەورەی بەمل دا هاتوە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ ١٦﴾سبأ، لافاوێکی بێڕەزاو سەختمان نارد، ئیدی بەنداوەکەی رامالیوەو رووخاندوویەتی و، لە ئەنجامی ئەوەشدا، ئەوان بەهۆی ئەو بەنداوەوە دەریاچەیەکیان، دروستکردوەو لەو دەریاچەیەدا، ئەو ئاوەی کۆیان کردۆتەوە، چەند جۆگەو رووباریان لێ هەڵبەستوون، باخ و دێبەرو کشتوکاڵی خۆیان پێ ئاو داوە، ئنجا کە دەریاچەکە نەماوە، جۆگەلەو رووبارەکانیش کۆتاییان پێهاتوەو سەرەنجام کشتوکاڵ و رەزو باخەکانی ئەوانیش وشك بوون و، سەرەنجام ئەوانیش بڵاوەیان لێکردوەو پرژاون.



٤)- بۆچی خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ١٩﴾؟

یەکەم: کە دەفەرموێ: ﴿لَآيَٰتٖ﴾؟ لەوەدا نیشانەی زۆر هەن، لەبەر ئەوەی بێگومان لەو بەسەرهاتەدا زۆر نیشانە هەبوون:

أ- هۆزی یان گەلی سەبەء، لەو شوێنە، خوا ﷻ ئاوێکی باشی بۆ ڕەخساندوون، ئنجا ئەوان بەنداویان لە بەردەم ئاوەکەدا دروست کردوەو ئاوەکەیان کۆکردۆتەوەو، دەریاچەیەکی لێ دروستبووە، ئەوە بۆ خۆی نیشانەیەك بووە.

ب- دوایی فیکریان بەوە شکاوە، خوا ئیلهامی بۆ کردوون، یان بەو عەقڵەی کە خوا ﷻ پێیداون، بیریان کردۆتەوەو تەگبیریان کردوە، چۆن بەهرەی باشتر لەو ئاوە وەربگرن؟ ڕەزو باخیان پێ بنیات ناوەو، ڕەزو باخەکانیشیان زۆر بەردارو پڕ بەرهەم بوون، ﴿كُلُواْ مِن رِّزۡقِ رَبِّكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥ﴾، ئنجا دیارە سەر زەمینەکەشیان بە پیت و پێز بووە، ﴿بَلۡدَةٞ طَيِّبَةٞ﴾.

ج- خوا ﷻ هێمنیی و ئاسایشێکی زۆری بۆ ڕەخساندوون، کە بتوانن بازرگانییش بکەن، هەر بەوەندە ڕانەوەستاون کشتوکاڵ بکەن و، ڕەزو باخیان هەبێ و، دانەوێڵەیان هەبێ و، ئاودێریی بکەن، بەڵکو بازرگانییشیان کردوە، ﴿وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ ٱلۡقُرَى ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا قُرٗى ظَٰهِرَةٗ وَقَدَّرۡنَا فِيهَا ٱلسَّيۡرَۖ سِيرُواْ فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ﴾.

د- هەروەها لە نێوخۆدا توکمەو بە هێزو پێز بوون و تەبا بوون، ئەوانە هەموویان نیشانەکانی خوا بوون و، نیعمەتی خوا بوون و، بەخشیونی بە گەلی سەبەء.

دووەم: کە دەفەرموێ: نیشانە هەن بۆ هەر زۆر خۆڕاگرێکی زۆر شوکرانە بژێر، چونکە کەسێك خۆڕاگر نەبێ، لە بەرانبەر ناڕەحەتییەکانداو، شوکرانە بژێرو سوپاسگوزار نەبێ، بەرانبەر بە نیعمەتەکانی خوا، لە چاکەو نیعمەتەکانی خوا بەهرەمەند نابێ و، وەك نیشانەکانی خوا تەماشای چاکەکانی خوا ناکات، واتە: مرۆڤ دەبێ خۆی بڕازێنێتەوە

بە هەردوو سیفەتەکانی: خۆڕاگریی لە بەرانبەر ناڕەحەتییەکانداو، شوکرانە بژێریی لە بەرانبەر نیعمەتەکاندا، ئنجا لە چاکەو نیعمەتەکانی خوا، بەهرەمەند دەبێ و وەك نیشانەکانی خوا تەماشایان دەکات.

## ٥)- نیعمەتەکانی خوا بەبێ سوپاسگوزاریی، بۆ خوا بەردەوام نابن:

بەڵێ بەبێ سوپاسگوزاریی خوا لەسەرکردنیان، چاکەکانی خوا بەردەوام نابن، وەك لە سوورەتی (إبراهيم)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: یاد بکەوە کاتێك پەروەردگارت ڕایگەیاند، (واتە: وەك یاسایەکی گەردوونیی، لە ژیانی مرۆڤ دا)، ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن، بۆتان زیاد دەکەم (لە چاکەکان) و، ئەگەر سپڵەیی بکەن، سزای من سەختە.

دیارە گەلی سەبەئیش کە خۆیان لێ گۆڕاوە، خواش لێی گۆڕیون، وەك لە سوورەتی (الأنفال)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٣﴾ ﴾، واتە: ئەوە بە هۆی ئەوەوە کە خوا ﷻ واقیعی پڕ نازو نیعمەتی هیچ کۆمەڵ ناگۆڕێ، تاکو ئەوان خۆیان نەگۆڕن، واتە: خۆیان نەگۆڕن لە چاکییەوە بۆ خراپیی، خوا ﷻ ئەو واقیعە کە نازو نیعمەتی پێداون، واقیعەکەیان بۆ ناگۆڕێ بە خراپیی.

## ٦)- هێمنیی و ئاسایشی ڕێ و بان نیعمەتێکی خوایە:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا آمِنِينَ ﴿١٨﴾ ﴾، بە زمانی حاڵ پێمان گوتن: بڕۆن بەو ڕێگایانەداو، بەو ئاوەدانییانەدا، شەوان و ڕۆژانێکی زۆر، بە دڵنیایی، بێگومان لە هەر شوێنێك هێمنیی و ئاساییش سەقامگیر بێ، کەسابەتیش دەبێ و، بازرگانییش دەبێ و، کشتوکاڵیش دەبێ و، ئاژەڵدارییش دەبێ و، پیشەسازییش دەبێ، هەموو ئەوانە بەرهەمی سەقامگیریی هێمنیی و

ئاسایشـن، بـەڵام کـە هێمنیی و ئاسایش نەبوو، ئـەو جموجۆڵانـە هیچیان لـە نێـو وڵاتـدا نابـن، یـان وەك پێویسـت نابـن.

**٧)- تۆکمەیی و تەبایی و کۆمەڵگا، نیعمەتێکی گەورەو گرنگی خوایەو، بە پێچـــەوانەوە، پەرتەوازەیی و پـرژو بـڵاویی و ناکۆکیی، بەڵایەکیی زۆر خراپ و بێزەزایە:**

هـەر کۆمەڵگایـەك لـە نێـو خۆیانـدا ناکـۆك و ناتەبـا بـوون، هەمـوو شـتێکیان لـێ تێکدەچـێ، تەبایـی و تۆکمەیـی بناغـەی هەمـوو شـتێکی باشـە، بۆیـە خـوا ﷻ وەك سـزادانی گەلـی (سـبأ) دەفەرمـوێ: ﴿وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾، واتـە: بـە هەمـوو شـێوەك لێکـمان پچڕانـدن، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە ئـەوان بەرانبـەر چاکەکانـی خـوادا سـپڵەو ناسـوپاس بـوون.

کەواتـە: تەبایـی نیعمەتێکـە دەبێتـە بناغـەی نیعمەتـەکان، بـەڵام بناغـەی تەباییش بریتیـە لـە: دادگەریـی و بناغـەی دادگەرییـش بریتیـە لـە: ئیـمان، بەهـۆی ئیمانـەوە دادگەریـی دەبـێ، مرۆڤـەکان ئەگـەر هەموویـان بەنـدەی خـوا ﷻ بـن، هەموویـان پێکـەوە بـرا دەبـن و پێکـەوەش تەبـا دەبـن، دیارە بەنـدەی خـوا بـوون و تەبـا بـوون، ڕەگ و ڕیشـەی دادگەرییـە، ڕەگ و ڕیشـەی دادگەرییـش ئەوەیـە قۆرخکاریـی نەبـێ و، گەندەڵیـی نەبـێ و، خـۆ سـەپاندن نەبـێ و، یەکـدی بـە کەمگرتـن نەبـێ و، ئـەو دادگەرییـە بناغـەی تەباییـە، تەباییـش بناغـەی ئاوەدانییـە لـە وڵات دا[1].

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١) ئـەو حـەوت هەڵوەسـتەیە، لـە تەفسـیری: (التحریر والتنویر، ج٢٢، ص (١٧٠ - ١٨١)ی (محمد الطاهـر بـن عاشـور)، وەرمگرتـوون، بـە دەسـتکاریی خۆمەوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە یازدە (١١) ئایەت پێك دێ، ئایەتەکانی: (٢٠ - ٣٠)، تەوەری سەرەکیی ئەو ئایەتانە، باسی یەکتایی خوا ﷻ لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی و پەرستراوێتیی دا و، پووچەڵیی شیرکە، وێڕای خستنە ڕووی باشترین شێوازی وتووێژو شەڕە قسە، لەگەڵ بێبڕوایان دا.

لە سێ ئایەتی کۆتاییشدا سەرو ئاماژە کراوە، بە هەر کام لە پێغەمبەرایەتیی گشگیریی موحەممەد ﷺ، بۆ هەمووو مرۆڤایەتیی و، ڕۆژی دوایی کە کەم و زۆر، پاش و پێش ناکرێ و، لە کاتی دیاریی کراوی خۆیدا دێ،

﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ
لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْءَاخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِى شَكٍّ ۗ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ
فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَلَا
تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ
قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ۞ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ
وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا
وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ
ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾ قُلْ أَرُونِىَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ۖ كَلَّا ۚ بَلْ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ
﴿٢٧﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا

يَعۡلَمُونَ ﴿٢٨﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قُل لَّكُم مِّيعَادُ
يَوۡمٍ لَّا تَسۡتَـٔۡخِرُونَ عَنۡهُ سَاعَةً وَلَا تَسۡتَقۡدِمُونَ ﴿٣٠﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی ئیبلیسیش گومانەکەی لە بارەیانەوە (لە بارەی مرۆڤەکانەوە) ڕاست دەرچواند، (چونکە) جگە لە کۆمەڵێك، لە بڕواداران، هەموویان شوێنی کەوتن ﴿٢٠﴾ هیچ دەستەڵاتیشی بەسەریاندا نەبوو، (بواریشمان نەدا زەفەر بەوانەیان بەرێ کە حەزیان لە گومڕاییە) مەگەر بۆ ئەوەی ئەو کەسە بزانین، کە بڕوای بە ڕۆژی دوایی هەیە (و جیابێتەوە) لەو کەسەی لە بارەیەوە، لە دوو دڵیی دایەو، پەروەردگاریشت بەسەر هەموو شتێکەوە پارێزەر (و چاودێر)ە. ﴿٢١﴾ بڵێ: (ئەی بێبڕوایەکان!) لەوانە بپاڕێنەوە کە پێتان وایە جگە لە خوا (پەرستراو) ن، تۆسقاڵێك لە ئاسمانەکان و زەوییان بە دەست نیە و، تێشیاندا هاوبەش نین و، ئەو (خوا)یش هیچ هاوکارێکی لە نێویاندا نیە ﴿٢٢﴾ هەروەها تکاکردنی (هیچ تکاکارێك)یش لە لای وی سوود ناگەیەنێ، مەگەر بۆ کەسێك (خوا) مۆڵەتی دابێ (تکای بۆ بکرێ)، ئنجا کاتێکیش ترس و بیم لە دڵیان (لە دڵی فریشتەکان)دا لابرا، گوتیان: پەروەردگارتان چی فەرمووە؟ گوتیان: هەق(ی فەرموو)و ئەویش بەرزی گەورەیە ﴿٢٣﴾ بڵێ: کێ لە ئاسمانەکان و زەوییەوە بژیوتان دەدات؟ بڵێ: خوا، ئێمە یان ئێوەش لە سەر ڕێنمایی، یان لە گومڕاییەکی ڕووندایـن ﴿٢٤﴾ بڵێ: ئێوە لە بارەی تاوانکردنی ئێمەوە، لێتان ناپرسرێ و، ئێمەش لە بارەی ئەوەوە کە ئێوە دەیکەن (لێمان ناپرسرێ) ﴿٢٥﴾ بڵێ: تەنیا پەروەردگارمان (لە ڕۆژی دوایی دا) بە هەق دادوەریمان لە نێواندا دەکات و، تەنیا ئەو دادوەری زانایە ﴿٢٦﴾ بڵێ: ئەو (پەرستراو)انەشم پێشان بدەن، کە وەك هاوبەشان پێتانەوە پەیوەستکردوون، (بە خواوە)، نەخێر، (خوا هیچ هاوبەشی نین)، بەڵکو ئەو خوای زاڵی کارزانە ﴿٢٧﴾

تۆشـمان نەنـاردوە (ئـەی موحەممـەد!) مەگـەر بـە مـوژدەدەرو ترسـێنەر بـۆ تێکـڕای خەڵکـی، بـەڵام زۆربـەی خەڵکـی (ئـەو ڕاسـتییە) نازانـن ﴿٢٨﴾ (بێبڕوایـەکان) دەشـڵێن: ئەگـەر ئێـوە لـە ڕاسـتانن، ئـەو بەڵێنـە (کـە قیامـەت دێ) کەیـە؟ ﴿٢٩﴾ بڵـێ: بەڵێنـی ڕۆژێکتـان هەیـە (و بـۆ دانـراوە) کـە نـە سـاتێك لێـی دوا دەکـەون، نە(لێـی) پێـش دەکـەون (ڕێـك لـە کاتـی دیاریکـراوی خۆیـدا دێ) ﴿٣٠﴾].

## شیکردنەوەی هەندی لە وشەکان

(صَدَّقَ): ﴿ وَلَقَدۡ صَدَّقَ عَلَيۡهِمۡ إِبۡلِيسُ ظَنَّهُۥ ﴾، واتـە: بـە دڵنیایـی ئیبلیسـیش گومـانی خـۆی لـە بـارەی مرۆڤەکانـەوە ڕاسـت دەرچوانـد، دەگوتـرێ: (صَدَّقْتُ فُلَانـاً، أي: نَسَـبْتُهُ إِلى الصِّـدْقِ)، واتـە: پاڵـم دایـە لای ڕاسـتیی.

(زَعَمۡتُم): (الزَّعْـمُ: حِكَايَـةُ قَوْلٍ يَكُوْنُ مَظِنَّةً لِلْكَـذِبِ)، (زَعْـم): بریتیـە لـە: گێڕانەوەی قسـەیەك کـە گومانـی درۆی لـێ بکـرێ، (زَعَـمَ فُـلَان)، واتـە: زیاتـر قسـەکەی بـە لای درۆ و ناڕاسـتییدا دەکێـشرێ.

(ظَهِيرٍ): (مُعِيْن)، واتە: هاوکارو یارمەتییدەر.

(فُزِّعَ): (الفَـزَعُ: انْقِبَـاضٌ وَنِفَـارٌ يَعْـتَرِي الإِنْسَـانَ مِـنَ الـشَّيءِ المُخِيْـف)، (فَـزَع): بریتیـە لـە ڕێکهاتـن و دوور کەوتنەوەیـەك، یاخـود حاڵەتێکـی ناخـۆش کـە بەسـەر مرۆڤـدا دێ، لـە ئەنجامـی دیتنـی شـتێکی مەترسییکراودا، کەواتـە: (فَزَع)، بریتیـە لـە ڕاچەڵەکیـن و داچەڵەکیـن و تـرس ڕێ نیشـتن، ﴿ فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ ﴾، واتـە: تـرس ڕێ نیشـتن و داچەڵەکینیـان لـێ لابـردرا.

(ٱلۡفَتَّاحُ): (الفَتْحُ: إِزَالَـةُ الإِغْـلَاقِ وَالإِشْـكَالِ، فَتَـحَ القَضِيَّـةَ افْتِتَاحَـاً، فَصَّـلَ الأَمْـرَ فِيْهَا)، (فَتْح): بریتیـە لـە لابـردنی شـتێك کـە داخرابـێ و، ئیشـکالێك هەبـێ لابچـێ، کەواتـە: (فَتَّـاح) واتـە: لابـەری ئیشـکال و گـرێ و گـۆڵ، دەگوتـرێ: (فَتَـحَ القَضِيَّـةَ افْتِتَاحَـاً)،

واتە: دادوەریی لە کێشەکەدا کرد، بە دادوەرییەکی چاك، هەق و ناهەقی تێدا لێك هەڵاوارد.

(كَآفَّةً): بە دوو واتایان لێکیان داوەتەوە، وشەی: (كآفة)یان بە کۆمەڵ لێکدراوەتەوە، واتە: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ﴾، واتە: بۆ تێکڕای خەڵك نەبێ، نەماننارددووی هەروەها: (كَآفَّة أي: كَافَّةٌ لَهُمْ عَنِ المَعَاصِي، وَالهَاء فِيه للمُبَالَغَة مِثْل: رَاوِيَة وَعَلَّامَة وَنَسَّابَة، وَقِيْلَ كَافَّة: الجَمَاعَة)، ﴿كَآفَّةً لِّلنَّاسِ﴾، كَافَّةٌ لَهُمْ عَنِ المَعَاصِي)، واتە: بۆ ئەوەی تۆ لە گوناهـ بیانگێڕیەوەو لایان بدەی، وشەی (هاء) لە کۆتاییەکەیدا: (كَافَّة) بۆ زێدەڕۆییە، وەك: (رَاوِيَة)، پیاویش بێ، پێی دەگوترێ: (راوية)، واتە: کە زۆر بەسەرهاتان، قسە دەگێڕێتەوە، (عَلَّامَة)، واتە: زۆر زانا، (نَسَّابَة)، واتە: زۆر ڕەچەڵەکناس، ئەوانە با پیاویش بن، بەو شێوەیە ئەو (ة)یە، لە کۆتاییان زیاد دەکرێ، بۆ زێدەڕۆیی لە واتاکەیاندا.

(مِيعَادُ): (المَوْعِدُ وَالمِيْعَادُ: يَكُونَانِ مَصْدَرَاً وَاسْماً)، وشەی (مَوْعِدُ وَمِيْعَاد)، هەم بە چاوگ دێن، (وَعَدَ، يَعِدُ، مَوْعِدَاً، وَمِيْعَادَاً)، هەروەها وەك ناویش بەکاردێن.

(سَاعَةً): (السَّاعَةُ: جُزْءٌ مِنْ أَجْزَاءِ الزَّمَانِ وَيُعَبَّرُ بِهِ عَنِ القِيَامَة)، (سَاعَة): بەشێکە لە بەشەکانی کات، بەڵام بەکاردەهێنرێ بۆ مانای قیامەت، بەڵکو جارێ وایە بۆ کۆتایی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی و، جاری واش هەیە: (سَاعَة) بۆ هەردووکیان، واتە: هەم بۆ ئاخیر زەمان، هەم بۆ زیندوو کرانەوە، بۆ کۆی ڕۆژی دوایی بەکاردێ.

## ماناي گشتیی ئايەتەكان

دواي ئـەوەی بەسـەرهاتی هەريـەك لـە داوودو سـولەيمان (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) باسـكرا، وەك دوو پێغەمبـەری حوكمـڕان، كـە خـوا نيعمەتـی زۆری پـێ دابـوون و، ئەوانیـش شـوكرانە بژێـر بـوون، لەسـەر نيعمەتەكانـی خـوا، پاشـان باسـی گەلـی سـەبەئیش كـرا، كـە گەلێـك بـوون، خـوا نيعمەتێكـی زۆری پـێ دابـوون، بـەڵام سـپڵەو ناسـوپاس بـوون، بەرانبـەر بـە چاكـەو نيعمەتەكانـی خـوا، خـواش واقيعەكەيانی گۆڕی لـە نـازو نيعمەتـەوە بـۆ بـەڵاو گرفتاريـی و، لـە تۆكمەيـی و تەبايیـەوە، بـۆ پـرژو بڵاويـی و پەرتەوازەيـی، دواي ئـەوە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدۡ صَدَّقَ عَلَيۡهِمۡ إِبۡلِيسُ ظَنَّهُۥ ﴾، بـە دڵنيايـی ئيبليسـيش گومـانی خـۆی لـە بارەيانـەوە ڕاسـت دەرچوانـد، (صَدَّقَ)، ڕاسـتيكرد، بـەڵام: ﴿ صَدَّقَ ﴾، يـانی: بـە ڕاسـتيی دانـا، واتـە: ئيبليسـيش گومانەكـەی خـۆی بـە ڕاسـت دانـاو، وەڕاسـتيگێڕا، گومانەكـەی چـی بـوو؟ ئـەوە بـوو كـە گوتـی: ﴿ لَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ۝٨٢ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ۝٨٣ ﴾ص، واتـە: هەموويـان بێمـرادو سـەرگەردان دەكـەم، جگـە لـە بەنـدە سـاغەكانت، هەروەهـا ئيبليـس گوتـی: ﴿ وَلَا تَجِدُ أَكۡثَرَهُمۡ شَٰكِرِينَ ۝١٧ ﴾الأعراف، زۆربەيـان سوپاسـگوزار نابينـی، گومانەكـەی خـۆی ڕاسـت دەرچوانـد، ﴿ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، هەموويـان شـوێنی كەوتـن، جگـە لـە كۆمەڵێـك، واتـە: كەمينەيـەك لـە بـڕواداران.

ئـەوەی جێـی سـەرنجە لێـرەدا، خـوا ﷻ قسـەی ئيبليسـی پشتڕاسـت كردۆتـەوە، خـوا ﷻ هەقـی ڕەهـای لەلايـە، ئيبليسـيش قسـەيەكی ڕاسـتی كـرد بـێ، خـوا ﷻ پشـتگيريی كـردوەو، فەرموويەتـی: لـەوەدا ڕاسـتيكردوە، ئەوەيـە دادگەريـی موتڵـەق، كـە تەنيـا لـەلای خوايـە ﷻ.

ڕەنگـە لێـرەدا پرسـيارێك بورووژێـنرێ: باشـە ئيبليـس چۆنـی زانـی كـە دەتوانـێ زۆربـەی مرۆڤـەكان بێمـراد بـكات و، گومـڕاو سـەرگەردانيان بـكات، جگـە لـە بەنـدە سـاغبووەوەكانی خـوا، يـان بەنـدە خـۆ سـاغكەرەوەكانی خـوا، چۆنـی ئـەوە زانـی؟

ئایا دەستەڵاتی بەسەریانەوە هەبووە؟ ئاوا بە لە خۆ ڕادیتوویی و بە دڵنیایی هەڕەشەی کردو گوتی: هەموویان گومڕا دەکەم؟ خوای بەرزو پاك لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَٰنٍ ﴾، ئیبلیس هیچ دەسەڵاتی بەسەریاندا نەبوو، لە ژێر ڕکێفی ئەودا نەبوون، ﴿ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْءَاخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِى شَكٍّ ﴾، ئەو توانای بەسەریاندا نەبوو کە بە تۆبزیی گومڕایان بکات، بەڵام ئێمە توانامان پێدا بوو، کە هەرکام لە مرۆڤان خۆی ئارەزوومەندی گومڕایی بێ، ئیبلیسیش زەفەری پێ بەرێ، ئەو توانایەشمان کە پێدابوو، بەس بۆ ئەوە بوو، کە هەرکەس بڕوای بە ڕۆژی دوایی هەیە، بە مەنزڵگای کۆتایی هەیە، بیزانین و جیابێتەوە لەوکەسەی لە بارەیەوە لە دوو دڵیی و گوماندایە، ﴿ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴾، پەروەردگاریشت بەسەر هەموو شتێکەوە پارێزەرە، کەواتە: لە ڕاستییدا ئیبلیس، بۆیە توانی زەفەریان پێ بەرێ، چونکە خوا ﷻ مرۆڤەکانی خستۆتە تاقیکردنەوەوە، بەڵام کە توانی زەفەریان پێ بەرێ، ئەوە نەبوو بە ناچاریی ملیان پێ بادا، بەڵکو ویستی ئازادی خۆشیان لە ئارادا هەبوو، ئنجا حیکمەتی ئەو توانا پێدرانەش بە ئیبلیس ئەوە بووە کە خوا بڕوادارانی پێ لە بێبڕوایان، جیا بکاتەوە.

ئنجا خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، بڵێ: ئێوە لە ئەوانە بپاڕێنەوە، کە پێتان وایە لە جیاتی خوا پەرستراوو هاوبەشی خوان {لێیان بپاڕێنەوە، بزانن دەتوانن بە دەنگتانەوە بێن؟} ﴿ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، {ئەو پەرستراوانە} تۆزقاڵێك لە ئاسمان و لە زەوی، شتیان بە دەست نیەو خاوەنی هیچ شتێك نین، ئنجا ئەگەر مرۆڤن، جند و شەیتانن، ئەگەر فریشتەکانن، ئەگەر دارو بەردن، ئەگەر ئەستێرەو خۆرو مانگن، ئەگەر هەواو ئارەزوون، ئەگەر حیزب و ڕژێمن، هەرچی هەن ئەو پەرستراوانە هیچیان بە دەست نیە، تۆزقاڵێك، (مثقال) یانی: قورسایی و گرانایی، لە ئەسڵدا، (مثقال)، بریتیە لە: (آلَـةٌ يُـوزَنُ بِهَـا)، ئامرازێکە

شتی پێ کێش دەکرێ، دوایی خوازراوەتەوە بۆ خودی گرانایی، (مثقال ذرة)، یانی: هێندەی گرانایی گەردێك و، گەردیش پێشتر باسمان کرد، کە بە کوردیی دەبێتە تۆزقاڵێك، تۆزقاڵێکیان لە ئاسمان و لە زەوییدا بە دەست نیە، ئنجا ئەو پەرستراوانەی ئێوە، نەك خاوەنی هیچ نین، بەڵکو ﴿وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ﴾، تێشیاندا بەشدار نین، واتە: لە ئاسمانەکان و زەویدا بەشدار نین، نەك خاوەنی سەربەخۆ نین، بەڵکو پشك و بەشیشیان نیە، ﴿وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ﴾، خوا ﷻ لە نێو ئەواندا، هیچ هاوکارو پشتیوانێکی نیە، واتە: ئەوانە لەو ئاستەدا نین، کە تەنانەت خوا ﷻ کارێکیشیان پێ بکات، ئەرکێکیشیان پێ بسپێرێ، وەك چۆن ئەرکی بە فریشتەکان سپاردوە، بەڵام ئەو پەرستراوانەی ئێوە، شایستەی ئەوە نەبوون، کە خوا ﷻ ئەرکێکیان پێ بسپێرێ.

پاشان دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾، نەك هەر ئەوە، بەڵکو توانای تکاکردنیشیان نیە، چونکە دەفەرموێ: تکاکردن لە لای خوا سوودی نیە، مەگەر بۆ کەسێك خوا مۆڵەتی دابێ، واتە: مۆڵەتی دابێ تکای بۆ بکرێ، ئنجا ئەو تکاکردنە سوودی هەیە.

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ﴾، ئنجا بە بۆنەی تکاکردنەوە، باسی حاڵەتی فریشتەکان دەکات، کە تکا دەکەن، یاخود: کاتێك کە خوا ﷻ فەرمانێك دەدا، هەتا کاتێك ترسیان لە دڵ دەڕەوێتەوە، ﴿قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ﴾، گوتیان: پەروەردگارتان چی فەرموو؟ ﴿قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ﴾، هەندێکی دیکەیان کە لە خوا نیزیکترن وەڵام دەدەنەوە گوتیان: پەروەردگارمان هەقی فەرموو، ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ﴾، ئەویش (خوا) بەرزی گەورەیە، بەرزییەك کە بۆ خوا شایستەیەو، گەورەییەك کە بۆ خوا شایستەیە، ئەمە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا، زیاتر تیشکی دەخەینە سەر.

خوا ﷻ لێرەدا باسی ئەوە دەکات، کاتێك فەرمانێك دەکات، فریشتەکان هەموویان دادەچەڵەکن و ترسیان ڕێ دەنیشێ، دوایی کە ترس لە دڵیان لادەچێ،

هێمــن دەبنــەوە، دەڵێــن: پەروەردگارتــان چــی فەرمــوو؟ ئەوانــەی زۆر لــە خــوا نیزیکــن، یاخــود جیبریــل کــە لــە فەرمایشــتی پێغەمبــەردا ﷺ هاتــوە، بــەڵام خــوا ﷻ بــە ڕانــاوی کــۆ هێناویەتــی، لەبــەر ئــەوەی جیبریــل ســەرۆکی فریشــتەکانە، یاخــود ئەویــش کۆمەڵێــك فریشــتەی لەگەڵــدان بــۆ گەیاندنــی پەیــڤ و پەیامــی خــوا ﷻ بــە پێغەمبــەران (عَلَيْهِـمُ الصَّلاةُ وَالسَّـلَامُ)، ئــەوان دەڵێــن: پەروەردگارمــان هەقــی فەرمــوو، ڕاســتیی فەرمــوو، ﴿ وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴾، هــەر ئەویــش بــەرزی گەورەیــە.

ئنجــا خــوا ﷻ لــە چــوار ئایەتەکانــی: (٢٤ - ٢٧)دا، نەرمتریــن و، لێزانانەتریــن شــێوازی گفتوگــۆو وتووێــژی بــڕواداران لەگــەڵ نەیارانیــان، لەگــەڵ ئەهلــی کوفــردا دەخاتــە ڕوو، دەفەرمــوێ: ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بڵــێ: کــێ لــە ئاســمانەکان و زەوییــەوە بژیوتــان دەدات، چ بژیــوی ماددیی، چ بژیــوی مەعنەویی؟ ﴿ قُلِ ٱللَّهُ ﴾، هــەر بــۆ خــۆت، وەڵام بــدەوە بڵــێ: خــوا لــە ئاســمانەکان و زەوییــەوە بژیــو دەڕەخســێنێ، بــۆ مرۆڤــەکان و بــۆ جندیــش ﴿ وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، {پێیــان بفەرمــوو:} یــان ئێمــە، یــان ئێــوە، لەســەر ڕێنماییــن، یاخــود لــە گومڕاییەکــی ڕوون و ئاشــکرادایـن، واتــە: بەدڵنیایــی یەکێکــمان لەســەر ڕێنماییــن و، یەکێکیشــمان لــە گومڕایــی دایــن، بــەڵام وەرن بــا لێــی بکۆڵینــەوە، بزانیــن کــێ ڕێــی ڕاســتی گرتــوەو، کێــش لــە گومڕایــی دایــە، ئــەوە شــێوازێکی زۆر نەرمــە لــە وتووێــژدا، نــەك هــەر بڵێــی: تــۆ لــە گومڕایــی دای و منیــش لەســەر هیدایەتــم!! بەڵکــو بڵــێ: مــادام قســەکانمان پێچەوانــەی یەکدییــن، یەکێکــمان ڕوو بــە ڕۆژهــەڵات دەڕوات و، یەکێکــمان ڕوو بــە ڕۆژئــاوا، یەکێکــمان ڕوو بەســەرەو، یەکێکــمان ڕوو بــە خــوار، حەتمــەن هــەر یەکێکــمان ڕاســتین، ئنجــا وەرن بــا لێــی بکۆڵینــەوە، کاممانــە؟!

﴿ قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾،{ئــەی موحەممــەد ﷺ! یــان ئــەی کەســێك کــە قورئــان دەخوێنــێ! بــە بەرانبەرەکانــت} بڵــێ: ئێــوە لــە بــارەی ئــەو تاوانانــەوە کــە ئێمــە دەیانکەیــن، لێتــان ناپــرسرێ و، ئێمــەش لــە بــارەی کردەوەکانــی ئێــوەوە لێــمان ناپرسرێتــەوە، ئێمــە تاوانــی خۆمــان بــۆ خۆمــان و، ئێــوەش کــردەوەی خۆتــان بــۆ خۆتــان، هــی خــۆی بــە تــاوان (جريمــة) نــاو بــردوە،

هی ئەوانیش بە کردەوە (عمل)، بۆ ئەوەی ئەیانورووژێنێ، ئەگەرنا لە ڕاستییدا ئەوەی ئەوان کردوویانە، کە لە کوفرو شیرکەوە سەرچاوەی گرتوە، ئەگەر دزیی بووە، ئەگەر زوڵم بووە، ئەگەر مەیخۆریی بووە، ئەگەر زینا بووە، ئەگەر ڕێگریی بووە، هی ئەوان تاوان بووە، بەڵام ئیمان سەرچاوەیەکی هێندە پاك و چاکە، ئاوی زوڵاڵ و شیرینی کردەوە چاکەکان نەبێ، لێی هەڵناقوڵێ، وەك: نوێژو خواپەرستیی و، ڕۆژوو و، چاکە و ماڵ بەخشین و، دادگەریی و ئینساف و، ڕەوشتی جوان و، پەیوەندیی خزمایەتیی و، ڕێزو حورمەت، ﴿ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ﴾، بڵێ: پەروەردگارمان کۆمان دەکاتەوە (لە قیامەتدا) ﴿ ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا ﴾، دوایی دادوەرییمان لە نێواندا دەکات (بە هەق و ڕاستیی) ﴿ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، ئەو زۆر لێك جیاکەرەوەیەکی زانایە، زۆر دادوەرێکی زانایە.

لە کۆتاییی دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرُونِيَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ﴾، بڵێ: پێشانم بدەن ئەوانەی وەك هاوبەش، بە خواتانەوە پەیوەستکردوون، ﴿ كَلَّا ﴾، نەخێر، خوا ﷻ هیچ هاوبەشی نین، ﴿ بَلْ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، بەڵکو ئەو خوای زاڵی کارزانە، ئنجا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴾، تۆشمان نەناردوە، مەگەر بۆ تێکڕای خەڵکی موژدەدەرو ترسێنەر بی، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، واتە: ئەو ڕاستییە نازانن کە تۆ وەك موژدە دەرو دڵخۆشکەرو، وەك ترسێنەرو ورياکەرەوە، بۆ هەموويان ڕەوانە کراوی، ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، دەشڵێن: ئەو بەڵێنە کەیە، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن؟! بەڵێنی هاتنی ئاخیر زەمان، یاخود بەڵێنی هاتنی قیامەت و زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوە، ﴿ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴾، بڵێ: بەڵێنی ڕۆژێکتان بۆ هەیە، کە نە سەعاتێك (ماوەیەکی کەم) لێی دوا دەکەون و، نەلێی پێش دەکەون و، ڕێك لە کاتی خۆیدا دێ، نە پێشتر و نە دواتر.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**پشتڕاستکردنەوەی خوا بۆ گومانی خراپی ئیبلیس، لە بارەی مرۆڤەکانەوە، کە هەموویان گومڕا دەکات، جگە لە کەمێك و، ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییەش کە ئیبلیس دەستەڵاتی بەسەریاندا نەبوو، کە بە زۆر گومڕایان بکات، بەڵام خوا توانای پێدابوو، ئەوانەی کە ئارەزوومەندی گومڕایین، ئیبلیس بتوانێ گومڕایان بکات، بە مەبەستی لێك هەڵاواردنیان، واتە: خوا ﷻ توانای گومڕاکردنی ئەو مرۆڤانەی کە خۆیان عەودالی گومڕایین بە ئیبلیسی دابوو، بە مەبەستی ئەوە کە ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیە، جیابنەوە، لەوانەی لێی دوو دڵن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْءَاخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِى شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ ﴾، بە دڵنیایی ئیبلیس گومانی خۆی لە بارەیانەوە ڕاست دەرچواند، (صَدَّقَ: أي حَقَّقَ)، واتە: ئیبلیس گومانێکی پێبرد بوون و، گومانەکەی ڕاست دەرچوو لە بارەیانەوە، کە بریتی بوو: لەوەی هەموویان گومڕا دەکات، جگە لە کەمێك، گومانەکەشی ڕاست دەرچوو.

وشەی: ﴿ صَدَّقَ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (صَدَقَ)، واتە: بە دڵنیایی ئیبلیس لە گومانیدا لە بارەیانەوە ڕاستیکرد، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (**وَلَقَد صدَّق عَلَيهِم إبليسَ ظَنُّهُ**)، واتە: گومانی ئیبلیس، ئیبلیسی بە ڕاست دانا، واتە: گومانەکەی، ئەوی وەڕاست گێڕا.

ئنجا ئەگەر بخوێندرێتەوە: (وَلَقَدْ صَدَقَ عَلَيهِم إبلِيسُ ظَنَّهُ)، بە دارِێنینی ژێردارکەر، یانی: (أي: صَدَقَ فِي ظَنِّهِ)، یانی: (بِنَزْعِ الخَافِضْ: أَصَابَ فِي ظَنِّهِ)، ئیبلیس لە گومانەکەیدا، پێکای لە بارەیانەوە، کەواتە: ئەم ڕستەیە، بەم سێ شێوەیە خوێنراوەتەوە:

١- ﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ ﴾، واتە: ئیبلیس گومانی خۆی لە بارەیانەوە، ڕاست دەرچواند.

٢- (وَلَقَد صَدَقَ عَلَيهِم إبْلِيسُ ظَنَّهُ)، واتە: ئیبلیس ڕاستیکرد، لە گومانەکەیدا، لە بارەیانەوە.

٣- (وَلَقَد صَدَقَ عَلَيهِمْ إبلِيسَ ظَنُّهُ)، واتە: گومانەکەی ئیبلیس، ئیبلیسی بە ڕاست دانا، واتە: ئیبلیسی بە ڕاست گێڕا.

کە هەرسێکیان واتایەکەیان ئەوەیە: ئەو گومانەی ئیبلیس پێی بردبوون، ڕاست دەرچوو.

ئایا گومانەکە بریتیە لە چی؟ لە چەند شوێنێکی قورئاندا، ئەوە هاتوە:

١- لە سوورەتی (الإسراء)دا کە ئیبلیس گوتی: ﴿ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ ﴾، بەدڵنیایی وەچەکەی هەموو ڕیشەکێش و بنبڕ دەکەم جگە لە کەمێکیان.

٢- لە سوورەتی (ص)دا ئیبلیس گوتی: ﴿ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾، واتە: بێگومان هەموویان سەرگەردان دەکەم، جگە لە بەندە ساغەکانت، ﴿ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، واتە: ساغبووەوەکان، یان (المُخْلِصِين)، واتە: خۆساغکەرەوەکان، هەردووك خوێندنەوەکەی هاتوون.

٣- لە سوورەتی (الأعراف)دا کە ئیبلیس گوتی: ﴿ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ ﴾، زۆربەیانت سوپاسگوزار چنگ ناکەوێ، هەروەها لە چەند شوێنێکی دیکەشدا، ئیبلیس ئەو قسانەی کردوون، خواش دەفەرموێ: ئەو گومانەی بە مرۆڤەکانی بردبوو، ئیبلیس لە گومانەکەیدا ڕاستیکردو، گومانەکەی لە بارەیانەوە ڕاست دەرچواند.

٢)- ﴿ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، هەموویان شوێنی کەوتن، جگە لە کۆمەڵێك لە بڕواداران، کە دەفەرموێ: ﴿ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، هەر دیارە (فَرِيْقاً) کەمێکە لە زۆرێك، واتە: کەمێك، کەمینەیەك لە بڕواداران نەبێت، ئەوانی دیکە هەموویان شوێنی کەوتن.

٣)- ﴿ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَٰنٍ ﴾، دەستەڵاتیشی بەسەریان دا نەبوو، ئەمە وەڵامی پرسیارێکی سەرسامکەرە لە هەندێك عەقڵ و مێشکاندا: ئایا ئیبلیس کە گومانی پێبردبوون و کە گومانەکەشی ڕاست دەرچوو، لەبەر ئەوە بوو کە دەیتوانی ناچاریان بکات لەسەر گومڕایی؟ وەڵامەکەی ئەوەیە، دەفەرموێ: دەستەڵاتیشی بەسەریاندا نەبوو، (أَي: لَمْ يَكُنْ لَهُ عَلَيْهِمْ مِنْ تَسْلِيْطٍ واسِتيْلَاءٍ بِالْوَسْوَسَةِ وَالإِسْتِغْوَاء)، واتە: نەیدەتوانی بەهۆی دەست بەسەرداگرتن و بە هۆی خوتخوتە بۆ کردن و گومڕاکردنەوە، بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆی.

٤)- ﴿ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْأَخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِى شَكٍّ ﴾، دەستەڵاتی بە سەریان دا نەبوو، مەگەر بۆ ئەوەی بزانین کێ بڕوای بە دواڕۆژە (و جیابێتەوە) لەو کەسەی لە بارەیەوە لە دوودڵیی دایە. یانی: ئێمە تەنها توانای ئەوەمان پێدابوو، ئەوانەیان کە بە ویستی خۆیان دەیانەوێ گومڕابن، ئیبلیسیش بتوانێ لەگەڵ خۆی دا پەلکێشیان بکات، ئەوەش بۆ ئەوەی بزانین: کێ بڕوای بە ڕۆژی دوایی هەیە، جیابێتەوە لەوانەی کە لە بارەی ڕۆژی دواییەوە لە دوو دڵییدان.

مانایەکەی ئاوایە: (أَي: لَمْ يَكُنْ لَهُ عَلَيْهِمْ مِنْ تَسَلُّطٍ إِلاَّ لِغَرَضٍ صَحِيْحٍ، وَلِحِكْمَةٍ بَيِّنَةٍ، وَهِيَ لِنَعْلَمَ مَنْ يُؤْمِنُ بِالآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ)، واتە: دەستەڵاتی بەسەریاندا نەبوو، مەگەر بۆ مەبەستێکی باش و حیکمەتێکی ڕوون کە بریتی بوو، لەوەی پاك و پیسیان لێك جیابکەینەوە، ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دواییە، بیانزانین و جیایان بکەینەوە لەوانەی لەبارەیەوە لە دوو دڵییدان، ئەگەرنا، ئەگەر خوا ﷻ ویستبای وەك چۆن شەیتان زەفەر بە فریشتەکان نابات، زەفەری بە مرۆڤەکانیش نەدەبرد، بەڵام بۆیە توانای زەفەر بردنی ئیبلیسی بە مرۆڤەکان

داوە، نەك ناچاریان بكات، بەڵكو بە ویستی ئازادانەی خۆیان شوێنی بكەون، وەك لە سووڕەتی (إبراهیم)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِي فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ﴿٢٢﴾﴾، واتە: من هیچ دەسەڵاتێكم بەسەرتاندا نەبوو، جگە لەوەی بانگم كردن، ئێوەش وەڵامتان دامەوە، سەر كۆنەی من مەكەن و سەركۆنەی خۆتان بكەن.

ئنجا ئەو توانایەی خوا بە ئیبلیسی داوە، لە بەرانبەر جند و مرۆڤ دا، كە بتوانێ گومڕایان بكات، بە پێچەوانەی فریشتەكانەوە، كە دەسەڵاتی بەسەریانەوە نیە، بۆ ئەوەیەو حیكمەتەكەی ئەوەیە، كە بڕوادارو بێبڕوا، لە ڕۆژی دوایی دا لێك جیا ببنەوە.

كە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا لِنَعْلَمَ﴾، دەڵێ: (العِلْمُ المُسْتَقْبَل المُعَلَّلُ بِهِ هُنَا، لَيْسَ هُوَ العِلْمُ الأزَلِيُّ القَائِمٌ بِالذَاتِ المُقَدَّسِ، بَلْ تَعَلُّقُه بِالمَعْلُوم فِي عَالَمِ الشَّهَادَةِ الَّذِي يَتَرَتَّبُ عَلَيْهِ الجَزَاءُ بِالثَّوَابِ وَالعِقَابِ، فَالمَعْنَى مَا سَلَّطْنَاهُ عَلَيْهِمْ، إلَّا لِيَبْرُزَ مَنْ كُمُونِ الغَيْبِ مَا عَلِمْنَاهُ، أو إلاَّ لِنَجْزِيَ عَلَى الإيْمَانِ وَضِدِّه)[1].

واتە: ئەو زانیارییەی بە داهاتوو، وەك هۆكار هێنراوەتەوە، {تاكو بزانین} ئەمە بریتی نیە لەو زانیارییە ئەزەلییەی خوا ﷻ كە هەمیشە لەگەڵ زاتی پاكی خوادایە، بەڵكو ئەو زانیارییە، زانیارییەكی پەیوەستە بە جیهانی بینراوەوە، كە بەپێی ئەو زانیارییە، سزاو پاداشت دێنە سەر كردەوەكان، واتاكەی ئاوای لێدێتەوە: ئیبلیسمان بەسەردا زاڵ نەكردن، كە بتوانێ گومڕایان بكات، مەگەر بۆ ئەوە، كە ئەوەی زانیومانە بە زانیاریی ئەزەلیی خۆمان لە دنیای بینراودا، بۆ مرۆڤەكان دەربكەوێ، یاخود بۆ ئەوەی لە سەر ئیمان و كوفر، ئێمە پاداشت و سزای مرۆڤەكان بدەین.

٥)- ﴿وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ﴾ پەروەردگاریشت پارێزەری هەموو شتێكەو، بەسەر هەموو شتێكەوە چاودێرو ئاگادارە.

---

(١) محاسن التأويل: ج١٤، ص١٨-١٩.

**مەسەلەی دووەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە بە هاوبەشدانەرەکان بفەرموێ: هاوبەشە خەیاڵییەکانیان کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، بانگ بکەن، کە نە هیچیان لە ئاسمانەکان و زەوییدا بە دەستەو، نە هاوبەشیان هەیەو، نە خوا کۆمەککارێکی لە نێویاندا هەیەو، نە هیچ تکاکردنیشیان لە لای خوا هەیە، مەگەر ئەوەی خوا مۆڵەتی بدات لە فریشتان، یان خوا مۆڵەتی بدات تکای بۆ بکرێ، فریشتەکانیش کە تکا دەکەن، ئەوانیش دوای ترس و بیم لێ لابرانیان، لە فەرمانی خوا دەپرسن؟ ئنجا وەڵامیان دەدرێتەوە، کە خوا هەقی فەرمووە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە: لە نۆ بڕگەدا:**

١)- ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، {ئەی موحەممەد! ﷺ بە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان} بڵێ: ئەوانەی پێتان وایە لە جیاتی خوا، لەگەڵ خوا پەرستراون و، هاوبەشیان دەکەن لە پەرستندا، بانگیان بکەن، لێیان بپاڕێنەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، واتە: (زَعَمْتُمُوهُمْ أَرْبَابًا، أو زَعَمْتُمُوهُمْ آلِهَةً)، واتە: پێتان وایە پەروەردگارن، یان پێتان وایە پەرستراون، کە دەفەرموێ: ﴿ مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، واتە: جگە لە خوا ﷻ، (أي: مِنْ نَاحِيَةِ غَيْرِ الله) لەلایەن جگە لە خواوە.

٢)- ﴿ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، خاوەنی تۆزقاڵێك نین، خاوەنی گرانایی گەردێك نین، نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەوییدا، خاوەنی هیچ شتێك نین.

(**المِثْقَالُ: مَصْدَرٌ مِيمِيٌّ سُمِّيَ بِهِ الشَّيْءُ الَّذِي بِهِ التَّثْقِيلُ، ثُمَّ أُطْلِقَ عَلَى العَدِيلِ مَجَازاً**)، (**مِثْقَال**)، چاوگێکی میمییە، ئەو شتەی کە شتی پێ قورس دەکرێ، یان شتی پێ هەڵدەسەنگێنرێ، ئەوەی پێ ناو نراوە، دوایی بۆ هەر شتێك کە هاوتای شتێك بێت، بە کارهێنراوە، چونکە (**المِثْقَالُ: آلَةُ الثُّقْلِ أو اسْمُ لِمَا يُوزَنُ بِه**)، واتە: (**مثقال**) ئامرازی قورسیی و گرانییە، یاخود ناوە بۆ ئەو شتەی شتی پێ هەڵدەسەنگێنرێ.

وشەی: (**ذَرَّة**) بە هێلکەی مێروولە دەگوترێ، کە هێلکەیەکی سپیی زۆر وردە، یاخود بەو تۆز گەردە دەگوترێ کە لە پەنجەرەوە دەبینرێ، کاتێ تیشکی خۆر دێتە ژوورێ، واتە: تۆزقاڵێك.

٣)- ﴿وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ﴾، {نەك هەر خاوەنی تۆزقاڵێك شت نین، لە ئاسمانەکان و زەوییدا} بەڵکو هیچ بەش و پشکێکیان لە ئاسمانەکان و زەوییدا نیە.

چونکە جاری وایە ئینسان دەبێتە خاوەنی شتێکی سەربەخۆو، جاری وایە خاوەنی سەربەخۆ نیە، بەڵام پشکی تێدا هەیە، بەڵام تەنانەت ئەوانە پشك و بەشیشیان نیە، (**لَيْسَت لَهُم شَرَاكَةٌ، وَلَا مُشَارَكَةٌ فِي شَيء**)،هیچ جۆرە هاوبەشیی و پشکدارییەکیان لە هیچ شتێك دا نیە.

٤)- ﴿وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ﴾، هەروەها (خوا ﷻ) لە نێو ئەواندا هیچ هاوکارێکی نیە، (**ظَهِيرٌ: أَيْ مُعِينٌ**)، وەك چۆن خوا ﷻ هەندێك لە کارو بارەکانی بە فریشتان سپاردوون، ئەو پەرستراوانەی ئێوەش، ئەگەر شەیتانن، ئەگەر مرۆڤن، ئەگەر مردوون، ئەگەر زیندوون، هەرچییەکن، خوا ﷻ هیچ هاوکارێکی نیە لە نێویاندا نیەو، هیچ پێیان نەسپاردوە.

٥)- ﴿وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾، تکاکردنیش لە لای خوا سوودی نیە، مەگەر بۆ کەسێك مۆڵەتی دابێ، تکای بۆ بکرێ، واتە: ئەوانەی ئێوە دەیانپەرستن، مافی تکاکردنیشیان نیە، لە لای خواو، تکا کردنیش سوود بە کەس ناگەیەنێ لە لای خوا ﷻ، مەگەر تکاکردنی کەسێك بۆ کەسێك، کە خوا مۆڵەتی دابێ، تکای بۆ بکرێ، وەك

لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ ﴿٢٨﴾﴾الأنبياء، واتە: فریشتەکانیش تکا ناکەن، مەگەر بۆ کەسێك کە خوا پەسندی کردبێ، تکای بۆ بکرێ.

ئەمە وێڕای ئەوەی خوێندراوەتەوە: ﴿إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾، خوێندراویشەتەوە: (إلاّ لِمَنْ أُذِنَ لَهُ)، مەگەر کەسێك مۆڵەت درابێ، تکای بۆ بکرێ.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾، ئەمە دوو واتایان هەڵدەگرێ:

١- تکاکردن لە لای خوا ﷻ سوودی نیە، مەگەر بۆ کەسێك خوا مۆڵەتی دابێ، تکا بکات، (أي: لِمَنْ أَذِنَ لَهُ مِنْ الشَّافِعِين).

٢- تکاکردن لەلای خوا سوودی نیە، مەگەر بۆ کەسێك خوا مۆڵەتی دابێ، تکای بۆ بکرێ، (أي: أذِن لَه مِنَ المَشْفُوعِيْن)، بۆ تکا بۆ کراوان.

بەڵام ئەوەی دووەمیان لەگەڵ ئەم سیاقەدا دەگونجێ، چونکە باسی سوود بەخشینی تکاکردن لە لای خوا دەکات، بێگومانیش بابای شەفاعەت بۆ کراو سوودی پێ دەگات و بەهرەی وەردەگرێ، نەك بابای تکاکار.

٦)- ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ﴾، هەتا کاتێك ترسیان لە دڵ ڕەوێنرایەوە، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (فَزَّعَ عَنْ قُلُوبِهِم)، ترسی لە دڵدا ڕەواندنەوە، واتە: خوا ترسی لە دڵی فریشتەکان دا ڕەواندەوە.

٧)- ﴿قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ﴾، گوتیان: پەروەردگارتان چی فەرموو؟.

٨)- ﴿قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ﴾، {دیارە پرسیارکەرەکان جیان، لە وەڵامدەرەوەکان} هەندێکیان وەڵامیان دایەوە، گوتیان: خوا هەقی فەرموو، ڕاستیی فەرموو.

٩)- ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ﴾، بەس خواش بەرزی گەورەیە.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ﴾، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان، لە بارەی ئەم ئایەتەوە زۆر ڕاجیایی و مشتومڕیان کردوە، بەڵام هەندێکیان ئەمەیان بەستۆتەوە بەوەی پێشەوەو، دەڵێن:

(**التَّقْدِيرُ: إِلاَّ لِمَنْ أَذِنَ لَهُ، وَيَوْمَئِذٍ يَبْقَى النَّاسُ مرتَقِبِينَ الإِذْنَ لِمَنْ يَشْفَعُ، فَزِعِينَ مِن أَن لَا يُؤْذَنَ لأَحَدٍ، زَمَناً يَنتَهِي بِوَقْتِ زَوَالِ الفَزَعِ عَن قُلُوبِهِمْ، حِيْنَ يُؤْذَنُ لِلشَّافِعِيْنَ بِأَن يَشْفَعُوا**)، بەوێوە پەیوەست دەبێتەوە، واتە: تکاکردن سوودی نیە، مەگەر بۆ کەسێ کە خوا مۆڵەتی دابێ و، ئەو کاتە کە ڕۆژی دواییە، خەڵك لە چاوەڕوانییدا دەمێننەوە، ئایا مۆڵەتی کێ دەدرێ، تکا بکات؟ بە ترس و لەرزەوە خەڵك دەمێننەوە، نەوەك مۆڵەتی هیچ کەس نەدرێ تکا بکات، دوایی بەوە ترسیان لە دڵ دەڕەوێتەوە، کە کاتێك مۆڵەت دەدرێ، بە هەندێ لە تکا کەرەکان، تکا بکەن.

ئەو کاتە دەپرسن: پەروەردگارتان چی فەرموو؟ هەندێکی دیکە، وەڵام دەدەنەوە دەڵێن: پەروەردگارمان هەقی فەرموو، ڕاستیی فەرموو، ئەو هەتا بڵێی بەرزەو گەورەیە، بەرزیی و گەورەییەك کە هەر شایستەی خۆیەتی.

یەکێك بۆی هەیە، بڵێ: ئەو ترسە چۆن لە دڵیان دەڕەوێتەوە؟ دەڵێ: (**التَّفْزِيعُ يَحْصُلُ لَهُم بانكِشافٍ إِجْمَالِي يُلْهَمُونَهُ، فَيَعْلَمُونَ بِأَنَّ اللهَ أَذِنَ بِالشَّفَاعَةِ، ثُمَّ يَتَطَلَّبُون التَّفْصِيلَ بِقَولِهِمْ، قَالُوا: مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا: الحَقَّ**)، ئەو ترس لە دڵ ڕەوێندرانەوەی فریشتەکان، بەوە بۆیان پەیدا دەبێ کە وەك ئیلهامێك پێیان دەگوترێ و دەزانن خوا مۆڵەتی داوە، شەفاعەت بکرێ، دواتر داوا دەکەن، کە زیاتر بۆیان ڕوون بێتەوە، دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرمووی؟ دەڵێن: هەقی فەرموو.

ئنجا ئایا ئەوەی گوتوویەتی: (**مَاذَا قَالَ رَبُّكُم**) کێیە؟ زانایان سێ ئەگەریان بۆ داناون:

١- هەندێکیان گوتوویانە: تاوانبارەکان دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرمووی؟

٢- هەندێك دەڵێن: نەخێر بەڵکو تکا بۆ کراوەکان (**المَشْفوعون**) دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرمووی؟

٣- هەندێکیشیان دەڵێن: فریشتەکان بە گشتیی بە فریشتەکانی سەرەوەی خۆیان، کە لە خوا نزیکترن (المُقَرَّبِيْن) دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرمووو؟

کە ئەوەی سێیەمیان زیاتر لەگەڵ سیاقی ئایەتەکان دا دەگونجێ، چونکە تاوانبارەکان لەو ڕۆژەدا، نایانپەرژێتە سەر ئەوەی بڵێن: پەروەردگارتان چی فەرمووەو، گوێبیستی فەرمایشتی پەروەردگاریش نابن، هەروەها تکا بۆ کراوەکانیش بە دەردی خۆیانەوە سەرقاڵن، بەڵام وا پێدەچێ ئەوە وتووێژو مشتومڕی نێوان فریشتەکان بێ، وەك لەم فەرمایشتەی پێغەمبەرەوە ﷺ دەردەکەوێ، کە ئێمە دوو ڕیوایەتی ئەو فەرمایشتە دێنین:

یەك: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَضَى اللَّهُ الْأَمْرَ فِي السَّمَاءِ ضَرَبَتِ الْمَلَائِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ، كَأَنَّهُ سِلْسِلَةٌ عَلَى صَفْوَانٍ فَإِذَا: ﴿ فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴾ وَالشَّيَاطِينُ بَعْضُهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ} (أخرجه البخاري: ٤٧٠، وأبو داود: ٣١٨٩، والترمذي: ٣٢٢٣، وابن ماجه: ١٩٤، وابن حبان: ٣٦، والحميدي: ١١٥١).

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێك خوا ﷻ بڕیارێك دەر دەکات، لە ئاسمان (لە گەردووندا) فریشتەکان، وەك ملکەچیی بۆ فەرمانی خوا، باڵەکانیان لێك دەدەن، وەك زنجیرێك کە فڕێدەدرێتە سەر تاتە بەردێکی سپیی لووس (چۆن دەنگی دێ، ئاوا دەنگیان دێ) کاتێك ترسیان لە دڵ لا دەدرێ، دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرمووو؟ ئەوانی دیکە کە لێیان دەپرسرێ، دەڵێن: هەقی فەرموو، ئەو بەرزی گەورەیە، شەیتانەکانیش هەندێکیان لە سەرووی هەندێکیانەوەن {واتە: لە سەر یەك کەڵەکە بوون}.

کەواتە: ئەمە مەبەست پێی ئێستایەو، مەبەست پێی هەر کاتێکە کە خوا فەرمایشت بکات، نەك مەبەست پێی قیامەت بێ.

دوو: {عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُوحِيَ بِالْأَمْرِ تَكَلَّمَ بِالْوَحْيِ، أَخَذَتِ السَّمَاوَاتِ مِنْهُ رَجْفَةٌ، أَوْ رِعْدَةٌ شَدِيدَةٌ، خَوْفًا مِنَ اللَّهِ تَعَالَى، فَإِذَا سَمِعَ

أَهْلُ السَّمَاوَاتِ ذَٰلِكَ، صَعِقُوا وَخَرُّوا لِلَّهِ تَعَالَىٰ سُجَّدًا، فَيَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يَرْفَعُ رَأْسَهُ جِبْرِيلُ، فَيُكَلِّمُهُ اللَّهُ تَعَالَىٰ، وَيَقُولُ لَهُ: مِنْ وَحْيِهِ مَا أَرَادَ، ثُمَّ يَمُرُّ جِبْرِيلُ بِالْمَلَائِكَةِ، كُلَّمَا مَرَّ بِسَمَاءٍ، سَأَلَهُ مَلَائِكَتُهَا مَاذَا قَالَ رَبُّنَا يَا جِبْرِيلُ؟ فَيَقُولُ: جِبْرِيلُ: قَالَ الْحَقَّ، وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ قَالَ: فَيَقُولُ كُلُّهُمْ كَمَا قَالَ جِبْرِيلُ: فَيَنْتَهِي جِبْرِيلُ بِالْوَحْيِ حَيْثُ أَمَرَهُ اللَّهُ تَعَالَىٰ)[1].

ئەمــە بەڕاســتیی تیشــکی باشــتر دەخاتــە ســەر چەمــك و واتــای ئــەو ئایەتــە موبارەکــە.

واتــە: نــەوواسی کــوڕی ســەمعان ﷺ، دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرمــووی: خــوای بــەرز هــەر کاتێــك ویســتی کارێــك سروش بــکات، (واتــە: کارێــك لــە ڕێــی وەحییــەوە بنێــرێ)، وەحیــی دەفەرمــوێ و، ئاســمانەکان بەهــۆی وەحیــی فەرموونــی خــواوە، لەرزینەوەیــەك، یــان داچەڵەکانێکــی تونــد دەیانگــرێ لــە ترســی خــوای بــەرز، کاتێــك خەڵکــی ئاســمانەکان ئــەوە دەبیســتن، ئەوانیــش دادەچەڵکێــن، یاخــود بێهــۆش دەبــن و، بــە کڕنووشــدا دەکــەون بــۆ خــوای بــەرز، یەکەمیــن کــەس کــە ســەر بــەرز دەکاتــەوە، جیبریلــە کــە خــوای بــەرز دەیدوێنــێ و، لــەوەی لــە وەحیــی خــۆی کــە دەیــەوێ پێــی ڕادەگەیەنــێ، ئنجــا جیبریــل بــە لای فریشــتەکاندا دەڕوات، هــەر کاتێــك جیبریــل بــە ئاســمانێکدا دەڕواو، فریشــتەکانی ئــەو ئاســمانە لێــی دەپرســن، ئــەی جیبریــل! پەروەردگارمــان چــی فەرمــوو؟ جیبریلیــش دەڵــێ: هەقــی فەرمــوو، ئــەو بــەرزی گەورەیــە، ئنجــا هەموویــان ئــەوەی جیبریــل فەرموویەتــی، دووبــارەی دەکەنــەوە، تاکــو جیبریــل وەحییەکــە دێنــێ، بــۆ ئــەو شــوێنەی کــە خــوای بــەرز فەرمانــی پێکــردوە.

واتــە: بــۆ ئــەو پێغەمبــەرە ﷺ، کەواتــە: ئەمــە تایبەتــی دەکاتــەوە، بــەو کاتــەوە کــە خــوا ﷻ وەحیــی بــۆ پێغەمبــەران (عَلَيْهِـم الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام) ڕەوان کــردوە.

---

(١) أخرجه الطبراني في الشاميين: ٥٩١، والبيهقي في الأسماء والصفات: ٤٢٣.

**مەسەلەی سێیەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی کە پرسیاریان لێ بکات، لە بێبڕوایەکان، لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، لە نا مسوڵمانەکان بە گشتیی، کێ لە ئاسمانەکان و زەوییەوە بژیویان دەدات؟ بێگومان وەڵامەکەی ئاشکرایە، کە تەنیا خوایە، پاشان ڕێنمایی کردنی خوا ﷻ بۆ نەرمترین و جوانترین شێوازی وتووێژ، کە بریتیە لە هەڵبژاردنی وشەو تەعبیری دڵگیرو بە نەزاکەت و، دروستکردنی پردی خۆشەویستیی و ڕێزو متمانەو، سەرەنجامیش ڕاگەیاندنی هەقی ڕوون و ڕاشکاو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿قُلۡ مَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُلِ ٱللَّهُۖ وَإِنَّآ أَوۡ إِيَّاكُمۡ لَعَلَىٰ هُدًى أَوۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٢٤﴾ قُل لَّا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّآ أَجۡرَمۡنَا وَلَا نُسۡـَٔلُ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلۡ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفۡتَحُ بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ وَهُوَ ٱلۡفَتَّاحُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٢٦﴾ قُلۡ أَرُونِيَ ٱلَّذِينَ أَلۡحَقۡتُم بِهِۦ شُرَكَآءَۖ كَلَّاۚ بَلۡ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿قُلۡ مَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، لێیان بپرسە: کێ لە ئاسمانەکان و زەوییەوە بژیوتان دەدات؟ (رِزق) هەر شتێکە کە دروستکراوەکان پێی بژین، یان پێی بەڕێوە بچن، چ شتی ماددیی و، چ شتی مەعنەویی، بژیوی ئاسمان بەرهەستی هەیەو، نابەرهەستی هەیە، بەرهەستەکەی: وەک تیشکی خۆر، هەروەها ئاوێك کە لە ئاسمانەوە دادەبارێ، نابەرهەستەکەشی: وەک وەحیی خواو، ئیلهامی فریشتەکان کە بۆ مرۆڤی مسوڵمان و جندی مسوڵمان، دێ، بژیوی زەویش بریتیە لە: جۆرەکانی ڕووەك و ئاژەڵ و کانزایەکان و ئەوشتانەی خوا لە زەوی دا دایناون، بۆ بەڕێوەچوونی ژیانی مرۆڤەکان، بڵێ: کێ بژیوتان دەدات لە ئاسمانەکان و لە زەوییەوە؟

٢)- ﴿قُلِ ٱللَّهُ﴾ بڵێ: خوا، هەر بۆ خۆت، وەڵام بدەوەو، چونکە ئەم پرسیارە تەنیا ئەم وەڵامەی هەیە، وەڵامی ڕاست و دروست.

٣)- ﴿ وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، {پێیان بڵێ:} ئێمە یان ئێوە لەسەر ڕێنماییین، یاخود لە گومڕاییەکی ئاشکرا داین، ئەمە لە: {زانیاریی باس و وتووێژ} (علم البَحْث وَالمُنَاظَرَة)دا، پێی دەگوترێ: (إرْخَاءُ العِنَانِ وَالكَلَامُ المُنْصِف)، واتە: ڕست درێژکردن بۆ لایەنی بەرانبەرو قسەی بە ویژدانانە لەگەڵدا کردنی، کە بریتیە لەوەی مرۆڤ شەڕە قسەی توند نەکات، لەگەڵ بەرانبەرەکەی دا، کە هۆکاری ئەوە بێ، تووڕە و پەست بێ و مکووڕ بێ، لەسەر قسەکانی خۆی.

بەدڵنیاییی پێغەمبەر ﷺ دڵنیا بووە، کە بۆ خۆی لەسەر هەقەو، ئەوان لەسەر ناهەقن، بەڵام خوا ﷻ پێی دەفەرموێ، پێیان بفەرموو: ئێمە یان ئێوە لەسەر ڕێنماییین، یاخود لە گومڕاییداین، ئنجا وشەی ﴿ هُدًى ﴾ ی لەگەڵ ﴿ علی ﴾، داهێناوە: ﴿ لَعَلَىٰ هُدًى ﴾، چونکە کەسێك کە لەسەر ڕێی ڕاست بێت، وەك ئەوەیە سواری وڵاخێك بووبێت، بە ڕێك و ڕاستیی دەڕوا، بەڵام گومڕایی (ضلال) ی لەگەڵ ﴿ فِى ﴾، داهێناوە: ﴿ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، چونکە کەسێك ڕێی چەوت بگرێ، وەك ئەوە وایە کە کەوتبێتە چاڵێکەوە، یان زەلکاوێکەوە.

٤)- ﴿ قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا ﴾ {دیسان بفەرموو:} ئێوە پرسیارتان لێ ناکرێ، لە بارەی ئەو تاوانبارییەی کردوومانە، واتە: ئەو تاوانانەی ئێمە لە ڕابردوودا، کردوومانن، ئێوە لێیان بەرپرسیار نین.

٥)- ﴿ وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، ئێمەش لە بارەی ئەو کردەوانەی ئێوە دەیانکەن، لێمان ناپرسرێتەوە، هی خۆی بە (جُرْم) ناوبردوە، هی وان بە (عَمَل)، هەروەها هی خۆی بە کرداری ڕابردوو هێناوە، ﴿ عَمَّآ أَجْرَمْنَا ﴾، ئەو تاوانانەی کردوومانن، بەڵام هی ئەوانی بە کرداری ئێستا هێناوە (فِعْل المُضَارع) ﴿ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، ئەو کردەوانەی دەیانکەن، ئێستاو دوایی دەیکەن.

٦)- ﴿ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ﴾، بڵێ: پەروەردگارم کۆمان دەکاتەوە.

٧)- ﴿ ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ ﴾، دوایی بە هەق دادوەرییمان لە نێواندا دەکات.

٨)- ﴿ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، ئەوە (خوا ﷻ) دادوەرێکی زۆر زانایە، **(القَاضِي العَلِيْمُ بِالْقَضَاءِ بَيْنَ خَلْقِه)**، خوا دادوەرێکی زانایە، بە چۆنیەتیی دادوەرییکردن لە نێوان دروستکراوەکانیدا، هەروەك خوا ﷻ لە ئایەتی (٨٩)ی **(الأعراف)**دا دەفەرموێ: ﴿ رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ ﴾، واتە: پەروەردگارمان! لە نێوان ئێمەو خەڵکەکەماندا، بە هەق دادوەرییمان لە نێواندا بکەو، تۆ باشترین لێك جیاکەرەوەی دادوەری، کە هەق و ناهەق لێك جیا دەکاتەوە.

٩)- ﴿ قُلْ أَرُونِيَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ﴾، بڵێ: پێشانم بدەن، ئەوانەی بە خواتانەوە پەیوەستتان کردوون، وەك هاوبەش.

١٠)- ﴿ كَلَّا بَلْ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، نەخێر ڕاست نیە، (خوا هاوبەشی نین)، بەڵکو ئەو خوای زاڵی کارزانە.

**(أَرُونِي مُسْتَعْمَلٌ فِي التَّعْجِيْزِ، وَالإِرَاءَةُ هُنَا بَصَرِيَّةٌ، أي: أَرُونِي شُخُوصَهُمْ لِنُبْصِرَ: هَلْ عَلَيْهَا مَا يُنَاسِبُ صِفَةَ الإِلَهِيَّة)**، لێرەدا وشەی **(أَرُونِي)** بەکارهێنراوە لە دەستەوسانکردن داو، مەبەست لە **(أَرُونِي)** {پێشانم بدەن} پێشاندانی چاوییە، واتە: پەیکەرەکانیان و، جەستەکانیانمان پێشان بدەن، تاکو بزانین و تەماشا بکەین: ئایا ئەوانە هیچ سیفەتی پەرستراوێتییان لەسەرەو، دەگونجێ بە پەرستراو دابنرێن؟

کە دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا بَلْ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، نەخێر وانیە کە ئێوە گومانتان بردوە، بەڵکو ئەو خوای زاڵی کارزانە، زاڵە، واتە: باڵادەستەو، پێویستیی بە هاوبەشان نیەو، کارزانیشە، واتە: هەموو کارەکانی بەوپەڕی حیکمەت ئەنجام دەدا، دەڵێ: **(العِزَّةُ: الإِسْتِغْنَاءُ عَنِ الغَيْرِ فَلَا يَحْتَاجُ غَيْرَهُ)**، **(عِزَّة)**: بریتیە لە بێ نیازیی لە غەیری خۆی، پێویستیی بە جگە لە خۆی نیە، تاکو بیانکاتە هاوبەش، **(الحِكْمَةُ: الإِحْكَامُ وَالإِتْقَانُ فِي الأُمُورِ، فَلَا نَقْصَ فِي خَلْقِهِ وَأَمْرِهِ)**، **(حِكْمَة)**: بریتیە لە ئەوپەڕی وەستایی و دانایی و وردەکاریی لە کاروباریداو، کەم و کوڕیی نیە، لە کارەکەیدا نیە، تاکو پێویستیی بە هاوبەشان بکات.

لێرەدا با قسەیەکی شەوکانیی بێنین، لە تەفسیرەکەی دا[1]، دەڵێ:

(وَفِي إِسْنَادِ الْجُرْمِ إِلَى الْمُسْلِمِينَ، وَنِسْبَةِ مُطْلَقِ الْعَمَلِ إِلَى الْمُخَاطَبِينَ، مَعَ كَوْنِ أَعْمَالِ الْمُسْلِمِينَ مِنَ الْبِرِّ الْخَالِصِ، وَالطَّاعَةِ الْمَحْضَةِ، وَأَعْمَالِ الْكُفَّارِ مِنَ الْمَعْصِيَةِ الْبَيِّنَةِ، وَالْإِثْمِ الْوَاضِحِ، مِنَ الْإِنْصَافِ مَا لَا يُقَادَرُ قَدْرُهُ، وَالْمَقْصُودُ: الْمُهَادَنَةُ وَالْمُتَارَكَةُ، وَقَدْ نُسِخَتْ هَذِهِ الْآيَةُ، وَأَمْثَالُهَا بِآيَةِ السَّيْفِ).

واتە: لێرەدا کە تاوان پاڵدراوەتە لای مسوڵمانان و، کردەوەی ڕەها دراوەتە پاڵ دوێنراوەکان کە نامسوڵمانەکانن، لەگەڵ ئەوەشدا کە کردەوەی مسوڵمانان چاکەی ساغەو، فەرمانبەریی ڕووتە، بەڵام کردەوەی کافرەکان، گوناهو سەرپێچیی و تاوانی ئاشکرایە، ئەوە ئینصاف و ویژدانێکی زۆری تێدایە، کە ئەندازەکەی نازانرێ، مەبەست لێرەدا بریتیە لە: وازلێهێنان کە واز لە یەکدی بهێنرێ، بەڵام ئەم ئایەتەو هاو وێنەکانی، بە ئایەتی شمشێر نەسخ کراونەوە.

دیارە مەبەستی لە ئایەتی شمشێر ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (التوبة)یە:
﴿ فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾،

کە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (التوبة)دا، کە لە بەرگی هەشتەمی ئەم تەفسیرە کوردییەماندا هاتوە، بە درێژیی لەو بارەوە قسەمان کردوە.

لە ڕاستییدا جێی داخە، کە لێرەدا شەوکانیی، هەروەها زۆر لە زانایان، ئەو ئایەتە موبارەکە بە ئایەتی (السَّيْفِ)، شمشێر، ناو دەبەن، لە حاڵێکدا کە وشەی (السَّيْفِ) نەك لە ئایەتی ژمارە پێنجی سوورەتی (التوبة)دا، بەڵکو لە هیچ کام لە ئایەتەکانی قورئاندا، وشەی (شمشێر) هەر نەهاتوە، بەس وشەی چەکەکان (أسلحة) هاتوە، لەوێدا باسمان کردوە، کە ئەم ئایەتە هیچ ئایەتێکی نەسخ

---

(١) فتحُ القدير: ج٤، ص٣٩٥.

نەکردۆتەوە، چونکە ئایەتی ژمارە پێنج لە سوورەتی (التوبة)، باسی جەنگ کردن لە دژی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەران دەکات، کە خاوەن پەیمان بوون لەگەڵ مسوڵماناندا، بەڵام دوایی پەیمانەکەیان شکاندوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: سزایان بدەن، هەتا یان پابەند دەبن بە پەیمانەکەیانەوە، یاخود دێنە نێو ئیسلامەوە، یانی: ئەوانەی پەیمانیان شکاندوە، بەڵام ئەوانەی پابەندن بە پەیمانەکەیانەوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾، واتە: پەیمانەکەیان تاکو ئەو کاتەی بەستراوە، تاکو کاتی دیارییکراو، پەیمانەکەیان لەگەڵدا تەواو بکەن، چونکە خوا ﷻ پارێزکارانی خۆش دەوێن، ئەوانەی پەیمان لەگەڵ ئەهلی کوفریش دەپارێزن، ئەوانە پارێزکارن.

## کورتە باسێک لە بارەی
## شێوازی بانگەوازەوە: لە دە خاڵاندا

۱)- لەسەرەتادا دەڵێم: سوپاس بۆ خوا ئێمە کتێبێکمان لەوبارەوە نووسیوە بە ناوی: (بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن)، کە بە درێژیی لەو بارەوە دواوین، ئەو کتێبەش دەبێتە یەکێك لە کتێب و ئاڵقەکانی مەوسووعەی، یان زنجیرەی: (مسوڵمانینە! با باشتر تێبگەین و پێبگەین)[1]، کە لە ژێر چاپەو، خوا پشتیوان بێ، زۆری پێ ناچێ بەر دیدی خوێنەرانی بەڕێز دەکەوێ، ئێمە لەوێدا قسەی تێرو تەسەلمان کردوە، لە بارەی بانگەواز، شێوازی بانگەواز، بانگەوازکاران ، ڕەوشتی بانگەوازکاران، شێوازەکانی بانگەواز، ئامڕازەکانی بانگەواز، ڕێبازی، بانگەواز... لەوێدا قسەی تێرو تەسەلی خۆمانمان کردوە.

۲)- دەبێ بزانین مرۆڤ تەنیا عەقڵ نیە، هەروەك تەنیا دڵ و عاتیفەش نیەو، مەگەر چۆن، ئەگەرنا هەموو کەس خۆی بە سەنتەر دادەنێ و، ڕێزلێگرتنی دەخاتە پێش هەموو شتێکی دیکەوە، هەر بۆیەش پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە وشەی (يا قَوْمِي)، ئەی گەلەکەم! خەڵکیان دواندوەو، پێغەمبەری خاتەم ﷺ سەر مەشقی ئێمەیە، لەوەدا کە ئەوپەڕی نەزاکەت و حورمەت و ڕێزی بەرانبەر بە بەرانبەرەکانی بەکارهێناوە، کە دواندوونی، لە حاڵێکدا کە ئەوان نەفامییان کردوە، ئەو خۆی شلوێ نەکردوە، هەر پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ وانەبووە، هەرچەندە ئەو لە لووتکەدا بووە، بەڵکو هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کاتێك سەیری شێوەی وتووێژو دواندن و گفتوگۆیان دەکەی، لەگەڵ گەلەکانیاندا، وەك دەریایەك وابوون بە هیچ شلوێ نەبوون، هەرچەندە بەرانبەرەکانیان پێیان گوتوون: شێتن، پێیان گوتوون: جادووگەرن، پێیان گوتوون: دەتانەوێ خۆتان فەرز بکەن و، پێیان گوتوون: درۆ دەکەن، بەڵام ئەوان ئەو وشانەیان بۆ بەرانبەرەکەیان بە کارنەهێناون، لە حاڵێکدا بەرانبەرەکانیان شایستەی ئەو شتانە

---

(۱) دوایی ناوەکەیمان گۆڕی بۆ: (بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن).

بوون، بەس گوتوویانە: نەخێر ئێمە درۆ ناکەین، ئێمە دڵسۆزتانین، ئێمە ئەمیندارین بۆتان، ئێمە بە ئەنگتانەوەین، ئێمە پەرۆشی ئێوەمانە!

٣)- لە کاتی قسەکردندا، پێویستە مرۆڤ خۆی بە ڕەوشت و بەها بەرزەکان برازێنێتەوە، ئەوە زۆر زۆر گرنگەو، لە ڕاستییدا ڕەوشت و ئاکاری بەرز لەو بوارەدا، یەکجار کاریگەرییەکی گەورەی هەیە، کە بەشێك لە ڕەوشت و بەهای بەرز، بریتیە لە: تەعبیری جوان و بە ئەزاکەت، بریتیە لە: هەڵبژاردنی وشەی جوان، بریتیە لە: شێوازی مامەڵەی جوان و خۆپاراستن لە هەر تەعبیرو هەڵس و کەوتێکی ناشیرین، بۆ وێنە: پێنەکەنین بە قسەی بەرانبەر با هەڵەش بێ، یاخود لێو لێ هەڵنەقرچاندنی، یاخود بەکارنەهێنانی هیچ ئاماژەیەك، هیچ دەست ڕاوەشاندنێك، هیچ شتێك کە ببێتە مایەی بێزاریی و دڵ ڕەنجاندنی بەرانبەر، بەڵێ شێوازی بەرزو، ڕەوشتی بەرز، لە وتووێژدا کلیلی زۆر ئیشکالانە.

٤)- پێویستە مرۆڤ کە بەرانبەرەکانی دەدوێنێ، متمانەو باوەڕی بە قسەی خۆی هەبێ و، لە دڵێکی پڕ بە بەزەیی و پەرۆشەوە، قسە بۆ خەڵك بکات، نەك شەیتان زەفەری پێ بەرێ و لە ئەنجامی تووڕەبووندا، دڵی کینە و ڕق و بوغزی بچێتێ، ئەو کاتە قسەکانی کاریگەریان نابێ، چونکە زۆر ڕاستە گوتراوە: دڵ ئاوێنەی دڵە، بەڵێ جاری وایە بەرانبەرەکە عینادیی و سەرکێشیی و سەرەخەریی دەیگرێ، بەڵام دەبێ هەر کەسە لە قەدەر بەرنامەو پەیامی خۆی بێ و، پەیامی خوا، جگە لە شێوازی بەرزو، جگە لە سینگ فراوانیی و سەماحەت و ئینصاف، هیچی دیکەی شایستە نیە.

٥)- پێویستە ئامانج، هەق دۆزینەوەو گەیشتن بە ڕاستیی بێ، نەك زاڵبوون و بێ قسەکردنی بەرانبەر، ئامانجی ئەوە نەبێ بەرانبەرەکەی بێ قسە بکات و، زاری بکاتە تەڵەی تەقیو، بەڵکو ئامانجی ئەوە بێ، کە بەرانبەرەکەی هەق بدۆزێتەوەو پەی بە هەق ببات.

٦)- پێویستە بە هەموو جۆرێك خۆی بپارێزێ، لە بە کەمگرتنی بەرانبەرو، بەکارهێنانی وشەو تەعبیری بریندارکەر، وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، ڕێزگرتن لە بەرانبەرو، پاراستنی هەست و نەستی، زۆر کاریگەریی هەیە، لەوەدا کە ئەویش باشتر گوێ بگرێ.

٧)- بەڕێزو حورمەتەوە لێوەرگرتنی قسەی هەق و، سوپاسکردنی لەسەر قسەی هەق و ڕاست، واتە: کاتێك مرۆڤ قسە لەگەڵ کەسێك دا دەکات، کاتێك ئەو قسە دەکات، دەبێ چەندەی هەقە، لێی وەربگرێ، نەك کاتێ کە ئەو قسە دەکات، تۆ تەنها بیر لەوە بکەیەوە، چۆن بەرپەرچی قسەکانی بدەیەوە، ڕاست بن یان ناڕاست بن! کە بە داخەوە زۆر کەس بەو شێوەیە مامەڵە دەکات، کە بێگومان شێوازێکی خراپە، بەڵکو پێویستە بەرانبەرەکەت ئەو هەقەی پێیەتی وەربگری و، بڵێی ئەوە هەقە، بەڵام ئەوەیان تێبینییم لە سەری هەیە، مەرجیش نیە بڵێی تۆ غەڵەتی، بڵێ: تێبینییم لەسەر ئەو قسەیەت هەیە، با لێی بکۆڵینەوە.

٨)- حاڵیی کردنی بەرانبەر کە دڵسۆزو بە پەرۆشە بۆی و، سوودو بەرژەوەندیی ئەوی مەبەستە، پێویستە ئەو کەسە کە وتووێژ دەکات لەگەڵ کەسێکدا، ئنجا ئەگەر ئەو کەسە مسوڵمانێکی ڕێ لێ تێك چوویە، ئەگەر نامسوڵمانێکە، ئەگەر مولحیدێکە، حاڵیی بکات و تێی بگەیەنی کە دڵسۆزو بە پەرۆشە بۆی و، سوودو بەرژەوەندیی ئەوی دەوێ، نەك پێی وابێ کە مەبەستی ئەوەیە هەر بیهێنێتە سەر قسەی خۆی، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە، کە ئەو بەهرەمەند بکات.

٩)- دەمارگیرنەبوون بۆ ڕاوبۆچوونی خۆو، بوار هێشتنەوە بۆ بەرانبەر، وەك ئەو بنچینە زێڕینەی شافیعیی، کە زۆر جوان، دەڵێ: (**قَوْلِي صَوَابٌ يَحْتَمِل الخَطَأ، وَقَوْلُ غَيْرِي خَطَأٌ يَحْتَمِل الصَّوَاب**)، واتە: قسەی خۆم پێ ڕاستە، دەگونجێ هەڵە بێ، قسەی بەرانبەرەکەم پێ هەڵەیە، دەگونجێ ڕاست بێ، ئەوە بنچینەیەکی زێڕینە، لەو شتانەدا کە دەگونجێ ڕاست بن و دەگونجێ هەڵە بن، بەڵام بۆ ئایەتی خوا، ناڵێی ئەو ئایەتە دەگونجێ ڕاست بێ و دەگونجێ هەڵە بێ، نا، چونکە هەقی موتڵەق لە لای خواوەیە، بەڵام لەو شتانەدا کە بواری تێدا هەیە، مرۆڤ بیپێکی یان نەیپێکێ، پێویستە بەو شێوەیە مامەڵە بکات، لەگەڵ شتە ڕاجیایی هەڵگرەکاندا.

١٠)- ئیقناعکردنی بەرانبەرو سەرنجڕاکێشانی هونەرەو، وەستایی و، کارامەیی و لێزانیی دەوێ، بەڵام دڵ ڕەنجاندن و خەڵك تاراندن و تۆراندن، هیچ هونەرو ئازایەتیی ناوێ،

وەك جاری دیکەش باسم کردوە، جارێ مامۆستایەك ئێستا بەرەو ڕەحمەتی خوا چووە، ئامۆژگاریی منی دەکرد، کە تازە دەگەیشتمێ، خەڵکم بانگ دەکردو، وتوویژم لەگەڵ خەڵك دا دەکرد، گوتی: فڵانکەس خەڵك بۆ لای خوا بانگکردن و خەڵك ئیقناعکردن، وەك ڕاو کردن وایە، کەسێك کە بیەوێ ئەو نێچیرە ڕاو بکات، دەبێ دێوجامەی بۆ لەبەر بکات، جاری وایە دەبێ تەڵەی بۆ دابنێ، دانی بۆ ڕۆ بکات، داوی بۆ دابنێ، بە ئەسپایی و بە شێنەیی، پارێزی بۆ بەرێ، بەڵام ئەگەر بتەوێ باڵندەکە، یان نێچیرەکە، بڕەوێنی و بتۆرێنێ و بفڕێنی، بەردێکیان تێگرە لە دوور ڕا، بۆ خۆیان دەفڕن، یان نێچیرەکە دەڕواو تەواو! بەڵێ لە ڕاستییدا خەڵك واوە هێنان بۆ لای خواو، خەڵك ئیقناعکردن هونەرەو، لێزانیی و کارامەیی پێویستە.

**مەسەلەی چوارەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا ﷻ موحەممەدی ﷺ وەك پێغەمبەرێکی مـوژدەدەرو ترسێنەر بۆ هەموو خەڵکی ناردوە، بۆ هەموو مرۆڤایەتیی:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:**

**١)- ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ ﴾، تۆمان نەناردوە، مەگەر بۆ تێکڕای خەڵك.**

**وشەی: ﴿ كَآفَّةً ﴾، بە دوو واتایان لێکدراوەتەوە:**

**أ- (كافة) (أي: عَامَّةً)، تۆ بە گشتیی بۆ هەموو خەڵکی نێردراوی.**

**ب- ﴿ كَآفَّةً ﴾، بە مانای (كَافّ)ە، بەرپەرچدەرەوە، (أي: كَافّاً للنَّاسِ تَكُفُّهُمْ عَمَّا هُمْ فِيْهِ مِنَ الكُفْرِ وَتَدْعُوْهُمْ إلى الإسْلَامِ)، (كَفَّهُ، يَكُفُّه)، (كَفّ) لە (لە پی دەست)ە هاتووە، ئەگەر تۆ بتەوێ کەسێك بیگێڕیەوە، لەپەدەستی بە سینگەوە دەنێی، ئنجا (كَافَّة)، واتە: تۆ گێڕەرەوەی خەڵکی، دەیانگێڕیەوە لەوەی کە لە سەرنی، لە کوفرو خراپەو، بانگیان دەکەی بۆ ئیسلام، کەواتە: لێرەدا: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ ﴾، واتە: (إلاَّ إرْسَالَةً كَافَّةً)، مەگەر ناردنێکی گێڕەرەوە، خەڵك بگێڕیەوە لە کوفرو خراپەو، بانگیان بکەی بۆ ئیسلام، بەڵام زۆربەی زاانایان وشەی: ﴿ كَآفَّةً ﴾، یان هەر بەتێکڕا، هەموو (عَامَّة، جَمَاعَة)، لێکداوەتەوە، (الزجاج) گوتوویەتی: (جَامِعاً للنَّاسِ بِالإِنْذَار)، خەڵکی کۆبکەیەوە بە هۆی وشیارکردنەوەیانەوە.**

**٢)- ﴿ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴾، موژدەدەرو ترسێنەر بی، کە دەفەرمووێ: ﴿ بَشِيرًا ﴾، واتە: هەم موژدەیان پێ بدەی و، دڵیان خۆشبکەی، ئەگەر ڕێی ڕاست بگرن، کە لە دنیادا بەختەوەر دەبن و، لە دواڕۆژیش دا بەمرادگەیشتوو و سەرفراز دەبن و، بە ڕەزامەندیی**

خوا ﷻ شاد دەبن، ﴿ وَنَذِيرًا ﴾، هەروەها بیانترسێنی و وریایان بکەیەوە، بە نسبەت ژیانی دنیاوە، کە ژیانێکی تاڵ و خراپیان دەبێ، ئەگەر لە پەیامی خوا لامل بن، هەم بە نسبەت ڕۆژی دواییەوە، کە تووشی سزای خوا ﷻ دەبن، ئەگەر لە ئایینی خواو ڕێبازی پێغەمبەری خوا لا بدەن.

٣)- ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن:

أ- زۆربەی خەڵك نازانن کە تۆ دڵخۆشکەرو ترسێنەری بۆیان، ئەگەر بە دوای تۆ بکەون، بەدڵنیایی بەهرەمەند دەبن لەو موژدەیەو، پارێزراو دەبن لەو هەڕەشەو ترساندنە، بەڵام ئەگەر لابدەن، بێبەش دەبن لەو موژدەیەو، تووشی ئەوەش دەبن، کە تۆ هەڕەشەیان پێی لێ دەکەی و ئەوانی پێ دەترسێنی.

ب- یاخود: زۆربەی خەڵك قەدری ئەو موژدەدان و ترساندنە نازانن.

ج- یاخود (لَا يَعْلَمُونَ صِدْقَ الْبَشَارَةِ وَالنِّذَارَةِ)، زۆربەیان نازانن کە ئەو موژدە پێدان و دڵخۆشکردن و، ترساندن و وریاکردنەوەیە، ڕاستە.

د- یاخود: زۆربەی خەڵکی هەق نازانن، بۆیە گوتراوە: (عَلَيْكَ بِطَرِيْقِ الحَقِّ، وَلَا تَسْتَوْحِش مِنْ قِلَّةِ السَّالِكِيْن، وإياك وطريق الباطل، وَلَا تغترَّ بِكَثْرَةِ الهَالِكِيْن)، واتە: ڕێی هەق بگرەو هەست بە غەریبی مەکە کە ڕێبوارانی کەمن و، خۆت لە ڕێی ناهەق و پووچ دوور بگرە و فریو مەخۆ، بەوەی کە زۆر کەس لە ڕێی ناهەق دا فەوتاون.

(الطبري): ئەم ئایەتەی ئاوا لێکداوەتەوە، دەڵێ: (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ يَا مُحَمَّدُ إِلَى هَؤُلَاءِ الْمُشْرِكِينَ بِاللَّهِ مِنْ قَوْمِكَ خَاصَّةً، وَلَكِنَّا أَرْسَلْنَاكَ كَافَّةً لِلنَّاسِ أَجْمَعِينَ، الْعَرَبَ مِنْهُمْ وَالْعَجَمِ، وَالْأَحْمَرَ وَالْأَسْوَدِ، بَشِيرًا مَنْ أَطَاعَكَ، وَنَذِيرًا مَنْ كَذَّبَكَ)[1].

واتە: تۆمان نەناردوە ئەی موحەممەد! ﷺ بۆ لای ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، لە گەلەکەت بە تایبەت، بەڵکو تۆمان ناردوە بۆ تێکڕای خەڵکی: عەرەب و عەجەم و، سوورو ڕەش، ئەوانەیان کە فەرمانبەریی دەکەن، موژدەیان پێ بدەی و، ئەوانەش کە بە درۆت دادەنێن، بیانترسێنی.

---

(١) جامع البيان: ج٢٢، ص١٠٢.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**پرسیارکردنی نکوولّیلێکەرانەی کافران، لە بارەی هاتنی بەڵێنی خواوەو، وەڵامدرانەوەیان کە لە بەڵێنگە پاش و پێش ناکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە: لە سێ بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، هەروەها دەڵێن: {بە سیاق دەزانرێ کە بێبڕوایەکانن} ئەو بەڵێنە، کەنگێیە ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن؟ واتە: لە چ کاتێکدا دێ، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، لەوەدا کە بەڵێنمان پێ دەدەن؟

٢)- ﴿ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ ﴾، پێیان بڵێ: بەڵێنی ڕۆژێکتان بۆ هەیە، واتە: ڕۆژێکی مەزن کە وەسف ناکرێ، (**التَّنْكِيْرُ للتَهْوِيْلِ**)، بەڵێنی ڕۆژێکتان بۆ دانراوە، (**المِيْعَادُ مَصْدَرٌ مِيْمِيٌ لِلْوَعْدِ، فَإضَافَتُهُ إلى ظَرْفِهِ بَيَانِيَّةٌ**)، ﴿ مِّيعَادُ ﴾، چاوگی میمییە بۆ وەعد، یانی: بەڵێنی ڕۆژێك، ئنجا کە پاڵدراوەتە لای ڕۆژەکە، ئەم پاڵدرانە بۆ ڕوونکردنەوەیە.

٣)- ﴿ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴾، ئێوە سەعاتێك لێی دواناکەون و لێشی پێش ناکەون، واتە: ئەو بەڵێنە، ئێوە نە لێی دوادەکەون و نە لێشی پێش دەکەون، بە ڕێکیی لەو کاتەدا کە خوا دیارییکردوە، بەڵێنەکە دێ، وشەی: ﴿ سَاعَةً ﴾، (**السَّاعَةُ حِصَّةٌ مِنَ الزَّمَنْ**)، (**ساعة**) بەشێکە لە کات، بە زۆرییش بۆ کاتێکی کەم و کورت بەکاردێ، بەڵام بەشێك بوونی (**ساعة**) لە بیست و چوار بەشی شەوو ڕۆژێك، ئەوە مانایەکی باوو عورفییە.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴾، (**أي: لَا تَؤَخَّرُوْنَ للتَّوْبَةِ وَالإعْتِذَار، وَلَا تُقَدَّمُونَ لاسْتِعْجَالِ العَذَاب**)، نە دوادەخرێن بۆ ئەوەی تۆبە

بکەن و پۆزش بێننەوەو، نە پێشیش دەخرێن، پەلە بکرێ لە سزادانتاندا، بەڵکو رێك لە کاتی خۆیدا، ئەو کاتەی دیاریکراوە، دێ، بە پێی سیستمێك کە خوا ﷻ بۆ کارەکانی داینـاوە.

کۆتایی ئەم دەرسەش بەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین:

**{أُعْطِيتُ خَمْساً لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي، بُعِثْتُ إِلَى أَحْمَرَ وَأَسْوَدَ، وَجُعِلَتْ لِي الأَرْضُ مَسْجِداً وَطَهُوراً، وَأُحِلَّتْ لِيَ الغَنَائِمُ، وَلَمْ تُحَلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، فَادَّخَرْتُهَا لِأُمَّتِي يَوْمَ القِيَامَةِ، فَهِيَ نَائِلَةٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى لِمَنْ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا} (أخرجه البخاري: ٣٢٨، ومسلم: ٥٢١، وغيرهما).**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پێنج شتم پێدراون، نەدراون بە هیچ کەس لە پێش مندا، (نەدراون بە پێغەمبەران):

١)- رەوانە کراوم بۆ لای سپی و رەش، یان سوورو رەش {واتە: بۆ لای عەرەب و عەجەم، یان بۆ لای هەموو مرۆڤەکان بە هەموو رەنگەکانیانەوە}.

٢)- سەر زەمینم بۆ کراوە بە مزگەوت و بە پاك {پێشتر دەبوو تەنیا لە پەرستگاکانی خۆیاندا پەرستش بکەن، خاوەن بەرنامەکانی دیکەی کە پێغەمبەران هێناویانن، بەڵام بۆ ئەهلی ئیسلام دەفەرموێ: لە هەر شوێنێك کاتی نوێژ بوو، بۆت هەیە، مادام رووی زەوی پاکەو، بۆت هەیە بیکەی بە شوێنی خوا پەرستیی لێکردن}.

٣)- دەستکەوتەکانی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراون {کە پێشتر بۆ کەس حەڵاڵ نەکراون و دەستکەوتی جەنگیی رەوا نەبووە بەکاربهێنرێ، یان خۆیان سووتاندوویانە، یان ئاگرێك لە ئاسمانەوە سووتاندوویەتی و رەوا نەبووە بەکاربهێنرێ}.

٤)- ماوەی مانگە رێیەك ترسم بۆ خراوەتە دڵی دوژمنەوە {لە کاتێکدا لەگەڵم رووبەڕوو دەبنەوە}.

٥)- تکاکردنم پێدراوەو، هەڵمگرتوە بۆ ئوممەتەکەم بۆ رۆژی قیامەت {تکاکردنی گشتیی} ئەگەر خوا حەز بکات، ئەو تکاکردنەم، هەموو کەس دەگرێتەوە کە هیچ

شتێك بە هاوبەش بۆ خوا دانەنێ. {هەر کەسە بە پێی خۆی، ئەوەی ئیماندار بێ و، ئیمانی چاك بووبێ و، کردەوەی باشی بووبێ، خوا بە هۆی شەفاعەتی پێغەمبەرەوە ﷺ پلەی بۆ بەرز دەکاتەوە، ئەوەش کە شایستەی سزادان بووبێ، سزای لەسەر سووك دەکرێ، یان هەر سزایەکەی لەسەر هەڵدەگیرێ}.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە نۆ (٩) ئایەت پێک دێ، ئایەتەکانی: (٣١ - ٣٩)، تەوەری سەرەکیی ئەو نۆ ئایەتە، باسی هەڵوێستی نەرێنیی و خراپی بێبڕوایانی کەللەڕەق، لە بارەی قورئان و پەیامی خوادایە، پاشان مشت ومڕی نێوان چەوسێنراوانی لاساییکەرەوەو خۆ بە زلگرانی خۆسەپێن و ملهوڕ لە قیامەتدا، کە هەر کامیان خەتا لە ملی ئەوی دیکە دەکات و، خۆی بەریی دەکات.

دوایی هەڵوێستی حوکمڕانە خۆسەپێن و خۆ بەزلزانەکان و، خۆشگوزەرانەکان خراوەتە ڕوو لە بەرانبەر پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە هاتوون، بۆ هۆشیار کردنەوەو ترساندنی خەڵک و ڕاچەڵەکاندنیان و، بوغڕابوونی ئەو حوکمڕانە خۆسەپێن و خۆ بەزلزانانە، بە ماڵ و سامان و منداڵیان و، بەرپەرچدانەوەی خوای زانا و کارزان بۆ ئەو خەیاڵپڵاوەیان کە گوایە خوا خۆشی دەوێن، وەک چۆن لە دنیادا بەهرەمەندی کردوون، لە قیامەتیشدا هەروا دەبن و تووشی سزاو جەزرەبەی خوا نابن!! دواتر سەرەنجامی هەر کام لە بڕواداران و، بێبڕوایان و پاداشت و سزای دادگەرانەیان لە لایەن خوای کارزانی دادگەرەوە، خراوتە ڕوو.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ
ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ
ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لِلَّذِينَ
ٱسْتُضْعِفُوٓا۟ أَنَحْنُ صَدَدْنَٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ
ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ
لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ هَلْ

يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ
أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾ قُلْ
إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ
أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا
عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ
مُحْضَرُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ وَمَآ أَنفَقْتُم
مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها ئەوانەی بێبڕوا بوون (بەو شتانەی پێویست بوو بڕوایان پێ بێنن)، گوتیان: هەرگیز نە بڕوا بەم قورئانە دێنین و، نە بەوەش کە لە پێش ویەوە بوون (لە کتێبەکان و پێغەمبەران)و، ئەگەر بشبینی کاتێک ستەمکاران لە لای پەروەردگاریان وەستێنراون (دیمەنێکی ڕاچڵەکێن دەبینی) پێکەوە شەڕە قسە دەکەن (هەر کامێکیان ئەوی دیکە تۆمەتبار دەکات)، ئەوانەی بێهێز کراون بەوانە دەڵێن کە خۆیان بە زلگرتوە: ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئێمە بڕوادار دەبووین ﴿٣١﴾ ئەوانەش کە خۆیان بەزلگرتوە بەوانەیان گوت کە بێهێز کراون: ئایا ئێمە ئێوەمان لە ڕاستە ڕێ (هیدایەت) لادا، دوای ئەوەی بۆتان هات؟ (ڕاست نیە)، بەڵکو خۆتان تاوانبار بوون (بە لە ڕاستە ڕێ لاتاندان)، ﴿٣٢﴾ ئەوانەش کە بێهێز کرابوون بەوانەیان گوت کە خۆیان بە زلگرتبوو: (لە حوکمڕانە خۆسەپێنەکان) بەڵکو پیلانگێڕیی شەوو ڕۆژتان لە دژمان {هۆکاری لادانمان بوو} کاتێک فەرمانتان پێدەکردین، بێبڕوابین بە خواو هاوتایانی بۆ دابنێین! کاتێکیش ئازاری دۆزەخیان بینی {بێهێز کراوان و خۆسەپێنان} پەشێمانییان پەنهانکردو (ئێمەش) کۆت و

زنجیرەكانمان خستنە گەردنی ئەوانەوە كە بێبڕوابوون، ئایا تەنیا بە گوێرەی ئەوەی كردوویانە سزا نادرێن؟ ﴿٣٣﴾ هیچ ترسێنەرو ورياكەرەوەيەكيشمان لە هیچ ئاوەدانییەكدا نەناردوە، مەگەر (حوكمڕانە) خۆشگوزەرانەكانی گوتوویانە: ئێمە بێبڕوایین بەو (پەیام)ەی پێی ڕەوانە كراون ﴿٣٤﴾ هەروەها حوكمڕانە خۆشگوزەرانە بێبڕوایەكان، گوتیان: ئێمە ماڵ و سامان و ڕۆڵەمان (لە ئێوە) پترەو، ئێمە (لە ڕۆژی دواییدا) لە سزادراوان نابین ﴿٣٥﴾ بڵێ: (وەك خەیاڵتان كردوە وانیە)، بێگومان پەروەردگارم بۆ هەر كەسێكی بوێ، بژێو زۆرو فراوان دەكات و (بۆ هەر كەسێكشیی بوێ)، بژێو كەم و بەرتەسك دەكاتەوە، بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن (كە فراوانكردن و كەمكردنی بژێو، نیشانەی ڕێزلێگرتن و بوغزاندنی خوا نیە بۆ مرۆڤەكان) ﴿٣٦﴾ بە دڵنیاییش سامان و ڕۆڵەكانتان هۆكاری ئەوە نین، بە نیزیكخستنەوە لە ئێمەتان نیزیك بخەنەوە، جگە لەو كەسەی بڕوابێنێ و كردەوەی باش بكات (ئەوانە سامان و ڕۆڵەكانیان دەكەنە هۆكاری لێ نیزیك بوونەوەمان و) ئەوانە بە هۆی ئەوەوە كە كردوویانە (لە كاری چاكە) پاداشتیان چەند قاتەو، لە كۆشكەكان(ی بەهەشت)دا هێمن و بێ ترس و بیمن ﴿٣٧﴾ ئەوانەش كە بە خەیاڵی خۆیان دەستەوسانكەرانە دژایەتیی ئایەتەكانمان دەكەن، ئەوانە لە ئازاری دۆزەخدا ئامادە دەكرێن ﴿٣٨﴾ بڵێ: بێگومان پەروەردگارم بۆ هەر كەسێكی بوێ لە بەندەكانی، بژێوی بۆ زۆرو فراوان دەكات و (بۆ هەر كەسێكیشی بوێ) بۆی بەرتەسك دەكات و، هەر شتێكیش (لە ڕێی خوادا) ببەخشن ئەو (خوا) شوێنی پڕ دەكاتەوەو، ئەو چاكترینی بژێودەرانە ﴿٣٩﴾).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(صَدَدۡنَٰكُمۡ): (أي: صَرَفْنَاكُـمْ أو مَنَعْنَاكُـمْ)، واتـە: ئێوەمـان لادا، یـان پێشـگیرییمان لـە ئێـوە کـرد، (الصَّدُّ والصُّـدُودُ: الإنْـصِرَافُ وَالإمْتِنَـاعُ عَـنِ الـشَّيء، أو الـصَّرْفُ وَالمَنْـعُ)، وشـەی (صَدّ وَصُدُود) بریتیـە لـە: لادان لـە شـتێك، لاملیـی کـردن لێـی، یاخـود لادانـی خەڵـك و پێشـگیریی کردنـی خەڵـك لێـی، واتـە: وشـەی (صَدُّ) هـەم بـە (لَازِم) دێ، واتـە: خـۆی لایـداو، هـەم بـە (مُتَعَـدِي) دێ، واتـە: خەڵکـی دیکـەی لادا.

(مَكۡرُ): (المَكْـرُ: صَرْفُ الغَـيْرِ عَـمَّا يَقْصِـدُهُ بِحِيلَـةٍ)، ﴿مَكۡرُ﴾، (مَكْـر): بریتیـە لـە لادانـی خەڵـك لـەوەی دەیانـەوێ، بـە فێـڵ و پیلانێـك.

(أَندَادٗا): (نِـدُّ الـشَّيءِ: مُشَـارِكُهُ فِي جَوْهَـرِهِ، فَـكُلُّ نِـدٌّ مِثْـلٌ، وَلَيْـسَ كُلُّ مِثْـلٍ نِـدّاً)، (نِـدّ) ی هـەر شـتێك، (هَـذَا نِـدُّ هَـذَا)، ئەوەیـە هاوبەشـی بـێ لـە ئێـوەڕۆك و چییەتـی دا، بۆیـە هەمـوو (نِدّ)ێـك بـە (مِثْـل) دادەنـرێ، بـەڵام هەمـوو (مِثْل)ێـك، بـە (نِـدّ) دانانـرێ، چونکـە (مِثْـل) ئەوەیـە لـە شـتێك لـە شـتەکاندا، وەك ئـەو بـێ، بـەڵام (نِـدّ) ئەوەیـە لـە جەوهـەرو چییەتـی دا، وەك ئـەو بـێ، (نِـدّ: هاوتـا)، (مِثْـل: وێنـە).

(وَأَسَرُّواْ): واتـە: پەنهانیـان کـرد، (الإِسْرَارُ: خِلَافُ الإِعْلَانِ، أَسَرُّوا النَّدَامَـةَ: كَتَمُوهَا، وَقِيْلَ أَظْهَرُوهَـا)، ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ﴾، واتـە: پەشـێمانییان پەنهانکـرد، چونکـە (إسْرَار)یانـی: پەنهانکـردن، پێچەوانـەی (إعْـلَانِ)ە، واتـە: دەرخسـتن، کەواتـە: ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ﴾، واتـە: پەشـێمانییان پەنهـان کـرد، هەندێکیـش گوتوویانـە: وشـەی: ﴿وَأَسَرُّواْ﴾، لـەو جـۆرە وشـانەیە، کـە دوو مانـای دژی یەکـدی دەگەیەنـێ و، بەپێـی سـیاق دەزانـرێ کامیـان مەبەسـتە؟ وەك (عَسْـعَسَ)، ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ١٧﴾التكویـر، (عَسْـعَس) بـە مانـای: هـات (أَقْبَـلَ)و، بـە مانـای: ڕۆیـی (أَدْبَرَ)یـش دێ، لێـرەش: ﴿وَأَسَرُّواْ﴾، یـانی: (أَظْهَـرُوا النَّدَامَـةَ)، پەشـێمانییان دەرخسـت، بـەڵام ڕای یەکـەم ڕاسـترە، کـە بـە مانـای پەنهانکـردن دێ.

(ٱلنَّدَامَةَ): (النَّدْمُ وَالنَّدَامَةُ: التَّحَسُّرُ مِنْ تَغَيُّرِ رَأيٍ فِي أمْرٍ فائِتٍ)، (نَدْم ونَدَامَة): بریتیە لە خەفەتبار بوون بە هۆی ئەوەوە شتێك كە تێپەڕ بووە، مرۆڤ ڕای لە بەرانبەردا بگۆڕێ، كە بە ڕاستی نەزانیبێ و ئێستا بۆی دەركەوێ، كە بە ڕاست نەزانینەكەی هەڵە بووەو، ئەو شتە ڕاست بووە.

(ٱلْأَغْلَـٰلَ): (الغُلُّ: مُخْتَصٌّ بِمَا يُقَيَّدُ بِهِ فَتَجْعَلُ الأَعْضَاءُ فِي وَسْطِهِ)، (أَغْلاَل) كۆی (غُلّ)ە، تایبەتە بەوەوە كە لە گەردنی مرۆڤ دەكرێ، ئنجا ئەو ئەندامانە دەخرێنە نێوی، هەڵبەتە ئەو لێرەدا مەبەستی ئەوەیە: وشەی (غُلّ) مەرج نیە، تەنیا بۆ گەردن بەكاربێ، هەرچەندە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَـٰقِهِمْ أَغْلَـٰلًا ﴿٨﴾﴾یس، واتە: ئێمە كۆت (غُلّ)ەكامان خستۆتە گەردنیانەوە، بەڵام وا پێدەچێ كۆت بخرێتە غەیری گەردنیشەوە، بەڵام ئەو ئەندامە دەخرێتە نێوی و، ئەوی لێك وێ دەهێنرێتەوەو دادەخرێ.

(مُتْرَفُوهَآ): (التُّرْفَةُ: التَّوَسُّعُ فِي النِّعْمَةِ: أُتْرِفَ فُلَانٌ فَهُوَ مُتْرَفٌ)، (تُرْفَة): بریتیە لە فراوانیی لە نازو نیعمەتدا، دەگوترێ: (أُتْرِفَ فُلَانٌ فَهُوَ مُتْرَفٌ)، فڵانكەس ئیترافی كردوە، ئەو موترەفە، واتە: خۆشگوزەرانە، خاوەنی نیعمەتی فراوانە، یان بەهرەمەندە لە نازو نیعمەت، بە فراوانیی.

(زُلْفَىٰٓ): (الزُّلْفَةُ وَالزُّلْفَى: المَنْزِلَةُ وَالحُظْوَةُ)، (زُلْفَة وزُلْفَى): بریتیە لە پێگەو نیزیكیی كەسێك لە كەسێك كە لێی بەهرەمەند بێ.

(ٱلضِّعْفِ): چەند بەرانبەر، چەند قات، دەگوترێ: (أَضْعَفْتُ الشَّيءَ، وَضَعَّفْتُهُ وَضَاعَفْتُهُ: ضَمَمْتُ إِلَيْهِ مِثْلَهُ فَصَاعِدَاً)، ئەم سێ كردارە هەر سێكیان بە یەك واتان، (أَضْعَفْتُ الشَّيءَ، وَضَعَّفْتُهُ، وَضَاعَفْتُهُ)، شتەكەم دوو قات، یان دوو بەرانبەر، یاخود چەند بەرانبەر كردەوە، (ضَمَمْتُ إِلَيْهِ مِثْلَهُ فَصَاعِدَاً)، وێنەی خۆیم خستە پاڵ و زیاتریش، واتە: دوو هێندەو، سێ هێندەو، چوار هێندەو، زیاتریش، (وَالضِّعْفُ: إِسْمٌ كَالثُّنَى وَالثُّنَى، فَضِعْفُ الشَّيءِ هُوَ الَّذِي يُثَنِّيهِ)، (ضِعْف) بریتیە لە ناو، (ضِعْفِ)ی هەر شتێك بریتیە لەوەی كە دەیكاتە دووان، یان دوو قاتی دەكاتەوە، یاخود زیاتر.

(ٱلْغُرُفَٰتِ): (**الغُرُفَات جَمْعُ غُرْفَة: عُلِّيَةٌ مِنَ البِنَاءِ، وَسُمِّي مَنَازِلُ الجَنَّةِ غُرَفاً**)، (**غُرُفَات**)، هەروەها لە قورئان بە (**غُرَف**)یش هاتوە، كۆی (**غُرْفَة**)یە، (**غُرْفَة**)ش بریتیە لە باڵەخانە، كەواتە: (**غُرُفَات**)، واتە: باڵەخانەكان و كۆشكەكان و مەنزڵگاكانی بەهەشت، بە (**غُرَف**) و (**غُرُفَات**) ناویان هاتوە، واتە: كۆشك و باڵەخانە بەرزەكان.

(ءَامِنُونَ): (**الأَمْنُ: طُمَأْنِينَةُ النَّفْسِ وَزَوَالُ الخَوْفِ**)، (**أَمن**): بریتیە لە هێمن بوونەوەی دەروون و لاچوونی ترس و بیم.

(يُخْلِفُهُۥ): واتە: شوێنی پڕ دەكاتەوە، (**يُخْلِفُهُ: أَخْلَفَ اللهُ عَلَيْكَ: أَي أَعْطَاكَ خَلَفاً**)، واتە: خوا ﷻ قەرەبووت بداتێ، شوێنی ئەو شتەی كە لە دەستت چووە، یان ڕۆیشتوە، پڕی بكاتەوە.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

بەڕێـــزان!

ئـەو نـۆ ئایەتـە موبارەکـە، بـەو ڕسـتەیە دەسـت پـێ دەکـەن: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، ئەوانـەی بێبـڕوان گوتیـان، یانـی: ئەوانـەی نکووڵیی دەکەن لـە بەرنامەکانی خـوا بـە گشـتیی، واتـە: هـەم هـی ئێسـتاو، هـەم هـی ڕابـردوو، کـە ئـاوا دەڵێـن: ﴿ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، ئەوانـەی بێبـڕوان، بێبـڕوا بـوون بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێـنرێ، واتـە: بێبـڕوا بـوون بـە خـوا ﷻو، بـە کتێبەکانـی خـواو، بـە فریشـتەکانی خـواو، بـە پێغەمبەرانـی خـوا (عَلَيْهِـم الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)و، بـە ڕۆژی دوایـی و بـە قـەدەر، یاخـود بـە یەکێـك لەوانـە بێبـڕوا بـوون، چونکـە مـەرج نیـە مـرۆڤ بێبـڕوا بـێ، بـە هەمـوو پایەکانـی ئیـمان، ئنجـا بەبـێ ئیـمان لـە قەڵـەم بـدرێ، بەڵکـو ئەگـەر بـە هـەر کام لـە پایـەکان بێبـڕوا بـێ، یـان بـە هـەر شـتێ ئاشـکراو زانـراو بـێ، کـە بەشـێکی بنەڕەتییـە لـە دینداریـی، ئـەوە بـە بێبـڕوا لـە قەڵـەم دەدرێ، ئنجـا ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون، گوتیـان: هەرگیـز بـڕوا ناهێنیـن، بـەم قورئانـەو بـەوەش کـە لـە پێشـیەوە بـووە، ئەمـە وەك ئـەو ئایەتـە موبارەکـەی سـوورەتی (الأنعـام)ە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ... ﴿٩١﴾ ﴾، واتـە: وەك پێویسـتە بـۆ خـوا ﷻ، قـەدری خوایـان نەگـرت، ڕێـزی خوایـان نەزانـی، کاتـێ گوتیـان: خـوا ﷻ هیـچ شـتێکی بـۆ سـەر هیـچ مرۆڤێـك دانەبەزانـدوە، واتـە: نکووڵییـان کـرد لـە هەمـوو پەیامەکانـی خـوا ﷻ، نـەك تەنیـا لـەو پەیامـەی کـە خـوا بـۆ پێغەمبـەری خاتەمـی ﷺ نـاردوە، لێـرەدا خـوا ﷻ وەڵامیـان ناداتـەوە، بەڵکـو یەکسـەر لـە دنیـاوە دەیانبـات بـۆ ڕۆژی قیامـەت و، دیمەنێـك لـە مشـت و مـڕی کافـرە لاساییکەرەوەکان لەگـەڵ کافـرە خـۆ سـەپێنەکان، چ مشـت ومـڕو وتووێژێکیـان دەبـێ، ئـەو دیالـۆگ و مشـت و مڕەمـان بـۆ بەرجەسـتە دەکات: دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ

رَبِّهِمۡ ﴾، ئەگەر تۆ ببینی کاتێ ستەمکاران لە لای پەروەردگاریان وەستێنراون، دیارە کەسێك دەوەستێنرێ، - چونکە نافەرموێ وەستاون، دەفەرموێ: وەستێنراون - کەسێك دەوەستێنرێ کە بە تۆبزیی بردرابێ و پەلکێش کرابێ، کە دەفەرموێ: لەلای پەروەردگاریان وەستێنراون، یانی: بۆ دادگایی کران، ﴿ يَرۡجِعُ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ ٱلۡقَوۡلَ ﴾، هەندێکیان قسە بۆ هەندێکیان دەگێڕنەوە، واتە: یەکێکیان قسە دەکات، ئەوی دیکە لە وەڵامدا قسە دەکاتەوە، پێکەوە وتووێژ دەکەن، پێکەوە شەڕە قسە دەکەن، ئنجا بۆمان باس دەکات کە ئەو قسەو بۆ یەکدی گێڕانەوەو بەرپەرچدانەوەیە چۆنە؟

﴿ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ ﴾، ئەوانەی بێهێزکراون بە ئەوانەی خۆیان بە زلگرتوە، دەڵێن، ﴿ ٱسۡتُضۡعِفُواْ ﴾ی بکەر نادیار (مَجۡهُول الفاعل) هێناوە، دیار نیە، بکەرەکەکێیەو کێ بێهێزی کردوون، یاخود کێ بە بێهێزی داناون؟ چونکە (استضعاف)، هەم دەگونجێ بە مانای بە بێهێزدانران، هەم بە مانای بێهێزکران بێ، ئەوانەی کە بە بێهێز دانراون، یان بێهێز کراون، بەوانەیان گوت: کە خۆیان بە زلگرتبوو، خۆ بە زلگرەکان و، حوکمڕانە خۆسەپێنەکان بە بکەر زانراو (مَعۡلُوم الفاعل) دێنێ، چونکە خۆیان بکەری خۆ بە زلگرتنەکەیان بوون، بەڵام هی چەوسێنراوو بێهێز کراوەکان، بکەرەکەی بە نادیار دەهێنێ، چونکە هەر ئەوانەی خۆیان بە زلگرتبوو، ئەوانەشیان بە بێهێز تەماشا دەکرد، یاخود بێهێزیان کردبوون، یان بە بێهێزیان دادەنان، ئنجا بێهێزکراوەکان بە خۆ بە زلگرەکانیان گوت: ﴿ لَوۡلَآ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِينَ ﴾، ئەگەر ئێوە نەبوونایە، ئێمە بڕوادار دەبووین، ئەگەر ئێوە نەبوونایە، واتە: ئەگەر ڕێگریی ئێوە نەبووایە، یان پیلان و فێڵی ئێوە نەبووایە لە دژی ئێمە، ئێمە بڕوادار دەبووین.

﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ ﴾، ئەوانەی خۆیان بە زلگرتبوو بەوانەیان گوت، کە بێهێز کرابوون، یان بە بێهێز دانرابوون، ﴿ أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ ﴾، ئەوە پرسیارلێکردنێکی نکووڵیلێکەرانەیە: ئایا ئێمە ئێوەمان لە ڕێی ڕاست گێڕایەوە؟ لە هیدایەت گێڕایەوە؟، ﴿ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُم ﴾، دوای ئەوەی بۆتان

هاتبوو؟ لە کوێوە بۆیان هاتبوو؟ بێگومان لە خواوە ﷻ. ﴿بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ﴾، بەڵکو ئێوە تاوانبار بوون، بۆیە کەیفتان بە ڕێگای ڕاست و هیدایەتی خوا نەدەهات، کەیفتان بە ڕێگای خوا نەدەهات، چونکە لەگەڵ تاوان و خراپەی ئێوەدا دانووی نەدەکوڵین و، ڕێی تاوان و خراپەی لێ دەگرتن، وەك پێشینان دەڵێن: (تەیری گول عاشقی داری ژەقنەمووتە)، ئێوە خۆتان تەیری گول بوون، بۆیە عاشقی بێبڕوایی و خراپەو کوفر بوون، ئەو پەیامە نورانییەو هەقانییەی خواتان وەرنەگرت، لەبەر ئەوەی ڕێی تاوان و خراپەو گوناهی لێ دەگرتن.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾، هەروەها ئەوانەی چەوسێنرابوونەوە، یاخود بێهێزکرابوون، یان بە بێهێز دانرابوون، بەوانەیان گوت کە خۆیان بە زلگرتبوو، خۆیان سەپاندبوو، ﴿بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾، بەڵکو ئەوەی بوو بە هۆی لادانی ئێمە، فێڵی شەوو ڕۆژان بوو، واتە: فێڵی شەوو ڕۆژی ئێوە لە دژمان، پیلانگێڕیی و فێڵ و تەڵەکەتان لە دژمان، دوایی باسی پیلانگێڕیی شەوو ڕۆژی ئەو ملهوڕو خۆ بەزلگرو خۆ سەپێنەکان دەکات، لە دژی چەوسێنراوەکان و، بێهێزکراوەکان و دەفەرموێ: ﴿إِذۡ تَأۡمُرُونَنَآ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ﴾، کاتێك کە فەرمانتان پێ دەکردین، بێبڕوابین بە خوا، ﴿وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗا﴾، هاوتایانی بۆ دابنێین، چونکە وشەی: ﴿أَندَادٗا﴾، کۆی (نِدّ)ە، واتە: ڕێك شتێك وەك شتێك بێ، وەك گوتراوە: (النِّدُّ: هُوَ المُشَارِكُ فِي الجَوْهَر)، واتە: (نِدّ) ئەوەیە لە چییەتیدا وەك ئەو بێ، ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ﴾، هەردووك لایان، واتە: چەوسێنراوەو، بە بێهێزدانراو و بێهێزکراوەکان، کە کوێرانە کەوتوونەتە دوایان، هەروەها خۆ بە زلگرو خۆ سەپێنەکان، پەشیمانییان پەنهان کرد، ژیوان بوونەوەو پەشیمانییان پەنهان کرد، کەنگێ؟ ﴿لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ﴾، کاتێك سزایان بینی، دیارە (أل)ی سەر ﴿ٱلۡعَذَابَ﴾، بۆ ناساندنە، ﴿ٱلۡعَذَابَ﴾ واتە: سزایەکەیان بینی و، ئازارەکەیان بینی، کە دۆزەخە.

﴿وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَغۡلَٰلَ فِيٓ أَعۡنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، کۆت (غُلّ) شتێکە دەکرێتە گەردنەوەو، وا دەکات مرۆڤ نەتوانێ سەر دانەوێنێ و، دەبێ ملی هەر هەڵبڕێ،

یانی: کۆت (غُل)ەکانمان خستنە ملی ئەوانەوە کە بێبڕوان، (غُـل) بە کوردیی دەبێتە کۆت، ئنجا کە دەفەرمویٚ: کۆتەکانمان خستنە ملی ئەوانەوە کە بێبڕوان، ئەوانەی بێبڕوان کێن؟ هەم بێهێزکراوەکانن، هەم خۆ بەزلگرەکانن، چونکە لە سەرەتاوە خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن نُّؤۡمِنَ بِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ ﴾، ئەوانەی بێبڕوا بوون، گوتیان: ئێمە هەرگیز بڕوا بەم قورئانە، ناهێنین، ﴿ وَلَا بِٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ ﴾، هەروەها بەوەی کە لە پێشیەوەشی دابەزێنراوەو هاتوە، ﴿ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، ئایا جگە لەوەی کە کردوویانە سزا دەدرێنەوە؟ واتە: ئەوە سزای پڕ بە پێستیانە، کە بەو شێوەیە سزایان بدەین، چونکە کردەوەکانیان ئەو جۆرە سزایە هەڵدەگرن.

ئەگەر سەرنج بدەین: خوا ﷻ لە سەرەتاوە هەموویانی بە بێبڕوا لە قەڵەم داوە، دواتریش هەموویانی بە ستەمکار لە قەڵەمداون: ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوۡقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمۡ يَرۡجِعُ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ ٱلۡقَوۡلَ ﴾، ئەگەر ببینی ستەمکاران لە لای پەروەردگاریان وەستێنراون، هەندێکیان قسە بۆ هەندێکیان هەڵدەدەنەوەو دەگێڕنەوە، واتە: وەڵامی یەکدی دەدەنەوە، ئنجا دابەشیان دەکات بۆ دوو جۆر:

أ- چەوسێنراوان، یاخود بێهێزکراوان، یاخود بە بێهێزدانراوان.

ب- لەگەڵ خۆ بەزلگران و خۆسەپێنان، دوایی خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَغۡلَٰلَ فِيٓ أَعۡنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، کۆتەکانیشمان خستنە گەردنی ئەوانەی بێبڕوان. کەواتە: ئەوانە هەموویان بێبڕوان و، هەمووشیان بە ستەمکار ناوزەند کراون و، خواش ﷻ هەموویان کۆت دەکات، دواییش دەفەرمویٚ: ﴿ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، ئایا بە جگە لەوەی، کردوویانە سزا دەدرێن؟ واتە: نابێ هیچ کەسێك خوتخوتەیەکی لە دڵدا پەیدابێ و بڵێ: چۆن خوا ئەو سزا سەختەیان دەدات؟ چونکە بە پێی کردەوەکانیان سزا دەدرێن و، کردەوەکانیان ئاوا بوون کە باسکراو، ئەوەش سزایەکەیانە.

دوایی خوا ﷻ دێتە سەر خستنەڕووی، یاسایەکی گەورەو گرنگی خۆی لە ژیانی بەشەردا، کە بریتیە لە هەڵوێستی حوکمڕانە خۆشگوزەرانە خۆ سەپێنەکان،

لە بەرانبەر پەیام و بەرنامەکانی خوادا، بەرانبەر بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، دەفەرمووێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ ﴾، لە هیچ ئاوەدانییەکدا هیچ ترسێنەرو هۆشیارکەرەوەیەکمان نەناردوە، ﴿ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ ﴾، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: ﴿ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾، ئێمە بەوەی ئێوە پێی ڕەوانەکراون، بێبڕواین، دیارە کە گوتوویانە: ﴿ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾، ئێمە بەوەی ئێوە پێی ڕەوانەکراون، ئەوە بە تەوسەوەو بە توانجەوە گوتوویانە، ئەگەرنا بێبڕوایان دانیان بەوەدا نەهێناوە، کە ئەوانە لەلایەن خواوە ﷻ نێردراون و ڕەوانەکراون، نکوولّییان لەوە کردوە، خوا ناردبنی، وەك لە شوێنێکی دیکەش دا بە توانج و تەوسەوە دەڵێن: ﴿ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِيٓ أُرۡسِلَ إِلَيۡكُمۡ لَمَجۡنُونٞ ٢٧ ﴾الشعراء، واتە: (فیرعەون)، گوتی: ئەو پێغەمبەرەتان کە بۆ لای ئێوە ڕەوان کراوە، شێتە، یانی: پێچەوانەی عەقڵ و لۆژیکە، خوا بابایەکی شێت ڕەوان بکات، کەواتە: مادام شێتە، لە لایەن خواوە نەهاتوە.

﴿ وَقَالُواْ نَحۡنُ أَكۡثَرُ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا ﴾، [خۆشگوزەرانە خۆسەپێنەکان] گوتیان: ئێمە ماڵ و سامان و منداڵمان لە هی ئێوە زیاترە، واتە: لە هی ئێوەو خەڵکی دیکە زیاترە، ﴿ وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾، ئێمەش لە سزادراوان نابین، واتە: مادام خوا ﷻ لە دنیادا بەهرەمەندی کردووین لە ماڵ و سامان و منداڵ و وەچەی زۆر، ئەوە نیشانەی ڕازی بوونیەتی لێمان، ئنجا کە لێشمان ڕازی بوو، لە دنیاداو لە دواڕۆژدا سزامان نادات و، لە سزادراوان نابین؟!

خوا ﷻ بەرپەرچییان دەداتەوە: ﴿ قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُ ﴾، بڵێ: بە دڵنیاییەوە پەروەردگارم بۆ هەر کەسێك بیەوێ بژێو فراوان دەکات، بۆ هەر کەسیشی بوێ، تەنگی دەکات و کەمی دەکات، واتە: فراوانکران و، وەتەنگ هێنرانی بژێو، زۆرکران و کەمکرانی، نیشانەی ئەوە نیە، کە خوا ﷻ ئەوەی بژێوی زۆری بداتێ لە دنیادا، خۆشی دەوێ و، ئەوەی کەمی بداتێ، خۆشی ناوێ، بەڵکو ویستی حەکیمانەی خوا لە پشت ئەو مەسەلەوەیە، هەڵبەتە هۆکارەکانیش کاریگەرییان تێیدا هەیە، بەڵام بە هیچ جۆرێك نابێ وا لێك

بدرێتەوە کە هەرکەس خوا بژیوی زۆری بداتێ، خۆشی دەوێ و، ئەوەی بۆ پشی کەم بکات و، لێشی کەم بکاتەوە، ڕقی لێیەتی، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، هەر بەو خەیاڵ و وەهمە خۆیان دەخەڵەتێنن، بە تایبەتی خۆشگوزەرانەکان و ساماندارەکان، کە لە ڕێی حەرامەوە سەروەت و سامانیان وەسەریەکناوە، پێیان وایە مادام لە دنیادا حاڵییان وایە، لە دوارۆژیشدا هەروادەبن!

﴿ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ ﴾، لەحاڵێکدا سامانەکانتان و منداڵەکانتان ئەو هۆکارە نین ئێوە لە ئێمە نیزیك بخەنەوە، واتە: هەرچەندە سامانتان زۆر بێ و منداڵ و وەچەتان زۆر بێ، ئەوە هۆکاری نیزیك بوونەوەتان نیە، لە ئێمە، ﴿ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾، مەگەر کەسێك بڕوای هێنابێ و کردەوەی باش بکات و، ماڵ و سامان و منداڵەکەی لە ڕەزامەندیی خوادا بەکارهێنابن، ﴿ فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ ﴾، ئا ئەوانە پاداشتی دوو قات یان چەند بەرانبەریان هەیە، بە هۆی ئەوەوە کە کردوویانە، ﴿ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴾، هەروەها ئەوانە لە کۆشکە بەرزەکان - لە بەهەشت - دا، بە دڵنیایی و بێ ترس و بیم، نیشتەجێ دەکرێن، ﴿ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ ﴾، ئەوانەش کە لە دژی ئایەتەکانی ئێمە تێدەکۆشن (کە بە خەیاڵی خۆیان) ئێمە دەستەوسان بکەن، یان پێشمان بکەونەوە، (مُعَاجِزِيْنَ أي: مُسَابِقِيْن أو مُغَالِبِيْن)، بە خەیاڵی خۆیان، پێیان وایە، بەسەر ئێمەدا، یان بەسەر ئایەتەکانی ئێمەدا، زاڵ دەبن ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴾، ئا ئەوانە لە سزاو ئازاری دۆزەخدا ئامادە دەکرێن، ﴿ فِى ٱلْعَذَابِ ﴾، (أل)ی سەر ﴿ ٱلْعَذَابِ ﴾، بۆ ناساندنی (عَهْد)ە، واتە: لە سزایەکەدا، کە مەبەست پێی دۆزەخە ئامادە دەکرێن.

لە کۆتاییدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ ﴾، ئەوەی پێشێ بۆ خەڵك بە گشتیی و، بۆ بێبڕوایان بە تایبەتیی بوو، ئەمەیان بۆ بڕوادارانە، ﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ ﴾، بڵێ: بە دڵنیایی پەروەردگارم بژیو بۆ هەر کام لە بەندەکانی

فراوان دەکات و، جاری واش هەیە بۆی وەتەنگ دێنێ، واتە: لە قۆناغێکدا بۆی فراوانکردووەو، لە قۆناغێکی دیکەدا لێی وەتەنگ دێنێ و، بۆی کەم دەکاتەوە، کە کەمکردنەوەکەش لە بەرژەوەندیی خۆیەتی مادام ئیماندار بێ، ﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ﴾، هەر شتێکیش ئێوە ببەخشن، خوا کەلێنێکەی پڕ دەکاتەوەو، شوێنی پڕ دەکاتەوە، بژیوی دیکە دەهێنێتەوە جێی، ﴿ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾، خواش ﷻ باشترینی بژیودەرانە، واتە: ئێوە لەوەی خوا پێیداون، ببەخشن، لە ڕەزامەندیی خوادا، خواش ﷻ کەلێنی ئەو بەخشراوەتان بۆ پڕ دەکاتەوە، جگە لەوەی کە لە دوارۆژیشدا پاداشتتان دەداتەوە.

## مەسەلە گرنگەكان

**مەسەلەی یەكەم:**

**نكوولّییكردنـی بێبڕوایانی بتپەرست لـە ئەسڵی پەیامـی خـواو، وەلاّمدانەوەیـان بـە خسـتنە ڕووی هەڵوێسـتی هـەردووك لایەنـی بێهێزكراوانـی لاسـاییكەرەوەو، حوكمڕانانـی خـۆ بەزلگـر لـە ڕۆژی دوایـدا، كـە هـەر كامیـان خەتـا لـە ملـی ئـەوی دیكـە دەكـات و، سـەرەنجام هەموویـان كـۆت و زنجیـر دەكرێـن و پەشـیمانیی دەكێشـن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓاْ أَنَحْنُ صَدَدْنَٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:**

**١)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوا بوون، گوتیان، زۆربەی تەفسیرەكان هەر دەڵێن: واتە: كافرەكانی مەككەو، هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانی مەككە، وەك چۆن قوڕئان كە لە سەرەتاوە، لە مەككە دابەزیوە، هەتا قیامەتیش هەر ڕوو لە خەڵكی مەككە بكات، كە خەڵكی مەككەش ئێستا مسوڵمانن! بەڵام نەخێر، مەبەست پێی ئەوانەیە كە بێبڕوان، ئنجا بەڵێ یەكەمجار بێبڕوایەكانی مەككەو دەوروبەری گرتۆتەوە، چونكە**

پێغەمبەر ﷺ لە نێو ئەواندا بووە، بەڵام بە تەئکید هەموو دواندنەکانی قورئان، هەموو باس و خواسەکانی کە لە فەرمایشت خوادا هاتوون، کاتێك باسی بێبڕوایان دەکەن، واتە: بێبڕوایان بە گشتیی، مەگەر بە بەڵگەیەك بێبڕوایانی قۆناغێك، یان جۆرێك لە بێبڕوایان تایبەت بکرێن بەو دواندنەوە، ئەگەرنا بێبڕوایان هەموویان دەگرێتەوە، هەروەها کە باسی ئیماندارانیش دەکات، هەموویان دەگرێتەوە.

کەواتـە: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون، گوتیـان، سـەرەتا مەبەسـت بێبڕوایەکانـی مەککـەو دەوروبەریەتـی، بـەڵام دواییـش هەمـوو بێبڕوایـان لـە هـەر شـوێنێکی دنیـادا بووبـن، لـە هـەر قۆناغێکـی مێـژووی بەشـەردا بوویـن، مەبەسـت بـوون.

٢)- ﴿ لَن نُّؤْمِنَ بِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، هەرگیز بڕوا بەم قورئانەو بەوەی پێشووشی ناهێنین. (لَنْ) بۆ (تَأْكِيد تَأْبِيْد)ە، جەختکردنەوەو لەمەودوایە، واتە: هەرگیز بڕوا ناهێنین بەم قورئانە، ﴿ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، هەروەها بە هەرچییەك کە لە پێش دەستیشیەوە بووە، کە هەموو کتێبەکانی خوا دەگرێتەوە، هەروەها هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەگرێتەوە، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، (الكِتَابُ الَّذِي هُوَ قَرِيْبُ العَهْدِ بِهِ)، ئەو کتێبەی کە ڕۆژگارەکەی لە قورئانەوە نیزیك بووە، کە ئەگەر وابێ ئینجیل دەگرێتەوە، لە پێش ئەویشدا زەبوورو، دوایی تەوڕات و، صوحوفی ئیبراهیم.

بـەڵام مـن پێـم وایـە، ئـەو ڕایـە ڕاسـتە کـە دەڵـێ: ﴿ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، هەرچـی لـە پێـش قورئانەوەیـە، واتـە: بـڕوا بـە هیـچ کام لـە کتێبەکانـی خـوا ناکەیـن.

٣)- ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾، ئەگەر ببینی کاتێك ستەمکاران لە لای پەروەردگاریان ڕاگیراون.

ئـەوەی تێبینیـی دەکـرێ، خـوا ﷻ وەڵامـی قسـەی کافـرەکان ناداتـەوە، کـە دەڵێـن هەرگیـز بـڕوا بـەم قورئانـەو، بـە هیـچ کام لـە کتێبەکانـی خـوا ناکەیـن، خـوا ﷻ

وەڵامی ئەو قسەیە ناداتەوە، چونکە خوا ﷻ وەڵامەکەی دەخاتە دووتوێی ئەو وتووێژەوە، کە لە نێوان لاساییکەرەوانی بێهێز کراوو بە بێهێز دانراوو، خۆ بە زلگرانی خۆ سەپێن، لە قیامەتێ دا دەبێ، کە هەر کامێکیان خەتا لە ملی ئەوی دیکە دەکات، واتە: خوا ﷻ لە جیاتی ئەوەی وەڵامێکی تیۆرییان بداتەوە، دیمەنێك لە دیمەنەکانی قیامەت، کە بریتیە لە وتووێژو دیالۆگێك لە نێوان ئەو دوو کۆمەڵەدا: شوێنکەوتووان و پەیڕەوییلێکراوان (أَتْبَاعُ وَمَتْبُوعِيْن)، یاخود: بێهێزکراوو بە بێهێز دانراوان و، خۆ سەپێن و خۆ بە زلگراندا، دەبێ، ئەو وتووێژەیان بۆ دەگوازێتەوە، کە ئەو کوفرەی ئێوە ئێستا لەسەرینی، ئەو بڕیارەی داوتانە، کە هەرگیز بڕوا بە قورئان و، بە هیچ کام لە کتێبەکانی پێش قورئانیش ناکەن، تا ئەوە سەرەنجامەکەیەتی، لە قیامەت دا! بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: تۆ ئەگەر ببینی کاتێك کە ستەمکاران لە لای پەروەردگاریان وەستێنراون، وەڵامی ئەگەر (لَوْ) قرتێندراوە، بە مەبەستی مەزنکردن و سەرسوڕماندن، وەك: (لَرَأَيْتَ أَمْرَاً عَجَباً)، ئەگەر ببینی کاتێ ستەمکاران ڕاگیراون و، وەستێنراون لە لای پەروەردگاریان: دیمەنێکی زۆر سەرسوڕهێنەر دەبینی.

٤)- ﴿يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ﴾، هەندێکیان قسە بۆ هەندێکیان دەگێڕنەوە، (رَجْعُ القَوْلِ: المُجَاوَبَة وَالمُحَاوَرَة)، (رجع القول) بریتیە لە وەڵامدانەوەی یەکدیی و وتووێژ پێکەوە کردن، واتە: قسە بۆ یەکدی هەڵدەدەنەوە، یەکیان قسە دەکات، ئەوی دیکە وەڵامی دەداتەوە، ئنجا باسی ئەو قسە بۆ یەکدی هەڵدان و گێڕانەوەیە دەکات:

٥)- ﴿يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟﴾، ئەوانەی کە بە بێهێز دانراون، یاخود بێهێز کراون، بە وانەیان گوت کە خۆیان بەزلگرتوە، (اسْتُضْعِفُوا: الَّذِيْن يَعُدُّهُمْ النَّاسُ ضُعَفَاءَ، أو الذِيْن جُعِلُوا ضُعَفَاءَ)، ئەوانەی کە خەڵك بە بێهێزیان دادەنێ و بە بێهێز تەماشایان دەکات، یاخود ئەوانەی بێهێز کراون، هەردوو واتایەکەی ڕاستن، بۆیەش بە بکەر نادیار (مَجْهُول الفَاعِل) هاتوە، یانی:

أ- ئەوانەی کە بێهێزکراون لەلایەن ستەمکارانەوە.

ب- یان لە ئەنجامی لاساییکردنەوەی کوێرانەدا، خۆیان بێهێز کردوە.

ج- یان: بارودۆخێکی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی نادادگەرانە، وایکردوە ئەوانە بێهێز بن، ئنجا لەبەر ئەوەی هۆکارەکانی زۆرن، بۆیە خوا ﷻ بە زۆریی ئەوە بە بکەر نادیار **(مجهول الفاعل)** دەیهێنێ، ئەوانەی بە بێهێز دانراون، یاخود بێهێز کراون، بەوانەی خۆیان بەزلگرتوە، گوتیان:

﴿ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ ﴾، ئەوانـەی خۆیـان بـە زلگرتبـوو، خۆیـان سـەپاند بـوو، ئەمـەش چەنـد واتایەکـی هەن:

أ- **(اسْتَكْبَرُواْ: يَعْنِي تَكَبَّرُوا عَلَى النَّاس)**، خۆیان لەسەر خەڵك بە زلگرتبوو،

ب- یاخود: **(طَلَبُوا الكِبرَ وَالعَظَمة)**، خۆ بە زلگریی و مەزنایەتییان داوا کردبوو.

ج- یاخود: **(عَدُّوا أنْفُسَهُمْ كُبَراء)**، خۆیان بە گەورە دەزانی.

بۆیـەش بـە بکـەر زانـراو، هێناویـەتی، چونکـە خـۆ بـە زلگرتنەکـە لـە خۆیانـەوە سـەرچاوەی گرتـوە، چەوسـێنراوەکان، بێهێـز کـراوو بـە بێهێـز دانـراوەکان بـە خـو بـە زلگرەکانیـان گـوت:

٦)- ﴿ لَوۡلَآ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِينَ ﴾، ئەگەر ئێوە نەبوونایە، ئێمە بڕوادار دەبووین، لێرەدا: **(لَوْلَا حَرْفُ امْتِنَاعٍ لِوُجُودٍ)**، پیتی نەبوونی شتێکە لەبەر بوونی شتێکی دیکە. واتە: **(لَوْلَا سَعْيُكُمْ أنْتُم، لَكُنَّا مُؤْمِنِيْن)**، واتە: ئەگەر هەوڵدانی ئێوە نەبووایە، ئێمە بڕوادار دەبووین، ئایەتەکە دەفەرموێ: ئەگەر ئێوە نەبوونایە، ئێمە بڕوادار دەبووین، بەڵام بە تەئکید بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، کە شتێکی دیکەی تێدایە قرتێندراوە، وەك: **(لَوْلَا سَعْيُكُمْ)**، یان **(لَوْلَا مَكْرُكُمْ)**، یان **(لَوْلَا مُحَاوَلَاتُكُمْ ضِدَّنَا)**، ئەگەر کۆششی ئێوە نەبووایە، یان: فێڵ و پیلانی ئێوە نەبووایە، یان: هەوڵەکانی ئێوە نەبوونایە، لە دژی ئێمە، ئێمە بڕوادار دەبووین، بەڵام ئایا ئەوان بێدەنگ دەبن؟ نەخێر، بەڵکو وەڵام دەدەنەوە:

٧)- ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ ﴾، چەوسێنراوەکان بە زمانی سووتاو یەك ڕستە دەڵێن، بەڵام خۆ بە زلگرەکان، هەروەك لە دنیادا عادەتیان پێوە گرتوە، کە زۆر زمان درێژیی بکەن و، هەر کەسێك قسەیەکی پێیان دەگوت، چوار قسەی پێ بڵێنەوە:

ئەوانەی خۆیان بە زلگرتبوو، خۆیان سەپاندبوو، بەوانەیان گوت: کە چەوسێنرابوونەوەو بێهێز کرابوون و بە بێهێز دانرابوون.

٨)- ﴿أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ﴾، ئایا ئێمە ئێوەمان لە ڕێی ڕاست و ڕێنمایی گێڕایەوە، دوای ئەوەی بۆتان هات؟! بەڵکو خۆتان تاوانبار بوون، ئەمە پرسیاکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، کە هەمیشە وەڵامەکەی لادەبرێ، واتە: ئێمە ئێوەمان لە ڕێنمایی خوا نەگێڕابۆوە، لە ڕێی ڕاست نەگێڕابۆوە.

﴿بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ﴾، بەڵکو ئێوە پێشتر تاوانبار بوون، واتە: هۆی لادانتان لە ڕێنمایی خوا، تاوانباریتان بوو، بابای تاوانبار کەیفی بە ئایین و ڕێنمایی خوا نایەت، چونکە ڕێنمایی خوا، ڕێی تاوانی لێ دەگرێ.

یانی: ئێوەش کەیفتان لە تاوان و خراپە بوو، بۆیە بە دوای ڕێنمایی خوا نەکەوتن، نەك ئێمە ملمان بە ئێوە سووڕاند بێ.

٩)- ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾، ئەوانەی بێهێزکرابوون بەوانەیان گوت کە خۆیان بەزلگرتبوو، (و)ی سەرەتا بادەرەوە (عاطفة)یەو، بۆ گێڕانەوەی ئەم ڕستەیە بۆ ڕستەی پێشێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم قسەیەی چەوسێنراوانی بێهێزکراو، تەواوکەری قسەی پێشێیانە، ئەگەرنا خوا ﷻ قسەی خۆ بە زلگرەکانی بەبێ (و) هێناو، یەکسەر فەرمووی: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ﴾، بەڵام لێرەدا دووبارە قسەی بێهێز کراوەکان بە (و) دێنێ، کەواتە: ئەمە هەر تەواوکەری قسەی پێشێیانەو، وا دیارە خۆ بە زلگرەکان، قسەیان پێ بڕیون، هەر کە ئەوان گوتوویانە: ﴿لَوۡلَآ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِينَ﴾، خۆ بە زلگرەکان لێنەگەڕاون، قسەکەیان تەواو بکەن و یەکسەر گوتوویانە: ﴿أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ﴾، بۆیەش بە (و)ی بادانەوە هاتوە، تاکو بزانرێ ئەوە هەر تەواوکەری قسەی پێشێیانە.

١٠)- ﴿بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾، (بەڵکو ئەوەی ئێمەی لادا، لە هیدایەتی خوا) پیلانی شەوو ڕۆژ بوو، واتە: پیلانی شەوو ڕۆژی ئێوە بوو لە دژمان.

ئنجا پیلانەکە ڕوون دەکەنەوە:

١١)- ﴿إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا﴾، کاتێك فەرمانتان پێ دەکردین بێبڕوا بین بە خواو هاوتایانی بۆ دابنێین.

بێبڕوابیـن بـە خـوا، وەك تاکـە بـە دیهێنـەرو پەرستراو نەیناسـین، ئنجـا هاوتاشـی بـۆ دابنێیـن، نـەك هـەر هاوبـەش، بەڵکـو هاوتـا، واتە: شـتانی دیکـە وەك خوا تەماشـا بکەیـن، چونکـە: (الأنْـدَادُ جَمْـعُ نِـدّ: وَهُـوَ الْمُشَـارِكُ فِي الجَوْهَـر)، وەك پێشـتر گوتمـان: (نِـدّ)، واتـە: ڕێـك لـە هەمـوو شـتێکدا، یـان لـە نێوەڕۆکـدا، وەك بەرانبەرەکـەی بـێ، بـەڵام (مِثْل وشَبيه)، ئەوەیـە کـە لـە شـتێك لـە شـتەکاندا وەك ئـەو بچـێ.

١٢)- ﴿وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ﴾، پەشێمانییان پەنهان کرد، دوای ئەوەی سزاو ئازارەکەیان بینی، کە مەبەست پێی ئازارو سزای دۆزەخە، (أل)ی سەر ﴿ٱلْعَذَابَ﴾، بۆ ناساندنە، بەڵام مەبەست پێی ناساندنی (عهد)ە، واتە: سزایەکەیان بینی، جاری دیکەش گوتوومانە: (أل)ی (عهد) لە زمانی عەرەبییدا دەچێتەوە بەرانبەر (کە) لە زمانی کوردییدا، ئەگەر گوتم: کتێبم بۆ بێنە، نازانی کام کتێب؟ بەڵام کە گوتم: کتێبەکە، دیارە کام کتێبەیە، هەروەك لە عەرەبییدا کە گوتی: (جِئْني بِكِتَابٍ) کتێبم بۆ بێنە، نازانی کامەیە، بەڵام کە گوتی: (جِئْني بالْكِتَاب)، واتە: ئەو کتێبەی دەزانین، ئەو کتێبەی زاندراوو ناسراوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ﴾، ﴿ٱلنَّدَامَةَ﴾: بریتیـە لـە خـەم خـواردن لـە شـتێك کـە ڕۆیشـتوەو لـە دەسـت چـووەو، ناگونجـێ قەرەبـوو بکرێتـەوە.

١٣)- ﴿وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، ئێمە کۆتەکانمان خستنە گەردنەکانی ئەوانەوە کە بێبڕوان، ﴿ٱلْأَغْلَٰلَ﴾، کۆی (غُلّ)ە، (غُلّ)یش بازنەیەکە لە ئاسن، یاخود لە چەرم، یان هەرشتێکی دیکە، بە ئەندازەی گەردن و، گەردنی مرۆڤی دەخرێتە نێوو دادەخرێ.

١٤)- ﴿هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾، ئایا بە جگە لەوەی دەیانکرد، سزا دەدرێن؟

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، واتـە: ئەوانـەی بێبڕوا بـوون، چ بـە بێهێـز دانـراوەکان و بێهێزکـراوەکان، چ خۆسـەپێن و خـۆ بەزلگـرەکان،

هەردووکیان وەك یەك، خوا کۆت و پێوەند دەخاتە گەردنیانەوە، دواییش کە دەفەرموێ: ﴿هَلۡ یُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ یَعۡمَلُونَ﴾، ئایا بە جگە لەوەی دەیانکرد، سزا دەدرێن؟ ئەمە پرسیارکردنێکی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: نابێ بە جگە لەوەی کردوویانە سزا بدرێن، ئەمە بۆ ئاگادار کردنەوەیە، هەروەك (الشعراوي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، کە بە (خواطر الشعراوي) ناسراوە، قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ:

(تَنْبِيه للمُؤْمِنِيْن الَّذِيْنَ يَسْمَعُونَ هَـذَا الـكَلَام وَهَـذَا الجَـزَاء: إِيَّاكُـمْ أَنْ تَأْخُذَكُـمْ بِهَـؤلَاءِ رِقَّـةٌ عَـلَى حَالِهِـمْ فِي الآخِـرَةِ، وَانْظُـرُوا إِلى مَـا فَعَلُـوهُ فِي الدُّنْيَـا مِـنْ إِجْـرَامٍ، لِتَعْلَمُـوا أَنَّ اللـهَ تَعَـالَى عَـادِلٌ لَا يَظْلِـمُ النَّـاسَ، وَلَكِـنَ النَّـاسَ أَنْفُسَـهُمْ يَظْلِمُـون)[1].

واتە: ئەمە ئاگادارکردنەوەو وشیارکردنەوەیە بۆ بڕواداران، کاتێك کە ئەم فەرمایشتەی خوا ﷻو ئەم سزایە دەبیستن، لە ڕۆژی دوایی دا، خوا ﷻ دەیەوێ پێیان بفەرموێ: وریا بن! بەزەییتان بەوانەدا نەیەتەوە کە لە دوارۆژدا، بەو شێوەیە سزا دەدرێن، تەماشا بکەن لە دنیادا چییان کردوە لە تاوانباریی، تاکو بزانن کە خوا دادگەرەو زوڵم لە خەڵك ناکات، بەڵکو خۆیانن ستەم لە خۆیان دەکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿هَلۡ یُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ یَعۡمَلُونَ﴾، ئایا بە جگە لەوەی کە دەیانکرد، سزا دەدرێن؟ یانی: ئاوایان کردووەو ئەوە کردەوەکانیان بوون، بۆیە پێویستە بەو جۆرەش سزا بدرێن.

وەك دەبینین: خوا ﷻ هەردوو کۆمەڵەکان: لاساییکەرەوەکان کە بە: (مُسْتَضْعَفِيْن، الذين اسْتُضْعِفُوا)، چەوسێنراوان و بێهێز کراوەکان باس دەکرێن و، حوکمڕانە خۆسەپێنەکان، کە بە (اسْتَكْبَرُوْا) ئەوانەی خۆیان بە زلگرتبوو، پێناسە دەکرێن، هەردووکیانی بە: (كَافِرُون) و (ظَالِمُـون) و (مُجْرِمُون)یش، ناوزەند کردوون، بێبڕوایان و، ستەمکارن و، تاوانباران.

---

(١) خواطر الشعراوي، ج٢٠، ص١٢٣٤٠.

شایانی باسە: ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا، بەرگی شەشەمی ئەم تەفسیرە کوردییە، لە تەفسیری ئایەتەکانی: (٣٧ - ٣٩)دا، باسێکی خەست و قووڵمان لەو بارەوە کردووەو، ئەو ئایەتانەی لە قورئاندا، لەوبارەوە هاتوون، لە نێویشیاندا ئەم ئایەتانەی لە سوورەتی (سبأ)دا، هاتوون، هەموو ئایەتەکانمان هێناون و، باسێکمان کردوە لە بارەی ئەوانەوە، کە لە دنیادا، دەبنە دوو بەش، بەشێکیان خۆسەپێن و خۆ بە زلگرو حوکمڕان، بەشێکیشیان شوێنکەوتوو و لاساییکەرەوەی کوێرانە، کە کاتێك خوا ﷻ باسی سزادانەکەیان دەکات، هەم لێرەدا، هەم لە سوورەتی (الأعراف)دا، هەم لە شوێنەکانی دیکەدا، وەك یەك باسیان دەکات، تەنانەت لە سوورەتی (الأعراف)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ ﴿٣٨﴾﴾، بۆ هەر کامتان سزای چەند بەرانبەر هەیە، نەك هەر بۆ ستەمکارەکان، کە خەڵکیان لاداوە، ئێوەش ئەی شوێنکەوتووە لاساییکەرەوەکان! سزاتان چەند بەرانبەرە، چونکە ئێوە بوونە هۆی ئەوەی ئەو ستەمکارانە پەیدا بن، هەروەك گوتراوە: بێ دەنگیی ستەم پەیدا دەکات، ستەم بێ دەنگیی پەیدا ناکات.

**مەسەلەی دووەم:**

**هەمیشە هەڵویستی خۆشگوزەرانەکان بریتی بووە لە: بڕوا نەهێنان بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و پەیامی خوا، بە خەیاڵی خۆیان، چونکە سامان و ڕۆڵەیان زۆرن، خوا خۆشیدەوێن و لە دوارۆژیشدا سزایان نادات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾، لە هیچ ئاوەدانییەکدا، هیچ ترسێنەرو هۆشیارکەرەوەیەکمان ڕەوان نەکردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: ئێمە بەوەی پێی نێرراون بێبڕواین. مەبەست لە: ﴿ نَّذِيرٍ ﴾، ترسێنەر، هۆشیارکەرەوە بە ناوی خواوە، بە پلەی یەکەم پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و، دوای ئەوانیش شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانن، کە لە جیاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، پەیامی خوا بە خەڵك ڕادەگەیەنن.

وشەی: ﴿ قَرْيَةٍ ﴾، کە بە: (قُرَى) کۆ دەکرێتەوە، واتە: ئاوەدانیی گەورە، نەك بەو چەمکە باوەی کە ئێستا هەیە، کە (قَرْيَة) بە مانای (رِيْف)و، (قُرَى) بە مانای (أرْيَاف)، واتە: گوند یان ئاوەدانیی بچووك مانا دەکرێ، لە قورئاندا بە مانای شاری گەورەو قەڵەباڵغ و ئاوەدانیی گەورە، بەکارهێنراوەو، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، هیچ کامیان لە ئاوەدانیی گەورەدا نەبێ، ڕەوان نەکراون، چونکە لە ئاوەدانیی گەورەدا، پەیامەکە زیاتر بڵاو دەبێتەوە، نەك لە کوێرە دێیەك و شوێنێکی لاپەڕگەدا، کە دەنگ و سەدای ئەو پەیامە باش بە خەڵك ناگات، بۆیە زانایانی زمان دەڵێن: (القَرْيَةُ: المَدِيْنَةُ العَامِرَةُ)، شارێکی ئاوەدان و قەڵەباڵغ، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: لە هیچ ئاوەدانییەکی قەڵەباڵغدا، لە هیچ

شارێکی گەورەدا، هیچ ترسێنەرو وشیارکەرەوەیەکمان ڕەوانە نەکردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی ئەو ئاوەدانییە، گوتوویانە: ئێمە بەوەی ئێوە پێی ڕەوانکراون، بێبڕواین، ﴿مُتۡرَفُوهَآ﴾، (أي: مُنَعَّمُوهَا)، خۆشگوزەرانەکانی، کە بەشێك لە زانایانی ڕوونکەرەوەی قورئان گوتوویانە: (أَصْحَابِ السُّلْطَانِ وَالجَاهِ وَالمَال)، ئەوانەی خاوەنی دەسەڵات و سامان و پێگەی کۆمەڵایەتیین، بە پێی عورف و باوی لاسەنگی ئەو کۆمەڵگایانە، کە دەسەڵاتدارانی خۆ سەپێن بەڕێوەیان دەبەن و، بە زۆریی وایە لە ژیانی بەشەردا، کە دەسەڵات و سامان (السُّلْطَة وَالثَّرْوَة)، هەر پێکەوەن، بۆیە ئەوانەی خۆشگوزەران بوون، بێگومان هەر حوکمڕانە خۆ سەپێنەکان بوون، هەر هەمان ئەوانەی خۆیان بە زلگرتوە، ئەوانیش بوون دەستیان بەسەر سەروەت و ماڵ و سامانی کۆمەڵگادا گرتوە، بە حەڕامیی، وەك ئێستاش دەیبینین، هەمیشە دەوڵەمەندە، پارەی حەرام کۆکەرەوەکان، لە پەنای حوکمڕانە خۆسەپێن و بە زەبرو زۆرەکاندا دەبن و، ئەو دووچینە هەمیشە پێکەوەن، دەسەڵاتدارەکان، بەهرە لە موڵك و سامانی ئەوان وەردەگرن و، ئەوانیش لە دەسەڵاتی نا شەرعیی ئەوان بەهرەمەند دەبن، بۆ بەسەرێکەوە نانی سەروەت و سامانی حەرام، هەروەها حوکمڕانە خۆسەپێنەکان، سوود وەردەگرن لە سەروەت و سامانی حەرام، بۆ چەواشەکردنی خەڵك و خۆسەپاندن، وەك ئامرازێك بۆ هێشتنەوەی حوکمڕانیی خۆ سەپێنانەی خۆیان.

٢)- ﴿وَقَالُواْ نَحۡنُ أَكۡثَرُ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا﴾، هەروەها (خۆشگوزەرانەکان لە حوکمڕانانی خۆ سەپێن و، لە ساماندارانی گەندەڵ و پۆخڵ) گوتیان: ئێمە سامانمان زیاترەو، وەچە و منداڵمان زیاترن.

٣)- ﴿وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ ئێمەش لە سزا دراوان نابین، یانی: لە ڕۆژی دواییدا.

پێویستە بزانرێ، کە لێرەدا دەڵێن: ﴿إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾، ئێمە بەوەی کە پێی ڕەوان کراون بێبڕواین، مەبەستیان ئەوە نەبووە، دان بەوە دابنێن، کە ئەوانە لەلایەن خواوە ڕەوانە کراون، بەڵکو واتە: ئەوەی ئێوە خۆتان لاف

لێدەدەن و داوای دەکەن، کە ڕەوانە کراون، ئێمە باوەڕمان بەوە نیە، کە پێی ڕەوان کراون و پێتانە.

لە تەفسیری ئەوەدا کە دەڵێن: ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾، ئێمە لە سزادراوان نابین، لە ئازاردراوان نابین، (الطبري)، لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1]، عیبارەتێکی جوان دێنێ، دەڵێ: ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾ يقولون: وَمَا نَحْنُ فِي الآخِرَةِ بِمعذَّبين، لِأَنَّ اللَّهَ لَوْ لَمْ يَكُنْ رَاضِيًا مَا نَحْنُ عَلَيْهِ مِنَ الْمِلَّةِ وَالْعَمَلِ، لَمْ يُخَوِّلْنَا الْأَمْوَالَ وَالْأَوْلَادَ، وَلَمْ يَبْسُطْ لَنَا فِي الرِّزْقِ، وَإِنَّمَا أَعْطَانَا مَا أَعْطَانَا مِنْ ذَلِكَ، لِرِضَاهُ أَعْمَالَنَا، وَآثَرَنَا بِمَا آثَرَنَا عَلَى غَيْرِنَا، لِفَضْلِنَا، وَزُلْفَةٍ لَنَا عِنْدَهُ).

کە دەڵێن: ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾، دەڵێن: ئێمە لە ڕۆژی دواییدا، لە سزا دراوان نابین، چونکە ئەگەر خوا ﷻ ڕازی نەبووایە لەو ڕێبازەی کە ئێمە لەسەرینی و، ئەو کردەوەیەی ئێمە دەیکەین، ئەو سامان و منداڵانەی پێ نەدەداین و، بژیوی بۆ فراوان نەدەکردین، بەڵکو ئەوەی کە پێیداوین، بۆیە پێیداوین، چونکە لە کردەوەکانمان ڕازییە، بۆیەش ئێمەی بەسەر غەیری خۆماندا هەڵبژاردوە، لەبەر ئەوەی کە ئێمە چاکترین و، ئێمە لەلای ئەو نیزیکین و، پەسەند کراوین.

واتە: ئەو قسەیەی ئەوان، ئەوە چەمك و واتایەکەیەتی، کە بە تەئکید ئەوە خەیاڵ پڵاوێکی بێ مانایەو، کێشان و پێوانێکی زۆر لاسەنگ و لاتەڵانەیە، بەڵام مرۆڤ کە پێوەری ناهەق بوو، تەرازووەکەی لاسەنگ و لاتەڵ بوو، کێشراوەکانیشی، هەمیشە لاتەڵ و لا سەنگ دەردەچن.

---

(١) جامع البيان، ج٢٢، ص١٠٥.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە بژیو فراوان و تەنگکردنەوە بە دەست خوایەو، پەیوەندیی بە چاکیی و خراپیی مرۆڤەکانەوە نیەو، سامان و منداڵیش مایەی لە خوا نیزیکیی نین، بەڵکو ئیمان و کردەوەی باش، سەنگی مەحەکەو، بڕوادارانیش لە کۆشکە بەرزەکانی بە هەشتدا دەبن و، دژایەتیکەرانی ئایەتەکانی خواش، لە سزای دۆزەخ دا ئامادەو حەپس دەکرێن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِي ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ فِي ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿٣٨﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:**

**١)- ﴿قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ﴾، بڵێ: بێگومان پەروەردگارم بۆ هەر کەس بیەوێ، بژیو فراوان دەکات و وەتەنگ دێنی.**

**ئەمە زانایان دوو واتایان بۆ لێکداوەتەوە: - کە لە چەند شوێنێکی قورئاندا ئەم تەعبیرە هاتوە -**

**أ- بۆ تاک تاکی مرۆڤەکان، خوا جاری وایە بژیوی بۆ فراوان دەکات، جاری واش هەیە لێی وەتەنگ دێنێ.**

**ب- یاخود: (إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ، وَيَقْدِرُ الرِّزْقَ عَلَى مَنْ يَشَاءُ)، پەروەردگارم بۆ هەرکەسێکی بوێ بژیوی بۆ فراوان دەکات و، هەرکەسێکیشی بوێ، لێی وەتەنگ دێنێ. واتە: ئەوەی کە بژیوی بۆ فراوان دەکات، جیایە لەوەی کە لێی وەتەنگ دێنێ.**

بێگومـان پـەروەردگارم بـۆ هــەر کــەس بیــەوێ بژێـو فـراوان دەکات، واتــە: زۆر دەکات و، بـۆ هـەر کەسێکی دیکـەش بیـەوێ، بژێـوی لـێ وەتەنـگ دێنـێ، یـانی: لێـی کـەم دەکات.

٢)- ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، واتە: زۆربەی خەڵکی نازانن کە بژێو زۆرکران و کەمکران، فراوان کران و تەنگ کران، نیشانەی ئەوە نیە کە خوا بژێو بۆ ئەو کەسە فراوان دەکات، کە لێی ڕازییەو، ئەوی دیکە کە لێی کەم دەکاتەوە، لێی تووڕەیە، بەڵکو بژێو فراوان بوون و تەنگ بوون، چەند هۆکارێکی دیکەی هەن و، بۆ ئەوەی بزانی: کە ئایا لە خوا نیزیکیی یان دووری، خوا لێت ڕازییە، یان لێت تووڕەیە؟ دەبێ شتی دیکە بکرێتە پێوەر، ئیمان و کردەوەی چاك بکرێتە پێوەر، نەك مەسەلەی ژیان و گوزەران و بژێو.

لــە تەفسـیری ئــەم ئایەتــە موبارەکــەدا: ﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ﴾، (الطـبري) لــە تەفسـیرەکەی دا[1]، گوتوویــەتی: (قُـلْ لَهُـمْ يَـا مُحَمَّـدُ: ﴿ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ﴾[سـبأ: ٣٦] مِـنْ خَلْقِـهِ، فَيُوَسِّـعُ عَلَيْـهِ تَكْرِمَـةً وَغَـيْرَ تَكْرِمَـةٍ، وَيَقْـدِرُ عَـلَى مَـنْ يَشَـاءُ مِنْهُـمْ، فَيُضَيِّقُـهُ وَيَقْـتُرُهُ إِهَانَـةً لَـهُ وَغَـيْرَ إِهَانَـةٍ، بَـلْ مِحْنَـةً وَاخْتِبَـارًا).

واتــە: ئــەی موحەممــەد! بڵــێ: بێگومـان پـەروەردگارم بژێـو بـۆ هــەر کەسـێك و خەڵکێـك فـراوان دەکات، وەك ڕێزلێگرتـن و، وەك جیـا لـە ڕێزلێگرتنیـش، یاخـود بژێـو وەتەنـگ دێنـێ، بـۆ هــەر کەسـێك کـە بیـەوێ، بەرتەسـکی دەکاتـەوە، وەك بێڕێزیـی و، وەك جیـا لـە بێڕێزییـش، بەڵکـو وەك تاقیکردنـەوەو جەڕبانـدن.

هەروەهـا (الطـبري) دەڵـێ: (فَيُضَيِّـقُ عَـلَى مَـنْ يَشَـاءُ، لَا لِمَحَبَّـةٍ فِيمَـنْ يَبْسُـطُ لَـهُ ذَلِـكَ، وَلَا خَـيْرٍ فِيـهِ وَلَا زُلْفَـةٍ لَـهُ، اسْـتَحَقَّ بِهَـا مِنْـهُ، وَلَا لِبُغْـضٍ مِنْـهُ لِمَـنْ قَـدَرَ عَلَيْـهِ ذَلِـكَ، وَلَا مَقْـتٍ، وَلَكِنَّـهُ يَفْعَـلُ ذَلِـكَ مِحْنَـةً لِعِبَـادِهِ وَابْتِـلَاءً، وَأَكْـثَرُ النَّـاسِ لَا يَعْلَمُـونَ أَنَّ اللَّـهَ

---

(١) جامع البيان، ج٢٣، ص١٠٧.

يَفْعَلُ ذَلِكَ اخْتِبَارًا لِعِبَادِهِ، وَلَكِنَّهُمْ يَظُنُّونَ أَنَّ ذَلِكَ مِنْهُ مَحَبَّةٌ لِمَنْ بَسَطَ لَهُ، وَمَقْتٌ لِمَنْ قَدَرَ عَلَيْهِ)[1].

واتە: خوا بژیو لە هەر کەسێك تەنگ دەکاتەوە، نەك لەبەر ئەوەی کە بژیوی بۆ فراوان دەکات، خۆشی بویّ و، لەبەر ئەوەی چاکەیەکی هەیەو، لەبەر ئەوەی نیزیکییەکی هەیە لە خواو، بە هۆی ئەوەوە شایستەی ئەوە بووە، هەروەها ئەوەی کە بژیوی لێ وەتەنگ دێنێ و بژیوی لێ کەم دەکاتەوە، لەبەر ئەوە نیە، کە خوا ڕقی لێ هەڵدەستێ و لێی تووڕە بووە، بەڵکو بۆیە خوا ﷻ وا دەکات، کە بژیو بۆ هەندێکیان فراوان دەکات و، بۆ هەندێکیان تەسك دەکاتەوە، وەك تاقیکردنەوەی بۆ بەندەکانی و، وەك جەڕباندنی بۆیان، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، کە خوا وەك تاقیکردنەوە بۆ بەندەکانی، ئەوە دەکات، زۆربەی خەڵك ئەوە نازانن، بەڵکو پێیان وایە ئەوەی بژیوی بۆ فراوان دەکات، خوا خۆشیدەویّ و، ئەوەش کە لێی وەتەنگ بێنێ ڕقی لێ هەڵدەستێ. [لەوەش دا نەیانپێکاوە].

ئەم تەعبیرە لە سوورەتی (الفجر)یش دا، خوا ﷻ هێناویەتی، دەفەرمویّ: ﴿ فَأَمَّا ٱلْإِنسَـٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَـٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ ٱلْيَتِيمَ ﴿١٧﴾ ﴾.

واتە: مرۆڤ (واتە: مرۆڤێك کە دەستی هیدایەتی خوای نەگەیوەتێ، یان مرۆڤی بێبڕوا)، کاتێك پەروەردگاری تاقیدەکاتەوەو بژیوی بۆ فراوان دەکات، بە هۆی سامان پێدانەوە ڕێزی لێ دەگریّ، دەڵێ: پەروەردگارم ڕێزی لە من گرت، بەڵام ئەگەر بژیوی لێ وەتەنگ بێنێ و، بەوە تاقیبکاتەوە، دەڵێ: پەروەردگارم منی بێڕێز کرد، (خوا دەفەرمویّ:) نەخێر وانیە، بەڵکو ئێوە ڕێزی هەتیو ناگرن.

واتە: نە لە حاڵەتی بژیو بۆ فراوان کردن دا، مانای ئەوەیە خوا ڕێزی لێگرتووە، نە لە حاڵەتی بژیو لێ وەتەنگ هێناندا، مانای وایە خوا بێ ڕێزی کردوە، بەڵکو بەڕێزیی و بێڕێزیی، لە لای خوا تەرازوو و پێوەری دیکەیان هەیە.

---

(1) جامع البيان، ج٢٢، ص١٠٥.

بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ:

٣)- ﴿ وَمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُم بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمۡ عِندَنَا زُلۡفَىٰٓ ﴾، هەروەها سامانەکانتان و منداڵەکانتان هۆکاری ئەوە نین، کە بە نیزیکخستنەوە، لە ئێمەتان نزیک بخەنەوە، ﴿ بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمۡ عِندَنَا زُلۡفَىٰٓ ﴾، یانی: (بِالَّتِي تُقَرِّبُكُم مِنَّا قُرْبَةً)، وەك نیزیکیی لە ئێمەتان نیزیك بخەنەوە، ماڵ و سامان و منداڵ و ڕۆڵەکانتان هۆکاری ئەوە نین.

٤)- ﴿ إِلَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ﴾، جگە لە کەسێك کە ئیمانی هێناوەو کردەوەی باش دەکات، ئەوە دەگونجێ ماڵ و سامانەکەی و، منداڵ و ڕۆڵەکانی بەکاربێنێ بۆ لە خوا نیزیك کەوتنەوە، سامانەکەی لە پێناوی خوادا ببەخشێ و، منداڵەکانی بەو شێوەیە پەروەردە بکات، کە خوا پێی خۆشەو، بە کەڵکی ماڵ و خێزانیان و کۆمەڵگایان بێن، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە خوا نیزیك ببنەوە بە هۆی ئەو ماڵ و سامانەوە، کە بە حەڵاڵیی پەیدایان کردووەو، لە ڕێی خوادا دەیبەخشن و، بە هۆی ئەو منداڵانەوە کە دیسان ئەوانیش وەچەیەکی پاکن و، بە شێوەیەکی پاك و چاك، پەروەردە کراون و ڕاهێنراون و بارهێنراون، کە بە کەڵکی خۆیان و ماڵ و خێزانیان و کۆمەڵگایان بێن، ئا ئەوە:

٥)- ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَزَآءُ ٱلضِّعۡفِ بِمَا عَمِلُواْ ﴾، (کەسانێك کە ئاوا بن) ئەوانە پاداشتی چەند بەرانبەریان هەیە، بە هۆی ئەوەوە کە کردوویانە، یانی: (لَكِنْ مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً سَيُقَرِّبُهُمْ عَمَلُهُمْ إِلَيْنَا)، ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، کردەوەکەیان لە ئێمەیان نزیك دەخاتەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ جَزَآءُ ٱلضِّعۡفِ ﴾، واتە: (الجَزَاءُ المُضَاعَف)، ئەوانە پاداشتی چەند بەرانبەر یان چەند قاتکراوە، وشەی: ﴿ ٱلضِّعۡفِ ﴾یش، یانی: (المُضَاعَفُ المُكَرَّر فَيَصْدُقُ بِالمُكَرَّرِ مَرَّةً وَأَكْثَر)، پاداشتێك کە دووبارە کرابێتەوە، ئنجا یەك جار دووبارە کرابێتەوە، یان زیاتر، واتایەکەی هەر دەیگەیەنێ.

٦)- ﴿ وَهُمۡ فِي ٱلۡغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴾، ئەوان لە کۆشکە بەرزەکاندا، بە دڵنیایی بەبێ ترس و بیمی نیشتەجێن، (الغُرُفَات جَمْعُ غُرْفَة، وَهِيَ البَيْتُ العالِي)، کۆشکی بەرز، خانووی بەرز

که به (غُرَف)یش هاتوه، له قورئانداو به (غُرُفَات)یش هاتوه، که (غُرفَة) تاکەکەیەتی، واته: کۆشکی بەرز، ئەوه به نسبەت کەسانێکەوه که سامان و ڕۆڵەکانیان بەکاردێنن له ڕەزامەندیی خوادا.

٧)- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ ﴾، بەڵام ئەوانەیان که له دژی ئایەتەکانی ئێمه تێدەکۆشن، هەوڵ دەدەن، ﴿ مُعَٰجِزِينَ ﴾، (أي: مُغَالِبِيْنَ مُطَالِبِيْنَ العَجْزَ بِظَنِّهِمْ)، واته: که به خەیاڵی خۆیان زاڵ بین بەسەر خوادا، بەسەر ئایەتەکانی ئێمەدا، بەسەر هەڵگرانی ئایەتەکانی ئێمەدا، بەسەریاندا زاڵ بین، یاخود له سزای ئێمه دەرباز بین، دیاره وا خەیاڵ دەکەن.

٨)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴾، ئا ئەوانه له نێو ئازاردا ئاماده دەکرێن، یانی: سجن و زیندانیی دەکرێن، (حَاضِر) ئاماده، کەسێکه بۆ خۆی، بۆ شوێنی بچێ، بەڵام (مُحْضَر) ئاماده کراو، کەسێکه هێنرابێ و پەلکێش کرابێ، خوا ﷻ هەمیشه له قورئاندا بۆ کافرەکان دەفەرموێ: ﴿ مُحْضَرُونَ ﴾، ئامادەکراون، هێنراون، پەلکێش کراون، وشەی: ﴿ ٱلْعَذَابِ ﴾، جاری دیکەش باسمان کردوه که (أل)ی ناساندن (تعريف)ی لەسەره، لێرەدا مەبەست پێی ناساندنی (عهد)ه، واته: له سزایەکەداو، له ئازارەکەدا که ئازاری دۆزەخه، لەوێدا ئاماده دەکرێن، پێغەمبەری خوا ﷺ له بارەی چەند بەرانبەر کردنەوەی پاداشتی ئیمانداران، فەرمایشتی زۆرن، یەکێك له فەرمایشتەکان ئەوەیه که پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ، الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ}، (أخرجه: مسلم: ١٦٤)، واته: هەموو کردەوەکانی ڕۆڵەی ئادەم چەند بەرانبەر دەکرێنەوه، {مەبەست پێی کردەوه چاکەکانن، چاکه به ده (١٠) وێنەی خۆی} تاکو حەوتسەد (٧٠٠) وێنەی خۆی.

هەندێك له زانایانیش دەڵێن: حەوتسەد هێندەکەش، هەر بۆ زۆرییه، ئەگەرنا مەرج نیه بەس ئەوەندەش بێ، بەڵکو هەتا نیەتەکەی باشتر بێ و، کردەوەکە شەرعیترو، ڕێکتر بێ، پاداشتەکەی زیاتره.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە ڕایبگەیەنێ: پەروەردگارم بە ویستی ڕەهای خۆی، بژێو بۆ بەندەکانی زۆر یان کەم دەکات، هەرچییەکیش بەندەکان ببەخشن، بۆیان قەرەبوو دەکاتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ﴿٣٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ ﴾، بڵێ: پەروەردگارم بۆ هەر کام لە بەندەکانی بیەوێ، بژێوی بۆ فراوان دەکات، جاری واش هەیە بۆی کەم دەکاتەوە.

٢)- ﴿ وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ ﴾، هەر شتێك ببەخشن زۆر یان کەم، ئەو شوێنی پڕ دەکاتەوە، (يَعْنِي: يَجْعَلُ لَهُ خَلَفاً)، یانی: شوێنی پڕ دەکاتەوەو، قەرەبووی دەکاتەوە.

٣)- ﴿ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ﴾، ئەو باشترینی بژێودەرانە.

ئەوەی پێشێ بۆ بەرپەرچدانەوەی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان و کافرەکان بوو، کە لە ڕوانگەیەکی دنیاییەوە، تەماشای شتەکان دەکەن، تەماشای نازو نیعمەتی دنیا، تەماشای سەروەت و سامان و ڕۆڵەکان دەکەن، بەڵام ئەمەیان بۆ هاندانی بڕوادارانە، لەسەر بەخشین، بە بەڵگەی ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ ﴾، خوا بژێو فراوان دەکات، بۆ هەر کام لە بەندەکانی و، جاری واش هەیە بۆی وەتەنگ دێنێ، بۆیە لێرە دەفەرموێ: ﴿ وَيَقْدِرُ لَهُ ﴾، لێرەدا: ﴿ لَهُ ﴾، زیاد کراوە، لە ئایەتی پێشێ دا فەرمووی: ﴿ وَيَقْدِرُ ﴾، وەتەنگ دێنێ، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَيَقْدِرُ

لَهُۥ ﴾، یانی: بژێویشی لێ وەتەنگ دێنێ و بۆی کەم دەکاتەوە، لەبەر خۆی و بەرژەوەندیی وی تێدایە. ﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ﴾، هەر شتێك ئێوە ببەخشن، بەدڵنیاییی ئەو قەرەبووی دەکاتەوەو، شوێنی پڕ دەکاتەوە. ﴿ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾، ئەویش باشترینی بژیوەدەرانە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، کە خوای بەرز دەفەرمووێ: (يَا ابْنَ آدَمَ أَنْفِقْ، أُنْفِقْ عَلَيْكَ) (أخرجه البخاري: ٧٤٩٦، ومسلم: ٥٩٣)، واتە: ئەی ڕۆڵەی ئادەم! ئەی کوڕی ئادەم! ببەخشە، منیش پێت دەبەخشم.

هەروەها لەو بارەوە فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەر ﷺ هەیە، کە دەفەرمووێ: (مَا مِنْ يَوْمٍ يُصبِحُ العِبادُ فِيهِ إِلَّا مَلَكَانِ يَنْزِلانِ، فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا: أَللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا، وَيَقُولُ الآخَرُ: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفاً) (أخرجه البخاري: ١٤٤٢، ومسلم: ٣٣٢٣).

واتە: هیچ ڕۆژێ نیە، بەندەکان ڕۆژی تێدا بکەنەوە، سەر لەبەیانییەکەی دوو فریشتە دانەبەزن، یەکێکیان دەڵێ: ئەی خوایە! هەر کەسێك دەبەخشێ، بۆی قەرەبوو بکەوە، ئەوی دیکەشیان دەڵێ: ئەی خوایە! ئەوەی نابەخشێ و دەست دەگرێتەوە، ماڵەکەی بفەوتێنەو، بەرەکەت و پێز لە ماڵەکەی هەڵبگرە.

لەو بارەوە کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ﴾، هەر شتێك ئێوە ببەخشن، خوا قەرەبووی دەکاتەوە، جگە لەو دوو فەرمایشتەی هێنامانن، زانایان لەو بارەوە کە چۆن قەرەبوو دەبێتەوەو، چۆن خوا کەلێنی پڕ دەکاتەوە؟ چەند ڕایەکیان هێناون:

١- وەك خۆی، یاخود زیاتر، خوا بۆی زیاد دەکات، لە هەمان ئەو جۆرە شتەی بەخشیویەتی.

٢- پاداشتەکەی بۆ قەرەبوو دەکاتەوە، هەر لە دنیادا، بەڵام بە شتێکی دیکەی جگە لەوەی بەخشیویەتی.

٣- پاداشتەکەی بۆ هەڵدەگرێ و لە ڕۆژی دواییدا، دەیبینێتەوە، هەڵبەتە ڕایەکەی دیکەش کە دەڵێ: خوا لە دنیادا بۆی قەرەبوو دەکاتەوە، مانای وانیە لە قیامەتیش پاداشتی نیە.

٤- جاری واش هەیە، ئەو بەخشینە دەبێتە هۆی ئەوە کە لەشی ساغ بێ، یاخود دەبێتە هۆی ئەوەی کە تەمەنی درێژ بێ، یاخود دەبێتە هۆی ئەوە کە حاڵ و باڵی چاك بێ.

هەرکام لە: (إبن العربي) لە (أحكام القرآن)دا، و (إبن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، بە تێکەڵیی ئەو قسانەیان هێناون.

دوا سەرنجمان لە بارەی ئەو ئایەتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ ﴾، ئەوەیە کە: ﴿ لَهُۥ ﴾، لێرەدا لەبەر ئەوەی قسە لە بارەی ئەهلی ئیمانەوەیە، بۆیە جاری وا هەیە بژێو تەنگکردنەوەی خوا لێیان، لە بەرژەوەندییانە، چونکە لە ڕاستییدا بە هۆی ئیمانەوەو، بە ئیمان تامی شتەکان دەگۆڕێ، جاری وایە کەسێك بە نەداریی و هەژارییەکەی خۆی سوپاسگوزارەو شوکرانە بژێرەو، پێی دڵ ئاسوودەو موڕتاحە، جاری وا هەیە خوا ﷻ بژێو لە یەکێك بەندەکانی تەنگ دەکاتەوە، چونکە بەرژەوەندیی لەوەدا هەیە، هەڵبەتە ئەگەر ئیماندار بێ، کاتێك خوا بژێوەکەی لێ کەم دەکاتەوە، یاخود لە کەسابەتێکدا سەروەت و سامانێکی لە دەست دەچێ، ئەگەر ئەهلی ئیمان بێ، دەڵێ: خوای پەروەردگار بردوویەتەوەو، من تاقی دەکاتەوەو، دیارە خێرو بەرژەوەندییم لەوەدایە، بۆیە بۆ ئەمیان دەفەرموێ: ﴿ وَيَقْدِرُ لَهُۥ ﴾، بۆ وی ڕزقەکەی کەم دەکاتەوە، چونکە ئیماندارە، دیارە بەرژەوەندیی لەوەدایە، بەڵام بۆ ئەوی دیکە هەر فەرموویەتی: ﴿ وَيَقْدِرُ ﴾، لەبەر ئەوەی بابای بێبڕوا، وادەزانێ: ئەگەر خوا ڕزقی زۆری بداتێ، دیارە خۆشی دەوێ و، ئەگەر لێشی کەم بکاتەوە، دیارە ڕقی لێ هەڵدەستێ، خوای پەروەردگاریش هەر بە پێی گومانی خۆیان، مامەڵە لەگەڵ بەندەکانی دا دەکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان شەش ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٤٠ - ٤٥)، تەوەری بنەڕەتیی ئەو شەش ئایەتەش، باسی ڕۆژی قیامەتەو، ئەو سەرەنجامە شوومەیە کە هاوبەشدانەران گیرۆدەی دەبن، هەروەها باسی هەڵوێستی کەللە ڕەقانەی بێبڕوایان کراوە لە بەرانبەر پێغەمبەری خواداو، ئەو ئایەتە ڕۆشنانەی خوا ﷻ، کە پێغەمبەر ﷺ بە سەریاندا دەخوێنێتەوە، پاشان سەرنجڕاکێشانی هەموو لایەك بۆ گەلانی پێشوو، کە چۆن گرفتاری سزای خوای دادگەر بوو ون، بە هۆی عینادیی و مکوڕ بوونیانەوە لەسەر بێبڕوایی و، گوێی خۆ خەواندنەوە لە ئاستی هەقدا.

﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا۟
سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾
فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم
بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا
كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ وَقَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ إِنْ
هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٣﴾ وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا ۖ وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن
نَّذِيرٍ ﴿٤٤﴾ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُوا۟ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ فَكَذَّبُوا۟ رُسُلِى ۖ فَكَيْفَ
كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها (یاد بکەوە) ئەو ڕۆژەی کە (خوا، هاوبەشدانەرەکان) هەموویان کۆدەکاتەوە، دوایی بە فریشتان دەفەرموێ: ئایا ئەوانە ئێوەیان دەپەرست؟ ﴿٤٠﴾ (فریشتەکان) گوتیان: پاکیی بۆ تۆ (کە هیچ کەس و هیچ شتێك شایستەی پەرستران بێ، جگە لە تۆ)، بەس تۆ دۆست و سەرپەرشتیارمانی، نەك ئەوان، بەڵکو ئەوانە جندیان دەپەرستن، زۆربەیان پێیان بڕوادار بوون (وەك پەرستراو) ﴿٤١﴾ ئنجا ئەمڕۆ هیچ کامتان سوودو زیانی یەکدیتان بە دەست نیەو، بەوانەی ستەمیان کردوە دەڵێین: ئازاری ئەو ئاگرە بچێژن، کە بە درۆتان دادەنا ﴿٤٢﴾ کاتێکیش ئایەتە ڕۆشنەکانمانیان بەسەردا بخوێنرێنەوە، دەڵێن: ئەم (موحەممەد)ە، تەنیا پیاوێکە دەیەوێ لاتان بدات، لەوەی باب و باپیرانتان دەیانپەرست، هەروەها گوتیان: ئەم (قورئان)ە، بەس درۆیەکی (بە ناو خواوە) هەڵبەستراوە، دیسان ئەوانەی بێبڕوان بە (پەیامی) هەقیان گوت، کاتێك بۆیان هات، ئەمە تەنیا جادوویەکی ئاشکرایە ﴿٤٣﴾ ئێمە (پێشتر) کتێبانێکمان پێ نەدابوون، لێیان بکۆڵنەوەو، لە پێش تۆش دا هیچ ترسێنەرێکمان (وریاکەرەوەیەکمان) بۆیان نەنارد بوو ﴿٤٤﴾ ئەوانەی پێش وانیش، پەیام و پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ دانا (سەرەنجامیش سزادران) لە حاڵێك دا کە (لە توانا و دەستڕۆیشتوویدا) ئەمانە نەگەیشتبوونە دەیەکی ئەوەی بەوانمان دابوو، ئنجا ئەوان پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، دەجا سەرنج بدە! نکووڵییکردنم (و سزادانم بۆیان) چۆن بوو! (زۆر سەخت و بێڕەزا بوو) ﴿٤٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(إِفْكٌ ): (الإِفْكُ: كُلُّ مَصْرُوفٍ عَنْ وَجْهِهِ الَّذِي يَحِقُّ أَنْ يَكُونَ عَلَيْهِ، فَاسْتُعْمِلَ فِي الْكَذِبِ وَالبَاطِلِ)، (إفك): هەر شتێك لەو ڕووە كە پێویستە لە سەری بێ، لابدرێ، ئنجا دوایی بەكارهێنراوە بۆ درۆو قسەی پووچ و بەتاڵ.

(مُّفْتَرًى ): واتە: هەڵبەستراو، (الْفَرْيُ: قَطْعُ الجِلْدِ، وَالإِفْتِرَاءُ لِلإِصْلَاحِ والإِفْسَادِ، وَاسْتُعْمِلَ فِي الْكَذِبِ وَالشِّرْكِ وَالظُّلْمِ)، (فَرْي): بە مانای بڕینی پێست دێ، بۆ ئەوەی شتێكی لێ دروست بكرێ، (إفتراء) واتە: قسە دروستكردن، ئنجا هەم بۆ چاككردن و هەم بۆ خراپكردن، بەكاردێ، بەڵام زیاتر بۆ قسە هەڵبەستن بە خراپەو، بۆ درۆو شیرك و ستەم لە قورئاندا، بەكارهێنراوە.

(يَدْرُسُونَهَا ): واتە: بیخوێننەوە، لێی بكۆڵنەوە، دەگوترێ: (دَرَسْتُ العِلْمَ: تَنَاوَلْتُ أَثَرَهُ بِالحِفْظِ)، واتە: لەبەرمكردو لێم كۆڵیەوە، (وَالدِّرَاسَةُ: إِدَامَةُ القِرَاءَةِ)، (دِرَاسَة): بریتیە لە بەردەوام بوون لەسەر خوێندنەوەو لێكۆڵینەوەو لێوردبوونەوە.

(مِعْشَارَ ): (مِعْشَارُ الشَّيءِ: عُشْرُهُ)، (مِعْشَار): واتە: دە یەك، یەك لەسەر دە.

(نَكِيرِ ): یانی: ئینكار، نكووڵیلێكردن، دەگوترێ: (نَكَرْتُ عَلَى فُلَانٍ وأَنكَرْتُ: فَعَلْتُ بِهِ مَا يَرْدَعُهُ)، (نَكَرْتُ عَلَى فُلَانٍ وأَنكَرْتُ)، واتە: شتێكم پێكرد، كە بیسڵەمێنێتەوەو، بیپرینگێنێتەوە لەوەی دەیكرد، ئەو كەسەی ئەو سزایەی داوە، دیارە ئەو شتەی ئەو سزادراوە كردوویەتی، پێی خراپ بووە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ سـەرنجی هەمـوو لایـەك ڕادەكێشـێ بـۆ دیمەنـی ڕۆژی دوایـی، كاتـێ خـوا ﷻ فریشـتەکان و، هەروەهـا هەمـوو ئەوانـەی کـە جگـە لـە خوایـان پەرسـتوە، بـە تایبـەت کـە لافیـان لێـداوە: فریشـتەکان دەپەرسـتن، کۆیـان دەکاتـەوەو، پرسـیارو وەڵامیـان لەگەڵـدا دەکات، ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾، ئـەو ڕۆژە کـە تێکڕایـان کۆدەکاتـەوە، واتـە: یـادی ئـەو ڕۆژە بکـەوە، ﴿ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾، دوایـی بـە فریشـتەکان دەفەرمـوێ، خوێندراوەیشـەتەوە: (وَيَـوْمَ نَحْشُرُهُـم جَمِيْعَـاً، ثُـمَّ نَقُـوْلُ للمَلَائِكَـةِ)، ئـەو ڕۆژەی هەموویـان خڕدەکەینـەوەو، بـە فریشـتەکان، دەڵێیـن: ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ﴾، ئایـا ئەوانـە ئێوەیـان دەپەرسـت؟ واتـە: ئـەو بتپەرسـت و هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـە، ئێوەیـان دەپەرسـت، ئـەی فریشـتەکان؟ بێگومـان هەیانبـووە فریشـتەکانیان پەرسـتوون، بـەڵام ئـەوان لافـی ئەوەیـان لێـداوە کـە: فریشـتەکان پێیـان خۆشـە بیانپەرسـتین، یاخـود: بـە فەرمانـی فریشـتەکان دەیانپەرسـتین، بۆیـە خـوا ﷻ ئـەو پرسـیارەیان لـێ دەکات.

﴿قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ﴾، گوتیـان: پاکیـی بـۆ تـۆ، تـۆ بـە پـاك دەگریـن، یـانی: تـۆ بـە پـاك دەگریـن، کـە جگـە لـە تـۆ شایسـتەی پەرسـتن و بەندایەتیـی بـۆ کـران بـێ، ﴿أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم﴾، تـۆ دۆسـت و نیزیـك و سەرپەرشـتیاری ئێمـەی، نـەك ئـەوان، ﴿بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ﴾، بەڵکـو ئـەوان جندەکانیـان دەپەرسـتن، واتـە: ئەگـەر بـە ڕواڵەتیـش، فریشـتەکانیان پەرسـتبێ، بـەڵام بـە هاندانـی جنـدەکان بـووە، چونکـە فریشـتە خەڵـك هـان نـادەن، جگـە لـە خـوا بپەرسـترێ، کەواتـە: ئـەوە بـە دەسیسـەو پیلانـی شـەیتانە جنـدەکان بـووە، کـە ئێمەیـان پەرسـتبێ، یان هەرشـتێکیان پەرسـتبێ، ﴿أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ﴾، زۆربەیـان {بـەو جندانـەی کـە پەرسـتوویانن و هانیـان داون، جگـە لـە خـوا بپەرسـتن} پێیـان بـڕوادار بـوون.

ئنجا خوا ﷻ پێیان ده‌فه‌رموێ: ﴿ فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا ﴾، ئه‌مڕۆ هیچ کامتان، بۆ هیچ کامتان نه سوود ده‌گه‌یه‌نن، نه زیان، واته: نه سوودتان به ده‌سته‌و نه زیان، سوودتان به‌ده‌ست نیه، سوود به یه‌کدی بگه‌یه‌نن، زیانیشتان به ده‌ست نیه، زیان له یه‌کدیی وه‌دووربخه‌ن، یاخود سوود به که‌سێ بگه‌یه‌نن، که خۆشتان ده‌وێ و، زیان له که‌سێك بده‌ن، که ڕقتان لێیه‌تی، ئه‌وانه‌تان به‌ده‌ست نین، ئنجا خوا ﷻ به هه‌موویان ده‌فه‌رموێ، ﴿ وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ﴾، ئه‌وانه‌ی سته‌میان کردوه، پێیان ده‌ڵێین، ئه‌وانه‌ی سته‌میان کردوه، که جگه له خوایان په‌رستوه، هه‌روه‌ها ئه‌وانه‌ی سته‌میان کردوه، که په‌یامه‌کانی خوایان به درۆ داناون و بڕوایان به پێغه‌مبه‌ران (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) نه‌هێناوه، ﴿ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾، [پێیان ده‌فه‌رمووین:] سزای ئه‌و ئاگره بچێژن، که ئێوه پێی بێبڕوا بوون و، به درۆتان داده‌نا.

ئنجا خوا ﷻ دوای نیشاندانی ئه‌و دیمه‌نه‌ی ڕۆژی دوایی، که ئه‌وانه‌ی جگه له خوا ده‌په‌رستن، تووشی چ سزاو سه‌رشۆڕییه‌ك دێن و، چۆن له‌وێ په‌رستراوه‌کانیان هیچ سوودیان پێ ناگه‌یه‌نن، هه‌موویان له‌وێ کڵۆڵ و ده‌سته پاچه ده‌که‌ون و، خواش ﷻ به‌و شێوه‌یه سه‌رزه‌نشتیان ده‌کات، ئنجا ده‌گوازێته‌وه بۆ بابه‌تێکی دیکه، ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ ﴾، کاتێك ئایه‌ته ڕۆشنه‌کانی ئێمه‌یان به‌سه‌ردا بخوێنرێنه‌وه، بێگومان له‌لایه‌ن موحه‌ممه‌ده‌وه ﷺ به پله‌ی یه‌که‌م، ئنجا جێنشین و جێگره‌کانی ئه‌و له دوای وی، ﴿ قَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ ﴾، گوتیان: ئه‌مه ته‌نیا پیاوێکه، ده‌یه‌وێ لاتان بدات، له‌وه‌ی باب و باپیرانتان ده‌یانپه‌رست، ﴿ قَالُوا۟ مَا هَٰذَآ ﴾، ئه‌مه هیچ نیه، ﴿ إِلَّا رَجُلٌ ﴾، جگه له پیاوێك، هه‌ڵبه‌ته به‌و شێوه‌یه ئاماژه‌کردن بۆ پێغه‌مبه‌ری خاته‌م ﷺ، مه‌به‌ستیان پێی نادیده گرتن و به که‌م ته‌ماشاکردن بووه، که دیاره هه‌ر که‌سه له هه‌مبانه‌ی خۆیدا گوێزان ده‌ژمێرێ، ئه‌گه‌رنا موحه‌ممه‌د ﷺ پێش پێغه‌مبه‌رایه‌تییش پیاوێکی ناسراو بووه‌و، شایسته‌ی ئه‌وه نه‌بووه، به‌و شێوه‌یه ئاماژه‌ی بۆ بکرێ، ﴿ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ ﴾، ئه‌مه هیچ شتێ نیه، جگه له پیاوێك،

﴿ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ ﴾، دەیەوێ لاتان بدات، لەوەی کە باب و باپیرانتان دەیانپەرست، کە ئەمەیان ڕاستە، موحەممەد ﷺ ویستوویەتی لەو ڕێیە چەوتەی کە باب و باپیرانیان لە سەری بوون و، لەو پەرستراوە ساختانەی باب و باپیرانیان پەرستوونیان، لایان بدات، ئەوە ڕاستە، ﴿ وَقَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ﴾، دیسان گوتیان: ئەمە هیچ نیە، جگە لە درۆیەکی هەڵبەستراو، واتە: درۆیەکی هەڵبەستراو بە ناوی خواوە، لێرەدا مەبەستیان لە: ﴿ مَا هَٰذَآ ﴾، قورئان بووە، یانی: (ما هذا القرآن إلاّ إفك مفترى)، ئەم قورئانە بەس درۆیەکی هەڵبەستراوە، بە ناوی خواوە هەڵیبەستوە، نەك خوا بۆی ناردبێ، ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، ئەوانەش کە بێبڕوا بوون بە هەقیان گوت، کاتێك بۆیان هات، (گوتیان:) ئەمە تەنیا جادوویەکی ئاشکرایە، ئەو هەقە کە لە پێغەمبەری خوادا ﷺ بەرجەستەیەو، لەو پەیامەدا کە خوا بۆی ناردوەو، لەو قورئانەدا کە بەسەریاندا دەخوێنێتەوە، هەموویان دەگرێتەوە، ئەو هەقە، ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: جگە لەوەی جادوویەکی ئاشکرایە، هیچی دیکە نیە!!

دوایی خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات، کە ئەوانە ئەو هەڵوێستەیان بووە، لە حاڵێکدا هیچ شارەزاییان نەبووە لە کتێبەکانی خواو، هیچ ترسێنەرو وریاکەرەوەیەکیان پێش موحوممەد ﷺ بۆ نەهاتوە، واتە: لە ڕۆژگاری نیزیکی هاتنی پێغەمبەردا ﷺ، نە کتێبێکیان بۆ دابەزێنراوەو، نە پێغەمبەرو ورياکەرەوەیەکیان بۆ نێردراوە، ﴿ وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا ﴾، ئێمە کتێبانێکمان پێ نەدابوون، بیانخوێننەوەو لێیان بکۆڵنەوەو، بەدواداچوونیان بۆ بکەن، ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ ﴾، لە پێش تۆشدا هیچ ترسێنەرو ورياکەرەوەیەکمان بۆ لا ڕەوان نەکردبوون، تۆ پشك و بەشی ئەوانی بە پلەی یەکەم، وەك پێغەمبەری خواو، قورئانیش پشك و بەشی ئەوانە لە کتێبەکانی خوا، بە پلەی یەکەم، ئەگەرنا قورئان بۆ هەموو بەشەرییەتە: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ١٠٤ ﴾یوسف، موحەممەدیش ﷺ بۆ هەموو بەشەرییەتە: ﴿ وَمَآ

أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾الأنبياء، بـەڵام دیـاره بـه پلـەی یەكـەم بـۆ گەلـی عـەرەب بـوون و لـه نێـو ئەوانیشـدا ئـەو خەڵكـەی، هاوچەرخـی پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ بـوون، واتـە: نـە لـە پێـش كتێبەكـەی تـۆدا هیـچ كتێبێكـی دیكەمـان بـۆ دابەزانـدوون، لـە پێـش ئـەو كتێبـەدا كـە بـۆ تۆمـان دابەزانـدوه، كـە قورئانـەو، نـە لـە پێـش تـۆش دا پێغەمبەرێكـی دیكەمـان بـۆ نـاردوون، وریاكەرەوەیـەك و ترسـێنەرێك، كەواتـە: دەبـوو زۆر بـە گـەرم و گوڕیـی، پێشـوازیی لـەو كتێبـەی خـوا بكـەن، كـە كۆتـا كتێبـی خوایـەو، لـەو پێغەمبـەرەی خـوا بكـەن، كـە كۆتـا پێغەمبـەرو ڕەوانـە كـراوی خوایـە بـۆ بەشـەر.

﴿ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئەوانـەی پێـش وانیـش بـە درۆیـان دانـا، چییـان بـە درۆ دانـا؟ پەیامەكانـی خوایـان بـە درۆ دانـان و، پێغەمبەرانـی خوایـان بـە درۆ دانـان و، كتێبەكانـی خوایـان بـە درۆ دانـان، بـەڵام لێـرەدا بـەركار (مَفْعُول بِـه)ی (كَـذَّبَ) قرتێـنراوه، بـۆ ئـەوەی هەموویـان بگرێتـەوه، ئەگـەر فەرموویـای: (وَكَـذَّبَ الَّذِيْـنَ مِـنْ قَبْلِهِـمْ بِرُسُـلِ اللـه، أو بِكُتُـبِ اللـهِ، أو بِرِسَـالَاتِ اللـهِ)، هـەر ئـەوەی دەگرتـەوه، بـەڵام ئەوانـەی پێـش وان سـیفەتیان بـە درۆ دانـان بـوو، بـۆ كتێبەكانـی خـواو، بـۆ پێغەمبەرانـی خـواو، بـۆ پەیامەكانـی خـواو، بـۆ ئـەو ڕاسـتییانەی كـە پێغەمبەرانـی خـوا (عَلَيْهِـم الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام)، هێناویانـن ﴿ وَمَا بَلَغُوا۟ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ﴾، بێبڕوایەكانـی ڕۆژگاری تـۆ، نەگەیشـتوونە یـەك لەسـەر دە (١٠/١)ی، ئـەوەی بەوانمـان دابـوو، توانـای ئەمـان نەگەیشـتۆتە یـەك لەسـەر دەی ئـەو توانایـەی بـۆ گەلانـی پێش خەڵكانـی تۆمـان ڕەخسـاند بـوو، ئـەوان زۆر خـاوەن تواناتـر بـوون، ﴿ فَكَذَّبُوا۟ رُسُلِى ﴾، كەچـی پێغەمبەرانـی منیـان بـە درۆ دانـا، بڕوایـان بـە پەیامەكانـی مـن نەكـرد، كـە بـە پێغەمبەرانـدا ناردبوومـن، ﴿ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾، ئنجـا ئایـا سـزادانی مـن، یاخـود: نكووڵیكردنـی مـن، ڕەخنـە گرتنـی مـن لێیـان، چـۆن بـوو؟! خـوا ڕەخنـە لـە كەسـێ بگـرێ و نكووڵیـی لـێ بـكات، دیـارە سـزای دەدات، چـۆن بـوو؟ زۆر سـەخت و بێـبەزا بـوو، كەواتـە: ئەوانیـش بـا وریابـن و پەنـد لـەوان وەربگـرن و، خۆیـان بـە مـەرەدی ئـەوان نەبـەن.

هەڵبەتە هەندێ لە زانایان گوتوویانە: ﴿وَمَا بَلَغُواْ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ﴾، واتە: کافرەکانی پێشێ نەگەیشتبوونە، یەك لەسەر دە (١٠/١)ی ئەوەی کە بەم خەڵکەی ڕۆژگاری تۆمان داوە، ئەی موحەممەد! ﷺ، لە تواناو دەسترۆیشتوویی ماددیی دا.

بەڵام ئەوە ڕایەکی بێهێزە، چونکە عەرەب لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هاتوە، نە دەوڵەتیان هەبووەو، نە قەوارەی سیاسیی و، نە ئیمکانیەت و دەستەڵاتێکی وایان هەبووەو، زیاتر کۆچەریی و بیابانشین بوون.

هەندێکی دیکەش وایان لێك داوەتەوە، کە مەبەست لێرەدا ئەوەیە: ئەو پەیامە بەرزەی کە بە گەلی تۆمان داوە، بەو خەڵکەی سەردەمی تۆ، ئەو قورئانەو، ئەو پێغەمبەرە ﷺو، ئەو هیدایەتە کە بۆیان هاتوە، ئەوانی پێشێ یەك لەسەر دەی ئەو هیدایەت و بەخشش و ڕووناکییەی خوای پەروەردگاریان پێ نەدراوە.

ئەمە لەگەڵ ئایەتەکەدا و لەگەڵ واقیعەکەشدا گونجاوە، قورئان تەواوترین کتێبی خوایەو، باشترین هیدایەت و ڕووناکیی خوایەو، موحەممەدیش ﷺ سەروەری پێغەمبەرانە، بەڵام سیاقی ئایەتەکان ئەو مانایەی یەکەمیان زیاتر دەگەیەنێ، کە مەبەست ئەوەیە خەڵکەکەی ڕۆژگاری تۆ نەگەیشتوونە دەیەك (١٠/١)ی ئەو تواناو دەست ڕۆیشتوویەی بە گەلانی پێشوومان دابوو - کەواتە: با بە تواناو دەسترۆیشتویەتیی خۆیان نەخورن - کەچی کاتێك پێغەمبەرانی منیان بە درۆ دانا، سزامدان، بەڵام چۆن سزادانێك! زۆر جێی سەرسوڕمان بوو، زۆر سەخت و بێبڕەزا بوو، هی ئەوەیە کە کافرەکانی ڕۆژگاری تۆ پەندو عیبرەت لەو سزادرانەی ئەو گەلە پێشووانە، وەربگرن.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**لە ڕۆژی کۆکرانەوەدا، خوا ﷻ پرسیار لە فریشتان دەکات، ئایا هاوبەشدانەرەکان ئێوەیان دەپەرست؟ ئەوانیش پاکیی بۆ خوا دەردەبڕن و، جەخت لەسەر تەنیا سەرپەرشتیارێتیی خوا ﷻ بۆ خۆیان، دەکەنەوە، خواش پێیان ڕادەگەیەنێ: کە لەو ڕۆژەدا هیچ کامیان سوودو زیانیان بۆ یەکدی نیە، نەپەرستراوەکان و نە پەرستەرەکان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ أَهَـٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا۟ سُبْحَـٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە: لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا﴾، ئەو ڕۆژە کە (خوا) تێکڕایان کۆدەکاتەوە، وشەی: ﴿يَحْشُرُهُمْ﴾، واتە: خڕیان دەکاتەوەو، کۆیان دەکاتەوە، خوێنراوەیشەتەوە: (وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ)، ئنجا (يَحْشُرُهُمْ)و (نَحْشُرُهُمْ)، یانی: خوا کۆیان دەکاتەوەو، ئێمە کۆیان دەکەینەوە، ﴿جَمِيعًا﴾، وشەی (جَمِيع، فَعِيلٌ بِمَعْنَى مَفْعُول: أي مَجْمُوع)، وشەی: (جَمِيْع) کە لەسەر کێشی (فَعِيْل)ە، بەڵام بە مانای (مَفْعُول)ە، یانی: (مجموع)، هەموویان، ئنجا کە دەفەرموێ: هەموویان کۆدەکەینەوە، یانی: هەموو جۆرەکانیان:

أ- **پەرستراوەکان:**

١- چ بە ویستی خۆیان بووبێ، وەك شەیتانەکان و تاغووت و فیرعەونەکان.

٢- چ بە ویستی خۆیان نەبووبێ، وەك فریشتەكان و، هەندێ لە پێغەمبەران و، هەندێ لە پیاوچاكان.

٣- چ ویستیان هەر نەبووبێ لە شتەكەدا، وەك مانگ و خۆرو ئەستێرەكان و، پەیكەرو ڕووەك و ژیاندارەكان و، هەموو ئەو شتانەی كە پەرستراون لە جیاتی خواوە، جگە لە خوا ﷻ هەموویان كۆدەكەینەوە.

ب- هەروەها پەرستەرەكانیش، ئەوانیش بە هەموو جۆرەكانیانەوە.

٢)- ﴿ ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (ثُمَّ نَقُولُ لِلْمَلَائِكَةِ)، دوایی بە فریشتەكان دەفەرموێ، یاخود بە فریشتەكان دەفەرمووین:

٣)- ﴿ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴾، ئایا ئەوانە ئێوەیان دەپەرست؟ هەڵبەتە ئەوە لەبەر ڕاهاویشتنە بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، وەك لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (إِيَّاكَ أَعْنِي وَاسْمَعِي يَا جَارَتِي)، یانی: قسە لەگەڵ تۆ دەكەم، بەڵام ئەی دراوسێیەكەم تۆش گوێت لێی بێ، یان لە كوردەواریی خۆمان دا دەڵێین: (دیوار لەگەڵ تۆمە، گوێسوانە گوێت لێ بێ)، خوا ﷻ كە ئەو دیمەنەی ڕۆژی دوایی، لێرەدا دەخاتە ڕوو، یانی: ئەوانەی جگە لە خوا دەپەرستن، ئەگەر فریشتەن، ئەگەر هەر شتێكن، لە ڕۆژی دوایی، ئاوا پرسیارو وەڵامیان لەگەڵدا دەكرێ و دادگایی دەكرێن، سەرەنجام زاریان دەبێتە تەڵەی تەقیو! هەڵبەتە هەمزە (أ)ی سەر: ﴿ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴾، هەمزەی پرسیاركردنی نكووڵیلێكەرانەیە، بێگومان دەشگونجێ بگوترێ: بۆ سەرزەنشتكردنە، بەڵام ئەوكاتە دەبێ ئاڕاستەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان بكری، چونكە فریشتەكان سەر زەنشتیان ئاڕاستە ناكرێ، فریشتەكان پاكن لە هەموو هەڵە و كەم و كوڕییەك، چ جای ڕێگا بدەن، یاخود داوا بكەن: لە جیاتی خوا، یان لەگەڵ خوادا بپەرسترێن؟! بەڵام سەر زەنشتەكە ئاڕاستەی بتپەرستەكان و خوانەپەرستەكان دەكرێ، چونكە هەندێ لە بتپەرستەكان گوتوویانە: فریشتەكان كچانی خوان، وەك لە سووڕەتی (الأنعام)دا، كاتی خۆی لە بەرگی پێنجی ئەم تەفسیرەدا، قسەمان لێ كردوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ

﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾﴾، واتە: بۆیان هەڵبەست کوڕان و کچان، بەبێ زانیاریی، دەیانگوت: شەیتانەکان کوڕانی خوان و فریشتەکان کچانی خوان.

٤)- ﴿قَالُوا سُبْحَانَكَ﴾ [فریشتەکان وەڵامیان دایەوە] گوتیان: پاکیی بۆ تۆ، ﴿سُبْحَانَكَ﴾، (أي: تَنْزِيهًا لَكَ، أنْ يَكُونَ لَكَ شَرِيْك)، پاکیی بۆ تۆ دەردەبڕین، کە تۆ هاوبەشت هەبێ، ئەم تەعبیرە: ﴿سُبْحَانَكَ﴾، (تَبَرُّءٌ مِنَ الرِّضَى بِأنْ يَعْبُدَهُمْ الْمُشْرِكُون)، حاشا کردن و دووریی گرتنە، لەوە کە ڕازیی بن، بەوەی هاوبەش بۆخوا دانەرەکان، بیانپەرستن، یان ڕازیی بووبن بیانپەرستن.

٥)- ﴿أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم﴾ [فریشتەکان لەسەر قسەکانی خۆیان بەردەوام بوون، دەڵێن:] تۆ جگە لەوان سەرپەرشتیاری ئێمەی، یانی: (لَا نُوالِي غَيْرَكَ)، ئێمە جگە لە تۆ دۆست و پشتیوانمان نیەو، دۆستایەتیی کەسێکی دیکە ناکەین، هیچکەس بە سەرپەرشتیاری خۆمان قبووڵ ناکەین.

خوا ﷻ باسی عیبادەت دەکات، بەڵام ئەوان لێرەدا باسی (وِلايـة و وَلَايـة) دەکەن، ویلایەت واتە: سەرپەرشتیی و، وەلایەت واتە: دۆستایەتیی، چونکە: (العِبَادَةُ وِلايـةٌ و وَلَايَـةٌ بَـيْنَ العَابِـدِ وَالْمَعْبُـود)، لـە ڕاستییدا پەرستنیش، بریتیە لە: سەرپەرشتیارییکردنی پەرستراو بۆ پەرستەرو، نیزیکیی و دۆستایەتیی نێوان پەرستراوو پەرستەر، کەواتە: ئەگەر سەرپەرشتیی و دۆستایەتیی و نیزیکیی نەبێ، مانای وایە پەرسترانیش لە ئارادا نیە، ئنجا دوایی فریشتەکان، هەر لەسەر قسەی خۆیان بەردەوام دەبن و دەڵێن:

٦)- ﴿بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ﴾، بەڵکو ئەو (بتپەرست)انە، ئەو جگە لە خواپەرستانە، بە هەموو جۆرەکانیانەوە، جیننیان دەپەرست، جندیش، وەك چۆن ئێمەی مرۆڤ لەسەر زەوی دەژین، ئەوانیش لەسەر زەوی دەژین و، هاو کات لەگەڵ مرۆڤدا نیشتەجێ بوون لەسەر زەوی، وەك لە ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی (الأعراف)دا، لە بەسەرهاتی ئادەم و حەووا (عَلَيْهِما السَّلَام)و ئیبلیسدا، بە درێژیی باسمان کردوە، ئەو ڕایە ڕاستە کە مرۆڤ و جند پێکەوە هاتوونە سەر زەوی، جندیش ئەو دروستکراوانەن، کە ئێمە ئەوان نابینین

و، ئەوان ئێمە دەبینن، وەك خوا لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ﴿٢٧﴾ ﴾، ئیبلیس و دارو دەستەکەی ئێوە، دەبینن، بێ ئەوەی ئێوە ئەوان ببینن.

ئنجا کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ﴾، بە تەئکید مەبەستیان هەموو جند نیە، (أي: الشَّيَاطِيْنَ مِنْهُمْ)، بەڵکو شەیتانەکانی جندو گەورەکانیان و لە خوا دوورەکانیان، چونکە جندیش وەك مرۆڤ، مسوڵمان و نامسوڵمانیان هەن، وەك لە سووڕەتی (الجنّ)دا، خوا ﷻ لەسەر زمانیان دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ ﴿١٤﴾ ﴾، ئێمە مسوڵمان و ملکەچمان هەن و، ستەمکارو لادەریشمان هەن.

ئنجا کە فریشتەکان دەڵێن: ﴿ بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ﴾، ئەمە گواستنەوەیە لە حاشا لێکردن و دووریی گرتن لە غەیری خوا پەرستەکان، بۆ شایەدیی دان لەسەریان و، شایەدیی دان لەسەر ئەوانەی جگە لە خوا پەرستنیان بۆ جوان کردوون، کە شەیتانەکانن، بەڵام لێرەدا بۆیە دەفەرموێ: جند، هەرچەندە وشەی: (ٱلشَّيَـٰطِينَ)، لە قورئاندا بۆ هەموو ئەوانە بەکارهێنراوە، کە لە خوا دوورن، مرۆڤ بن، یان جند، بەڵام لێرەدا بە سیاق دەزانرێ، کە مەبەست پێی شەیتانەکانی جندە، بۆیە: ﴿ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ﴾، یانی: جندە (شەیتانە)کان، دەپەرستن، ئەوانەی لە خوا دوورن، لە جند.

٧)- ﴿ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴾، زۆربەیان پێیان بڕوا داربوون، واتە: زۆربەی ئەو، جگە لە خوا پەرستانەو، ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، بڕواداربوون بەو جندە شەیتانانە، ئەو شەیتانە جندانە هاوبەش بۆ خوا دانانیان بۆ جوان کردن و، ڕازاندیانەوەو، هانیاندان بۆی، ئەوانیش زۆربەیان پێیان بڕواداربوون، بۆیەش دەفەرموێ: زۆربەیان، چونکە بە تەئکید بەشێك لە بتپەرستەکان، یان بەشێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، یان بەشێك لە جگە لە خواپەرستەکان، ڕاستییان دەزانی، بەڵام دەیانویست خەڵك و جەماوەرەکەیان چەواشە بکەن، وایان پێشان دەدات، کە ئەوانیش بڕوایان بە شەیتانەکان هەیە، کە بپەرسترێن و

پەرستراو بن و بکرێنە هاوبەش بۆ خوا، یان لە جیاتی خوا بپەرسترێن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴾، زۆربەیان پێیان بڕوادار بوون، چونکە بەشێکیان - لە هاوبەشدانەران - بڕوایان بەوە نەبوو شەیتانەکان بپەرسترێن، یان شایستەی پەرستران بن، بەڵام دەیانویست کڵاو لە سەری خەڵك و جەماوەرەکەیان بنێن، وەك چۆن لەم ڕۆژگارەدا هەندێك ڕەوت و ڕێبازگەو مەشرەبی پووچ و ئەفسانەیی لە نێو مسوڵماناندا هەن، ئەوانەی کە سەرپەرشتیی ئەو مەشرەب و مەزهەب و ڕەوتانە دەکەن، لەوانەیە زۆریان بڕوایان بەو کەسانە نەبێ، کە ئەو مەشرەب و مەزهەب و ڕەوتانەیان، تەبەنیی کردوون، بەڵام وا پێشان دەدەن کە بڕوایان پێیان هەیە، بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵك و جەماوەرەکەیان و نانیان لەوەدایە!

٨)- ﴿ فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا ﴾، [ئەمە فەرمایشتی خوایە، ئاراستەی هاوبەش بۆ خوادانەرەکانی دەکات، دەفەرموێ:] ئەمڕۆ هەندێکتان سوودو زیانی هەندێکتان بە دەست نیە، هەڵبەتە دەشگونجێ لێرەدا ڕووی قسان تەنیا لە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان و جگە لە خواپەرستەکان نەبێ، بەڵکو خوا سبحانەو تعالی پەرستراوەکان کە فریشتەو جگە لە فریشتەکانن و، پەرستەرەکان بە هەموو شێوەکانیانەوە، هەموویان دەدوێنێ و دەفەرموێ: ئەمڕۆ سوودو زیانی یەکدیتان بە دەست نیە، واتە: نە دەتوانن سوود بە یەکدی بگەیەنن، نە دەتوانن زیان لە یەکدی دوور بخەنەوە.

٩)- ﴿ وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ﴾، بەوانەش دەڵێین کە ستەمیان کردوە.

ئەوانەی ستەمیان کردوە بەوە کە بە خوا بێبڕوا بوون، بەرانبەر بە خوا سپڵە بوون، هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، جگە لە خوایان پەرستوە، بەوانە دەڵێین:

١٠)- ﴿ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾، ئازاری ئەو ئاگرە کە ئێوە پێی بێبڕوا بوون، بە درۆتان دادەنا، بیچێژن.

کە دەفەرموێ: ﴿ ذُوقُوا۟ ﴾، (الذَّوْقُ: مَجَازٌ لِمُطْلَقِ الإِحْسَاس)، (ذوق) وشەیەکە بە مەجاز کاردەهێنرێ بۆ هەست پێکردن بە ڕەهایی.

دەشکونجێ بگوترێ: وشەی: (ذُوقُ)، بۆیە بۆ سزاو ئازار خوازراوەتەوە، چونکە ئینسان کە شتێك دەخوات، تامی دەکات و دەیچێژێ، چاك دەزانێ چۆنە؟ ئەوانەش کە خوا سزایان دەدات، ئەو سزای ئاگرە کە پێی ئازار دەدرێن، چاك دەزانن چۆنە؟ وەك چۆن خواردنێك کە مرۆڤ دەیخاتە زاریەوە، دەیچێژێ، ئەوانیش ئاوا ئەو سزایە، ئەو ئازارە دەچێژن، لە سوورەتی (السجدة)دا هەمان ئەو تەعبیرە هاتوە، بەلام بەم شێوەیە هاتوە: ﴿ وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾، پێیان گوترا: ئازاری ئەو ئاگرەی کە پێشتر پێی بێبڕوابوون، بیچێژن، لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾، لەوێ دەفەرموێ: ﴿ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾، چونکە هی سوورەتی (السجدة)، واتە: ئێوە بێبڕوا بوون بە خودی سزایەکە، ﴿ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾، (العَذَاب الَّذِي كُنتُمْ بِهِ تُكَذِّبون)، بەلام لێرە لە سوورەتی (سبأ)دا، بە درۆ دانانەکە ڕووی پێکراوەتە، خودی ئاگرەکە، دەفەرموێ: ﴿ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾، ئاشکراشە: (ٱلنَّارِ) مێینەی مەجازییەو ڕاناوی مێینەی دەوێ و، (عَذَابَ)یش نێرینەی مەجازییەو ڕاناوی نێرینەی دەوێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**تۆمەتبارکردنی کافرەکان بۆ پێغەمبەر ﷺ و قورئان، کە جگە لە دژایەتیی کردنی ئایین و کلتووری پێشینانیان و، درۆو جادوو، هیچی دیکە نین! ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەش کە خوا نە لە پێش قورئان دا هیچ کتێب و، نە لە پێش موحەممەددا، هیچ پێغەمبەری بۆ ناردوون، بۆ ئەو گەلەی پێغەمبەر موحوممەد ﷺ لە نێویاندا هات، کە گەلی عەرەبن و، ئەو گەلانەی ڕابردووش کە خوا بە هۆی کوفریانەوە سزای داون، زۆر خاوەن تواناتر بوون لە کافرانی ڕۆژگاری دابەزینی قورئان و، کافرانی کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ وَقَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٣﴾ وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا ۖ وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ ﴿٤٤﴾ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُوا۟ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ فَكَذَّبُوا۟ رُسُلِى ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ ﴾، کاتێك کە ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەسەردا خوێنرانەوە، (و)ی سەر: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ ﴾، واوی بادەرەوە (**عاطفة**)یەو بۆ گێڕانەوەیە، ئەو ڕستەیە بادەداتەوەو، دەیگێڕێتەوە سەر ڕستەی پێشوو، کە دەفەرمووێ: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ﴾، واتە: ئەوانە حاڵیان وابوو، کە کاتێك ئایەتەکانی ئێمەیان بە ڕۆشنیی، یان: ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێندرانەوە، کە دەفەرمووێ: ﴿ بَيِّنَٰتٍ ﴾، (**أي: حَالَ كَوْنِهَا وَاضِحَاتٍ فِي مَجِيئِهَا مِنَ اللهِ تَعَالى**)، لە حاڵێکدا کە ئەو ئایەتانە زۆر ڕۆشن بوون، کە لە خوای بەرزەوە هاتوون، یاخود: ﴿ بَيِّنَٰتٍ ﴾، واتە: ڕۆشن بوون، ئامانجەکانیان زۆر بە ڕۆشنیی دەگەیاند.

٢)- ﴿ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ ﴾، [کاتێك ئەو ئایەتە ڕۆشنانەی ئێمەیان بەسەردا خوێنرانەوە]، گوتیان: ئەمە تەنیا پیاوێکە، بە سیاق دەزانرێ کە بێژەرەکە، مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و، جگە لە خوا پەرستە، بتپەرستەکانن، ﴿ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ ﴾، ئەمە - لەوکاتەدا ئاماژەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ کردوە - تەنیا پیاوێکە، واتە: ئەوەی کە ئایەتەکانیان بەسەردا دەخوێنێتەوە، پیاوێکە، ئاسایی وەك سەرجەم پیاوانی دیکە بێ جیاوازیی، یان پیاوێکی نەناسراوو نامۆیە!

٣)- ﴿ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ ﴾، دەیەوێ لەوەی کە باب و باپیرانتان، پێشینانتان، دەیانپەرست، لاتان بدات.

بێگومـان ئـەم قسـەیە، مەبەسـت پێـی زلـەزلانی بێبڕوایـان و دەمڕاسـت و بڕیاردەرەکانیانـە، ویسـتوویانە خەڵـك بورووژێنـن و هانبـدەن لـە دژی پێغەمبـەر ﷺ کـە ئەهـا! دەیـەوێ ڕێبـازی پێشـینان و بـاب و باپیرانتـان لـێ تێکبـدات و، ئـەوەی بـاب و باپیرانتـان دەیانپەرسـت، لاتـان بـدات لێـی!

بـە نسـبەت پێغەمبـەرەوە ﷺ بـەوە تۆمەتباریـان کـرد، کە تەنهـا پیاوێکـە، دەیەوێ لـەوەی کـە پێشـینانتان و بـاب و باپیرانتـان پێشـتر پەرسـتوویانە، لاتـان بـدات، ئنجـا دێتـە سـەر بـاسی قورئـان:

٤)- ﴿ وَقَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ﴾ هەروەها گوتیان: ئەم (قورئان)ە تەنیا درۆیەکی هەڵبەستراوە، ﴿ إِفْكٌ ﴾، بە مانای درۆ دێ، ﴿ مُّفْتَرًى ﴾، واتە: هەڵبەستراو بە ناوی خواوە، یانی: هەڵبەستراوەو دروستکراوە لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بەناوی خواوە!

٥)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ ﴾، هەروەها ئەوانەی بێبڕوا بوون، بەو هەقەیان گوت، کە بۆیان هاتبوو:

٦)- ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، ئەمە تەنیا جادوویەکی ئاشکرایە.

کـە لێرەدا دەڵێـن: ﴿ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ﴾، ئـەم قورئانـە هەمـووی درۆیەکی هەڵبەسـتراوە، یـانی: وەك خـۆی بـە گشـتیی، درۆیـەو، بەسەرهاتەکانیشـی هەموویـان

هەڵبەستراون، یاخود هەمووی درۆشەو هەڵبەستراویشە، یان بۆ دوو جۆر دابەش دەبێ:

أ- غەیری بەسەرهاتەکانی درۆیە.

ب- بەسەرهاتەکانیشی هەڵبەستراون و بنەڕەت و بنەمایەکیان نیە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان، بە هاقیان گوت کە بۆیان هات، لێرەدا دەگونجا بفەرموێ: (وَقَالُوا لِلحَقِّ لَمّا جَاءَهُم)، بەڵام بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ ﴾، بۆ ئەوەی کوفرو بێبڕواییەکەیان دەربخات، کە بێبڕواییەکەیان هاندەریان بوو، ئەو قسەیە بکەن، ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ ﴾، ئەوانەی کە بێبڕوا بوون، بێبڕوا بوون بە هەموو شتێك، بە هەقیان گوت: کاتێك بۆیان هات، ﴿ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴾، ئەمە جگە لە جادوویەکی ئاشکرا هیچی دیکە نیە.

کەواتــــــە:

١- پێغەمبەری خاتەمیان ﷺ بەوە تۆمەتبار کردوە، کە دەیەوێ لەوەی باب و باپیرانیان پەرستوویانە، لایان بدات.

٢- قورئانیشیان بەوە تۆمەتبار کردوە، کە درۆیەو هەڵبەستراوە.

٣- کۆی ئەو هەقەش کە موحەممەد هێنابووی، ئەو پەیامە هەقە، بەوەیان تۆمەتبار کرد کە جادوویەکی ئاشکرایە! ئەمانەش بەس لاف لێدانن و هیچ ئەك بەڵگە، شوبهە بەڵگەیەکیشیان بۆ نەهێناونەوە، بۆیە خوا ﷻ بە پێویستی نەزانیوە، وەڵامیان بداتەوە لەم سیاقەدا، تەنها ئەوەندە دەفەرموێ:

٧)- ﴿ وَمَآ ءَاتَيۡنَٰهُم مِّن كُتُبٖ يَدۡرُسُونَهَا ﴾، ئێمە هیچ کتێبمان پێنەداون، لێی بکۆڵنەوەو، بیخوێننەوە، (يَعْنِي لَمْ يَكُونوا أَهْل دِرَاسَةٍ وَتَحْقِيق للكُتُبِ سَابِقًا)، ئەوانە پێشتر ئەهلی ئەوە نەبوون، کتێبان بخوێننەوەو لێیان بکۆڵنەوەو هەڵیانسەنگێنن، تاکو ئێستا بە هەوای باڵ، هەروا لە خۆوە، قورئان تۆمەتبار بکەن و، موحەممەد تۆمەتبار بکەن.

﴿يَدْرُسُونَهَا﴾، (الدِّرَاسَةُ: القِرَاءَةُ بِتَهمُّلٍ وَتَفَهُّمْ)، (دِرَاسَة) بریتیە: لە خوێندنەوەی بە شێنەیی و بە لێتێگەیشتن و لێوردبوونەوەوە.

٨)- ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ﴾، [بە نسبەت پێغەمبەرانیشەوە] لە پێش تۆدا، هیچ ورياكەرەوەو ترسێنەرێكمان بۆ نەناردوون، واتە: هیچ پێغەمبەرێك كە وریایان بكاتەوەو بیانترسێنێ و هۆشیاریان بكاتەوە، بۆمان نەناردوون، واتە: ئەو قسانەی دەیانكەن، لە بارەی وەحیی و ئایینی خواو، لە بارەی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەبێ سەرچاوەكەی یان كتێب و وەحیی خوا ﷻ بێ، یان پێغەمبەرێكی لە لایەن خواوە، ڕەوانە كراو بێ، بەڵام ئەوانە نە پێشتر هیچ كتێبێكیان پێدراوە، پێش قورئان و موحەممەد ﷺ، نە هیچ پێغەمبەرێكیان بۆ ڕەوانە كراوە، كەواتە: ئەو قسانە هەر بە گومان دەیانكەن و پشت ئەستوور نین بە بەڵگە، ئەو قسانە لە سەرچاوەیەكەوە نایەن، كە پێویستە لێیەوە بێن، كە وەحییە.

٩)- ﴿وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾، ئەوانەی پێش وانیش بە درۆیان دانا، چییان بە درۆ دانا؟ پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، كتێبەكانی خوایان بە درۆ دانا، پەیامی خوایان بە درۆ دانا.

١٠)- ﴿وَمَا بَلَغُواْ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ﴾، كافرەكانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ نەگەیشتوونە دەیەك (١٠/١)ی ئەوەی كە بەوانمان دابوو، (مِعْشَار: عُشْر، وَقِيْلَ عُشْرُ العُشر)، واتە: یەك لەسەر دە (١٠/١) گوتراویشە: سەد یەك، واتە: كافرەكانی ڕۆژگاری تۆ ئەی موحەممەد! ﷺ دەیەك (١٠/١)ی، یاخود: سەدیەك (١٠٠/١) ئەو تواناو دەستڕۆیشتوویییەی كە ڕەخساندبوومان بۆ گەلانی پێشوو، كە پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان، پێیان نەدراوە.

١١)- ﴿فَكَذَّبُواْ رُسُلِي﴾، بەڵام پێغەمبەرانی منیان بە درۆ دانا.

١٢)- ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾، ئنجا ئایا نكووڵیلێكردنی من چۆن بوو؟ (نَكِيرِ)، هەرچەندە ژێر (كسرة)ی هەیە، بەڵام لە ئەصڵدا (نكيري)یە، ئایا نكووڵیلێكردنی من چۆن بوو؟ دیارە نكووڵیلێكردن و ڕەخنەلێگرتنی خواش، بێگومان سەردەكێشێ بۆ سزادانیان، كەواتە:

﴿ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾، (أي: فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي المُتَرَتِّبِ عَلَى إنْكَارِي لَهُمْ)، ئەو سزایەم کە دەرەنجامی نکوولّیلێکردن و ڕەخنەگرتنی من بوو، لێیان، چۆن بوو؟ ئەمە پرسیارکردنە، بەڵام بۆ سەرسوڕماندن و مەزن پیشاندانی ئەو سزایەیە کە خوا داونی.

ئەمـە بـەو شـێوەیەی مانامان کـرد، بـە تایبەتی ئەم ڕسـتە موبارەکە کـە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا بَلَغُواْ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ﴾، زۆربـەی توێـژەرەوان وایـان لێکداوەتـەوە، واتـە: کافرەکانـی ڕۆژگاری موحەممـەد ﷺ نەگەیشـتبوونە، یـەك لەسـەر دە، دەیـەکی ئـەوەی کـە بـە کافرەکانـی ڕۆژگارانی پێشـوومان دابـوو، لـە ڕووی ئیمکانیاتـی ماددیـی و، توانـای سـەربازیی و توانـای ئابووریـی، کەچـی کـە سزاشـم دان، هیـچ خۆیـان نەگرت.

کەواتـە: ئـەوان کـە دەیـەك (١٠/١)ی توانـای ئەوانـەی پێشووشـیان نیـە، یاخـود: یـەك لەسـەر سەدیشـیان نیـە، دەبـێ بترسـێن، ئەگـەر هـەر بـە پێوانـەو کێشـانەی خۆشـیان بـێ، خـوا ئاسـانتر دەتوانـێ سـزایان بـدات!

لێـرەدا دوای ئـەوەی خـوا ﷻ دەریخسـت کـە ئـەو قسـانەی دەیانکـەن، نـە لـە کتێبێکـی خواییـەوە سـەرچاوە دەگـرێ، نـە لـە پێغەمبەرێکـی لەلایـەن خـوا ڕەوانەکـراوەوە، کەواتـە: هیـچ بنەمایەکـی نیـە، دوای ئـەوە خـوا ﷻ گواسـتیەوە بـۆ زمانـی هەڕەشـە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُواْ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ فَكَذَّبُواْ رُسُلِى فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ﴾، ئەمـە هەڕەشـەیە بۆیـان، دوای ئـەودی دەریخسـت کـە قسـەکانیان تەنیـا لاف لیدانـی ڕووتـن، ئنجـا خـوا ﷻ هەڕەشـەی لێکـردن.

جێـی سـەرنجە کـە (محـي الديـن الدرويـش)، لـە تەفسـیرەکەیدا[1]، کـە لـە ڕووی ڕێزمانییـەوە ئیعرابـی قوڕئـانی کـردوەو، زۆر جـاران نوکتـەی ڕەوانبێژیـی، بەڵکـو کۆمەڵایەتیـی و فیکرییـش دەخاتـە ڕوو، لێـرەدا ڕایەکـی هێنـاوە، کـە کەمـتر بینیومـە لـە تەفسـیرەکانی دیکـەدا، ئـەو ڕایـە هاتبـێ، بـا پێشـێ عیبارەتەکانـی بێنیـن، ئنجـا قسـەکانی تەرجەمـە دەکەیـن و هەڵویسـتی خۆشـمانی لەسـەر دەردەبڕیـن، دەڵـێ:

---

(١ ) إعراب القرآن الكريم وبيانه، ج٨، ص١٠٨.

(فِي هـذِهِ الآيَـات تِكْـرارٌ، يَـدُلُّ عَـلَى الغَضَـبِ وَالإِنْـكَارِ، فَقَـدْ تَكَـرَّرَ الفِعْـلُ، وَهُـوَ قَوْلُهُـمْ، وَصَرَّحَ بِاسْـمِهِمْ وَهُـوَ (الَّذِيْـنَ كَفَـرُوْا) وَجَـاءَ بِالـلَّامِ المؤْذِنَـةُ بِالقُـوَةِ، وَصَرَّحَ بِقَوْلِـهِ: ﴿لَمَّا جَآءَهُمْ﴾، لِلْعَجَـبِ مِـنْ مُبَادَهَتِهِـمْ بِالْكُفْـرِ، وَذَلِـكَ لِلْدَّلاَلَـةِ عَـلَى مَـدَى السُـخَطِ عَلَيْهِـمْ، وَالزِّرَايَـةِ بِأَقْدَارِهِـمْ، وَالتَّعَجُـب مِـن ارْتِـكَاسِ عُقُولِهِـمْ، وَنُبُوُهَـا عَـنِ الحَـقِّ، ثُـمَّ أَضْفَـى عَـلَى ذَلِـكَ، مَـا هُـوَ أَبْلَـغُ فِي الدَّلاَلَـةِ عَـلَى رُسُـوخِهِمْ فِي الكُفْـرِ وَتَمَادِيْهِـمْ فِي البَاطِـلِ، وَهُـوَ أَنَّ مَـنْ قَبْلَهُـمْ مِـنْ أَصْحَـابِ الكِتَـابِ، لَـمْ يُؤْتَـوْا مِثْلَـمَا أُوْتُـوا، بَـلْ لَـمْ يَبْلُـغْ مَـا أُوتُـوهُ مِعْشَـارَ مَـا آتَاهُـمْ، وَهُـوَ جُـزْءٌ مِـنْ عَـشْرَةٍ، بَـلْ مِـنْ مِائَـةٍ عَـلَى رَأْيِ بَعْضِهِـمْ، بَـلْ جُـزْءٌ مِـنْ أَلْـفٍ عَـلَى رَأْيِ آخَرِيْـن).

واتـە: لـەم ئایەتانـەدا دووبـارە کردنەوەیـەك هەیە، کـە تووڕەیـی و نکوولّییلێکردنی خـوا دەگەیەنـێ، چونکـە کردەوەکەیـان کـە بریتیـە لـە قسـە بـێ بنەماکانیـان، دووبارە بوونـەوەو، خـوا ﷻ بـە ئاشـکرا ناوەکەیـانی، هێنـاوە: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾، هەروەها (ل) ی هێنـاوە کـە ئـەوە دەلالـەت لەسـەر هێـز دەکات، کـە دەفەرمـوێ: ﴿لَمَّا جَآءَهُمْ﴾، کاتێـك کـە قورئـان بۆیـان هـات، ئـەوان ئەوەیـان گـوت، ئـەوەش بـۆ سەرسـوڕماندن، لـەوە کـە هـەر یەکسـەر ئەوانـە کوفریـان دەربڕیـوە، کـە هەقیـان بـۆ هاتـوە! ئەمەش بـۆ ئەوەیـە ئـەوە بگەیەنـێ، کـە خـوا چەنـدە لێیـان تووڕەیـەو، چەنـدە بەبـێ ڕێزیـی و، کـەم پایەیـی تەماشـایان دەکات و، بـۆ سەرسـوڕماندن لـەوە کـە چـۆن عەقڵەکانیـان هەڵگەڕاونـەوەو، چـۆن لـە هـەق دوور کەوتوونـەوە! دوایـی شـتێکی دیکـەی خسـتۆتە پـاڵ ئـەوەی ڕابـرد، کـە لـەوەی ڕابـرد زیاتـر گەیەنـەری ئەوەیـە، ئەوانـە زۆر لـە کوفردا ڕۆ چـوون و، لـە ناهەقـدا درێژەیـان پێـداوە، کـە ئـەوانی پێـش وان لـە خـاوەن کتێبان، ئەوەیـان پـێ نـەدراوە کـە بـە کافرانـی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ دراوە (لەوەحیـی و کتێـب) بەڵکـو ئـەوەی کـە بـە ئـەوان دراوە، دەیـەك (١٠/١)ی ئـەوە نەبـووە کـە بـە ئەمـان دراوە، کـە (مِعْشَارَ )، بریتیـە لـە: بەشـێك لـە دە (١٠) (دەیـەك) بەڵکـو لـە سـەر ڕای هەندێکیـان یـەك لەسـەر سـەد، بەڵکـو هەندێکیـان دەڵێـن: یـەك لەسـەر هەزارە.

ئەم وای لێکداوەتەوە، کە ئەم وەحییەی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ هاتوە، چەند قاتی ئەو کتێب و وەحییەیە، کە بۆ گەلانی پێشوو هاتوە، کەواتە: ئەمە خوازیاری ئەوەیە، دەبووایە بڕوای پێ بێنن.

بەڵام لە ڕاستییدا بە سەرنجدانی ئایەتەکان، هەر ئەو بۆ چوونە زیاتر بە ڕاست دەردەکەوێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا بَلَغُواْ مِعۡشَارَ مَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ﴾، واتە: کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ نەگەیشتوونە دەیەك (١٠/١)ی ئەوەی کە بەوان دراوە، لە ڕووی ئیمکانیاتی ماددیی و دەستڕۆیشتوویەتییەوەو، لە ڕووی توانای سیاسیی و توانای ماددیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و.. هتدەوە، چونکە عەرەبەکان کاتێك کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هاتوە، دەوڵەتێکی کۆکەرەوەیان نەبووە، قەوارەیەکی سیاسییان نەبووە، بەڵکو هەر عەشیرەتەو هەر شارە، بۆ خۆی قەوارۆکەیەکی سیاسیی بوو و پرژ بڵاوبوون، بۆیە ئەو ئیمکانیەت و توانایەی کە بۆ دەوڵەتان دەرەخسێ، ئەوان ئەو توانایەیان نەبووە، کەچی پێشووەکان کاتێك بێبڕوا بوون و پێغەمبەرانیان بە درۆ داناوە، خوا ﷻ سزای داون، یانی: خوا گەلانی پێشووی سزاداون، لە حاڵێکدا کە توانایان، توانای ماددییان، چەند بەرانبەری ئەوانەی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بووە، کەواتە: با کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەریش ﷺ بەو تۆزە توانایە، بەو بڕە توانایە، کە یەك لە سەر دە، یاخود یەك لەسەر سەدی ئەو توانا ماددییەش نیە، کە بە گەلانی پێشوو دراوە، با پێی لە خۆیان بایی نەبن، چونکە ئەوان تواناشیان زۆر زۆر بوو، کەچی خوا سزای دان و، ئەمانیش بەو تۆزە توانایەوە، ناتوانن دەرباز بن، لە سزای خوا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە نۆ (٩) ئایەتی کۆتایی سوورەتی (سبأ) پێك دێ، ئایەتەکانی: (٤٦ - ٥٤)، کە تێیاندا خوای زاناو کارزان، پێنج کەرەتان پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ بە وشەی: بڵێ (قُل) دەدوێنێ، هەر کەرەتەش لە ئایەتێکی سەربەخۆداو، هەر جارەش فەرمانی پێدەکات کە ڕاستییەکی گەورەو گرنگ بە بێبڕواو هاوبەشدانەرەکان ڕابگەیەنێ، ئەوە لە پێنج ئایەتی سەرەتادا: (٤٦ - ٥٠).

لە چوار ئایەتەکەی کۆتاییشدا، خوا ﷻ باسی دیمەنی ترس و لەرزو ڕاچڵەکینی بێبڕوایان دەکات، لە قیامەت دا، کە دەستیان لە هەموو پچکان دەبڕێ و، بە هیچ شتێك ڕاناگەن، ئەوەی کە ئارەزوویان دەکرد، لێی بێبەش دەکرێن و، بەربەست دەخرێتە نێوان خۆیان و ئارەزووەکانیانەوە.

﴿قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ ۚ مَا
بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾ قُلْ مَا سَأَلْتُكُم
مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٤٧﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ
عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٤٨﴾ قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلْ إِن ضَلَلْتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ
عَلَىٰ نَفْسِى ۖ وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِىٓ إِلَىَّ رَبِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ ﴿٥٠﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُوا۟
فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٥١﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍۭ
بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ ۖ وَيَقْذِفُونَ بِٱلْغَيْبِ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَحِيلَ
بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍۭ ﴿٥٤﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ئـەی موحەممـەد!) بڵـێ: (ئـەی بێبڕوایـەکان!) تەنیـا بـە یـەك ئامۆژگاریـی، ئامۆژگارییتـان دەکـەم: کـە لەبـەر خـوا دوو دوو و یـەك یـەك هەڵسـن، دوایـی بیـر بکەنـەوە: هاوەڵەکەتـان (موحەممـەد) هیـچ جـۆرە شـێتییەکی نیـە، تەنیا ترسـێنەرتانە وریاکەرەوەتانـە لـە پێـش دەسـتی ئازارێکـی سـەخت دا ﴿٤٦﴾ بڵـێ: هـەر کرێیـەك لێتانـم داوا کـردوە، بـا بـۆ خۆتـان بـێ، کـرێ و پاداشـتم تەنیـا لەسـەر خوایـەو، ئـەو بەسـەر هەمـوو شـتێکەوە چاودێـرە ﴿٤٧﴾ بڵـێ: بێگومـان پـەروەردگارم هـەق دەهـاوێ (بـەرەو ناهـەق) یەکجـار زانایـە بـە پەنهانـەکان (و هیچـی لـێ ناشـاردرێتەوە) ﴿٤٨﴾ بڵێ: هـەق هـات و ناهـەق (هیـچ کارەیـە) نـە هیچـی پـێ دەسـت پێدەکـرێ و، نـە هیچیشـی پـێ دەگێڕدرێتـەوە ﴿٤٩﴾ بڵـێ: ئەگـەر گومڕابم، ئـەوە زیانـی گومڕابوونەکەم تەنیـا بـۆ خۆمـەو، ئەگـەر ڕێـی ڕاسـتیشی بگـرم، بـە هـۆی ئەوەوەیە، کـە پـەروەردگارم سروشـم بـۆ دەکات، بـە ڕاسـتیی ئـەو بیسـەری نیزیکـە ﴿٥٠﴾ ئەگـەر ببینـی کاتێـك (بێبڕوایـان) بـە تـرس و لـەرزەوە دادەچڵەکـن (بـەڵام) قوتاربـوون نیـەو، لـە شـوێنێکی نیزیکــەوە گیــراون (دیمەنێکــی زۆر ســامناکە) ﴿٥١﴾ (بێبڕوایــەکان لــە قیامەتــدا)، گوتیشـیان: بڕوامـان پێـی هێنـا، بـەڵام لـەو شـوێنە دوورەوە چـۆن دەسـتیان دەیگاتـێ ﴿٥٢﴾ بێگومـان پێشـتر پێـی بێبـڕوا بـوون و، لـە دوورەوە بـەرەو پەنهـان دەیانهاویشـت (بەنەزانیـی لـە بـارەی نادیـارەوە دەدوان) ﴿٥٣﴾ بەربەسـتیش خرایـە نێـوان ئـەوان و ئـەوەوە کـە ئارەزوویـان دەکـرد، وەك چـۆن ئـەوەش بەرانبـەر بـە کۆمەڵەکانـی پێشـوویان کـرا، بێگومـان ئەوانیـش لـە دوو دڵییەکـی خەسـت و خـۆڵ دا بـوون (بۆیـە بـەو دەردە چـوون) ﴿٥٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَقْذِفُ): دەهاوێ، (القَـذْفُ: الرَّمِـيُ البَعِيْـد)، (قـذف): بریتیـە لـە هاویشـتنێك بـەرەو دوور، یـان لـە دوورەوە، هاویشـتن وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (طـه)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱقۡذِفِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ ﴿٣٩﴾ ﴾طـه، فڕێبـدە نێـو دەریایەکـەوە.

(فَزِعُواْ): واتـە: داچەڵەکیـن، (الفَـزَعُ: انْقِبَـاضٌ وَنِفَـارٌ يَعْـتَرِي الإِنْسَـانَ مِـنَ الـشَّيءِ المُخِيْـفِ، وَهُـوَ مِـنْ جِنْـسِ الجَـزَعِ)، (فـزع): بریتیـە لـە هاتنەوەیـەك و سڵەمینەوەیەك کـە بەسـەر ئینسـاندا دێ، لـە ئەنجامـی دیتنـی شـتێکی مەترسـیلێکراوو ترسـناکدا، (فـزَع) لـە ڕەگـەزی (جَـزَعَ)ە، (جَـزَعْ) واتـە: هەڵپـەو ناڕەحـەت بـوون، (فَزَع)یـش واتـە: داچڵەکیـن.

(فَلَا فَوۡتَ): دەربازبـوون نیـە، (الفَـوْتُ: بُعْـدُ الـشَّيءِ عَـنِ الإِنْسَـانِ، بَحِيْـث يَتَعَـذَّرُ إِدْرَاكُـهُ)، (فـوت): بریتیـە لـەوەی شـتێك لـە ئینسـانەوە دوور بـێ، بـە شـێوەیەك نەتوانـێ دەسـتی بگەیەنێتـێ.

(ٱلتَّنَاوُشُ): (النَّـوْشُ: التَّنَـاوُلُ)، (تنـاوش) بریتیـە لـەوەی ئینسـان دەسـت بگەیەنێتـە شـتێك، یانـی: (تَنَـاوُل).

(وَحِيلَ): (حَـالَ بَيْنِـي وَبَيْنَـكَ كَـذَا) واتـە: فـڵان شـتە، کەوتـە نێـوان مـن و تـۆوە، (حَائِـلْ)، پـەردە، (أَصْـلُ الحَـوْلِ: تَغَـيُّرُ الـشَّيءِ وَانْفِصَالُـهُ عَـنْ غَـيْرِه)، وشـەی (حَـوْل)، بریتیـە لـە شـتێك کـە بگـۆڕێ و لـە شـتێکی دیکـە جیابێتـەوە، وەك گوتمـان: (حَائِـلْ)، لەسـەر کێـشی (فَاعِـل)ە، بـە مانـای پـەردەو نێوانێـك دێ، کـە دەکەوێتـە نێـوان دوو شـتانەوە.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

خـوا ﷻ لـە كۆتايـى ئـەم سـوورەتە موبارەكـەدا، پێغەمبـەرى خاتـەم موحەممـەد ﷺ دەدوێنـێ، لـە پێنـج ئايەتـى يـەك لـە دواى يەكـدا، پێنـج جـاران فەرمانـى پـێ دەكات: (بڵـێ)و، پێنـج ڕاسـتيى زۆر گـەورەو گرنگـى پـێ دەفەرمـوێ، كـە پێيـان ڕابگەيەنـێ، كـە لـە هەمـوو قورئانـدا وێنـەى ئـەوە نيـە، بۆيـەش ئێمـە ئەوەمـان بـە يەكێـك لـە تايبەتمەندييـەكان سـوورەتى (سبأ) دانـا، لـە كاتـى خسـتنە ڕووى ئێـوەڕۆك و پێناسـەى ئـەم سـوورەتەدا.

يەكەمجـار خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ﴾، ئاشـكرايە ڕووى دوانـدن لـە پێغەمبـەرە ﷺ، تـۆ بڵـێ: ﴿إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ﴾، مـن تەنيـا بـە يـەك شـت ئامۆژگارييتـان دەكـەم، چييـە ئـەوە تاكـە ئامۆژگارييـە؟ ﴿أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ﴾، ئەويـش ئەوەيـە كـە بـۆ خـوا ﷻ هەڵسـن، دوو دوو و يـەك يـەك، ﴿ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْ﴾، دوايـى بيـر بكەنـەوە، چونكـە مـرۆڤ ئەگـەر بـە تەنيـا بـێ، بـاش بيـرى بـۆ دەكرێتـەوە، ئەگـەر يەكێكـى ديكەشـى لەگـەڵ دا بـێ، لەوانەيـە باشـتر هەندێـك شـتى بيـر بخاتـەوە، بـەڵام ئەگـەر قەڵەباڵـغ بـوون، بێگومـان مـرۆڤ ناتوانـێ وەك پێويسـت بيـر بكاتـەوەو، فيكـرو هۆشـى خـۆى چـڕ بكاتـەوە لـە سـەر بابەتێكـى دياريكـراو، بۆيـە لێـرەدا دەفەرمـوێ: تەنيـا بـە يـەك شـت ئامۆژگارييتـان دەكـەم، ئەويـش ئەوەيـە : لەبـەر خـوا، هەڵسـن، واتـە: دڵـى خۆتـان بـۆ خـوا سـاغ بكەنـەوەو مەبەسـتى ديكەتـان نەبـێ، لەبـەر ڕەزامەنديـى خـوا، دوو دوو، يـان يـەك يـەك، بيـر بكەنـەوە، ﴿مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ﴾، بيـر بكەنـەوە لـە حاڵى پێغەمبـەر، موحەممەد ﷺ، ئـەو كاتـە بۆتـان دەردەكـەوێ كـە: هاوەڵەكەتـان هيـچ جـۆرە شـێتييەكى تێدانيـە، ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم﴾، ئـەو تەنيـا ورياكـەرەوەو ترسـێنەرێكە بـۆ ئێـوە، ﴿بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾، لـە پێـش دەسـتى سـزايەكى سـەخت دا، بۆتـان ڕەوانـە كـراوە، واتـە: هاتـوە ئاگادارتـان بكاتـەوەو بتانترسـێنێ و هۆشـيارتان بكاتـەوە، كـە سـزايەكى

سەخت لە پێشەوەیە، ئنجا پێش ئەوەی ئەو سزا سەخت و دژوارەتان بۆ بێ و، ملتان بگرێ، هاتوە وریاتان بکاتەوەو هۆشدارییتان بداتێ، تاکو لە خۆتان وریا بن.

کەواتە: یەکەمجار کە خوا ﷻ فەرمووی: (قُلْ)، واتە: ئەی موحەممەد تۆ بڵێ: ئامۆژگارییتان دەکەم بە یەك ئامۆژگاریی، ئەویش ئەوەیە: دوو دوو و یەك یەك، لە بەر خوا هەڵسن، کە دەفەرموێ: هەڵسن، مەبەست پێی ئەوە نیە، هەڵسنە سەر پێ، یانی: ویستی بیرکردنەوەتان هەبێ و، دڵی خۆتانی لەسەر ساغ بکەنەوەو، بیر بکەنەوە لە هاوەڵەکەتان موحەممەد ﷺ کە هیچ جۆرە شێتییەکی تێدا نیە، بەڵکو نموونەی عەقڵ و هۆشی هەرە بەرزەو، لە لووتکەی عەقڵ و هۆش و تێگەیشتن دایە، ئەوە تەنیا ترسێنەرو ورپاکەرەوەیە بۆتان.

بۆ جاری دووەم دیسان پێی دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ﴾، تۆ پێیان بڵێ: هەر کرێیەك و پاداشتێك لێم داوا کردوون، با بۆ خۆتان بێ، واتە: هیچ چاوەڕوانییەکم لێتان نیە، یاخود هەر شتێك کە لێم داوا کردوون، ئەوە هەمووی بۆ سوودی خۆتانە، ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لێی داوا کردوون، ئەگەر بریتی بێ لە پاداشت و کرێ، ئەوە بووە کە بڕوا بێنن، کە بڕوا هێنانەکەش بە سوودو قازانجی خۆیانە، ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ﴾، پاداشتی من تەنیا لەسەر خوایە، ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾، ئەو چاودێرو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکەوە.

بۆ جاری سێیەم دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ رَبِّي يَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَّامُ الْغُيُوبِ﴾، تۆ بڵێ: بێگومان پەروەردگارم هەق دەهاوێ، هەق بۆ کوێ دەهاوێ؟ بێگومان هەق بە ناهەق دادەدات، هەق ئەگەر وەك بەردێك و فیشەکێك بێ، بهاویشترێ و بتەقێنرێ، دەبێ بەرەو ڕووی شتێك بهاویشترێ، ئنجا بە سیاق دەزانرێ کە هەق بە ناهەق دادەدرێ، ﴿عَلَّامُ الْغُيُوبِ﴾، ئەو زانای هەموو پەنهانەکانە.

جاری چوارەم: ﴿قُلْ جَاءَ الْحَقُّ﴾، تو بڵێ: هەق هات، ئەو هەقەی لە قورئاندا بەرجەستەیە، لە پێغەمبەری خاتەم ﷺو ڕێبازەکەیدا، ﴿وَمَا يُبْدِئُ

﴿ٱلۡبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾، ناهەق نە هیچ شتێکی پێ دەکرێ، نە هیچ شتێکی پێ دەگێڕدرێتەوە، واتە: ناهەق هیچ کارە نیە و دەستە پاچەیە لە بەرانبەر هەقداو، هیچی لە دەست نایەت، چونکە ئەوە وەك مەسەلێکە لە زمانی عەرەبییدا، دەڵێ: (لَايُبْدِيءُ وَلَا يُعِيد)، واتە: هیچ کارە نیەو، هیچی لە دەست نایەت، یاخود نە هیچ شتێکی پێ دەست پێ دەکرێ لە سەرەتاوەو، نەهیچ شتێکی دوای ئەوەی لادەچێ، پێ دووبارە دەکرێتەوەو، دەگێڕدرێتەوە.

بۆ جاری پێنجەم و کۆتایی دەفەرموێ: ﴿قُلۡ إِن ضَلَلۡتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفۡسِي﴾، بڵێ: ئەگەر گومڕابم ئەوە زیانی گومڕا بوونەکەم بۆ خۆمە، بە زیانی خۆم تەواو دەبێ، ﴿وَإِنِ ٱهۡتَدَيۡتُ فَبِمَا يُوحِيٓ إِلَيَّ رَبِّيٓۚ﴾، ئەگەر ڕێی ڕاستیش بگرم، ئەوە پەروەردگارم بۆم سروش دەکات و بە پەنامەکیی بۆم دەنێرێ، بە هۆی پەیامی خواوە من ڕێی ڕاست دەگرم، ئەگەر لاش بدەم بە هۆی خۆمەوەیەو، بە زیانی خۆشمە، ﴿إِنَّهُۥ سَمِيعٞ قَرِيبٞ﴾، بە دڵنیایی ئەو (پەروەردگارم) بیسەری نیزیکە، ئنجا لە کۆتایی دا، خوا ﷻ، ئەو دیمەنە سامناکەی ڕۆژی دواییان دەخاتە بەرچاو:

﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ فَزِعُواْ فَلَا فَوۡتَ﴾، ئەگەر تۆ ببینی کاتێك، ڕاچڵەکین و دەرباز بوونیش نیە، ﴿وَأُخِذُواْ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ﴾، لە شوێنێکی نیزیکەوەش گیران، ﴿وَقَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦ﴾، لەوێ (لە قیامەتدا) گوتیان: بڕوامان پێهێنا، ﴿وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ﴾، بەڵام چۆن دەستی دەگەیەننێ، چۆن بۆیان بەرپەل و بەردەست دەبێ، دەستی دەگەیەننێ لە شوێنێکی دوورەوەو، لە قیامەت دا چۆن تازە دەستیان بە ژیانی دنیا ڕادەگاتەوە، چونکە شوێنی ئیمان هێنان ژیانی دنیا بوو، نەك قیامەت، ﴿وَقَدۡ كَفَرُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۖ﴾، پێشتریش پێی بێبڕوا بوون، لە دنیادا، ئەو شوێنەی کە دەگونجا ئیمانی تێدا بێنن، ئەوان پێی بێبڕوا بوون، بەو هەقە کە بۆیان هاتبوو، کە لە قورئان و لە پێغەمبەردا ﷺ بەرجەستەیە، ﴿وَيَقۡذِفُونَ بِٱلۡغَيۡبِ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ﴾، لە دنیادا ڕوو بە پەنهان،

شتیان دەهاویشت لە شوێنێکی دوورەوە، تفەنگیان بە تاریکییەوە دەنا، نەزانانەو بێ ئاگایانە، بێ ئەوەی شارەزاییان هەبێ، قسەیان دەکرد.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ ﴾، واتە: بەربەست خرایە نێوان ئەوان و ئەوەوە کە ئارەزوویان دەکرد، ئارەزووەکانیان، ﴿ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ ﴾، وەك چۆن ئەوەش بە کۆمەڵەکانی پێش وان کرا، واتە: ئەو کۆمەڵانەی پێش وان، ڕابردوون بە هەمان مەرەد چوون، هەمان ئەو دەردەیان تووشبوو، کە پەردە خرایە نێوان خۆیان و ئارەزووەکانیان، بۆچی؟ ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍۭ ﴾، چونکە ئەوان لە دوو دڵییەکی خەست و خۆڵدا بوون، ﴿ شَكٍّ مُّرِيبٍۭ ﴾، (رَيبٌ و شَكٌ) هەردووکیان بە مانای دوو دڵیین، ﴿ شَكٍّ مُّرِيبٍۭ ﴾، وەك: (لَيْلٌ أَلْيَلُ) شەوێکی شەو، یان (شِعْر شَاعِر)، شیعرێکی شیعر، ئەوە بۆ تەئکید کردنەوەیە، واتە: لە دوو دڵییەکی زۆرخەست و خۆڵ دا بوون، بۆیە بەو مەرەدو دەردە چوون.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کە پێنج ڕاستیی گەورەو گرنگ بە بێبڕوایان ڕابگەیەنێ:**

١- دوو دوو و یەك یەك، لەبەر خوا بیربکەنەوە، لە بارەی هاوەڵەکەیانەوە: موحەممەد ﷺ ئەو کاتە دەگەنە ئەو دەرەنجامەی، کە هیچ جۆرە شێتییەکی تێدانیە.

٢- موحەممەد ﷺ هیچ جۆرە کرێ و پاداشتێکیان لێ داوا ناکات و، پاداشت تەنیا لە خوا چاوەڕێ دەکات.

٣- خوا هەق بە ناهەق دا دەدات و بۆی دەهاوێ، دیارە هەقیش بە ناهەق بکەوێ دەیپووچێنێتەوە.

٤- کە هەق هات، ناهەق لە پەل و پۆ دەکەوێ و، دەستە پاچە دەبێ و، هیچ کارە دەبێ.

٥- مرۆڤ ئەگەر گومڕا بێ، خەتای خۆیەتی و، ڕاستە ڕێ بوونیشی بەرهەمی وەحیی خوایە، یاخود موحەممەد ﷺ ئەگەر گومڕابێ، خەتای خۆیەتی و، ڕاستە ڕێ بوونیشی، بەرهەمی وەحیی و پەیامێکە، کە لە خوای بەرزەوە بۆی دابەزێنراوە:

خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ ۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾
قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٤٧﴾ قُلْ إِنَّ
رَبِّى يَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٤٨﴾ قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلْ إِن
ضَلَلْتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِى ۖ وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِىٓ إِلَىَّ رَبِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ ﴿٥٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

**١)- ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ﴾، بفەرموو: تەنیا بە یەك شت ئامۆژگاریتان دەكەم، ئەمە فەرمانی یەكەمە، كە خوا پێنج جاران لە پێنج ئایەتی بەدوای یەك دا دووبارەی دەكاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ ﴾، بفەرموو: ﴿ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ﴾، من تەنیا بە یەك شت ئامۆژگاریتان دەكەم، ﴿ أَعِظُكُم ﴾، (الوَعْظُ: كَلَامٌ يَرِقُّ لَهُ الْقَلْبُ وَفِيْهِ تَحْذِيْرٌ وَتَرْغِيْب)، (وَعْظ): بریتیە لە قسەیەك كە دڵی مرۆڤ بۆی نەرم بێ و، ترساندن و وریاكردنەوەو هاندانی تێدابێ.**

**(إِنَّمـا: أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَـات)، (إِنَّمـا) ئامـرازی كـورت هەڵهێنـان و چەسـپاندنە، كـە دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ﴾، بفەرمـوو: تەنیـا بـە یـەك شـت ئامۆژگاریتـان دەكـەم، (أي: مَـا أَعِظُكُـمْ إِلاَّ بِخَصْلَـةٍ وَاحِـدَة)، ئەمـە بـۆ ئەوەیـە ڕێـی وتووێـژو قسـەو بـاس بپێچرێتـەوەو، قسـەی كـورت و پوخـت لـە كۆتاییـدا بكـرێ، كـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ﴾، وشـەی: ﴿ بِوَٰحِدَةٍ ﴾، (صِفَـةٌ لِمَوْصُـوفٍ مَحْـذُوفٍ: أي كَلِمَـةٍ وَاحِـدَةٍ، أو خَصْلَـةٍ وَاحِـدَةٍ، أو قَضِيَـةٍ وَاحِـدَة، أو مَوْعِظَـةٍ وَاحِـدَة)، وشـەی: (واحـدة) سـیفەتی وەسـفكراوێكی قرتێـنراوە، واتـە: یـەك وشـەتان پێرادەگەیەنـم، یـان یـەك خەسـڵەت، یـان یـەك بابـەت، یـان یـەك ئامۆژگاریـی ئەویـش بریتیـە لـە چـی؟**

**٢)- ﴿ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ﴾، كە بۆ خوا دوو دوو، یەك یەك، هەڵسن، لێرەدا كە دەفەرموێ: بۆ خوا هەڵسن، (القِيَامُ: مُرَادٌ بِهِ مَعْنَاهُ المَجَازِي، وَهُوَ التَّأَمُّلُ للعَمَلِ وَالإِجْتِهَاد)، مەبەست هەڵسانی ڕواڵەتیی نیە، بەڵكو مەبەست مانا مەجازەییەكەیەتی، واتە: خۆتان ماندوو بكەن و كۆشش بكەن، كە دەفەرموێ: (مَثْنَى وَفرادى)، واتە: (مَثْنَى: أي اثْنَيْنِ اثْنَيْنِ، وَفرادى أي: فَرْداً فَرْداً)، چونكە دوو دوو، یەك یەك، وەك پێشتریش باسمان كرد، كاتێ ئینسان تەنیایە، باشتر دەتوانێ بیر بكاتەوە، یاخود ئەوپەڕی یەكێكیشی لەگەڵدا بێ، شتێكی بیر بخاتەوە، پێكەوە وتووێژ بكەن، بەڵام كە بوونە سێ و چوارو پێنج و... هتد، هەر كەسە قسەیەكی كردو، هەر كەسە بە دۆڵێكدا ڕۆیی، مرۆڤ مێشكی پەرت دەبێ.**

٣)- ﴿ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْ﴾، دوایی بیربکەنەوەو رامێنن (ثُمَّ ) لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی پلەییە (للتَّرْتِيب الرُتْبِي)، چونکە خۆ ئامادە کردنەکە شتێکە، بەڵام بیرکردنەوەو ڕامان لە پلەو پایەدا بەرزترەو گرنگترە، لە خۆ ئامادەکردن و هەڵسان و، پێکەوە بە جووتیی و بە تاکیی بیرکردنەوە.

ئنجا ئایا بیر لە چی بکەنەوە؟ بە ڕەهایی بیر لە خوا بکەنەوەو، بیر لە خۆتان بکەنەوەو، بیر لە ژیان بکەنەوەو، بیر لە دوارۆژ بکەنەوەو، یاخود بیر بکەنەوە بە تایبەتیی لە پێغەمبەر ﷺ موحەممەد.

٤)- ﴿مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ﴾ بیر بکەنەوە لەوەدا کە هاوەڵەکەتان هیچ شێتییەکی تێدا نیە، بۆچی دەفەرموێ: ﴿بِصَاحِبِكُمْ﴾؟ (الصَّاحِبُ: المُخالِطُ مُطْلَقاً بالمُوافَقَةِ والمُخَاصَمَةِ، وَهُوَ كِنَايَةٌ عَنِ التبَصُّرِ فِي خُلُقِهِ، وَهَذَا إظْهارٌ فِي مَقامِ الإضْمارِ: «مَا به مِنْ جِنَّةٍ»)، چونکە هاوەڵ (صَاحِب): ئەو کەسەیە لەگەڵ کەسێك دا تێکەڵ بێ و، چ هاوڕای بێ، یان ڕای جیا بێ، لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە کە ئەو موحەممەدە ﷺ ئەوەندە لەگەڵی تێکەڵن، کە باش شارەزای ڕەوشت و ئاکارنی و چاکی دەناسن، ئەمەش ئاشکراکردنە لە جیاتی شاردنەوە بەهۆی ڕاناوەوە.

یانی: کە دەفەرموێ: ﴿مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ﴾، هاوەڵەکەتان هیچ جۆرە شێتییەکی تێدانیە، لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (مَا بِهِ مِنْ جِنَّةٍ)، ئەو هیچ شێتیی تێدانیە، یانی: ئەو کەسەی لە نیزیکەوە دەیناسن و، هاوەڵایەتیی و ڕەفاقەتتان لەگەڵی هەیەو لەگەڵی ژیاون و، لەگەڵی تێکەڵن و چاکی دەناسن.

﴿مِّن جِنَّةٍ﴾، (مِنْ) یان دەستپێکردەنیی (إبْتِدَائِيَّة)یە، یان (مِنْ)ی بەشکردەنیی (تَبْعِيضية)یە، ئەگەر (مِنْ)ی (إبْتِدَائِيَّة) بێ، واتە: هەر لە سەرەتایەوە هیچ جۆرە شێتییەکی تێدانیە، ئەگەر (مِنْ)ی (تَبْعِيضية)ش بێ، واتە: (أيُ شَيءٍ مِنَ الجُنُونِ وَلَوْ قَلِيلًا)، هیچ بەشێك لە شێتیی تێدانیە، هەرچەندە کەمیش بێ.

٥)- ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم﴾، ئەو تەنها ترسێنەرو وشیارکەرەوەیە بۆ ئێوە، واتە: پێش ئەوەی سزا سەختەکەتان بۆ بێ، ئەو هاتوە وریاتان دەکاتەوە.

٦)- ﴿بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾، لە پێش دەستی سزایەکی سەخت و تونددا، یانی: سزایەك کە لێتانەوە نیزیکە، ﴿بَيْنَ يَدَيْ﴾، (أي: قَرِيبٍ)، واتە: نیزیکە، واتە: پێش ئەوەی سزا سەختەکەتان بۆ بێ، ئەو هاتوە، وریاتان دەکاتەوە، بتانترسێنێ، تاکو هۆشیاریی خۆتان وەربگرن، کە مەبەست پێی سزای ڕۆژی دواییە، ئنجا چ قۆناغی یەکەمی، کە ئاخیر زەمانەو تێك چوونی گەردوونە، یان قۆناغی دووەمی، کە زیندوو کرانەوەو لێپرسرانەوەیەو، یاخود کۆی ڕۆژی دوایی، دەشگونجی مەبەست پێی ئەو سزاو ئازارە بێ، کە لە دوای مردنەوە دەست پێ دەکات، کە کەوتنە نێو قۆناغی بەرزەخە، ئەمە جاری یەکەمە لە پێنج جارەکە کە خوا فەرمووی: (قُلْ)، پێیان بفەرموو: وەرن بابە یەك ئامۆژگاریی ئامۆژگارییتان بکەم، ئەویش ئەوەبوو کە باسمان کرد.

ئنجا بۆ جاری دووەم دەفەرمویٚ:

٧)- ﴿قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ﴾، بفەرموو: هەرکرێ و پاداشتێکم لێتان داواکردبێ، با بۆ خۆتان بێ، ئەمە دوو مانایان هەڵدەگرێ:

أ- (مَا) لێرەدا (مَا الشَّرْطِيَة): ﴿مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ﴾، لە وشەی: ﴿مِّنْ أَجْرٍ﴾، ڕوونکردنەوەیە بۆ (مَا)، چونکە (مَا) نەزانراویی (إبهام)ێکی تێدایەو نازانی چییە؟ ﴿مَا سَأَلْتُكُم﴾، یانی: (أيُّ شيْءٍ سَأَلْتُكُمْ) هەرشتێك کە داوام لێکردوون، دوایی دەفەرمویٚ: ﴿مِّنْ أَجْرٍ﴾، لە کرێ و پاداشت، با بۆ خۆتان بێ، ﴿فَهُوَ لَكُمْ﴾، ئەمە وەڵامی مەرج (جَواب الشَّرْط)ەکەیە، واتە: هەر پاداشتێکم لێ داواکردوون، با بۆ خۆتان بێ.

ب- یاخود: ﴿مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ﴾، (مَا: نَافِيَة)، دەگونجێ (ما) لابەرەبێ، یانی: هیچ کرێیەکم لێ داوا نەکردوون، (مِّنْ أَجْرٍ) هەرجۆرە کرێ و پاداشتێك، ئەمە تەئکیدی ئەوەیە کە هیچ جۆرە کرێیەکم لێتان داوا نەکردوە، کە دەفەرمویٚ: ﴿فَهُوَ لَكُمْ﴾،

ئەمەش دوو واتای هەن:

أ- هەر کرێ و پاداشتێکم لێ داواکردوون، با بۆ خۆتان بێ.

ب- (هو) دەگەڕێتەوە بۆ قورئان، ﴿ فَهُوَ لَكُمْ ﴾، واتە: قورئان بۆ ئێوەیە، بۆ سوودی خۆتانەو، من هیچ کرێیەکم لێ داوا نەکردوون، ﴿ قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ ﴾، بڵێ: من هیچ پاداشتێکم لێ داوا نەکردوون، ﴿ فَهُوَ لَكُمْ ﴾، قورئان تەنها بۆ خۆتانە، ئەگەر بڕوای پێ بێنن.

بەڵام وا پێدەچێ مانای یەکەمیان گونجاوتر بێ: ﴿ قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ ﴾، واتە: هەر پاداشتێکم لێ داواکردوون، با بۆ خۆتان بێ، واتە: هیچم لێ داوا نەکردوون.

ئەم ئایەتەی ئێرە شێوەی هەردووك ئایەتی: (٨٦ و ٨٧)ی سووڕەتی (ص) دەکات: خوا لە سووڕەتی (ص)دا، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾، واتە: بڵێ من هیچ پاداشتێکتان لە سەری لێ داوا ناکەم، من لە ئەرك خەرەسەران نیم، {لەوانە نیم، بارتان گران بکەم و ئەرکتان بخەمە سەرێ} ئەمە تەنها بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان.

(أَجْرٍ): بریتیە لە قەرەبوویەك لە بەرانبەر کارێکدا کە دەکرێ و، سوودێك بە وەرگرەکەی دەگەیەنێ.

ئەو ئایەتە بەپێزە مانایەکی دیکەش دەگەیەنێ کە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، بەڵام پێم وایە ئەو واتایەش لە خۆی دەگرێ: من هیچ شتێکم لێ داوا نەکردوون، ئەوە نەبێ کە بڕوا بێنن، ئنجا ئەگەر ئەو داوا کردنەی من: {بڕوا بێنن} بە کرێ و پاداشتی تێدەگەن، بە تەئکید بەس خۆتان لێی بەهرەمەندن و هەر بۆ خۆتانەو بۆ هیچکەسی دیکە نیە.

٨)- ﴿ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ﴾، پاداشتی من تەنیا لەسەر خوایە ﷻ، ئەمەش بە دوو شێوە خوێنراوەتەوە: ﴿ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (إِنْ أَجْرِي إلاَّ عَلَى اللهِ)، پاداشتم تەنیا لەسەر خوایە ﷻ.

٩)- ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ ئەویش (خوا) چاودێرو ئاگاداری هەموو شتێکەو، بینەری هەموو شتێکە.

١٠)- ﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَقْذِفُ بِالْحَقِّ ﴾، {ئەمە جاری سێیەمە} بڵێ: بە دڵنیایی پەروەردگارم هەق دەهاوێ، ئایا مەبەست لە هەق هاویشتن، چییە؟

أ- (يُظْهِرُ الحَقَّ)، هەق دەردەخات.

ب- یاخود هەقێ بە نا هەقێ دادەدات: (يَرْمِي بِالْحَقِّ عَلَى البَاطِل)، هەق دەهاوێ بەرەو باتیڵ.

١١)- ﴿ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴾، (خوا) زۆر زانای پەنهانەکانە، کەواتە: نا هەق و باتیڵ لە کوێ بێ، خوا دەیبینێ، ناهەق لە هەر شوێنێك بێت، خوا دەری دەخات و دەیبینێ و، ئەو هەقەی کە بەرەو ڕووی دەیهاوێ، دەیپێکێ و دەیهەنگێوێ.

١٢)- ﴿ قُلْ جَاءَ الْحَقُّ ﴾، {جاری چوارەم} بڵێ: هەق هات، ئەو هەقە مسۆگەر مەبەست پێی قورئانە، ئەو هەقەی کە لە قورئانداو، لە وەحیی و پەیامی خوادا بەرجەستەیە.

١٣)- ﴿ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴾، باتیڵ هیچ دەست پێناکات و هیچ ناگێڕێتەوە. هەق واتە: شتی چەسپاو، باتیل، واتە: شتی بۆش و بێ بنەما، کە لێرەدا مەبەست لە (حق) خوا بە یەکگرتن و بەندایەتیی بۆ خوا کردن و بە ڕێی خوادا ڕۆیشتنەو، باتیڵیش بە پێچەوانەکەیەتی، کە بریتیە لە هاوبەش بۆ خوا دانان، یان دان بە خوادانەنان، یاخود دان بە پێغەمبەردا نەهێنان و ڕێی وەحیی و خوانەگرتن، بڵێ: هەق هات و باتیڵ هیچ دەست پێ ناکات و هیچ ناگێڕێتەوە، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی **(الإسراء)** ە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ ﴾، بڵێ: هەق هات و باتیڵ مرد، لە بەینچوو، بێگومان باتیڵ خۆی لە خۆیدا، لە بەین چوویە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴾، ﴿ يُبْدِئُ ﴾، واتە: دەست پێدەکات، ﴿ يُعِيدُ ﴾، واتە: دەگێڕێتەوە: ئەم تەعبیرە چوار واتایان هەڵدەگرێ:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ، کە هەر لە سەرەتاوە دروست ناکات و ناهێنێتە دی و، هیچ شتێکیش دوای لە بەین چوون، ناگێڕێتەوە.

ب- دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ، کە ئەوە عیبارەتێکی مەشهوورە لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (فلَان مَا يُبْدِيءُ وَمَا يُعِيدُ)، واتە: فڵانکەس هیچی لە دەست نایەت و دەستە پاچەیە.

ج- یاخود ئەمە کینایەیە بۆ لە بەینچوون، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾، یانی: باتیڵ لە بەین چووە و هیچی لە دەست نایەت، چونکە کەسێ کە فەوتابێ و مردبێ و لە بەین چووبێ، هیچی پێناکرێ.

د- هەندێکیش گوتوویانە: ﴿وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾، ئەمە لە زمانی عەرەبییدا بەو واتایە هاتوە: یانی: نە ئەوەیە خۆی قسەیەك بکات، نە ئەوەشە کە لە وەڵامی قسەی خەڵکدا، قسە بکات.

١٤)- ﴿قُلْ إِن ضَلَلْتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِى﴾، {جاری پێنجەم} بڵێ: ئەگەر گومڕابم، زیانی گومڕابوونە کە لە سەرخۆمە.

وشەی: ﴿أَضِلُّ﴾، (تَعْدِيَةُ (أَضِلُّ) بـ «عَلَى» إِذْ شُبْهَةُ الضَّلَالُ بِجَرِيمَةٍ عَلَيْهِ)، یانی: کە (أَضِلُّ): تەعەددای پێکراوە بە (عَلَى)، واتە: ئەگەر گومڕابم، ئەوە تاوانێك بەرانبەر خۆم دەکەم و، ستەم لە خۆم دەکەم و زیانەکەی بۆ خۆمە.

١٥)- ﴿وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِىٓ إِلَىَّ رَبِّىٓ﴾، ئەگەر ڕێی ڕاستیش بگرم، ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە کە پەروەردگارم سروشم بۆ لادەکات. ﴿ٱهْتَدَيْتُ﴾، واتە: ڕاستە ڕێ بووم، ڕێی ڕاستم گرت.

واتە: ڕێی ڕاست گرتنم بە هۆی خواوەیەو، گومڕابوونیشم بە هۆی خۆمەوەیەو، ڕێی ڕاست گرتنم بە قازانجی خۆمەو، نەك بە قازانج و سوودی خوا ﷻ، گومڕابوونیشم بە زیانی خۆمە، نەك زیانێ لە خوا ﷻ بدەم.

١٦)- ﴿إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ﴾، بە دڵنیایی ئەو بیسەری نیزیکە، واتە: خوا ﷻ بیسەری هەموو شتێکەو، نیزیکیشە ئاگای لە هەموو شتێکە.

کەواتە: ئەوانە ئەو پێنج جارەن، کە خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ، بفەرموو:

١- کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟﴾، بڵێ: تەنیا ئامۆژگارییەکتان دەکەم: هەڵسن بۆ خواو بیر بکەنەوە، بیر لە هەموو شتێك بکەنەوەو، بە تایبەت بیر لە موحەممەد ﷺ بکەنەوە، کە پێغەمبەری ڕەوانە کراوی خوایە، بیر لە خۆیان بکەنەوەو، بیر لە خوا بکەنەوەو، بیر لە ژیانی دنیا بکەنەوەو، بیر لە دوارۆژ بکەنەوەو، هەمووی دەگرێتەوە.

٢- کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ﴾، بڵێ: من هیچ کرێ و پاداشتێکتان لێ داوا ناکەم، هیچ چاوەڕوانییەکم لێتان نیەو، هیچ بارگرانییەکیشم بۆتان نیەو، شانتان قورس ناکەم.

٣- کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ رَبِّى يَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ﴾، بڵێ: بێگومان پەروەردگارم هەقی دەهاوێ، هەق بەرەو پێچەوانەکەی خۆی و دژەکەی دەهاویشترێ، کە ناهەق (باطل)ە، لێرەدا مەبەستەکە ئەوەیە کە هەق ڕوون بۆوەو، وەك بە ناهەق دا درابێ، وایە، ناهەق بۆ خۆی دەپووچێتەوە، لە ڕاستییدا لە نەبوونی هەقدا باطیل و ناهەق دێتە مەیدان و خۆی ڕادەنوێنێ و خۆی بادەدات، کاتێ هەق بێ، باطیل دەپووچێتەوە، وەك لە سووڕەتی (الإسراء)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾﴾.

٤- ﴿قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾، بڵێ: هەق هات و باتیڵ هیچ کارەیە. دوای ئەوەی هەق دێ، باطیل بوونی نامێنی، یاخود هیچ کارەو دەستەپاچە دەبێ.

٥- کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن ضَلَلْتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِى ۖ وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِىٓ إِلَىَّ رَبِّىٓ﴾، بڵێ: گومڕاییەکەم بە زیانی خۆمەو، ڕێ ڕاست گرتنەکەم لە خواوەیە ﷻ، کەواتە: ئێوەش ئەی بێبڕوایەکان! ئەگەر گومڕابن، تەنیا زیان لە خۆتان دەدەن و، ئەگەر ڕێی ڕاستیش بگرن، تەنها بە هۆی پەیامی خواوە دەتوانن ڕێی ڕاست بگرن، کە لەم ژیانی دنیایەدا بە جۆرێك ژیان بگوزەرێنن و بیبەنە سەر، کە شایستەی مرۆڤ بێ، ئەوە تەنیا بە هۆی خوای پەروەردگارو، بە هۆی ئەو بەرنامەو پەیامەوەیە، کە خوا ﷻ ناردوویەتی.

**مەسەلەی دووەم:**

**خستنە ڕووی دیمەنی ترس و لەرزو داچڵەکینی کافران لە ڕۆژی دوایـیداو، گیرانیـان لـە نیزیکـەوەو، بـڕوا هێنانـی ناچاریـان لـەوێ و، لـێ نەسـەلمێنرانی ئـەو ئیعتیراڤـە ناچاریـەو، چواندنیـان بـە کەسـێك کـە دەیـەوێ لـە دوورەوە، دەسـت بگەیەنێتـە شـتێك، ئنجـا بیـر هێنانـەوەی کوفـری پێشـوویان کـە تفەتگیـان لـە دوورەوە بـە تاریکییـەوە دەنـاو، خستنە ڕووی ئـەو ڕاستییە کـە ئـەوەی ئارەزوویان دەکـرد، دەسـتیان ناکـەوێ، وەك ڕابردووانیـان:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُوا۟ فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٥١﴾
وَقَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِهِۦ مِن
قَبْلُ ۖ وَيَقْذِفُونَ بِٱلْغَيْبِ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ كَمَا فُعِلَ
بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍۭ ﴿٥٤﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُوا۟ فَلَا فَوْتَ ﴾، ئەگەر ببینی کە داچڵەکین، هیچ قوتاربوونێك نیە. لێرەدا وەڵامی (لَوْ)، فڕتێندراوە، چونکە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ ﴾، ئەگەر تۆ ببینی، ﴿ فَزِعُوا۟ ﴾، کاتێك کە داچەڵەکین، ﴿ فَلَا فَوْتَ ﴾، دەرباز بوون نیە، قوتار بوون و ڕزگار بوونیان نیە، (**وَلَوْ تَرَى إِذْ فَزِعُوا فَلَا فَوْتَ، لَرَأَيْتَ أَمْراً عَجِيْباً**)، ئەگەر ببینی کە داچڵەکین، ئنجا قوتاربوون نیە، تۆ شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر دەبینی، یاخود: (**لَرَأَيْتَ أَمْراً مَخُوفاً**)، شتێکی زۆر سامناك دەبینی، ئەگەر ئەو ڕۆژەت بینیبایە، کە کافرەکان دادەچڵەکن و هیچ بواری دەرباز بوونیشیان نیە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ ﴾، کـرداری: ﴿ تَرَىٰٓ ﴾: بـەرکار (**مَفْعُولُ بِه**)ەکـەی فڕتێنـدراوە، یانـی: (**لَـوْ تَرَاهُـمْ، أو: تَـرَى عَذَابَهُـمْ**)، واتـە: ئەگـەر تـۆ بیانبینـی، یـان سـزایەکەیان ببینـی، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِذْ فَزِعُوا۟ ﴾، ﴿ إِذْ ﴾، لـە شـوێنی بـەرکار

(مَفْعُولٌ بِـه)ەو مانـا ناگەیەنـێ، یانـی: ئەگـەر ئـەو کاتـە ئـەو حاڵـە ببینـی، شـتێکی سـامناك دەبینـی، وەڵامەکـەی فڕتێـنراوە، وشـەی: ﴿ فَوْتَ ﴾، لـە: ﴿ فَلَا فَوْتَ ﴾، (الفَـوْتُ: الخَـلَاصُ وَالتَفَلُّـتُ مِـنَ العِقَـاب)، واتـە: دەربـاز بـوون و، ڕزگار بـوون لـە سـزا، بـەڵام لـەوێ هیـچ دەربازبوونێـك نیـە ﴿ فَلَا فَوْتَ ﴾.

٢)- ﴿ وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴾، لە شوێنێکی نیزیکەوەش گیران.

﴿ وَأُخِذُوا۟ ﴾، واتـە: گیـران، بـەڵام لێـرەدا بەکارهێـنراوە بـۆ تێشـکان و هیـچ لـە دەسـت نەهاتـن، ﴿ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴾، شـوێنی کۆکرانـەوەی خەڵـك لەسـەر زەمینـی مەحشـەرو بـەرەو ئاگـر، کـە شـوێنێکی نیزیکـە، یـان وەك شـوێنێکی نیزیـك وایـە، بـا دووریـش بـێ، مـادام هەمـووی لـە بـەر دەسـتی خوایـەو، ئـەوان شـوێنی قوتـار بوونیـان نیـە، وەك لـە شـوێنێکی نیزیکـەوە بگیرێـن، وایـە، وەك دەگوتـرێ: لـە بنـەو پاڵـەوە گیـران.

وشـەی (فَزِعـوا)، داچڵەکیـن لـە: ﴿ إِذْ فَزِعُوا۟ ﴾، (الفَزَعُ: الخَـوْفُ المُفَاجِيء)، ترسـێکی لـە نـاکاو، کـە دەبێتـە هـۆی داچڵەکیـن و ڕاچڵەکینـی مرۆڤ.

٣)- ﴿ وَقَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦ ﴾، گوتیان: ئێمە بڕوامان پێهێنا، دیارە لە ڕۆژی دواییدا، گوتیان، ئەم دیمەنە هەمووی باسی ڕۆژی دواییە، واتە: لەوێ گوتیان: ئێمە بڕوامان پێهێنا، بڕوایان بە چی هێناو ڕاناوی (بە) بۆچی دەچێتەوە؟ دەگونجێ بچێتەوە بۆ قورئان، واتە: ئیمانمان بە قورئان هێنا، دەگونجێ مەبەست پێی پێغەمبەر ﷺ بێ، یاخود بڕوامان هێنا بە ڕۆژی دوایی، یاخود بڕوامان هێنا، بەو هەڕەشەیەی کە پێی دەترسێنراین، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، یاخود بڕوامان بە هەموو ئەوانە هێنا، کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدابوون.

٤)- ﴿ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴾، بەڵام لە شوێنێکی دوورەوە چۆن دەستپێگەیاندنیان دەبێ؟ ﴿ وَأَنَّىٰ ﴾، (أَنَّى: إِسْتِفْهَامٌ عَنِ المَكَانِ وَهُنَا مُسْتَعْمَلٌ فِي الإِنْكَارِ)، (أَنَّى): پرسیارکردنە لە بارەی شوێنەوە {جاری واش هەیە، لە بارەی چۆنیەتییەوە: (أَنَّى شِئْتُم)، هەرچۆنێك ویستتان، جاری واش هەیە (أَنَّى)، بۆ کاتە، یانی: (مَتَى شِئْتُم) هەرکات ویستتان}

بەڵام لێرەدا: ﴿وَأَنَّىٰ لَهُمُ﴾، (أَنَّى) بۆ پرسیارکردنەو بەکارهێنراوە بۆ نکووڵیلێکردن: یانی: چۆن دەستیان دەگاتێ؟ ﴿مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ﴾، لە شوێنێکی دوورەوە، قیامەت و دنیا، دوو شوێنی لە یەك دوورن، لە ڕووی کاتەوە، تازە کات بەرەو دواوە ناگەڕێتەوە، لە قیامەتەوە چۆن دەستیان دەگاتەوە دنیا و بڕوا بێنن؟ کە گوتوویانە: ﴿ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ چونکە شوێنی بڕواهێنان دنیا بوو!!

پێشتریش گوتمان: ﴿ٱلتَّنَاوُشُ﴾، یانی: (التَّنَاوُلُ): دەستگەیاندن بە شتێك، (الزمخشري) دەڵێ: (التَّنَاوُلُ وَالتَّنَاوُشُ أخَوَان، إلاَّ أنَّ التَّنَاوُشَ: تَنَاوُلٌ سَهْلٌ لِشَيْءٍ قَرِيبٍ، يُقَالُ: نَاشَهُ يَنُوشُهُ وَتَنَاوَشَهُ الْقَوْمُ)[1]، ئەمە: (محي الدين الدرويش)، هێناویەتی، دەڵێ: (تَنَاوُلٌ وَتَنَاوُش) بران، بەڵام (تَنَاوُش)، بۆ دەستگەیاندنە بۆ شتێکی ئاسان، شتێکی نیزیك، دەگوترێ: (نَاشَهُ يَنُوشُهُ وَتَنَاوَشَهُ الْقَوْمُ)، واتە: دەستی گەیاندێ و، خەڵکەکە دەستیان گەیاندێ، لە نیزیکەوە بە ئاسانیی.

٥)- ﴿وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ﴾، لە حاڵێك دا پێشتر پێی بێبڕوابوون، ئێستا چۆن دەتوانن بە ئاسانیی دەستی بگەیەننێ، چۆن لە شوێنێکی دوورەوە، دەستیان دەگاتە ئیمان؟ ﴿وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ﴾، پێشتر پێی بێبڕوا بوون، بە چی بێبڕوا بوون؟ بەوەی کە ئێستا دەڵێن: بڕوامان پێی هێنا، بە هەموو ئەگەرەکان:

١- بڕوا بە قورئان.

٢- بڕوا بە پێغەمبەر ﷺ.

٣- بڕوا بەو هەقە کە قورئان و موحەممەد گرتوویانەتە خۆیان.

٤- بڕوا بە ڕۆژی دوایی هێنا.

٥- بڕوا بە سزای خوا، ﴿وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ﴾، پێشتر پێی بێبڕوا بوون، واتە: پێشتر ئەو کاتەی دەگونجا، ئیمان بێنن و ئیمان هێنانەکەیان سوودی بۆیان هەبێ، پێی بێبڕوا بوون، لە کاتێك دا ئیمان پێ هێنان کەڵکی هەبوو، پێی بێبڕوا بوون، بەڵام لە کاتێك دا ئیمان پێهێنان سوودی نیە، ئێستا بڕوا دێنن، وەك گوتراوە: (لە پاش بارانان کەپەنەك).

---

(١) إعراب القرآن الكريم وبيانه: ج٨، ص١١٣.

٦)- ﴿ وَيَقْذِفُونَ بِٱلْغَيْبِ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴾، بۆ پەنهان دەهاوێن لە شوێنێكی دوورەوە، ﴿ وَيَقْذِفُونَ بِٱلْغَيْبِ ﴾، (الغَيْبُ: المُغَيَّبُ)، واتە: شتێك كە لێیان نادیارەو پەنهانە، لە دوورەوە بۆی دەهاوێن، وەك پەندی پێشینان دەڵێ: [تفەنگ بە تاریكییەوە دەنێ] (يَقْذِفُونَ)، [(مفعول (يَقْذِفُونَ مَحْذُوفٌ)] بەركاری دەهاوێن (يقذفون) فڕتێنراوە، (أي: يَقْذِفُونَ بِكَلِمَاتٍ مِنَ الكُفْرِ وَالبَاطِلِ، وَيَرْمُونَ بِهَا جُزَافًا)، وشەكانی بێبڕوایی و ناهەقیان هەر لە گۆترە دەهاویشت بەرەو پەنهان و نادیار، ئەویش ئەوە بوو كە دەیانگوت: موحەممەد ﷺ شێتە، دەیانگوت: قورئان جادوویەو، ناهەقەو، نكووڵییان دەكرد، لە هاتنی ڕۆژی دوایی، لە هاتنی ڕۆژی سزاو پاداشت، ئەوانە هەموویان نادیار بوون لێیان و، ئەوان لە دوورەوە ئەو جۆرە قسانەیان بەرەو، ئەو نادیارە دەهاویشت.

دەشـگونجێ مەبەسـت ئەوەبـێ: (أي: يَقْذِفُـونَ وَهُـمْ غَائِبُـون عَـنِ المَقْـذُوف مِـنْ مَـكَانٍ بَعِيـد)، واتـە: ئەوانـە شـتیان دەهاویشـت، لـە حاڵێكـدا كـە خۆیـان نادیـار بـوون، لـەو شـتەی كـە بۆیـان دەهاویشـت، لێـی دوور و نادیـار بـوون، واتـە: بەبـێ ئاگایانـە قسـەیان لـە بـارەی شـتێكەوە دەكـرد، كـە خۆیـان لێـی دوورو بێئاگابـوون.

(القرطبـي) لـە بـارەی شـیكردنەوەی واتـای ئـەم ڕسـتە قورئانییـەوە، كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَقْذِفُونَ بِٱلْغَيْبِ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴾، دەڵـێ: (الْعَـرَبُ تَقُـولُ لِـكُلِّ مَـنْ تَكَلَّـمَ بِمَـا لَا يَحُقُّـهُ: «هُـوَ يَقْـذِفُ وَيَرْجُـمُ بِالْغَيْـبِ. مِـنْ مَـكَانٍ بَعِيـدٍ»، عَلَـى جِهَـةِ التَّمْثِيـلِ لِمَـنْ يَرْجُـمُ وَلَا يُصِيـبُ، أَيْ: يَرْمُـونَ بِالظَّـنِّ فَيَقُولُـونَ: لَا بَعْـثَ، وَلَا نُشُـورَ، وَلَا جَنَّـةَ، وَلَا نَـارَ، رَجْـمًا مِنْهُـمْ بِالظَّـنِ)[1]، واتـە: عـەرەب عادەتیـان وایـە بـۆ هـەر كەسـێك قسـەیەك بـكات، كـە قسـەكەی هـەق نەبـێ، دەڵێـن: ئـەو بـەرد دەهـاوێ بـە نادیاریـی لـە شـوێنێكی دوورەوە، وەك تەشـبیهـ كـردن بـۆ كەسـێك، كـە شـتێك بـەرەو شـتێك دەهـاوێ، (بەردێـك یـان تیرێـك بـەرەو شـتێك دەهـاوێ)، بـەڵام نایپێكـێ.

یـانی: ئەوانـەش هـەر بـە گومـان شـت دەهاوێـن و، بـەس گومانـان بـۆ شـتەكە دەهاوێـن، كـە دەڵێـن: زیندووبوونـەوە نیـەو، بڵاوبوونـەوە نیـەو، بەهەشـت نیـەو، دۆزەخ نیـەو، هەمـووشی بـە گومـان.

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن، ج١٤، ص٢٥٥.

هەندێکی دیکە گوتوویانە: ﴿وَيَقْذِفُونَ بِالْغَيْبِ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ﴾، (هُنَا مُسْتَعَارٌ لِلْقَوْلِ بِدُونَ تَرَوٍّ وَلَا دَلِيلٍ)، واتە: ئەم تەعبیرە خوازراوەتەوە بۆ قسە کردنێك لە بارەی شتێکەوە، کە بیر کردنەوەو رامان و بەڵگە هێنانەوەی لەگەڵدا نەبێ، لە خۆڕا قسە دەکەن، ئەوە واتایەکی، واتایەکی دیکەی: (شُبِّهُوا بِمَنْ يَرْمِي شَيْئاً مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ وَهُوَ غَائِبٌ عَنْهُ، فَلَا يُصِيبُهُ الْبَتَّةَ)، چوێنـدراون بە کەسێکەوە کە شتێك دەهاوێ، لە شوێنێکی دوورەوە بەرەو شتێك، کە لێی دوورەو ئەو شتە نابینێ، بۆیە هەرگیز نایپێکێ.

٧)- ﴿وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ﴾ هەروەها بەربەست خرایە نێوان ئەوان و ئەوەی ئارەزووی دەکەن.

٨)- ﴿كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ﴾، وەك چۆن کۆمەڵەکانیان پێشتر ئەوەیان بەسەر هێنرا، واتە: وەك چۆن ئەوە کرا بەو کۆمەڵانە، کە لە پێش وان دابوون، واتە: ئەو کافرانەی ڕۆژگاری تۆش ئەی موحەممەد! ﷺ بەربەست و نێوان خرایە، نێوان ئەوان و ئارەزووکانیان، وەك چۆن ئەو کۆمەڵانەیان، کە وەك وان بوون، هەمان شت بەرانبەر وانیش کرا.

٩)- ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا فِي شَكٍّ مُّرِيبٍ﴾، بەدڵنیایی ئەوانیش لە دوودڵییەکی خەست دا بوون، ﴿شَكٍّ﴾، واتە: دوو دڵیی، (ظَنٌ)، واتە: گومان، (شك) یانی: لە نێو قەدێ بوەستی، نە بەملادا و نە بەولادا، ﴿مُّرِيبٍ﴾، لە (رَيْب)ەوە، هاتوە، ﴿مُّرِيبٍ﴾، واتە: شتێك کە شتێك بخاتە دوو دڵییەوە، (أَرَابَهُ، يُرِيبُهُ فَهُوَ مُرِيب)، (مُرِيب)، واتە: (الْمُدْخِلُ فِي الشَّكِّ، الْمُدْخِلُ فِي الرَّيْبِ)، ئەمە کە دەفەرموێ: ئەوانەی پێش وان لە دوو دڵییەکی خەستدا بوون، بۆیە بەو مەرەدە چوون، ئەوانەی ئێستاش کە لە خۆیانەوە تفەنگ بە تاریکییەوە دەنێن و، لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشا دەکەن، هەر لە خۆوە قسە دەکەن، ئەوانیش هەروەك کۆمەڵەکانی پێشوویان وان، کەواتە: هەر بە ڕێچکەی ئەواندا دەڕۆن و چی بەسەر وان دا هات، بەسەر ئەمانەش دێ، کە دەفەرموێ: ﴿فِي شَكٍّ مُّرِيبٍ﴾، ئەمە وەك: (لَيْلٌ أَلْيَلُ، شِعْرٌ شَاعِرٌ)، واتە: شەوێکی شەو، شیعرێکی شیعر، یانی: بریتیە

لە تۆخکردنەوەی مانای شتێك، هەر لە بێژەی خۆی، یاخود بە غەیری بێژەی خۆی، بەڵام هەمان واتا بگەیەنێ، وەك: ﴿ فِي شَكٍّ مُّرِيبٍ ﴾، (لَيْلٌ أَلْيَلُ)، (شِعْرٌ شَاعِرٌ)، ڕستەی: ﴿ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم ﴾، واتە: وەك چۆن بە کۆمەڵەکانیان کران، (شِيَعٌ وَأَشْيَاع)، هەردووکیان کۆی شیعەن، (شيعة)ش واتە: کۆمەڵ، واتە: کۆمەڵەکانی پێش ئەوان چییان بەسەر هات، ئەمانیش هەر هەمان شتیان بەسەر دێ، چونکە بە هەمان ڕێگای واندا دەڕۆن، کە ئەوان لە دوو دڵییەکی خەست دا بوون، ئەوانەی پێش وان، ئەمانەش هەروا، کەواتە: چی بەسەر واندا هات، بەهۆی ئەو دوو دڵیی و گومان و دڵ لە دڵ دانەوە، کە هەیانبوو، بەرانبەر پێغەمبەران و پەیامی خوا، هەمان شتیش بەسەر ئەم کافرانەدا دێ، لەبەر هەمان هۆکار کە بریتیە لە دوو دڵیی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ ﴾، یانـی: (حَـالَ زَجُّهُـمْ فِي النَّـارِ بَيْنَهُـمْ وَبَـيْنَ مَـا يَأْمُلُونَـهُ مِـنَ النَّجَـاةِ بِقَوْلِهِـمْ «آمَنَّـا بِـهِ» وَمَـا يَشْـتَهُونَهُ، هُـوَ النُّجَـاةُ مِـنَ الْعَـذَابِ، أَوْ عَوْدَتُهُـمْ إِلَى الدُّنْيَـا)، کاتێـك کـە دەخرێنـە ئاگـرەوە، چوونـە نێـو ئاگریـان، بـووە بـەر بەسـتێك لـە نێـوان ئـەوان و دەربـاز بوونیـان دا لـە ئاگـر، بـەوەی کـە دەڵێـن: (آمنّـا بـهِ)، بـەوە دەربـاز نابـن، یاخـود ئـەوەی کـە ئـارەزووی دەکـەن، کـە بریتیـە لـە دەربـاز بـوون یـان گەڕانـەوە بـۆ دنیـا.

کـە نـە دەربـاز دەبـن لە ئاگـر، نـە دەگەڕێنـەوە بۆ دنیـا، بـەو قسـەیەی کردوویانە، لـە کاتێکـداو لـە شـوێنێکدا، کات و شـوێنی ئـەو قسـەیە نەبـوو، کـە گوتیـان: (آمنّـا بِـهِ)، ئـەو بڕواهێنانـە دەبـوو لـە دنیـادا بووایـە، پێشـتر بووایـە کـە ئـەوێ شـوێنی تاقیکردنـەوە بـوو، قیامـەت شـوێنی ئەنجـام وەرگرتنەوەیـە، ئەمـە لـە قورئانـدا لـە چەنـد شـوێنێکدا هاتـوە، ئـەو پەشـێمانییەی کـە بێبڕوایـان دەیکێشـن، بـۆ وێنـە:

أ- خوا ﷻ لە سووڕەتی (الأنعام)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَقَالُوا يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: گوتیان: ئەی خۆزگە بگێڕدرێینەوەو، ئایەتەکانی پەروەردگارمان بە درۆ دانەنێین و، لە بڕواداران بین.

هەی خۆزگە! بەڵام داری خۆزگە بۆ کەس بەری نەگرتوە، تاکو بۆ ئەوان بەر بگرێ.

ب- هەروەها خوا ﷻ لە سوورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾، واتە: هەتا کاتێك یەکێکیان مردنی بۆ هات، گوتی: پەروەردگارم! بمگێڕنەوە، بەڵکو لەوەدا کە بەجێمهێشتوە {کە ژیانی دنیایە} کاری باش بکەم، نەخێر، ئەوە قسەیەکە، تەنیا خۆی دەیکات، (واتە: قسەیەکە هیچ سوودێکی نیەو)، لە پشتیانەوە پەردەیەك هەیە، تاکو ئەو ڕۆژەی تێدا زیندوو دەکرێنەوە.

واتــە: لــە پشــتیانەوە قۆناغــی بــەرزەخ چاوەڕێیانــە، بــەڵام قۆناغــی بــەرزەخ، تاکــو کــوێ دەوامــی هەیــە؟ ﴿ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾، تاکــو ئــەو ڕۆژەی تێیــدا زینــدوو دەکرێنــەوە، لــەوێ قۆناغــی بــەرزەخ کۆتایــی پــێ دێ و، قۆناغــی قیامــەت و ڕۆژی دوایــی دێتــە پێــش.

ج- هەروەها خوا ﷻ لە سوورەتی (فاطر)دا، دەفەرموێ: ﴿ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ﴿٣٧﴾ ﴾، واتە: پەروەردگارمان! دەرمان بێنە، کردەوەی باش بکەین، جیا لەوەی کە پێشتر دەمانکرد، واتە: جیا لەو کردەوە خراپانەی بریتی بوون لە بێ ئیمانیی و تاوان و خراپە، با شتێکی جیاواز بکەین، ئەم جارە دەرمان بێنە، واتە: جارێکی دیکە تاقیمان بکەوە، بەڵام ئەوە قسەیەکی پووچە، چونکە خوا ﷻ سیستمی ژیانی مرۆڤی واداناوە، کە قۆناغی تاقیکردنەوە هەیە، لە دنیادا، دوایی قۆناغی ئەنجام وەرگرتنەوە هەیە، ئەوانە دەیانەوێ ئەوەی کە لە قۆناغی تاقیکردنەوەدا دەکرا، لە قۆناغی ئەنجام وەرگرتنەوەدا بیکەن، بێگومان ئەوە پێچەوانەی سیستمی خوای کارزان و کاربەجێیە، کە خوا ﷻ هەموو شتێکی بە سیستم داناوەو، شتێك کە لە قۆناغێکدا دەکرێ، لە قۆناغێکی دیکەدا ناکرێ، دەبێ لەو قۆناغەدا کە دەکرێ، ئاگات لە خۆت بێ، هەر بۆیە خوا ﷻ ئەو هەموو پێغەمبەرانەی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ناردوون و، ئەو هەموو کتێبانەی دابەزاندوون، تاکو لەو قۆناغەدا کە قۆناغی تاقیکرانەوەیە، مرۆڤ لە خۆی وریا بێ و، ئەوەی کە پێویستە لێرەدا بیکات، تاکو لە شوێنێکی دیکەو، لە قۆناغێکی دیکەدا پەشێمان نەبێتەوە، کە پەشێمانییەکەی هیچ سوودێکی بۆی نیە.

لە خوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە، بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، پەند وەربگرین لە سەرەنجامی شوومی ئەو بێبڕوایانەی، کە لە ڕۆژی دواییدا پەشێمان دەبنەوەو کاڵەك بە ئەژنۆ دەشکێنن و، خۆزگە دەخوازن، بەڵام هیچ سوودی نیە.

هەروەها خوا ﷻ لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بەر لەوەی ڕۆژێك بێت تێیدا پەشێمان بینەوە، ئێستا بە ویستی ئازادانەی خۆمان پەشێمان بینەوەو، لە هەر خراپەیەك کە کردوومانە، بۆ لای خوا بگەڕێینەوە، بەر لەوەی بە ناچاریی بگێڕدرێینەوە، بە ئیختیاری خۆمان بۆ لای بگەڕێینەوە، ئەگەرنا ئەوانەش کە بە ئیختیارو بە ویستی ئازادانەی خۆیان ناگەڕێنەوە بۆ لای خوا، دوایی هەر دەگێڕدرێنەوە، بەڵام بە ناچاریی دەگێڕدرێنەوەو، ئەوانەی ئێستاش پەشێمان نابنەوە، کاتێك دێت پەشێمان ببنەوە، بەڵام بە ناچاریی پەشێمان دەبنەوە، ئەو کاتە پەشێمان بوونەکەیان سوودیان پێ ناگەیەنێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، زیاتر لە قورئان تێبگەین و لێی ورد بینەوەو، کارلێکی لەگەڵدا بکەین، لە قورئان تێبگەین و بە هۆی قوڕئانەوە پێ بگەین، خەڵك لە قورئان تێبگەیەنین و، بە هۆی قوڕئانەوە پێیان بگەیەنین، تاکو ئەو واقیعە پڕ تەنگ و چەڵەمەو، پڕ تاوان و ستەم و خراپەو لادانەی کە دەیبینین، چ لێرە لە هەرێمی کوردستان و عیراق دا، چ لە وڵاتانی مسوڵمانشین و لە سەرتاسەری دنیادا، کە دەیبینین دنیا پڕ بووە لە جەورو ستەم و لادان و تاوان، لە هەڵگەڕانەوە لە زگماکێك کە خوا مرۆڤی لەسەر خوڵقاندوە، لە حوکمی عەقڵ، لە حوکمی شەرع، تاکو بتوانین ئێمە خۆمان و ئەوەی دەستمان پێیڕادەگات، دەربازی بکەین لەو واقیعە تاڵ و دژوارەو، بە لای کەمەوە ئەگەر واقیعەکەشمان پێ نەگۆڕێ و پێ چاك نەکرێ، خۆمان ئەوەندە تۆکمەو دامەزراو بین، کە نەگۆڕدرێن، واقیع ئێمە نەگۆڕێ و لانەدا، کە بە تەئکید ئەرکی ئوممەتی پێغەمبەرە ﷺ - کە ئوممەتی پێغەمبەریش لە گەلانی مسوڵمان و گەلانی مسوڵمان لە تاکەکان پێك دێن - ئەرکی ئوممەتی پێغەمبەرە ﷺ کە نەك هەر بەرەی خۆیان لە ناوێ دەربێنن و، خۆیان سەرفرازو

بەختەوەر بکەن، بەڵکو بەرەی هەموو مرۆڤایەتییش لە ناوی دەربێنن، وەك خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴿١١٠﴾ ﴾آل عمران، ئێوە باشترین کۆمەڵن بۆ مرۆڤایەتیی پەیداکراون، ئێمە بەس ئەرکی سەرشانمان نیە کە خۆمان بەختەوەر بکەین و، ڕێی ڕاست بگرین، بەڵکو ئەرکمانە کە هەوڵبدەین لەگەڵ مرۆڤایەتییدا، هەموو مرۆڤایەتیی بێتە سەر ڕێی ڕاست، ئەو ڕێیە ڕاستەی کە خوا ﷻ خستوویەتە ڕوو، لە ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ، کە ئەو ڕێیە ڕاستە، هەم دەبێتە هۆی ئەوە کە مرۆڤ لە زاتی خۆیدا بەرچاو ڕوون بێ، دڵنیا بێ، بزانێ کێیە؟ لە کویّ هاتوەو بۆ چی هاتوە؟ بۆ کویّ دەچێ؟ کێ هێناویەتی؟ ئەم گەردوونە خاوەنی کێیە؟ چۆن بەڕێوەدەچێ و بەرەو کویّ دەچێ؟ هەم لەسەر ئاستی خێزان، خێزان تۆکمەو دامەزراو دەبێ، ژن و مێرد ئەرك و مافەکانیان دەزانن، ڕۆڵەکان، ئەرك و مافیان دەزانن، دایك و باب لەگەڵ منداڵەکانیان، منداڵ لەگەڵ دایك و بابیان، خزم لەگەڵ خزم، دراوسێ لەگەڵ دراوسێ.

هەروەها لە ڕووی بازنەی کۆمەڵایەتیی فراوانترەوە، پاشان لە ڕووی سیاسیی و ئیدارییەوە، کۆمەڵگا پاك و چاك دەبێ، دوور دەبێ لە ستەم و چەوساندنەوەو، قڕیی و پڕیی و چینایەتیی و، خۆسەپاندنی سیاسیی، لە چەوساندنەوەی ئابووریی، لە چین و توێژ دروستکردنی کۆمەڵایەتیی، بەڵکو لە ئەنجامی شوێنکەوتنی وەحیی خوای پەروەردگارو، لە ئەنجامی پابەندیی بە پەیام و بەرنامەی خوای پەروەردگارەوە، لەسەر ئاستی تاك و خێزان و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئیدارەدان و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا، مرۆڤەکان بەختەوەر دەبن و، ئەو ڕاستە شەقامە دەگرن، کە بەختەوەریی و سەربەرزیی دنیاو دوا ڕۆژیانی تێدایە.

خوا ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە پشك و بەشیان دەبێ، لەوەدا کە کۆمەڵگاو دەوروبەری خۆیان لەگەڵ ئایین و بەرنامەی خوای پەروەردگاردا، هاوڕەنگ بکەن، لەو کەسانە بین، کە خوا بە هۆی ئێمەوە خەڵکی دیکەش لە ئیسلامدا تێبگەیەنێ و پێ بگەیەنێ، تاکو هەم لە دنیادا بەختەوەر بین، هەم لە دواڕۆژدا سەربەرزو سەرفراز بین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# نێـوەڕۆک

پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی..................................................٥
بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ..................................................١٠
لەبارەی ئەم تەفسیرەوە..................................................١٠
پێشەکی ئەم بەرگە..................................................١٢

## تەفسیری سووڕەتی (الأحزاب)

دەستپێك..................................................١٧
نێوەڕۆکی سووڕەتی (الأحزاب) و بابەتەکانی..................................................١٧
یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:..................................................١٧
دووەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنە خواردا:..................................................١٨
سێیەم: شوێنی دابەزینی:..................................................١٨
چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:..................................................١٩
پێنجەم: نێوەڕۆکی:..................................................١٩
شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:..................................................١٩
حەوتەم: دابەشکردنی ئەم سووڕەتە بۆ چەند دەرسێك:..................................................٢٢
ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سـووڕەتەو ڕەواندنەوەی تەم و مژێك:..................................................٢٦
قسەی زانایان:..................................................٢٨
دەرسی یەکەم..................................................٣٩
پێناسەی ئەم دەرسە..................................................٤١
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان..................................................٤٣
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان..................................................٤٤

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان...................................................... ٤٦
مانای گشتیی ئایەتەکان .............................................................. ٤٩
مەسەلە گرنگەکان ...................................................................... ٥٥

دەرسی دووەم ........................................................................... ٧٥

پێناسەی ئەم دەرسە .................................................................... ٧٧
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان .......................................................... ٧٩
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان.................................................... ٨١
هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان...................................................... ٨٤
مانای گشتیی ئایەتەکان .............................................................. ٨٦
بەسەرهاتی جەنگی ئەحزاب و جەنگی تیرەی بەنی قورەیزە ........................ ٩٤
جەنگی خەندەك (الأحزاب) لە بیست (٢٠) بڕگەدا: ................................. ٩٤
جەنگی بەنو قورەیزە لە پازدە (١٥) بڕگەدا:........................................ ١١٦
مەسەلە گرنگەکان ..................................................................... ١٣١
جەنگی ئەحزاب و دوازدە (١٢) هەڵوەستە.......................................... ١٥٩
جەنگی بەنی قورەیزەو حەوت هەڵوەستە ........................................... ١٦٧

دەرسی سێیەم........................................................................... ١٧١

پێناسەی ئەم دەرسە ................................................................... ١٧٣
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ......................................................... ١٧٤
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان................................................... ١٧٥
هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان..................................................... ١٧٧
مانای گشتیی ئایەتەکان ............................................................. ١٩٠
مەسەلە گرنگەکان .................................................................... ١٩٥
کورتە باسێك لە بارەی .............................................................. ٢٠٢

چەمك و واتای: (فَاحِشَة مُبَيِّنَة)ەوە.......... ٢٠٢
دەرسی چوارەم.......... ٢٢١
پێناسەی ئەم دەرسە.......... ٢٢٣
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان.......... ٢٢٤
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان.......... ٢٢٥
هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان.......... ٢٢٦
مانای گشتیی ئایەتەکان.......... ٢٢٩
مەسەلە گرنگەکان.......... ٢٣٤
سێ کورتە سەرنج.......... ٢٣٧
لافلێدەرانی پێغەمبەرایەتیی و بابییەکان و بەهائییەکان.......... ٢٥٠
١)- بابییەکان (البابية):.......... ٢٥٠
٢)- بەهائییەکان (البهائية):.......... ٢٥١
کورتە باسێك لە بارەی بەسەرهاتی زەیدو زەینەبەوە.......... ٢٥٢
دەرسی پێنجەم.......... ٢٦٣
پێناسەی ئەم دەرسە.......... ٢٦٥
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان.......... ٢٦٦
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان.......... ٢٦٦
مانای گشتیی ئایەتەکان.......... ٢٦٧
مەسەلە گرنگەکان.......... ٢٧١
حەوت ڕێنمایی گەورەو گرنگ بۆ پێغەمبەر ﷺ.......... ٢٧٩
کورتە باسێك لە بارەی یادی خوا کردنەوە.......... ٢٨١
١)- واتا و پێناسەی یادی خوا (ذکر الله):.......... ٢٨١
٢)- گرنگیی و پلە و پایەی زیکری خوا:.......... ٢٨٥

٣)- جۆرەکانی یادی خوا کردن: (أنواع الذّكر):........................ ٢٩٢
٤)- چۆن زیکری خوا بکەین:........................ ٣٠٤
ئێمە لە چوار ڕووەوە باسی چۆنیەتیی یادی خواکردن دەکەین........................ ٣٠٥
١)- لە ڕووی قیافەی جەستەییەوە:........................ ٣٠٥
٢)- لە ڕووی دەرخستن و دەرنەخستنەوە:........................ ٣٠٥
٣)- لە ڕووی دەنگەوە:........................ ٣٠٦
٤)- لە ڕووی تەنهایی و تێکەڵییەوە:........................ ٣١٠
٥)- بەرهەمی زیکری خواکردن:........................ ٣١١

دەرسی شەشەم........................ ٣٢٥

پێناسەی ئەم دەرسە........................ ٣٢٧
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان........................ ٣٢٨
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان........................ ٣٢٩
هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان........................ ٣٣١
مانای گشتیی ئایەتەکان........................ ٣٣٢
مەسەلە گرنگەکان........................ ٣٣٨

دەرسی حەوتەم........................ ٣٥٥

پێناسەی ئەم دەرسە........................ ٣٥٧
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان........................ ٣٥٨
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان........................ ٣٥٩
هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان........................ ٣٦١
مانای گشتیی ئایەتەکان........................ ٣٦٣
مەسەلە گرنگەکان........................ ٣٧٠
چــوار سەرنجی گرنگ........................ ٣٧٨

چۆنیەتیی پێکەوە پەیوەست بوونی ئایەتەکان ........................................ ٣٨٨
کورتە باسێك لە بارەی ........................................................... ٣٨٩
صەڵات و سەلام دان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ ..................................... ٣٨٩
١)- مانای (صَلَاة) و (سَلَام): ......................................................... ٣٨٩
٢)- حوکمی صەڵات و سەلام ناردن بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ: ............................ ٣٩٠
٣)- چۆنیەتیی صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا: ............................ ٣٩٢
٤)- حوکمی صەڵات و سەلام ناردن بۆ جگە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام):.... ٣٩٣
٥)- وا باشە صەڵات و سەلام کۆبکرێنەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ: ............................ ٣٩٦
٦)- حیکمەتی صەڵات و سەلام ناردنی ئێمە بۆ پێغەمبەر ﷺ: .......................... ٣٩٧
٧)- وەڵامی پرسیارێك: ........................................................... ٤٠٠
شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا: ........................................ ٤٠٢
دەرسی هەشتەم .................................................................. ٤٠٧
پێناسەی ئەم دەرسە .............................................................. ٤٠٩
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ...................................................... ٤١٠
شیکردنەوەی هەندێ لە وشەکان .................................................. ٤١٠
مانای گشتیی ئایەتەکان .......................................................... ٤١١
مەسەلە گرنگەکان ................................................................ ٤١٤
شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا: ......................................... ٤١٤
کورتە باسێك لە بارەی خێزان (أسرة)ی پێغەمبەرەوە ﷺ .............................. ٤١٨
١)- باب و دایکی و باپیری پێغەمبەری خوا ﷺ: ...................................... ٤١٨
٢)- ناوو ژمارەی هاوسەرەکانی و، ساڵی هاوسەرگیریی کردنی لەگەڵیان: ............... ٤١٨
٣)- ناوو ژمارەی کچ و کوڕەکانی پێغەمبەر ﷺ: ....................................... ٤٢٠
شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا: ........................................ ٤٢٣

دەرسی نۆیەم ........................................ ٤٢٩

پێناسەی ئەم دەرسە ........................................ ٤٣١
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ........................................ ٤٣٢
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان ........................................ ٤٣٣
مانای گشتیی ئایەتەکان ........................................ ٤٣٥
مەسەلە گرنگەکان ........................................ ٤٣٨

## تەفسیری سووڕەتی (سبأ)

دەستپێك ........................................ ٤٦١
پێناسەی سووڕەتی (سبأ) و بابەتەکانی ........................................ ٤٦١
یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە: ........................................ ٤٦١
دووەم: شوێنی دابەزینی: ........................................ ٤٦١
سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنە خواردا: ........................................ ٤٦٢
چوارەم: ژمارەی ئایەتەکان: ........................................ ٤٦٢
پێنجەم نێوەڕۆکی: ........................................ ٤٦٣
شەشەم: تایبەتمەندییەکانی: ........................................ ٤٦٣
حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکانی بۆ چەند دەرسێك: ........................................ ٤٦٥

دەرسی یەکەم ........................................ ٤٦٩

پێناسەی ئەم دەرسە ........................................ ٤٧١
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ........................................ ٤٧٢
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان ........................................ ٤٧٣
مانای گشتیی ئایەتەکان ........................................ ٤٧٥
مەسەلە گرنگەکان ........................................ ٤٨٣

دەرسی دووەم ............................................................ ٥٠٥

پێناسەی ئەم دەرسە ............................................................ ٥٠٧
مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان ............................................................ ٥٠٨
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان ............................................................ ٥٠٩
مانای گشتیی ئایەتەکان ............................................................ ٥١٢
مەسەلە گرنگەکان ............................................................ ٥١٧
کورتە باسێك: دە (١٠) کورتە سەرنج لە بارەی چاکەکانی خواوە لە سەر داوود و سولەیمان (علیهما السلام) ............................................................ ٥٢٧
أ- سێ کورتە سەرنج لە بارەی داوود ﷺ و نیعمەتەکانی خواوە لە سەری: ......... ٥٢٧
ب- حەوت کورتە سەرنج لە بارەی سولەیمان ﷺو، ئەو موعجیزەو چاکەو نیعمەتانەوە، کە خوا ﷻ پێیدابوون: ...... ٥٢٨

دەرسی سێیەم ............................................................ ٥٣٩

پێناسەی ئەم دەرسە ............................................................ ٥٤١
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ............................................................ ٥٤٢
شیکردنەوەی هەندێ لە وشەکان ............................................................ ٥٤٣
مانای گشتیی ئایەتەکان ............................................................ ٥٤٥
مەسەلە گرنگەکان ............................................................ ٥٤٩
حەوت هەڵوەستە لە بەرانبەر بەسەرهاتی گەلی سەبەئدا ............................................................ ٥٥٩
١)- گەلی سەبەء، یان هۆزی سەبەء: ............................................................ ٥٥٩
٢)- هۆکاری پرژانیان: ............................................................ ٥٥٩
٣)- هۆکاری ڕووخانی بەنداوەکە: ............................................................ ٥٦٠
٤)- بۆچی خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾ ﴾؟ ........... ٥٦١
٥)- نیعمەتەکانی خوا بەبێ سوپاسگوزاریی، بۆ خوا بەردەوام نابن: ............................................................ ٥٦٢

٦)- هێمنیی و ئاسایشی ڕێ و بان نیعمەتێکی خوایە:................................٥٦٢
٧)- تۆکمەیی و تەبایی و کۆمەڵگا، نیعمەتێکی گەورەو گرنگی خوایەو، بە پێچەوانەوە، پەرتەوازەیی و پرژو بڵاویی و ناکۆکیی، بەڵایەکیی زۆر خراپ و بێرەزایە:................................٥٦٣

دەرسی چوارەم................................٥٦٥

پێناسەی ئەم دەرسە................................٥٦٧
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان................................٥٦٨
شیکردنەوەی هەندێ لە وشەکان................................٥٦٩
مانای گشتیی ئایەتەکان................................٥٧١
مەسەلە گرنگەکان................................٥٧٦
کورتە باسێك لە بارەی شێوازی بانگەوازەوە: لە دە خاڵاندا................................٥٩١

دەرسی پێنجەم................................٦٠١

پێناسەی ئەم دەرسە................................٦٠٣
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان................................٦٠٤
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان................................٦٠٦
مانای گشتیی ئایەتەکان................................٦٠٩
مەسەلە گرنگەکان................................٦١٦

دەرسی شەشەم................................٦٣٥

پێناسەی ئەم دەرسە................................٦٣٧
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان................................٦٣٨
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان................................٦٣٩
مانای گشتیی ئایەتەکان................................٦٤٠

مەسەلە گرنگەکان ..................................................................................... ٦٤٥

دەرسی حەوتەم ..................................................................................... ٦٥٩

پێناسەی ئەم دەرسە ..................................................................................... ٦٦١
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ..................................................................................... ٦٦٢
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان..................................................................................... ٦٦٣
مانای گشتیی ئایەتەکان ..................................................................................... ٦٦٤
مەسەلە گرنگەکان ..................................................................................... ٦٦٨